بنچینەکانی دەسەڵات و خۆشگوزەرانی و هەژاری

# بۆچی نەتەوان شکستدەهێنن؟

نووسینی
دارۆن ئاسمۆگلو و جەیمس ڕۆبینسۆن

وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە
هۆشیار سیوەیلی



چاپی یەکەم
هەولێر 2014

بنچینەکانی دەسەڵات و خۆشگوزەرانی و هەژاری

# بۆچی نەتەوان شکستدەهێنن؟

نووسینی
دارۆن ئاسمۆگلو و جەیمس ڕۆبینسۆن

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە
هۆشیار سیوەیلی

چاپی یەکەم
هەولێر ٢٠١٤

○ ناوی کتێب : بنچینەکانی دەسەڵات و خۆشگوزەرانی و هەژاری بۆچی نەتەوان شکستدەهێنن؟
○ نووسینی : دارۆن ئاسمۆگلو و جەیمس ڕۆبینسۆن
○ وەرگێڕانی : هۆشیار سیوەیلی
○ تیراژ : (٢٠٠٠) دانە
○ نەخشەسازی : نووسینگەی هیوا
○ چاپ : چاپخانەی ڕۆژهەڵات
○ چاپی یەکەم، هەولێر / ٢٠١٤

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (٥٣٢)ی ساڵی (٢٠١٤)ی دراوەتێ

# هەڵسەنگاندنی
# بۆچی نەتەوان شکستدەهێنن

**کێنیس جەی ئارۆ،**
**خاوەن خەڵاتی نۆبڵ**
**لە ئابووری دا، ١٩٧٢**

ئاسمۆگلو و ڕۆبینسۆن بەشدارییەکی باشی ئەو گفتوگۆیەیان کردوە کە دەکرێ دەربارەی ئەوەی بۆچی نەتەوانی لەیەکچوو بەو ئەندازە گەورەیە لە پەرەپێدانی ئابووری و سیاسییان دا لە یەکتر جیاوازن. لە میانەی چەندین نموونەی مێژووییەوە، ئەوان پیشانیدەدەن کە چۆن، پەرەپێدانی دەزگایی، هەندێجار لە سەر بنەمای بارودۆخی زادەی ڕێکەوت، ئاکامی گەورەی هەبوە. کراوەیی کۆمەڵگایەك و ئامادەیی بۆ ڕێگەدان بە تێکدانی بنیاتنەر و سەروەریی یاسا، پێدەچن بۆ پەرەپێدانی ئابووری یەکلاکار بن.

**گاری ئێس بێکەر،**
**خاوەن خەڵاتی نۆبڵ**
**لە ئابووری دا، ١٩٩٢**

نووسەرەکان بە شێوەیەکی بڕواپێهێن پیشانیدەدەن کە وولاتان تەنیا لە کاتێك دا لە هەژاری ڕزگاریان دەبێ کە دەزگایانی ئابووری گونجاویان هەبێ، بەتایبەتی موڵکداری تایبەت و ڕکابەریی. ئەوان لایان وایە کە وولاتان ئەگەری پەرەپێدانی دەزگایانی دروستیان زیاتر دەبێ کاتێك سیستەمی کراوەی پلورەلیستییان دەبێ لەگەڵ ڕکابەریی بۆ گەیشتنە دەسەڵاتی سیاسی و دەنگدانی فراوان و کرانەوە بە ڕووی سەرکردانی سیاسی نوێ دا. ئەم پەیوەندییە قووڵە لە نێوان دەزگایانی سیاسی و ئابووری دا، کرۆکی بەشدارییەکەیان پێکدەهێنێ و بووشەتە هۆی بەرهەمهێنانی لێکۆڵینەوەیەکی یەکجار بایەخدار لەسەر یەکێك لە پرسە گرنگەکانی ئابووری و ئابووری سیاسی.

ئەم کتێبە گرنگ و تیژبینە، کە پڕە لە نموونەی مێژوویی، ئەو بابەتە دەخاتەڕوو کە لایوایە بوونی دەزگایانی سیاسی کراوە بۆ پشتگیری دەزگایانی ئابووری کراوە کلیلی خۆشگوزەرانی بەردەوامە. کتێبەکە پێداچوونەوە دەکا دەربارەی ئەوەی کە چۆن هەندێك ڕژێمی باش کەوتنە سەرکار و دواتر کەوتنە سەر بارنەی بەختەوەری، لە کاتێك دا ڕژێمە خراپەکان لە بارنەی ناهەمواری دا مانەوە. ئەمە شیکردنەوەیەکی گرنگە و نابێ خوێندنەوەی پشتگوێبخرێ.

**پیتەر دایەمۆند، خاوەن خەڵاتی نۆبڵ لە ئابووری دا، ٢٠١٠**

کتێبێکی سەرنجڕاکێش و یەکجار شیاوی خوێندنەوەیەو ئەنجامگیرییەکەشی دڵخۆشکارە: دەزگا ئەسۆریتاری (چەوسێنەر)ەکان، وەك ئەوانەی بوونەتە هۆی گەشەپێدان لە چینی ئەمڕۆدا، هەر دەبێ تینوگوڕی خۆیان لەدەستبدەن. بەبێ بوونی دەزگایانی کراوە کە یەکەمجار لە ڕۆژئاوادا سەریانهەڵدا، گەشەسەندنی پایەدار مەحاڵە، چونکە تەنیا کۆمەڵگایەکی خاوەن ئازادی ڕاستەقینە دەتوانێ نوێکاری ڕەسەن و تێکدانی بنیاتنەر، کە هاوپەیوەندن، بهێنێتەئاراوە.
بۆ ئەوانەی لایان وایە چارەنووسی ئابووری نەتەوەیەك بەستراوەتەوە بە جوگرافیا یان کەلتوور، ئەوا دارۆن ئاسمۆگلو و جیم ڕۆبینسۆن هەواڵی خراپیان بۆ ئەوانە پێیە. ئەوە دەزگایانی دەسکردی مرۆڤن، نەك چۆنیەتی هەڵکەوتەی زەوی یان ئیمانی باوباپیرانمان، کە دەوڵەمەندی و هەژاری وڵاتێك دیاریدەکەن. بە تێهەڵکێشکردنی زیرەکانەی کارەکانی تیۆریستانی هەر لە ئادەم سمیس تا دۆگلاس نۆرس لەگەڵ توێژینەوەتەجریبیە زیاتر نوێکان لەلایەن مێژووناسانی ئابوورییەوە، ئاسمۆگلو و ڕۆبینسۆن کتێبێکی سەرنجڕاکێش و شیاوی خوێندنەوەیان بەرهەمهێناوە.

**نیاڵ فێرگەسۆن، نووسەری کتێبی بەرزبوونەوەی پارە**

ئـــاسمۆگلو و ڕۆبینـــسۆن، دوو لـــه شــارەزا پێشەنگەکانی بواری پەرەپێدان، دەریدەخەن بۆچی جوگرافیا و نەخۆشـی یان کـەلتوور نـین شـرۆڤەی ئـەوە دەکـەن هەنـدێك نەتـەوە دەوڵەمەنـد و هەندێکیشیان هـەژارن، بـەڵکو ئەمـە پەیوەنـدی بـە دەزگایـان و سیاسـەتەوە هەیـە. ئـەم کتێبـە زۆر ئاسـانە، تیژبینییـەکی باشـی خـستۆتە بـەردەم پسپۆڕان و خوێنەران بە گشتی.

**فرانسیس فۆکۆیاما، نووسەری کۆتایی مێژوو و دوا پیاو و نووسەری بنچینەکانی سیستەمی سیاسی**

کتێبێکی بلیمـەت و وروژێنـەرە، سـەرەڕای ئـەوەی بانگێکی بەئاگاهێنەوەی یەکجار ناخۆشە. ئاسمۆگلو و ڕۆبینـسۆن تیۆرییـەکی بڕواپێهێنیـان خـستۆتەڕوو دەربـارەی هـەموو ئـەو شـتانەی پەیوەنـدییان بـە پەرەپێدانی ئابوورییەوە هەیە: وڵاتان پێشدەکەون کاتێـك دەزگایـانی سیاسـی هانـدەری گەشـەکردن دادەمـەزرێنن و شکـستدەهێنن ــ زۆرجـار بـە شێوەیەکی سەیر- کاتێك ئـەو دەزگایانـە ڕەق دەبـن یان ناتوانن خۆیان لەگەڵ گەشەکردن دا بگـونجێنن. کەسـانی بـەهێز هەمیـشە و لـە هـەموو شـوێنێك دا هەوڵ دەدەن بە تەواوی کۆنترۆڵی حکومەت بکەن و لەبـەر چاوچـنۆکی خۆیـان بـەر بـە پێـشکەوتنی کۆمەڵایـەتی فـراوان بگـرن. یـان دەبـێ دەسـەڵاتی ئەمانە لە ڕێگەی دیموکراسی کاریگەرەوە سنووردار بکـرێ یـان سـەیری نەتەوەکـەت بکـە کـە شکستدەهێنێ.

**سایمۆن جۆنسۆن، هاونووسەری ١٣ خاوەن بانك و پرۆفیسۆر لە ئێم ئای تی سلۆون**

دوو لە باشترین و شارەزاترین ئابووریناسانی جیهان دەستدەدەنە زەحمەت ترین بابەت: بۆچی هەندێك نەتەوە هەژارن و ئەوانی تر دەوڵەمەندن؟ پشتبەستوو بە زانیارییەکی قوڵ لەسەر ئابووری و مێژووی سیاسی، رەنگە ئەمە بەهێزترین لێدوان بێ تا ئێستا درابێ کە لای وابێ "دەزگاگان گرنگن" کتێبێکی وروژێنەر و چاوکەرەوە، لەگەڵ ئەوەش دا، بەتەواوی سەرنجڕاکێشە.

**جول مۆکیر، رۆبەرت ئێیچ سترۆتز پرۆفیسۆری هونەر و زانست و پرۆفیسۆری ئابووری و مێژوو، زانکۆی نۆرسوێزرەن**

لەم کتێبە وروژێنەر و خۆشخوێنە دلگیرەدا، لە ناو چوارسەد ساڵ مێژووەوە، دوو لە شاسوارانی مەیدانی زانستی کۆمەڵایەتی ئەم سەردەمە، پەیامێکی گرنگ و بزوێنەرمان بۆ دەهێنن: ئەوە ئازادیە کە جیهان دەوڵەمەند دەکا. با ستەمکاران لە هەموو جێگایەك دا بلەرزن.

**ئیان مۆریس، زانکۆی ستانفۆرد، نووسەری بۆچی رۆژئاوا لە ئێستا دا فەرمانڕەوایی دەکا**

وادابنێ لە دەوری مێزێك دانیشتویت و گوێ لە جارد دایەمۆند و جۆزیف شومپێتەر و جەیمس مادیسۆن دەگریت کە باسی مێژووی سیاسی و ئابووری زیاتر لە دوو هەزار ساڵ دەکەن. وادابنێ کە ئەوان بیرۆکەکانیان دەخەنە چوارچێوەیەکی تیۆری یەکگرتووەوە کە لەسەر بنەمای سنووردارکردنی چەوسانەوە و وەگەڕخستنی تێکدانی بنیاتنەر و پێکهێنانی دەزگایانی سیاسی بەهێز دامەزراوە کە بواری هاوبەشی لە دەسەڵات دا دەڕەخسێنێ، ئەو کاتە بایەخی ئەم کتێبە کە بە شێوەیەکی زیرەکانەو سەرنجڕاکێش نووسراوە، دەبینی.

**سکۆت ئی پەیج، زانکۆی مشیگان و سانتا فی ئینستیتیوت**

لــەم کتێبــە دڵــڕفێن و گــشتگیرە دا، ئــاسمۆگلو و ڕۆبینسۆن پرسیارێکی سادە بەڵام گرنگ دەکەن کە ئەویش ئەوەیە: بۆچی هەندێك نەتەوە دەوڵەمەند دەبــن و ئــەوانی تــر بــە هــەژاری دەمێننــەوە؟ وەڵامەکەشــیان سادەیە- چونکە هەنــدێك قــەوارە دەزگایــانی سیاســی کراوەتــر دادەمــەزرێنن. ئــەوەی دەربــارەی ئــەم کتێبــە، سەرنجڕاکێــشە، بریتییــە لــە ڕوونـــــی و ســــــاکاری نووســـــینەکەی و نایــــابی ئارگومێنتەکەی و دەوڵەمەندی بەرچاوی ووردەکارییە مێژووییەکان. پێویستە ئەم کتێبــە بخوێندرێتــەوە لــە ساتەوەختێکدا کە جیهانی ڕۆژئاوا پێویــستە ئــیرادەی سیاسی لا دروستببێ بۆ مامەڵەکردن لەگــەڵ قــەیرانی قەزر کە بە ئەندازەیەکی نائاسایی سەریهەڵداوە.

ستیڤن پینکەس،
پرۆفیسۆری مێژوو و
لێکۆڵینەوە
نێودەوڵەتیەکان و
ناوچەکە، زانکۆی یەڵ

ئەوە سیاسەتە کە نەفامە! ئەمــە شــرۆڤە ئاســان و لەگـــەڵ ئـــەوەش دا بەهێزەکـــەی ئـــاسمۆگلو و ڕۆبینــسۆنە دەربــارەی ئــەوەی بۆچــی ئــەم هــەموو وولاتانە لە پەرەپێدان دا شکستدەهێنن. لە ڕەهــایی ستوارتەکانەوە تــا جــەنگی نــاوخۆ لــە باشــوور، لــە سیارا لیۆن تــا کۆلۆمبیــا، ئــەم کــارە بەنرخــە ئــەوە پیشاندەدا کە چۆن نوخبە بــەهێزەکان یاســاکان بــۆ بەرژەوەنــدی خۆیــان بــەکاردەهێنن لەســەر حــسابی خــەڵکێکی زۆر. بــە وێنــاکردنی ڕێڕەوێکــی ڕوون لــە نێوان ڕەشبینان و گەشبینان دا، نووسەران پیشانی دەدەن کە نابێ جوگرافیا ومێژوو و چارەنووس بــن. ئەوان ئەوەش دەخەنەڕوو کە چۆن ئایدیا ئابووری و سیاســییە گونجاوەکــان بــە نــەبوونی گۆڕانکــاری سیاســـی بنـــەڕەتی زۆرجـــار شـــتێکی ئـــەوتۆ بەدەستناهێنن.

دانی بۆدریك،
قوتابخانەی کەنەدی
بۆ لێکۆڵینەوەی
حکومەت، زانکۆی
هارڤارد

ئەمە تەنیا کتێبێکی سەنجڕاکێش ودڵگیر نییە، بەڵکو کتێبێکی بەڕاستی گرنگە. ئەم توێژینەوە ڕەسەنە، کە پرۆفیسۆران ئاسمۆگلو و ڕۆبینسۆن ئەنجامیانداوە و بەردەوامن لە ئەنجامدانیدا دەربارەی ئەوەی چۆن هێزە ئابوورییەکان و سیاسەت و بژاردەی پۆلیسییەکان پێکەوە نەشونما دەکەن و یەکتریش سنووردار دەکەن و چۆن دەزگاکان کار دەکەنە سەر ئەم نەشونماکردنە، گرنگە بۆ تێگەیشتن لە سەرکەوتن و شکستهێنانی کۆمەڵگایان و نەتەوان. لێرەدا و لەم کتێبەدا ئەم تیژبینیانە بە شێوەیەکی کراوە و لە ڕاستیدا بە شێوازێکی زۆر سەرنجڕاکێش خراونەتەڕوو. ئەوانەی ئەم کتێبە بەدەستەوەدەگرن و دەست بەخوێندنەوەی دەکەن، کێشەیان لەگەڵ دانانی دا دەبێ.

**مایکل سپێنس،**
**خاوەن خەڵاتی نۆبڵ**
**لە ئابووری دا، ٢٠٠١**

ئەم کتێبە سەرنجڕاکێش و خۆشخوێنە جەختدەکاتە سەر نەشونمای ئاڵۆز و هاوبەشی دەزگایانی سیاسی و ئابووری بە ئاڕاستەی باش و خراپ دا. باڵانسێکی ناسك دروستدەکا لە نێوان لۆجیکی هەڵسوکەوتی سیاسی و ئابووری و گۆڕین لە ئاڕاستە دا کە لە لایەن ڕووداوە مێژووییە پەیوەستەکانەوە دروستدەبن، گەورە و بچووك، لە کاتی وەرچەرخانە مێژووییەکان دا. ئاسمۆگلو و ڕۆبینسۆن ژمارەیەکی زۆر نموونەی مێژوویی پێشکەشدەکەن بۆ پیشاندانی ئەوەی چۆن ئەم گۆڕینانە یان بەرەو دەزگایانی لەبار و نوێکاری پێشکەوتوو و سەرکەوتنی ئابووری دەجوڵێن، یان بەرەو دەزگایانی چەوسێنەر و گەندەڵی یان چەقبەستن دەجووڵێن. ئەوان دەتوانن چێژ و تێڕامان دروستبکەن.

**ڕۆبەرت سۆلۆ،**
**خاوەن خەڵاتی نۆبڵ**
**لە ئابووری دا، ١٩٨٧**

سێ هۆکار هەیە کە وات لێدەکەن ئەم کتێبەت لا پەسەند بێ. هۆکاری یەکەم ئەوەیە کە ئەم کتێبە دەربارەی جیاوازییەکانی داهاتە نەتەوەییەکانە لە ناو جیهانی مۆدێرن دا، کە ڕەنگە گەورەترین کێشە بێ ئەمڕۆ ڕووبەڕووی جیهان بوبێتەوە. هۆکاری دوەم ئەوەیە کە ئەم کتێبە بە چەندین چیرۆکی دڵفرێن زاخاودراوە کە وات لێدەکەن لە ئاهەنگەکان دا قسەبێژێکی سەرنجڕاکێش بیت - وەك چیرۆکی ئەوەی بۆچی بۆتسوانا دەوڵەمەند دەبێ و سیارا لیۆن دەوڵەمەند نابێ. هۆکاری سێیەمیش ئەوەیە کە ئەم کتێبە بابەتێکی خۆشە بۆ خوێندنەوە و وەك من ڕەنگە تۆش حەزبکەی بە یەکجار بیخوێنیتەوە و دواتریش جار لە دوای جار بگەڕێیتەوە سەری وبیخوێنیتەوە.

**جێرد دایەمۆند، براوەی خەڵاتی پلوتزەر- نووسەری براوەی پڕفرۆشترین کتێبی تفەنگان و میکرۆبان و پۆڵا و دارمان**

لە ماوەی ڕابوردوودا فەیلەسوفێکی کەمناسراوی سکۆتلەندی کتێبێکی نووسی دەربارەی ئەوەی کە چی دەبێتە هۆی سەرکەوتنی نەتەوان و چی دەبێتە هۆی شکستهێنانیان. *سامانی نەتەوان* ئەمڕۆ هێشتا دەخوێندرێتەوە. بە هەمان ژیری و بەهەمان تێڕوانینی فراوانی مێژووییەوە، دارۆن ئاسمۆگلو و جەیمس ڕۆبینسۆن جارێکیتر تاوتوێی هەمان کێشە دەکەنەوە بۆ سەردەمی ئێستامان. دوو سەدە لەمەودوا، بە هەمانشێوە نەوەکانی ئێمە کتێبی *بۆچی نەتەوان شکستدەهێنن؟* دەخوێننەوە.

**جۆرج ئەیکەرلۆف، براوەی خەڵاتی نۆبڵ لە ئەدەب دا، ساڵی ٢٠٠١**

*بۆچی نەتەوان شکستدەهێنن؟* لە چەندین ڕووەوە هێندە باشە کە ناتوانم هەموو ئەو ڕوانە بخەمەڕوو. شرۆڤەی ڕووبەرێکی فراوانی مێژووی مرۆڤایەتی دەکا. ئەم کتێبە بە هەمان ئەندازە ئاشنای ڕووداوەکانی ئاسیا و ئەفریقاو ئەمەریکاکانە. وەك یەك مامەڵە لەگەڵ چەپ و ڕاست و هەموو ڕەنگەکانی نێوانیان دا دەکا. دەستناپارێزێ، بەڵام تەنیا لە پێناوی ڕاکێشانی سەرنج دا ڕووناشکێنێ. ڕابوردوو ڕۆشن دەکاتەوە لە کاتێك دا ڕێگای نوێمان لەبەردەمدا دەکاتەوە تا بیر لە ئێستا بکەینەوە. ئەو کتێبە دەگمەنەیە لە ئابووری دا کە خوێنەر دەهێنێتە سەر ئەو بڕوایەی کە نووسەرانی باشترین شتیان بۆ خەڵکی ئاسایی دەوێ. ئەم کتێبە دەبێتە بابەتی مشتومڕی چەندین ساڵانی داهاتووی باسکاران و گفتوگۆی ئایا زانیوتەی سەر مێزی شیڤخواردنی خوێنەرانی ئاسایی بۆ چەندین ساڵان. هەندێك گاڵتەی تێدایە کە تامی خۆیان هەیە. کتێبێکی نایابە و پێویستە یەکسەر بکڕدرێ، بۆ ئەوەی نووسەرەکان هانبدرێن تا لە کارکردن بەردەوامبن.

**چارڵس سی مان،**
**نووسەری کتێبی**
**١٤٩١ و ١٤٩٣**

# پێرست

| لاپەڕە | ناوەڕۆك |
| --- | --- |

# پێشەکی لە لایەن وەرگێڕەوە

ئـەم کتێبـە بەرهــەمی پـازدە سـاڵ توێژینــەوە و لێکۆڵینەوەیـە لـە لایـەن نووسەران، دارۆن ئاسمۆگلو و جـەیمس ڕۆبینـسۆن و چـەندین کەسـی تـرەوە و چۆتە ناو قووڵایی مێژووی مرۆڤایەتییەوە، هەر لە شۆڕشی کشتوکاڵی ناوچـەی مێسۆپۆتامیا تـا مێـژووی نـوێی چـەندین وڵاتـانی دەوڵەمەنـد و هــەژاری ئـەم سەردەمە. ئەوان، هەوڵیانداوە وەڵامێکی نوێی ئەوپرسیارە کۆنـە بدەنـەوە کـە دەڵێ: بۆچـی هەنـدێك وڵات هــەژار و هەنـدێکی تریـان دەوڵەمەنـدن؟. لێـرەوە گــەڕانێکی وورد دەســپێدەکەن بــۆ بەدەسخــستنی وەڵــامی ئــەم پرســیارە سەرەکییە و چەندین پرسیاری تری گرنگ: ئایا کەڵتووری نەتەوان یـان شـوێنی جوگرافی وڵاتان یان ئاستی شارەزایی فەرمانڕەوا و نوخبـەکان ڕۆڵـی گـرنگ لـە هەژاری و دەوڵەمەندی یان لەسـەرکەوتن و شکستهێنانی نەتـەوان دا دەبیـنن؟ ئەگەر وەڵامەکە نەخێرە، ئـەی هۆکـاری ئـەم جیاوازییـە گەورەیـە لـە داهـات و گوزەرانی نەتەوان دا چییە؟. ئایا سیاسەت بناخەی خۆشگوزەرانی دادەنێ یان ئـابووری و چـۆن؟ هــەردوو نووســەر، دوای ووردبوونـەوە لەچـەندین نموونـەی مێژوویی و لێکۆڵینەوە لە ئەزموونی چەندین وڵات لـە کیـشوەرە جیاجیاکـان دا دەگەنە ئەو دەرئەنجامەی کە کەڵتوور وجوگرافیا و نەشارەزایی ڕۆڵی گەورەیان نییە، بەڵکو ئەوە دەزگایانی وڵاتن ڕۆڵی سەرەکی لە پەرەپێدان و پێشکەوتنی ئـابووری و سیاسـی وڵـات دا دەبیـنن. دەزگایـانی سیاسـی و ئـابووری کـراوە دابمەزرێنـە و خـۆت لـە دەزگایـانی سیاسـی و ئـابووری داخـراو و چەوسـێنەر دوورخـەرەوە، ئــەوا دەوڵەمەنـدی و خۆشـگوزەرانی ڕووت تێدەکـەن. پـازدە چاپتەرەکەی کتێبەکە ئەوە ڕووندەکەنەوە کە لە کاتێك دا دەزگا ئابوورییـەکان گرنگن بۆ هێنانەدی خۆشگوزەرانی و دەوڵەمەندی نەتەوەیەك، ئـەوە سیاسـەت و دەزگایانی سیاسی وڵاتن ئەوە دیاریدەکەن کـە ووڵاتێـك چ جـۆرە دەزگایـانی ئابووری هەبێ: دەزگایانی ئابووری کراوە کە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی بەشی هەرە زۆری کۆمەڵگا بکەن یان دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر و داخراو کە تەنیا بەرژەوەندی نوخبەیـەکی کەمینـەی دەسـەڵاتدار بپارێزن. ئەگـەر دابەشـبوونی دەسەڵات لەناوکۆمەڵگادا تەسك بێ و هـیچ جڵەوگیرییـەك یـان جڵـەوگیری کـەم

لەسەر دەسەڵاتی سیاسی فەرمانڕەوایان هەبوو، ئەوا دەزگا سیاسییەکان ڕەها دەبن، هەروەك نموونەی ئەو پاشایەتی و دەسەڵاتە ڕەهایانەی لە جیهان دا لە زۆربەی قۆناخەکانی مێژوودا حوکمیانکردوە. بە پێچەوانەوە، ئەو دەزگا سیاسییانەی کە دەسەڵات بە شێوەیەکی فراوان لە کۆمەڵگادا دابەشدەکەن و جڵەوگیری بۆ دەسەڵاتی فەرمانڕەواکان دادەنێن، دەزگایانی پلورەلیستین ودەسەڵاتی سیاسییش دیموکراسی دەبێ و ئەمانیش بەدەوری خۆیان دەزگایانی ئابووری کراوە دادەمەزرێنن. ئەوان بەدرێژی باسی ئەوە دەکەن کە ئەگەر دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوە هێندە گرنگن بۆ ژیانی نەتەوە ئەی بۆچی هەندێك نەتەوە سەرکەتوو نابن لە دامەزراندنی دەزگایانی کراوە و دەزگایانی چەوسێنەر دروستدەکەن یان بۆچی دەزگاکانیان بۆ دەزگایانی کراوە و دیموکراسی ناگۆڕن؟

ئاسمۆگلو و ڕۆبینسۆن دەڵێن (لۆجیکی ئەوەی بۆچی دەسەڵاتداران نایانەوێ ئەو جۆرە دەزگا ئابوورییانە دابمەزرێنن کە هانی گەشەکردنی ئابووری دەدەن بە ئاسانی بۆ هەڵبژاردنی دەزگا سیاسییەکانیش درێژدەکرێتەوە. لە سایەی ڕژێمێکی ڕەها دا، هەندێك نوخبە دەتوانن دەسەڵات بەکاربهێنن بۆ دامەزراندنی ئەو دەزگا ئابوورییانەی دەیانەوێ. ئایا ئەوان ئارەزووی ئەوە دەکەن دەزگا سیاسییەکان بەرەو دەزگایانی زیاتر پلورەلیستی بگۆڕن؟ بە گشتی نەخێر، چونکە ئەمە تەنیا دەسەڵاتی سیاسییان کەمدەکاتەوەو بۆیان زەحمەت تر دەبێ، تەنانەت مەحاڵ دەبێ، کە دەزگا ئابوورییەکان بەو شێوەیە دابڕێژن کە بتوانن بەرژەوەندییەکانیان زیاتر بپارێزن ... ئەو خەڵکەی بەهۆی دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکانەوە تووشی زیان دەبن ئومێدی ئەوەیان نییە کە دەسەڵاتدارە ڕەهاکان خۆویستانە دەزگا سیاسییەکان بگۆڕن و دەسەڵات لەناو کۆمەڵگادا دابەشبکەنەوە. تەنیا ڕێگا بۆ گۆڕینی ئەم دەزگا سیاسییانە بریتییە لە ناچارکردنی نوخبەی سیاسی بۆ دامەزراندنی دەزگای زیاتر پلورەلیستی).

وەرچەرخانە مێژووییەکان ڕۆڵی گەورە دەبینن لە ژیانی نەتەوان دا و ئەوانەی سوود لەو وەرچەرخانانە دەبینن پێشدەکەون و لە ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە پەرەدەسێنن. ئینگلتەرە توانی بە شێوەیەکی پۆزەتیف سوود لە وەرچەرخانی مێژوویی کە مردنی ڕەش و بازرگانی زەریای ئەتڵەسی بوو

وەربگریّ لە کاتێك دا ئیسپانیا نەیتوانی سوود لەو وەرچەرخان و دەرفەتانە وەربگریّ. هەر بۆیە ئینگلتەرە لە دەوڵەتێکی بچووکی لاوەکی و دواکەوتووەوە پێیشکەوت و شۆڕشی شکۆدار و شۆڕشی پیشەسازی بەرپاکرد و ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیاش بەرەو ڕۆچون ملینا. ئەم کتێبە جەختدەکا کە هیچ شتێك و هیچ پێشهاتێك حەتمی نییە و پێشتر دیاریکراو نییە، بەڵام جەختیش لەسەر گرنگی و کاریگەری پەیوەستی (contingency) دەکا لە ڕووداوە مێژووییەکان دا و ئەوە ڕووندەکاتەوە کە مەرکەزیەتی سیاسی چ گرنگیەکی هەیە و بۆچی شۆڕشی پیشەسازی و نوێکاری لەو وولاتانەدا بڵاو نەبوونەوە کە خاوەن کەمترین ئاستی مەرکەزیەتی دەوڵەت نەبوون.

نووسەرانی کتێبی (بۆچی نەتەوان شکستدەهێنن) لایان وایە تیۆرییەکی نوێیان داناوە بۆ لێکدانەوە و شرۆڤەکردنی هۆکار و فاکتەرەکانی هەژاری و خۆشگوزەرانی کە زۆر جیاوازە لە تیۆری و گریمانە کۆن و تەقلیدییەکان. ئەوان هۆکاری سەرەکی ململانیّ نێوخۆییەکان لەسەر دەسەڵات و سەرهەڵدانی ڕژێمە دیکتاتۆرەکان و بەردەوامییان دەگێڕنەوە بۆ بوونی دەزگایانی سیاسی و ئابووری چەوسێنەر. ئەوان لە ڕێگەی تیۆرییەکەیانەوە ئەوە شیدەکەنەوە کە چۆن دەزگا کراوەکان لە ڕێگەی فیدباکی پۆزەتیڤ و بازنەی بەختەوەرییەوە بەردەوامدەبن و چۆن دەزگایانی چەوسێنەر و داخراو لە ڕێگەی فیدباکی نێگەتیڤ و بازنەی ناهەمواررییەوە و بەردەوامی بە مانەوە و چەوساندنەوەکانیان دەدەن.

هەرێمی کوردستان لە ماوەی دە ساڵی ڕابوردوودا هەنگاوی بەرچاوی ناوە بەرەو دامەزراندنی دیموکراسی و پلورەلیزم و دەزگایانی کراوەی سیاسی و ئابووری و هێزدارکردنی جەماوەر. ئەمانە هەنگاوی گرنگ و پۆزەتیڤن لە ڕێڕەوی دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی خۆشگوزەران و کراوە دا و پێویستە زیاتر پەرەیان پێبدریّ و لەڕێگەی پرۆسەی (بازنەی بەختەوەری و فیدباکی پۆزەتیڤەوە) بەردەوامی بە مانەوە و بەهێزبوونیان بدریّ.

هیوادارم کە ناوەرۆکی ئەم کتێبە ببێتە هاندەرێکی تر بۆ خوێنەران بە گشتی و ڕووناکبیران و میدیاکاران و ناوەندە سیاسی و مێژوویی و کەلتوورییەکان بە تایبەتی بۆ ورووژاندنی ئەو پرس و پرسیارە گرنگانەی کە لەم کتێبەدا ورووژێنراون تا بە شیکردنەوەیان هەڵسەنگاندنی دروست بۆ واقیعی

ئـەمڕۆ بکـەن و سـەرکردە حیزبـی و بەرپرسـە حوکمڕانـەکانی کوردسـتانیش گرنگی زیاتر بە دامەزراندن و پەرەپێدانی دەزگایانی کراوەی سیاسی و ئابووری بدەن.

## کاری وەرگێڕان

وەرگێڕان بۆ زمانی کوردی کارێکی زەحمەتە چونکە هێشتا، جگـە لـەوەی زمانێکی ستاندارد و یەکگرتوومان نییە، هـیچ هـەوڵێکی جـدیش بـەدیناکرێ بـۆ دامەزرانـدنی ئـەو زمانـە. سـەرەڕای هەوڵـە باشـەکان، هێـشتا فەرهـەنگ یـان قاموسـێکی (ئینگلیـزی - کـوردی) وامـان نییـە کـە بتـوانین بـە تـەواوی پـشتی پێببەستین بۆ وەرگێڕانی ووشە و زارەوەکان. ڕێزمان و ڕێنووسـی کـوردی نـەك تەنیا لە نێوان زاراوەکانی زمانەکەمان دا جیاوازن، بەڵکو لە ناو ئـەو زاراوەیـەی ئەم کتێبەی پێنووسراوە جیاوازە. لە کاتێك دا هەوڵمـداوە لـە ڕووی ڕێزمانـەوە ئەو ستاندارد و ڕێچکە باوە بەکاربهێنم کە ئەم سەردەمە لە هەرێمی کوردسـتان دا بـەکاردەهێنرێ، لـە ڕووی ڕێنووسـەوە، کێـشەی زۆرم تـووش بـوو چـونکە شێوازی ڕێنووسەکان فرەو هەمەچەشنن.

لەگـەڵ هـەموو ئـەم کەموکوڕییـە گـشتیانەش دا لـە شـێوازی نووسـین و دەربڕینی زمانە شیرینەکەمان دا، هەر هەڵەیەك یان ناتەواوییەك لە وەرگێـڕان و لێکدانەوەی دەقەکانی ئەم کتێبەدا ڕوویاندابێ خەتای خۆمە و من بەرپرسیارم.

لەم وەرگێڕانـەدا، زیـاتر بایەخمـداوە بـەوەی کـە تـۆی خوێنـەری بـەڕێز لـە مەبەسـتی نووسـەرەکان و دەقـەکانی نـاو کتێبەکـە تێبگـەی نـەك مەبەسـتم نووسینی دەقێکی ئەدەبی بێ.

چاوەڕێی دەسخۆشی لە کەس ناکەم چونکە ئەم کـارە یەکێکـە لـە ئەرکـەکانی سەرشـــانم بەرامبـــەر نەتەوەکـــەم، بـــەڵام هیـــوادارم ڕەخنـــە و ســـەرنج و بۆچوونەکانتان دەربارەی ناوەڕۆکی کتێبەکە بۆ نووسـەران و، شـێوە و ئاسـتی وەرگێرانەکە بۆ بەندە، بەم ناونیشانە ئەلیکترۆنییە، بنێرن.

hoshyars@hotmail.com

**هۆشیار سیوەیلی**

# پێشەکی لە لایەن نووسەرانەوە

ئەم کتێبە دەربارەی جیاوازییە گەورەکانی داهات و ئاستی ژیانە، کە وڵاتە دەوڵەمەندەکانی وەك ویلایەتە یەکگرتوەکان و بەریتانیای مەزن و ئەڵمانیا جیادەکاتەوە لە وڵاتە هەژارەکانی وەکو ئەوانەی دەکەونە باشووری بیابانی ئەفریقا و ناوەڕاستی ئەمەریکا و باشووری ئاسیا.

لە کاتێك دا ئێمە ئەم پێشەکییە دەنووسین، باکووری ئەفەریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەهۆی (بەهاری عەرەبی)یەوە تووشی هەژان بوون کە بە شۆڕشی یاسەمین دەستیپێکرد و لەسەرەتا دا لە ڕێگەی خۆسوتاندنی دەسگێڕێکەوە کە ناوی موحەمەد بوئەزیزی بوو لە ١٧ کانونی یەکەمی ٢٠١٠ دا کڵپەیسەند. لە ١٤ کانونی دوەم دا سەرۆك زەین ئەلعابدین بن عەلی، کە لە ساڵی ١٩٨٧ ەوە حوکمی تونسی دەکرد، وازی لە دەسەڵات هێنا، بەڵام شۆڕش خاونەبۆوە. تینی شۆڕشگێڕی دژی حوکمی نوخبە ماف تایبەتەکە لە تونس گەرمتربوو تا گەیشتە وڵاتەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. حوسنی موبارەك کە بۆ ماوەی سی ساڵ بە چەپۆکی قورس حوکمی میسری کرد لە ١١ ی شوباتی ٢٠١١ دا لابرا. چارەنووسی ڕژێمەکانی بەحرەین و لیبیا و سوریا و یەمەن لە کاتی نووسینی ئەم پێشەکیەدا دیار نییە.

ڕیشەی ناڕەزاییەکان لەم وڵاتانەدا لە هەژارییانەوە سەرچاوەدەگرێ. کەسێکی مامناوەندی میسر ئاستی داهاتی تەنیا ١٢٪ ی داهاتی هاوڵاتییەکی مامناوەندی ویلایەتە یەکگرتوەکانە و وا چاوەڕێدەکا دە ساڵ کەمتر بژی. ٢٠٪ ی دانیشتوانی میسر لە هەژاری تەواودا دەژین. هەرچەندە ئەم جیاوازییانە گەورەن بەڵام هێشتا زۆر بچووکن گەر بەراووردی ویلایەتە یەکگرتوەکان لەگەڵ هەژارترین وڵاتی دنیای وەك کۆریای باکوور و سیارا لیۆن و زیمبابۆی دا بکەین کە نیوەی دانیشتوانیان لە هەژاری دا دەژین.

بۆچی میسر بەو ئەندازەیە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان هەژارترە؟ ئەو تەگەرانە چین کە نەیانهێشتوە میسر ببێتە وڵاتێکی دەوڵەمەند؟ ئایا هەژاری میسر هەمیشەییە یان دەکرێ لە ناوببرێ؟ ڕێگایەکی سروشتی بۆ سەرەتای بیرکردنەوە دەربارەی ئەمە، ئەوەیە کە گوێ لە میسرییەکان خۆیان بگرین و

بـزانین چـی دەڵـێن دەربـارەی ئـەو كێـشانەی دووچـاری بـوون و بۆچـی دژی ڕژێمەكەی موبارەك ڕاپەڕین. نۆحا حەمیـد تەمـەن بیـست و چـوار سـاڵ كـە لـە ئاژانـسێكی ڕێكـلام لـە قـاهیرە كـار دەكـا لـە كاتێـك دا لـە مەیـدانی تـەحریر خۆپیشاندانیدەكرد بۆچونەكانی خۆی بەم شێوەیە خستە ڕوو (ئێمـە بەدەسـت گەنـدەڵی و چەوسـاندنەوە و خراپـی خوێندنـەوە دەنـاڵێنین. لـە ناوچەرگـەی سیـستەمێكی گەنـدەڵ دا دەژیـن كـە پێویـستە بگـۆڕێ). یـەكێكی تـر لـە مەیدانەكەدا، موسعەب ئەلشامی كە تەمەنی بیست ساڵە و خوێندكاری كۆلێجی دەرمانسازییە، هاوڕا بوو ( هیوادارم لە كۆتایی ئەمساڵ دا بتوانین حكومـەتێكی هەڵبژێراومان هەبێ و ئازادییە گەردوونییەكان جێبەجێبكرێن و بتـوانین كۆتـایی بەو گەندەڵییە بهێنین كـە لـە وڵات دا بڵاوبۆتـەوە). خۆپیـشاندەرانی مەیـدانی تـەحریر هـەموویان بـە یـەك دەنـگ دژی گەنـدەڵی حكومـەت و بێتوانـایی لـە دابینكردنـی خزمەتگوزارییـە گـشتییەكان و نـەبوونی دەرفـەتی یەكـسان لـە وڵاتەكـەیان دا قـسەیان كـرد. ئـەوان بەتایبـەتی دەربـارەی سـەركوتكردن و نـەبوونی مـافی سیاسـی سـكالایان كـرد. هـەروەك موحومـەد ئەلبـەرادعی دایرێكتەری پێشووی ئاژانسی نێودەوڵەتی ووزەی ئەتۆمی لە ١٣ كانونی دوەمی ٢٠١١ دا لەسـەر تویتـەر نوسـیویەتی ( تـونس: سـەركوتكردن + نـەبوونی دادی كۆمەلایەتی + نەبوونی كەناڵەكانی گۆڕانكاری ئاشتییانە = بۆمبی تەوقیتكراو). میـسرییەكان و تونـسیەكان گەیـشتبوونە ئـەو بڕوایـەی كـە هۆكـاری كێـشە ئابوورییەكانیان لە بنەڕەت دا دەگەڕێتەوە بـۆ نـەبوونی مـافی سیاسـی. كاتێـك خۆپیـــشاندەران بـــە شـــێوەیەكی زیـــاتر سیـــستەماتیكی كەوتنـــە دارشـــتنی داخوازییەكانیان، دوازدە داخوازییە هەرە گرنگەكانیان لـە لایـەن وائـل خـەلیل، ئەندازیاری سۆفتوێر و ڕێكخەری زانیاری نـاو وێبـسایتەكان كـە وەك یـەكێك لـە سـەركردەكانی بزووتنـەوەی نـاڕەزایی میـسریەكان دەركـەوت، بڵاوكرایـەوە، هـەموویان جـەختیان لـە گۆڕانكـاری سیاسـی دەكـردەوە. بابەتـەكانی وەك زیادكردنی كەمترین كرێ، وەك داخوازییە لاوەكییەكان دەخرانە ڕوو كە دەبوایە دواتر جێبەجێبكرێن.

بەلای میسرییەكانەوە، هۆكاری دواكەوتنیان بریتییە لـە بـوونی دەوڵـەتێكی بێتواناو گەندەڵ و كۆمەڵگایەك كـە تیایدا نـاتوانن سـوود لـە بـەهرە و تمـوح و داهێنانـەكانیان وەربگـرن و تیایـدا نـاتوانن ئـەو پەروەردەیـەی دەیانـەوێ بەدەستیبهێنن. لـە هـەمانكات دا، ئـەوان تێدەگـەن كـە ڕیـشەی ئـەم كێـشانە هـەموویان سیاسـین. هـەموو ئـەو كارەسـاتە ئابوورییانـەی ئـەوان دووچـاری

بوونەتەوە لەوەوە سەرچاوەدەگرن کە دەسەڵاتی سیاسی لە میسر چۆن پیادە دەکرێ و چۆن لە لایەن نوخبەیەکی کەمەوە قۆرخ کراوە. ئەمەی ئەوان دەرکییپێدەکەن یەکەم شتە کە دەبێ بگۆڕێ.

ئەم شێوە بیرکردنەوەیەی خۆپیشاندەرانی مەیدانی تەحریر زۆر جیاوازە لە بۆچوونە تەقلیدییەکان. کاتێك خاوەنی بۆچوونە تەقلیدییەکان هۆکاری هەژاری وڵاتێکی وەك میسر شیدەکەنەوە، زۆربەی ئەکادیمی وچاودێران باسی فاکتەری جیاواز دەکەن. هەندێکیان پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە هەژاری میسر بە شێوەیەکی سەرەکی بە هۆی پێگە جوگرافیەکەیەتی، ئەمەش لەبەر ئەو ڕاستییەیە کە زۆربەی ناوچەکانی وڵاتەکە بیابانن و بارانی تەواویان نییە و گڵ و کەشەکەی بواری کشتوکاڵێکی بەرهەمدار نارەخسێنن. کەسانی تر هۆکاری ئەم هەژارییە بۆ دیاردە کەلتوورییەکان دەگێڕنەوە کە گوایە ڕێگرن لەبەردەم پەرەپێدانی ئابووری و خۆشگوزەرانی دا. میسرییەکان، هەروەك ئەوان دەڵێن، ئەو ئاکاری کارکردن و سیفاتی کەلتوورییانەیان نییە کە بوونەتە هۆی ئەوەی نەتەوەکانی تر دەوڵەمەند بن و لە بری ئەوە پەیڕەوی باوەڕە ئیسلامییەکانیان دەکەن کە لەگەڵ سەرکەوتنی ئابووری دا یەکناگرنەوە. بۆچوونی سێیەم، کە لە ناو ئابوریناسان و ڕەخنەگرانی بواری دانانی پۆلیسی دا زاڵە، ئەوەیە کە فەرمانڕەوایانی میسر نازانن ڕێگەی دروست بگرنە بەر بۆ ئەوەی وڵاتەکانیان خۆشگوزەران بن و لە ڕابوردوودا پەیڕەوی پۆلیسی و ستراتیژی هەڵەیان کردوە. ئەگەر ئەم فەرمانڕەوایانە ئامۆژگاری دروست لە ڕاوێژکارانی دروستەوە وەربگرن، ئەوا خۆشگوزەرانی دێتە دی. لای ئەم ئەکادیمی و ڕەخنەگرانە، ئەو ڕاستییەی کە میسر لە لایەن نوخبەیەکی بچووکەوە حوکمکراوە و لە سەر حسابی کۆمەڵگا هێلانەکانیان دەڕازێننەوە، پەیوەندی نییە بە کێشە ئابوورییەکانی وڵاتەوە.

لەم کتێبەدا ئێمە پێ لەسەر ئەوە دادەگرین کە میسرییەکانی مەیدانی تەحریر نەك ئەکادیمی و شیکارەکان خاوەنی ئایدیای دروستن. لە ڕاستیدا هۆکاری هەژاری میسر ئەوەیە کە لە لایەن نوخبەیەکی کەمەوە حوکمکراوە کە کۆمەڵگایان بەشێوەیەك ڕێکخستوە تا بەرژەوەندییەکانی ئەوان بپارێزێ لەسەر حسابی زۆربەی هەرەزۆری جەماوەر. دەسەڵاتی سیاسی چڕکراوەتەوە و بەکارهێنراوە بۆ کەڵەکەکردنی سامان بۆ ئەوانەی ئەم دەسەڵاتەیان قۆرخ کردوە، هەروەك ئەو حەفتا ملیارد دۆلار سامانەی کە پێدەچێ لە لایەن موبارەکی سەرۆکی پێشووەوە کۆکرابێتەوە. دۆڕاوەکانیش گەلی میسرن،

هەروەك بۆخۆیان ئەمە چاك تێدەگەن.

ئێمە ڕوونیدەکەینەوە کە ئەم لێکدانەوەیە بۆ هەژاری میسر کە لێکدانـەوەی خەڵکەکەیە، دەکرێ وەك لێکدانەوەیەکی گشتی بەکاربهێنرێ کە بۆچی وولآتانی هەژار، هەژارن. ئەگەر کۆریای باکوور بێ یان سیارا لیۆن یان زیمبابۆی، ئـەوە ڕووندەکەینەوە کـە وولآتـانی هـەژار هـەژارن لەبـەر هـەمان ئـەو هۆکارانـەی کـە بوونەتـە هـۆی هـەژاری میـسر. بـەریتانیای مـەزن و ویلایەتـە یـەکگرتوەکان دەوڵەمەندبوون چونکە هاوڵاتییەکانیان ئەو نوخبەیەیان لە سەر تـەخت لادا کـە کۆنترۆڵی دەسەڵآتیان کردبوو، لە جێگەی ئەمانە کۆمەڵگایەکیان پێکەوە نا کـە تێیدا مافە سیاسییەکان زۆر فراوانتر دابەشکران و حکومەت زیاتر بەرپرسیار و زیـاتر وەڵامـدەرەوەی هاوڵاتییـان بـوو. لـەم کۆمەڵگایەنـەدا جـەماوەر توانیـان سوود لە دەرفەتە ئابوورییەکان وەربگرن. ئێمە ڕوونیدەکەینەوە کە بۆ ئـەوەی لەم نایەکسانییەی ئەمڕۆی جیهان تێبگەین پێویستە بۆ ڕابوردوو بگەڕێینـەوە و لە داینامیکە مێژووییەکانی کۆمەڵگاکان بکۆڵینـەوە. لـەم کتێبـەدا دەبینـین کـە هۆکاری ئەوەی بەریتانیا لە میسر دەوڵەمەند تـرە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کـە بـەریتانیا (یـان ڕاسـتر ئینگلتـەرە) لـە سـاڵی ١٦٨٨ دا شۆڕشـی بـەرپاکرد کـە گۆڕانکاری لە سیاسەت و دواتریش ئابووری نەتەوەدا ئەنجامدا. خەڵك خەباتیان کرد بۆ بەدەستهێنانی مافی سیاسی زیـاتر و ئـەو مافانـەیان بەدەسـتهێنا و بـۆ فراوانکردنی دەرفەتە ئابوورییەکانیان بەکاریانهێنان. ئەنجامەکەی بریتیبـوو لـە هێنانـەئارای ڕێڕەوێکـی تـەواو جیـاوازی سیاسـی و ئـابووری کـە بـە شۆڕشـی پیشەسازی کۆتاییهات.

شۆڕشی پیشەسازی و ئـەو تەکنەلۆجییایانـەی ئـەم شۆڕشـە هێنانیـەئاراوە نەگەیشتنە میـسر چـونکە ئـەو کاتـە میـسر لـە ژێـر کـۆنترۆڵی ئیمپراتۆریـەتی عوسمانی دا بوو کە بە هەمان ئەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ دا دەکرد کـە دواتـر موبارەك کردی. دەسەڵآتی عوسمانییەکان لە لایەن ناپۆلیۆن بۆناپارت لە ساڵی ١٧٩٨ دا لـەناوبرا، بـەڵآم دواتـر وولآتەکـە کەوتـە بندەسـتی کۆلۆنیـالیزمی بەریتانییەوە کە بە هەمانشێوەی عوسمانییەکان بەرژەوەندییـەکی ئـەوتۆی لـە هێنانەدی خۆشگوزەرانی میسردا نەبوو. هەرچەندە میسرییەکان ئیمپراتۆریەتی عوسمـانی و بـەریتانییان هینایـە لـەرزەو لـە سـاڵی ١٩٥٢ دا سیـستەمی پاشایەتییان لەناوبرد، بەڵآم ئەم شۆڕشانە وێنـەی شۆڕشـی ئینگلتـەرای سـاڵی ١٦٨٨ نـەبوون و لـە بـری ئـەوەی بـە شـێوەیەکی بنـەڕەتی سیاسـەتی میـسر بگـۆڕن، نوخبەیـەکی تریـان هینایـە سـەر حـوکم کـە هێنـدەی عوسمـانی و

بەریتانییەکان نامۆ بوون بە هێنانەدی خۆشگوزەرانی بۆ هاوڵاتییانی ئاسایی میسر. لە ئاکام دا هەیکەلی بنەڕەتی کۆمەڵگا گۆڕانکاری بەسەردا نەهات و میسر بە هەژاری مایەوە.

لەم کتێبەدا باسی ئەوە دەکەین کە چۆن ئەم شێوازانە بە درێژایی کات خۆیان بەرهەمدەهێننەوە و بۆچی هەندێجار دەگۆڕرێن، هەروەك لە ئینگلتەرە لە ساڵی ١٦٨٨ و لە فەرەنسا بەهۆی شۆڕشی ساڵی ١٧٨٩ ەوە ڕوویاندا. ئەمە یارمەتیمان دەدا تا تێبگەین ئایا بارودۆخەکەی میسر ئەمڕۆ گۆڕانکاری بەسەردا هاتوە و ئایا ئەو شۆڕشەی کۆتایی بە دەسەڵاتی موبارەك هێنا دەبێتە هۆی هێنانەدی کۆمەڵە دەزگایەکی ئەوتۆ کە بتوانن خۆشگوزەرانی بۆ خەڵکی ئاسایی میسر مسۆگەر بکەن. میسر لە ڕابوردوودا شۆڕشی بەرپاکردوە کە نەیانتوانیوە هیچ شتێك بگۆڕن چونکە ئەوانەی شۆڕشەکانیان بەرپاکردوە هاتوونەتە جێگەی ئەوانەی لەسەر تەخت لابراون و سیستەمی هاوشێوەیان دروستکردۆتەوە. لە ڕاستیدا هەرچەندە زەحمەتە هاوڵاتییانی ئاسایی بتوانن دەسەڵاتی سیاسی ڕاستەقینە بەدەستبهێنن و ئەو شێوازەی کۆمەڵگاکانیان لەسەری دەڕۆن بگۆڕن، بەڵام دەکرێ ئەمە ئەنجامبدرێ هەروەك دەبینین چۆن لە ئینگلتەرە و فەرەنسا و ویلایەتە یەکگرتوەکان و هەروەها لە یابان و بۆتسوانا و بەڕازیل دا ئەنجامدرا. لە بنەڕەت دا، گۆڕنکاری سیاسی لەم چەشنە پێویستە بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەکی هەژار دەوڵەمەند ببێ. بەڵگەی ئەوتۆ لە ئارادان کە ڕەنگە ئەمە لە میسر ڕوویدا. ڕەعدە متەولی کە خۆپیشاندەرێکی تری مەیدانی تەحریرە ووتی (ئێستا موسڵمان و مەسیحییەکان پێکەوە دەبینی، ئێستا پیر و لاوەکان پیکەوە دەبینی، هەموویان هەمان شتیان دەوێ). دواتر دەبینین کە ئەم جۆرە بزووتنەوە فراوانە لە کۆمەڵگادا کلیلی سەرەکی بوو لە ئاڵوگۆڕە سیاسییەکانی تردا. ئەگەر تێبگەین کەی و بۆچی ئەم گواستنەوانە ڕوو دەدەن ئەوا لە پێگەیەکی باشتردا دەبین بۆ هەڵسەنگاندنی ئەوەی کەی چاوەڕێی شکستهێنانی ئەم بزووتنەوانە بکەین هەروەکو چۆن لە ڕابوردوودا ڕویداوە و کەی هیوای سەرکەوتنیانمان لا دروستببێ و بتوانن ژیانی ملیۆنان کەس بگۆڕن.

١

# هێندە نزیك و لەگەڵ ئەوەش دا هێندە جیاواز

## ئابوورییەکانی ڕیۆ گراندی

شاری نۆگاڵس بەهۆی شورایەکەوە کراوەتە دوو کەرت. ئەگەر لە تەنیشت ئەم شورایەوە ڕابوەستی و سەیری باکوور بکەیت، ئەوا نۆگاڵس، ئەریزۆنا دەبینی کە دەکەوێتە ناوچەی سانتاکروز. داهاتی خێزانێکی مامناوەندی لەوێدا لە ساڵێکدا نزیکەی ٣٠,٠٠٠ دۆلارە. زۆرینەی گەنجەکان لە قوتابخانەن و زۆربەی پێگەیشتوەکانیش دەرچوانی قوتابخانەی ئامادەیین. سەرەڕای هەموو ئەو ئارگیومێنتانەی خەڵك دەربارەی کەموکوڕییەکانی سیستەمی تەندروستی ویلایەتە یەکگرتوەکان دەیکەن، دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بە شێوەیەکی ڕێژەیی تەندروستییان باشە و تەمەنیان بە پێی ستانداردە جیهانییەکان درێژە. ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان لەسەروو تەمەنی شەست و پێنجساڵن و خزمەتگوزاری تەندروستییان بۆ دابینکراوە. ئەمەش تەنیا یەکێکە لەو خزمەتگوزارییانەی تری وەکو کارەبا و تەلەفۆن و سیستەمی ئاوەڕۆ و تەندروستی گشتی و تۆڕی ڕێگاوبان کە بە شارەکانی تری ناوچەکەو بەشەکانی تری ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە دەیانبەستێتەوە. هەموو ئەمانەش لە لایەن حکومەتەوە دابینکراون و خەڵکیش بە بێمنەتی سەیریان دەکەن. خەڵکی نۆگاڵس، ئەریزۆنا دەتوانن چالاکی ڕۆژانەی خۆیان ئەنجامبدەن بێئەوەی لە ژیان و سەلامەتی خۆیان بترسن و بە شێوەیەکی بەردەوام نیگەران نین لە دزی و زەوتکردن و شتی تری لەم چەشنە کە ڕەنگە هەڕەشە لە وەبەرەهێنان ولە بزنسەکانیان و خانوەکانیان بکا. بە هەمان گرنگییەوە کە خەڵکی نۆگاڵس بە بێمنەتی سەیری دەکەن، ئەوەیە کە حکومەت، سەرەڕای کەموکوڕی و گەندەڵی ناوبەناو، نوێنەری دانیشتوانی نۆگاڵس، ئەریزۆنایە. دانیشتوانی نۆگاڵس، ئەریزۆنا دەتوانن دەنگ بدەن بۆ گۆڕینی پارێزگارەکەیان و ئەندامی کۆنگرێس

و ئەنـدامی ئەنجوومـەنی پیرانیـان، لـە هەڵبژاردنـەکانی سـەرۆکایەتیدا دەنـگ دەدەن بۆ دیاریکردنی ئەو کەسەی سەرکردایەتی وولاتەکەیان دەکا. لای ئـەوان دیموکراسی پرسی دوەمە.

ژیان لـە بەشـی باشـووری شـوراکەوە و لـە دووری تـەنیا چـەند پێیەکـەوە، جیاوازە. هەرچەندە دانیشتوانی نۆگالس، سۆنۆرا لە چاو ناوچەکانی تـر دا، لـە ناوچەیەکی خۆشگوزەرانی مەکسیك دا دەژین، داهـاتی خێزانێکـی مامناوەنـدی نزیکـەی سـێ یـەکی داهـاتی خێزانێکـی نۆگـالس، ئەریزۆنایـە. زۆربـەی پێگەیشتوەکان لە نۆگـالس، سـۆنۆرا دەرچـوانی قوتابخانـەی ئامـادەیی نـین و ژمارەیەکی زۆر لە گەنجان لە قوتابخانـە نـاخوێنن. دایکـان نیگـەرانن بەرامبـەر رێـژەی بـەرزی مردنـی منـدالانیان. خراپـی بـارودۆخی تەندروسـتی گشتی بـە جۆرێکە کە جێگەی سەر سوڕمان نییە دانیـشتوانی نۆگـالس، سـۆنۆرا هێنـدەی دراوسـێکانی باکووریـان نـاژین. لـە هـەمانکات دا سـوود لـە خزمەتگوزارییـە گـشتییەکان وەرنـاگرن: لـە بەشـی باشـووری شـوراکەدا رێگاکـان لـە بـارێکی خراپـدان و پـەیڕەوی یاسـا و پاراسـتنی ئاسـایش لـە خـراپترین بارودۆخدایـە. تاوانکردن لە ئاستێکی بەرزدایە و دامەزراندنی بزنس چالاکییەکی پڕمەترسـییە. تەنیا ڕووبـەڕووی تـالانکردن نابیتـەوە بـەڵکو وەرگرتنـی مۆڵـەت و چـەورکردنی دەمەکان تەنیا بۆ دامەزرنـدنی بزنـسێك تەقەلایـەکی ئاسـان نییـە. دانیـشتوانی نۆگالس، سۆنۆرا ڕۆژانە لەگەڵ گەندەڵی و بێتواناییی سیاسییەکان دا دەژین.

بە پێچەوانەی دراوسێکانی باکووریانەوە، دیموکراسی بۆ ئەوان ئەزموونێکی نوێیـە. هـەتا چاکسازییە سیاسـییەکانی سـاڵی ٢٠٠٠، نۆگـالس، سـۆنۆرا بـە هەمانـشێوەی ناوچـەکانی تـری مەکسیك لـە ژێـر دەسـەڵاتی گەنـدەڵی پـارتی دەستووری شۆڕشگێڕ (PRI) دا بوو.

ئایا چۆن دوو نیوەی لە بنەڕەت دا هەمان شار تا ئەم ئەندازەیە لە یـەکتری جیاوازن؟ لە ڕووی جوگرافیا و ئاووهەواو ئەو جۆرە نەخۆشیانەی لە ناوچـەکەدا بـڵاون هـیچ جیاوازییـەك لـە نێوانیـان دا نییـە، هەرچـەندە میکرۆبـەکان لـە پەڕینەوەی سنووری نێـوان ویلایەتـە یـەکگرتوەکان و مەکسیك دا بـەرەوڕووی هیچ بەربەستێك نابنەوە، بەڵام بـارودۆخی تەندروسـتی نێوانیـان زۆر جیـاوازە، ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە ژینگەی نەخۆشییەوە نییە. ئەم بارودۆخە خراپەی تەندروستی لە باشوور لەبەر ئەوەیە خەڵکی باشووری سنوورەکە لە بـارودۆخی

نەبوونی ئاوی پاك و کەمی چاودێری تەندروستی دا ژیان بەسەر دەبەن.

لەوانەیە دانیشتوانی ئـەم دوو بەشـە زۆر لـە یـەکتر جیـاواز بـن. ئایـا لەبـەر ئەوەیە کە دانیـشتوانی نۆگالس، ئـەریزۆنا نـەوەی ئەوانـەن کـە لـە ئـەوروپاوە کۆچیانکردوە، لە کاتێك دا ئەوانەی لە باشوور دا دەژیـن نـەوەی ئازتێکـەکانن؟ بەم شێوەیە نییـە. باکگراونـدی ئـەو خەڵکـەی لـە هـەردوو دیـوی سـنوورەکەدا دەژین زۆر لەیەك دەچێ. دوای ئەوەی مەکسیك لە ساڵی ١٨٢١ دا سـەربەخۆیی خـۆی لـە ئیـسپانیا وەرگـرت، ئـەو ناوچـەیەی دەکەوێتـە دەوری (لـۆس دۆس نۆگالس) بەشێك بوو لە دەوڵـەتی (ڤایخـا کالیفۆرنیـا)ی مەکـسیکی و هـەر بـەم شێوەیەش مایەوە تەنانەت دوای جەنگی نێـوان ئەمـەریکاو مەکسیکی سـاڵانی ١٨٤٦ـ١٨٤٨. لـە ڕاسـتدا تـەنیا دوای کڕینەکـەی گادسـدن لـە سـاڵی ١٨٥٣ دا سنووری ویلایەتە یەکگرتوەکان بەرەو ئەم ناوچەیە درێژکرایەوە. ئەوە ئەفسەر ن. میچڵەر بوو کە لە کاتی ڕووپێـوکردنی سـنوورەکەدا تێبینـی بـوونی " دۆڵـە جوانەکەی لۆس نۆگالس"ی کرد. لێرەدا لە هەردوو دیوی سنوورەکەوە دووشار بەرز بوونەوە. دانیشتوانی نۆگالس، ئەریزۆنا و نۆگالس، سۆنۆرا خاوەنی هەمان باووباپیرانن و حەزیان لە هەمان خواردن و هەمان مۆسیقایە و چاوقایمیە گـەر بڵێین خاوەنی هەمان کەلتوورن.

بێگومان لێکدانەوەیەکی ساکارو ئاشکرا هەیە بۆ بـوونی ئـەم جیاوازییـە لـە نێوان دوو نیوەکەی نۆگالس دا کە لەوانەیە لە مێژە هەستتان پێکردبێ. ئەویش ئەو سنوورەیە کە ئەم دوو نیوەیەی لە یەکتر جیاکردۆتەوە. نۆگالس، ئـەریزۆنا لە ناو ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکادایە و دانیشتوانەکەی سـوود لـە دەزگـا ئابوورییـەکانی ویلایەتـە یـەکگرتوەکان وەردەگـرن کـە دەرفـەتی هەڵبـژاردنی کاریان بە شێوەیەکی ئازاد بۆ دەڕەخسێنێ و دەتوانن لە قوتابخانـە بخـوێنن و بەهرەی پێویست بەدەستبهێنن و هانی خاوەنکارەکانیان دەدا وەبـەرهێنان لـە بەدەسـتهێنانی باشـترین تەکنـەلوجیادا بکـەن کـە لـە ئەنجامـدا دەبێتـە هـۆی زیادکردنی موچەکانیان. لە هەمانکات دا بەشدارن لەو دەزگـا سیاسـییانەدا کـە دەرفـەتی بەشـداربوونیان لـە پرۆسـەی سیاسـییدا بـۆ دەڕەخـسێنن تـا نوێنەرەکانیان هەڵبژێرن و هـەرکاتێکیش ئـەو نوێنەرانـە بـە شـێوەیەکی خـراپ ڕەفتاریان کرد بیـانگۆڕن. لـە ئـەنجامی ئەمـەدا، سیاسـییەکان خزمەتگوزارییـە گرنگەکانی وەکو تەندروستی گشتی و ڕێگا و جێبەجێکردنی یاسا و پاراستنی

ئاسـایش کـە هاوڵاتییـان داوای دەکـەن، دابیندەکـەن. دانیـشتوانی نۆگـاڵس، سـۆنۆرا هێنـدە بەختـەوەر نـین. ئـەوان لـە جیهـانێکی جیـاوازدا دەژیـن کـە دەزگایـانی جیـاواز دروسـتیکردوە. ئـەم دەزگـا جیاوازانـە هانـدانی جیـاواز بـۆ دانیـشتوانی هــەردوو نۆگـاڵس و ئـەو کـارزان (entrepreneurs ) و خـاوەن بزنسانەی دەیانەوێ لـەم دوو بەشـەدا وەبـەرهێنان بکـەن، دروسـتدەکەن. ئـەم هاندانانە کە لە لایەن دەزگا جیاوازەکانی هـەردوو نۆگـاڵس و ئـەو دوو وڵاتـەی هــەردوو نۆگاڵـسی تێکــەوتوون، پێکهێنــراون، هۆکــاری ســەرەکی جیــاوازی خۆشگوزەرانین لە هەردوو دیوی سنوورەکەوە.

بۆچــی دەزگاکــانی ویلایەتــە یــەکگرتوەکان زیــاتر زەمینەخۆشــکاری سـەرکەوتنی ئـابوورین بـە بـەراوورد لەگـەڵ ئەوانـەی مەکەسـیك و بـە هـەمان پێوەریش لەگەڵ هەموو ئەمەریکای لاتین دا؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لە شـێوازی پێکهــاتنی ئــەم دوو کۆمەڵگایــەدا لەســەردەمی کــۆنی کۆلۆنیاڵییــەوە سەرچــاوەدەگرێ. جیابوونــەوەی دەزگاکــان لــەو کاتــەوە هاتــەئاراوە و کاریگەرییەکەی تا ئەمڕۆش بەردەوامە. بۆ ئەوەی لەم جیابوونەوەیە تێبگـەین، پێویستە هەر لـە دامەزرانـدنی کۆلۆنییـەکانی بـاکووری ئەمـەریکا و ئەمـەریکای لاتینەوە دەستپێبکەین.

## دامەزراندنی بۆینس ئایرس

لە سەرەتای ساڵی ١٥١٦ دا، دەریاوانی ئیسپانی (خوان دیـاز دی سـۆلیس) بـەرەو ڕێژگـە (estuary)یـەکی بـەرین لـە کـەنارەکانی ڕۆژهـەڵاتی باشـووری ئەمـەریکا کەوتـەڕێ. کاتێـك گەیـشتە ووشـکانی، دی سـۆلیس ئـەو زەوییانـەی خستە ژێر ڕکێفی ئیسپانیاوە و ڕووبارەکەی ناونا ڕیۆ دی پلاتـا (ڕووبـاری زیـو) چونکە خەڵکی ناوچەکە خاوەنی زیو بوون. دانیـشتوانە خۆماڵییەکـەی هـەردوو دیوی ڕێژگەکە ـ چاروەس کە ئۆرۆگوای ئێستایە و کیۆڕاندی ناو دەشـتەکان کـە دواتر ناونرا پامپـاس لـە ئەرجـەنتینی ئـەمڕۆدا ـ هەڵوێـستیان بەرامبـەر خەڵکـە نوێیەکە دوژمنکارانە بوو. ئەم خەڵکـە ناوچـەییانە کەسـانی ڕاوچـی بـوون و لـە گرووپی بچووك دا دەژیان بەبێ بوونی دەسەڵاتێکی ناوەندی بەهێز. لـە ڕاسـتیدا هەر ئەم تاقمەی چارواسەکان بوو کە دی سۆلیس یان کوشت لـە کاتێـك دا لـەو

ناوچە نوێیانەدا دەگەڕا کە دەیوست داگیریان بکا بۆ ئیسپانیا.

لە ساڵی ١٥٣٤ دا ئیسپانییەکان کە هێشتا گەشبینبوون، یەکەم گروپی نیشتەکارانیان لە ئیسپانیاوە لە ژێر سەرکردایەتی پێدرۆ دی مێندۆزا ڕەوانە کرد. لە هەمان شوێنی بۆینس ئایرس دا و لە هەمان ساڵ دا شارێکیان دروستکرد. دەبوایە ئەم شوێنە بۆ ئەورووپییەکان شوێنێکی نموونەیی بوایە. بۆینس ئایرس کە مانای (هەوایەکی خۆش) دەگەیەنێ خاوەنی ئاوو هەوایەکی خۆش و سازگار بوو. لەگەڵ ئەمەش دا گەشتی یەکەمی نیشتەکارانی ئیسپانیا تەمەن کورت بوو. ئەوان بە دوای هەوای خۆش دا نەدەگەڕان، بەڵکو بەدوای سامانی سروشتی دا دەگەڕان دەریبهێنن و بەدوای کرێکاران دا دەگەڕان بیانچەوسێننەوە. چارواس و کیۆڕاندییەکان ملیان بۆ ئەمە نەدا. کاتێك لە لایەن ئیسپانییەکانەوە بە دیل دەگیران، ئامادە نەبون خۆراکیان بۆ دابینبکەن و کاریان بۆ بکەن. ئەوان بە تیرو کەوانەکانیان هێرشیاندەکردە سەر شوێنی نیشتەکاران. لەبەر ئەوەی ئیسپانییەکان چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکرد بۆخۆیان خۆراکی خۆیان دابینبکەن، تووڕەبوون. بۆینس ئایرس ئەو شوێنە نەبوو کە خەونیان پێوە دەبینی. نەدەکرا خەڵکی ناوچەکە ناچار بکرێن بەزۆر کاریان بۆ بکەن و ناوچەکە خاوەنی ئاڵتوون و زیو نەبوو، ئەو زیوەی کە دی سۆلیس لە سەرەتادا دۆزییەوە لە ڕاستی دا لە ناوچە دوورەکانی دەوڵەتی ئینکا لە زنجیرە چیاکانی ئەندیز هێنرابوون کە کەوتبوە ناوچە دوورەکانی ڕۆژئاواوە.

لە کاتێك دا ئیسپانییەکان هەوڵیان دەدا ژیانی ڕۆژانە بەرنە سەر، دەستیان کرد بە هەڵمەتی گەڕان بۆ دۆزینەوەی جێگای نوێ کە دەوڵەمەندتر بێ و خاوەن دانیشتوانی ئەوتۆ بێ ناچاری کارکردن بکرێن. لە ساڵی ١٥٣٧ دا یەکێك لەم هەڵمەتانە بە سەرکردایەتی خوان دی ئەیۆلاس، لە کاتێك دا بە دوای ڕێگایەك دا دەگەڕا تا بیگەیەنێتە ناوچەی ئینکا، چوە ناو قووڵایی ناوچەکانی ڕووباری پارانێ. لە ڕێگای دا تووشی گوارانییەکان بوو، کە خەڵکێکی نیشتەجێ و خاوەن ئابوورییەکی کشتوکاڵی پشتبەستوو بە بەرهەمی گەنمەشامی و کاساڤا بوون. هەر زوو دی ئەیۆلاس بۆی دەرکەوت کە گوارانییەکان خەڵکێکی تەواو جیاواز بوون لە چاریۆس و کیۆراندییەکان. دوای ململانێیەکی کەم ئیسپانییەکان بەسەر بەرگرییەکانی گوارانییەکان دا سەرکەوتن و شارێکیان دروستکرد بە ناوی نیۆسترا سێنۆرا کە تائێستاش پایتەختی پەرەگوایە.

داگیرکاران کەوتنە هێنانی شازادەخاتوونەکانی گوارانییەکان و بە خێرایی وەك ئەریستۆکراتی نوێ نیشتەجێبوون. لە ژێر بالآدەستی خۆیان دا، پێداچوونەوەیان بۆسیستەمە باوەکانی ئەو کاتەی کارکردنی زۆرملێ و سەرانەی گوارانییەکان کرد. ئەمە ئەو جۆرە کۆلۆنییە بوو کە دەیانویست دایبەمەزرێنن. لە ماوەی چوار ساڵ دا بۆینس ئایرس چۆڵکراو هەموو ئەو ئیسپانییانەی لەوێ دا نیشتەجێبووبوون بەرەو شارە نوێیەکە کۆچیانکرد.

بۆینس ئایرس (پاریسی باشووری ئەمەریکا)، کە شارێکی خاوەن بلوڤاردی فراوانی شێواز ئەوروپی و پشتی بە سامانی کشتوکاڵی پامپا بەستوە، تا ساڵی ١٥٨٠ ئاوەداننەکرایەوە. چۆڵکردنی بۆینس ئایرس و داگیرکردنی ناوچەی گوارانی لۆجیکی بەکۆلۆنیکردنی ئەمەریکا لە لایەن ئەوروپییەکانەوە دەردەخا. ئیسپانییە کۆلۆنیستەکان و هەروەك دواتر دەبینین، ئینگلیزەکان نەیاندەویست بۆخۆیان زەوییەکان بکێڵن، بەڵکو دەیانویست خەڵکی تر ئەوەیان بۆ بکەن و ئەوانیش خەزنە و ئاڵتوون و زیو بە تاڵان بەرن.

## لە (کاخامارکا) وە

هەڵمەتەکانی دی سۆلیس و دی مێندۆزا و دی ئەیۆلاس دوابەدوای هەڵمەتە بەناوبانگترەکانی تر هاتن کە دوای دۆزینەوەی دوورگەی بەهاما لە لایەن کریستۆفەر کۆلۆمبۆسەوە لە ١٢ ی تشرینی یەکەم ی ساڵی ١٤٩٢ ەوە دەستیان پێکردبوو. فراوانبوونی دەسەڵاتی ئیسپانیا و بە کۆلۆنیکردنی ئەمەریکا بە داگیرکردنی مەکسیك لە لایەن هێرنان کۆرتیز لە ساڵی ١٥١٩ دا و هەڵمەتی فرانسیسکۆ پیزارۆ بۆ پیرۆ دەیە و نیوێك دواتر و هەڵمەتی پێدرۆ دی مێندۆزا بۆ ریۆ دی لا پلاتا تەنیا دوو ساڵ دوای ئەوە، بە توندی دەستیپێکرد. لەماوەی سەدەی دواتردا ئیسپانیا زۆربەی ناوچەکانی ناوەڕاست و ڕۆژئاوا و باشووری باشووری ئەمەریکای داگیرکردو کردنیە کۆلۆنی خۆی، لە کاتێك دا پورتوگال بەرازیلی لە ڕۆژهەڵاتەوە خستە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

ستراتیژی ئیسپانیا بۆ بەکۆلۆنیکردن زۆر کاریگەر بوو. ئەم ستراتیژییە بۆ یەکەمجار لە لایەن کۆرتیز لە مەکسیك پەیڕەوکرا. ستراتیژییەکە لەسەر بنەمای ئەو لێکدانەوەیە بوو کە باشترین ڕێگە بۆ زاڵبونی ئیسپانییەکان بە سەر

بەرهەڵستکارییەکاندا بریتیبوو لە بەدیلگرتنی سەرکردە خۆماڵییەکان. ئەم ستراتیژییە بوە هۆی ئەوەی ئیسپانییەکان بتوانن دەستبگرن بەسەر سامانی کەڵەکەبووی سەرکردەکەدا و خەڵکە خۆماڵییەکەش ناچار بکەن خواردن و خزمەتیان پێشکەشبکەن. هەنگاوی داهاتوو بریتیبوو لە خۆسەپاندنیان وەك نوخبەی نوێی کۆمەڵگا خۆماڵییەکە و دەستگرتن بەسەر شێوازەکانی وەرگرتنی باج و سەرانە و بەتایبەتیش کاری زۆرەملێ دا.

کاتێك کۆرتیز و پیاوەکانی لە ٨ ی تشرینی دوەمی ساڵی ١٥١٩ گەیشتنە پایتەختە مەزنەکەی ئازتێك کە پێیان ئەوت (تێنۆچتیتلان)، لە لایەن مۆکتێزۆما، ئیمپراتۆری ئازتێك پێشوازییان لێکرا، دوای ئەوەی لە لایەن ڕاوێژکارەکانییەوە ئامۆگاری کرابوو کە بە شێوەیەکی ئاشتییانە پێشوازی لە ئیسپانییەکان بکا. ئەوەی کە دواتر ڕوویدا بە باشی لەو گێڕانەوەیەدا باسکراوە کە لە دەسنووسە بەناوبانگەکەی قەشەی فرانسیسکی بێرناردینۆ دی ساهاگون، کە دوای ساڵی ١٥٤٥ لە فلۆرەنسا دا کۆکراوەتەوە.

*(ئیسپانییەکان یەکسەر مۆکتێزۆما یان گرت ... دواتر هەریەك لە تفەنگەکان کەوتنە تەقەکردن ... ترس باڵادەست بوو. هەروەك ئەوە وابوو کە هەریەك لەوخەڵکە دڵی خۆی قووت دابێ. تەنانەت پێش ئەوەی تاریك دابێ، ترس و سەرسوڕمان و نیگەرانی ئەو ناوەی گرتبۆوە، خەڵك حەپەسابوو.*

*کاتێکیش دنیا ڕووناك بۆوە هەر زوو هەموو ئەو شتانە ڕاگەیەندران کە ئیسپانییەکان دەیانویستن: نانی سپی، مریشك و قەلی برژاو، ئاوی سازگار، تەختە، داری سووتاندن، خەڵوز ... هەموو ئەمانەش لە لایەن مۆکتێزۆماوە فەرمانی دابیکردنیان درابوو.*

*دوای ئەوەی ئیسپانییەکان بە باشی حەسانەوە، داوایان لە مۆکتێزۆما کرد دەرگای گەنجینەی شاریان بۆ بکاەوە... زۆر بە پەرۆشەوە بە دوای ئاڵتوون دا دەگەڕان. مۆکتێزۆماش پێش ئیسپانییەکان کەوت.. هەموویان چواردەوریان گرت ... هەریەکەیان پەلاماری شوێنێکی دەدا و هەریەکە شوێنێکی دەگرت ...*

*کاتێکیش گەیشتنە گەنجینەکە، لە جێگایەك کە پێیان دەوت تیۆکالکۆ، هەموو شتە بەنرخەکانیان هێنایەدەر، پانکەی سەر، کە بە پەڕی کۆێسالّ دروستکرابوو، قەڵغانەکان، دیسکە ئاڵتوونییەکان ... لووتەوانەی ئاڵتوونی شێوەی مانگ و بەندی ئاڵتوونی قاچ و بەندی ئاڵتوونی قۆڵ و بەندی ئاڵتوونی*

نێوچەوان.

*هەموو ئاڵتوونەکانیان داماڵی ... یەکسەر ئاگریان بەردایە ئەو هەموو شتە ناوازانە و هەموویان سووتاندن. ئاڵتوونەکەشیان توانەوە و لە شێوەی قاڵب دا دایانڕشتنەوە.. ئیسپانییەکان خۆیانکرد بە هەموو شوێنەکان دا ... هەموو شتێکیان برد، هەموو ئەو شتانەی بە لایانەوە باشبوون.*

*دوای ئەوە یەکسەر بەرەو گەنجینەکەی خودی مۆکتیزوما کەوتنەڕێ ... لە کۆشکێك کە پێیان دەوت تۆتۆکالکۆ... کەلوپەلەکانی مۆکتیزوما یان هێنایەدەر کە هەموویان شتی بەنرخبوون: ملوانکە و بەندی قۆڵ بە پەڕی کێسال و بەندی ئاڵتوونی قۆڵ و بازنە و بەندی ئاڵتونی ... تاجی تۆرکوازی کە سیمای فەرمانڕەوایی بوو. هەموویان بردن)*

داگیرکردنی سەربازی خاکی ئازتێك لە ساڵی ١٥٢١ تەواو کرا. کۆرتێز کە بوە فەرمانڕەوای تازەی پارێزگای ئیسپانیای نوێ، کەوتە دابەشکردنی بەنرخترین سامان کە دانیشتوانە خۆماڵییەکە بوو لە ڕێگەی دەزگای ئینکۆمایندا. بۆ یەکەمجار ئینکۆمایندا لە سەدەی پازدەیەمی ئیسپانیادا دەرکەوتبوو وەك بەشێك لە داگیرکردنەوەی باشووری ئیسپانیا لە ژێردەستی مەغریبیەکان، ئەو عەرەبانەی کە لە سەدەی هەشتەم و دواتریش دا لێرەدا نیشتەجێبووبوون. ئەمە لە جیهانی نوێ دا شێوازێکی دزێوتری وەرگرت: ئەمە بریتیبوو لە بەخشینی دانیشتوانی خۆماڵی بە ئیسپانییەك کە پێیان دەوت ئینکۆمێندێرۆ. خەڵکە خۆماڵییەکە دەبوایە سەرانە و خزمەتگوزاری کار بدەنە ئینکۆمێندێرۆ و بەرامبەر بەمەش دەبوایە ئینکۆمێندێرۆ دانیشتوانە خۆماڵییەکە وەربگێڕێ بۆ سەر ئاینی مەسیحی.

شێوازی کارکردنی ئینکۆمایندا بە شێوەیەکی وورد لە لایەن قەشەیەکی دۆمینیکیەوە بە ناوی بارتۆلۆمی دی لاس کاساس باسکراوە و گەیشتۆتە دەست ئێمە. ئەم قەشەیە یەکێك بوە لە ڕەخنەگرە سەرەتایی وهەرە توندەکانی سیستەمی کۆلۆنیالی ئیسپانیا. دی لاس کاساس لە ساڵی ١٥٠٢ لەگەڵ گەلەکەشتییەك بە سەرۆکایەتی فەرمانڕەوای نوێ، نیکۆلاس دی ئۆڤاندۆ گەیشتە دوورگەی هیسپانیۆلا. ئەو تا پێدەچوو زیاتر تەنگاو و بێزار دەبوو بەهۆی مامەڵەی بێبەزەیی و چەوسێنەرانە کە ڕۆژانە دەیبینی و دانیشتوانە خۆماڵییەکە ڕووبەڕووی دەبوونەوە. لە ساڵی ١٥١٣ دا وەك قەشە بەشداری

داگیرکردنی کوبای کرد لە لایەن ئیسپانیاوە و تەنانەت بە هۆی خزمەتەکانییەوە ئینکۆمایندا‌شی پێبەخشرا. ئەو، ئەم بەخشینەی ڕەتکردەوە و دەستیکرد بە ئەنجامدانی هەڵمەتێکی درێژخایەن بۆ ئەنجامدانی چاکسازی لە دەزگا کۆلۆنیالییەکانی ئیسپانیادا. هەوڵەکانی لە ساڵی ١٥٤٢ دا لە کتێبێك دا چڕکردەوە بەناوی باسێکی کورت دەربارەی وێرانکردنی ئێندیز کە بریتیبوو لە هێرشێکی توند بۆسەر بەربەریەتی فەرمانڕەوایی ئیسپانیا. ئەو بەم شێوەیە باسی ئینکۆمایندا لە نیکاراگوادا دەکا:

*(هەریەك لە نیشتەکاران لەو شارەی بۆی دیاریکرابوو ماڵێکی وەك جێگەی نیشتەجێبوون پێدەدرا (یان پێیدەبەخشرا هەروەك دەستەواژە یاساییەکە دەڵێ) و ئەندامانی خێزانی ماڵەکەی ناچار دەکرد کاری بۆ بکەن و خۆراکە کەمەکەی ئەوانی بۆخۆی دەبرد و دەستیدەگرت بەسەر ئەو زەوییەی کە ئەوان خاوەنی بوون و کاریان تێدادەکرد و هەر لە کونەوە بەرهەمەکەیان دەخوارد. نیشتەکار بە شێوەیەك مامەڵەی لەگەڵ دانیشتوانە خۆماڵییەکە دا دەکرد ـ پیاوماقوڵ و پیاوانی پیر و ژنان و منداڵان ـ وەك ئەوەی ئەندامی خێزانەکەی بن، ناچاری دەکردن شەو و ڕۆژ بێحەسانەوە کاری بۆ بکەن).*

دەربارەی داگیرکردنی نیو گرانادا کە کۆلۆمبیای ئێستایە، دی لاس کاساس باسی هەموو ئەو ستراتیژییانە دەکا کە ئیسپانیا خستبونیە گەڕ:

*(بۆ ئەوەی مەرامی درێژخایەنی خۆیان بهێننەدی لە دەستگرتن بەسەر هەموو ئەو ئاڵتوونەی هەبوو، ئیسپانییەکان ستراتیژییە ئاساییەکەی خۆیان، کە بریتیبوو لە دابەشکردنی شار و دانیشتوانەکانیان بەسەر خۆیان دا، خستەکار ... دواتر، هەروەك هەمیشە، وەك کۆیلە مامەڵەیان لەگەڵ دا دەکردن. ئەو پیاوەی سەرکردایەتی گشتی هەموو هەڵمەتەکە بوو، پاشای هەموو ناوچەکەی بەدیل گرت و بۆ ماوەی شەش یان حەوت مانگ لای خۆی هێشتیەوە و زۆر بێبەزەییانە داوای ئاڵتوون و زمرووتی زیاتر و زیاتری لێدەکرد. پاشا، کە پاشایەکی بۆگۆتا بوو، هێندە ترسابوو بۆ ئەوەی خۆی لە چنگی جەلادەکانی قوتار بکا ملی بۆ داواکارییەکان داو ڕازیبوو کە خانویەك پڕبکا لە ئاڵتوون و بیانداتێ. بۆ کۆکردنەوەی ئاڵتون، پاشا خەڵکەکەی خۆی ڕاسپارد تا بە دوای ئاڵتوون دا بگەڕێن. ئەوانیش کەوتنە هێنانی ئاڵتوون و بەردە بەنرخەکان. بەڵام خانوەکە هەر پڕنەبوو تا کار گەیشتە ئەوەی ئیسپانییەکان ڕایانگەیاند کە*

*لەبەر ئەوەی پاشا بەڵێنەکانی خۆی جێبەجێنەکردوە دەیکوژن. فەرمانڕەوا فەرمانی دا کە کێشەکە بخەنە بەردەم ئەو، بەو سیفەتەی ئەو نوێنەری پاسا بوو، کاتێکیش ئەمەیانکرد، فەرمانڕەوا بە شێوەیەکی ڕەسمی پاشای بە ئەشکەنجەدان حوکمدا ئەگەر بێ و بەردەوامبێ لە سەر جێبەجێنەکردنی بەڵێنەکانی. دەستیانکرد بە ئەشکەنجەدانی لە ڕێگەی هەڵواسین و پێداکردنی ڕۆنی قرچاو بە ووڕگیدا و بەستنەوەی هەردوو قاچ و ملی و گرتنی هەردوو دەستی لە لایەن دوو کەسەوە و دواتر داخکردنی بنی پێکانی. جارجاریش فەرماندە سەیریدەکردن و داوای دەکرد ئەگەر ئاڵتوونی زیاتری نەهێنا ئەوا تا مردن ئە شکەنجەییدەن و ئەوانیش بەردەوامدەبوون. پاشا بەدەم ئازارەوە گیانی لە دەست دا).*

ستراتیژی و دەزگاکانی داگیرکردن کە لە مەکسیك دا دامەزران، لە شوێنەکانی تری ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیادا بە پەرۆشەوە پەیڕەوکران. ئەم پەیڕەوکردنە لە کاتی داگیرکردنەکەی پیرۆ لە لایەن پیزارۆ بە شێوەیەکی کاریگەرتر لە شوێنەکانی تر ئەنجامدرا. هەروەك دی لاس کاساس لە سەرەتای گێڕانەوەی ڕووداوەکان دا ئاماژەیپێدەدا:

*(لە ساڵی ١٥٣١ دا خوێنمژێکی گەورەی تر لەگەڵ ژمارەیەك پیاودا بەرەو شانشینی پیرۆ کەوتنەڕێ بە نیازی پەیڕەوکردنی هەمان ستراتیژی و تاکتیکەکانی هاوڕێ سەرکێشەکانی کە لە شوێنەکانی تری دنیای نوێدا جێبەجێیان کردبوون).*

پیزارۆ لە کەناری دەریای نزیك شاری تەمبیسی پیرۆ دەستپێیکرد و بەرەو باشوور کەوتەڕێ. لە مانگی تشرینی دووەمی ١٥٣٢ گەیشتە شاری شاخاوی کاخامارکا، لەو شوێنەدا ئەتاهۆلپا، ئیمپراتۆری ئینکا لەگەڵ سوپاکەی دا هەڵیاندابوو. ڕۆژی دواتر، ئەتاهۆلپا کە تازە لە کێبڕکێی جێگرتنەوەی هیۆنا کاپکی باوکی دا، هۆسکاری برای لەناوبردبوو، لەگەڵ لایەنگرانی بەرەو ئەو شوێنەی ئیسپانییەکان هەڵیاندابوو، کەوتەڕێ. ئەتاهۆلپا نیگەرانبوو چونکە هەواڵی ئەو دەسدرێژییانەی پێگەیشتبوو کە ئیسپانییەکان ئەنجامیاندابوو، بەتایبەتی پەلاماردانی پەرستگای خوداوەندی ڕووناکی، ئینی. ئەوەی کە دواتر قەوما باش زانراوە. ئیسپانییەکان بۆسەیان بۆ نانەوە و پاسەوان و لایەنگرەکانی ئەتاهۆلپایان کوشت کە ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی دوو هەزار

کەس و بۆخۆشیان بە دیل گرت. لە پێناوی ئازادکردنی خۆی دا، ئەتاهۆلپا ناچار بوو بەڵێنبدا کە پڕ بە یەك ژوور ئاڵتوون و پڕ بە دوو ژووریش زیو بۆ ئیسپانییەکان دابینبکا. هەرچەندە ئەتاهۆلپا بەڵێنەکەی خۆی هێنایەدی، بەڵام ئیسپانییەکان لە تەمووز ۱٥۳۳ دا خنکاندیان. لە تشرینی دووەمی ئەو ساڵەدا، ئیسپانییەکان (کۆسکۆ)ی پایتەختی ئینکا یان داگیرکرد و ئەریستۆکراتەکانی ئینکا ڕووبەڕووی هەمان چارەنووسی ئەتاهۆلپا بوونەوە. ئەوان خرانە بەندیخانەوە بۆ ئەوەی ئاڵتوون و زیو دابینبکەن و کاتێکیش نەیانتوانی داخوازییەکانی ئیسپانییەکان جێبەجێبکەن، بە زیندوویی سوتێنران. هەموو ئاڵتوونی گەنجینە هونەرییەکانی کۆسکۆی وەك پەرستگای خۆر، لێکرانەوە و توێنێنرانەوە و کرانە قاڵبی ئاڵتون.

لەو کاتەدا ئیسپانییەکان چاویان بڕیە دانیشتوانی ئیپراتۆریەتی ئینکا. هەروەك مەکسیك هاوڵاتییانی ئیمپراتۆریەتەکە بەسەر ئینکۆمایندا‌کان دا دابەشکران و هەریەك لەو داگیرکارانەی لەگەڵ پیزارۆ دا هاتبوون بوە خاوەنی یەك ئینکۆمایندا. ئینکۆمایندا لەسەرەتای سەردەمی کۆلۆنیاڵی دا دەزگای سەرەکی ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردنی هێزی کار بوو، بەڵام هەر زوو ڕووبەڕووی بەرەنگاربوونەوە هات. لە ساڵی ۱٥٤٥ دا، لە کاتێك دا کەسێکی خەڵکی ناوچەکە بەناوی دیاگۆ گوالپا، لە شاخەکانی ئەندیز کە بۆلیڤیای ئەمڕۆیە بەدوای مەزارێکی خۆماڵی دا دەگەڕا، بەهۆی ڕەشابایەکی لەناکاوەوە درا بە زەوی دا و لووتی بوو بە تەپۆلکەیەکی زیوی کۆکراوەوە. ئەمە بەشێك بوو لە شاخێکی گەورەی زیو کە ئیسپانییەکان ناویان نا ئێل سێرۆ ڕیکۆ (گردی دەوڵەمەند). لە دەوری ئەم گردە شاری پۆتۆسی دروستکرا، کە ژمارەی دانیشتوانی گەیشتە ۱٦۰,۰۰۰ کەس و لە لیزبۆن و ڤێنسی ئەم سەرەدەمە گەورەتر بوو.

بۆ ئەوەی بتوانن زیوەکە دەربهێنن، ئیسپانییەکان پێویستیان بە کرێکاری کان هەبوو- ژمارەیەکی زۆری کرێکاری کان. فەرمانڕەوایەکی نوێیان بۆ ئەم ناوچەیە ڕەوانەکرد، فرانسیسکۆ دی تۆلیدۆ کە کاربەدەستێکی گەورەی کۆلۆنیاڵی بوو، ئەرکی سەرەکی چارەسەرکردنی کێشەی هێزی کار بوو. تۆلیدۆ لە ساڵی ۱٥٦۹ گەیشتە پیرۆ و لەسەرەتادا پێنج ساڵ خەریکی گەڕان و لێکۆڵینەوە بوو لەسەر ئەرکە نوێیەکەی. لە هەمانکات دا کەوتە ئەنجامدانی

ڕووپێوێکی فـراوان دەربـارەی دانیـشتوانە پێگەیـشتوەکەی. بـۆ ئـەوەی هێـزی کاری پێویست دابینبکا، دی تۆلیدۆ لە هەنگاوی یەکەمی دا هـەموو دانیـشتوانە خۆماڵییەکەی گواستەوە و لەو شارە نوێیانەی پێیان دەوترا (ڕیدەکسیۆن) کـە مانای کەمکردنەوە بوو، کۆیکردنەوە، کە چەوساندنەوەی هێزی کاری لە لایـەن تاجی ئیسپانییەوە ئاساندەکرد. دواتـر، دوای چاوپێداخـشاندنەوە، دەزگاکـانی هێزی کاری ئینکای خستەوەگەڕ کـە بـە میتـا ناسـرابوون و لـە زمـانی ئینکـادا واتای (نۆرە) دەگەیـەنێ. بـە پێـی سیـستەمی میتـا ئینکاکـان بـۆ دابینکردنـی خۆراك بۆ پەرستگاکان و ئەریستۆکراتەکان و سوپاکەیان، لـە کـاری کـشتوکاڵی دا کاری زۆرەملێیان پەیڕەودەکرد. لـە بەرامبـەر ئەمـەدا نوخبـەکانی ئینکـا لـە کاتی قاتوقڕیدا هاوکاری خەڵکیان دەکرد و ئاسایشیان بۆ دابیندەکردن. لەسەر دەسـتی دی تۆلیـدۆ دا میتـا بەتایبـەتی میتـای پۆتۆسـی بـوە گـەورەترین و بەزەبرترین ئامرازی چەوساندنەوەی هێزی کار لەسەردەمی کۆلۆنیـالی ئیـسپانی دا. دی تۆلیدۆ ناوچەیەکی فراوانی دیاریکرد کە لە ناوەڕاسـتی پـیرۆی ئـەمڕۆوە دەستیپێدەکرد و زۆربەی ناوچـەکانی پۆلیفیـای ئـەمڕۆی دەگرتـەوە. ڕووبـەری ئەم ناوچانە نزیکەی دووسەد هەزار میلی چوارگۆشە بوو. لەم ناوچەیەدا حەوت یەکی دانیشتوە نێرەکان کە تازە دەگەیشتنە (ڕیدەکسیۆن)ەکانیـان، دەبوایـە لە کانەکانی پۆتۆسی دا کار بکەن. میتای پۆتۆسی لە سەرتاسـەری سـەردەمی کۆلۆنیالی دا بەردەوامبوو، تەنیا لە ساڵی ١٨٢٥ دا هەڵوەشێنرایەوە. نەخـشەی (١)، ناوچەی میتا ڕووندەکاتەوە کە لەسەر نەخشەی ئیمپراتۆریـەتی ئینکـا لـە کـاتی داگیرکردنییـەوە لـە لایـەن ئیـسپانیاوە، دانـراوە. نەخـشەکە ڕادەی تێهەڵکێشی میتا لەگەڵ ناوجەرگەی ئیمپراتۆریەتەکەدا ڕووندەکاتەوە و تەنانەت کۆسکۆی پایتەختیشی لەخۆ گرتوە.

## نەخشەی (١): ئیمپراتۆریەتی ئینکا و تۆڕی ڕێگاوبانی ئینکا و ناوچەکانی کانەکانی میتا



ئێستاش میراتی میتا لە پیرۆی ئەم سەردەمەدا دەبینی. سەیری جیاوازی نێوان هەرێمەکانی کالکا و ئەکۆمایۆی نزیکیەوە بکە. وا دەردەکەوێ جیاوازییەکی کەم لە نێوان ئەم هەرێمانەدا هەبێ. هەردوکیان دەکەونە بەرزایی چیاکان و دانیشتوانیان پاشماوەی ئینکان و بەزمانی کویۆچۆ قسەدەکەن. لەگەڵ ئەوەش دا ئەکۆمایۆ زۆر هەژارترە و ئاستی بەکاربردن لە لایەن دانیشتوانەکەیەوە سێ یەك کەمترە لەوەی دانیشتوانی کالکا. خەڵکەکەش ئەمە دەزانن. خەڵکی ئەکۆمایۆ لە بێگانە چاوقایمەکان دەپرسن (ئایا نازانن خەڵکی ئێرە لە خەڵکی کالکا هەژارترن؟، بۆچی دەتانەوێ بێنە ئێرە؟ دەڵێن بێگانە چاوقایمەکان چونکە گەشتکردن لە پایتەختی هەرێمی کۆسکۆوە کە مەڵبەندی کۆنی ئیمپراتۆریەتی ئینکایە بۆ ئەکۆمایۆ زۆر زەحمەت ترە لەچاو گەشتکردن بۆ کالکا. رێگای هاتوچۆ بۆ کالکا قیر کراوە، لە کاتێك دا رێگای ئەکۆمایۆ لە بارێکی زۆر ناهەمواردایە. بۆ گەیشتن بە ناوچەکانی دوای ئەکۆمایۆ پێویستە ئەسپ یان هێستر بەکاربهێنی. خەڵکی کالکا و ئەکۆمایۆ هەمان جۆری کشتوکاڵ دەکەن، بەڵام لە کالکا خەڵك ئەو بەروبومانە لە بازاڕدا بە پارە دەفرۆشن. لە ئەکۆمایۆ ئەو بەروبومانە تەنیا بەشی خوراکی رۆژانەی خۆیان دەکەن. ئەم نایەکسانییە، کە بەچاو دیارە و لای ئەو خەڵکەی لەوێدا دەژین ئاشکرایە، بۆ جیاوازی دەزگایی ئەم دوو ناوچەیە دەگەڕێتەوە- جیاوازی دەزگایی کە ریشەی مێژوویی دەگەڕێتەوە بۆ دی تۆلیدۆ و پلانەکەی بۆ چەوساندنەوەی هێزی کاری دانیشتوانە خۆماڵییەکە. جیاوازی سەرەکی مێژوویی نێوان کالکا و ئەکۆمایۆ ئەوەیە کە ئەکۆمایۆ کەوتبوە ناو ناوچەی میتای پۆتۆسی، لە کاتێکدا کالکا لەدەرەوەی ئەم ناوچەیەدا بوو.

جگە لە چڕکردنەوەی هێزی کار و میتا، دی تۆلیدۆ ئینکۆمایندای گۆڕی بۆ باجی سەر. کە بڕێکی دیاریکراو بوو، دەبوایە هەموو پیاوێك ساڵانە هێندەی ئەو بڕە زیو بدا. ئەمەش شێوازێکی تر بوو بۆ ئەوە دانرابوو تا خەڵك ناچار بکا بچنە ناو بازاڕی کار و بە کرێیەکی کەم کار بۆ خاوەن زەوییە ئیسپانییەکان بکەن. دەزگایەکی تر بریتیبوو لە ریپارتیمایئنتۆ دی مێرکانسیاس و لە سەردەمی دی تۆلیدۆدا تەشەنەیکرد. ئەم ناوە لە ووشەی ریپارتیری ئیسپانییەوە وەرگیرابوو کە واتای دابەشکردنە. ریپارتیمایئنتۆ دی مێرکانسیاس بە مانای (دابەشکردنی کەلوپەل) دێ و بریتیبوو لە بە زۆر فرۆشتنی کەلوپەل

به دانیشتوان و به نرخێك كه له لایەن ئیسپانییەكانەوە دیاریدەكرا. له كۆتایی دا دی تۆلیدۆ تراجینی هێنایەئاراوە كە واتەكەی (بار) دەگەیەنێ و خەڵكە خۆماڵییەكەی بەكاردەهێنا بۆ گواستنەوەی باری قورسی كەلوپەل لە چەشنی شەراب و گەڵای كۆكا و قوماش بۆ كارە بازرگانییەكانی نوخبە ئیسپانییەكە لە بری بەكارهێنانی ئاژەڵی باربەر.

لە سەرتاسەری جیهانی كۆلۆنیاڵی ئیسپانی لە ئەمەریكادا، دەزگا و پێكهاتەی كۆمەڵایەتی هاوشێوە دامەزران. دوای قۆناخی سەرەتایی تاڵانكردن و بردنی ئاڵتوون و زیو، ئیسپانییەكان تۆڕێك دەزگایان دامەزراند كە بۆ چەوساندنەوەی خەڵكە خۆماڵییەكە دیزاینكرابوون. ئینكۆمایندا و ڕیپارتیمایێنتۆ و تراجین وا دیزاینكرابوون كە ئاستی گوزەرانی دانیشتوانە خۆماڵییەكە بۆ ئاستی كولەمەرگی دابەزێنن و هەموو ئەو داهاتانەی لەم ئاستە زیاتربوون لێیان زەوتبكرێ و بدرێنە ئیسپانییەكان. ئەمەش لە ڕێگەی داگیركردنی زەوییەكانیان و بەزۆر كار پێكردنیان و پێدانی كرێی كەم بەرامبەر كارەكانیان و سەپاندنی باجی زۆر و بە گران فرۆشتنی كەلوپەل كە تەنانەت لە كڕینیان دا سەرپشك نەبوون. هەر چەندە ئەم دەزگایانە سامانێكی زۆریان بۆ تاجی ئیسپانی كۆكردەوە و بوونە هۆی دەوڵەمەندبوونی داگیركاران و نەوەكانیان، بەڵام ئەمەریكای لاتینیان كردە نایەكسانترین كیشوەر لە جیهان دا و توانا و پۆتێنشیەڵی ئابووری ئەم كیشوەرەیان لاوازكرد.

## ... بۆ جەیمستاون

كاتێك دا ئیسپانییەكان لە ساڵی ١٤٩٠ ەكانەوە دەستیانكرد بە داگیركردنی ئەمەریكا، ئینگلتەرە هێزێكی بچووكی ئەورووپا بوو، تازە لە كاریگەرییە وێرانكارییەكانی جەنگی ناوخۆ، كە بە جەنگەكانی گوڵەباخ ناسراوە، پشووی بەبەردا دەهاتەوە. لە بارودۆخێك دا نەبوو كە كەڵك لە تاڵانكاری و كۆكردنەوەی ئاڵتوون وەربگرێ و خەڵكی خۆماڵی ئەمەریكا بچەوسێنێتەوە. نزیكەی سەد ساڵ دواتر، لەساڵی ١٥٨٨ دا، سەركەوتنە بەخت ئامێزەكەی ئینگلتەرە بەسەر هێزی دەریایی ئیسپانیادا كە هەوڵدانێك بوو لە لایەن فیلیپ پاشای دووەمی ئیسپانیاوە بۆ داگیركردنی ئینگلتەرە، شەپۆلی ترسی لە ئەورووپادا بڵاوكردەوە.

هەرچەندە ئینگلتەرە لەو سەرکەوتنەدا بەخت یاوەری بوو، بەڵام لە هەمانکات دا نیشانەی دەسەڵاتی زیاتری ئینگلتەرە بوو لە ناو دەریادا و ئەو توانایەی پێبەخشین بەشدارییکەن لە هەوڵەکانی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی کۆڵۆنیاڵی دا.

لەبەر ئەوە رێکەوت نییە کە ئینگلیزەکان لە هەمانکات دا دەستیانکرد بەکۆڵۆنیکردنی باکووری ئەمەریکا، بەڵام هێشتا لە دواکەوتوەکان بوون لەو بوارەدا. ئەوان باکووری ئەمەریکایان هەڵبژارد نەك لەبەر ئەوەی سەرنجڕاکێش بوو، بەڵکو هۆکارەکەی ئەوە بوو کە تەنیا ئەو شوێنە لە ئارادا بوو. ناوچە "بەسوودەکان"ی ئەمەریکا کە خاوەنی دانیشتوانێکی خۆماڵی زۆر بوون و دەکرا بچەوسێنرێنەوە، ئەو ناوچانەی کە کانەکانی ئاڵتوون و زیویان تێدا بوو، ئەو کاتە داگیرکرابوون. ئینگلیزەکان پاشماوەکەیان بۆ مایەوە. کاتێك نووسەری ئینگلیزی سەدەی هەژدەیەم و شارەزای بواری کشتوکاڵ، ئارسەر یونگ، باسی ئەو شوێنانە دەکا کە کاڵای کشتوکاڵی شیاو بۆ ناردنەدەرەوەیان تێدا بەرهەمدەهێنرا، ئەو تێبینیکرد:

*(بە شێوەیەکی گشتی پێدەچی کە بەهای کاڵای شیاوی ناردنەدەرەوە لە ناو کۆڵۆنییەکان دا بە پێی دوورییان لە خۆرەوە کەمبکاتەوە. دوورگەکانی رۆژئاوای هیند کە لە هەموویان گەرمترە هەر تاکێك بڕی ٨١ پاوەند و ١٢ شیلینگ و یەك پێنس بەرهەمدەهێنی، لە کاتێك دا لە باشووری کیشوەرەکەدا بڕەکە ٥١ پاوەند و ١٠ شلینگە و لە ناوچەکانی ناوەڕاست دا بڕەکە ٩ شلینگ و نیو پێنسە. لە ناوچەکانی باکووردا بڕەکە بریتییە لە ٢ شلینگ و ٦ پێنس. ئەم سکێڵە بێگومان وانەیەکی زۆر گرنگمان فێردەکا کە ئەویش — دوور کەوتنەوەیە لە بەکۆڵۆنیکردنی ناوچەکانی باکوور).*

هەوڵێ یەکەمی ئینگلیزەکان بۆ دامەزراندنی کۆڵۆنی، لە ڕۆونۆك کە دەکەوێتە باکووری کارۆلینا، لە نێوان ساڵانی ١٥٨٥ و ١٥٨٧ بەتەواوی شکستیهێنا. لە ساڵی ١٦٠٧ دا جارێکیتر هەوڵیاندایەوە. کەمێك بەر لە ساڵی ١٦٠٧ سێ کەشتی، سوزان کۆنستانت و گۆدسپید و دیسکەڤەری لە ژێر فەرماندەیی کاپتن کریستۆفەر نیوپۆرت بەرەو ڤێرجینیا کەوتنەڕێ. کۆڵۆنیستەکان لە ژێر سەرپەرشتی کۆمپانیای ڤێرجینیا ڕوویانکردە کەنداوی چێساپیك و بە ناو ڕووبارێك دا سەرکەوتن کە ناویان نا جەیمس بەناوی پاشای

فەرمانڕەوای ئینگلتەرە، جەیمسی یەکەم. لە ١٤ ی مایسی ساڵی ١٦٠٧ دا نشینگەی جەیمستاونیان دامەزراند. هەرچەندە نیشتەکارانی ناو کەشتییەکان کە هی کۆمپانیای ڤیرجینیا بوون، ئینگلیز بوون، بەڵام مۆدێلی بەکۆلۆنیکردنیان کاریگەری گەورەی مۆدێلی کۆرتێز و پیزارۆ و دی تۆلیدۆی پێوە دیاربوو. پلانی یەکەمیان بریتیبوو لە بەدیلگرتنی سەرۆك خێڵی ناوچەکە و بەکارهێنانی بۆ دابینکردنی پێداویستیەکان وخەڵکەکەش ناچار بکەن تا خۆراك و سامانیان بۆ بەرهەمبهێنن.

کاتێك کۆلۆنیستە ئینگلیزەکان بۆ یەکەمجار لە جەیمستاون نیشتەجێبوون، نەیانزانی ئەو ناوچەیە هی کۆنفدراسیۆنی پۆوهاتان بوو، کە هاوپەیمانییەك بوو لە نزیکەی سی قەوارە پێکهاتبوو، هەموویان وەلائیان بۆ یەك پاشا بوو کە ناوی واهۆنسۆناکۆك بوو. پایتەختی واهۆنسۆناکۆك شاری ویرۆکۆمۆکۆ بوو کە نزیکەی بیست میل لە جەیمستاونەوە دووربوو. پلانی کۆلۆنیستەکان ئەوە بوو زانیاری زیاتر لە سەر هەڵکەوتی ناوچەکە کۆبکەنەوە. ئەگەر نەتوانرا خەڵکی ناوچەکە ناچاربکرێن بۆئەوەی خۆراکیان بۆ پەیدابکەن و کاریان بۆبکەن، ئەوا بەلایەنی کەمەوە ڕەنگە کۆلۆنیستەکان بتوانن بازرگانییان لەگەڵ دا بکەن. ئەو بیرۆکەیەی کە دەبوایە کۆلۆنیستەکان بۆخۆیان کاریان بکردایە و خۆراکی خۆیان بەرهەمبهێنایە، پێدەچوو بیریان لێنەکردبێتەوە، چونکە ئەمە ئەوە نەبوو کە داگیرکارانی جیهانی نوێ دەیانکرد.

واهۆنسۆناکۆك هەر زوو دەرکی بەبوونی کۆلۆنیستەکان کرد و بە گومانێکی زۆرەوە دەیڕوانیە نیازەکانیان. ئەو لەو سەردەمەی باکووری ئەمەریکا دا وەك سەرۆکی ئیمپراتۆریەتێکی گەورە وابوو، بەڵام دوژمنی زۆر و کۆنترۆڵی ناوەندیی سیاسی بەهێزی بەسەر ئینکاکان دا نەبوو. واهۆنسۆناکۆك بڕیاری دا لە نیاز و مەبەستی ئینگلیزەکان تێبگات و لەسەرەتادا کەوتە ناردنی پەیامنێر بۆ لایان و ئاگاداریکردن کە ئەو حەزدەکا پەیوەندییەکی دۆستانەیان هەبێ.

کاتێك زستانی ساڵی ١٦٠٧ بەسەردا هات، خۆراکی نیشتەکارانی جەیمستاون بەرەو تەواوبوون دەچوو. سەرکردەی ئەنجوومەنی فەرمانڕەوای کۆلۆنییەکە، ئێدوارد ماری وێنگفیلد نەیتوانی بڕیاری یەکلاکار بدا. کاپتن جۆن سمیس توانی فریای کۆلۆنییەکە بکەوێ. سمیس، کە نووسینەکانی یەکێکن لە سەرچاوە سەرەکییەکانی زانیاریەکانمان دەربارەی کۆلۆنییەکە، کارێکتەرێکی

هەڵکەوتوو بوو، لە ناوچەی لینکۆنشێری ئینگلتەرە لە دایکبووبوو. ئەو بە پێچەوانەی خواستەکانی باوکی کە دەیویست ببێتە بزنسمان، بوە سەربازێکی سەرکێش. یەکەمجار لە ناو سوپای ئینگلیزدا لە هۆڵەندا بەشداری جەنگی کرد و دواتر چوە پاڵ هێزەکانی نەمسا لە هەنگاریا و دژی سوپاکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی شەڕیکرد و لە ڕۆمانیا بە دیلگیرا. وەك کۆیلە فرۆشرا و وەك بەردەستێکی ئیشوکاری کێڵگە کاری درایە. سمیس توانی ڕۆژێك بەسەر خاوەنەکەی دا زاڵ بێ و ئەسپ و جلەکانی دزی و خۆی گەیاندەوە ناوچەکانی نەمسا. لەبەرئەوەی لە سەفەرەکەی دا بۆ ڤێرجینیا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی وینگفیلد نەبوو، تووشی کێشە هات و لە کەشتی سوزان کۆنستانت دا بەندکرا. پلانەکە بریتیبوو لە دادگاییکردنی سمیس کاتێك کەشتییەکان گەیشتنە جیهانی نوێ، بەڵام کاتێك وینگفیلد و نیوپۆرت و نوخبە کۆلۆنیستەکانی تر فەرمانە پێچراوەکانیان خوێندەوە بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە بۆیان دەرکەوت کە کۆمپانیای ڤێرجینیا سمیسی دەسنیشانکردوە تا ببێتە ئەندامی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردن کە دەبوونە فەرمانڕەوای جەیمستاون.

به گەڕانەوەی نیوپۆرت بۆ ئینگلتەرە بۆ هێنانی کەلوپەل و کۆلۆنیستی زیاتر لە لایەکەوە و ڕاڕایی وینگفیلد لە بڕیاردان دا لە لایەکیترەوە، سمیس ئەو کەسە بوو کە توانی کۆلۆنییەکە ڕزگار بکا. ئەو زنجیرەیەك کاروانی بازرگانی دەسپێکرد و توانی کەلوپەلی خۆراکی پێویست پەیدابکا. لە یەکێك لەم کاروانانەدا لەلایەن ئۆپێنچانکانۆی برا بچووکی واهۆسۆنانکۆکەوە بەدیلگیرا و برایە بەردەم پاشا لە ویرۆکۆمۆکۆ. سمیس یەکەم پیاوی ئینگلیز بوو کە دیدار لەگەڵ واهۆسۆنانکۆك بکا و هەر ئەم دیدارە سەرەتاییە بوو بە پێی هەندێك سەرچاوە، بوە هۆی ڕزگارکردنی ژیانی سمیس، دوای ئەوەی پۆکاهۆنتاس، کچە گەنجەکەی واهۆسۆنانکۆك بەرگریلێکرد. سمیس لە ٢ کانونی دوەمی ١٦٠٨ ئازادکراو گەڕایەوە جەیمستاون، کە هێشتا کێشەی کەمی کەلوپەلی خۆراکیان هەبوو تا گەڕانەوەی نیۆپۆرت لە هەمان ڕۆژدا و لە کاتی دیاریکراوی خۆی دا.

کۆلۆنیستەکانی جەیمستاون لەم ئەزموونە سەرەتاییەوە وانەیەکی ئەوتۆ فێرنەبوون. بەدرێژایی ساڵی ١٦٠٨، کۆلۆنیستەکان بەردەوامبوون لە گەڕان بە دوای ئاڵتوون و کانزا بەنرخەکان دا. پێدەچوو هێشتا لەوە نەگەیشتبوون کە بۆ مانەوەیان لە ژیان دا ناتوانن چ لە ڕێگەی زۆرەملێ یان بازرگانییەوە پشت بە

دانیشتوانی ناوچەکە ببەستن بۆ دابینکردنی خۆراك. سمیس یەکەم کەس بوو بۆی دەرەکەوت کە ئەو مودێلی کۆلۆنیکردنەی لای کۆرتیز و پیزارۆ بە باشی کاریکردوە لە باکووری ئەمەریکادا کار ناکا. بارودۆخەکان زۆر جیاوازبوون. سمیس بۆیدەرکەوت کە بە پێچەوانەی گەلانی ئازتێك و ئینکا، گەلانی ڤێرجینیا خاوەنی ئاڵتوون نەبوون. ئەو لە ڕۆژمێرەکەی خۆی دا نوسیویەتی *( پێویستە بزانن کە سامانی ئەوان تەنیا بەروبومی خۆراکە)*. ئەناس تۆدکێل کە یەکێك بوو لە نیشتەکارە سەرەتاییەکان و یاداشتنامەیەکی دەوڵەمەندی بەجێهێشتوە، بە جوانی نیگەرانییەکانی سمیس و ئەوانیتری تۆمارکردوە :

*(ئاخاڤتن نەبوو، میوا نەبوو، کار نەبوو، تەنیا گەڕان بە دوای ئاڵتوون و توانەوەی ئالتوون و بارکردنی ئاڵتوون نەبێ)*

کاتێك نیوپۆرت لە ئەپریلی ساڵی ١٦٠٨ بەرەو ئینگلتەرە گەڕایەوە، کارگۆیەك لە پایرایت کە کانزایەکی ڕەنگ ئاڵتوونییە و پێیدەڵێن ئاڵتوونی نەفامەکان، لەگەڵ خۆی بردەوە. لە کۆتایی ئەیلول دا گەڕایەوە و لەگەڵ خۆی دا فەرمانی کۆمپانیای ڤێرجینیای هێنابوو بۆ زیاتر کۆنترۆڵکردنی دانیشتوانی ناوچەکە. پلانەکەیان بریتیبوو لە دانانی واهۆسۆنانکۆك بە پاشا، بەو هیوایەی ئەمە ببێتە هۆی ملکەچکردنی واهۆسۆنانکۆك بۆ جەیمسی یەکەم، پاشای ئینگلتەرە. ئەوان واهۆسۆنانکۆکیان بانگهێشتکرد کە بچێتە جەیمستاون، بەڵام ئەو کە هێشتا بە گومانەوە دەیڕوانیە کۆلۆنیستەکان، ئامادە نەبوو خۆی بخاتە بەردەم مەترسی دەسگیرکردنەوە. جۆن سمیس وەڵامەکەی واهۆسۆنانکۆکی تۆمارکردوە: *(ئەگەر پاشاکەی ئێوە دیاری بۆ ناردووم، منیش بەهەمانشێوە پاشام و ئەمە خاکی منە... پێویستە باوکتان بێتە لای من، نەك من بچمە لای ئەو یان بێمە قەڵاکەی ئێوە و من خۆم ناکەم بەم تەڵەیەوە)*. ئەگەر واهۆسۆنانکۆك ئامادە نەبوو (خۆی بکا بەم تەڵەیەوە)، ئەوا پێویست بوو نیوپۆرت و سمیس بچن بۆ ویرۆکۆمۆکۆ بۆ ئەنجامدانی تاج لەسەرنانەکە. ئەمەش پێدەچوو ببێتە کارەسات چونکە تەنیا ئەنجامێك کە لەمە دەکەوتەوە سووربوونی واهۆسۆنانکۆك بوو بۆ لەناوبردنی کۆلۆنییەکە. واهۆسۆنانکۆك ئابلۆقەیەکی توندی بازرگانی خستە سەر کۆلۆنییەکە. جەیمستاون چیتر نەیدەتوانی بازرگانیکا بۆ هێنانی کەلوپەل. واهۆسۆنانکۆك دەیویست لە ڕێگەی برسیکردنیانەوە دەریانپەڕێنێ.

نیوپۆرت جارێکیتر لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٦٠٨ دا بەرەو ئینگلتەرە

گەڕایەوە و لەگەڵ خۆی دا نووسراوێکی جۆن سمیسی بۆ کارگێڕانی کۆمپانیای ڤێرجینیا برد کە تیایدا داوای کردبوو کۆمپانیاکە شێوازی بیرکردنەوەی بەرامبەر کۆلۆنییەکە بگۆڕێ. ئەگەری دەوڵەمەندبوونی خێرا لە ڕێگەی چەوساندنەوەی ڤێرجینیا هاوشێوەی مەکسیك و پیرۆ لە ئارادا نەبوو. ئەو ناوچەیە نە ئاڵتوون و نە کانزای بەنرخی تێدا نەبوو، نەدەکرا دانیشتوانە خۆماڵییەکە ناچاربکرێن خوراکیان بۆ دابینبکەن. سمیس گەیشتە ئەو بڕوایەی بۆ ئەوەی کۆلۆنییەکە بتوانێ لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ، ئەوا دەبوایە خودی کۆلۆنیستەکان کار بکەن. لەبەر ئەوە داوای لە کارگێڕانی کۆمپانیاکە کرد کەسانی شیاو ڕەوانە بکەن: *( ئەگەر جارێکیتر خەڵك دەنێرن ئەوا داواتان لێدەکەم نزیکەی سی دارتاش و جووتیار و باخەوان و ماسیگر و ئاسنگەر و وەستای خانوو و دار و ڕەگ هەڵکەن بیرهەڵکەن بنێرن).*

سمیس، چیتر زێرەنگەری بێسوودی نەدەویست. جەیمستاون جارێکیتر بە هۆی بیرتیژی ئەوەوە ڕزگاربوو. ئەو توانی خەڵکی ناوچەکە ڕازیبکا تا بازرگانی لەگەڵ دا بکەن و کاتێکیش ئامادەنەبوون بازرگانییان لەگەڵ دا بکەن ئەوا دەستی بەهەرچی دەگەیشت دەیبرد. سمیس لە ناو کۆلۆنییەکەدا بەرپرسیارێتی تەواوی گرتە ئەستۆ و فەرمانی (ئەوەی کار نەکات خواردنیش ناخوات) بەسەر هەموان دا سەپاند. جەیمستاون توانی زستانی دوەمیش بەسەر بەرێ.

کۆمپانیای ڤێرجینیا بۆ ئەوە دامەزرابوو پارە پەیدابکا، بەڵام دوای دوو ساڵی پڕچەرمەسەری، هیچ ئاسۆیەکی قازانجکردن دیارنەبوو. بەڕێوەبەرانی کۆمپانیاکە بڕیاریان دا مۆدێلێکی نوێی فەرمانڕەوایی پەیڕەوبکەن. ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنیان وەلانا و لەبری ئەوە تەنیا فەرمانڕەوایەکیان دانا. یەکەم پیاو بۆ ئەم پێگەیە دانرا بریتیبوو لە سێر تۆماس گەیتس. بە لەبەرچاوگرتنی هۆشداریەکانی سمیس، کۆمپانیاکە گەیشتە ئەو بڕوایەی کە پێویستە شتێکی نوێ تاقیبکاەوە. ڕوداوەکانی زستانی ١٦٠٩ـ١٦١٠ کە ناونرا ( ڕۆژانی قڕکردن)، ئەم بڕوایەی کۆمپانیاکەی پتەوترکرد. شێوازی نوێی فەرمانڕەوایی هیچ بوارێکی بۆ سمیس نەهێشتەوە و بەدڵشکاوییەوە لە پایزی ساڵی ١٦٠٩ دا گەڕایەوە بۆ ئینگلتەرە. بە نەمانی بیرتیژییەکەی سمیس و ئابلۆوقەی واهۆسۆنانکۆك لەسەر هێنانی خۆراك، کۆلۆنیستەکانی جەیمستاون تەفروتونا بوون. لەو پێنج سەد کەسەی لە سەرەتای زستان دا لە ناو کۆلۆنییەکەدا بوون، تەنیا شەست

کەسیان بە زیندوویی گەیشتنە مانگی ئازار. بارودۆخەکە هێند نالەبار بوو کە کۆلۆنیستەکان ناچاری خواردنی گۆشتی یەکتربوون.

ئەو (شتە نوێیەی) لە لایەن گەیتس و سێر تۆماس دەیلی جێگریەوە بەسەر کۆلۆنییەکەدا سەپێنرا بریتیبوو لە شێوازێکی کارکردنی دڵڕەقانە لە لایەن نیشتەکارانەوە. بێگومان ئەم شێوازی کارکردنە ئەو نوخبەیەی نەدەگرتەوە کە کۆلۆنییەکەیان بەڕێوەدەبرد. ئەوە دەیل بوو کە (یاسای خودایی و مۆراڵ و سوپایی) دەرکرد و ئەم مادانەی لە خۆ گرتبوو:

*(نابێ هیچ پیاو و ژنێك لە کۆلۆنییەکەوە بەرەو لای هیندییەکان هەڵبێ. بە پێچەوانەوە بە مردن سزا دەدرێ.*

*هەرکەسێك شتێك لە باخچەیەك دا، موڵکی گشتی بێ یان تایبەت، بدزێ یان دزی لە ڕەزێك دا بکا یان گوڵە گەنمە شامییەك بدزێ بە مردن سزا دەدرێ.*

*نابێ هیچ ئەندامێکی کۆلۆنییەکە هیچ جۆرە کالایەکی گرنگی ئەم وولاتە بدا یان بفرۆشێ بە کاپتن یان دەریاوان یان خودانێك بە نیازی بردنە دەرەوەی لە کۆلۆنییەکە و بۆ بەکارهێنانی تایبەتی خۆی. بە پێچەوانەوە بە مردن سزا دەدرێت).*

کۆمپانیای ڤێرجینیا پێیوابوو کە ئەگەر نەتوانرا دانیشتوانە خۆماڵییەکە بچەوسێنرێنەوە ئەوا لەوانەیە بتوانرێ کۆلۆنیستەکان بچەوسێنرێنەوە. ئەم مۆدێلە نوێیەی پەرەپێدانی کۆلۆنیالی بوە هۆی ئەوەی کۆمپانیای ڤێرجینیا ببێتە خاوەنی هەموو زەوییەکان. پیاوان لە کامپەکان دا نیشتەجێکران، ئەو ژەمە خۆراکەیان دەدرایە کە لە لایەن کۆمپانیاکەوە دیاریکرابوو. گروپەکانی کارکردن دیاریکران و هەریەکەیان لە لایەن نوێنەرێکی کۆمپانیاکەوە چاودێریدەکرا. ئەمە وەك یاسای عورفی وابوو و لە سێدارەدانیش وەك سزای یەکەم ئەنجامدەدرا. وەك بەشێك لە دەزگا نوێکان ماددەی یەکەمی ئەوەی سەرەوە گرنگە. کۆمپانیا هەڕەشەی مردنی لە هەموو ئەوانە دەکرد کە هەڵدەهاتن. لە بەردەم ئەم شێوازە نوێیەی کارکردن دا هەلاتنی ئەو کۆلۆنیستانەی بەم شێوەیە کاریان پێدەکرا بۆ لای خەڵکی ناوچەکە و ژیان لەگەڵ ئەوان دا زیاتر و زیاتر برەوی پەیدادەکرد. لەهەمانکات دا کەمی چڕی دانیشتوانە خۆماڵییەکەی ڤێرجینیا لەو سەردەمەدا، بواری ئەوەی بۆ کۆمپانیاکە ڕەخساندبوو کە پەل بۆ دەرەی سنوورەکەی خۆشی بهاوێژێ، بەلام دەسەلاتی کۆمپانیاکە بۆ کەلك وەرگرتن لەم دەرفەتانە سنووردار بوو، چونکە

نەیدەتوانی کۆلۆنیستە ئینگلیزەکان ناچار بکا بە بژێویەکی کەم کار بۆ کۆمپانیاکە بکەن.

نەخشەی (٢) مەزەندەی چڕی دانیشتوانی ناوچە جیاوازەکانی ئەمەریکا پیشاندەدا لەسەردەمی داگیرکاری ئیسپانیادا. چڕی دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتوەکان جگە لە چەند ناوچەیەکی بچووك، بریتیبوو لە سێ لەسەر چواری کەسێك بۆ هەر میلێکی چوارگۆشە. لە ناوەڕاستی مەکسیك یان پیرۆی چیاکانی ئەندیز چڕی دانیشتوان دەگەیشتە چوار سەد کەس بۆ هەر میلێکی چوارگۆشە کە پێنجسەد هێندەی چڕی دانیشتوانی ویلایەتە یەکگرتوەکان بوو. ئەوەی لە مەکسیك یان پیرۆ دەکرا، لە ڤێرجینیا نەدەکرا ئەنجامبدرێ.

کاتێکی زۆری ویست تا کۆمپانیای ڤێرجینیا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە مۆدیلە سەرەتاییەکەی بەکۆلۆنیکردن لە ڤێرجینیادا کار ناکا و هەروەها ماوەیەکی پێچوو تا شکستهێنانی (یاسای خودایی و مۆراڵ و سوپایی) ڕوونبۆوە. لە ساڵی ١٦١٨ ەوە ستراتیژییەکی تەواو نوێ پەیڕەوکرا. لەبەر ئەوەی نەدەتوانرا نە خەڵکی ناوچەکە و نە کۆلۆنیستەکان ناچاری کارکردن بکرێن، تەنیا ئەڵتەرنەتیڤ پێشکەشکردنی هاندان بوو بە کۆلۆنیستەکان. لە ساڵی ١٦١٨ دا کۆمپانیاکە (سیستەمی هێدڕایت)ی هێنایە کایەوە کە بریتیبوو لە پێدانی پەنجا ئەیکەر زەوی بە هەر نیشتەکارێکی نێرینە و پەنجا ئەیکەریش بۆ هەریەك لە ئەندامانی خێزانەکەی و هەر خزمەتکارێك کە خێزانەکە بتوانێ بیهێنێ بۆ ڤێرجینیا. نیشتەکاران خانووی خۆیان پێدراو گرێبەستەکانیان هەڵوەشێنرانەوە و لە ساڵی ١٦١٩ دا ئەنجومەنێکی گشتی دامەزرا و هەریەك لە پیاوەکان دەیانتوانی ڕای خۆیان دەربارەی ئەو یاسا و دەزگایانە دەربڕن کە لە ڕێگەیانەوە کۆلۆنییەکە بەڕێوەدەبرا. ئەمەش سەرەتای دیموکراسی بوو لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا.

دوازدە ساڵی خایاند تا کۆمپانیای ڤێرجینیا گەیشتە ئەو بڕوایەی ئەوەی بۆ ئیسپانییەکان لە مەکسیك و ناوەڕاست و باشووری ئەمەریکا دەستیدەدا نەدەکرا لە باکوور جێبەجێبکرێ. ساڵانی دواتری سەدەی حەڤدەیەم خەباتێکی دوورودرێژی دەربارەی وانەی دوەم بەخۆوە بینی: بۆ ئەوەی کۆلۆنییەك ببێتە خاوەنی ئابوورییەکی سەقامگیر، تەنیا چارە بریتیبوو لە دامەزراندنی دەزگایانی ئەوتۆ کە هاندان بخەنە بەردەم کۆلۆنیستەکان تا وەبەرهێنان بکەن و بە جدی کاربکەن.

## نەخشەی (٢): چڕی دانیشتوان لە ساڵی ١٥٠٠ دا لە هەردوو کیشوەری ئەمەریکادا



لەگــەڵ پەرەپێــدانی بــاکووری ئەمــەریکادا، نوخبــە ئینگلیزەکــان هــەوڵی بەردەوامیان دا بەهەمانشێوەی ئیسپانییەکان، دەزگـای ئـەوتۆ دابمـەزرێنن کـە سنووری مافە ئابووری و سیاسییەکانی هەموو دانیشتوانی کۆلۆنییەکە، جگە لە کەمینەیەکی خاوەن ئیمتیاز، بەڕادەیەکی زۆر تەسـکبکەنەوە،. سـەرەڕای ئـەم هەولانـەش ئـەو مـۆدێلی بەڕێوەبردنـەی ئـەوان خوازیـاری بـوون شکـستیهێنا، هەروەك چۆن لە ڤێرجینیا شکستیهێنابوو.

یـەکێك لـە هەوڵـە هـەرە بـەرزخوازەکان هـەر زوو دوای گـۆڕینی سـتراتیژی کۆمپانیای ڤێرجینیا دەستیپێکرد. لە سـاڵی ١٦٣٢ دا دە ملیـۆن ئەیکـەر زەوی لە ناوچەی کەنداوی ئەپەر چیزاپیك لە لایەن پاشای ئینگلتەرە، چارڵسی یەکەم درایە سێسیلیەس کەڵڤێرت، لۆرد باڵتیمۆر. دەستووری مێریلاند ئازادی تـەواوی بەخشیە لۆرد بـاڵتیمۆر بـۆ دامەزرانـدنی حکومـەتێك بـە ئـارەزووی خـۆی و لـە ماددەی حەوتەم دا هـاتوە کـە بـاڵتیمۆر ( لـە پێنـاوی بەرژەوەنـدی و سـوودی حکومەتی ئەو ناوچەیە، هەموو دەسەڵاتێکی ڕەهـا و ئـازاد و تـەواوی هەیـە بـە پێی گرێبەستی ئـەم بەخـشینە بـۆ دانـان و دەرکـردن و وەگەڕخـستنی هـەموو جۆرە یاسایەك).

باڵتیمۆر پلانێکی ووردی دارِشت بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگایـەکی فیـوداڵی کـە شـێوازێکی بـاکووری ئەمـەریکای شـێوە نموونەییەکـەی سـەدەی حەڤدەیـەمی ناوچە گوندنشینەکانی ئینگلتەرە بوو. بە پێی ئەم پلانە زەوییەکان بۆ پارچەی هەزار ئەیکەری دابەشکران، کـە دەبوایـە لـە لایـەن لۆردەکانـەوە بـەڕێوەببرێن. لۆردەکان جووتیاریان بەکرێ دەگرت بۆ ئەوەی لەسـەر زەوییـەکان کاربکـەن و کرێ بدەنە ئەو نوخبە خاوەن ئیمتیازەی کە کۆنترۆڵی زەوییەکانیان دەکرد. لە ساڵی ١٦٦٣ هەوڵێکی تری لەم چەشنە خرایەوە گەڕ و لە ئاکام دا کارۆلینـا لـە لایەن هەشت خودانەوە بناخەی دانرا. یەکێك لەو هەشـت کەسـە سێر ئـەنتۆنی ئاشلی کوپـەر بـوو. ئاشـلی کوپـەر شانبەشـانی سـکرتێرە بـە تواناکـەی، فەیلەسـوفی مـەزنی ئینگلیـز، جـۆن لـۆك، مـادە بنەڕەتییـەکانی دەسـتووری کارۆلینایان دارِشت. ئەم دۆکیومێنتە هەروەك دەستووری مێریلاندی پێش ئەم، نەخشە ڕێگای دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی نوخبەیی و پلەبەنـدی دارِشـت کـە لـە سەر بنەمای باڵادەستی نوخبەی خاوەن زەوییەکان دامەزرابوو. لە دیباجەکەیدا نووسرابوو کە *( پێویستە حکومەتی ئەم ناوچەیە باشترین ڕەزامەندی پاشایەتی*

*ئینگلتەرە، کە ئێمە لە ژێر سایەیدا دەژین و ئەم ناوچەیەش بەشێکە لێی، بەدەستبهێنێ و پێویستە خۆمان لە قوتکردنەوەی فرە دیموکراسی بەدوور بگرین.)*

مادەکانی دەستووری بنەڕەتی هەیکەلێکی ڕەقی کۆمەڵایەتی دامەزراند. بەشی خوارەوەی ئەم هەیکەلە لە (پیاوانی لیت) پێکهاتبوو هەروەك مادەی ٢٣ ئاماژەی بۆ دەکا (هەموو منداڵانی پیاوانی لیت وەك پیاوانی لیت دەمێننەوە و نەوەش دوای نەوە هەروا دەمێننەوە). لە سەروو پیاوانی لیت، کە خاوەن دەسەڵاتی سیاسی نەبوون، لاندگرەیڤ و کازیکیۆ بوون، ئەمانەش ئەریستۆکراسییان پێکدەهێنا. هەریەك لە لاندگرەیڤەکان چلوهەشت هەزار ئەیکەر زەوییان پێدەدرا و کازیکیۆەکانیش بیست و هەشت هەزار ئەیکەر. پەرلەمان دامەزرا کە تیایدا لاندگرەیڤ و کازیکیۆەکان نوێنەریان هەبوو، بەڵام بۆیان هەبوو تەنیا گفتوگۆ لەسەر ئەو بابەتانە بکەن کە پێشتر لە لایەن هەشت خودانەکەوە بڕیاریان لەسەر درابوو.

هەروەك چۆن تەقەلاکان بۆ سەپاندنی یاسا سەرکوتکارەکان لە ڤێرجینیا شکستیهێنا، بە هەمانشێوە پلانەکان بۆ دامەزراندنی دەزگای هاوشێوە لە مێریلاند و کارۆلینا شکستیانهێنا. هۆکارەکانیش هەمان هۆکار بوون. لە هەموو دۆخەکان دا ئەستەم بوو کە نیشتەکاران ناچاربکرێن لە کۆمەڵگایەکی پلەبەندی ڕەق دا بژین چونکە لەو جیهانە نوێیەدا بژاردەی زۆریان لەبەردەم دا بوو. لەبری ئەمە دەبوایە هاندان بخرایە بەردەمیان تا حەز لە کارکردن بکەن. هەر زوو کۆلۆنیستەکان کەوتنە داوای ئازادی ئابووری زیاتر و مافی سیاسی زۆرتر. لە مێریلاندیش نیشتەکاران جەختیان لەسەر وەرگرتنی زەوی خۆیان کردەوە و لۆرد باڵتیمۆریان ناچار کرد ئەنجوومەنێك دابمەزرێنێ. لە ساڵی ١٦٩١ ئەنجوومەنەکە پاشایان ڕازیکرد کە مێریلاند وەك کۆلۆنییەکی سەر بە تاجی ئینگلتەرە ڕابگەیەنێ و لەم ڕێگەیەشەوە ئیمتیازەکانی باڵتیمۆر و لۆردە مەزنەکان هەڵوەشێنرانەوە. خەباتێکی درێژخایەنی لەم چەشنە لە کارۆلیناش سەریهەڵدا و لە ئەنجامدا خودانەکان شکستیان هێنا. باشووری کارۆلینا لە ساڵی ١٧٢٩ بوە کۆلۆنییەکی پاشایەتی ئینگلتەرە.

بە هاتنی ساڵانی ١٧٢٠ ەکان، هەموو سیازدە کۆلۆنییەکە کە دواتر بوونە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا هەمان هەیکەلی حکومەتیان هەبوو. لە

هەریەك لەمانەدا پارێزگارێك و ئەنجومەنێك كە لە لایەن پیاوانی خاوەن زەوییەوە هەڵدەبژێردرا هاتنەئاراوە. ئەمانە دیموكراسی نەبوون، چونكە ئافرەتان و كۆیلان و بێزەوییەكان نەیاندەتوانی دەنگبدەن. بەلام مافە سیاسییەكان فراوان بوون بە بەراوورد لەگەڵ هەندێك كۆمەڵگای تری ئەم سەردەمە. هەر ئەم ئەنجوومەن و سەركردەكانیان بوون كە یەكیانگرت و لە ساڵی ١٧٧٤ دا یەكەم كۆنگرێسی سەرتاسەریيان پێكهێنا كە پێشەكی سەربەخۆیی ویلایەتە یەككگرتوەكان بوو. ئەنجوومەنەكان باوەڕیان وابوو كە مافی خۆیانە بڕیار لەسەر ئەندامێتی خۆیان و دانانی باج بدەن. ئەمەش هەروەك دەزانین كێشەی بۆ حكومەتی كۆلۆنیالی بەریتانی دروستكرد.

## چیرۆكی دوو دەستوور

دەبێ ئێستا ڕوون بێ كە ڕێكەوت نییە ویلایەتە یەككگرتوەكان نەك مەكسیك دەستوورێكی ئەوتۆی داڕشت و كارپێكرد كە پرینسیپی دیموكراسی گرتبوە خۆی و سنووری بۆ بەكارهێنانی دەسەلاتی سیاسی دانا و ئەو دەسەلاتەی بە شێوەیەكی فراوان بەسەر كۆمەڵگادا دابەشكرد. ئەو دۆكیومێنتەی شاندی ویلایەتەكان لە مانگی مایسی ساڵی١٧٨٧ دا لە فیلادلفیا نووسییان، بەرهەمی پرۆسەیەكی دووردورێژ بوو كە بە پێكهێنانی ئەنجوومەنی گشتی لە جەیمستاون لە ساڵی ١٦١٩ دا دەستپێكردبوو.

جیاوازی نێوان پرۆسەی گەلاڵەكردنی دەستوور لە سەردەمی سەربەخۆیی ویلایەتە یەككگرتوەكان و ئەو پرۆسەیەی كەمێك دواتر لە مەكسیك دا ئەنجامدرا زۆر گەورەیە. لە شوباتی ساڵی ١٨٠٨ دا سوپاكانی فەرەنسای ناپلیۆن بۆناپارت ئیسپانیایان داگیركرد. لە مانگی مایس دا گەیشتنە مەدریدی پایتەختی ئیسپانیا. لە مانگی ئەیلولدا پاشای ئیسپانیا، فێردیناند، بەدیل گیرا و لەسەر تەخت لابرا. جۆنتایەكی نەتەوەیی، جۆنتای ناوەندی، جێگەی پاشای گرتەوە و مەشخەڵی شەڕی دژی فەرەنسیەكان گرتەدەست. یەكەمجار جۆنتا لە ئارانخوێز كۆبوونەوە، بەلام ناچار بوون بەرەو باشوور لەبەردەم هێزەكانی فەرەنسادا بكشێنەوە. لە كۆتایی دا گەیشتنە مینای كادیز، هەرچەندە لە لایەن هێزەكانی ناپلیۆنەوە گەمارۆدران، بەلام توانییان بەرگە بگرن. لێرەدا جۆنتا

پەرلـەمانی دامەزرانـد و بـە کـۆرتێز ناسـرا. لـە سـاڵی ١٨١٢ ەدا کـۆرتێز ئـەو دەسـتوورەی کـە بـە دەسـتووری کـادیز ناسـرا دارشـت کـە داوای هێنانـەئارای سیستەمی پاشایەتی دەستووری دەکرد کە لەسەر بنەمای سەروەریی جەماوەر دامەزرابێ. لە هەمانکات دا دەستوورەکە داوای نەهێشتنی ئیمتیـازی تایبـەت و داوای یەکسانی لەبەردەم یاسا دا کرد. هـەموو ئـەم داواکاریانـە مایـەی بێـزاری نوخبەکانی باشووری ئەمەریکا بوون کە تا ئەو کاتەش لەو ژینگـە دەزگاییانـەدا حوکمیان دەکرد کە بە ئینکۆمایندا و کاری زۆرەملـێ دارێـژرابوون و دەسـەڵاتی ڕەها لە دەست خۆیان و دەوڵەتی کۆلۆنیاڵی دا بوو.

ڕمـانی دەوڵـەتی ئیـسپانیا بـەهۆی داگیرکردنـی ناپلیۆنـەوە، قـەیرانی دەستووری لە سەراپای ئەمەریکای لاتینی کۆلۆنیاڵی دا دروستکرد. ناکۆکی زۆر لەسـەر دانپێـدانان بـە دەسـەڵاتی جۆنتـای ناوەنـدی پەیـدابوو، لـە ئاکامیـشدا چـەندین کۆلـۆنی ئەمـەریکای لاتـین بڕیـاری دامەزرانـدنی جۆنتـای خۆیـان دا. کاتێکی زۆری نەخایاند ئەم کۆلۆنیانەش هەستیان بـە دەرفـەتی جیابوونـەوەی تەواو لە ئیسپانیا کرد. یەکەم ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی لـە سـاڵی ١٨٠٩ دا لـە لا پاز لە بۆلیڤیا سەریهەڵدا، هەرچەندە هەر زوو لە لایەن سوپای ئیسپانیاوە کـە لە پیرۆوە ڕەوانە کرابـون، تێکشکێنرا. لـە مەکسیك هەڵوێـستە سیاسییەکانی نوخبە کەوتبوونە ژێر کاریگەری شۆڕشەکەی هیدالگۆ کە لە لایەن قەشە ماگیوڵ هیدالگۆ سەرکردایەتیکرا. سوپاکەی هیدالگۆ لە ٢٣ ئەیلولدا گواناخواتۆی داگیر و وێرانکرد و فەرمانڕەواکەی کوشـت کـە کاربەدەسـتی بـاڵای کۆلۆنیـاڵی بـوو و دواتریش کەوتنە ڕەشـەکوژی دانیـشتوانە سپیەکە. ئەمـەش زیـاتر لـە جـەنگی چینایەتی و تەنانەت ئێتنی دەچوو لـەوەی بزووتنەوەیـەکی سـەربەخۆیی بـێ و بوە هۆی یەکگرتنی نوخبەکان بۆ بەرەنگاربوونەوە. ئەگەر سەربەخۆیی دەبـوە هـۆی بەشـداریی جـەماوەر لـە سیاسـەت دا ئـەوا نـەك تـەنیا ئیـسپانییەکان بەڵکونوخبـەکانی نـاوخۆش دژی بـوون. لـە ئەنجامـدا نوخبـەی مەکـسیکی بـە گومـانێکی زۆرەوە ڕوانیانـە دەسـتووری کـادیز کـە دەرفـەتی بەشـداریی جـەماوەریی دەڕەخـساند و ئـەم نوخبەیـە ئامادەنـەبوون دان بـە ڕەوایـی دەستوورەکەدا بنێن.

لە ساڵی ١٨١٥ لە کاتێك دا ئیمپراتۆریەتی ئەورووپی ناپلیۆن ڕما، فێردینانـد پاشای حەوتەم دەسەڵاتی گرتەوە دەست، دەستووری کادیز وەلا نرا. لە کاتێك

دا تاجی ئیسپانی هەوڵی دەدا دەستبگرێتەوە بەسەر کۆلۆنییەکانی ئەمەریکادا، لەگەڵ مەکسیکی لایەنگری دا ڕووبەڕووی کێشە نەبۆوە. لەگەڵ ئەمەش دا کاتێك لە ساڵی ١٨٢٠ دا ئەو سوپا ئیسپانییەی لە کادیز ئامادەی پەڕینەوە بوو بۆ ئەمەریکا بۆ هاوکاریکردنی گەڕانەوەی دەسەڵاتی ئیسپانیا، لە فێردیناندی حەوتەم هەڵگەڕانەوە، هەر زوو یەکەی سەربازی تر لە هەموو لایەکی وڵاتەوە هاتنە پاڵیان. فێردیناند ناچار بوو دەستووری کادیز بگێڕێتەوە و داوای کۆبوونەوەی کۆرتیز بکا. ئەم کۆرتیزە ڕادیکاڵتر بوو لەو کۆرتیزەی دەستووری کادیزی نوسیبۆوە و پێشنیازی نەهێشتنی هەموو جۆرە کارێکی زۆرەملێی کرد. لە هەمانکات دا کۆرتیز هێرشیکردە سەر ئیمتیازە تایبەتەکان — بۆ نموونە، مافی سوپا کە لە کاتی ئەنجامدانی تاوان دا لە دادگاکانی خۆیان دا دادگایی بکرێن. دەبوایە ئەم دۆکیومێنتە لە مەکسیکیش جێبەجێبکرایە، بۆیە نوخبەکەی مەکسیك بڕیاریان دا واباشترە ڕێگەی خۆیان بگرنەبەر و سەربەخۆیی ڕابگەیەنن.

ئەم بزووتنەوە سەربەخۆییە لە لایەن ئۆگەستین دەی تۆربیدێ کە پێشتر لە سوپای ئسپانیادا ئەفسەر بوو، سەرکردایەتیکرا. لە ٢٤ شوباتی ١٨٢١ دا پلانی دی ئیگۆلای بڵاوکردەوە کە دیدی خۆی بوو بۆ سەربەخۆیی مەکسیك. پلانەکە سیستەمی پاشایەتی دەستووری بە سەرۆکایەتی ئیمپراتۆرێکی مەکسیکی لەخۆگرتبوو. لە هەمانکات دا دەستووری کادیزی وەلانا کە نوخبەکانی مەکسیك بە هەڕەشەیان دەزانی بۆ سەر پایە و ئیمتیازەکانیان. ئەم پلانە پشتگیریی خێرای بەدەستهێنا و هەر زووش ئیسپانیا بۆی دەرکەوت کە ناتوانێ ئەوەی ڕوودانی مسۆگەرە ڕابگرێ. تۆربیدێ تەنیا ڕێکخەری جیابوونەوەی مەکسیك نەبوو، بەڵکو دوای ئەوەی هەستی بە بۆشایی هێزەکان کرد، خێرا و بە سوود وەرگرتن لەو پشتگیرییەی لە لایەن سوپاوە لیێدەکرا، خۆی کردە ئیمپراتۆر، ئەمەش پێگەیەك بوو کە سەرکردەی مەزنی سەربەخۆیی باشووری ئەمەریکا سایمۆن بۆلیڤار وەسفیکردوە بە (لە سایەی خوا و نێزەوە). دەسەڵاتی تۆربیدێ سنووردار نەکرابوو لە ڕێگەی دەزگای سیاسی هاوشێوەی ئەو دەزگا سیاسیانەی سنووریان بۆ دەسەڵاتەکانی سەرۆکەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان دائەنا. هەر زوو خۆی کردە دیکتاتۆر و لە تشرینی یەکەم ی ١٨٢٢ دا ئەو گۆنگرێسەی بە پێی دەستوور دامەزرابوو هەڵوەشاندەوە و جۆنتایەك کە لە

لایەن خۆیەوە دیاریکرابوون لـە جێگـەی دانـرا. هەرچـەندە دەی تۆربیـدیٚ زۆر نەمایەوە، بەڵام ئـەم جـۆرە ڕووداوانـە جـار دوای جـار لـە مەکـسیکی سـەدەی نۆزدەیەم دا ڕوویاندایەوە.

دەستووری ویلایەتە یەکگرتوەکان بـە پێـی سـتانداردی ئـەمرۆ دیموکراسـی نەهێنایەئاراوە، ئەوانەی بۆیان هەبوو لە هەڵبژاردنەکان دا دەنگبدەن بەجێهێڵرا بۆ ویلایەتەکان بڕیاری لەسەر بدەن. لە کاتێك دا ویلایەتەکانی بـاکوور هـەر زوو مافی دەنگدانیان دایە هـەموو پیـاوانی سپیپێـست بەبێگوێدانـە ئـەوەی داهـاتی چەندە و خاوەن موڵکـە یـا نـا، ویلایەتـەکانی باشـوور بەرەبـەرە ئـەم کارەیـان ئەنجامدا. هیچ کام لە ویلایەتەکان مافی دەنگدانیان نەدایە ئافرەت و کۆیلان و لە کاتێك دا مەرجی موڵکـداری و سـامانداری لەسـەر پیـاوانی سپیپێـست لابـرا، یاسای ئەوتۆی هەڵبژاردن کە مافی دەنگدانی نەدەدایـە ڕەشپێـستان داڕێـژران. بێگومـان کۆیلەیـەتی لـە کـاتی نووسـینەوەی دەسـتوور لـە فیلادلفیـا کـارێکی دەستووری بـوو. لـەو کاتـەدا دانوسـتاندنی زۆر لەسـەر چـۆنیەتی دابەشـکردنی کورسیەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران بەسەر ویلایەتـەکان دا ئەنجامـدرا. دەبوایـە کورسیەکان بە پێی ژمارەی دانیشتوانی ویلایەتەکان دابەشبکرانایە بـەڵام ئـەو نوێنەرانەی کۆنگرێس کە نوێنەرایەتی ویلایەتەکانی باشووریان دەکرد جەختیان لەسەر ئەوە دەکرد کە دەبیٚ کۆیلەکانیش بخرێنـە نێـو ژمـارەی دانیـشتوانەوە. ئەوانەی باکوور ناڕازیبوون. دواتـر لەسـەر ئـەوە ڕێکـەوتن کـە بـۆ دابەشـکردنی کورسـیەکانی ئەنجومـەنی نوێنـەران، کۆیلەیـەك وەك سـیٚ لەسـەر پێنجـی کەسێکی ئازاد حساب بکریٚ. ململانێکـانی نێـوان بـاکوور و باشـووری ویلایەتـە یەکگرتوەکان لە کاتی پرۆسەی نووسینەوەی دەستووردا لە ڕێگـەی ڕێکـەوتنی سیٚ لەسەر پێنج و سازانەکانی ترەوە کپکران. بە تێپەڕبوونی کـات دەسـکاریتر زیادکران، بۆ نموونە، سازانی مزووری کە بریتیبوو لە ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە ویلایـەتێکی دژ بـە سیـستەمی کۆیلەیـەتی و ویلایـەتێکی لایـەنگری سیـستەمی کۆیلەیەتی هەمیشە پێکەوە بۆ ویلایەتـە یـەکگرتوەکان زیـادبکرێن بـۆ ڕاگرتنـی باڵانسی نێوان ئەوانەی لەگەڵ ئەم سیستەمە بـوون و ئەوانـەی دژبـوون لـە نـاو ئەنجوومـەنی پـیران دا. ئـەم شـتە سـەیرانە بوونـە هـۆی ئـەوەی دەزگـا سیاسییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان پێکەوە بەشێوەیەکی ئاشتی کاربکەن تـا ئەو کاتـەی شـەڕی نـاوخۆ دەسـتپێکرد و ململانێکـانی لەبەرژەوەنـدی بـاکوور

کۆتاییپێهێنا.
جەنگی ناوخۆ خوێناوی و کاولکار بوو، بەڵام بەر لە جەنگ و دوای جەنگیش دەرفەتی ئابووری زۆر بۆ بەشێکی گەورەی دانیشتوان لە ئارادا بوو، بەتایبەتی لە باکوور و ڕۆژئاوای ویلایەتە یەکگرتوەکان دا. باردۆخەکەی مەکسیك زۆر جیاواز بوو. ئەگەر ویلایەتە یەکگرتوەکان ماوەی پێنج سالّی نێوان ۱۸٦۰ و ۱۸٦٥ بە ناسەقامگیریی سیاسی بەسەر بردبێ، ئەوا مەکسیك ماوەی پەنجا ساڵی یەکەمی دوای سەربەخۆیی بریتیبوە لە ناسەقامگیریی سیاسی. ئەمەش لە میانەی پیشەی ئەنتۆنیۆ لۆپیز دی سانتا ئانا باشتر ڕووندەبێتەوە.
سانتا ئانا کوڕی کاربەدستێکی کۆلۆنیالی بوو لە ڤێراکروز، لە کاتی جەنگەکانی سەربەخۆیی دا وەك سەربازێکی ناو سوپای ئیسپانیا شەڕی کرد و نێوباگی پەیداکرد. لە ساڵی ۱۸۲۱ دا چوە پاڵ توربیدیّ و هەرگیز ئاوڕی بۆ دواوە نەدایەوە. لە مانگی مایسی ۱۸۳۳ دا بۆ یەکەمجار بوە سەرۆکی مەکسیك. هەرچەندە سەرۆکایەتیەکەی کەمتر لە مانگێکی خایاند و وای بە باش زانی ڤەڵانتاین گۆمێز فاریاس ببێتە سەرۆك کۆمار. سەرۆکایەتیەکەی گۆمێز فاریاس تەنیا پازدە ڕۆژی خایاند و دوای ئەو سانتا ئانا دەسەڵاتی گرتەوەدەست. ئەمەشیان بە هەمانشێوەی سەرۆکایەتیەکەی یەکەمی، هێندەی نەخایاند و جارێکیتر لە سەرەتای تەمووز دا گۆمێز فاریاس جێگەیگرتەوە. سانتا ئانا و گۆمێز فاریاس لەسەر ئەم سەمایە بەردەوامبوون تا ناوەڕاستی ۱۸۳٥ و سانتا ئانا لە لایەن میگوێل باراگان دەسەڵاتی لێسەندرایەوە. بەڵام سانتا ئانا کەسێك نەبوو هەروا بە ئاسانی مەیدانەکە چۆڵبکا و لە ساڵانی ۱۸۳۹ و ۱۸٤۱ و ۱۸٤٤ و ۱۸٤۷ و دواجاریش لە نێوان ساڵانی ۱۸٥۳ و ۱۸٥٥ بوەوە بە سەرۆك. هەموو پێکەوە یازدە جار سەرۆك بوە و لە سەردەمی ئەودا ئەلامۆ و تێکساس لە دەسدران و جەنگی وێرانکاری نێوان مەکسیك و ئەمەریکا بەرپا بوو، کە بوەهۆی لەدەسدانی ئەوەی ئەمڕۆ بە نیو مەکسیکۆ و ئەریزۆنا ناسراوە. لە نێوان ساڵانی ۱۸۲٤ و ۱۸٦۷ مەکسیك پەنجا و دوو سەرۆکی هەبوە و کەمیش لەمانە بە پێی ڕێگەوشوێنی دیاریکراوی ناو دەستوور دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست.
ئاکامی ئەم ناسەقامگیرییە سیاسییە بێوێنەیە بۆ دەزگا ئابوورییەکان و هاندانەکان ئاشکرایە. ئەم جۆرە ناسەقامگیرییە بوە هۆی هاتنەئارای مافی

موڵکداری نـاجێگیر. لـە هـەمانکات دا بـوە هـۆی لاوازکردنـی لەرادەبـەدەری دەوڵەتی مەکسیك کە ئێستاش دەسەلات و توانایەکی کەمی هەیە بۆ زیادکردنی باج و دابینکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان. لە ڕاستیدا هەرچەندە سانتا ئانا سەرۆك کۆماری مەکسیك بوو، چەندین ناوچەی گەورەی مەکسیك لـەدەرەوەی دەسەلاتی ئەودا بوون، ئەمەش بـوە هـۆی دەسـتگرتن بەسـەر تێکساس دا لـە لایـەن ویلایەتـە یەککرتوەکانـەوە. جگـە لەمـە، هـەروەك بینیمـان ئامـانج لـە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی مەکسیك پاراستنی ئەو کۆمەڵە دەزگا ئابوورییانـە بـوو کە لەسەردەمی کۆلۆنیالی دا دامەزرابوون و هەروەك گەڕۆکی مـەزنی ئـەڵمانی و شـارەزای جوگرافیـای ئەمـەریکای لاتـین، ئەلیگزانـدەر ڤـۆن هـەمبۆلت دەڵـێ، مەکسیکیان کردبوە (وولاتی نایەکسانی). لە بەرئەوەی ئەم کۆمەڵگایانە لەسەر بنـەمای چەوسـاندنەوەی دانیـشتوانە خۆماڵییەکـە و قـۆرخکردن دامـەزرابوون، ڕێگربوون لەبەردەم هاندانی ئابووری و دەسپێشخەریەکانی زۆربـەی هـەرەزۆری دانیشتوان دا. لە کاتێك دا ویلایەتە یەککرتوەکان لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی نۆزدەیەم دا خەریکی دەسپێکردنی شۆڕشی پیشەسازی بوو، مەکسیك هەژار تر دەبوو.

## خاوەنی بیرۆکەیەك و دامەزراندنی کۆمپانیایەك و وەرگرتنی قەرزێك

شۆڕشی پیـشەسازی لـە ئینگلتـەرەدا دەسـتیپێکرد. سـەرکەوتنی یەکـەمی بریتیبـوو لـە بـەرپاکردنی شۆڕشـێك لـە بەرهـەمهێنانی جلوبـەرگی لۆکـە دا بـە بەکارهێنانی ئامێری نـوێ کـە بـە چـەرخەی ئـاو و دواتـریش بزوێنـەری هـەڵمی کاریان دەکرد. بەرهەمهێنانی لۆکە لە ڕێگەی ئامێرەوە بـە شـێوەیەکی بەرچـاو ئاسـتی بەرهـەمێنانی کرێکـارانی بـەرزکردەوە، لەسـەرەتادا، لـە پیـشەسازی قوماش ودواتریش پیشەسازیەکانی تردا. پاڵنەری پێشکەوتنی تەکنـەلۆجی لـە سـەرتاپای ئـابووری دا بریتیبـوو لـە نوێکـاری کـە کـارزان و بزنـسمانە نوێکـان پێشەنگ بوون تا بیرۆکە نوێکانیان بخەنە بواری جێبەجێکردنەوە. ئـەم خونـچە پـشکوتوە سـەرەتاییە هـەر خێـرا لـە ڕێگـەی زەریـای بـاکووری ئەتڵەسـیەوە گوێزرایەوە بۆ ویلایەتە یەککرتوەکان و لەوێدا بلاوبۆوە. لە ڕێگەی بەکارهێنانی

ئـەو تەكنەلۆجییـە نوێیانـەی كـە لـە ئینگلتـەرەدا دروسـتكرابوون، دەرفـەتی گەورەی ئابووری لەبەردەم خەڵك دا كرایەوە. لەهەمانكاتیشدا ئەمە هانیدان تـا بۆخۆیان داهێنانی نوێ ئەنجامبدەن.

دەتوانین بە وردبوونەوە لە چۆنیەتی بەخـشینی ئـەم مـافی داهێنانانـە لـە سروشـتی ئـەم داهێنانانــە تێبگـەین. سیـستەمی مـافی داهێنــان كـە مـافی خاوەنداری ئایدیاكان دەپارێزی، لە چوارچێوەی یاسـای مۆنۆپۆلییـەكان دا كـە لە لایەن پەرلەمانی بەریتانیاوە لە ساڵی ١٦٢٣ دەركرا، كـرا بـە سیـستەماتیك. دەركردنـی ئـەم یاسـایەش تـا ڕادەیـەك بـۆ ڕاگرتنـی پاشـا بـوو لـە بەخـشینی (مۆڵەتی مافی داهێنان) بە ئارەزووی خۆی و بۆ هەركەسێك بیویستایە. مۆڵەتی مافی داهێنان بریتیبوو لـە بەخـشینی مـافی تایبـەت بـۆ ئەنجامـدانی چـالاكی و بزنسی دیاریكراو. ئەوەی جێگەی سەرنجە دەربارەی بەڵگـەكانی پێـدانی مـافی داهێنان لە ویلایەتە یەكگرتوەكان دا ئەوەیە كە ئەو كەسانەی مافی داهێنانیـان پێدەبەخـشرا، تـەنیا خەڵكـە دەوڵەمەنـد و نوخبەكـە نـەبوون، بـەڵكو كەسـانی هەمەجۆر و خاوەن باكگراوندی جیاواز بوون. كەسـانێكی زۆر لـە ڕێگـەی مـافی داهێنانەوە دەوڵەمەندبوون. بۆ نموونە، تۆماس ئەدیسۆن داهێنەری فۆنۆگرام و گلۆپ و دامەزرێنەری كۆمپانیای جەنەڕال ئەلەكتریك كە تا ئێستاش یەكێكـە لـە كۆمپانیا گەورەكانی جیهان. ئەدیسۆن دوا منداڵی خێزانێكی حەوت منداڵی بوو. سامیۆل ئەدیسۆنی باوكی لە چەندین پیشەدا كاری كردوە هەر لە دروسـتكردنی لەوحی دار بۆ سەقف تا بەرگـدروویی و شـوێنی خواردنـەوە. تۆمـاس خوێنـدنی فەرمی قوتابخانەی وەك پێویست نەبوە و دایكی لەماڵەوە وانەی پێوتوە.

لە نێوان ساڵانی ١٨٢٠ و ١٨٤٥ دا، تەنیا ١٩٪ ی ئەوانەی مـافی داهێنانیـان وەرگرتوە لە دایك و باوكی پرۆفێشنەڵ یان لە خێزانی گەورە و ناسراوی خاوەن زەوی بوون. لە هەمان ماوەدا، ٤٠٪ ی ئەوانەی مافی داهێنانیان پێدراوە تـەنیا خوێنــدنی ســەرەتایی و كەمتریــشیان هــەبوە بەهەمانــشێوەی ئەدیــسۆن. زۆرجاریش لە ڕێگەی دامەزراندنی كۆمپانیاوە سوودیان لە مافی داهێنانـەكانیان وەرگرتوە بەهەمانشێوەی ئەدیسۆن. هەروەك چۆن ویلایەتـە یـەكگرتوەكان لـە سـەدەی نۆزدەیـەم دا لـە ڕووی سیاسـییەوە لـە هـەموو نەتـەوەكانی دنیـا لـەو سـەردەمەدا دیموكراسـیتر بـوو، لەهــەمانكات دا لــە ڕووی نوێكارییــەوە لــە نەتـەوەكانی تـر دیموكراسیتر بـوو. ئەمـەش گـرنگ بـوو لـە ڕێـڕەوی بـوون بـە

نوێکارترین نەتەوەی دنیا لە ڕووی ئابوورییەوە.

ئەگەر هەژار بویتایە و خاوەنی ئایدیایەکی باش بویتایە، وەرگرتنی مافی داهێنان کە هێندە گران نەبوو شتێك بوو و بەکارهێنانی ئەو مافە بۆ پارە پەیداکردن، شتێکی تر بوو. بێگومان یەکێك لە ڕێگاکان بریتیبوو لە فرۆشتنی مافی داهێنانەکە بە کەسێکی تر. ئەمەش ئەو ڕێگایە بوو کە ئەدیسۆن لە سەرەتادا گرتیە بەر بۆ پەیداکردنی هەندێك سەرمایە، کاتێك کوادرۆپلێکس تێلەگرافی فرۆشت بە وێزرەن یونیەن بە ١٠,٠٠٠ دۆلار. بەڵام فرۆشتنی مافی داهێنان تەنیا بۆ کەسێکی وەك ئەدیسۆن باش بوو، چونکە بیرۆکەکانی خێرا تر بۆ دەهات لەوەی بتوانێ بیانخاتە بواری جێبەجێکردنەوە. (ئەو ڕیکۆردی جیهانی هەبوو لە ڕووی وەرگرتنی مافی داهێنان و خاوەنی ١,٠٩٣ مافی داهێنان بوو لە ویلایەتە یەکگرتوەکان و لەسەر ئاستی جیهانیش خاوەنی ٢٥٠٠ مافی داهێنان بوو.) ڕێگای ڕاستەقینەی بەکارهێنانی مافی داهێنان بۆ پێکەوەنانی سامان بریتیبوو لە دامەزراندنی بزنسی خۆت. بەڵام بۆ دامەزراندنی بزنس پێویستت بە سەرمایەیەو، پێویستت بە بانکە تا سەرمایەت بە قەرز بداێ.

داهێنەرانی ویلایەتە یەکگرتوەکان دیسانەوە لەمەش دا بەختیان هەبوو. لە سەدەی نۆزدەیەم دا فراوانبوونێکی خێرا لە بواری بانك و چالاکییە داراییەکان دا پەیدابوو کە ئەمەش هاوکارێکی گرنگی ئەو گەشەکردن و بەپیشەسازیکردنە بوو کە ئابووری بەخۆیەوە بینی. لە کاتێك دا لە ساڵی ١٨١٨ تەنیا ٣١٨ بانك بە سەرمایەی ١٦٠ ملیۆن دۆلارەوە کاریان دەکرد، لە ساڵی ١٩١٤ دا ئەم ژمارەیە گەیشتە ٢٧,٨٦٤ بانك بە سەرمایەی ٢٧,٣ ملیارد دۆلار. داهێنەرانی ویلایەتە یەکگرتوەکان بە ئاسانی دەستیان دەگەیشتە سەرمایە بۆ ئەوەی دەست بە پێکەوەنانی بزنسەکانیان بکەن. جگە لەمە ئەو ڕکابەرییە توندەی لە نێوان بانك و دەزگا داراییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان دا هەبوو، کارێکی وایکردبوو کە سەرمایە بە سوودێکی کەم دەستبکەوێ.

بارودۆخەکەی مەکسیك بەم شێوەیە نەبوو. لە ڕاستیدا لە ساڵی ١٩١٠ کە شۆڕشی مەکسیك سەریهەڵدا، تەنیا چلودوو بانك لە مەکسیك دا هەبوون و دووش لەمانە کۆنترۆڵی ٦٠٪ ی هەموو سەرمایەی بانکەکانیان کردبوو. بە پێچەوانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە کە ڕکابەریی توند لە نێوان بانکەکان دا

هەبوو، لە مەکسیك دا هیچ ڕکابەرییەك لە نێوان بانکەکان دا نەبوو. ئاکامی نەبوونی ڕکابەریی ئەوەبوو بانکەکان دەیانتوانی ڕێژەی سوودی بەرز لە کڕیارەکانیان وەربگرن و پێدانی سەرمایەش بە قەرز تەنیا سامانداران و پایەدارەکانی دەگرتەوە و ئەمانیش ئەم سەرمایەیان بەکاردەهێنا بۆ دەستگرتنی زیاتر بەسەر کەرتە جیاوازەکانی ئابووری دا.

شێوازی پیشەسازی بانکی لە مەکسیك دا لە سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم دا ئەنجامی ڕاستەوخۆی ئەو دەزگا سیاسییانە بوو کە دوای سەربەخۆیی لە وڵات دا پێکهێنران: ئاژاوەکانی سەردەمی سانتا ئانا و دواتریش هەوڵە لەبارچوەکانی حکومەتی فەڕەنسا لەسەردەمی ناپلیۆنی دوەم دا لە نێوان ساڵانی ١٨٦٤ و ١٨٦٧ بۆ دامەزراندنی ڕژێمێکی کۆلۆنیالی لەژێر فەرمانڕەوایی ماکسیمیلیان دا. فەڕەنسیەکان دەرکران و دەستوورێکی نوێ نووسرا. ئەو حکومەتەی یەکەمجار لە لایەن بێنیتۆ خوارێز و دوای مردنی ئەویش لە لایەن سەباستیان لێردۆ دی تێژێدا، پێکهێنرا، هەر زوو لە لایەن پیاوێکی سەربازی لاو کە ناوی پۆرفیریۆ دیاز بوو تووشی ڕووبەڕووبوونەوە هات. دیاز جەنەڕاڵێکی سەرکەوتوو بوو لە جەنگی دژی فەڕەنسیەکان دا و ئارەزووی دەسەڵاتگرتنەدەستی تیا دروستبووبوو. ئەو سوپایەکی یاخیبووی پێکهێناو لە تشرینی دوەمی ١٨٦٤ دا لە شەڕی تیکۆك دا بەسەر سوپای حکومەت دا سەرکەوت. لە مانگی مایسی ساڵی دواتردا خۆی بە سەرۆك کۆمار هەڵبژارد. بەشێوەیەکی بەردەوام و بێ پچڕانێکی ئەوتۆ و بە شێوازێکی ئەسۆریتاریان فەرمانڕەوایی مەکسیکی کرد تا ڕاماڵینی دەسەڵاتەکەی لە کاتی بەرپابوونی شۆڕش دا سیوچوار ساڵ دوای ئەوەی دەسەڵاتی گرتەدەست.

بە هەمانشێوەی تۆربیدێ و سانتا ئانای پێش خۆی، دیاز فەرماندەیەکی سەربازی بوو. ئەم شێوە ڕێچکەیە بەرەو سیاسەت بێگومان لە ویلایەتە یەکگرتوەکانیش دا هەبوو. یەکەم سەرۆکی ویلایەتەیەکگرتوەکان، جۆرج واشنتۆن جەنەڕاڵی سەرکەوتووی جەنگی سەربەخۆیی بوو. یولیسیس ئێس گرانت یەکێك لە جەنەڕاڵە سەرکەوتوە فیدراڵیەکان لە ساڵی ١٨٦٩ بوە سەرۆك و دوایت دی ئایزنهاوەر، فەرماندەی گشتی هێزە هاوپەیمانەکان لە ئەورووپادا لە کاتی جەنگی دوەمی جیهانی دا، لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٥٣ و ١٩٦١ سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتوەکان بوو. بە پێچەوانەی تۆربیدێ و سانتا ئانا و دیاز

هیچ یەکێك لەم پیاوە سەربازیانە هێزی بۆ دەسەڵات گرتنەدەست بەکارنەهێنا. لە هەمانکات دا پەنایان بۆ هێز نەبرد بۆ ئەوەی لە دەسەڵات دا بمێننەوە. ئەوان پەیڕەوی دەستووریان کرد. هەرەچەندە مەکسیك لە سەدەی نۆزدەیەم دا چەندین دەستووری گۆڕی، بەڵام ئەم دەستوورانە سنووری کەمیان بۆ دەسەڵاتی تۆربیدێ و سانتا ئاناو دیاز دانا. دەبوایە ئەم پیاوانە بە هەمان ئەو شێوەیەی دەسەڵاتیان گرتەدەست دەسەڵاتیان لێبسەنرێتەوە کە ئەویش بەکارهێنانی هێز بوو.

دیاز مافی موڵکداری خەڵکی پێشێلکرد و ڕێگای بۆ زەوتکردنی بڕێکی زۆری زەوی خۆشکرد و مۆنۆپۆلی و دیاری دەبەخشیە لایەنگرانی لە هەموو بوارەکانی بزنس دا لەوانەش لە بوارەکانی بانکی دا. شتێکی نوێ لەم ڕەفتارەی دیاز دا نەبوو، چونکە هەمان ئەو ڕەفتارانە بوون کە داگیرکارە ئیسپانییەکان پێشتر کردبوویان و سانتا ئاناش دوای ئەوان لەسەری ڕۆیشت.

هۆکاری ئەوەی کە ویلایەتە یەکگرتوەکان پیشەسازی بانکی ئەوتۆی هەبوو کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی باشتر بوو بۆ برەوپێدانی ئابووری وولات، هیچ پەیوەندی نەبوو بە جیاوازی لە مەرامی ئەوانەی خاوەن بانك بوون. لە راستیدا مەرامی قازانجکردن کە بنەمای سروشتی قۆرخکاریی پیشەسازی بانکی بوو لە مەکسیك دا، لە ویلایەتە یەکگرتوەکانیش دا لە ئارادا بوو. بەڵام ئەم مۆتیڤی قازانجکردنە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا بە شێوەیەکی جیاواز لە ڕێگەی دەزگای تەواو جیاوازەوە ئاڕاستە دەکرا. خاوەن بانکەکان ڕووبەڕووی دەزگای ئابووری جیاواز بوونەوە، دەزگایانی ئەوتۆ کە ناچاری ڕکابەریی زۆر توندتری کردن. ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر لەبەر ئەوە بوو کە ئەو سیاسیانەی ڕێنماییان بۆ خاوەن بانکەکان دەرکرد بۆخۆیان ڕووبەڕووی هاندانی جیاواز بوونەوە کە لە لایەن دەزگای سیاسی جیاوازەوە داڕێژرابوون. لە راستیدا، لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم دا، ماوەیەکی کەم دوای ئەوەی دەستووری ویلایەتە یەکگرتوەکان کەوتە کار، سیستەمێکی بانکی هاوشێوەیەی ئەوەی کە دواتر لە مەکسیك دا باڵادەست بوو، خەریك بوو سەرهەڵبدا. سیاسییەکان دەستیان بە دامەزراندنی بانکی دەوڵەتی خاوەن مۆنۆپۆلی کرد و ئەم بانکانەشیان دەدایە هاوڕێ و شەریکەکانیان، بەرامبەر وەرگرتنی بەشێك لەو قازانجەی بانکەکان دەیانکرد. بانکەکانیش خێرا کەوتنە سەر بزنسی پێدانی قەرز بەو سیاسیانەی کە

چاودێریان دەکردن هەروەك لە مەکسیك باو بوو. ئەم بارودۆخە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دا نەیتوانی بەرگە بگرێ، چونکە ئەو سیاسیانەی هەوڵی دامەزراندنی بانکی خاوەن مۆنۆپۆلی یان دەدا بە پێچەوانەی هاوشێوەکانیان لە مەکسیك ناچار بوون ڕووبەڕووی هەڵبژاردن و هەڵبژاردنەوە ببنەوە. دامەزراندنی بانکی مۆنۆپۆلی و پێدانی قەرز بە سیاسییەکان بزنسێکی باشە بۆ ئەو سیاسییانە ئەگەر بۆیان بچێتە سەر، هەرچەندە ئەمە لە بەرژەوەندی هاوڵاتییان دا نییە. بە پێچەوانەی مەکسیك، لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دا هاوڵاتییان دەیانتوانی لێپرسینەوە لەگەڵ سیاسییەکان دا بکەن و ئەوانەی پێگەکانیان بۆ دەوڵەمەندبوونی خۆیان یان دامەزراندنی مۆنۆپۆلی بۆ دەستوپێوەندەکانیان بەکاردەهێنا، وەدەرنێن.

لە ئەنجامی ئەم پرۆسەیەدا، مۆنۆپۆلی لە سیستەمی بانکی دا شکستیهێنا. دابەشبوونی فراوانی مافە سیاسییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دا، بەتایبەتی بە بەراوورد لەگەڵ مەکسیك دا، زامنی ڕەخساندنی دەرفەتی یەکسان بوو بۆ وەرگرتنی قەرز و پەیداکردنی پێویستیە داراییەکان. ئەمەش بە دەوری خۆی بوە هۆی ئەوەی ئەوانەی خاوەنی ئایدیا و داهێنان بوون سوودیان لێوەربگرن.

## گۆڕانکاری بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکان

لە ساڵانی ١٨٧٠ و ٨٠ کان دا جیهان لە گۆڕان دا بوو. ئەمەریکای لاتین لەم گۆڕانکاریانە بەدەر نەبوو. ئەو دەزگایانەی پۆرفیرۆ دیاز دایمەزراندن هاوشێوە نەبوون لەگەڵ ئەوانەی سانت ئانا و ئەوانەی دەوڵەتی کۆلۆنیالی ئیسپانی دا. ئابووری جیهان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم دا بوژایەوە و نوێکارییەکانی بواری گواستنەوە لە چەشنی بەلەمی هەڵمی و شەمەنەفەر بونە هۆی فراوانبوونی گەورەی بازرگانی نێودەوڵەتی. ئەم شەپۆلە گەردوونگیریە (Globalization) مانای وابوو کە وڵاتانی خاوەن دەرامەتی سروشتی وەك مەکسیك و ووردتریش نوخبەکانی ئەو وڵاتانە دەیانتوانی خۆیان دەوڵەمەند بکەن لە ڕێگەی هەناردەکردنی کەرەستەی خاو و دەرامەتە سروشتیەکان بۆ وڵاتانی وەکو باکووری ئەمەریکا یان ئەورووپای ڕۆژئاوا کە لە قۆناخی

پەرەپێدانی پیشەسازی دا بوون. دیاز و دەستوپێوەندەکانی خۆیان لە ناو جیهانێکی جیاواز و بەردەوام گۆڕاودا دۆزیەوە. ئەوان تێگەیشتن کە پێویستە مەکسیکیش خۆی بگۆڕێ. بەڵام ئەمە مانای لەڕیشەهێنانی دەزگا کۆلۆنییەکان و جێگرتنەوەیان بە دەزگایانی هاوشێوەی ئەوانەی ویلایەتە یەکگرتوەکان نەبوو. لە بری ئەمە گۆڕانکارییەکانی ئەوان گۆڕانکاری پشبەستوو بوون بە ڕێچکەکانی پێشتر (Path dependant change) و تەنیا گواستنەوە بوون بۆ قۆناخی دوەمی دامەزراندنی دەزگاکان کە پێشتر بووبوونە هۆی ئەوەی زۆربەی وڵاتانی ئەمەریکای لاتین هەژار و نایەکسان بن.

گەردوونگیری بوە هۆی ئەوەی کە ناوچە فراوان و کراوەکانی هەردوو ئەمەریکا (سنووره کراوەکانی) بایەخدار بن. زۆرجاریش ئەم ناوچانە بە شێوەیەکی خەیاڵی کراوە بوون چونکە دانیشتوانە خۆماڵییەکەی ئەمەریکا کە زۆر بێڕەحمانە تالانکران، لەو ناوچانەدا نیشتەجێبوون. بە هەمانشێوە، هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ئەم دەرامەتە نوێیە بایەخدارانە لە نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەیەم دا، یەکێك بوو لە پرۆسە چارەنوسازەکان لە ئەمەریکا دا. کرانەوەی لە ناکاوی ئەم سنووره بایەخدارانە نەبوونە هۆی سەرهەڵدانی پرۆسەی هاوشێوە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئەمەریکای لاتین دا، بەڵکو بوونە هۆی زیاتر لێکترازانیان. ئەمەش لە ئەنجامی بوونی جیاوازی لە دەزگاکانی ئەم وڵاتانەدا بەتایبەتی ئەو دەزگایانەی پەیوەندیان بە تەرخانکردنی زەوییەوە هەبوو. لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا زنجیرەیەکی درێژی یاسا دانان، هەر لە یاسای زەویوزاری ساڵی ١٧٨٥ تا یاسای هۆمستێدی ساڵی ١٨٦٢ بواری زۆری بۆ بەدەستهێنانی زەوی ڕەخساند. هەرچەندە دانیشتوانی خۆماڵی سەر ئەم زەوییانە پشتگوێخران، بەڵام ئەمە بوە هۆی دروستبوونی ناوچەی ئیگالیتاری و چالاك لە ڕووی ئابوورییەوە. لەگەڵ ئەمەش دا دەزگا سیاسییەکانی زۆربەی وڵاتانی ئەمەریکای لاتین، ئەنجامی جیاوازیان هێنایەئاراوە. زەوی ئەو ناوچانە درانە خاوەن دەسەڵات و ئەوانەی خاوەن سامان و پەیوەندی بوون، ئەمەش بوە هۆی زیاتر دەوڵەمەندبوونی ئەو کەسانە.

دیاز دەستی بە هەڵوەشاندنەوەی زۆربەی ئەو دەزگا کۆڵۆنیاڵیانە کرد کە ڕێگەیان لە بازرگانی نێودەوڵەتی گرتبوو چونکە پێیوابوو ئەم بازرگانیکردنە

ئەو و لایەنگرانی دەوڵەمەند دەکا. بەهەرحاڵ، ئەو لەسەر مۆدێلەکەی خۆی بەردەوامبوو، مۆدێلێك نەك لەسەر شێوەی ئەو جۆرە پەرەپێدانە ئابوورییەی کە لە باکووری ڕیۆ گراندی بینیبووی، بەڵکو لە سەر شێوەی کۆرتیز و پیزارۆ و دی تۆلیدۆ کە بەهۆیەوە نوخبە بوونە خاوەنی سامانی زۆر لە کاتێك دا خەڵکی تر بەهەژاری مانەوە. کاتێك نوخبە وەبەرهێنانی کرد ئابووری کەمێك گەشەیکرد بەڵام هەمیشە ئەم جۆرە گەشەکردنە ئابوورییە مایەی نائومێدی بوو. ئەم گەشەکردنە لەسەر حسابی ئەوانە ئەنجامدرا کە لە سیستەمە نوێیەکەدا مافیان نەبوو، وەکو گەلی یاکۆی لە سۆنۆرا لە ناوچەرگەی نۆگالیس دا. لە نێوان ساڵانی ۱۹۰۰ و ۱۹۱۰ دا نزیکەی سی هەزار کەس لە گەلی یاکۆی دەرکران و کرانە کۆیلە و ڕەوانەکران بۆ کێڵگەی بەرهەمهێنانی هینیکین لە یۆکاتان (فایبەری ڕووەکی هینیکین بۆ هەناردەکردن بایەخدار بوو چونکە بۆ دروستکردنی گوریس و بەن بەکاردەهێنرا).

بەردەوامبوونی ئەو جۆرە دەزگایانەی نامۆ بوون بە گەشەکردن لەسەدەی بیستەم دا لە مەکسیك و ئەمەریکای لاتین دا، بە باشی لە دەرخستنی ئەو ڕاستیەوە دەردەکەوێ کە، بە هەمانشێوەی سەدەی نۆزدەیەم، ئەو جۆرە شێوازە لە سەدەی بیستەمیش دا بوە هۆی چەقبەستنی ئابووری و ناسەقامگیری سیاسی و شەڕی ناوخۆ و کۆدیتا، لە کاتێك دا گروپە جیاوازەکان بۆ قازانجی خۆیان هەوڵی دەسەڵات گرتنە دەستیان دەدا. لە کۆتایی دا دیاز لە لایەن هێزە شۆڕشگێڕەکانەوە لە ساڵی ۱۹۱۰ لەسەر دەسەڵات لابرا. دوابەدوای شۆڕشی مەکسیك، شۆڕش لە بۆلیڤیا لە ساڵی ۱۹۵۲ و کوبا لە ساڵی ۱۹۵۹ و نیکاراگوا لە ساڵی ۱۹۷۹ بەرپاکرا. لە کاتێك دا جەنگی ناوخۆ لە کۆلۆمبیا و ئێل سەلڤادۆر و گواتیمالا و پیرۆ درێژەی کێشا. زەوتکردنی یان هەڕەشەی زەوتکردنی موڵك وماڵ بەردەوامبوو لەگەڵ چاکسازی فراوانی زەویوزار (یان هەوڵی چاکسازی) لە بۆلیڤیا و بەرازیل و چیلی و کۆلۆمبیا و پیرۆو ڤەنزەوێلا. شۆڕش و زەوتکردن و ناسەقامگیریی سیاسی، شانبەشانی حکومەتە سەربازییەکان و شێوازی جیاوازی دیکتاتۆری، بەردەوامبوون. هەرچەندە گۆڕانکاری کەمکەم بەرەو مافی سیاسی زیاتر ئەنجامدرا، بەڵام تەنیا لە ساڵانی ۱۹۹۰ ەکان دا زۆربەی وولاتانی ئەمەریکای لاتین بوونە وولاتی دیموکراسی و تەنانەت ئەو کاتەش لە گێژاوی ناسەقامگیریدا نقومبوون.

ناسەقامگیریی هاوکات بوولەگەلّ چەوساندنەوە و کوشتنی خەلّك. لە سالّی ١٩٩١ دا ڕاپـۆرتی کۆمسیۆنی نەتـەوەیی بـۆ دەرخـستنی ڕاسـتییەکان و ئاشـتبوونەوەی گـشتی لـە چـیلی ڕایگەیانـد کـە لـە سـەردەمی دیکتاتۆریـەتی پینۆشـێ دا لـە نێـوان سـالاّنی ١٩٧٣ و ١٩٩٠ دا ٢,٢٧٩ کـەس لەبـەر هۆکـاری سیاسی کوژراون و نزیکەی ٥٠,٠٠٠ کەس بەندکراون و سەدان هەزار کەسیش لـە سـەر کارەکانیـان لابـران. کۆمـسیۆنی گۆاتیمـالا بـۆ ڕاپـۆرتی ڕوونکردنـەوەی مێـژوویی لـە سـالّی ١٩٩٩ دا ٤٢,٢٧٥ قوربـانی دەسنیـشانکرد، هەرچـەندە سەرچاوەکانی تـر ئاماژەیـان بـەوە دا کـە تـا ٢٠٠,٠٠٠ کـەس لـە نێـوان سـالاّنی ١٩٦٢ و١٩٩٦ لـە گۆتیمـالادا کـوژراون، ٧٠,٠٠٠ کـەس لەسـەردەمی ڕژێمـی جەنەرال ئیفرەین ڕیۆس مۆنت کوژراون کە توانی ئەوەندە بێباکانە ئەم تاوانانە ئەنجامبدا کە لە هەلّبژاردنەکانی سالّی ٢٠٠٣ دا خۆی بۆ سـەرۆکایەتی بپالێوی، بەلاّم خۆشبەختانە سەرنەکەوت. کۆمسیۆنی نەتەوەیی لەسەر دیارنەمانی خەلّك لە ئەرجەنتین ژمارەی ئەوانەی لـە لایـەن سـوپاوە لـە سـالاّنی نێـوان ١٩٧٦ تـا ١٩٨٣ کوژراون بە ٩,٠٠٠ کەس مەزەندە کرد، هەرچەندە تێبینی ئـەوەیکرد کـە دەشێ ژمارەی ڕاستەقینە زیاتر بێ. ( ڕێکخراوانی مافی مرۆڤ ئـەم ژمارەیـە بـە ٣٠,٠٠٠ کەس دەخەملّێنن).

## پەیداکردنی ملیاردێك یان دوو

کاریگەرییە دریژخایەنـەکانی ڕێکخستنی کۆمـەلّگای کۆلۆنیـالّی و پاشمـاوە دەزگاییـەکانی ئەوکۆمەلّگایانـە جیاوازییـەکانی ئـەمرۆی نێـوان ویلایەتـە یـەککگرتوەکان و مەکـسیکیان درشـتوە و لێرەشـەوە جیـاوازی نێـوان هـەردوو بەشەکەی نۆگالّس. جیاوازی نێـوان ئـەوەی کـە چـۆن بیـل گـەیتس و کـارلۆس سلیم بوونە دوو دەولّەمەنـدترین پیـاوی جیهـان ـ هـەروەها ڕەنگـە وارن بـەفیت بچێتە ڕیزەوە ـ ئەو هێزانە ڕووندەکاتـەوە کـە لـە کـاردان. هەلّکـشانی گـەیتس ومایکرۆسۆفت ئاشکرایە، بەلاّم پێگـەی گـەیتس وەك دەولّەمەنـدترین کـەس لـە جیهـان دا و دامەزرێنـەری یـەکێك لـە نوێکـارترین کۆمپانیـا لـە ڕووی تەکنەلۆجیییـەوە، نـەبوە ڕێگـر لەبـەردەم وەزارەتـی دادی ئەمـەریکا بـۆ

تۆمارکردنی سکاڵای مەدەنی دژی مایکرۆسۆفت کۆرپەرەیشن لە ٨ مایسی ١٩٩٨ دا بەو تۆمەتەی کە مایکرۆسۆفت دەسەڵاتی مۆنۆپۆلی خراپ بەکارهێناوە. بەتایبەتی مەسەلەکە بریتیبوو لەو شێوەیەی مایکرۆسۆفت وێب برۆسەرەکەی ئینتەرنێ، ئێکسپلۆرەری بە ئۆپەرەیتینگ سیستەمی ویندۆزەوە بەستبۆوە. حکومەت ماوەیەکی زۆر بوو گەیتسی خستبوە ژێر چاودێری و هەر لەسەرەتای ساڵی ١٩٩١ ەوە دەستی بە لێکۆڵینەوە کردبوو دەربارەی ئەوەی کە ئایا مایکرۆسۆفت مۆنۆپۆلیەکەی لەسەر ئۆپەریتینگ سیستەمی پی سی خراپ بەکارهێناوە. لە ساڵی ٢٠٠١ دا مایکرۆسۆفت گەیشتە ڕێکەوتنێك لەگەڵ وەزارەتی داد و باڵەکانی کران، هەرچەندە سزاکەی کەمتر بوو لەوەی کەسانی زۆر داوایان دەکرد.

لە مەکسیك، کارلۆس سلیم پارەکەی لە ڕێگەی نوێکارییەوە پەیدانەکرد. ئەو لەسەرەتادا لە مامەڵەکردن لە بازاڕی بۆرسە و کڕین و دامەزراندنەوەی کۆمپانیا شکستخواردوەکان برەوی پەیداکرد. کۆدێتا گەورەکەی بریتیبوو لە کڕینی تێلمێکس، کە کۆمپانیایەکی خاوەن مۆنۆپۆلی بواری گەیاندن بوو لە لایەن سەرۆك کارلۆس سالیناس لە ساڵی ١٩٩٠ دا فرۆشرا بە کەرتی تایبەت. حکومەت لە ئەیلولی ١٩٨٩ دا بڕیاری فروشتنی ٥١٪ پشکە خاوەن دەنگەکانی کۆمپانیا (٢٠,٤٪ هەموو سەرمایەی کۆمپانیا) کەی دا و لە تشرینی دوەمی ١٩٩٠ دا نرخە پێشنیازکراوەکان گەیشتنە حکومەت. هەرچەندە سلیم بەرزترین نرخی پێشکەشنەکردبوو، بەڵام کۆنسۆرتیۆمێك کە لە لایەن گروپۆ کۆرسۆ، کە هی ئەو بوو، سەرکردایەتیکرا مەزاتەکەی بردەوە. لە بری ئەوەی یەکسەر پارەی پشکەکان بدا، سلیم توانی پێدانی ئەو پارەیە دوا بخا و ئەو قازانجەی لە کۆمپانیاکە دەستیدەکەوت بەکارهێنا بۆ دانی پارەی پشکەکان. ئەوەی کە تا ئەو کاتە مۆنۆپۆلیەکی کەرتی گشتی بوو، بوە مۆنۆپۆڵی سلیم و داهاتێکی زۆری دەستکەوت.

ئەو دەزگا ئابوورییانەی کارلۆس سلیمیان کرد بەو کەسەی ئێستا، جیاوازی زۆریان لەگەڵ ئەوانەی ویلایەتە یەکگرتوەکان دا هەیە. ئەگەر تۆ کارزانێکی مەکسیکی بیت ئەوا بەربەستەکانی بەردەمت کاریگەری گەورەیان لەسەر دامەزراندنی بزنسەکەت هەیە لە هەموو قۆناخەکانی کارەکەت دا. ئەم بەربەستانەش بریتین لە مۆڵەتی گرانی دامەزراندنی بزنسەکەت و ئەو هێڵە

سورانەی کە دەبێ بیانبڕی و ئەو سیاسی و کاربەدەستانەی دێنە سەر ڕێگەت و زەحمەتی بەدەستهێنانی هاوکاری دارایی لە کەرتی دارایی کە زۆرجار ڕێکەوتنی پشت پەردەیان لەگەڵ ئەو کاربەدستانەدا هەیە کە تۆ دەتەوێ ڕکابەرییان بکەیت. ئەم بەربەستانەش دەشێن لە جۆرێك بن شکاندنیان ئەستەم بێ یان دوورخستنەوەت بێ لە بوارە چەورەکان دا یان هاورێیەکی نزیکت بێ بۆ دوورخستنەوەی ئەوانەی کێبڕکێ لەگەڵ دا دەکەن. جیاوازی نێوان ئەم دوو سیناریۆیە بێگومان دەوەستێتە سەر ئەوەی کێ دەناسی و دەتوانی کاریگەریت لەسەر کێ هەبێ - بەڵێ دەتوانی بەرتیل بدەیتە کێ. کارلۆس سلیم پیاوێکی بەتوانا و تموحدار و خاوەن باکگراوندێکی ئاسایی کۆچکردوانی لوبنانی و سەرکەوتوو بوو لە بەدەستهێنانی گرێبەستی تایبەت دا، توانی بازاڕی گەیاندن لە مەکسیك دا مۆنۆپۆل بکا و دواتریش پەل بۆ وولاتانی تری ئەمەریکای لاتین بهاوێژێ.

مۆنۆپۆلی تێلمێکس لە لایەن سلیمەوە، ڕووبەڕووی تەحەدا بۆوە، بەڵام ئەم تەحەدایانە سەرکەوتوونەبوون. لە ساڵی ١٩٩٦ دا ئاڤان تێل کە کۆمپانیایەکی تەلەفۆنی ماوە دوورە، داوای لە کۆمسیۆنی ڕکابەرێتی مەکسیکی کرد تا لەوە بکۆڵێتەوە کە ئایا تێلمێکس پێگەیەکی باڵادەستی لە بازاڕی گەیاندن دا هەیە. لە ساڵی ١٩٩٧ کۆمسیۆن ڕایگەیاند کە تێلمێکس دەسەڵاتی مۆنۆپۆلی گەورەی هەیە لە بواری تەلەفۆنی ناوخۆ و تەلەفۆنی ماوە دووری نێو وولات و ماوە دووری نێودەوڵەتی دا. بەڵام هەوڵەکانی کۆمسیۆن لە مەکسیك بۆ کەمکردنەوەی ئەم مۆنۆپۆلیانە هیچ ئاکامێکی نەبوو. هۆکارێکی ئەمە ئەوە بوو کە سلیم و تێلمێکس دەتوانن پەنابەرنەبەر ئەوەی پێیدەڵێن ڕیکێرسۆ دی ئەمپارۆ کە واتای (داوای پاراستن) دەگەیەنێ. ئەمپارۆ داواکردنە بۆ ئەوەی داکۆکی بکەیت کە یاسای پەیوەندار لەسەر تۆ جێبەجێنابێ. ئایدیای ئەمپارۆ دەگەڕێتەوە بۆ دەستووری مەکسیکی ساڵی ١٨٥٧ و لە بنەڕەت دا بۆ پاراستنی ماف و ئازادی تاك خرایە دەستوورەوە، بەڵام لای تێلمێکس و مۆنۆپۆلیەکانی تری مەکسیك کرایە ئامرازێکی بەهێزی چڕکردنەوەی دەسەڵاتی مۆنۆپۆلی. لە بری پاراستنی مافەکانی خەڵك ئەمپارۆ کەلێنی خستۆتە یەکسانی بەرامبەر یاسا.

سلیم، پارەکەی لە ئابووری مەکسیك دا تا ڕادەیەکی زۆر بەهۆی

پەیوەندییە سیاسییەکانیەوە پێکەوەناوە. کە سلیم ویستی لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا ئەم جۆرە سەرکێشیە بکا سەرکەوتوو نەبوو. لە ساڵی ١٩٩٩ دا گروپۆ کۆرسۆکەی سلیم کۆمپانیای فروشتنی کۆمپیوتەر، کۆمپ یو ئێس ئەی، کڕی. لەو دەمەدا کۆمپ یو ئێس ئەی مافی فروشتنی کۆمپیوتەری دابوە کۆمپانیای خزمەتگوزاری (COC) تا کومپیوتەرەکانی لە بازاڕەکانی مەکسیك دا بفرۆشێ. سلیم هەر زوو ئەو گرێبەستەی وەلانا و ویستی بۆخۆی زنجیرە کۆگایەکی فرۆشتن بکاەوە بەبێ هیچ کێبڕکێیەك لە لایەن (COC). بەڵام (COC) لە دادگای دالآس دا شکاتی لە کۆمپ یو ئێس ئەی کرد. لە دالآس دا ئەمپارۆ نەبوو سلیم پەنای بۆ بەرێ و دۆڕاندی و سزای ٤٥٤ ملیۆن دۆلاری بەسەردا سەپا. پارێزگارەکەی (COC) مارك وەرنەر دواتر ڕایگەیاند کە (پەیامی ئەم بڕیارەی دادگا ئەوەیە کە لەم سەردەمەی ئابووری جیهانیدا پێویستە کۆمپانیاکان ڕێز لە یاساکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان بگرن گەر بیانەوێ بێنە ئێرە). کاتێك سلیم ڕووبەڕووی دەزگاکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان بۆوە تاکتیکە ئاساییەکانی بۆ پەیداکردنی پارە کارینەکرد.

## بەرەو تیۆرییەك بۆ نایەکسانی لە جیهان دا

ئێمە لە جیهانێکی نایەکسان دا دەژین. جیاوازی نێوان نەتەوەکان هاوشێوەی جیاوازییەکانی نێوان هەردوو بەشەکانی نۆگالسە، بەڵام لەسەر ئاستێکی گەورەتر. لە وڵاتە دەوڵەمەندەکان دا تاکەکان تەندروست ترن و زیاتر دەژین و ئاستێکی بەرزتری پەروەردەیان هەیە. لە هەمانکات دا، سوود لە خزمەتگوزاری جیاواز و بژاردەی جیاواز لە ژیان دا وەردەگرن، هەر لە پشوو وەرگرتنەوە تا هەڵبژاردنی پیشە کە خەڵك لە وڵاتە هەژارەکان دا خەونیان پێوەدەبینن. خەڵکی وڵاتە دەوڵەمەندەکان لەسەر ڕێگای بێ چاڵ و تاسە دەهاژوون و خاوەنی تەواڵێ و کارەبا و ئاوی پاکن لە خانوەکانیان دا. خاوەن حکومەتی ئەوتۆن کە بە شێوەیەکی ڕەشبگیر نایانگرن و بێزاریان ناکەن، بە پێچەوانەوە حکومەتەکانیان خزمەتگوزارییان بۆ دابیندەکەن لەشێوەی پەروەردە و پاراستنی تەندروستی و ڕێگاوبان و یاساو دابینکردنی ئاسایش.

دیسانەوە شایانی باسە کە هاوڵاتییانی ئەو وڵاتانە لە هەڵبژاردنەکان دا دەنگ دەدەن و تـا ڕادەیـەك ڕایـان وەردەگـیرێ لـە شـێوازی ئاڕاسـتەی سیاسـی وڵاتەکانیان دا.

جیاوازییە گەورەکانی نایەکسانی لە جیهان دا لای هـەموو کـەس ئاشـکرایە، تەنانەت لای ئەوانەش کە لەوڵاتە هەژارەکان دا دەژین، هەرچەندە ژمارەیـەکی زۆر لەوانە خاوەنی تەلەفزیۆن یان ئینتەرنێ نین. هـەر ئـەم تێـڕوانین و واقیعـی ئەم جیاوازییانەیە وایکردوە خەڵك لە ڕیۆ گراندی یان دەریـای ناوەڕاسـتەوە بـە شێوەیەکی نایاسایی بپەڕنەوە بـۆ ئـەوەی سـوود لـە دەرفـەت و ئاسـتی ژیـانی وڵاتە دەوڵەمەندەکان وەربگرن. ئەم نایەکسانییە تەنیا کاریگەری لەسەر ژیانی تاکـەکانی وڵاتـە هـەژارەکان نییـە، بـەڵکو نـاڕەزایی و بێـزاری لـە ویلایەتـە یـەکگرتوەکان و وڵاتـانی تـردا دروسـتدەکا کـە ئاکـامی سیاسـی گـەورەی لێدەکەوێتەوە. تێگەیشتن لەوەی بۆچی ئەم جیاوازییانە هەن و چی دروسـتیان دەکـا، تیـشکۆی ئـەم کتێبەیـە. تێگەیـشتنەکە بـە تـەنیا ئامـانج نییـە، بـەڵکو هەنگاوی یەکەمە بۆ گەڵاڵەکردنی ئایدیای باشتر دەربارەی چۆنیەتی باشـکردنی ژیانی ملیاردان کەس کە هێشتا بە دەست هەژارییەوە دەناڵێنن.

جیاوازییەکانی نێوان هەردوو دیوی شوراکە لە نۆگـاڵس، تـەنیا مـشتێکە لـە خەروارێك. هەروەك چۆن بەشەکانی تری باکووری مەکسیك سـوود لـە بازرگـانی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتوەکان دا وەردەگرن، هەرچەندە هەموویان یاسایی نـین، دانیـشتوانی نۆگاڵـسیش لـە چـاو دانیـشتوانی تـری مەکـسیك دا، کـە داهـاتی سـاڵانەی خیزانێـك نزیکـەی ٥,٠٠٠ دۆلارە، گوزەرانیـان باشـترە. هۆکـاری ئـەم باشتر بوونە ڕێژەییەی گوزارەنی خـەڵك لـە نۆگـاڵس، سـۆنۆرا دەگەڕێتـەوە بـۆ بـوونی کارگـەکانی مـاکیلادۆرا کـە دەکەونـە ناوچـەی پـارکی پیـشەسازییەوە. یەکەم کارگە لە لایەن ڕیچارد کامبێڵ جەی ئاڕ دامەزرا کە دروسـتکاری زەمیلـە بوو. یەکەم کۆمپانیا کە یەکێك لەو کارگانـەی بـەکرێ گـرت بریتیبـوو لـە کـۆین ئارت کە کۆمپانیایەکی دروستکاری ئالاتی مۆسیقا بوو خاوەنەکەی ڕیچارد بۆس کە لەهەمانکات دا خاوەنی کۆمپانیای ئـەرتلی فلـوت ئاند ساکسۆفۆن بـوو لـە نۆگـاڵس، ئـەریزۆنا. دوای کـۆین ئـارتیش کۆمپانیاکـانی مێمـۆرێکس (وایـەری کۆمپیوتـەر) و ئـەڤینت (جلوبـەرگی خەسـتەخانە) و گرانـت (چـاویلکە) و چەمبەرلەین (دروستکاری ئـامێری کردنـەوەی دەرگـای گـەراج ) و سامسۆنایت

(جانتـا) لەوێـدا کاریـانکردوە. شـایانی باسـە کـە ئەمانـە هـەموویان بـزنس و بزنـسمانی ئەمـەریکی بـوون و سـەرمایە و تەکنـەلۆجیای ئەمـەریکییان بـەکارهێناوە. سەرچـاوەی گـەورەترین خۆشـگوزەرانی نۆگـالس، سـۆنۆرا، بـە بـەراورد لەگـەڵ ناوچـەکانی تـری مەکـسیك، لـە دەرەوەی مەکـسیك سەرچاوەدەگرێ.

جیاوازییەکانی نێوان ویلایەتە یەکگرتوەکان و مەکسیك بە بـەراوورد لەگـەڵ ناوچەکانی تری جیهان هێشتا کەمن. تاکێکی دەرامەت مامناوەنـدی ئەمـەریکی حـەوت هێنـدەی هـەمان تـاکی مەکـسیك و دە هێنـدەی تـاکێکی پـیرۆ یـان ناوەڕاستی ئەمەریکا خۆشگوزەرانترە. هەمان تاکی ئەمـەریکی بیـست هێنـدەی تـاکێکی وولاتـانی باشـووری بیابـانی ئـەفریقی و چـل هێنـدەی ئەوانـەی لـە هـەژارترین وولاتـی ئەفـەریفای وەك مـالی و ئەسـیوپیا و سـیارا لیـۆن دا دەژیـن خۆشگوزەرانترە. تەنیا ویلایەتە یەکگرتوەکان نییە کە ئاستی گوزەرانی بەرزە، بەڵکو گروپێکی بچووکی وولاتانی دەوڵەمەند کە ژمارەیان تـادێ زیـاتر دەبـێ ـ زۆربەیان لە ئەورووپا و باکووری ئەمـەریکادان و لـە هـەمانکات دا وولاتـانی وەك ئوستڕالیا و یابان و نیو زیلاند و سینگاپور و باشووری کۆریا و تایوان ـ لـە خـۆ دەگرێ کە هاوڵاتییانیان ژیانێکی زۆر جیاواز لە ژیانی دانیشتوانی وولاتانی تری جیهان بەسەردەبەن.

هۆکاری ئەوەی نۆگاڵس، ئەریزۆنا زۆر لە نۆگاڵس، سـۆنۆرا دەوڵەمەنـد تـرە سادەیە، ئەویش بوونی دەزگایانی جیاوازە لە هـەردوو دیـوی سـنوورەوە. ئـەم دەزگا جیاوازانە هاندانی جیاواز بۆ دانیـشتوانی نۆگـاڵس، ئـەریزۆنا و نۆگـاڵس، سۆنۆرا دەرەخسێنن. ویلایەتە یـەکگرتوەکانی ئـەمرۆ زۆر لـە مەکسیك و پـیرۆ دەوڵەمەنـد تـرە لەبـەر ئـەوەی دەزگـا ئـابووری و سیاسـییەکانی ویلایەتـە یـەکگرتوەکان بـە شـێوەیەکی جیـاواز هانـدانیان بـۆ بزنـسەکان و تاکـەکان و سیاسییەکان دارشتوە. هەریەك لە کۆمەڵگاکان بە پێی کۆمەڵێك یاسای سیاسی و ئابووری کاردەکەن کـە لـە لایـەن حکومـەت و هاوڵاتییـان پێکـەوە دانـراون و جێبەجێـدەکرێن. دەزگـا ئابوورییـەکان هاندانـە ئابوورییـەکان دیاریدەکـەن: هاندانی خوێندنی زیاتر و پارەی زیاتر کۆبکەیتەوە و زیاتر وەبـەرهێنان بکـەیت و نوێکاری بکەیت و تەکنەلۆجییای نوێ بەکاربهێنی و شـتی تـر. ئـەوە پرۆسـە سیاسییەکانن کە دیاریدەکەن خەڵك لە سایەی چ جۆرە دەزگایەکی ئـابووری دا

بژی و هەر دەزگا سیاسییەکانن دیاریدەکەن ئەم پرۆسەیە چۆن کاردەکا. بۆ نموونە، دەزگا سیاسییەکانی نەتەوەیەکە توانای هاوڵاتییان دیاریدەکەن بۆ کۆنترۆڵکردنی سیاسییەکان و چۆنیەتی ڕەفتارکردنیان. ئەمەش بە دەوری خۆی ئەوە دیاریدەکا کە ئایا سیاسییەکان نوێنەری هاوڵاتییانن یا نا، هەڵبەتە بە شێوەیەکی پێرفێکت نا، یان دەتوانن ئەو دەسەڵاتەی پێیاندراوە بە خراپی بەکاربهێنن، یان دەسەڵاتیان گرتۆتەدەست بۆ کەڵەکردنی سامان بۆخۆیان و تەنیا مشووری ئەجێنداکانی خۆیان بخۆن، کە پێچەوانەی ئەجێندای هاوڵاتییانە. دەزگا سیاسییەکان جگە لە دەزگایانی تر، بریتین لە دەستوور و ئەو دەزگایانەی دیموکراسیبوونی وولاتێك دیاریدەکەن. ئەو دەزگایانەی دەسەڵات و توانای دەوڵەت دیاریدەکەن بۆ ڕێکخستن و حوکمی کۆمەڵگا. لە هەمانکات دا پێویستە ئەو فاکتەرانە لەبەرچاوبگیرێن کە چۆنیەتی دابەشکردنی دەسەڵات لە ناو کۆمەڵگادا دیاریدەکەن بەتایبەتی توانا و دەسەڵاتی گروپە جیاوازەکان کە پێکەوە و لە پێناوی هێنانەدی ئامانجەکانیان دا کاربکەن یان ڕێگر بن لەبەردەم خەڵکی تردا بۆ هێنانەدی ئامانجەکانیان.

لەبەر ئەوەی دەزگاکان لە ژیانی ڕۆژانەدا کار لەسەر ڕەفتار و هاندانەکان دەکەن، سەرکەوتن یان شکستهێنانی نەتەوەکان دیاریدەکەن. بەهرەی تاکەکان لە هەموو ئاستێکی کۆمەڵگادا گرنگە، بەڵام تەنانەت ئەم بەهرانەش پێویستیان بە چوارچێوەیەکی دەزگایی هەیە تا بیانکاتە هێزێکی پۆزەتیڤ. بیلْ گەیتس وەکو کەسایەتییە ئەفسانەییەکانی تر لە بواری پیشەسازی تەکنەلۆجییای زانیاری دا (وەکو پۆل ئەلن و ستیڤ بۆڵمەر و ستیڤ جۆبس و لاری پەیج و سێرجی برین و جێف بیزۆس)، بەهرە و خواستی لەبن نەهاتوویان هەبوو، بەڵام لە کۆتایی دا ئەو بەپیر هاندانەکانەوە چوو. سیستەمی خوێندنی ویلایەتە یەکگرتوەکان دەرفەتی بە گەیتس و ئەوانیتری وەك ئەو دا تا کۆمەڵێك شارەزایی فێربن کە تەواوکاری بەهرەکانیان بن. دەزگا ئابوورییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان بواری ئەوەی بۆ ڕەخساندن تا کۆمپانیاکانیان بە ئاسانی دابمەزرێنن بێئەوەی دووچاری کۆسپی ئەوتۆ ببن کە نەتوانن بەسەریان دا زاڵ بن. هەر ئەم دەزگایانە دەرفەتی پشتگیری دارایی بۆ پرۆژەکانیان لەبەردەم دا والاکردن. بازاڕی هێزی کاری ویلایەتە یەکگرتوەکان بوە هۆی ئەوەی کە بتوانن کەسانی شارەزا بەکرێبگرن و بازاڕی خاوەن ژینگەی ڕکابەریی کارێکی وایکرد

کۆمپانیاکانیان فراوانبکەن و بەرهەمەکانیان لەو بازاڕەدا بفرۆشن. ئەم کارزانانە هەر لەسەرەتاوە دڵنیا بوون لەوەی کە دەشیا ئەو پڕۆژانەی خەونیان پێوە دەبینین جێبەجێبکرانایە: ئەوان متمانەیان بە دەزگاکان و ئەو یاسایانە هەبوو کە ئەم دەزگایانە دەریاندەکردن و مەترسییان دەربارەی سەلامەتی مافی موڵکداری نەبوو. لە کۆتایی دا دەزگا سیاسییەکان پارێزەری سەقامگیری و بەردەوامی بوون. ئەم دەزگا سیاسییانە ئەو دڵنیاییەیان دەبەخشی کە مەترسی ئەوە نەبێ دیکتاتۆرێك دەسەڵات بگرێتەدەست و یاساکانی گەمەکە بگۆڕێ و سامانیان زەوتبکا و بیانخاتە بەندیخانە یان هەڕەشە لە ژیان و ماڵ و موڵکیان بکا. لە هەمانکات دا هەر ئەم دەزگا سیاسییانە زامنی ئەوە بوون کە هیچ بەرژەوەندییەك لە ناو کۆمەڵگادا نەتوانێ حکومەت بە ئاراستەیەکی کارەساتی ئابووری دا بەرێ، چونکە دەسەڵاتی سیاسی لە لایەکەوە سنووردار و لە لایەکی ترەوە هێند فراوان دابەشکراوە کە ئەو جۆرە دەزگا ئابورییانە دێننە کایەوە کە هاندانیان بۆ هێنانەدی خۆشگوزەرانی ڕەخساندوە.

ئەم کتێبە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە لە کاتێك دا دەزگا ئابوورییەکان گرنگن بۆ پیشاندانی ئەوەی کە وولاتێك هەژارە یان دەوڵەمەندە، ئەوە سیاسەت و دەزگا سیاسییەکانن ئەوە دیاریدەکەن کە وولاتێك چ جۆرە دەزگای ئابووری هەیە. لە ئاکام دا دەزگا ئابوورییە باشەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان لە ڕێگەی ئەو دەزگا سیاسییانەوە دروستبوون کە بەرەبەرە دوای ساڵی ١٦١٩ سەریانهەڵدا. تیۆرییەکەی ئێمە دەربارەی نایەکسانی لە جیهان دا ئەو پیشاندەدا کە چۆن دەزگا سیاسی و ئابوورییەکان کار لەسەر یەکتر دەکەن بۆ هێنانەئارای هەژاری یان خۆشگوزەرانی و چۆن ناوچە جیاوازەکانی جیهان بوونە خاوەنی کۆمەڵە دەزگای جیاواز. پێداچوونەوە خێراکەمان بۆ مێژووی هەردوو ئەمەریکا وامان لێدەکا لەو هێزانە تێبگەین کە دەزگا سیاسی و ئابوورییەکان دادەڕێژن. شێوازە جیاوازەکانی دەزگاکانی ئەمڕۆ ڕیشەی قووڵیان لە ناو ڕابوردوودا هەیە چونکە کاتێك کۆمەڵگا بە شێوازێکی تایبەت ڕێکدەخرێ، ئەم شێوازە هەوڵی مانەوە و بەردەوامی دەدا. ئەوە پیشاندەدەین کە ئەم ڕاستییە لە ڕێگای کار لەیەك کردنی دەزگا سیاسی و ئابوورییەکانەوە سەرچاوەدەگرێ.

ئەم مانەوە و بەردەوامییە و ئەو هێزانەی دروستیان دەکەن ئەوە شرۆڤە

دەکەن کە بۆچی نەهێشتنی نایەکسانی لە جیهان دا و دەوڵەمەندکردنی وولاتە هەژارەکان کارێکی هێندە زەحمەتە. هەرچەندە دەزگاکان هۆکاری ئەو جیاوازییانەن کە لە نێوان هەردوو نۆگاڵس و ویلایەتە یەکگرتوەکان ومەکسیک دا هەن، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەموو لایەك لە مەکسیك دا ڕازین بە گۆڕینی ئەو دەزگایانە. پێویستییەك نییە کە کۆمەڵگایەك ئەو دەزگایانە دابمەزرێنێ وکاریان پێبکا کە بۆ گەشەپێدانی ئابووری یان خۆشگوزەرانی هاولاتییانی باشترین دەزگان، چونکە ڕەنگە دەزگایانی تر باشتر بن بۆ ئەوانەی کۆنترۆڵی سیاسەت و دەزگا سیاسییەکان دەکەن. دەسەلاتداران لە لایەك و هاولاتییانی کۆمەڵگا زۆرجار لەسەر ئەوە ڕێکناکەون چ جۆرە دەزگایەك جێگەی ئەوانە بگرێتەوە کە کاتی گۆڕینیان هاتوە. کارلۆس سلیم خۆشحاڵ نەدەبوو ببینێ پەیوەندییە سیاسییەکانی نامێنن و ئەو کۆسپانەی بزنسەکەی دەپارێزن دەتوێنەوە - بەبێ گوێدانە ئەوەی کە دامەزراندنی بزنسی تر ملیۆنان خەڵکی تری مەکسیك دەوڵەمەند دەکەن - لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە سازانە لە نێوان دەسەلاتداران و بەشەکانی تری کۆمەڵگادا نییە، ئەو یاسایانەی کۆمەڵگایەکیان پێ بەڕێوەدەبرێ سیاسەت دیارییان دەکا: کێ دەسەلاتی دەبێ و ئەم دەسەلاتە چۆن بەکاردەهێنرێ. کارلۆس سلیم دەسەلاتی هەیە ئەوەی بیەوێ بەدەستی بهێنێ. دەسەلاتی بیل گەیتس زۆر سنووردارترە. هەر لەبەر ئەمەیە کە تیۆرییەکەمان تەنیا دەربارەی ئابووری نییە بەڵکو دەربارەی سیاسەتیشە. تیۆرییەکەمان دەربارەی کاریگەری دەزگاکانە لەسەر سەرکەوتن و شکستهێنانی نەتەوان، واتا ئابووری هەژاری و خۆشگوزەرانی، لە هەمانکات دا دەربارەی چۆنیەتی دامەزراندنی دەزگاکان و گۆڕانی ئەم دەزگایانەیە بە تێپەڕبوونی کات و چۆن ئەم دەزگایانە لە گۆڕانکاری لە ناوخۆیان دا شکستدەهێنن تەنانەت ئەگەر مایەی هەژاری و دەردەسەریش بن بۆ ملیۆنان کەس، واتا سیاسەتی هەژاری وخۆشگوزەرانی.

# ٢

# ئەو تیۆرییانەی کار ناکەن

## چۆنیەتی باری زەوی

کتێبەکەمان جەخت لەسەر شرۆڤەکردنی نایەکسانی لە جیهان دا و، لە هەمانکاتیش دا، شرۆڤەکردنی ئەو پاتێرنانە دەکا کە بە ئاسانی دەبینرێن و لە ناو ئەم نایەکسانییەدا هێلانەیان کردوە. یەکەم وولاتێک کە گەشەکردنی ئابووری بەردەوامی بەخۆوە بینی، بریتیبوو لە ئینگلتەرە ـ یان بەریتانیای مەزن و بە شێوەیەکی ئاساییش تەنیا بەریتانیا، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٧٠٧ دا، ئینگلتەرە و وێڵس و سکۆتلەندا یەکیانگرت. گەشەکردن لەم وولاتەدا بە هێواشی و لە نیوەی دوەمی سەدەی هەژدەیەم دا سەریهەڵدا کاتێک شۆڕشی پیشەسازی، کە لەسەر بنەمای پێشکەوتنە تەکنەلۆجیییەکان و خستنەگەڕی ئەم تەکنەلۆجیییانە دامەزرابوو، ریشەی داکوتا. بەپیشەسازیبوون لە ئینگلتەرە هەر زوو لە لایەن زۆربەی وولاتانی ئەورووپای رۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە پەیرەوکرا. لە هەمانکات دا، خۆشگوزەرانی ئینگلتەرە بەخێرایی لە ناو " کۆلۆنی نیشتەکاران" ی بەریتانیای وەك ئوسترالیا و کەنەدا و نیوزیلەندەدا دا بڵاوبۆوە. لیستی دەوڵەمەندترین سی وولاتی ئەمڕۆ، ئەم سیێ وولاتانە لەخۆ دەگرێ، جگە لە یابان و سینگاپوور و کۆریای باشوور. خۆشگوزەرانی ئەم سیێ وولاتەی دوایی، بەشێکە لە پاتێرنێکی فراوانتر کە تیایدا چەندین نەتەوەی رۆژهەڵاتی ئاسیا، لەوانە تایوان و دواتریش چین، گەشەکردنی خێرای تازەیان بە خۆوەبینی.

بەشی بنەوەی دابەشبوونی داهات لە جیهان دا، هەمان وێنەی ڕوون و زەقی ئەو دابەشبوونەی لەسەرەوە هەیە دەنەخشێنێ. ئەگەر لەبری ئامادەکردنی لیستی سی دەوڵەمەندترین وولاتی جیهان، لیستی سی هەژارترین وولات لە جیهانی ئەمڕۆدا ئامادە بکەیت، ئەوا نزیکەی هەموو ئەو سی وولاتە هەژارە

دەکەونە باشووری بیابانی ئەفریقاوە. وولاتانی تری وەك ئەفغانستان و هایتی و نیپال، هەرچەندە ناکەونە ئەفەریقاوە، لە هەندێك شتی گرنگ دا، هەروەك دواتر دەبینین، هاوشێوەی وولاتە ئەفریقیەکانن. ئەگەر پەنجا ساڵ بۆ دواوە بگەڕێیتەوە، ئەوا دەبینی کە ئەوانەی لە لیستی سی وولاتەکەی سەرەوەدان و ئەوانەی لە لیستی سی وولاتەکەی بنەوەدان جیاوازی زۆریان لەگەڵ ئەمڕۆدا نەبوە. سینگاپور و کۆریای باشوور لە لیستی سی وولاتە دەوڵەمەندەکەدا نەبوون و چەندین وولاتی جیاوازیش دەکەوتنە لیستی سی وولاتە هەژارەکەوە، بەلام وێنە گشتیەکەی دەمانبینی بە شێوەیەکی سەیر لەو وێنەیەی ئەمڕۆ دەچوو. سەد ساڵ یان سەد و پەنجا ساڵ بۆ دواوە بگەڕێوە، تا ڕادەیەکی زۆر هەمان ئەم وولاتانە لە هەمان گروپی ئەمڕۆدا دەبینی.

نەخشەی (٣)، چۆنیەتی باری زەوی لە ساڵی ٢٠٠٨ دا پیشاندەدا. ئەو وولاتانەی بە ڕەنگی ڕەشی تێر پیشاندراون، هەژارترین وولاتانی جیهانن، ئەو وولاتانەن کە تێکڕای داهاتی ساڵانەی تاکیان (لە لایەن ئابووریناسانەوە بە GDP ناودەبرێ) لە ٢,٠٠٠ دۆلار کەمترە. زۆربەی وولاتانی ئەفریقا دەکەونە ناو ئەم ڕەنگەوە، بەهەمانشێوەی ئەفغانستان و هایتی و بەشێك لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا (بۆ نموونە، کەمبۆدیا و لاوس). باکووری کۆریاش دەکەوێتە ناو ئەم گرۆپەی وولاتانەوە. ئەو وولاتانەی بە ڕەنگی سپی پیشاندراون دەوڵەمەندترین وولاتانن، کە تێکڕای داهاتی ساڵانەی تاکیان ٢٠,٠٠٠ دۆلار یان زیاترە. باکووری ئەمەریکا و وولاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ئوسترالیا و یابان لە ناو ئەم وولاتانەدان.

دەشێ پاتێرنێکی تری جێگەی سەرنج لە هەردوو ئەمەریکا دا بەدیبکرێ. لیستێك لە دەوڵەمەندترین بۆهەژارترین نەتەوانی ئەمەریکا دروستبکە. دەبینی کە ئەوانەی لە سەرەوەن بریتین لە ویلایەتە یەکگرتوەکان و کەنەدا و دوای ئەمانیش چیلی و ئەرجەنتین و بەرازیل و مەکسیك و ئۆرۆگوای و ڕەنگە ڤەنزوێلاش بگرێتەوە کە دەوەستێتە سەر نرخی نەوت. دوای ئەمانیش کۆلۆمبیا و کۆماری دۆمینیکان و ئێکوادۆر و پیرۆ، دێن. لە بەشی بنەوە گروپێکی دیار و زۆر هەژارتر دەردەکەوێ کە لە بۆلیڤیا و گواتیمالا و پاراگوای پێکدێ. پەنجا ساڵ بۆ دواوە بگەڕێوە ئەوا ڕیزبەندییەکی هەمانشێوە بەدیدەکەی. سەد ساڵ بۆ دواوە هەمان شت. سەد و پەنجا ساڵ بۆ دواوە

دیسانەوە هەمان شت بەدی دەکەی. کەواتە مەسەلەکە تەنیا ئەوە نییە کە ویلایەتە یەکگرتوەکان و کەنەدا لە وڵاتانی ئەمەریکای لاتین دەوڵەمەندترن، بەڵکو بریتیشە لەوەی دابەشبوونی ڕوون و بەردەوام لە نێوان نەتەوانی دەوڵەمەند و هەژاری ئەمەریکای لاتینیش دا هەیە.

**نەخشەی (٣): خۆشگوزەرانی لە جیهان دا لە ساڵی ٢٠٠٨ دا**



دوا پاتێرنی جێگەی سەرنج لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دایە. لەوێدا نەتەوانی دەوڵەمەندی وەك سعودیە و كوەیت دەبینین كە ئاستی داهاتیان وەكو هی سی وولاتەكەی سەرەوەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش دا ئەگەر نرخی نەوت دابەزێ ئەوا ئەوانیش لە لیستەكەدا بەرەو خوارەوە دادەبەزن. وولاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست كە بێنەوتن یان خاوەن نەوتی كەمن، وەك میسر و ئەردەن و سوریا، هەموویان ئاستی داهاتیان هاوشێوەی ئەوەی گواتیمالا یان پیرۆیە. بەبێ بوونی نەوت وولاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەموویان هەژارن، هەرچەندە هەمانشێوەی ئەو وولاتانەی ناوەڕاستی ئەمەریكا و چیاكانی ئەندیز، هێندەی وولاتانی باشووری بیابانی ئەفەریقا هەژار نین.

لە كاتێك دا بەردەوامی زۆر، لەو پاتێرنی خۆشگوزەرانییەی ئەمڕۆ لە دەوری خۆمان دەیبینین، لە ئارادایە، ئەمە مانای ئەوە نییە ئەم پاتێرنانە شیاوی گۆڕان نین یان هەمیشەیین. یەكەم، هەر وەك چۆن جەختمان لەسەركرد، زۆربەی ئەم نایەكسانییەی ئێستای جیهان لە كۆتایی سەدەی هەژدەیەمەوە سەریهەڵداوە، دوای ئەوەی شۆڕشی پیشەسازی بەرپا بوو. نەك تەنیا كەلێنی نێوان خۆشگوزەرانی وولاتان، تا ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمیش زۆر تەسكتر بوو، بەڵكو ئەو ڕیزبەندییەی لەو كاتەوە بە جێگیری ماوەتەوە هەمان ئەو ریزبەندییە نییە، ئەگەر لە مێژوودا زیاتر بۆ دواوە بگەڕێینەوە. بۆ نموونە، لە ئەمەریكادا ئەو ریزبەندییەی لەماوەی سەد و پەنجا ساڵی رابوردوودا دەیبینین، پێنج سەد ساڵ لەمەو بەر بە تەوای جیاواز بوە. دوەم، چەندین نەتەوە بۆ چەندین دەیە لە كاتی دوەم جەنگی جیهانییەوە گەشەكردنی خێرایان ئەنجامداوە، وەكو زۆربەی نەتەوەكانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و لە هەمووشیان نوێتر چین. هەندێك لە مانەش گەشەكردنەكانیان بۆ دواوە گەڕاوەتەوە. بۆ نموونە، ئەرجەنتین بە خێرایی و بۆ ماوەی پێنج دەیە تا ساڵی ١٩٢٠ گەشەیكرد و بوە یەكێك لە دەوڵەمەندترین وولاتی جیهان، بەڵام دواتر تووشی خزینێكی دووردرێژ بوو. یەكێتی سۆڤیەت تەنانەت نموونەیەكی پڕبایەخترە كە بە خێرایی لە نێوان ساڵانی ١٩٣٠ و ١٩٧٠ دا گەشەیكرد و دواتر هەرەسێكی خێرای هێنا.

ئایا چی شرۆڤەی ئەم جیاوازییە گەورانەی نێوان هەژاری و دەوڵەمەندی و پاتێرنەكانی گەشەكردن دەكا؟ بۆچی نەتەوەكانی ئەورووپای ڕۆژئاوا و كۆلۆنییە

دەسنێژەکانیان کە پڕبوون لە نیشتەکارە ئەورووپییەکان و لە سەدەی نۆزدەیەم دا دەستیان بە گەشەکردن کرد، زۆر کەم ئاوڕ بۆ دواوە دەدەنەوە؟ ئایا چی شرۆڤەی ڕیزبەندی بەردەوامی نایەکسانی لە هەردوو ئەمەریکادا دەکا؟ بۆچی نەتەوانی باشووری بیابانی ئەفریقا و ئەوانەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست سەرکەتوو نەبوون لە هێنانەدی ئەو جۆرە گەشەکردنانەی لە ئەورووپای ڕۆژئاوا دا دەبینرێ، لە کاتێك دا بەشێکی زۆری نەتەوانی ڕۆژهەلاتی ئاسیا ڕێژەی بەرچاویان لە گەشەکردنی ئابووری دا بەدەستهێناوە؟

ڕەنگە وا بیر بکرێتەوە کە لەبەر ئەو ڕاستییەی نایەکسانی لە جیهان دا هێندە گەورەیە و لە ئەنجامی شتی تردا دروستبوە و ئەم پاتێرنە زەقانەی هەیە، ئەوا شرۆڤەیەکی ڕوون و پەسەندکراوی هەیە. ئەمە وا نییە. زۆربەی ئەو گریمانانەی زانا کۆمەلایەتییەکان دەیخەنە ڕوو دەربارەی بنچینەکانی هەژاری و خۆشگوزەرانی کار ناکەن و ناتوانن بە شێوەیەکی باوەڕ پێکەر شرۆڤەی چۆنیەتی باری زەوی بکەن.

## گریمانەی جوگرافیا

یەکێك لە تیۆرییە باوەکانی هۆکارەکانی نایەکسانی لە جیهان دا بریتییە لە گریمانەی جوگرافیا، کە وادادەنێ ئەم دابەشبوونە گەورەیەی نێوان وولاتانی دەولەمەند و وولاتانی هەژار بەهۆی جیاوازی جوگرافییەوە دروستبوە. چەندین وولاتی هەژاری وەك ئەوانەی ئەفریقا و ناوەڕاستی ئەمەریکا و باشووری ئاسیا دەکەونە نێوان هەردوو مەداری سەرەتان و جەدییەوە. بە پێچەوانەوە نەتەوە دەولەمەندەکان دەکەونە سەر هێلە پانەکانی ئاوو هەوای فێنکەوە. ئەم چڕبوونەوە جوگرافیەی هەژاری و دەولەمەندی پاساوێکی دەسکرد دەداتە ئەوانەی خاوەنی گریمانەی جوگرافییان، کە خالی دەسپێکی تیۆری و بۆچوونەکانی چەندین زانای بواری کۆمەلایەتی و شارەزایانن. بەلام ئەمە لە چەوتی ئەم تیۆرییە کەمناکاتەوە.

هەر لە کۆنەوە و لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم دا، فەیلەسوفی سیاسی مەزنی فەرەنسی مۆنتێسکیۆ تێبینی چڕبوونەوەی جوگرافی هەژاری و دەولەمەندی کردوە و شرۆڤەیەکی پێشنیازکردوە. ئەو پێیوابوو کە خەلکی

ناوچـە گەرمـەکان تەمـەڵترن و ژیرییـان کـەمترە. هـەر لـە ئـەنجامی ئەمـەدا، ڕەنجیان نەداوە و نوێکار نەبوون. هەر ئەمەش هۆکاری هەژاری ئەوان بـوە. لـە هـەمانکات دا مۆتێسکیو پێیوابوو کـە خـەڵکی تەمـەڵ لـە لایـەن فـەرمانڕەوای زاڵمەوە حوکمدەکرێن و ئەوەی پێشنیازکرد کـە جێگـای گـەرم تـەنیا شـرۆڤەی هـەژاری ناکـا، بـەڵکو شـرۆڤەی هەنـدێك لـەو دیـاردە سیاسـییانەش دەکـا کـە پەیوەستن بە شکستهێنانی ئابوورییەوە، وەك دیکتاتۆری.

تیـۆری ئـەوەی کـە وڵاتـە گەرمـەکان بـە شـێوەیەکی سروشـتی هـەژارن، هەرچـەندە پێـشکەوتنە ئابووریيـە خێراکـانی ئـەم دواییانـەی وڵاتـانی وەك سینگاپور و مالیزیا و بۆتسوانا، لەگەڵ ئەم تیۆرییەدا ناتەبان، تـا ئێـستاش بـە توندی لە لایـەن هەنـدێك کەسـی وەك ئابووریناس جێفـری سـاکس پـشتگیری دەکرێ. شێوازی نـوێی ئـەم بۆچـوونە جـەخت لەسـەر کاریگـەری ڕاستەوخۆی کەشوهەوا لەسەر هەوڵی کارکردن یان پرۆسەکانی بیرکردنەوە ناکەنەوە، بـەڵکو دوو ئارگومێنتی زیاتر باسدەکەن: یەکەم، نەخۆشی ناوچە گەرمەکان بەتایبەتی مەلاریا، کاریگەری خراپی بۆ تەندروسـتی هەیـە و لێرەشـەوە بـۆ بەرهەمـداریی هێزی کار، دوەمیش ئەوەیە کـە خـۆڵی ناوچـە گەرمـەکان بـواری کـشتوکاڵێکی بەرهەمـدار نارەخـسێنیٚ. ئـەنجامی هـەموو ئەمانـەش هەرچـەندە وەك یـەکن، ئەوەیە کە ناوچـە فێنکـەکان بـە شـێوەیەکی ڕێـژەیی لەناوچـە گـەرم و نیمـچە گەرمەکان باشترن.

لەگەڵ ئەمەش دا، ناکرێ نایەکسانی لە جیهان دا لە ڕێگەی کـەش و هـەوا و نەخۆشی یان هەر شێوازێکی گریمانەی جوگرافییەوە شرۆڤە بکرێ. تەنیا بیر لە نۆگالس بکەرەوە. ئەوەی ئەم دوو بەشە لە یەکتر جیادەکاتەوە کەشوهەوا یـان جوگرافیا یان ژینگەی نەخۆشی نییە، بەڵکو سنووری ویلایەتـە یـەکگرتوەکان و مەکسیکە.

ئەگەر گریمانەی جوگرافیا نەتوانێ شرۆڤەی جیاوازییەکانی نێـوان بـاکوور و باشووری نۆگالس بکا، یان شرۆڤەی جیاوازییـەکانی نێـوان بـاکوور و باشـووری کۆریا بکا، یان ئەوانەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای ئەڵمانیا بکـا بـەر لـە ڕمـانی دیـواری بـەرلین، ئایـا دەکـرێ تیۆرییـەکی بەکـەڵك بـێ بـۆ شـرۆڤەکردنی جیاوازییەکانی نێوان باکوور وباشووری ئەمەریکا؟ جیاوازییەکانی نێوان ئەورووپا و ئەفریقا؟ بێگومان نەخێر.

مێژوو ئەوە دەردەخا کە پەیوەندی ساکار و درێژخایەن لە نێوان کەشوهەوا یان جوگرافیا و پێشکەوتنی ئابووری دا نییە. بۆ نموونە، ئەوە ڕاست نییە کە ناوچە گەرمەکان هەمیشە هەژار تر بوون لە ناوچە فێنکەکان. هەروەك لە چاپتەری پێشتر دا بینیمان، لە کاتی داگیرکردنی ئەمەریکا لە لایەن کۆڵەمبەسەوە، ناوچەکانی باشووری مەداری سەرەتان و باکووری مەداری جەدی، کە ئەمڕۆ مەکسیك و ناوەڕاستی ئەمەریکا و پیرۆ و بۆلیڤیا لە خۆ دەگرن، خاوەنی شارستانی مەزنی ئینکا و ئازتێکەکان بوون. ئەم ئیمپراتۆریەتانە لە ڕووی سیاسییەوە خاوەن مەرکەزیەت بوون و ئاڵۆز بوون و ڕێگاو بانیان دروستکردوە و لە کاتی گرانی دا هاوکارییان پێشکەشکردوە بە خەڵك. ئازتێکەکان خاوەنی پارە و نووسین بوون و ئینکاکان هەرچەندە خاوەنی ئەم دوو تەکنەلۆجییە نەبوون، بڕێکی زۆر زانیارییان لە ڕێگەی گرێی پەت یان گوریسەوە کە پێیدەوترا کویپەس، تۆمارکردوە. زۆر بە پێچەوانەوە، لە سەردەمی ئینکا و ئازتێکەکان دا، باکوور و باشووری ئەو ناوچانەی ئینکاو ئازتێکەکانی تێدا نیشتەجێبووبوون کە بریتین لە ویلایەتە یەکگرتوەکان و کەندا و ئەرجەنتین و چیلی ئەمڕۆ، بە زۆری شارستانییەتی چاخە بەردینەکانیان تێدا نیشتەجێبوون کە خاوەنی ئەم تەکنەلۆجییانە نەبوون. کەواتە ناوچە گەرمەکان لە ئەمەریکا دا زۆر دەوڵەمەندتر بوون لەناوچە فێنکەکان و ئەمەش ئەوە دەردەخا کە " ڕاستی ڕوون" ی هەژاری ناوچە گەرمەکان نە ڕوونە و نە ڕاستییە. لە بری ئەمە، دەوڵەمەندی زیاتری ویلایەتە یەکگرتوەکان و کەنەدا دەگەڕێتەوە بۆ پێچەوانەبوونەوەی بەرچاوی دەوڵەمەندی بە بەراوورد لەگەڵ ئەوەی لە کاتی گەیشتنی ئەوروپییەکان دا لە ئارادا بوو.

ئەم پێچەوانەبوونەوەیە هیچ پەیوەندی بە جوگرافیاوە نییە و هەروەك لەمەوبەر بینیمان پەیوەندی بە شێوازی کۆلۆنیکردنی ئەم ناوچانەوە هەیە. ئەم پێچەوانەبوونەوەیە تەنیا تایبەت نییە بە ئەمەریکا. دانیشتوانی باشووری ئاسیا بەتایبەتی نیمچە کیشوەری هیند و دانیشتوانی چین دەوڵەمەند تر بوون لە دانیشتوانی زۆربەی ناوچەکانی تری ئاسیا و بە دڵنیاییەوە دەوڵەمەند تر بوون لەو خەڵکەی لە ئوستراليا و نیوزیلەندەدا نیشتەجێبوون. ئەمەش دیسانەوە پێچەوانەبۆوە و کۆریای باشوور و سینگاپوور و یابان بوونە دەوڵەمەندترین نەتەوەکانی ئاسیا و ئوستراليا و نیوزیلەندە لە ڕووی خۆشگوزەرانییەوە پێش

هەموو ئاسیا کەوتنەوە. تەنانەت لە ناو وولاتانی باشووری بیابانی ئەفەریقاش دا پێچەوانەبوونەوەی هاوشێوە ڕوویداوە. لەم دواییانەشدا، بەر لە دەسپێکردنی پەیوەندی ئەورووپا لەگەڵ ئەفریقا دا، ناوچەی باشووری ئەفریقا خاوەنی کەمترین ژمارەی دانیشتوان و لاوازترین ناوچە بوە لە ڕووی بوونی دەوڵەتی دامەزراوی ئەوتۆوە کە کەمترین دەسەڵاتی بەسەر ناوچەکانیدا هەبێ. لەگەڵ ئەمەش دا، باشووری ئەفەریقا یەکێکە لە نەتەوە دەوڵەمەندەکانی باشووری بیابانی ئەفریقی. ئەگەر زیاتر لە مێژوو دا بۆ دواوە بگەڕێینەوە دیسانەوە خۆشگوزەرانی زۆر لە ناوچە گەرمەکان دا بەدی دەکەین. هەندێك لە شارستانییە مەزنەکانی پریمۆدێرنی وەك ئانگکۆر لە کەمبۆدیای ئەمڕۆ دا و ڤیجایاناگارا لە باشووری هیندستان و ئاکسۆم لە ئەسیوپیا لە ناوچە گەرمەکان دا گەشەیان کرد، هەروەك چۆن شارستانی مەزنی دۆڵی ئیندۆسی مۆهێنجۆ دارۆ و هاراپا لە پاکستانی ئەمڕۆدا دامەزران. کەواتە مێژوو گومانێکی ئەوتۆ ناهێڵێتەوە کە پەیوەندیەکی ڕوون لە نێوان شوێنێ گەرم و سەرکەوتنی ئابووری دا نییە.

بێگومان نەخۆشی ناوچە گەرمەکان دەبێتە مایەی ناهەمواری و ڕێژەی بەرزی مردنی منداڵانی ساوا لە ئەفریقادا، بەڵام ئەمانە هۆکاری هەژاری ئەفریقا نین. نەخۆشی بە شێوەیەکی سەرەکی ئاکامی هەژاری و ئەنجامی بێتوانایی یان ئارەزوونەکردنی حکومەتەکانە بۆ گرتنەبەری ڕێوشوێنی ئەوتۆ کە دەبنە هۆی لەناوبردنی ئەم نەخۆشیانە. ئینگلتەرەش لە سەدەی نۆزدەیەم دا شوێنێکی زۆر ناتەندروستبوو، بەڵام حکومەت بەرەبەرە کەوتە ئەنجامدانی وەبەرهێنان بۆ دابینکردنی ئاوی پاك و پاکردنەوەی ئاوی ئاوەڕۆکان و ئەو ئاوەی دەڕژانە ڕووبارەکانەوە و دواتریش کەوتە وەبەرهێنان لە دامەزراندنی خزمەتگوزاری تەندروستی کاریگەر. باشبوونی بارودۆخی تەندروستی و زیادبوونی ماوەی ژیان ئەنجامی سەرکەوتنە ئابوورییەکانی ئینگلتەرە نەبوو، بەڵکو بەرهەمی گۆڕانکارییە سیاسی و ئابوورییەکانی پێشتر بوون. هەمان شتیش بۆ نۆگالس، ئەریزۆنا ڕاستە.

بەشەکەی تری گریمانەی جوگرافی ئەوەیە کە ناوچە گەرمەکان هەژارن چونکە کشتوکاڵی ناوچە گەرمەکان بە شێوەیەکی سروشتی بەرهەمدار نین و خۆڵی ناوچە گەرمەکان تەنکە و توانای هێشتنەوەی توخمە خۆراکیەکانی نییە.

ئەم بۆچوونە جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە چۆن ڕەهێڵە بارانەکان ئەم خۆڵە لەگەڵ خۆیان دا ڕادەماڵن. بە دڵنیاییەوە هەندێك ڕاستی لەم ئارگومێنەتەدا هەیە، بەڵام هەروەك پیشانی دەدەین، هۆکاری سەرەکی ئەوەی کە بۆچی بەرهەمداریی کشتوکاڵی — بەرهەمی کشتوکاڵ لە هەر ئەیکەرێکدا ـ لە وڵاتە هەژارەکان دا هێندە نزمە، بەتایبەتی لە وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا دا، پەیوەندیەکی ئەوتۆی بە جۆری خۆڵەوە نییە. بەڵکو ئەمە ئەنجامی پێکهاتەی خاوەندارێتی زەوی و ئەو هاندانانەیە کە لە لایەن حکومەت و ئەو دەزگایانەی جووتیارەکان لە ژێر سایەیان دا کار دەکەن، دەخرێنە بەردەم جووتیاران. ئێمە دیسانەوە پیشانی دەدەین کە ناکرێ نایەکسانی لە جیهان دا لە ڕێگەی جیاوازی لە بەرهەمداریی کشتوکاڵیەوە شرۆڤە بکرێ. هۆکاری ئەو نایەکسانییە گەورەیەی لە جیهانی ئەمڕۆدا هەیە و لەسەدەی نۆزدەیەم دا سەریهەڵدا، بڵاوبوونەوەی نا یەکسانی تەکنەلۆجییە پیشەسازیەکان و بەرهەمە پیشەسازیەکان بوو. هۆکارەکە بریتینەبوو لە جیاوازی لە دەسکەوتە کشتوکاڵیەکان دا.

شێوازێکی گرنگی تری گریمانەی جوگرافیا لە لایەن ئیکۆلۆجیست و بایۆلۆجیستی پەرەسەندنەوە، جارد دایەمۆند خراوەتە ڕوو. ئەو لایوایە بنچینەکانی نایەکسانی نێوان کیشوەرەکان لەسەرەتای سەردەمی مۆدێرنەوە و پێنج سەدساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی مێژوویی لە بوونی جۆرەکانی ڕوەك و ئاژەڵ کە لە ئەنجامدا کاری کردە سەر بەرهەمداریی کشتوکاڵی. لە هەندێك جێگای وەك مانگی بەپیت دا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئەمڕۆدا، ئەو جۆرانەی کە دەکران لە لایەن مرۆڤەوە ماڵی بکرێن زۆر بوون. لە جێگاکانی تری وەك ئەمەریکا ژمارەی ئەو جۆرانە زۆر نەبوون. بوونی چەندین جۆری شیاو بۆ ماڵیکردن سەرنجی کۆمەڵگا ڕاوچییەکانی بۆ ژیانی جووتیاری ڕاکێشا. هەر لە ئەنجامی ئەمەدا، کشتوکاڵ زووتر لە ناوچەی مانگی بەپیت دا سەریهەڵدا بەر لە سەرهەڵدانی لە ئەمەریکادا. چڕی دانیشتوان زیادی کرد کە بوە هۆی پەیدابوونی تایبەتمەندێتی لە بواری هێزی کار و بازرگانی و ژیانی شارنشینی و پەرەسەندنی سیاسی. لەو جێگایانەی کە کشتوکاڵ تیایاندا پەرەیسەند، نوێکاری تەکنەلۆجی زۆر خێراتر لە جێگاکانی تری جیهان دا ئەنجامدرا. بەم شێوەیە، لای دایەمۆند، جیاوازی لە بوونی جۆرەکانی ئاژەڵ و ڕوەك دا بوە

هۆی دروستبوونی چڕی جیاواز لە کشتوکاڵ کردن دا، کە ئەوەش بوە هۆی دروستبوونی ڕێچکەی جیاوازی گۆڕانکاریی تەکنەلۆجی و خۆشگوزەرانی لە کیشوەرە جیاوازەکان دا.

هەرچەندە تیۆرییەکەی دایەمۆند ڕوانینێکی بەهێزە بۆ ئەو لەغزەی ئەو جەختی لەسەر دەکا، بەڵام ناشێ درێژبکرێتەوە بۆ شرۆڤەکردنی نایەکسانی ئەمڕۆی جیهان. بۆ نموونە، دایەمۆند لایوایە کە ئیسپانییەکان توانیان زاڵ بن بەسەر شارستانییەکانی ئەمەریکا دا لەبەر ئەوەی خاوەنی مێژووی درێژتر بوون لە کشتوکاڵ دا و لە ئەنجامیشدا بوونە خاوەنی تەکنەلۆجییای باڵادەست تر. بەڵام ئێستا پێویستە بپرسین کە بۆچی مەکسیکییەکان و پیرۆییەکان کە نیشتەجێی هەمان ناوچەکانی پێشتری ئازتێك و ئینکاکانن، ئێستا هەژارن. لە کاتێك دا بوونی گەنم و جۆ و ئەسپ ڕەنگە بووبێتە هۆی ئەوەی ئیسپانییەکان لە ئینکاکان دەوڵەمەندتر بن، بەڵام بۆشایی نێوان داهاتی ئەم دوانە زۆر گەورە نەبوو. تێکڕای داهاتی تاکێکی ئیسپانی کەمتر بوە لە دوو هێندەی تێکڕای داهاتی هاوڵاتییەکی ئیمپراتۆریەتی ئینکا. تیۆرییەکەی دایەمۆند ئەوە دەگەیەنێ کاتێك ئینکاکان دەستیان گەیشتە هەموو ئەو جۆرە جیاوازانەی ڕوەك و ئاژەڵ و تەکنەلۆجییانەی کە بۆخۆیان نەیانتوانی بوو بەدەستیان بهێنن، دەبوایە هەر زوو بگەشتنایەتە ئاستی گوزەرانی ئیسپانییەکان. لەگەڵ ئەمەش دا شتێکی لەم جۆرە ڕووینەدا. بە پێچەوانەوە، لە سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم دا بۆشاییەکی گەورەتر لە نێوان داهاتی ئیسپانیاو پیرۆدا دروستبوو. ئەمڕۆ کەسێکی مامناوەندی ئیسپانی زیاتر لە شەش هێندەی کەسێکی مامناوەندی پیرۆیی دەوڵەمەند ترە. بۆشایی نێوان داهاتەکان پەیوەندی نزیکی بە تەشەنەکردنی ناهاوتای تەکنەلۆجییە پیشەسازیەکانەوە هەیە و ئەمەش پەیوەندیەکی ئەوتۆی بە توانای ماڵیکردنی ئاژەڵ و ڕوەك یان جیاوازی لە ئاستی بەرهەمداریی کشتوکاڵی نێوان ئیسپانیا و پیرۆ دا نییە.

لەکاتێك دا ئیسپانیا، هەڵبەت درەنگتر، تەکنەلۆجییەکانی هێزی هەڵم و ڕیگای ئاسنین و کارەبا و بەکارهێنانی ئامێری بۆ بەرهەمێنانی کارگە خستەگەڕ، پیرۆ ئەمەی نەکرد یان لە باشترین حاڵەت دا، ئەمەی زۆر بە هێواشی و ناتەواوی ئەنجامدا. ئەم بۆشاییە تەکنەلۆجییە تا ئەمڕۆش بەردەوامە و بە ئەندازەیەکی گەورەتر خوی بەرهەمدەهێنێتەوە، کاتێك تەکنەلۆجییای

نویّ، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە تەکنەلۆجییای زانیارییەوە هەیە، دەبنە هۆی گەشەکردنی زیاتری چەندین نەتەوەی پەرەسەندوو و هەندێك لەو نەتەوانەی بە خێرایی پەرەدەسێنن. تیۆرییەکەی دایەمۆند ئەوەمان پێنالێ کە بۆچی ئەم تەکنەلۆجییە گرنگانە تەشەنە ناکەن و نابنە هۆی یەکسانکردنی داهاتەکان لە سەرتاسەری جیهان دا. شرۆڤەی ئەوە ناکا کە بۆچی نیوەکەی باکووری نۆگالس ئەوەندە دەوڵەمەند ترە لە چمکەکەی باشووری شووراکەوە، هەرچەندە هەردووکیان پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر بەشێکی هەمان شارستانی بوون.

چیرۆکەکەی نۆگالس گرفتێکی تری گەورەی پەیڕەوکردنی تیۆرییەکەی دایەمۆند پیشاندەدا: هەروەك پێشتر بینیمان لەگەڵ هەموو کەمووکوڕییەکانی ئیمپراتۆریەتەکانی ئینکا و ئازتێك لە ساڵی ١٥٣٢ دا، بێگومان پیرۆ و مەکسیك دەوڵەمەند تر بوون لەو ناوچانەی کە ئێستا بوونەتە ویلایەتە یەکگرتوەکان و کەنەدا. دواتر باکووری ئەمەریکا دەوڵەمەندتربوو، چونکە بە پەرۆشەوە باوەشی بۆ ئەو تەکنەلۆجی و پێشکەوتنانە کردەوە کە شۆڕشی پیشەسازی هێنابوونیەئاراوە. دانیشتوانەکەی خوێندەوار تر بوون و ڕێگای ئاسنین لە سەراپای دەشتە گەورەکان دا بڵاو بۆوە، بە پێچەوانەی بەرچاوی ئەوەی لە باشووری ئەمەریکا دا ڕوویدا. ناکرێ ئەمە بە ئاماژەکردن بۆ جیاوازی جوگرافیای نێوان باکوور و باشووری ئەمەریکا لێکبدرێتەوە کە ئەو جیاوازییە هەرچییەك بێ ئەوا لە قازانجی باشووری ئەمەریکا دا بوە.

نایەکسانی لە جیهانی مۆدێرن دا بە زۆری لە ئەنجامی تەشەنەکردن و بەکارهێنانی ناهاوتای تەکنەلۆجییەکانەوە هاتۆتەئاراوەو تیۆرییەکەی دایەمۆندیش ئارگومێنتی گرنگ لەم بارەیەوە لەخۆدەگرێ. بۆ نموونە، ئەو، بە پەیڕەوکردنی مێژووناس ولیەم ماکنیل، لایوایە کە هەڵکەوتی ڕۆژهەلات ـ ڕۆژئاوای یۆراسیا بوە هۆی ئەوەی کە ڕوەك و ئاژەڵ و نوێکارییەکان لە مانگی بە پیتەوە بۆ ئەورووپای ڕۆژئاوا بگوێزرێنەوە، لە کاتێك دا هەڵکەوتی باکوورـ باشووری هەردوو ئەمەریکا هۆکاری ئەوەیە کە بۆچی سیستەمی نووسین، کە لە مەکسیك دروستکرا، نەگوێزرایەوە بۆ چیاکانی ئەندیز و باکووری ئەمەریکا. لەگەڵ ئەمەش دا، هەڵکەوتی کیشوەرەکان ناتوانێ شرۆڤەی نایەکسانی ئەمرۆی جیهان پێشکەشبکا. بیر لە ئەفریقا بکەرەوە. هەرچەندە بیابان کۆسپێکی

گەورەی لەبەردەم گواستنەوەی کەلوپەل و ئایدیاکان لە باکوورەوە بۆ باشووری بیابانەکە دروستکردوە، ئەمە کۆسپێك نەبوو کە زاڵبوون بەسەریا مەحاڵ بووبێ. پورتوگالی و دواتریش ئەورووپییەکانی تر بە دەوری کەناری دەریادا سوڕانەوە و جیاوازییەکانی زانیارییان نەهێشت لە سەردەمێکدا کە بۆشایی لە داهاتەکان دا زۆر بچووك بوو بەبەراوورد لەگەڵ ئەو بۆشاییەی ئەمڕۆ هەیە. لەو کاتەوە ئەفریقا بە ئەورووپا نەگەشتۆتەوە و بە پێچەوانەشەوە ئێستا بۆشاییەکی گەورەتر لە نێوان زۆربەی وولاتانی ئەفریقی و وولاتانی ئەورووپیدا هەیە.

دیسانەوە دەبێ ڕوون بێ کە ئارگومێنتەکەی دایەمۆند، دەربارەی نایەکسانی نێوان کیشوەرەکان، هێندە بەهێز نییە بتوانێ شرۆڤەی جیاوازییەکانی نایەکسانی ناو کیشوەرەکان بکا ــ کە بەشێکی گرنگی نایەکسانی جیهانی ئەمڕۆیە. بۆ نموونە، لە کاتێکدا ڕەنگە هەڵکەوتی خاکی یۆراسیا شرۆڤەی ئەوە بکا کە چۆن ئینگلتەرە توانی سوود لە نوێکارییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەربگرێ بێئەوەی بۆخۆی دایانبهێنێتەوە، شرۆڤەی ئەوە ناکا کە بۆچی شۆڕشی پیشەسازی لە ئینگلتەرە ڕوویدا و، بۆ نموونە، لە مۆڵدۆڤا ڕووینەدا. جگە لەمە، هەروەك دایەمۆند بۆخۆی ئاماژەیپێدەدا، چین و هیندستان سوودی گەورەیان لە کۆکردنەوەی ئاژەڵ و ڕووەکەکان و هەڵکەوتی یۆراسیا وەرگرت، بەڵام زۆرترین خەڵکی هەژار لە جیهانی ئەمڕۆدا لەو دوو وولاتەدان.

لە ڕاستیدا باشترین ڕێگا بۆ تێگەیشتن لە مەودای تیۆرییەکەی دایەمۆند بریتییە لە تێڕوانین لەو زانیاریانەی کە خۆی بۆ شرۆڤەکردنی تیۆرییەکەی پەنایان بۆ دەبات. نەخشەی (٤)، داتا دەربارەی بڵاوبوونەوەی سەس سکۆرفا کە باوانی بەرازی ئەم سەردەمە و ئۆرۆچس کە باوانی مانگای ئەم سەردەمەیە، دەخاتەڕوو.

## نەخشەی (٤): بڵاوبوونەوەی مێژوویی گایەل و بەرازی کێوی




هەردوو جۆرەکە بە فراوانی لە یۆراسیادا و تەنانەت لە باکووری ئەفریقا دا بڵاو بوونەوە. نەخشەی (٥)، بڵاوبوونەوەی باوانە کێویەکانی هەندێك لە ڕووەکەماڵیکراوەکانی وەك ئۆریزا ساتیڤا کە باوانی برنجی ئاسیایی و باوانی گەنم و جۆی ئەمڕۆیە، پیشاندەدا.

ئەم نەخشەیە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە باوانی برنجی کێوی بە فراوانی لە باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا بڵاو بوبۆوە، لە کاتێك دا باوانی جۆ و گەنم بەدرێژایی کەوانەیەکی درێژ بڵاوبوونەوە، هەر لە وڵاتی شامەوە تا دەگاتە ئێران و ئەفغانستان و ئەووڵاتانەی "ستان" یان پێوەیە بە وێنەی تورکەمەنستان و تاجیکستان و کیرگستان. ئەم جۆرە باوانانە لە زۆربەی

ناوچەکانی یۆراسیا دا هەن. بڵاوبوونەوەی فراوانیان ئەوە دەردەخا کە ناکرێ نایەکسانی لە ناو یۆراسیادا لە ڕێگەی بڵاوی جۆر و ژمارەی ئاژەڵ و ڕوەکەکانەوە شرۆڤە بکرێ.

## نەخشەی ( ٥ ): بڵاوبوونەوەی مێژوویی برنج و گەنم و جۆی کێوی




گریمانەی جوگرافیا نەک تەنیا لە ئاست شرۆڤەکردنی بنچینەکانی خۆشگوزەرانی لە مێژوودا دەستەوسانە و بە زۆریش لە پێداگرتنەکانیدا ناڕاستە، بەڵکو ناشتوانێ چۆنیەتی باری زەوی لێکبداوە. ڕەنگە یەکێك وادابنێ کە هەر پاتێرنێکی بەردەوام، لە وێنەی پلەبەندی داهات لە هەردوو ئەمەریکادا یان جیاوازییە زەق و درێژخایەنەکانی نێوان ئەورووپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەهۆی نەگۆڕانی جوگرافیاوە شرۆڤە بکرێ. بەڵام ئەمە وانییە.

لەمەوبەر بینیمان کە پێناچێ پاتێرنەکانی ناو هەردوو ئەمەریکا بەهۆی فاکتەری جوگرافیاوە سەریانهەڵدابێ. بەر لە ساڵی ١٤٩٢ شارستانییەکانی دۆڵی ناوەڕاستی مەکسیك و ناوەڕاسنی ئەمەریکا و ئەندیز لە ڕووی تەکنەلۆجی و ئاستی گوزەرانەوە لە باکووری ئەمەریکا و شوێنی وەکو ئەرجەنتین و چیلی باڵادەست تر بوون. لە کاتێك دا جوگرافیا وەکو خۆی مایەوە، ئەو دەزگایانەی لە لایەن کۆلۆنیستە ئەورووپییەکانەوە بەسەر ئەو ناوچانەدا سەپێنران بوونە هۆی پێچەوانەبوونەوەی دەوڵەمەندی. لە بەر هۆکاری هاوشێوە، جوگرافیا ناتوانێ شرۆڤەی هەژاریی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکا. بەهەرحاڵ، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێشەنگی جیهان بوو لە شۆڕشی کشتوکاڵ دا و یەکەم شار لە عێراقی ئەمڕۆدا دروستکرا. بۆ یەکەمجار ئاسن لە تورکیادا توێنرایەوە و تا سەردەمێکی درەنگی چاخەکانی ناوەڕاست، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ڕووی تەکنەلۆجییەوە چالاك بوە. ئەوە جوگرافیای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەبوو کە بوە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕشی کشتوکاڵ لەو ناوچەیەی جیهان دا هەروەك لە چاپتەری پێنجەم دا دەبینین و دیسانەوە جوگرافیا نەبوو کە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی هەژار کرد. ئەوە فراوانبوون و بەهێزبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و پاشماوە دەزگاییەکانی ئەم ئیمپراتۆریەتەیە کە ئەمڕۆش ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی بە هەژاری هێشتۆتەوە.

لە کۆتایی دا، فاکتەرە جوگرافییەکان نەك تەنیا هاوکار نین بۆ شرۆڤەکردنی ئەو جیاوازییانەی ئەمڕۆ لە سەرانسەری جیهان دا دەیانبینین، بەڵکو هاوکاریش نین بۆ شرۆڤەکردنی ئەوەی بۆچی چەندین نەتەوەی وەك یابان و چین بۆ ماوەی دوورودرێژ لە شوێنی خۆیان دا چەقدەبەستن و دواتر پرۆسەی گەشەپێدانی خێرا دەستپێدەکەن. ئێمە پێویستمان بە تیۆرییەکی تری باشتر هەیە.

## گریمانەی کەلتوور

تیۆری دوەم کە ڕەواجی زۆری هەیە، گریمانەی کەڵتوورە، کە خۆشگوزەرانی دەگێڕێتەوە بۆ کەڵتوور. گریمانەی کەڵتوور، بە هەمانشێوەی گریمانەی جوگرافیا بنەچەی دیاری هەیە و بەلایەنیکەمەوە دەگەڕێتەوە بۆ

ماکس ویبەر، سۆسیۆلۆجیستی مەزنی ئەڵمانی کە لایوایە چاکسازی ئاینی پرۆتستانتی و ئاکاری پرۆتستانتی ڕۆڵی سەرەکی لە سەرهەڵدانی کۆمەڵگای پیشەسازی مۆدێرنی ئەوروپای ڕۆژئاوا دا بینی. گریمانەی کەڵتوور چیتر بە تەنیا پشت بە ئایین نابەستێ، بەڵکو جەخت لەسەر جۆرەکانی تری باوەڕ و بەها و ئاکار دەکاتەوە.

هەرچەندە لە ڕووی سیاسییەوە شیاو نییە بە ئاشکرا باسی بکەن، کەسانێکی زۆر تا ئێستاش لەو بڕوایەدان کە ئەفریقییەکان بۆیە هەژارن چونکە ئاکاری کارکردنیان نییە و تا ئێستاش بڕوایان بە جنۆکە و جادوو هەیە، یان بەرەنگاری تەکنەلۆجی نوێی ڕۆژئاوا دەبنەوە. دیسانەوە کەسانێکی زۆر لەو بڕوایەدان کە ئەمەریکای لاتین هەرگیز دەوڵەمەند نابن چونکە خەڵکەکەی لە ناخەوە خوێڕی و نابووتن و دووچاری کەڵتووری ئایبریا و مانانا بوون. بێگومان کەسانێکی زۆریش بڕوایان وابوو کە کەڵتووری چینی و بەهاکانی کۆنفۆشی لەگەڵ گەشەکردنی ئابووری دا ناتەبان، بەڵام ئێستا گرنگیی ئاکاری کارکردنی چینییەکان وەك بزوێنەری گەشەکردن لە چین و هۆنکۆنگ و سینگاپوور، بەرزدەنرخێنرێ.

ئایا گریمانەی کەڵتوور بەسوودە بۆ تێگەیشتنی نایەکسانی لە جیهان دا؟ بەڵی و لە هەمانکاتیش دا نەخێر. بەڵێ، لەو ڕوانگەیەوە کە نەریتە کۆمەڵایەتییەکان کە پەیوەندییان بە کەڵتوورەوە هەیە، گرنگن و گۆڕینیان زەحمەتە و هەندێجاریش یاریدەدەری جیاوازیی دەزگاکانن، کە شرۆڤەی ئەم کتێبەیە بۆ بوونی نایەکسانی لە جیهان دا، بەڵام بەزۆری نەخێر، چونکە ئەو سیمایانەی کەڵتوور کە زۆر جار جەختی لەسەر دەکرێ ـ ئایین، ئاکاری نەتەوەیی، بەهاکانی ئەمەریکای لاتین و ئەفریقا ـ هیچ گرنگ نین بۆ تێگەیشتنمان لەوەی کە چۆن گەیشتوینەتە ئێرە و بۆچی نایەکسانی لە جیهان دا بەردەوامە. سیماکانی تری وەکو ڕادەی متمانەبوونی خەڵك بەیەکتر و تا چ ئەندازەیەك خەڵك دەتوانن هاوکاری یەکتر بکەن، گرنگن، بەڵام ئەمانە بە زۆری ئاکامی بوونی دەزگاکانن نەك هۆکاری سەربەخۆ.

با بگەڕێینەوە بۆ نۆگاڵس. هەروەك پێشتر تێبینیمانکرد، گەلێك سیمای کەڵتوور لە باکوور و باشووری شوراکەوە وەك یەکن. لە هەمانکات دا، ڕەنگە چەند جیاوازییەکی بەرچاو لە هەڵسوکەوت و نەریت و بەهاکان دا هەبێ، ئەم

جیاوازییانـه هۆکـاری دوو ڕێـچکەی لەیەکدوورکـەوتووی پەرەپێـدانی ئـەو دوو ناوچـەیە نـین، بـەڵکو ئـەنجامی ئـەو لەیەکدوورکەوتنەوەیـەن. بـۆ نموونـە، لـە ڕاپرسییەکان دا مەکسیکییەکان دەڵێن کە ئەوان متمانەیان بە خەڵکی تر کەمتر هەیە لەوەی هاوڵاتییانی ویلایەتە یەکگرتوەکان دەڵێن متمانـەیان هەیـە. بـەڵام جێگەی سەرسوڕمان نییە ئەگەر مەکسیکییەکان متمانەیان بەخەڵکی تر کـەمتر بێ، لەکاتێك دا حکومەتەکەیان ناتوانێ کارتێلی مادە هۆشبەرەکان لە ناو بەرێ یان ناتوانێ سیستەمێکی بێلایەنی دادوەری کـارا دابمـەزرێنێ. هـەمان شـت بـۆ بـاکوور و باشـووری کۆریـاش ڕاسـتە، هـەروەك لـە چـاپتەری داهـاتوودا باسـی دەکەین. باشووری کۆریا یەکێکە لـە دەوڵەمەنـدترین وڵاتـی دنیـا لـە کاتێـك دا بـاکوور بـە دەسـت هـەژاری و برسـێتی ناوبـەناوەوە دەنـاڵێنێ. هەرچـەندە لـە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا "کەلتوور" ی نێوان باکوور و باشوور زۆر جیاوازە، بەڵام ئـەم جیاوازییە هیچ ڕۆڵـی نـەبوە لـە لێکدوورکەوتنـەوەی بـرەوی ئـابووری ئـەم دوو نیوەیــەی یــەك نەتــەوەدا. نیمــچە دوورگــەی کۆریــا مێژوویــەکی هاوبەشــی دووروودرێژی هەیە و بەر لە جەنگی کۆریـا و دابەشـبوونی کۆریـا لـە سـەر هێڵـی پانی٣٨، لە ڕووی زمان و ئایـنـی و کـەلتوورەوە خـاوەنی لێکـچوونێکی بێهاوتـا بوون. بەهەمانشێوەی نۆگاڵس، ئەوەی کاریگەری هەیە بریتییە لە سـنوورەکە. بەشی باکوور خاوەن ڕژمێکی جیاوازە و کۆمەڵە دەزگای جیاوازی سـەپاندوە و هاندانی جیاوازی دروسـتکردوە. بۆیـە ئـەو جیاوازییانـەی لـە کـەلتووری نێـوان هەردوو بەشەکەی نۆگاڵس یان دوو بەشـەکەی کۆریـادا هـەن هۆکـاری جیـاوازی خۆشـگوزەرانی نـین، بـەڵکو ئـەنجام و ئاکـامی جیاوازییـەکانی خۆشـگوزەرانی نێوانیانن.

ئـەی دەربـارەی ئـەفریقا و کـەلتووری ئـەفریقی؟ لـە ڕووی مێژوویییـەوە، وڵاتــانی باشــووری بیابــانی ئــەفریقا لــە زۆربــەی ناوچــەکانی تــری جیهــان هەژارتربوون و شارستانییە کۆنەکانیان چەرخ یان نووسین ( بەدەر لە ئەسیوپیا و سۆمالی) یان گاسنیان دانەهێنا. هەرچەندە ئەم تەکنەلۆجییانە بە شێوەیەکی فـراوان بەکارنـەهێنران تـا بڵاوبوونـەوەی فـەرمی کۆلۆنیـالیزمی ئـەوروپی لـە درەنگانێکی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سـەدەی بیستـەم دا، کۆمـەڵگاکانی ئــەفریقا زۆر زووتــر زانیارییــان دەربارەیــان هــەبوە. چــالاکی کەشــتیوانی ئەوروپییــەکان بــەدەوری کــەناری ڕۆژئـاوادا لـە کۆتـایی سـەدەی پێنجـەم دا

دەستپێکرد و ئاسیاییەکانیش بە شێوەیەکی بەردەوام لە سەردەمێکی کۆنترەوە بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا کەشتیوانییان دەسپێکردبوو.

دەتوانین لەوە تێبگەین کە بۆچی ئەم تەکنەلۆجییانە، هەر لە سەردەمی پاشایەتی کۆنگۆوە، کە دەکەوتە زاری ڕووباری کۆنگۆوە و ناوی کۆماری دیموکراسی کۆنگۆی ئەمڕۆ لەوەوە وەرگیراوە، بەکارنەهێنران. نەخشەی (٦) شوێنی ئەو کاتەی کۆنگۆ و دەوڵەتێکی تری گرنگی ئەو کاتەی ئەفریقا کە ناوی پاشایەتی کیوبا بوە پیشاندەدا. دواتر لەم کتێبەدا باسی ئەم پاشایەتییە دەکەین.

## نەخشەی (٦): پاشایەتی کۆنگۆ و کیوبا و بۆشۆنگ و لیلی



کۆنگـۆ پەیوەنـدی چـڕوپڕی لەگـەڵ پورتوگاڵییـەکان دا دەسـپێکرد دوای ئەوەی بۆ یەکەمجار لە لایەن دەریاوان دیاگۆ کاو لە ساڵی ١٤٨٣ دا سـەردانیان کرا. لـەو کاتـەدا، کۆنگـۆ بـە پێـی پێوەرەکـانی ئـەفریقا، قەبارەیـەکی خـاوەن مەرکەزیەتێکی توندبوو، دانیشتوانی مبێنـزای پایتـەختی شەسـت هـەزار کـەس بوو کە هێندەی قەبارەی لیزبۆنی پایتەختی پورتوگاڵ و لە لەندەنیش گەورەتر بوو کە ژمارەی دانیشتوانی لە ساڵی ١٥٠٠ دا پـەنجا هـەزار کـەس بـوو. پاشـای کۆنگۆ، نزینگا ئا نکۆوا، بوە کاسۆلیك و ناوەکەی خۆی گۆڕی بۆ جۆنی یەکەم. دواتر ناوی مبێنـزاش گـۆڕا بـۆ سـاو سـەلڤادۆر. لـە سـایەی پورتوگالیەکانـەوە، خەڵکی کۆنگۆ بە چەرخ و گاسن ئاشنا بوون و تەنانەت پورتوگالیەکان لە کـاتی گەشـتە کـشتوکاڵیەکانی سـاڵانی ١٤٩١ و ١٥١٢ دا هـانی خـەڵکیان دا تـا ئـەم ئامێرانــە بــەکاربهێنن، بــەڵام هــەموو ئــەم دەسپێــشخەرییانە شکــستیانهێنا، هەرچەندە کۆنگۆییەکان بە شێوەیەکی گشتی زۆر دووربـوون لـەوەی دژایـەتی تەکنـەلۆجی مـۆدێرن بکـەن. ئـەوان زۆر زوو کەوتنـە بـەکارهێنانی داهێنـانێکی شکۆداری ڕۆژئاوا کە ئەویش تفەنگ بوو. ئەم ئامرازە نوێ و بـەهێزەیان خستە گەڕ تا بـەپیر ئـەو هاندانـەوە بـچن کـە بـازاڕ دەسـتەبەری کردبـوو: بـۆ گـرتن و هەناردە کردنـی کـۆیلان. لێـرەدا هـیچ هێمایـەك نـابینین کـە بـەها و کـەلتووری ئەفریقییـەکان ڕێگـر بـووبن لەبـەردەم بـەکارهێنانی تەکنـەلۆجی و ڕەفتـارە نوێکانـەوە. لەگـەڵ قوڵبوونـەوەی پەیوەندییـەکان لەگـەڵ ئەورووپییـەکان دا، کۆنگۆییەکان ڕەفتاری تری ڕۆژئاواییەکانیان وەرگـرت: خوێنـدەواری، سـتایەڵی جلوبـەرگ و دیزاینــی خـانوو. لـە سـەدەی نۆزدەیـەم دا، چـەندین کۆمـەڵگای ئــەفریقی ســوودیان لــەو دەرفەتــە ئابوورییانــەی کــە شۆڕشــی پیــشەسازی ڕەخساندبونی وەرگرت لە ڕێگەی گۆڕینی شێوازی بەرهەمهێنانەوە. لە ڕۆژئاوای ئــەفریقا پەرەپێـدانی ئـابووری خێـرا هاتـەئاراوە کـە پـشتی بـە ڕۆنـی خورمـا بەستبوو. لەسەرانسەری باشووری ئەفریقادا، ئەفریقییەکان کەوتنە پـەرەپێدانی هـەناردەکردن بـۆ دەڤـەرە خـاوەن پیـشەسازی و کانـە خێـرا فراوانبوەکـانی ناوچەی ڕاند لە باشووری ئەفریقا. لەگـەڵ ئەمـەش دا ئـەم ئەزموونـە ئابوورییـە ئومێدبەخـشانە لـەبار بـران، نـەك بـەهۆی کـەلتووری ئـەفریقی یـان بێتوانـایی ئەفریقییە ئاساییەکان تـا لـە پێنـاوی بەرژەوەندییـەکانی خۆیـان دا کاربکـەن، بـەڵکو لەسـەرەتادا بـەهۆی کۆڵنیـاڵیزمی ئـەورووپی و دواتـریش بـەهۆی ئـەو

حکومەتانەی دوای سەربەخۆیی جڵەوی حوکمیان گرتەدەست.

هۆکاری ڕاستەقینە کە بوە هـۆی ئـەوەی کۆنگۆییـەکان تەکنـەلۆجی نایـاب بەکارنەهێنن، بریتیبوو لەنەبوونی هیچ جۆرە هاندانێك تا ئەو کارە بکەن. ئەوان لەبەردەم مەترسی گەورەی ئەوەدا بـوون کـە هـەموو بەرهەمـەکانیان لـە لایـەن پاشای دەسەڵات ڕەهاوە لێزەوتبکرێ، گرنگ نییە پاشا بووبێ یان نـەبووبێ بـە کاسۆلیك. لە ڕاستیدا تەنیا موڵك و ماڵیان نـەبوو کـە لـە ژێـر مەترسـیدا بـوون، بەڵکو مانەوەیان لە ژیان دا بە تاڵە دەزوویەکـەوە بەسـترابۆوە. چـەندین کـەس لـەوان گـیران و وەك کۆیلـە فرۆشـران، ئەمـەش ئـەو ژینگەیـە نـەبوو کـە هـانی وەبەرهێنان بدا بۆ زیادکردنی بەرهەمداریی درێژخایەن. پاشاش هانـدانی نـەبوو تا گاسن بە ئەندازەیەکی زۆر بخاتە گەڕ یان زیادکردنی بەرهەمداریی کشتوکاڵی بکاتە ئامانجی یەکەمی: فرۆشتنی کۆیلان بۆ ئەو قازانجی گەلێك زیاتر بوو.

ڕەنگە ئەوە ڕاست بێ کە ئەمڕۆ ئەفریقییەکان کەمتر لە گـەلانی ناوچـەکانی تـری جیهـان متمانـەیان بـە یـەکتر هەیـە، بـەڵام ئەمـە ئـەنجامی مێژوویـەکی دووردرێـژی دەزگاکـانن کـە بوونـە هـۆی لاوازکردنـی مـافی مـرۆڤ و مـافی خاوەنـدارێتی لـە ئـەفریقادا. ئەگـەری بـەهێزی گـرتن و فرۆشـتن وەك کۆیلـە، بێگومـان لــە ڕووی مێژووییــەوە کاریگــەر بــوە لەســەر ڕادە و ئەنــدازەی متمانەبوونی ئەفریقییەکان بە خەڵکی تر.

ئایا ئاکاری پرۆتستانتی ماکس وێبەر چییە؟ هەرچەندە لەوانەیە ڕاسـت بـێ کە بەزۆری وڵاتە پرۆتستانتەکانی وەك هۆڵەندا و ئینگلتەرە یەکەم سەرکەوتنی ئابووریان لە سەردەمی نوێدا بەدەستهێنا، لەگـەڵ ئەمـەش دا، پەیوەندییـەکی ئەوتۆ لە نێوان ئایین و سـەرکەوتنی ئـابووری دا نییـە. فەڕەنـسا کـە وڵاتێکـی زۆرینە کاسۆلیکە هەر زوو لە سەدەی نۆزدەیەم دا لاسایی پێشکەوتنی ئابووری هۆڵەندی و ئینگلیزەکانی کـردەوە و ئـەمڕۆ ئیتالیـا بـە ئەنـدازەی هەریـەك لـەم نەتەوانە دەوڵەمەندە. ئەگەر بڕوانیتە ڕۆژهەڵاتی دوور، ئەوا دەبینی کە هیچ کام لەو سەرکەوتنە ئابوورییانەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا پەیوەندیان بـە هـیچ شـێوازێکی ئایینی مەسیحیەوە نییە. کەواتە لەوێـشدا پـشتگیریەکی ئـەوتۆ بـەدیناکرێ بـۆ پەیوەندی تایبەتی نێوان پرۆتستانیزم و سەرکەوتنی ئابووری.

با ئاوڕێك لە ناوچەیەکی جێگەی بایـەخی لایـەنگرانی سـەرگەرمی گریمانـەی کـەلتوور بدەینـەوە کـە ئـەویش ناوچـەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتە. وڵاتـانی

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە شێوەیەکی سەرەکی وڵاتانی ئیسلامین و هەروەك لەمەوبەر بینیمان، ئەوانەی خاوەنی نەوت نین زۆر هەژارن. وڵاتە بەرهەمهێنەرەکانی نەوت دەوڵەمەند ترن، بەڵام ئەم سامانە شتێکی ئەوتۆی نەکردوە بۆ بنیاتنانی ئابوورییەکی فرەسەرچاوە لە سعودیە یان کوەیت. ئایا ئەم ڕاستییانە بە دڵنیاییەوە ئەوە ڕووناکەنەوە کە ئایین کاریگەریی هەیە؟ هەرچەندە ڕێی تێدەچێ، بەڵام ئەم ئارگومێنتەش ڕاست نییە. بەڵی وڵاتانی وەك میسر و سوریا هەژارن و زۆرینەی دانیشتوانیان موسڵمانن، بەڵام ئەم وڵاتانە بە شێوەیەکی سیستەماتیك لە ڕووی تریشەوە جیاوازن کە کاریگەری زۆر زیاتریان بۆ خۆشگوزەرانی ئەم وڵاتانە هەیە. یەکێك لەو ڕووە جیاوازانە ئەوەیە کە ئەم وڵاتانە هەموویان ویلایەتی سەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوون کە بە توندی و بە شێوەیەکی چەوت و ناهەموار شێوازی پەرەپێدانی ئەو وڵاتانەی دارشتوە. دوای ئەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هەرەسیهێنا، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست خرایە ناو ئیمپراتۆریەتە کۆلۆنیاڵەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی، کە دیسانەوە بوونە هۆی داهێزانی تواناکانیان. دوای سەربەخۆییش ئەم وڵاتانە لە بازنەی جیهانی کۆن دا قەتیس مان لە ڕێگەی دامەزراندنی ڕژێمی سیاسی پلەبەند و زۆر کەم لەو دەزگایانەیان دامەزراند، بە ڕای ئێمە، کە گرنگن بۆ سەرکەوتنی ئابووری. ئەم ڕێچکە پەرەپێدانە بە زۆری مۆرکی مێژووی حوکمی عوسمانییەکان و ئەورووپییەکانی گرتەخۆ. پەیوەندی نێوان ئاینی ئیسلام و هەژاری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، زیاتر هەڵبەستراوە.

ڕۆڵی ئەم بەسەرهاتە مێژووییانە، نەك هۆکارە کەلتوورییەکان، لە دارشتنی ئاڕاستەی ئابووری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، لەو ڕاستیەش دا بەدیدەکرێ کە هەندێك ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە بە شێوەیەکی کاتی خۆیان لە کۆنترۆڵی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دەسەڵاتی ئەورووپییەکان ڕزگارکرد، وەکو میسر لە نێوان ساڵانی ١٨٠٥ و ١٨٤٨ دا بەسەرکردایەتی موحەمەد عەلی، دەیانتوانی ڕێگای خێرای گۆڕانکاری ئابووری بگرنە بەر. موحەمەد عەلی دوای پاشەکشەی هێزەکانی فەرەنسا کە لە کاتی فەرمانڕەوایی ناپلیۆن بۆناپارت دا میسریان داگیرکردبوو، دەسەڵاتی گرتەدەست. بە سوود وەرگرتن لە لاوازییەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەو کاتەدا، ئەو توانی دەسەڵاتی بنەماڵەیی خۆی دابمەزرێنێ کە بە هەر شێوەیەك بێ توانی حوکمی میسر بکا تا

شۆڕشی میسر بە سەرکردایەتی ناسر لە ساڵی ١٩٥٢ دا. چاکسازییەکانی موحەمەد عەلی، هەرچەندە بە زۆرداری بوون، توانییان گەشەکردن لە میسردا بهێننەئاراوە چونکە بیرۆکراسیەتی دەوڵەت و سوپا و سیستەمی باج نوێکرانەوە و گەشەکردن لە بوارەکانی کشتوکاڵ و پیشەسازی دا هاتنەئاراوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا، دوای مردنی موحەمەد عەلی پرۆسەی نوێکاری و گەشەکردن وەستا، کاتێك میسر کەوتە بن کاریگەری ئەوروپییەکانەوە.

ڕەنگە ئەمە ڕێگەیەکی هەڵە بێ بۆ بیرکردنەوە دەربارەی کەلتوور. لەوانەیە ئەو فاکتەرە کەلتوورییانەی گرنگن پەیوەست نەبن بە ئایینەوە بەڵکو زیاتر پەیوەندییان بە " کەلتووری نەتەوەیی"یەوە هەبێ. ڕەنگە کاریگەریی کەلتووری ئینگلیزی شرۆڤەی ئەوە بکا کە بۆچی وولاتانی وەك ویلایەتە یەکگرتوەکان و کەنەدا و ئوستراليا هێندە دەوڵەمەندن. هەرچەندە ئەم بیرکردنەوەیە ڕەنگە لە سەرەتادا ڕەواجی هەبێ، بەلام ئەمیش مەبەست ناپێکێ. بەڵێ کەنەدا و ئوستڕاليا کۆلۆنی ئینگلتەرە بوون، بە لام خۆ سیارا لیۆن و نایجیریاش بە هەمانشێوە کۆلۆنی ئینگلتەرە بوون. جیاوازی نێوان خۆشگوزەرانی کۆلۆنییەکانی پێشووی ئینگلتەرا، هێندەی جیاوازی نێوان خۆشگوزەرانی جیهان گەورەن. میراتی ئینگلیزی هۆکاری سەرکەوتنی باکووری ئەمەریکا نییە.

لەگەڵ ئەمەش دا، شێوازێکی تری گریمانەی کەلتوور هەیە: ڕەنگە مەسەلەکە بریتینەبێ لە ئینگلیز بەرامبەر ئەوانەی ئینگلیز نین، بەڵکو مەسەلەکە بریتی بێ لە ئەوروپی بەرامبەر ئەوانەی ئەوروپی نین. ئایا دەبێ هۆکارەکە ئەوەبێ کە ئەوروپییەکان بە شێوەیەك لە شێوەکان بالادەست بن لەبەر ئاکاری کارکردنیان و تێڕوانینیان بۆ ژیان یان لەبەر بەهاکانی جوولەکە و مەسیحی یان کەلەپووری ڕۆمانی؟ ڕاستە، ڕۆژئاوای ئەوروپا و باکووری ئەمەریکا کە پڕن لە خەڵکی ڕەچەڵەك ئەوروپی، ناوچە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهانن. ڕەنگە بالادەستی کەلتووری ئەوروپی بنەمای خۆشگوزەرانیان بێ - ئەمەش دوا شتە کە گریمانەی کەلتوور پەنای بۆ دەبات. بەداخەوە، ئەم شێوەیەی گریمانەی کەلتوور وەك شێوەکانی تر توانای شرۆڤەکردنی کەمە. ڕێژەیەکی زیاتری دانیشتوانی ئەرجەنتین و ئۆرۆگوای لە ڕەچەڵەکی ئەوروپین بە بەراورد لەگەڵ دانیشتوانی کەنەدا و ویلایەتە یەکگرتوەکان، بەلام

دەسکەوتە ئابوورییەکانی ئەرجەنتین و ئوروگوای خۆزگەیان بۆ ناخوازرێ.
یابان و سینگاپور هەمیشە ژمارەیەکی یەکجار کەمی دانیشتوانیان لە ڕەچەڵەکی ئەورووپی بوون، کەچی هێندەی زۆربەی ناوچەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا دەوڵەمەندن.

چین، سەرەڕای چەندین کەموکوڕی لە سیستەمە ئابووری و سیاسییەکەی دا، لە سێ دەیەی ڕابووردودا خێراترین نەتەوەی گەشەکردوو بوە. هەژاری چین تا مردنی ماوتسی تۆنگ هیچ پەیوەندییەکی نەبوو بە کەلتووری چینەوە، بەڵکو لەبەر شێوازی کاولکارانەی بەڕێوەبردنی ئابووری و سیاسەتکردن بوو لە لایەن ماوەوە. لە ساڵی ١٩٥٠ کاندا ماو (تەکانی گەورە بۆ پێشەوە)ی هێنایەئاراوە، کە سیاسەتێکی لە ئەندازەبەدەری بەپیشەسازیکردنی چین بوو کە بوە هۆی برسێتی و گرانییەکی فراوان. لە ١٩٦٠ کاندا ماو (شۆڕشی کەلتووری) بەرپاکرد کە بوە مایەی چەوساندنەوەی کەسانی ڕووناکبیر و خەڵکی تێگەیشتوو. ئەوانەی دڵسۆزییان بۆ حیزب جێگەی گومان بوو. ئەمەش دیسانەوە بوە هۆی تۆقاندن و بەفێڕۆدانێکی زۆری بەهرەی کۆمەڵگا و سامانەکەی. بە هەمانشێوە، گەشەکردنی ئێستای چین هیچ پەیوەندی نییە بە بەهاکانی چین یان گۆڕانکاری لە کەلتووری چین دا. ئەم گەشەکردنە ئەنجامی پرۆسەیەکی گۆڕانکاری ئابوورییە کە بەهۆی چاکسازییەکانی دینگ خیاوپینگ و هاوپەیمانەکانییەوە هاتەئاراوە. ئەوان، دوای مردنی ماو تسی تۆنگ بەرەبەرە وازیان لە سیاسەت و دەزگاکانی ئابووری سۆشیالیستی هێنا، لە سەرەتادا لە بواری کشتوکاڵ و دواتریش لە بواری پیشەسازی دا.

بە هەمانشێوەی گریمانەی جۆگرافیا، گریمانەی کەلتووریش یارمەتیدەر نییە بۆ شرۆڤەکردنی ڕوەکانی تری چۆنیەتی باری زەوی. بێگومان جیاوازی لە باوەڕ و هەڵسوکەوتە کەلتووری و بەهاکان دا هەیە لە نێوان ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئەمەریکای لاتین دا، بەڵام بە هەمانشێوەی ئەو جیاوازییانەی نێوان نۆگاڵس، ئەریزۆنا و نۆگاڵس، سۆنۆرا یان ئەوانەی لە نێوان باکوور و باشووری کۆریا دا هەن، جیاوازییەکان ئەنجامی جیاوازی لە دەزگاکان و مێژووی دەزگاکانی ئەم دوو شوێنانەن. فاکتەری کەلتووری کە جەخت لەسەر ئەوە دەکا چۆن کەلتووری "هیزبانیک" یان "لاتین"

ئیمپراتۆریـەتی ئیـسپانی داڕشـتوه، نـاتوانیَ شـرۆڤەی جیاوازییـەکانی نـاو خـودی ئەمـەریکای لاتـین بکـا ــ بـۆ نموونـه، بۆچـی ئەرجـەنتین و چـیلی خۆشـگوزەرانترن لـە پـیرۆ و بۆلیڤیـا. جۆرەکـانی تـری ئارگومێنتـەکانی کەلتوور- بۆ نموونه، ئەوانەی جەخت لە کەلتووری نـوێی خەلکە خۆماڵیەکـە دەکـەن ــ بەهەمانـشێوە نـاتوانن مەبەسـت بپـێکن. ئەرجـەنتین و چـیلی ژمارەیـەکی کـەمتر خـەڵکی خۆماڵییـان هەیـە بـە بـەراوورد لەگـەڵ پـیرۆ و بۆلیڤیا. هەرچەندە ئەمە ڕاستە، بـەلام کـەلتووری خۆمـالی بـۆ شـرۆڤەکردن دیـسانەوە سـوودی نییـە. کۆلۆمبیـا و ئیکـوادۆر و پـیرۆ ئاسـتی داهـاتی هاوشێوەیان هەیە، بەلام ئەمڕۆ کۆلۆمبیا ژمارەیـەکی کـەم خـەڵکی خۆمـالی هەیە، لە کاتێـك دا ئێکـوادۆر و پـیرۆ ژمارەیـەکی زۆرتـر خـەڵکی خۆماڵییـان هەیە. لە کۆتایی دا، هەڵسوکەوتە کەلتوورییەکان، کە بە گشتی بە هێواشـی دەگـۆڕێن، نـاکرێ بـە تـەنیا هۆکـاری ئـەو گەشـەکردنە سەرسـوڕهێنەرەی ڕۆژهـەلاتی ئاسـیا و چـین بـن. هەرچـەندە دەزگاکـان هـەوڵی بـەردەوامی دەدەن، بەلام لە هەندێك دۆخی تایبـەت دا ئـەوانیش بـە خێرایـی دەگـۆڕێن، هەروەك دواتر دەبینین.

## گریمانەی نەشارەزایی

دوا تیۆری بەناوبانگ دەربارەی ئەوەی بۆچی هەندێك نەتـەوە هـەژارن و هەندێکیش دەوڵەمەندن، بریتییە لـە گریمانـەی نەشـارەزایی، کـە پێـداگیری لـەوە دەکـا نایەکـسانی لـە جیهـان دا بـوونی هەیـە چـونکە ئێمـە یـان فەرمانڕەواکانمان نـازانن چـۆن وولاتـە هـەژارەکان دەوڵەمەنـد بکـەن. ئەمـە بیرۆکەیەکە لـە لایـەن زۆربـەی ئابووریناسـانەوە پـشتگیری لێـدەکریَ و ئـەو پێناسە بەناوبانگە دەجوونەوە کە لە لایەن ئابووریناسـی ئینگلیـزی لیۆنێـلَ ڕۆبیـنس لـە سـاڵی ۱۹۳۵ دا خراوەتـەڕوو کـە دەڵـێ (ئـابووری زانـستێکە دیراسەی ڕەفتاری مرۆڤ دەکا وەك پەیوەندی لـە نێـوان ئامـانج و کەرەسـە کەمەکان دا کە بەکارهێنانی ئەڵتەرنەتیڤیان هەیە)

کەواتە بە هەنگاوێکی کـورت دەگەینـە ئـەو دەرئەنجامـەی کـە پێویـستە

زانستی ئابووری جەخت لەسەر باشترین شێوەیەی بەکارهێنانی کەرەسە کەمەکان بکا بۆ هێنانەدی ئامانجە کۆمەڵایەتیەکان. لە راستیدا، بەناوبانگترین ئەنجامی تیۆری لە ئابووری دا کە پێیدەوترێ یەکەم تیۆری خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی، ئەو بارودۆخە دەسنیشاندەکا کە تیایدا تەرخانکردنی دەرامەتەکان لە "ئابووری بازاڕدا" لە ڕوانگەی ئابوورییەوە، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە پەسەندە. ئابووری بازاڕ ئەبستراکتێکە کە مەبەست لێی پیشاندانی دۆخێکی ئەوتۆیە کە تیایدا هەموو تاك و کۆمپانیاکان بتوانن بە ئازادی هەر کاڵا یان خزمەتگوزارییەك بیانەوێ، بە ئازادی بەرهەمیانبهێنن و بیانکڕن و بیانفرۆشن. کاتێك ئەم بارودۆخە نایەتەئاراوە ئەوا "شکستی بازاڕ" ڕوودەدا. ئەم شکستانەش بنەمای تیۆری نایەکسانی لە جیهان دا پێکدەهێنن، چونکە تا شکستەکانی بازاڕ زیاتر بێ چارەسەر بمێننەوە، ئەوا ڕەنگە ئەو وولاتە بەرەو هەژاری زیاتر بڕوات. گریمانەی نەشارەزایی وادەدنێ کە وولاتانی هەژار هەژارن چونکە ژمارەیەکی زۆر شکستی بازاڕیان هەیە و ئابووریناسان و دانەرانی پۆلیسی نازانن چۆن چارەسەری ئەم شکستانە بکەن و لە ڕابوردوودا پەیڕەوی ئامۆژگاری خراپیان کردوە. وولاتە دەوڵەمەندەکان دەوڵەمەندن، چونکە توانیویانە پۆلیسی باشتر گەڵاڵە بکەن و سەرکەوتوانە ئەم شکستانانەیان لەناوبردوە.

ئایا گریمانەی نەشارەزایی دەتوانێ شرۆڤەی نایەکسانی جیهانی بکا؟ ئایا دەبێ لەبەر ئەوە بێ کە وولاتانی ئەفریقی لە زۆربەی وولاتانی جیهان هەژارترن چونکە سەرکردەکانیان هەمان بیروبۆچوونی هەڵەیان هەیە دەربارەی بەڕێوەبردنی وولاتەکانیان و ئەمەش بۆتە هۆی هەژاری لەو وولاتانەدا، لە کاتێك دا سەرکردەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا زانیارییان زیاترە یان باشتر ئامۆژگاری دەکرێن کە ئەمەش شرۆڤەی سەرکەوتنە ڕێژەییەکانیان دەکا؟ لەکاتێك دا نموونەی ناسراوی ئەو سەرکردانە زۆرن کە پۆلیسی کاولکارانەیان پەیڕەوکردوە چونکە دەرکیان بە ئاکامەکانی ئەو پۆلیسیانە نەکردوە، نەشارەزایی ناتوانێ تەنانەت لە باشترین حاڵەتیشدا، شرۆڤەی بەشێکی بچووکی نایەکسانی جیهانی بکا.

ئەگەر بە شێوەیەکی ڕووکەش سەیری بکەین ئەوا ڕۆچونە ئابوورییە

بەردەوامەکەی، کە غانا هەر دوای وەرگرتنی سەربەخۆیی لە بەریتانیا، ڕووبەڕووی بۆوە، لە ئەنجامی نەشارەزاییەوە بوو. ئابووریناسی بەریتانی تۆنی کیلیك کە ئەو کاتە وەك ڕاوێژکار کاری بۆ حکومەتەکەی کوامی نکرۆما دەکرد، چەندین نموونەی لەو گرفتانە بە درێژی تۆمارکردوە. پۆلیسیەکانی نکرۆما بایەخیان بە پەرەپێدانی پیشەسازی دەوڵەت دەدا کە دەرکەوت زۆر ناکارامە بوون. کیلیك دەگێڕێتەوە:

(کارگەی دروستکردنی پێڵاو ... کە دەبوە هۆی پێکەوە بەستنەوەی کارگەی گۆشت لە باکوور، لە ڕێگەی گواستنەوەی پێستەکان بۆ باشوور (بۆ ماوەی زیاتر لە ٥٠٠ میل) بۆ شوێنی خۆشکردنی پێستە (کە ئێستا چۆڵکراوە). دەبوایە چەرمەکە بهێنرایەتەوە بۆ کارگەی پێڵاوەکە لە کوماسی، لە ناوەڕاستی وڵات و نزیکەی ٢٠٠ میل لە باکووری کارگەی پێستەخۆشکردنەکە. لەبەرە ئەوەی بازاڕی سەرەکی پێڵاو لە ناوچەی مێترۆپۆلیتانی ئەکرەیە، دەبوایە دواتر پێڵاوەکان بۆ ماوەی ٢٠٠ میل بۆ باشوور بگوێزرانایەوە).

کیلیك بە ڕاشکاوی کەمەوە دەڵێ کە ئەم بازرگانییە (بەهۆی هەڵبژاردنی شوێنی نەگونجاوەوە ئاستەنگ هاتە بەردەم سەرکەوتنی) کارگەی پێڵاو یەکێك بوو لە چەندین پرۆژەی تری لەم شێوەیە و دواتر کارگەی قوتوبەندی مانگۆ لە ناوچەیەکی ئەوتۆی غانا دامەزرا کە مانگۆی تێدا بەرهەمنەدەهێنرا و بەرهەمی کارگەکەش زیاتر بوو لە داخوازی هەموو جیهان بۆ ئەو بەرهەمە. ئەم زنجیرە بێکۆتاییە لە پەرەپێدانی نەشیاو لە ڕووی ئابوورییەوە، لەبەر ئەوە نەبوو کە نکرۆما یان ڕاوێژکارەکانی زانیاری چەوتیان هەبوو یان بێئاگا بوون دەربارەی پۆلیسی ئابووری. ئەوان کەسانی وەك کیلیك ڕاوێژکاریان بوو، تەنانەت لە لایەن سێر ئارسەر لویس کە خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ بوو، ئامۆژگاری دەکران و دەیزانی ئەم پۆلیسییانە گونجاو نین. ئەوەی کە لە پشت پەیڕەوکردنی ئەم پۆلیسییانەوە بوو ئەو ڕاستیەیە کە نکرۆما پێویستی بەم جۆرە پۆلیسییانە بوو بۆ کڕینی پشتگیریی سیاسی و هێشتنەوەی ڕژێمە نادیموکراسییەکەی لە حوکم دا.

ناکرێ، نە کارە نومێدبڕەکانی غانای دوای سەربەخۆیی و نە حاڵەتە

لەژمارە نەهاتوەکانی تری خراپ بەڕێوەبردنی ئابووری، هەروا بە ئاسانی بخرێتە ئۆبالّی نەشارەزاییەوە. خۆ ئەگەر کێشەکە بریتیبوایە لە نەشارەزایی ئەوا سەرکردە نیازپاکەکان هەر زوو تێدەگەیشتن کە چ جۆرە پۆلیسییەك دەبوە هۆی زیادبوونی داهات و خۆشگوزەرانی هاولاّتییەکانیان و هەولّی جێبەجێکردنی ئەو پۆلیسییانەیان دەدا.

بیر لە ڕێچکە لێکدوورکەوتوەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان و مەکسیك بکەرەوە. ئەگەر ئۆبالّی جیاوازییەکانی نێوان ئەم دوو وولاّتە بخەیتە ئەستۆی نەشارەزایی سەرکردەکانی ئەم دوو نەتەوەیە، ئەوا لە باشترین حالّەت دا، ناچێتە ئەقلّەوە. ئەوە جیاوازی زانیاری یان نیازی نێوان جۆن سمیس وکۆرتێز نەبوو کە تۆوی لێکدوورکەوتنەوەی لە سەردەمی کۆلۆنیالّیدا ڕشت، دیسانەوە ئەوە جیاوازی نێوان سەرۆکەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی وەکو تێدی ڕۆزڤێلّت یان وودرۆ وێلّسۆن و پۆرفیریۆ دیاز نەبوو کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم دا بوە هۆی ئەوەی کە مەکسیك جۆرە دەزگایانی ئەوتۆی ئابووری هەلّبژێرێ کە نوخبەکان دەولّەمەند بکا لەسەر حسابی باقیەکەی تری کۆمەلّگا، لە کاتێك دا ڕۆزڤێلّت و وودرۆ پێچەوانەی ئەوە کاریان کرد. بەلّکو جیاوازییەکە بریتیبوو لە جیاوازی لە جلّەوگیرییە دەزگاییەکان کە سەرۆك و نوخبەکانی ئەو وولاّتانە دەبوایە ڕووبەڕووی ببونایەوە. بە هەمانشێوە، سەرکردەکانی ئەفریقا کە نەتەوەکانیان لە ماوەی نیو سەدەی ڕابوردوووەوە بە دەست مافی مولّکداری ناجێگیر و دەزگای ئابوورییەوە دەنالّێنن کە بوونەتە هۆکاری داماوی زۆربەی دانیشتوان، نەیانهێشت ئەمە ڕووبدا چونکە لەو بڕوایەدا بوون کە ئەوە لە ڕووی ئابوورییەوە لەبەرژەوەندی ئەوان دا بوو، دەشیانزانی ئەوەیان بۆ دەچێتە سەر و دەتوانن لە سەر حسابی باقی خەلّکەکە خۆیان دەولّەمەند بکەن، یان لەبەر ئەوە بوو کە لایانوابوو ئەوە سیاسەتێکی باشە و ڕێگەیەکە بۆ هێشتنەوەی خۆیان لە دەسەلاّت دا بە کڕینی پشتگیریی گروپە گرنگەکان و نوخبەکان.

ئەزموونی کۆفی بوسیای، سەرۆك وەزیرانی غانا لە سالّی ١٩٧١ دا، ئەوە پیشاندەدا کە دەشێ گریمانەی نەشارەزایی چەندە چەواشەکار بێ. بوسیا، دوای ئەوەی لە سالّی ١٩٦٩ دا دەسەلاّتی گرتەدەست، ڕووبەڕووی

تەنگژەیەکی ئابووری ترسناک بۆوە.، بەهەمانشێوەی نکرومـا پـێش خـۆی، کەوتە پەیڕەوکردنی سیاسەتی فراوانکردنی ئابووری ئـەوتۆ کـە برەوپێـدانی زەحمەت بوو و دانـانی میکـانیزمی جیـاوازی کـۆنترۆڵکردنی نـرخ لـە ڕێگـەی بۆردەکانی خستنەبازاڕ و دانانی نرخی گۆڕینەوەی پارە زیـاتر لـە بەهاکـەی خـۆی. هەرچـەندە بوسـیا بەرهەڵـستکاری نکرۆمـا بـوو و سـەرکردایەتی حکومەتێکی دیموکراسی کرد، ئەو ڕووبەڕووی زۆربـەی هـەمان جڵەوگیرییـە سیاسییەکانی نکرۆما بۆوە. بە هەمانشێوەی نکرۆمـا، لەسـەردەمی ئـەویش دا پۆلیسی ئابووری پەیڕەوکران نـەك لەبـەر ئـەوەی ئـەو "نەشـارەزا" بـوو، یان لای وابوو کە ئەو پۆلیسییانە لە ڕووی ئابوورییەوە باشن، یـان باشـترین ڕێگەن بۆ پەرەپێدانی وڵات. ئەو پۆلیسییانە هەڵبـژێران چـونکە سیاسـەتی باش بوون و ئەو دەرفەتەیان بۆ بوسیا ڕەخساند تا سامان بـۆ ئـەو گروپانـە دەستەبەر بکا کە لە ڕووی سیاسییەوە خـاوەن هێـز بـوون، بـۆ نموونـە، بـۆ ناوچە شارییەکان کە پێویست بوو ڕازیبکرێن. کۆنترۆڵکردنی نـرخ بـوە هـۆی لاوازکردنی کشتوکاڵ و دابینکردنی خۆراکی هەرزان بـۆ ناوچـە شـارییەکان و پەیـداکردنی داهـات تـا خەرجیـەکانی حکومـەتی پـێ تـەمویلبکرێ، بـەڵام نـەتوانرا بـەردەوامی بـەم نـرخ کۆنترۆڵکردنـە بـدرێ و زۆری پێنەچوو غانـا تووشی زنجیرەیەك تەنگژەی هاوسەنگی هاتنەناوە و چـوونەدەرەوەی پـارە (Balance of payment) و کەمی دراوی بیانی بۆوە. لەگەڵ کەوتنـە نـاو ئەم گێـژاوەوە، لـە ٢٧ کـانونی یەکـەمی ١٩٧١ دا، بوسـیا ڕێکەوتنامەیـەکی لەگـەڵ سـندوقی دراوی نێودەوڵـەتی (IMF) دا ئیمزاکـرد و دابەزانـدنی بەرچاوی نرخی دراوی وڵات بەشێك بوو لەم ڕێکەوتنامەیە.

(IMF) و بانکی جیهانی و هەموو جیهان گوشاریان خستە سـەر بۆسـیا بـۆ ئـەوەی ئـەو چاکسازییانەی لـە ڕێکەوتنامەکـەدا هـاتبوون جێبـەجێبکا. هەرچـەندە دەزگـا نێودەوڵەتییـەکان خۆشـحاڵ و لـە هـەمانکات دا بێئگـاش بـوون، بوسـیا دەیزانـی کـە قومـارێکی سیاسـی گـەورەدەکا. ئـەنجامی ڕاستەوخۆی دابەزینی بەهای پارەی وڵات بریتیبوو لە ئاژاوە و نارەزایی لـە ئـەکرای پایتـەختی غانـا، کـە نـەتوانرا کـۆنترۆڵ بکـرێ تـا بۆسـیا لـە لایـەن سوپاوە بەسەرکردایەتی کۆلۆنیۆڵ ئاچـیمپۆنگ دەسـەڵاتی لێسەندرایەوە و ئەویش هەر زوو بەها دابەزاندنی پارەی پێچەوانەکردەوە.

گریمانەی نەشارەزایی جیاوازە لە گریمانەی جۆگرافیا و کەلتوور لەوەدا کە پێشنیازێکی ئامادەی چۆنیەتی "چارەسەرکردنی" کێشەی هەژاری دەخاتە ڕوو: ئەگەر نەشارەزایی ئێمەی گەیاندبێتە ئێرە، ئەوا دەسەلاتداران و دانەرانی پۆلیسی زیرەك و شارەزا دەتوانن لێرە دەرمابهێنن و دەبێ بتوانین "ئەندازیاریی" خۆشگوزەرانی لەسەراپای جیهان دا بکەین بە پێشکەشکردنی ئامۆژگاری دروست و فێرکردنی سیاسییەکان بەوەی ئابووری گونجاو چییە. لەگەڵ ئەمەش دا، ئەزموونی بۆسیا ئەو ڕاستییە دەردەخا٠کە کۆسپی سەرەکی پەیڕەوکردنی ئەو پۆلیسییانەی دەبنە هۆی کەمکردنەوەی شکستەکانی بازاڕ و یارمەتی گەشەکردنی ئابووری دەدەن، بریتی نییە لە نەشارەزایی سیاسییەکان، بەڵکو بریتییە لەو هاندەر و جڵەوگیرییانەی لە لایەن دەزگا سیاسی و ئابوورییەکانی کۆمەڵگاکانیانەوە ڕووبەڕوویاندەبنەوە.

هەرچەندە گریمانەی نەشارەزایی تائێستاش لە ناو ئابووریناس و بازنەی دانەرانی پۆلیسی ڕۆژئاوادا بالادەستە- کە بەدەر لە هەموو شتێکی تر جەخت لەسەر ئەوە دەکا کە چۆن "ئەندازیاریی" خۆشگوزەرانی بکەین، ئەمیش تەنیا گریمانەیەکی ترە و کار ناکا. ئەم گریمانەیە نە بنچینەکانی هەژاری لە جیهان دا شرۆڤە دەکا و نە چۆنیەتی باری زەوی دەورمان شرۆڤە دەکا - بۆ نموونە، بۆچی هەندێك نەتەوەی وەکو مەکسیك و پیرۆ، نەك ویلایەتە یەکگرتوەکان یان ئینگلتەرە پەیڕەوی ئەو دەزگاو پۆلیسییانەیان کرد کە بوونە هۆی هەژاری زۆربەی هەرە زۆری هاولاتییانیان، یان بۆچی نزیکەی هەموو وولاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا و زۆربەی وولاتانی ناوەڕاستی ئەمەریکا هێندە لە ئەوروپای ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلاتی ئاسیا هەژارترن.

کاتێك نەتەوان خۆیان دەربازدەکەن لەو ڕێچکە دەزگاییانەی تووشی هەژاری کردوون و دەتوانن ڕێگەی گەشەکردنی ئابووری بگرنەبەر، لەبەر ئەوە نییە کە لە پڕێکدا سەرکردە نەشارەزاکانیان شارەزاتر دەبن یان کەمتر بایەخ بە بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەدەن یان لەبەر ئەوەی لە لایەن ئابووریناسانی باشترەوە ئامۆژگاری کراون. بۆ نموونە، چین یەکێکە لەو وولاتانەی وازی لەو پۆلیسییە ئابوورییانە هێنا کە مایەی هەژاری و برسێتی

بوون بۆ ملیۆنان کەس و پەیڕەوی ئەوانەی کرد کە دەبنە هۆی گەشەکردنی ئابووری. بەڵام، هەروەك دواتر بە درێژی باسی دەکەین، لەبەر ئەوە روویندا چونکە حیزبی کۆمۆنیستی چین لە کۆتایی دا تێگەیشت کە خاوەندارێتی بە کۆمەڵی زەوی کشتوکاڵی و پیشەسازی هاندانی خراپیان دەرەخساند. لە بری ئەمە، دینگ خیاو پینگ و هاوپەیمانانی، کە بایەخدانیان بە بەرژەوەندییەکانی خۆیان کەمتر نەبوو لە ناحەزەکانیان، بەڵام بەرژەوەندی جیاواز و ئامانجی جیاوازیان هەبوو، دوژمنە بەهێزەکانیان لە ناو حیزبی کۆمۆنیست دا تێکشاکاند و سەرکردایەتی جۆرە شۆڕشێکی سیاسییان کرد کە بوە هۆی گۆڕانی بنەڕەتی لە سەرکردایەتی و ئاراستەی حیزب دا. چاکسازییە ئابوورییەکانیان، کە بوونە هۆی دروستکردنی هاندان لە کشتوکاڵ و دواتریش لە پیشەسازی دا، دوابەدوای شورشە سیاسییەکە هات. ئەوە سیاسەت بوو بوە هۆی گۆڕینی کۆمیۆنیزم بەرەو هاندانەکانی بازاڕ لە چین دا، نەك ئامۆژگاری باشتر یان تێگەیشتنی زیاتر دەربارەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئابووری.

ئێمە پێمانوایە بۆ ئەوەی لە نایەکسانی لە جیهان دا تێبگەین، پێویستە تێبگەین بۆچی هەندێك کۆمەڵگا بە شێوەیەکی زۆر ناچوست و نەخوازرا و ڕێکدەخرێن. نەتەوان هەندێجار دەتوانن دەزگای چوست دابمەزرێنن و خۆشگوزەرانی بەدەستبهێنن، بەڵام بەداخەوە، ئەمانە حاڵەتی دەگمەنن. زۆربەی ئابووریناسان و دانەرانی پۆلیسی بایەخ بە " دروست ئەنجامیبدە" دەدەن، لە کاتێك دا ئەوەی پێویستە بریتییە لە شرۆڤەکردنی ئەوەی بۆچی نەتەوانی هەژار "نادروست ئەنجامیدەدەن". ئەنجامدان بە شێوەیەکی هەڵە بە زۆری لەبەر نەشارەزایی و کەلتوور نییە. هەروەك پیشانیدەدەین، وڵاتانی هەژارن چونکە ئەوانەی خاوەن دەسەڵاتن ڕێگای ئەوتۆ هەڵدەبژێرن کە دەبنە هۆی دروستکردنی هەژاری. خراپ ئەنجامیدەدەن نەك لەبەر هەڵە یان نەشارەزایی بەڵکو بە ئەنقەست. بۆ تێگەیشتنی ئەمە، پێویستە لە پشت ئابووری و ئامۆژگاری شارەزایان دەربارەی ئەنجامدانی باشترین شت بگەڕێیت و لەوە بکۆڵیتەوە کە بڕیارەکان چۆن دروستدەکرێن، کێ ئەم بڕیارانە دروستدەکا و بۆچی ئەو خەڵکە بڕیار لەسەر ئەنجامدانی ئەو شتانە دەدەن کە ئەنجامیاندەدەن. ئەمە

لیکۆڵینەوەی سیاسەت و پرۆسە سیاسییەکانە. بە شێوەیەکی تەقلیدی ئابووری سیاسەتی پشتگوێخستوە، بەڵام تێگەیشتنی سیاسەت گرنگە بۆ شرۆڤەکردنی نایەکسانی لە جیهان دا. هەروەك ئابووریناس ئەبا لێرنەر لە ساڵی ١٩٧٠دا سەرنجی دا (ئابووری ناونیشانی شازنی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی بەدەستهێناوە لە رێگەی هەڵبژاردنی کێشە چارەسەرکراوە سیاسییەکان وەك مەیدانی کارکردنی)

ئێمە پێمانوایە کە بەدەستهێنانی خۆشگوزەرانی بەندە بە چارەسەرکردنی هەندێك کێشەی سیاسی بنەڕەتییەوە. ئەمەش بە تەواوی لەبەر ئەوەیە کە ئابووری ئەو گریمانەیەی کردوە کە کێشە سیاسییەکان چارەسەردەکرێن و بۆخۆشی نەیتوانیوە شرۆڤەیەکی گونجاو بۆ نایەکسانی لە جیهان دا بخاتەڕوو. شرۆڤەکردنی نایەکسانی لە جیهان دا هێشتا پێویستی بە ئابووری هەیە بۆ تێگەیشتنی ئەوەی کە چۆن جۆرە جیاوازەکانی پۆلیسی و رێکخستنە کۆمەڵایەتییەکان کاردەکەنە سەر هاندانی ئابووری و ڕەفتارەکان. بەڵام شرۆڤەکردنەکە پێویستی بە سیاسەتیشە.

**٣**

# دروستکردنی خۆشگوزەرانی و هەژاری ئابوورییەکانی هێڵی پانی ٣٨

لـە هـاوینی ١٩٤٥ دا، لـە کاتێـك دا دوەم جـەنگی جیهـانی بـەرەو کۆتـایی دەچوو، کۆلۆنییەکەی یابان لە کۆریا بەرەو ڕمان ڕۆیشت. لە ماوەی یەك مانگی دوای خۆبەدەستەوەدانە بێمەرجەکەی یابان لە ١٥ ئاب دا، کۆریا لەسـەر هێڵـی پانی ٣٨ بەسەر دوو بازنەی دەسەڵات دا دابەشکرا. باشوور لـە لایـەن ویلایەتـە یەکگرتوەکانــەوە بــەڕێوەبرا و بــاکووریش لـــە لایـــەن ڕوســیاوە. ئاشــتییە ناسـەقامگیرەکەی جـەنگی سـارد لـە حـوزەیرانی ١٩٥٠ دا کۆتاییهـات، کاتێـك سوپای باکووری کۆریا باشـووری داگیرکـرد. هەرچـەندە لـە سـەرەتادا سـوپای باکووری کۆریا، زۆر هاتە ناوەوە و سیۆڵی پایتەختی داگیرکرد، بەڵام بە هـاتنی پایز لە پاشەکشەی تەواودا بوون. ئەو کاتە بوو کە هوانگ پیۆنگ ۆن و براکـەی لە یەکتر جیابوونـەوە. هـوانگ پیـۆنگ ۆن تـوانی خـۆی بـشارێتەوە و خـۆی لـە ڕاپێچکردنی بۆ ناو سوپای باکووری کۆریا قوتار بکا. ئەو لـە باشـوور مایـەوە و وەك فارمەسیـستێك کـاریکرد. براکـەی کـە دکتـۆر بـوو لـە سـیۆڵ خــەریکی تیمارکردنی بریندارەکانی سوپای باشـووری کۆریـا بـوو، لـە کـاتی پاشەکـشەی سوپای باکووری کۆریا بەرەو باکوور برا. لە ساڵی ١٩٥٠ دا لە یەکتر جیاکرانەوە و لە ساڵی ٢٠٠٠ دا جارێکیتر بۆ یەکەمجار لە مـاوەی پـەنجا سـاڵ دا لـە سـیۆڵ یەکتریان بینییەوە دوای ئەوەی کە هەردوو حکومەتەکە بڕیاریان دا دەسـت بـە جێبەجێکردنی پرۆگرامێکی سنووورداری یەکگرتنەوەی خێزانی بکەن.

براکـەی هـوانگ یـۆنگ ۆن لـە هێـزی ئاسمـانی دا وەك دکتـۆر دەسـتی بەکارکردن کرد، ئەمەش کـارێکی بـاش بـوو لـە دیکتاتۆریـەتێکی سـەربازی دا. بەڵام تەنانەت ئەوانەی کە خاوەن ئیمتیازیشن لە بـاکووری کۆریـا گوزرەرانیـان باش نییە. کاتێك دوو براکە لە چوارچێوەی بەرنامەی یەکگرتنەوەی خێزانـی دا بە یەك گەیشتنەوە، هوانگ یـۆنگ ۆن دەربـارەی بـارودۆخی ژیـان لـە بـاکووری هێڵـی پـانی ٣٨ پرسـیاریکرد. ئـەو بۆخـۆی ئۆتـۆمبێلی هـەبوو، بـەڵام براکـەی

خاوەنی ئۆتۆمبێل نەبوو. لە براکەی پرسی (ئایا تەلەفۆنت هەیە؟). لە وەڵامدا براکەی ووتی (نەخێر، بەڵام کچەکەم کە لە وەزارەتی دەرەوە کاردەکا تەلەفۆنی هەیە، بەڵام ئەگەر کۆدەکەی نەزانی ناتوانی بەکاریبهێنی). هوانگ پیۆنگ باسیدەکرد کە چۆن هەموو ئەوانەی لە باکوورەوە هاتبون داوای پارەیان دەکرد و ئەویش هەندێك پارەی دا بە براکەی، بەڵام براکەی پێی ووت (ئەگەر بەم پارەیەوە بگەڕێمەوە ئەوا حکومەت پێم دەڵێ، ئەو پارەیە بدە بە ئێمە، بۆیە نامەوێ). هوانگ پیۆنگ ۆن سەرنجی دایە پاڵتۆی براکەی کە پینەی پێوە بوو، ئەو پێی ووت : (ئەو پاڵتۆیە داکەنە و فڕێیدە، کاتێك دەگەڕێیتەوە ئەم پاڵتۆیەی من لەبەر کە)، براکەی وەڵامی دایەوە : ( ناتوانم ئەوە بکەم و ئەم پاڵتۆیەم لە کاتی هاتنم بۆ ئێرە لە حکومەت قەرز کردوە). هوان پیۆنگ ۆن لە بیریەتی کە لە کاتی جیابوونەوەیان دا براکەی چەندە نیگەران و نائارام بوو هەروەك ئەوەی یەکێك گوێ لە قسەکان بگرێ. ئەو لەوە هەژارتر بوو کە هوانگ یۆنك ۆن بە خەیاڵیدا دەهات. براکەی پێی ووت کە ئەو ژیانی باشە، بەڵام هوانگ پیۆنگ ۆن پێیوابوو کە ئەو پەرێشان و وەك دەرزی باریك بوو.

ئاستی گوزەرانی دانیشتوانی باشووری کۆریا هاوشێوەی ئاستی گوزەرانی پورتوگال و ئیسپانیایە. لە باکوور، ئەوەی پێیدەوترێ کۆماری دیموکراسی جەماوەریی کۆریا، یان باکووری کۆریا، ئاستی گوزەران هاوشێوەی وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا یە کە دەکاتە یەك لەسەر پێنجی ئاستی ژیانی دانیشتوانی باشووری کۆریا. باری تەندروستی دانیشتوانی باکووری کۆریا تەنانەت لە بارێکی خراپتریشدایە. کەسێکی مامناوەندی باکووری کۆریا چاوەڕێدەکا کە دە ساڵ کەمتر لە ئامۆزاکانی لە باشووری هێڵی پانی ٣٨ بژی. نەخشەی (٧) بە شێوەیەکی دراماتیکی بۆشاییە ئابوورییەکەی نێوان هەردوو کۆریا ڕووندەکاتەوە. نەخشەکە داتا دەربارەی چڕی ڕووناکی لە شەودا پیشاندەدا کە لە وێنەکانی سەتەلایتەوە وەرگیراوە. باکووری کۆریا نزیکەی بەتەواوی تاریکە لەبەر نەبوونی کارەبا و باشووری کۆریاش لە ڕووناکی دا دەدرەوشێتەوە.

**نەخشەی (٧): ڕووناکی لە باشووری کۆریا و تاریکی لە باکوور**




ئەم جیاوازییە زەقانە کۆن نین. لە راستیدا بەر لە دووەم جەنگی جیهانی لە ئارادا نەبوون. بەڵام دوای ١٩٤٥، حکومەتە جیاوازەکانی باکوور و باشوور رێگای زۆر جیاوازی بەڕێوەبردنی ئابوورییەکانیان گرتەبەر. باشووری کۆریا لە لایەن سینگمان ڕیی سەرۆکایەتی کرا کە دەرچووی هارفەرد و پرینستۆن و دوژمنێکی سەرسەختی کۆمۆنیست بوو، دەزگا سیاسی وئابوورییە سەرەتاییەکانی، بە پاڵپشتی گەورەی ویلایەتە یەکگرتوەکان، لە لایەن ئەوەوە

پێکهێنران. ڕیی لە ساڵی ١٩٤٨ دا بە سەرۆکی کۆریا هەڵبژێررا. باشووری کۆریا کە لە گەرمەی جەنگی کۆریا و لە بەردەم هەڕەشەی تەشەنەکردنی کۆمیۆنیزم بەرەو باشووری هێڵی ٣٨ سەریهەڵدا، وڵاتێکی دیموکراسی نەبوو. هەردووکیان. ڕیی و جێگرەوە هەمانشێوە بەناوبانگەکەی، جەنەراڵ پارک چۆنگ هی، وەك دوو سەرۆکی ئەسۆریتاریان لە مێژوودا جێگەی خۆیانکردەوە. بەڵام هەردووکیان ئابوورییەکی بازاڕی وایان بەڕێوەبرد کە تیایدا موڵکداری تایبەت پەسەندکرا و دوای ١٩٦١ یش پارك بە هەموو کێشی دەوڵەتەوە کەوتە ئەنجامدانی گەشەکردنی ئابووری خێرا و دابینکردنی پارە و پشتگیریی بۆ ئەو کۆمپانیایانەی سەرکەوتوو بوون.

بارودۆخەکەی باکووری هێڵی ٣٨ جیاواز بوو. کیم ئیل سۆنگ کە لە میانەی دوەم جەنگی جیهانیدا سەرکردەی پارتیزانە کۆمیۆنیستەکانی دژی یابان بوو، لە ساڵی ١٩٤٧ دا وەك دیکتاتۆر خۆی سەپاند و بە هاوکاری یەکێتی سۆڤیەت شێوازێکی ڕەقی ئابووری پلان مەرکەزی وەك بەشێك لەوەی پێیدەوترا سیستەمی جوچێ هێنایەئاراوە. موڵکداری تایبەت نایاسایی کرا و ئابووری بازاڕ قەدەخەکرا. ئازادییەکان سەرکوتکران نەك تەنیا لە بازاڕدا بەڵکو لە هەموو بوارەکانی ژیانی دانیشتوانی باکووری کۆریا ـ جگە لەوانەی کە بەشێك بوون لە نوخبە کەمە فەرمانڕەواکەی دەوری کیم ئیل سۆنگ و دواتریش، کوڕ و جێگرەوەی، کیم یۆنگ ئیل.

دەبێ جێگەی سەرسوڕمان نەبێ کە ئابووری باشوور و باکوور بەخێرایی لێکدوورکەوتنەوە. ئابووری لەسەرەوە داریکراوی کیم ئیل سۆنگ و سیستەمەکەی جوچێ هەر زوو نابووتی خۆیان سەلماند. ئاماری وورد لە باکووری کۆریا لە بەردەستدا نییە لەبەر ئەوەی لایەنی کەم دەوڵەتێکی نهێنیپارێزە. لەگەڵ ئەمەش دا، ئەو بەڵگانەی لەبەردەستدان زانیارییەکانی ئێمە دەربارەی ئەو گرانییانەی زوو زوو ڕوودەدەن، پشتڕاستدەکەنەوە: نەك تەنیا بەرهەمی پیشەسازی لە دەسپێکردن شکستیهێنا، بەڵکو باکووری کۆریا لە ڕووی بەرهەمداریی کشتوکاڵیشەوە شکستیهێنا. نەبوونی موڵکداری تایبەت مانای ئەوە بوو کە خەڵکێکی کەم هاندانی هەبوو بۆ ئەوەی وەبەرهێنان بکا یان تەقەلای زیاتر بدا بۆ زیادکردن یان تەنانەت هێشتنەوەی ئاستی بەرهەمداریی. ڕژێمە زاڵم و چەوسێنەرەکە نامۆ بوو بە نوێکاری و بەکارهێنانی تەکنەلۆجیای

نویێ، بەڵام کیم ئیلێ سۆنگ و کیم یۆنگ ئیلێ و دەستوپێوەندەکانیان نیازیان نەبوو چاکسازی لە سیستەمەکەدا بکەن یان موڵکداری تایبەت و بازاڕ و گرێبەستی تایبەت بهێننەئاراوە یان دەزگا سیاسی و ئابوورییەکان بگۆڕن. باکووری کۆریا بەردەوامە لە چەقبەستنی ئابووری دا.

لە هەمانکات دا، لە باشوور دەزگا ئابوورییەکان هانی وەبەرهێنان و بازرگانییاندا. سیاسییەکانی باشووری کۆریا وەبەرهێنانیان لە پەروەردە دا کرد و ڕێژەی بەرزیان لە خوێندەواری و چوونە قوتابخانە بەدەستهێنا. کۆمپانیاکانی باشووری کۆریا خێرا بوون لە سوودوەرگرتن لەو دانیشتوانە خوێندەوارە و پۆلیسیەکانی کە هانی وەبەرهێنان و بەپیشەسازیکردن و هەناردەکردن و گواستنەوەی تەکنەلۆجییان دەدا. باشووری کۆریا خێرا بوە یەکێك لە "موعجیزە ئابوورییەکانی"ی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و یەکێك لەو نەتەوانەی دنیا کە خێراترین گەشەکردنیان ئەنجامدا.

لە کۆتایی ١٩٩٠ەکان داو تەنیا لە نزیکەی نیو سەدەدا، گەشەکردنی باشووری کۆریا و چەقبەستنی باکووری کۆریا بوونە هۆی دروستبوونی بۆشاییەکی دە هێندەیی لە نێوان دوو نیوەی هەمان وڵات دا ـ بیر بکەرەوە کە چەند سەدەیەك چ جیاوازییەك دروستدەکا. کارەساتە ئابوورییەکەی باکووری کۆریا، کە بوە هۆی برسێتی ملیۆنان کەس، کاتێك لەگەڵ سەرکەوتنە ئابوورییەکەی باشووری کۆریا بەراوورد دەکرێ، یەکجار سەرسوڕهێنەرە: نە کەلتوور و نە جوگرافیا ونە نەشارەزایی دەتوانن شرۆڤەی ڕێچکەی لە یەکتردوورکەوتووی باکوور و باشووری کۆریا بکەن. پێویستە بۆ پەیداکردنی وەڵام سەیری دەزگاکان بکەین.

## دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر ( Extractive ) و گراوە ( Inclusive )

وڵاتان لە سەرکەوتنە ئابوورییەکانیان دا جیاوازن لەبەر جیاوازی لە دەزگاکانیان و ئەو یاسایانەی کاریگەرن لەسەر چۆنیەتی کارکردنی ئابووری و ئەو هاندانانەی کە هانی خەڵك دەدەن. بیر لە گەنجەکانی باکوور و باشووری کۆریا بکەرەوە و ئەوان چ جۆرە چاوەڕوانییەکیان لە ژیان هەیە. ئەوانەی

باکوور لە هەژاری دا گەورە دەبن، بەبێ هیچ دەسپێشخەریەکی کارزانی (Entrepreneurial) و داهێنەرانە یان پەروەردەی تەواو تا بۆ کاری بەهرەخواز ئامادەیان بکەن. بەشی زۆری ئەو پەروەردەیەی لە قوتابخانە وەریدەگرن تەنیا پڕوپاگەندەی ڕووتە، بەمەبەستی ڕەونەقکردنی ڕەوایی ڕژێم و کتێبی کەمیان هەیە و باسی کۆمپیوتەر هەر مەکە. دوای تەواوکردنی قوتابخانە، هەموویان دەبێ بۆ ماوەی دە ساڵ لە سوپادا خزمەتبکەن. ئەم گەنجانە دەزانن ناتوانن ببنە خاوەنی موڵك و بزنس دابمەزرێنن و دەوڵەمەند تر بن، تەنانەت ئەگەر خەڵکانێکی زۆریش بە شێوەیەکی نایاسایی خەریکی چالاکی ئابووری تایبەت بن لە پێناوی گوزەرانی خۆیان دا. ئەوان، هەروەها دەزانن ناتوانن بە شێوەیەکی یاسایی دەستیان بگاتە بازاڕ تا بەهرەکانیان یان داهاتەکانیان بەکاربهێنن بۆ کڕینی ئەو کەلوپەلانەی پێویستیان پێیانە و حەزیان لێدەکەن. ئەوان تەنانەت دڵنیا نین لەوەی چ جۆرە مافێکی مرۆیی یان دەبێ.

ئەوانەی لە باشوورن دەبنە خاوەنی پەروەردەی باش و خۆیان لەبەردەم هاندانی وا دەبیننەوە کە پاڵیان پێوەدەنێ بۆ زیاتر تەقەلادان و سەرکەوتن لەو پیشانەی هەڵیاندەبژێرن. باشووری کۆریا خاوەنی ئابووری بازاڕە و لەسەر بنەمای موڵکداری تایبەت دامەزراوە. گەنجانی باشووری کۆریا ئەوە دەزانن کە ئەگەر وەك کارزان یان کارمەند سەرکەوتوو بن، ئەوا دەتوانن ڕۆژێك لەبەرهەمی وەبەرهێنان و هەوڵەکانیان بخۆن و ئاستی گوزەرانیان بەرز بکەنەوە و ئوتۆمبێل و خانوو و چاودێری تەندروستی بکڕن.

لە باشوور دەوڵەت یارمەتی چالاکییە ئابوورییەکان دەدا. بۆیە دەکرێ کارزانان پارە لە بانك و بازاڕە داراییەکان قەرز بکەن و دەکرێ کۆمپانیا بیانییەکان لەگەڵ کۆمپانیاکانی باشووری کۆریا هاوبەشی بکەن و دەکرێ تاکەکان قەرزی خانووبەرە وەربگرن بۆ کڕینی خانوو. لە باشوور کەموزۆر ئازادیت دەست بەو بزنسە بکەی ئارەزوی دەکەی. لە باکوور ئازاد نیت. لە باشوور دەتوانی کارمەندان بەکرێبگری و بەرهەم و خزمەتگوزاریەکانت بفرۆشی و پارەکەت لە بازاڕدا بەو شێوەیەی حەزدەکەی خەرجبکەیت. لە باکوور تەنیا بازاڕی ڕەش هەیە. ئەم یاسا جیاوازانە بریتین لەو دەزگا جیاوازانەی کە خەڵکی باکوور و باشوور لە سایەیان دا دەژین.

دەزگا ئابوورییە کراوەکان، وێنەی ئەوانەی لە باشووری کۆریا یان ئەوانەی لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا هەن ئەوانەن کە بوار ڕەخسێن و پاڵنەری بەشداریکردنی جەماوەری خەڵکن لە چالاکییە ئابوورییەکان دا و بەهرە و تواناکانیان بە باشترین شێوە بەکاردەهێنن و وا لە تاکەکان دەکەن ئەو بژاردانە هەڵبژێرن کە ئارەزوویان دەکەن. بۆ ئەوەی کراوە بن، پێویستە دەزگا ئابوورییەکان دابینکاری موڵکداری تایبەتی جێگیر و سیستەمی یاسایی بێلایەن و خزمەتگوزاریە گشتییەکان بن کە زەمینەیەکی تەختی گەمە برەخسێنی تا تیایدا خەڵك بتوانێ گۆڕینەوە و گرێبەست ئەنجامبدا و هەروەها پێویستە بواری هاتنە ناوەوەی بزنسی نوێ برەخسێنی و دەرفەتی خەڵك بدا تا پیشەکانیان هەڵبژێرن.

جیاوازییەکانی نێوان باشوور و باکووری کۆریا و ئەوانەی نێوان ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئەمەریکای لاتین. پرینسیپێکی گشتی ڕووندەکەنەوە. دەزگا ئابوورییە کراوەکان برەو بە چالاکی ئابووری و گەشەکردنی بەرهەمداریی و خۆشگوزەرانی ئابووری دەدەن. مافی موڵکداری جێگیر شتێکی ناوەندیە چونکە تەنیا ئەوانەی خاوەنی ئەم مافەن ئامادەن وەبەرهێنان بکەن و بەرهەمداری زیاد بکەن. کاتێك بزنسمانێك چاوەڕێدەکا کە دەسکەوتەکەی بدزرێ یان زەوت بکرێ یان هەمووی لە ڕێگەی باجەوە لووشبدرێ، ئەوا نەك تەنیا هاندەرێکی ئەوتۆی نامێنێ هەوڵی وەبەرهێنان و نوێکاری بدا، بەڵکو هاندەری کارکردنیشی نامێنێ. ئەم مافە پێویستە بۆ زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی کۆمەڵگا دەستەبەربکرێ.

لە ساڵی ١٦٨٠ دا حکومەتی ئینگلیزی سەرژمێرییەکی ئەنجامدا بۆ دانیشتوانی باربەیدۆز کە کۆلۆنییەکی ئینگلتەرە بوو لە هیندی ڕۆژئاوا. سەرژمێرییەکە دەریخست کە لەو ٦٠,٠٠٠ کەسەی دانیشتوانی ئەو دوورگەیەیان پێکدەهێنا، نزیکەی ٣٩,٠٠٠ کەسیان کۆیلەی ئەفریقی بوون و موڵکی یەك لەسەر سێکەی تری دانیشتوان بوون. لە ڕاستیدا زۆربەی ئەوانە موڵکی گەورەترین ١٧٥ بەرهەمهێنەری شەکر بوون، کە لە هەمانکات دا خاوەنی زۆربەی زەوییەکان بوون. ئەم خاوەن چاندنگە گەورانە مافی مۆڵکداری جێگیر و باش جێبەجێکراویان هەبوو بەسەر زەوییەکانیان و تەنانەت کۆیلەکانیشیان دا. ئەگەر بەرهەمهێنێکی شەکر بیویستایە کۆیلەیەك بە بەرهەمهێنێکی تر

بفرۆشێ، ئەوا دەیتوانی ئەم کارە بکا و چاوەڕێشیدەکرد کە دادگا ئەم فرۆشتنە یان هەر گرێبەستێکی تر ئەو دەینووسێ بسەپێنێ، بۆچی؟ لەو چل دادوەر و پارێزەری ئاشتیانەی لە ناو دوورگەکەدا هەبوون، بیست و نۆیان بەرهەمهێنی گەورە بوون. لە هەمانکات دا، هەشت کاربەدەستە سەربازییە هەرە باڵاکان هەموویان بەرهەمهێنی گەورەی شەکر بوون. سەرەڕای بوونی مافی موڵکداری و گرێبەستی باش دیاریکراو و جێگیر و وەگەڕخراو بۆ نوخبەکانی دوورگەکە، باریەیدۆز دەزگای ئابووری کراوەی نەبوو، چونکە دوو لەسەر سێی دانیشتوانەکەی کۆیلە بوون و بواری سوودوەرگرتن لە پەروەردە و دەرفەتە ئابوورییەکانیان بۆ نەڕەخسابوو، تواناو هاندەریان نەبوو بۆ سوود وەرگرتن لە بەهرەو کارامەییان. دەزگایانی ئابووری کراوە پێویستیان بە مافی موڵکداری جێگیر و دەرفەتی ئابووری هەیە، نەك تەنیا بۆ نوخبە بەڵکو بۆ بەشێکی فراوانی کۆمەڵگا.

مافی موڵکداری جێگیر و یاسا و خزمەتگوزارییە گشتییەکان و ئازادی ئەنجامدانی گرێبەست و گۆڕینەوە، هەموویان پشت بە دەوڵەت دەبەستن، ئەو دەزگایەی توانای بەزۆر سەپاندنی ئاسایش و نەهێشتنی دزی و ساختەکردن و خستنەگەڕی گرێبەستەکانی نێوان لایەنە تایبەتەکانی هەیە. بۆ ئەوەی بە باشی کارەکانی ئەنجامبدا، کۆمەڵگا پێویستی بە خزمەتگوزارییە گشتییەکانی تر هەیە: تۆڕەکانی ڕێگا و گواستنەوە بۆ ئەوەی بتوانرێ کەلوپەلەکان بگوێزرێنەوە و ژێرخانی گشتی بۆ ئەوەی چالاکیە ئابوورییەکان برەوبسێنن و هەندێك ڕێسای بنەڕەتی بۆ ڕێگەگرتن لە ساختەکاری و خراپەکاری بگرن. هەرچەندە چەندین خزمەتگوزاری گشتی لەمانە دەکرێ لە لایەن بازاڕ و هاوڵاتییانەوە دابینبکرێن، بەڵام ئەندازەی هەماهەنگی ئەنجامدانی ئەم کارانە، زۆرجار، بە برێکی زۆر، تەنیا بە دەسەڵاتێکی ناوەندی دەکرێ. لەبەر ئەوە دەوڵەت بە ناچاری تێهەڵکێشی دەزگا ئابوورییەکان دەبێ وەك سەپێنەری یاساو ئاسایش و موڵکداری تایبەت و گرێبەستەکان و زۆرجاریش وەك دابینکاری سەرەکی خزمەتگوزارییە گشتییەکان. دەزگا کراوەکان پێویستیان بە دەوڵەت هەیە و سوودی لێوەردەگرن.

دەزگا ئابوورییەکانی باکووری کۆریا یان ئەوانەی ئەمەریکای لاتینی سەردەمی کۆلۆنیالی ـ میتا و ئینکۆمایندا و ڕیپارتۆمینتۆ کە پێشتر باسکران ـ

ئەم سیمایانەیان نەبوو. موڵكداری تایبەت لە باكووری كۆریا بوونی نییە. لە ئەمەریكای لاتینی سەردەمی كۆلۆنیالی دا موڵكداری تایبەتی بۆ ئیسپانییەكان هەبوو، بەڵام موڵكی خەڵكە خۆماڵیەكە زۆر ناجێگیر بوو. لە هیچ یەكێك لەم كۆمەڵگایانەدا زۆربەی هەرە زۆری خەڵك نەیاندەتوانی ئەو بڕیارە ئابوورییانە بدەن كە دەیانویستن، ئەوان خرابوونە ژێر كاری زۆرەملێیی بە كۆمەڵەوە. لە هیچ یەكێك لەم دوو جۆرە كۆمەڵگایەدا دەسەڵاتی دەوڵەت بۆ دابینكردنی خزمەتگوزاری گشتی بۆ هێنانەدی خۆشگوزەرانی بەكارنەهێنرا. لە باكووری كۆریا، دەوڵەت سیستەمێكی پەروەردەی ئەوتۆی دامەزراند تا پەروەردەی پڕوپاگەندە فێربكا، بەڵام نەیتوانی ڕێگری لە برسێتی بكا. لە ئەمەریكای لاتینی كۆلۆنیالی دا، دەوڵەت جەختی لەسەر ناچاركردنی خەڵكە ڕەسەنەكە دەكرد. لە هیچ یەكێك لەو دوو جۆرە كۆمەڵگایەدا مەیدانی تەختی گەمەكردن یان سیستەمی یاسایی بێلایەن بونی نەبوو. لە باكووری كۆریا سیستەمی دادوەری باڵێكی حیزبی كۆمیۆنستی فەرمانڕەوایە و لە ئەمەریكای لاتین دا بریتیبوو لە ئامرازێكی جیاكاری دژی جەماوەر. ئێمە بەم جۆرە دەزگایانە، كە سیمای دژ بەیەكیان لەگەڵ ئەو دەزگایانەدا هەیە كە ئێمە پێیان دەڵێین كراوە، دەڵێین دەزگای ئابووری چەوسێنەر، لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە دەزگایانە وا دیزاین كراون تا داهات و سامانی بەشێكی كۆمەڵگا بەرن بۆ سوودی بەشێكی تر.

## بزوێنەرانی دەوڵەمەندی

دەزگایانی ئابووری كراوە بازاڕی كراوە دروستدەكەن، كە نەك تەنیا ئازادی دەدەنە خەڵك تا لە ژیانی خۆیان دا ئەو كارانە هەڵبژێرن كە هاوتای بەهرەكانیانە، بەڵكو لە هەمانكات دا مەیدانێكی تەختی گەمەش دەڕەخسێنن كە دەرفەتی ئەنجامدانی ئەو هەڵبژاردنانەیان دەخاتەبەردەم. ئەوانەی خاوەن ئایدیای باشن دەتوانن دەستبكەن بە دامەزراندنی بزنس، كارمەندان هەوڵدەدەن ئەو چالاكیانە ئەنجامبدەن كە بەرهەمدارییان زیاترە و كۆمپانیا كەم چوستەكان لە لایەن كۆمپانیا چوست ترەكانەوە جێگەیان دەگیرێتەوە. بەراووردی ئەوە بكە چۆن خەڵك لە بازاڕە كراوەكان دا كارەكانیان هەڵدەبژێرن لەگەڵ پیرۆ و بۆلیڤیای سەردەمی كۆلۆنیالی دا، كاتێك خەڵكێكی زۆر، لە ژێر

میتا دا، ناچار کران تا لە کانەکانی زیو و جیوەدا کار بکەن بەبێ گوێدانە بەهرەکانیان یان بێ گوێدانە ئەوەی ئەوان دەیانویست ئەو کارانە بکەن یان نا. بازاڕە کراوەکان تەنیا بازاڕی ئازاد نین. باربەیدۆزیش لە سەدەی حەڤدەیەم دا خاوەن بازاڕ بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کە مافی موڵکداری تەنیا بۆ بەرهەمهێنەکانی شەکر بوو لەبری ئەوەی بۆ هەموان هەبێ، بازارەکانی زۆر دووربوون لە بازاڕی کراوە. لە راستیدا، سەوداکردن بە کۆیلەوە بەشێك بوو لە دەزگا ئابوورییەکان کە بە شێوەیەکی سیستەماتیك زۆربەی خەڵکی ناچاری کارکردن دەکرد و توانای هەڵبژاردنی پیشەکانیان و چۆنیەتی بەکارهێنانی بەهرەکانیانی لێزەوت دەکردن.

لە هەمانکات دا، دەزگا ئابوورییە کراوەکان ڕێگا بۆ دوو بزوێنەری تری خۆشگوزەرانی خۆش دەکەن: تەکنەلۆجی و پەروەردە. گەشەکردنی بەردەوامی ئابووری نزیکەی هەمیشە پێشکەوتنی تەکنەلۆجی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ کە ئەویش بەدەوری خۆی دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵك (کرێکاران) و زەوی و سەرمایە (تەلار و ئامێر و هتد) بەرهەمدارییان زیاتر بکەن. بیر لە باووباپیرانی مەزنمان بکەرەوە تەنیا سەدەیەك لەمەوبەر نەیاندەتوانی فرۆکە و ئۆتۆمبێل بەکاربهێنن یان زۆربەی ئەو دەرمان و خزمەتگوزارییە تەندروستییانەیان نەبوو کە ئەمڕۆ ئێمە بەرامبەریان بێمنەتین و باسی سیستەمی ئاوی ناو ماڵان و فێنکەرە و بازاڕە گەورەکان و ڕادیۆ و وێنە جوڵاوەکان تا دەگاتە زانیاری تەکنەلۆجی و ڕۆبۆت و یان ئەو ئامێرانەی بە کۆمپیوتەر کاردەکەن، هەر مەکە. ئەگەر چەند نەوەیەك بۆ دواتر بگەڕێینەوە ئەوا زانیاری تەکنەلۆجی و ئاستی ژیان دواکەوتوتر بوون بە ئەندازەیەك کە زەحمەتە بتوانین بیر لەوە بکەینەوە کە چۆن زۆربەی خەڵك لەو سەردەمانەدا توانیویانە ژیان بەسەربەرن. ئەم پێشکەوتنانە لە ڕێگای زانست و کارزانانی وەك تۆماس ئەدیسۆن هاتوونەئاراوە کە زانستیان بۆ دامەزراندنی بزنسە قازانج هێنەرەکانیان بەکارهێنا. پرۆسەی نوێکاری ڕوویدا لە ڕێگەی ئەو دەزگا ئابوورییانەی پشتگیری موڵکداری تایبەت بوون و ڕێزیان لە گرێبەستەکان دەگرت و مەیدانی تەختی گەمەیان دروستکرد و هان و بواری دامەزراندنی بزنسی نوێیان دەدا تا تەکنەلۆجیای نوێ بەکاربهێنن. لەبەر ئەوە دەبێ جێگەی سەر سوڕمان نەبێ کە ئەوە کۆمەڵگای ویلایەتە یەکگرتوەکان بوو نەك مەکسیك

یان پیرۆ کە تۆماس ئەدیسۆنی هێنایە بەرهەم و ئەوە باشووری کۆریایە نەك باکووری کۆریا کە ئەمڕۆ کۆمپانیای نوێکاری تەکنەلۆجی وەکو سامسۆنگ و هیۆندای بەرهەمدەهێنێ.

ئەوەی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە تەکنەلۆجییەوە هەیە بریتییە لە پەروەردە و بەهرە و توانا و شارەزایی هێزی کار کە لە قوتابخانە و ماڵ و شوێنی کارکردنەوە وەردەگیرێ. ئێمە بە بەراوورد لەگەڵ سەدەیەك لەمەوبەر ڕادەی بەرهەمداریمان زۆر زیاترە، نەك تەنیا لەبەر بوونی تەکنەلۆجی باشتر کە خۆی لە ئامێرەکان دا دەبینێتەوە، بەڵکو لەبەر بوونی ئەو شارەزاییە زیاترەی کارمەندان هەیانە. هەموو تەکنەلۆجی دنیا سوودێکی ئەوتۆیان نابێ بەبێ بوونی کارمەندی ئەوتۆ کە بتوانن بیانخەنەگەڕ. بەڵام بەهرە و تواناکان تەنیا بریتینین لە توانای خستنەگەڕی ئامێرەکان. ئەوە پەروەردە و توانای هێزی کارە کە شارەزایی زانستی دەهێنێتەئاراوە کە پێشکەوتنمان پشتیان پێدەبەستن و توانای گونجاندن و پەیڕەوکردنی ئەم تەکنەلۆجییانە دەرەخسێنن لە بوارە جیاوازەکانی بزنس دا. هەرچەندە لە چاپتەری یەکەم دا بینیمان کە چەندین نوێکاری شۆڕشی پیشەسازی و دواتری وەکو تۆماس ئەدیسۆن خاوەن پەروەردەی بەرز نەبوون، بەڵام ئەم تەکنەلۆجییانە زۆر ئاسانتر بوون لە تەکنەلۆجییە مۆدێرنەکان. ئەمڕۆ، ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە تەکنەلۆجیا دا پێویستی بەوە هەیە کە نوێکار و کارمەندیش خاوەن پەروەردە بن. ئا لێرەدا گرنگی دەزگا ئابوورییەکانمان بۆ دەردەکەوێ کە مەیدانی تەختی گەمە دەرەخسێنن. ویلایەتە یەکگرتوەکان توانی بۆخۆی یان بە ڕاکێشان لە وڵاتانی بیانییەوە، کەسانی وەك بیڵ گەیتس و ستیڤ جۆبس و سێرجی برین و لاری پەیج و جێف بیزۆس و سەدان زانای ئەوتۆ بەرهەمبهێنێ کە داهێنانی بنەڕەتییان لە زانیاری تەکنەلۆجی و هێزی ئەتۆمی و بایۆتێك و بوارەکانی تر دا ئەنجامداو کارزانەکان بزنسەکانیان لەسەر بنەمای ئەو داهێنانە دامەزراند. بەهرەکان هەبوون و پێویست بوو بخرێنەگەڕ چونکە زۆربەی گەنجانی ویلایەتە یەکگرتوەکان چەندە بیانەوێ یان بتوانن دەرفەتی خوێندن لەبەردەمیان دا کراوەیە. ئێستا بیر لە کۆمەڵگایەکی تر بکەرەوە، بۆنموونە، کۆنگۆ یان هایتی کە بەشێکی زۆری دانیشتوانەکانیان بواری ئەوەیان بۆ نەڕەخساوە بچنە قوتابخانە و ئەگەر توانیشیان بچنە قوتابخانە ئەوا کوالێتی وانە ووتنەوە لە

قوتابخانەکان دا جێگەی داخە و مامۆستاکان ئامادە نابن بۆ ووتنەوەی وانەکان و ئەگەریش ئامادەبن ئەوا ڕەنگە کێشەی نەبوونی کتێبیان هەبێ.

ئاست نزمی پەروەردەی وولاتانی هەژار بەهۆی دەزگا ئابوورییەکانەوە دروستدەبێ کە ناتوانن هانی دایکیوباوکان بدەن تا منداڵەکانیان بنێرنە قوتابخانە و بەهۆی دەزگا سیاسییەکانەوە دروستدەبێ کە ناتوانن حکومەت ناچار بکەن تا قوتابخانە دروستبکا و بودجەیان بۆ دابینبکا و پشتگیریی قوتابخانە و ویستی دایکیوباوکان و منداڵان بکا.

ئەو نرخەی ئەم نەتەوانە دەیدەن، بەرامبەر نزمی پەروەردەی دانیشتوانیان و نەبوونی بازاڕی کراوە، بەرزە. ئەم نەتەوانە ناتوانن بەهرەی دانیشتوانیان بخەنەگەڕ. ئەوان چەندین بیل گەیتس و ڕەنگە یەکێك یان دوو ئەلبێرت ئەنیشتاینی شاراوەیان هەبێ کە ئێستا وەك جووتیاری هەژار و نەخوێندەوار کاردەکەن و ناچارکراون ئەوەبکەن کە نایانەوێ بیکەن، یان ڕاکێشراونەتە ڕیزی سوپا، چونکە ئەوانە هەرگیز ئەو دەرفەتەیان بۆ نەڕەخسێنراوە لە ژیان دا پیشەکانیان هەڵبژێرن.

توانای دەزگا ئابوورییەکان بۆ ئەوەی توانا شاراوەکانی بازاڕە کراوەکان بخەنە گەڕ و هانی نوێکاری تەکنەلۆجی بدەن و وەبەرهێنان لە خەڵك دا بکەن و بەهرە و کارامەیی ژمارەیەکی زۆری تاکەکان بخەنەگەر، بۆ گەشەکردنی ئابووری گرنگە. شرۆڤەکردنی ئەوەی کە بۆچی ئەم هەموو دەزگا ئابوورییانە لە بەدیهێنانی ئەم ئامانجە ساکارانەدا شکستدەهێنن، بابەتی سەرەکی ئەم کتێبەیە.

## دەزگایانی سیاسی کراوە ( Inclusive ) و چەوسێنەر ( Extractive )

هەموو دەزگا ئابوورییەکان لە لایەن کۆمەڵگاوە دادەمەزرێن. ئەوانەی باکووری کۆریا، بۆ نموونە، لە لایەن کۆمیۆنیستەکانەوە کە لە ساڵی ١٩٤٠ەکان دا دەسەلاتیان گرتەدەست، بەسەر خەڵك دا سەپێنران، لە کاتێکدا ئەوانەی ئەمەریکای لاتین لە لایەن داگیرکارە ئیسپانییەکانەوە سەپێنران. باشووری کۆریا بوە خاوەنی دەزگایانی ئابووری زۆر جیاواز لەوانەی باکوور چونکە

خەڵکی جیاواز کە بەرژەوەندی و ئامانجی جیاوازیان هەبوو بڕیاریان دەربارەی چۆنیەتی ڕێکخستنی کۆمەڵگا، دا. بە واتایەکی تر باشووری کۆریا سیاسەتی جیاوازی هەبوو.

سیاسەت ئەو پرۆسەیەیە کە بەهۆیەوە کۆمەڵگا ئەو یاسایانە هەڵدەبژێرێ کە حوکمیدەکا. سیاسەت دەوری دەزگاکان دەدا لەبەر ئەو هۆیە ساکارەی کە لە کاتێك دا دەزگا کراوەکان ڕەنگە بۆ خۆشگوزەرانی نەتەوەیەك باش بن، هەندێك کەس یان گروپ، وەك نوخبەی ناو حیزبی کۆمیۆنیستی باکووری کۆریا یان بەرهەمهێنەرانی شەکر لە باربەیدۆزی سەردەمی کۆلۆنیالیدا، گوزەرانیان زۆر باشتر دەبێ ئەگەر ئەو جۆرە دەزگایانە دروستبکەن کە چەوسێنەرن. کاتێك ململانێ لەسەر دەزگاکان دروستدەبێ، ئەوەی ڕوودەدا دەوەستێتە سەر ئەوەی کێ لە گەمە سیاسییەکەدا دەیباتەوە ـ کێ دەتوانێ پشتگیری زیاتر بەدەستبهێنێ و سامانی زیاتر بەدەستبهێنێ و هاوپەیمانی کاریگەرتر دروستبکا. بە کورتی ئەوەی دەیباتەوە بەندە بە دابەشبوونی دەسەڵاتی سیاسی لەناو کۆمەڵگادا.

دەزگا سیاسییەکانی کۆمەڵگایەك بڕیاردەری سەرەکی ئەنجامەکانی ئەم گەمەیەن. ئەو دەزگایانەش بریتین لەو یاسایانەی بڕیار لەسەر هاندانەکان دەدەن لە سیاسەت دا. ئەو دەزگایانە ئەوە دیاریدەکەن کە حکومەت چۆن هەڵدەبژێررێ و کام بەشەی حکومەت مافی ئەوەی هەیە چی بکا. دەزگا سیاسییەکان ئەوە دیاریدەکەن کێ لە کۆمەڵگادا دەسەڵاتی هەیە و ئەو دەسەڵاتە بۆچ ئامانجێك بەکاردەهێنرێ. ئەگەر دابەشبوونی دەسەڵات تەسك و بێجڵەوگیری بوو، ئەوا دەزگا سیاسییەکان ڕەها دەبن، هەروەك نموونەی ئەو پاشایەتییە ڕەهایانەی لە جیهان دا لە زۆربەی قۆناخەکانی مێژوودا حوکمیان کردوە. لە سایەی دەزگا سیاسییە ڕەهاکان دا، هەروەك ئەوانەی باکووری کۆریا و ئەمەریکای لاتینی سەردەمی کۆلۆنیالی، ئەوانەی ئەم دەسەڵاتە دەگرنە دەست دەتوانن دەزگای ئابووری دابمەزرێنن بۆ دەوڵەمەندکردنی خۆیان و دەسەڵاتیان زیاتر بکەن لەسەر حسابی کۆمەڵگا. بە پێچەوانەوە، ئەو دەزگا سیاسییانەی کە دەسەڵات بە شێوەیەکی فراوان لە کۆمەڵگادا دابەشدەکەن و جڵەوگیری بۆ دادەنێن، دەزگای پلورەلیستین. لە بری ئەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە دەستی تەنیا کەسێك یان گروپێکی بچووك دا کۆبکرێتەوە، دەخرێتە ئەستۆی هاوپەیمانییەکی فراوان یان ژمارەیەك گروپەوە.

بێگومـان پەیوەندییـەکی نزیـك لـە نێـوان پلـورەلیزم و دەزگـای ئـابووری کراوەدا هەیە. بەڵام کلیلی تێگەیشتن لەوەی بۆچی باشووری کۆریـا و ویلایەتـە یەکگرتوەکان دەزگای ئابووری کراوەیان هەیە تەنیا بریتی نییە لە بوونی دەزگا سیاسییە پلورەلیستیەکانیان، بەڵکو لە هەمانکاتدا بریتییە لە بـوونی دەوڵـەتی بەهێز و خاوەن مەرکەزیـەت. نموونەیـەکی دیـار بریتییـە لـە نەتـەوەی سـومالی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا. هەروەك دواتر لە کتێبەکەدا دەبینین، دەسەڵاتی سیاسی لە سۆماڵ دا زۆر لە مێژە بە فراوانی دابەشبوە ـ تاڕادەیـەکی زۆر بـە شـێوەیەکی پلورەلیستی. لە راستیدا دەسەڵاتێکی ڕاستەقینە نییە کە کۆنترۆڵ یان ڕادە بـۆ کردەوەی کەسێك دابنێ. کۆمەڵگا بە قوڵی بەسەر تیرەی دژ بەیەکدا دابەشـبوە کە هیچ یەکێك لەمانە ناتوانێ بەسەر ئـەوی تـردا زاڵ بـێ. دەسـەڵاتی تیرەیـەك تـەنیا لـە ڕێگـەی تفەنگـەکانی تیرەیـەکی تـرەوە سـنووردار دەکـرێ. ئـەم دابەشـبوونەوەی دەسـەڵات نابێتـە هـۆی دروسـتبوونی دەزگـای کـراوە بـەڵکو دەبێتـە هـۆی دروسـتکردنی ئـاژاوە و ڕیـشەی ئـەم بارودۆخـەش ئەوەیـە کـە دەوڵەتی سۆماڵ هیچ جۆرە مەرکەزیەتێکی سیاسی یان مەرکەزیـەتی دەوڵـەتی نییە و لە توانایدا نییە تەنانەت کەمترین ئاستی یاسـا و ئاسـایش بسەپێنێ بـۆ پـشتگیری چـالاکی ئـابووری و بازرگـانی و تەنانـەت ئاسایـشی بنـەڕەتی هاوڵاتییانی.

مـاکس ویبـەر، کـە لـە چـاپتەری پێـشتر پێـی گەیـشتین، بـە ناوبـانگترین و پەسەندکراوترین پێناسەی بۆ دەوڵەت کردوە. دەوڵـەتی وا پێناسـە کـردوە کـە خاوەنی (مۆنۆپۆلی توندوتیـژیی ڕەوایـە) لـە نـاو کۆمـەڵگادا. بـەبێ بـوونی ئـەم مۆنۆپۆڵیـە و ئەندازەیـەك لـە مەرکەزیـەت، دەوڵـەت نـاتوانێ ڕۆڵـی خـۆی وەك سەپێنەری یاسا و ئاسایش ببینێ، چخاسمە دابینکردنی خزمەتگوزاری گشتی و هانـدان و ڕێکخستنی چـالاکی ئـابووری. کاتێـك دەوڵـەت لـە هێنانـەدی هـەموو شێوەیەك لە مەرکەزیەتی سیاسی شکستدەهێنێ، ئەوا کۆمەڵگا درەنگ یان زوو بەرەو ئاژاوە ملدەنێ، هەروەك لە سۆماڵ ڕوویدا.

ئێمە ئەو دەزگا سیاسییانەی کە ئەندازەیەکی تـەواو مەرکەزیـەتیان هەیـە و پلورەلیستین بە دەزگای سیاسی کراوە ناوزەد دەکەین. کاتێك یەکێك لـەم دوو مەرجـە شکستدەهێنن، ئـەوا ئـەو دەزگایانـە بـە دەزگـای سیاسـی چەوسـێنەر ناوزەد دەکەین.

تێهەڵکێشیەکی بـەهێز لـە نێـوان دەزگایـانی سیاسـی و ئـابووری دا هەیـە.

دەزگای سیاسی چەوسێنەر دەسەڵات لە دەستی نوخبەیەکی بچووك دا چڕ دەکاتەوە و جڵەوگیری کەم لەسەر پیادەکردنی ئەم دەسەڵاتە دادەنێ. دەزگا ئابوورییەکان زۆرجار لە لایەن ئەم نوخبەیەوە پێکدەهێنرێن بۆ ئەوەی سامان لە باقی کۆمەڵگا بکێشنەوە. لەبەر ئەوە بەشێوەیەکی سروشتی دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر هاوشانی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەرن. لە راستیدا پێویستە دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکان بۆ مانەوەیان پشت بە دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەکان ببەستن. دەزگای سیاسی کراوە کە دەسەڵات بە شێوەیەکی فراوان دابەشدەکا، دەبەوێ ئەو دەزگا ئابوورییانە ریشەکێش بکا کە سامانی زۆرینە زەوتدەکەن و کۆسپ لەبەردەم بەشداریکردن دادەنێن و چالاکی بازاڕەکان کۆنترۆڵدەکەن بۆ ئەوەی تەنیا ژمارەیەکی کەم قازانجبکەن.

بۆ نموونە، لە باربەیدۆز سیستەمی چاندن کە لەسەر بنەمای چەوساندنەوەی کۆیلان دامەزرابوو، نەیدەتوانی بەبێ دەزگا سیاسییەکان بەردەوامبێ کە کۆیلانی سەرکوتدەکرد و لە پرۆسە سیاسییەکە دووریدەخستنەوە. سیستەمی ئابووری کە ملیۆنان کەس بۆ سوودی نوخبەیەکی کەمی کۆمیۆنیست لە باکووری کۆریا دەڕوتێنێتەوە، دیسانەوە بەبێ کۆنترۆڵی تەواوی سیاسی حیزبی کۆمیۆنیست بوونی مەحاڵە.

ئەم پەیوەندییە تێهەڵکێشەی نێوان دەزگایانی ئابووری و سیاسی چەوسێنەر بازنەیەکی فیدباکی بەهێز دەهێنێتەئاراوە: دەزگا سیاسییەکان توانا دەدەنە ئەو نوخبانەی کۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسی دەکەن، تا دەزگایانی ئابووری وا هەڵبژێرن کە جڵەوگیری یان هێزی بەرەنگاربوونەوەی کەمیان هەبێ. لە هەمانکات دا ئەو دەزگا سیاسییانە توانا دەدەنە نوخبەکان تا دەزگا سیاسییەکانی ئایندە و شێوازی پەرەسەندنیان دابڕێژن. دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکان بە دەوری خۆیان هەمان ئەو نوخبە سیاسییانە دەوڵەمەند دەکەن و سامانی ئابووری و دەسەڵاتیان یارمەتی بەهێزکردنی باڵادەستی سیاسییان دەدەن. بۆ نموونە، لە باربەیدۆزی ئەمەریکای لاتین دا کۆلۆنیستەکان توانیان دەسەڵاتی سیاسییان بەکاربهێنن بۆ سەپاندنی کۆمەڵێك دەزگای ئابووری ئەوتۆ کە سامانێکی زۆری بۆ کەڵەکەکردن لەسەر حسابی باقی دانیشتوانەکە. ئەو سامانەی ئەم دەزگا ئابوورییانە پەیدایانکرد توانای بەخشیە ئەم نوخبانە تا سوپا و هێزی ئاسایش پێکەوە بنێن بۆ بەرگریکردن لە مۆنۆپۆڵی ڕەهای دەسەڵاتی سیاسییان. بێگومان ئاکامی ئەمەش ئەوەیە کە

دەزگا سیاسی و ئابوورییە چەوسێنەرەکان پشتگیری یەکتر دەکەن و پەرە بە بەردەوامی خۆیان دەدەن.

لە راستیدا تێهەڵکێشی نێوان دەزگایانی سیاسی و ئابووری چەوسێنەر لێرەدا ناوەستێ. کاتێك نوخبە دەسەڵاتدارەکان لە سایەی دەزگا سیاسییە چەوسینەرەکان دا تەحەدا دەکرێن و تاقمە نوێکان دەسەڵات دەگرنەدەست، ئەوا ئەم تاقمە نوێیانەش بە هەمانشێوە رووبەڕوی جڵەوگیری کەمدەبنەوە. لەبەر ئەوە ئەوانیش هاندانی هێشتنەوەی ئەم دەزگا سیاسییانەیان لادروستدەبێ و کۆمەڵێك دەزگای ئابووری هاوشێوە دروستدەکەن هەروەك چۆن پۆرفیریۆ دیاز و ئەوانەی دەوروپشتی کردیان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دا لە مەکسیك.

دەزگایانی ئابووری کراوە لەسەر ئەو بناخانە پێکدەهێنرێن کە لە لایەن دەزگایانی سیاسی کراوەوە دامەزراون. ئەو دەزگا سیاسییانەی کە دەسەڵات بە شێوەیەکی فراوان لە ناو کۆمەڵگادا دابەشدەکەن و سنوور بۆ بۆ بەکارهێنانی بێسەروبەری دەسەڵات دادەنێن. ئەم جۆرە دەزگا سیاسییانە زەوتکردنی دەسەڵات و لەقکردنی بناخەی دەزگا کراوەکان زەحمەت تر دەکەن. ئەوانەی کۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسی دەکەن ناتوانن بە ئاسانی دەزگا سیاسییە کراوەکان بەکاربهێنن بۆ دامەزراندنی دەزگای ئابووری چەوسێنەر بۆ بەرژەوەندی خۆیان. دەزگا ئابوورییە کراوەکانیش بە دەوری خۆیان دابەشکردنی زیاتر یەکسانی سامانەکان دەرەخسێنن و دەبنەهۆی بەردەوامی دەزگا سیاسییە کراوەکان.

ئەوە رێکەوت نەبوو کاتێك لە ساڵی ١٦١٨ دا، کۆمپانیای ڤێرجینیا زەوی بەخشیە ئەو کۆلۆنیستانەی پێشتر هەوڵی چەوساندنەوەیانی دەدا و گرێبەستە بێبەزەییەکانی هەڵوەشاندنەوە، ساڵێك دوای ئەوە ئەنجوومەنی گشتی بواری دایە کۆلۆنیستەکان تا بۆخۆیان کاروباری خۆیان بەڕێوەببەن. مافە ئابوورییەکان بەبێ مافە سیاسییەکان جێگای متمانەی کۆلۆنیستەکان نەبوو، چونکە هەوڵە بەردەوامەکانی کۆمپانیای ڤێرجینیایان بینیبوو بۆ چەوساندنەوەیان. ئەم مافە ئابوورییانە بەبێ مافە سیاسییەکان نەدەکرا جێگیر بن و مانەوەیان بەردەوامبێ. لە راستیدا، بەشێوەیەکی گشتی کارکردنی دەزگا کراوە و چەوسێنەرەکان پێکەوە، ناجێگیرن. دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکان لە سایەی دەزگا سیاسییە کراوەکان دا ناتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوامبن،

هەروەك گفتوگۆكەمان دەربارەی بەربەیدۆز پیشانیدەدا.

بە هەمانشێوە، دەزگا ئابوورییە كراوەكان نە پشتگیری دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەكان دەكەن و نە لە لایەن ئەم دەزگایانەشەوە پشتگیری دەكرێن. یان ئەو دەزگا ئابوورییە كراوانە دەگۆڕێن بۆ دەزگای ئابووری چەوسێنەر بۆ پاراستنی ئەو بەرژەوەندییە تەسكانەی دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە، یان ئەو دانامیزمە ئابوورییانەی ئەو دەزگا ئابوورییە كراوانە دروستیدەكەن، دەبێتە هۆی لەقكردنی دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەكان و كردنەوەی دەرگا بۆ سەرهەڵدانی دەزگایانی سیاسی كراوە. لە هەمانكات دا، دەزگای ئابووری كراوە ئەو قازانجانە كەمدەكەنەوە كە نوخبەی دەسەڵاتدار دەستیان دەكەوێ لە رێگەی بەڕێوەبردنی دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەكان، چونكە ئەو دەزگا ئابوورییانە ڕووبەڕووی ڕكابەریی بازاڕ دەبنەوە و دەسەڵاتەكانیان بەهۆی گرێبەستەكان و مافی موڵكداری باقی كۆمەڵگا سنووردار دەكرێ.

## بۆچی هەمیشە خۆشگوزەرانی هەڵنابژێریت؟

دەزگا سیاسی و ئابوورییەكان كە سەرەنجام هەڵبژێراوی كۆمەڵگان، دەكرێن كراوە بن و هانی گەشەكردنی ئابووری بدەن، یان چەوسێنەر بن و ببنە تەگەرەی بەردەم گەشەكردنی ئابووری. نەتەوان شكستدەهێنن كاتێك دەبنە خاوەنی دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر كە لە لایەن دەزگایانی سیاسی چەوسێنەرەوە پشتگیری دەكرێن كە دەبنە تەگەرە و تەنانەت كۆسپ لەبەردەم گەشەكردنی ئابووری دا. ئەمە مانای ئەوەیە هەڵبژاردنی دەزگاكان ـ كە ئەمەش سیاسەتی دەزگاكانە ـ ناوەندییە بۆ گەڕان بە دوای تێگەیشتنمان دەربارەی هۆكارەكانی سەركەوتن و شكستهێنانی نەتەوان. دەبێ ئەوە تێبگەین كە بۆچی سیاسەتی هەندێك كۆمەڵگا دەبنە هۆی سەرهەڵدانی دەزگای كراوە كە باوەش بۆ گەشەكردنی ئابووری دەكەنەوە، لە كاتێك دا سیاسەتی زۆربەی هەرەزۆری كۆمەڵگان بە درێژایی مێژوو بوونەتە هۆی، ئەمڕۆش دەبنە هۆی، سەرهەڵدانی دەزگایانی چەوسێنەر كە گەشەكردنی ئابووری پەكدەخەن.

ڕەنگە ڕوونبێ، كە پێویستە هەموو كەس بەرژەوەندی لە دامەزراندنی ئەو جۆرە دەزگا ئابوورییانەدا هەبێ كە دابینكاری خۆشگوزەرانین. ئایا هەموو

هاوڵاتییەك و هەموو سیاسییەك و تەنانەت دیکتاتۆرێکی دڕندەش نایەوێ هێندەی دەکرێ وڵاتەکەی دەوڵەمەند بکا؟

با بگەڕێینەوە بۆ پاشایەتی کۆنگۆ کە پێشتر باسمانکرد. هەرچەندە ئەم پاشایەتییە لە سەدەی حەڤدەیەم دا هەرەسیهێنا، بەڵام ناوەکەی بەخشیە ئەو وڵاتە مۆدێرنەی سەربەخۆیی لە حوکمی کۆلۆنیالی بەلجیکا لە ساڵی ١٩٦٠ دا وەرگرت. وەك قەوارەیەکی سەربەخۆ، کۆنگۆ لە نێوان ساڵانی ١٩٦٥ و ١٩٩٧ دا لە ژێر فەرمانڕەوایی جۆزیف مۆبۆتۆ تووشی پاشەکشەی بەردەوامی ئابووری و دووچاری هەژاری بوو. ئەم پاشەکشەیە، دوای لادانی مۆبۆتۆ لە لایەن لۆرەنت کابیلا هەر بەردەوامبوو. مۆبۆتۆ کۆمەڵێك دەزگای ئابووری زۆر چەوسێنەری دامەزراند. هاوڵاتییان ڕووتێنرانەوە، بەڵام مۆبۆتۆ و ئەو نوخبەیەی دەوریان دابوو کە بە (سەوزەواتە گەورەکان) ناسرابوون، زۆر دەوڵەمەندبوون. مۆبۆتۆ کۆشکێکی لە گبادۆلیتی شوێنی لە دایکبوونی کە دەکەوێتە باکووری وڵاتەکەوە، بۆخۆی دروستکرد لەگەڵ فڕۆکەخانەیەکی هێندە گەورە کە جێگای نیشتنەوەی فڕۆکەی سوپەرسۆنیکی کۆنکۆرد دەبۆوە. ئەمەش فڕۆکەیەك بوو کە زوو زوو لە هێڵی ئاسمانی فەڕەنسا بەکرێی دەگرت بۆ سەفەرکردن بۆ ئەوروپا. لە ئەوروپا قەڵای کڕی و بوە خاوەنی پانتاییەکی گەورەی برۆکسلی پایتەختی بەلجیکا.

ئایا باشتر نەدەبوو بۆ مۆبۆتۆ تا دەزگای ئابووری وا دروستبکا کە کۆنگۆییەکان دەوڵەمەند تر بکا لە بری قوڵکردنەوەی هەژارییان؟ ئایا ئەگەر مۆبۆتۆ بیتوانیایە خۆشگوزەرانی نەتەوەکەی زیاتر بکا، ئایا نەیدەتوانی پارەی زیاتر بۆخۆی زەوتبکا و لەبری ئەوەی کۆنکۆرد بەکرێبگرێ، کۆنکرد بکڕێ و قەڵای زیاتر و کۆشکی زیاتر و تەنانەت سوپایەکی گەورەتر و بەهێزتری هەبێ؟ بۆ بەدبەختی هاوڵاتییانی چەندین وڵاتی جیهان، وەڵامەکە بریتییە لە نەخێر. ئەو دەزگا ئابوورییانەی کە هانی پێشکەوتنی ئابووری دەدەن ڕەنگە لە هەمانکات دا داهات و دەسەڵاتیش بە شێوەیەك دابەشبکەنەوە کە دیکتاتۆرێکی دڕندە و ئەوانەی دەسەڵاتی سیاسییان هەیە ڕەنگە باری داراییان هێندە باش نەبێ.

کێشەی بنەڕەتی ئەوەیە کە ململانێ و ناکۆکی لەسەر پێکهێنانی دەزگا ئابوورییەکان دروستدەبێ. دەزگایانی جیاواز ئەنجامی جیاوازییان بۆ خۆشگوزەرانی نەتەوەیەك لێدەکەوێتەوە و ئەو خۆشگوزەرانییە چۆن

دابەشدەکرێ و کێ دەسەڵاتی سیاسی دەگرێتەدەست. گەشەکردنی ئابووری کە لە لایەن دەزگاکانەوە دەهێنرێتەئاراوە، براوە و دۆڕا و دروستدەکا.. ئەمە لە سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی دا لە ئینگلتەرە ڕوونبوو، کە بناخەی ئەو خۆشگوزەرانییەی دامەزراند کە ئەمڕۆ لە وڵاتە دەوڵەمەندەکانی جیهان دا دەیبینین. ئەم شۆڕشە لە سەر کۆمەڵێك گۆڕانکاری تەکنەلۆجی ڕێچکەشکێن لە بوارەکانی هێزی هەڵم و گواستنەوە و بەرهەمهێنانی قوماش چەقی بەستبوو. هەرچەندە ئامێرسازی بوە هۆی زیادبوونی بەرچاوی کۆی داهاتەکان و سەرەنجامیش بوە بناخەی کۆمەڵگای مۆدێرنی پیشەسازی، بەڵام لە لایەن کەسانی زۆرەوە بەرهەڵستکاریکرا. نەك لەبەر نەزانی یان یان کورتبینیان، بەڵکو بە پێچەوانەوە. ئەم جۆرە بەرهەڵستکارییە بۆ گەشەکردنی ئابووری، بەداخەوە، لۆجیکی پتەوی خۆی هەیە. گەشەکردنی ئابووری و گۆڕانکاری تەکنەلۆجی شانبەشانی، هەروەك ئابووریناسی مەزن جۆزیف شومپیتەر دەڵێ، تێکدانی بنیاتنەر دەبێ. ئەوان جێگەی کۆن بە نوێ دەگرنەوە. کەرتە نوێکان دەرامەتی کەرتە کۆنەکان بۆخۆیان کێشدەکەن. کۆمپانیا نوێکان بزنسی کۆمپانیا کۆنەکان بۆخۆیان ڕادەکێشن. تەکنەلۆجییە نوێکان بەهرە و ئامێرە کارپێکردوەکان بێبایەخ دەکەن. پرۆسەی گەشەکردنی ئابووری و ئەو دەزگا کراوانەی ئەم گەشەکردنە پشتیان پێدەبەستن براوە و دۆڕاو دروستدەکەن لە مەیدانی سیاسی و بازاڕی ئابووری دا. ترسی تێکدانی بنیاتنەر زۆرجار هۆکاری سەرەکی بەرهەڵستکردنی دەزگا ئابووری و سیاسییە کراوەکانن.

مێژووی ئەوروپا نموونەیەکی زیندووی ئەنجامەکانی تێکدانی بنیاتنەر پیشاندەدا. لە ئێوارەی شۆڕشی پیشەسازی دا لە سەدەی هەژدەیەم دا، حکومەتەکانی زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا لە لایەن نوخبە ئەریستۆکرات و تەقلیدیەکانەوە کۆنترۆڵ کرابوون کە داهاتی سەرەکییان لە خاوەنداریێتی زەوی و ئیمتیازە بازرگانییەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو، بەهۆی ئەو مۆنۆپۆلیەی پێیان بەخشرابوو و ئەو کۆسپانەی لە لایەن پاشاکانەوە خرابوونە بەردەم بەشداریکردنی خەڵکی تر. هاوتا لەگەڵ تێکدانی بنیاتنەر دا، بڵاوبوونەوەی پیشەسازی و کارگە و شارەکان، دەرامەت و سەرچاوەی لە زەوییەکان کێشایەوە و کرێی زەوی کەمکردەوە و ئەو کرێیانەی زیادکرد کە دەبوو خاوەن زەوییەکان بیاندایەتە کرێکارەکانیان. لە هەمانکات دا، ئەم نوخبانە بینییان دەرکەوتنی بزنسمان و بازرگانی نوێ دەبێتە هۆی لە دەستدانی ئیمتیازە

بازرگانییەکانیان. لە هەموو ڕوویەکەوە ئەوان دۆڕاوی دیاری ئابووری پرۆسەی بەپیشەسازیبون بوون. شارنشینی و دەرکەوتنی چینی ناوەڕاست و کرێکاری هۆشیار لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە تەحەدای قۆرخکردنی دەسەڵاتی سیاسی زەویدارە ئەریستۆکراتەکانی کرد. بۆیە بە تەشەنەکردنی شۆڕشی پیشەسازی، ئەریستۆکراتەکان تەنیا دۆڕاوی ئابووری نەبوون، بەڵکو لەبەردەم مەترسی دۆڕاندنی سیاسیشدا بوون کە لە دەستدانی باڵادەستی دەسەڵاتی سیاسییان بوو. بە کەوتنە بەر هەڕەشەی دەسەڵاتە ئابووری و سیاسییەکانیان، ئەم نوخبانە زۆجار بەرهەڵستکارێکی سەرسەختی بەپیشەسازیکردن بوون.

ئەریستۆکراتەکان تەنیا دۆڕاوی پرۆسەی بەپیشەسازیکردن نەبوون. خاوەن پیشە هونەریەکان کە بەهرە دەستییەکانیان لە لایەن ئامێرسازییەوە جێگەیان دەگیرایەوە، بە هەمانشێوە بەرهەڵستی بڵاوبوونەوەی پیشەسەزییان دەکرد. زۆر لەوانە کەوتنە خۆڕێکخستن دژی بەپیشەسازیکردن و نانەوەی ئاژاوە و تێشکاندنی ئەو ئامێرانەی ئەوان بە سەرچاوەی خراپبوونی بژێوی خۆیان دەزانی. ئەوانە پێیان دەوترا لودیەکان، ووشەیەك کە ئەمڕۆ بۆتە هاوەڵی بەرەنگاربوونەوەی گۆڕانکاری تەکنەلۆجی. جۆن کەی، داهێنەری ئینگلیزی، کە " ئامێری جۆلایی" لە ساڵی ١٧٣٣ دا داهێنا و یەکێك بوو لە چاکسازییە گرنگەکانی بواری جۆلایی، خانوەکەی لە ساڵی ١٧٥٣ لە لایەن لودیەکانەوە سووتێنرا. جەیمس هارگریڤ، داهێنەری "خەڕەکی ڕستن"، کە باشکردنێکی شۆڕشگێڕانەی تەواکاری بوو لە کاری ڕستن دا، تووشی هەمان چارەنووس بوو.

لە ڕاستیدا، کاریگەری خاوەن پیشە هونەریەکان لە دژایەتیکردنی پرۆسەی بەپیشەسازیبوون دا زۆر کەمتر بوو لە خاوەن زەوی و نوخبەکان. لودیەکان وەك ئەریستۆکراتە خاوەن زەوییەکان دەسەڵاتی سیاسییان نەبوو- توانای کارتێکردنی ئەنجامە سیاسییەکان دژی خواستەکانی گروپانی تر. لە ئینگلتەرە دا، بەپیشەسازیبوون، سەرەڕای بەرهەڵستی لودیەکان، بەرەو پێشەوە ڕۆیشت، چونکە بەرهەڵستکاری ئەریستۆکراسی هەرچەندە ڕاستەقینە بوو، کپکرا. لە ئیمپراتۆریەتەکانی هەنگاریا- نەمسا و ڕوسیا کە پاشایەتییە دەسەڵات ڕەهاکان و ئەریستۆکراتەکان زیانی زۆر گەورەتریان دەکرد، بەپیشەسازیبوون وەستێنرا. لە ئەنجامدا ئابووری نەمسا- هەنگاریا و ڕوسیا چەقیبەست. ئەم دوو ئیمپراتۆریەتە کەوتنە دوای وولاتانی تری ئەوروپا کە تیایان دا گەشەکردنی ئابووری لە سەدەی نۆزدەیەم دا دەستیپێکرد.

سەرای سەرکەوتن و شکستهێنانی گروپە دیاریکراوەکان، وانەیەك ئاشکرایە: گروپە بەهێزەکان زۆرجار دژی پێشکەوتنی ئابووری و بزوێنەری خۆشگوزەرانی دەوەستنەوە. گەشەکردنی ئابووری تەنیا بریتینیە لە پرۆسەی ئامێری باشتر و زیاتر و خەڵکی زیاتری خاوەن پەروەردەی باشتر، بەڵکو بریتیشە لە پرۆسەی ئاڵوگۆڕکردن و ناسەقامگیریی کە بەهۆی تێکدانی بنیاتنەرەوە دێنەئاراوە. بۆیە گەشەکردن تەنیا لەو کاتەدا دێتەئاراوە کە لە لایەن ئەوانەوە نەوەستێنرێ لە رووی ئابوورییەوە زیاندەکەن و لایان وایە ئیمتیازە ئابوورییەکانیان نامێنێ و لە لایەن ئەوانەوە نەوەستێنرێ کە لە رووی سیاسییەوە زیاندەکەن و لەوە دەترسن دەسەڵاتی سیاسییان نەمێنێ.

ململانێکان لەسەر دەرامەتە کەمەکان و داهات و دەسەڵات، دەگۆڕێ بۆ ململانێ لەسەر رێساکانی گەمەکە و دەزگا ئابوورییەکان کە چالاکیە ئابوورییەکان دیاریدەکەن و ئەوەش دیاریدەکەن کێ سوود لەم دەزگایانە وەردەگرێ. کاتێك ململانێ سەرهەڵدەدا، ناتوانرێ خواستی هەموو لایەنەکان پێکەوە بهێنرێتەدی. هەندێك لایەن دەدۆڕێن و بێزاردەبن، لە کاتێك دا لایەنانی تر لە بەدەستهێنانی ئەو ئەنجامانەی دەیانەوێ سەردەکەون. ئەوانە کێن کە براوەی ململانێکەن، کاریگەری گەورەی دەبێ بۆ رێرەوی ئابووری نەتەوەیەك. ئەگەر ئەو گروپانەی دژی گەشەکردن دەوەستنەوە براوەکان بن، ئەوا دەتوانن سەرکەوتوانە گەشەکردنی ئابووری ڕاگرن و ئابووریش چەقدەبەستێ.

لۆجیکی ئەوەی بۆچی دەسەڵاتداران نایانەوێ ئەو جۆرە دەزگا ئابوورییانە دابمەزرێنن کە هانی گەشەکردنی ئابووری دەدەن بە ئاسانی بۆ هەڵبژاردنی دەزگا سیاسییەکانیش درێژدەکرێتەوە. لە سایەی رژێمێکی ڕەها دا، هەندێك نوخبە دەتوانن دەسەڵات بەکاربهێنن بۆ دامەزراندنی ئەو دەزگا ئابوورییانەی دەیانەوێ. ئایا ئارەزووی ئەوە دەکەن دەزگا سیاسییەکان بەرەو دەزگای زیاتر پلورەلیستی بگۆڕن؟ بە گشتی نەخێر، چونکە ئەمە تەنیا دەسەڵاتی سیاسییان کەمدەکاتەوە، بۆیان زەحمەت تر دەبێ، تەنانەت مەحاڵ دەبێ کە دەزگا ئابوورییەکان بەو شێوەیە دابرێژن کە بتوانن بەرژەوەندییەکانیان زیاتر بپارێزن. لێرەدا دیسانەوە سەرچاوەی ئامادەی ململانێ دەبینین. ئەو خەڵکەی بەهۆی دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکانەوە تووشی زیان دەبن ئومێدی ئەوەیان نییە کە دەسەڵاتدارە ڕەهاکان خۆویستانە دەزگا سیاسییەکان بگۆڕن و دەسەڵات لەناو کۆمەڵگادا دابەشبکەنەوە. تەنیا ڕێگا بۆ گۆڕینی ئەم دەزگا

سیاسییانە بریتییە لە ناچارکردنی نوخبەی سیاسی بۆ دامەزراندنی دەزگای زیاتر پلورەلیستی.

بە هەمان ئەو شێوەیەی کە هیچ هۆکارێك نییە پێویستی بکا دەزگا سیاسییەکان بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی زیاتر پلورەلیستی بن، ئارەزووی ئاساییش بەرەو مەرکەزیەتی سیاسی نییە. بە دڵنیاییەوە هاندان بۆ دامەزراندنی دەزگایانی دەوڵەتیی خاوەن مەرکەزیەتی زیاتر دروستدەبێ، بەتایبەتی لەو کۆمەڵگایانەدا کە هیچ جۆرە مەرکەزیەتێکیان تێدا نییە. بۆ نموونە، ئەگەر تیرەیەك لە تیرەکانی سۆماڵ بتوانێ دەوڵەتێکی خاوەن مەرکەزیەت دابمەزرێنێ کە بتوانێ ئاسایش لە وڵات دا بچەسپێنێ، ئەمە دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی قازانجی ئابووری و دەوڵەمەندکردنی ئەم تیرەیە. ئایا چی رێگرە لەبەردەم ئەمەدا؟ کۆسپی سەرەکی لەبەردەم مەرکەزیەتی سیاسی دیسانەوە بریتییە لە شێوە ترسێك لە گۆڕان: هەر تیرەیەك یان گروپێك یان سیاسییەك هەوڵبدا لە ناو دەوڵەت دا مەرکەزیەتی دەسەڵات دروستبکا، لە هەمانکات دا مەرکەزیەتی دەسەڵات لە دەستی خۆی دا چڕدەکاتەوە و ئەمەش دەبێتە هۆی ڕق و تووڕەیی تیرە و گروپ و تاکەکانی تر، ئەوانەی لەم پرۆسەیەدا لە رووی سیاسییەوە تووشی زیان دەبن. نەبوونی مەرکەزیەتی سیاسی تەنیا مانای نەبوونی یاسا و ئاسایش نییە لە زۆربەی ناوچەکان دا، بەڵکو مانای ئەوەشە کە چەندین ئەکتەر دەبن ئەوەندە دەسەڵاتیان دەبێ تا شتەکان ڕابگرن یان تێکیان بدەن. ترس لە بەرهەڵستی ئەمانە و کاردانەوە توندوتیژەکانیان زۆرجار ئەوانەی ئارەزووی مەرکەزیەت دەکەن تووشی سڵەمینەوە دەکا. مەرکەزیەتی سیاسی تەنیا لەو کاتەدا ئەگەری سەرکەوتنی هەیە کە گروپێکی خەڵك دەسەڵاتیان هێندە زیاتر بێ کە بتوانن دەوڵەت دابمەزرێنن. لە سۆماڵ دا، دەسەڵات بە شێوەیەکی هاوسەنگ دابەشبوە و هیچ یەکێك لە تیرەکان ناتوانن خواستی خۆی بەسەر ئەوی تردا بسەپێنێ. هەر بۆیە نەبوونی مەرکەزیەتی سیاسی بەردەوامدەبێ.

# ئێشوئازاره درێژخایەنەکەی کۆنگۆ

نموونەی باشتر، یان پەژارە ئامێزتر، لە کۆنگۆ کەمە بۆ پیشاندانی ئەو هێزانەی شرۆڤەی لۆجیکی ئەوە دەکەن کە بۆچی خۆشگوزەرانی ئابووری لە سایەی دەزگا چەوسێنەرەکان دا هێندە دەگمەنە، یان بۆ ڕوونکردنەوەی تێهەڵکێشی نێوان دەزگا ئابووری و سیاسییە چەوسێنەرەکان. گەشتیارە پورتوگالی و هۆڵەندییەکان لەگەشتەکانیان دا بۆ کۆنگۆ لە سەدەکانی پازدەیەم و شازدەیەم دا باسی "هەژاری ناهەموار"ی ئەوێیان کردوە. تەکنەلۆجی بەپێی ستانداردی ئەورووپی لەو وڵاتەدا زۆر سەرەتایی بوو، کۆنگۆییەکان نووسین و چەرخ و گاسنیان نەبوو. هۆکاری ئەم هەژارییە و ئامادەنەبوونی جووتیارانی کۆنگۆ بۆ بەکارهێنانی تەکنەلۆجی باشتر، کاتێک ئاگاداری بوونی ئەم تەکنەلۆجییانە بوون، لە تۆمارە مێژووییەکانەوە بە ڕوونی دەردەکەوێ. هۆکارەکەش بریتیبوو لە سروشتی چەوسێنەرانەی دەزگا ئابوورییەکانی وڵات.

هەروەك بینیمان، پاشایەتی کۆنگۆ لە لایەن پاشاوە لە مبانزا حوکمدەکرا و دواتریش بوە ساو سەلڤادۆر. ناوچە دوورەکان لە پایتەختەوە، لە لایەن نوخبەیەکەوە حوکمدەکران کە ڕۆڵی پارێزگاریان دەبینی لە ناوچە جیاوازەکانی پاشایەتییەکەدا. سامانی ئەم نوخبەیە پشتی بەستبوو بە بەکارهێنانی کۆیلە بۆ کشتوکاڵ لە دەوری ساو سەلڤادۆر و بە زۆر وەرگرتنی باج لە ناوچەکانی تری وڵات دا. کۆیلەیەتی بۆ ئابووری ناوەندی بوو، لە لایەن نوخبەوە بەکاردەهێنرا بۆ بەردەوامیدان بە کشتوکاڵەکانیان و لە لایەن ئەورووپییەکانیشەوە لە کەناری دەریا بەکاردەهێنران. کۆکردنەوەی باج بەشێوەیەکی ڕەمەکی بوو: جۆرە باجێك وەردەگیرا هەرکاتێك شەبقەکەی پاشا بکەوتایەتە خوارەوە. کۆنگۆییەکان بۆ ئەوەی دەوڵەمەند تر بن دەبوایە پارەیان پاشەکەوت بکردایە و وەبەرهێنانیان بکردایە، بۆ نموونە، لە ڕێگەی کڕینی گاسنەوە. بەڵام ئەم کارە بەهایەکی ئەوتۆی نەبوو چونکە هەر دەرامەتێکی زیادەیان دەستبکەوتایە لە ئەنجامی بەکارهێنانی تەکنەلۆجی باشترەوە، ئەوا لە لایەن پاشا و نوخبەکەی دەوروبەریەوە زەوتدەکرا. لە بری ئەوەی کۆنگۆییەکان وەبەرهێنان بکەن بۆ زیادکردنی ئاستی بەرهەمدارییان و فرۆشتنی بەرهەمەکانیان لە بازاڕەکان دا، ئەوان گوندەکانیان بۆ شوێنە دوورەکان لە بازاڕەوە دەگواستەوە، هەوڵیاندەدا تا دەتوانن خۆیان لە ڕێگاکان بەدوور بگرن بۆ کەمکردنەوەی تاڵانکردنیان و خۆ

قوتارکردنیان لە چنگی بازرگانانی کۆیلە.

بۆیە هەژاری کۆنگۆ ئەنجامی بوونی دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکان بوو کە هەموو بزوێنەرەکانی خۆشگوزەرانی ڕاگرتبوو، تەنانەت وای لێکردبوون بۆ دواوە بگەڕێنەوە. حکومەتی کۆنگۆ بڕێکی زۆر کەم خزمەتگوزاری گشتی بۆ هاولاتییەکانی دابینکردبوو، تەنانەت خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکانی وەك مافی مولکداری و یاسا و ئاسایش بوونیان نەبوو. بە پێچەوانەوە، حکومەت بۆخۆی گەورەترین هەڕەشە بوو بۆ سەر مولك و مافی مرۆیی هاولاتییەکانی. دەزگای کۆیلەیەتی ئەوەی دەگەیاند کە بنەڕەتیترین بازاڕ، کە بازاڕی کراوەی هێزی کارە و تیایدا خەلك دەتوانن پیشەکانیان یان کارەکانیان بەو شێوەیە هەلبژێرن کە بۆ ئابوورییەکی برەودار گرنگە، بوونی نەبوو. جگە لەمە، بازرگانی شوێنە دوورەکان و چالاکیە بازرگانییەکان تەنیا بۆ پاشاو دەستوپێوەندەکانی کراوە بوون. هەرچەندە نوخبەکە، دوای ئەوەی پورتوگالیەکان نوسینیان هێنایەئاراوە، زوو فێری خوێندەواری بوون، بەلام پاشا هیچ هەولێکی نەدا خوێندەواری لە ناو جەماوەری خەلك دا بلاو بێتەوە.

لەگەل ئەمەش دا، هەرچەندە " هەژاری ناهەموار" تەشەنەی کردبوو، دەزگا چەوسێنەرەکانی کۆنگۆ لۆجیکی تایبەتی خۆیان هەبوو: ئەو دەزگایانە خەلکێکی کەمیان دەولەمەند دەکرد، ئەوانەی دەسەلاتی سیاسییان هەبوو. لە سەدەی شازدەیەم دا پاشای کۆنگۆ و ئەریستۆکراتەکان دەیانتوانی کەلوپەلی گرانبەهای ئەورووپی هاوردە بکەن و چواردەوریان بە خزمەتکاروکۆیلە تەنرابوو.

ڕیشەی دەزگا ئابوورییەکانی کۆمەلگای کۆنگۆ لە دابەشبوونی دەسەلاتی سیاسی لە ناو کۆمەلگادا سەرچاوەی گرتبوو، بەمەش لە سروشتی دەزگا سیاسییەکانەوە. هیچ شتێك نەبوو پاشا لە زەوتکردنی مولك و ناموسی خەلك بگێڕێتەوە جگە لە هەڕەشەی شۆڕش. هەرچەندە ئەم هەڕەشەیە ڕاستەقینە بوو، بەلام بەس نەبوو بۆ پاراستنی سامان و ژیانی خەلك. دەزگا سیاسییەکانی کۆنگۆ بەڕاستی دەزگای دەسەلات ڕەها بوون و بە شێوەیەك بوون کە هیچ سنوورێکیان بۆ دەسەلاتی پاشا و نوخبەکەی دەوروبەری دانەدەنا و هیچ بوارێکی بۆ ڕای هاولاتییان دەربارەی شێوازی ڕێکخستنی کۆمەلگاکەیان نەهێشتبۆوە.

بێگومان، زەحمەت نییە ببینین کە دەزگا سیاسییەکانی کۆنگۆ کوتومت پێچەوانەی دەزگایانی سیاسی کراوەن کە بەهۆیانەوە دەسەلات سنووردار و بە

شێوەیەکی فراوان دابەشکراوە. دەزگا ڕەهاکانی کۆنگۆ بە هۆی سوپاوە مابوونەوە. پاشا لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەم دا سوپایەکی ئامادەی پێنج هەزار سەربازی هەبوو، لەگەڵ پێنج سەد سەربازی مەسکەت لەشانی هەبوو. کە هێزێکی بێهاوتای ئەو سەردەمە بوون. ئایا بۆچی پاشا و ئەریستۆکراتەکان بە پەرۆشەوە چەکی ئەوروپییان بەکاردەهێنا، تێگەیشتن لەمە ئاسانە.

هیچ بوارێك نەبوو بۆ گەشەکردنی بەردەوامی ئابووری لە سایەی ئەم جۆرە دەزگا ئابوورییانەدا و تەنانەت هاندان بۆ ئەنجامدانی گەشەکردنی کاتی سنووردار بوو. ڕیفۆرمی دەزگا ئابوورییەکانی کۆنگۆ بۆ باشترکردنی مافی موڵکداری کۆنگۆییەکان دەبوە هۆی هێنانەدی خۆشگوزەرانی زیاتر بۆ خەڵکی کۆنگۆ، بەڵام پێندەچوو کە نوخبەکە سوود لەم خۆشگوزەرانییە گشتیە ببینن. یەکەم، ئەم ڕیفۆرمانە دەبوونە هۆی ئەوەی نوخبە لە ڕووی ئابوورییەوە تووشی زیان بن بەهۆی کەمکردنەوەی ئەو سامانەی لە ڕێگەی بازرگانی کۆیلەو بەکارهێنانی کۆیلە بۆ کاری کشتوکاڵ دەستیاندەکەوت. ئەم ڕیفۆرمانە تەنیا لەو کاتەدا دەکران جێبەجێبکرێن کە دەسەڵاتی سیاسی پاشا و نوخبە سنووریان بۆ دابنرێ. بۆ نموونە، ئەگەر پاشا بەردەوامبوایە لە فەرمانکردن بەو پێنج سەد کەسە مەسکەت لەشانە، کێ بڕوای بەو ڕاگەیاندنە دەکرد کە کۆیلەیەتی هەڵوەشاوەتەوە؟ چی پاشای دەوەستاند لە گۆڕینی ڕاکەی دوای ڕاگەیاندنەکە؟ تەنیا گەرەنتیەك بریتیبوو لە گۆڕینی دەزگا سیاسییەکان بۆ ئەوەی هاوڵاتییان دەسەڵاتی سیاسی پارسەنگیان بەدەستبهێنایە و ڕایان دەربارەی باج و ڕەفتارەکانی مەسکەت لەشانەکان وەربگیرایە. لەم حاڵەتەدا ڕێگەی تێناچێ کە هێشتنەوەی ئاستی گوزەران و ستایەڵی ژیانی پاشا و نوخبە جێگەیەکی بەرزی لە لیستی ئەولەویەتی هاوڵاتییان دا بگرتایە. لەم سیناریۆیەدا، ئەو گۆڕانکارییانەی دەبوونە هۆی سەرهەڵدانی دەزگای ئابووری باشتر لە کۆمەڵگادا، دەبوونە هۆی ئەوەی پاشا و ئەریستۆکراسی لە ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە بدۆڕێنن.

کارلەیەککردنی دەزگا سیاسی و ئابوورییەکان پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر، ئێستاش گونجاوە بۆ تێگەیشتن لەوەی کە بۆچی دەوڵەتی مۆدێرنی کۆنگۆ هێشتا لەم ڕۆژگارەش دا هەژارە. دەرکەوتنی حوکمی ئەوروپییەکان لەم ناوچەیەدا و قوڵتریش لە حەوزی ڕووباری کۆنگۆ دا لە کاتی "هەوڵدان بۆ گەیشتنە ئەفریقا " لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دا، بوە هۆی ناسەقامگیری لە

مافەکانی موڵکداری و مرۆڤ دا، تەنانەت بە شێوەیەکی ناهەموارتر لەوەی لە سەردەمی پێش کۆلۆنیالی لە کۆنگۆدا هەبوو. سەرەڕای ئەمەش، پاتێرنی دەزگایانی چەوسێنەر ڕەهایی سیاسی بەرهەمهێنایەوە کە ژمارەیەکی کەمی لەسەر حسابی جەماوەر دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار کرد، هەرچەندە ئەو ژمارە کەمە بریتیبوون لە کۆلۆنیستە بەلجیکیەکان و لە هەمووشیان دیارتر لیۆپۆڵد پاشای دوەم بوو.

کاتێك کۆنگۆ لە ساڵی ١٩٦٠ دا سەربەخۆ بوو، هەمان پاتێرنی دەزگا ئابوورییەکان و هاندان و جێبەجێکردن جارێکیتر خۆیان بەرهەمهێنایەوە. ئەم دەزگا چەوسێنەرە ئابوورییانەی کۆنگۆ دیسانەوە لە لایەن دەزگا سیاسییە یەکجار چەوسێنەرەکانەوە پشتگیریکران. بارودۆخەکە خراپتر بوو، چونکە کۆلۆنیالیزمی ئەوروپی قەوارەیەکی سیاسی دروستکرد کە کۆنگۆ بوو، لە چەندین دەوڵەت و کۆمەڵگای پێش کۆلۆنیالی پێکهاتبوو کە دەوڵەتە نەتەوەییەکەی لە کێنشاسای پایتەختەوە حوکمدەکرا، دەسەڵاتی کەمی بەسەریان دا دەشکا. هەرچەندە سەرۆك مۆبۆتۆ، دەوڵەتەکەی بۆ دەوڵەمەندکردنی خۆی و دارودەستەکەی بەکارهێنا ـ بۆ نموونە، لە ڕێگای پرۆگرامی بەزاییریکردن لە ساڵی ١٩٧٣ دا، کە بریتیبوو لە زەوتکردنێکی زۆری بەرژەوەندییە ئابوورییە بیانییەکان ـ ئەو فەرمانڕەوایی دەوڵەتێکی بێ مەرکەزیەتی دەکرد کە دەسەڵاتی کەمی بە سەر زۆربەی ناوچەکانی ووڵات دا هەبوو. ئەو ناچار بوو داوای هاوکاری بیانی بکا بۆ ڕاگرتنی جیابوونەوەی کاتانگا و کاسی لە ساڵی ١٩٦٠ ەکان دا. نەبوونی مەرکەزیەتی سیاسی، تا ئاستی ڕمانی دەوڵەتەکە، سیمایەکی هاوبەشی نێوان کۆنگۆ و زۆربەی ووڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقایە.

کۆماری دیموکراسی کۆنگۆی ئەم سەردەمە بە هەژاری ماوەتەوە چونکە هاوڵاتییەکانی تا ئێستاش ئەو دەزگا ئابوورییانەیان نییە کە هاندانی ئەوتۆ دروستدەکەن کە دەبنە هۆی خۆشگوزەرانی کۆمەڵگا. ئەوە نە جوگرافیایە و نە کەلتوور و نە نەشارەزایی هاوڵاتییان و سیاسییەکانە کە کۆنگۆی بە هەژاری هێشتۆتەوە، بەڵکو ئەوە دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکانی کۆنگۆیە. ئەم دەزگایانە دوای هەموو ئەم سەدانە هێشتا ماونەتەوە چونکە دەسەڵاتی سیاسی هێشتا بە تەسکی لە چنگی نوخبەدا چڕکراوەتەوە کە هیچ هاندانێکیان نییە بۆجێبەجێکردنی مافی موڵکداری جێگیر بۆ خەڵك و دابینکردنی خزمەتگوزارییە

گشتییە بنەڕەتییەکان کە کوالیتی ژیان باشتر دەکەن یان بۆ پشتگیریی پێشکەوتنی ئابووری. بەڵکو لەبری ئەمە بەرژەوەندی ئەوان بریتییە لە زەوتکردنی داهات و مانەوەیان لە دەسەڵات دا. ئەوان دەسەڵاتی خۆیان بۆ دروستکردنی دەوڵەتێکی خاوەن مەرکەزیەت بەکارنەهێناوە، چونکە ئەم کارە هەمان کێشەی سەرهەڵدانی ئۆپۆزیۆسۆن و تەحەدای سیاسی دێنێتەئاراوە هەروەك چۆن گەشەکردنی ئابووری ئەمانە دروستدەکا. جگە لەمەش، هەروەك لە زۆربەی وڵاتانی باشووری بیابان دا، شەڕی ناوخۆ کە لە لایەن تاقمە دژ بەیەکەکانەوە بەرپادەکرێ بۆ دەستگرتن بەسەر دەزگا چەوسێنەرەکان دا، ئارەزووی هێنانەئارای مەرکەزیەتی دەوڵەتی لەناوبردوە، کە ڕەنگە لەوەبەر هەبووبێ.

مێژووی پاشایەتی کۆنگۆ و مێژووی نوێتری کۆنگۆ، بە ڕوونی ئەوە پیشاندەدەن کە چۆن دەزگا سیاسییەکان دەزگا ئابوورییەکان دیاریدەکەن و لە ڕێگەی ئەم دەزگا ئابوورییانەوە هاندانی ئابووری و شێوازی گەشەکردنی ئابووری دیاریدەکرێ. لە هەمانکات دا، ئەم مێژووە پەیوەندی ڕەمزیی نێوان ڕەهایی دەسەڵاتی سیاسی و دەزگا ئابوورییەکان ڕووندەکاتەوە کە ژمارەیەکی کەم دەسەڵاتدار و دەوڵەمەند دەکەن لە سەر حسابی زۆرینەی خەڵك.

## گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا

کۆنگۆی ئەمڕۆ نموونەیەکی ئیکستریمی پشێوی و ناسەقامگیری زۆری مافی موڵکدارییە. بەهەرحاڵ، لە زۆربەی دۆخەکان دا ئەم ئێکستریمیزمە خزمەتی بەرژەوندییەکانی نوخبە ناکا چونکە هەموو هاندانە ئابوورییەکان لەناودەبات و سامانێکی کەم بۆ نوخبە بەرهەمدەهێنێ. بیرۆکەی ناوەندی ئەم کتێبە ئەوەیە کە گەشەکردنی ئابووری و خۆشگوزەرانی هاوشانی دەزگایانی ئابووری و سیاسی کراوەن، لە کاتێك دا دەزگایانی چەوسێنەر دەبنە هۆی چەقبەستوویی و هەژاری. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە دەزگایانی چەوسێنەر ناتوانن هەرگیز گەشەکردن بهێننەئاراوە و ئەوەش ناگەیەنێ کە هەموو دەزگا چەوسێنەرەکان وەك یەك دروستدەکرێن.

دوو ڕێگای جیاواز و لە هەمانکاتیشدا تەواکاری یەکتر هەن کە بەهۆیانەوە

گەشەکردن لە سایەی دەزگای چەوسێنەردا دێتەئاراوە. یەکەم، تەنانەت ئەگەر دەزگایانی ئابووریش چەوسێنەر بن، دەکرێ گەشەکردن ڕووبدا کاتێک نوخبەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەرامەتەکان لە بواری ئەو چالاکیانەی بەرهەمدارییان بەرزە و لە بندەست خۆیاندایە، دەخەنە گەڕ. نموونەیەکی دیاری ئەم جۆرە گەشەکردنە لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەر دا، دوورگەکانی کاریبی بوو لە نێوان سەدەکانی شازدەیەم و هەژدەیەم دا. زۆربەی خەڵك کۆیلە بوون، لە بارودۆخێکی ناهەمواردا لە کشتوکاڵ دا کاریاندەکرد و کەمێك لەسەروو ئاستی مەمرە ومەژی دا دەژیان و ژمارەیەکی زۆر بەهۆی بەدخۆراکی و ماندووبوونەوە مردن. لە بەربەیدۆز و کوبا و هایتی وجامایکا لە سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەم دا، کەمینەیەکی بچووك کە نوخبەی چێنەر بوون، کۆنترۆڵی هەموودەسەڵاتی سیاسییان کردبوو و خاوەنی هەموو سەرمایەکان بوون بە کۆیلەکانیشەوە. لە کاتێك دا زۆرینە هیچ مافێکی نەبوو، موڵك و سامانی نوخبە چێنەرەکە بە باشی پارێزراو بوو. سەرەڕای دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکان کە بێبەزەییانە زۆرینەی دانیشتوانیان دەچەوساندەوە، ئەم دوورگانە لە شوێنە دەوڵەمەندەکانی دنیا بوون چونکە دەیانتوانی شەکر بەرهەمبهێنن و لەبازاڕی جیهانیدا بیفرۆشن. ئابووری ئەو دوورگانە تەنیا کاتێك تووشی چەقبەستن هات کە پێویست بوو چالاکیەکان بۆ چالاکی ئابووری نوێ بگۆڕن کە هەڕەشەی لە داهات و دەسەلاتی سیاسی نوخبە چێنەرەکە کرد.

نموونەیەکی تر، گەشەکردنی ئابووری و بەپیشەسازیبوونی یەکێتی سۆڤیەتە، هەر لە یەکەم پلانی پێنج ساڵەی ساڵی ١٩٢٨ تا ساڵانی ١٩٧٠ کان. دەزگا سیاسی و ئابوورییەکان زۆر چەوسێنەر بوون و بازاڕەکان بە قورسی کۆتکرابوون. لەگەڵ ئەمەش دا یەکێتی سۆڤیەت توانی گەشەکردنی ئابووری خێرا بەدەستبهێنێ چونکە دەیتوانی دەسەلاتی دەوڵەت بەکاربهێنێ بۆ گواستنەوەی دەرامەتەکان لە کشتوکاڵەوە، کە زۆر بە ناکارامەیی بەکاردەهێنران، بەرەو پیشەسازی.

جۆری دووەمی گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر دا بریتییە لەوەی کە دەزگاکان بواری ئەوە دەڕەخسێنن کە دەزگایانی ئابووری تا ڕادەیەك کراوە، گەر بەتەواویش کراوە نەبن، دروستببن. چەندین کۆمەڵگا کە خاوەنی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەرن، خۆیان لە دامەزراندنی دەزگایانی ئابووری کراوە بە دوور دەگرن لە ترسی تێکدانی بنیاتنەر. بەڵام ئەو

ئەندازەیەی کە نوخبە دەتوانن قۆرخی دەسەڵات بکەن لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکیتر دەگۆڕێ. لە هەندێکیان دا، ڕەنگە پێگەی نوخبە بە ئەندازەی پێویست جێگیر بێ کە بواری کرانەوە بەرەو دامەزراندنی دەزگایانی ئابووری کراوە دەڕەخسێنن، کاتێك نوخبە دڵنیا دەبن لەوەی ئەم کرانەوەیە هەڕەشە لە دەسەڵاتی سیاسییان ناکا. ئەڵتەرنەتیڤی ئەمە ئەوەیە کە بارودۆخی مێژوویی بە شێوەیەك دەبێ کە ڕژێمێکی سیاسی چەوسێنەر دەکاتە خاوەنی دەزگای ئابووری کراوە کە نوخبە بڕیاردەدەن ڕێگری لە سەرهەڵدانیان نەکەن. ئەمەش ڕێگای دوەم دەڕەخسێنێ کە بەهۆیەوە گەشەکردن لە سایەی دەزگای سیاسی چەوسێنەر دا پەیدادەبێ.

بە پیشەسازیبوونی خێرای باشووری کۆریا بە سەرۆکایەتی جەنەڕاڵ پارك نموونەیەکە. پارك لە ڕێگەی کۆدێتایەکی سەربازییەوەلە ساڵی ١٩٦١ دا دەسەڵاتی گرتەدەست، بەڵام ئەو ئەم کارەی لە کۆمەڵگایەك دا ئەنجامدا کە بەتوندی لە لایەن ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە پشتگیریدەکرا و خاوەنی ئابوورییەك بوو کە دەزگا ئابوورییەکانی بەشێوەیەکی بەرچاو کراوەبوون. هەرچەندە ڕژێمەکەی پارك ئەسۆریتاری بوو، بەڵام هەستی بە جێگیرییەکی وا دەکرد کە برەوبدا بە گەشەکردنی ئابووری و لە ڕاستیدا ئەمەی زۆر چالاکانە ئەنجامدا ـ ڕەنگە تا ڕادەیەك هۆکاری ئەم گەشەکردنە ئەوە بووبێ کە ڕژێمەکە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پشتی بە دەزگای ئابووری چەوسێنەر نەدەبەست. جیاواز لە یەکێتی سۆڤیەت و حاڵەتەکانی تری گەشەکردن لە سایەی دەزگا چەوسێنەرەکان دا، باشووری کۆریا لە ساڵانی ١٩٨٠ کان دا لە دەزگایانی سیاسی چەوسێنەرەوە گواستیەوە بەرەو دەزگایانی سیاسی کراوە. ئەم گواستنەوە سەرکەوتوە بەهۆی کۆمەڵێك فاکتەرەوە ڕوویدا.

بە هاتنی ساڵانی ١٩٧٠ کان دەزگا ئابوورییەکانی باشووری کۆریا بە ئەندازەیەکی وا کرانەوە کە بوونە هۆی کەمکردنەوەی یەکێك لە ڕاشناڵە بەهێزەکانی بوونی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر- نوخبەی ئابووری قازانجێکی ئەوتۆی لە باڵادەستی خۆی یان سوپا لە سیاسەت دا نەدەکرد. یەکسانی ڕێژەیی داهات لە باشووری کۆریا ئەوەی دەگەیاند کە نوخبە کەمتر لە پلورەلیزم و دیموکراسی بترسن. لە لایەکی ترەوە، کاریگەری گەورەی ویلایەتە یەکگرتوەکان، بەتایبەتی بەلەبەرچاوگرتنی هەڕەشەی باکووری کۆریا، مانای وابوو کە بزووتنەوەی بەهێزی دیموکراسی کە تەحەدای دیکتاتۆریەتی سەربازی

دەکرد نەتوانرێ بۆ ماوەیەکی زۆر سەرکوتبکرێ. هەرچەندە کوشتنی جەنەڕاڵ پــارك لــە ســاڵی ١٩٧٩ دا کۆدێتایــەکی تــری ســەربازی بــەدوادا هــات بــە سەرکردایەتی چۆن دوو هۆن، ڕۆی تـەی وو، کـە لـە لایـەن چـۆن وەك سـەرۆك دیاریکرا، دەستی بە پرۆسەی چاکسازی سیاسی کرد و بوە هۆی بنج داکوتـانی دیموکراسـی لـە دوای سـاڵی ١٩٩٢. بێگومـان گواسـتنەوەیەکی لـەم جـۆرە لـە یەکێتی سۆڤیەت دا ڕوویندا. لە ئەنجامدا، گەشەکردنی سـۆڤیەت تـێن وگـوڕی خاوبۆوە و ئابوورییەکەی لە ساڵی ١٩٨٠ کان دا بەرەو ڕمان ڕۆشـت و لـە ١٩٩٠ ەکان دا بە تەواوی هەرەسیهێنا.

گەشەکردنی ئەمڕۆی ئابووری چین لە چەندین ڕووەوە هاوشێوەی ئەزموونی یــەکێتی ســۆڤیەت و باشــووری کۆریایــە. لــە کاتێکــدا پێــشەنگی قۆناخــە سەرەتاییەکانی گەشەکردنی ئابووری چین بریتیبوو لە چاکسازی ڕیشەیی بـازاڕ لە سێکتەری کشتوکاڵ دا، چاکسازی لە سێکتەری پیشەسازی دا زۆر هێواش تر بوو. تەنانەت ئەمڕۆش، دەوڵەت و حیزبی کۆمیۆنیست ڕۆڵی ناوەندی دەبینن لە بڕیاردان لەسەر ئەوەی کام سێکتەر و کام کۆمپانیا سەرمایەی زیاتر وەربگرن و بواری گەورەبوونیان پێبـدرێ ـ لـەم پرۆسـەیەش دا قـازانج یـان زیـانی گـەورە بکـەن. هـەروەك لـە یـەکێتی سـۆڤیەت دا لـە هـەرەتی دەسـەڵاتی دا، چـین بـە خێرایـی گەشــەدەکا، بــەڵام ئەمــە هێــشتا گەشــەکردنێکە لــە ســایەی دەزگــا چەوسێنەرەکان دا و لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەت دا ڕوودەدا و ئامارژەیەکی کەمیش لە ئارادایە بۆ گواسـتنەوە بـەرەو دەزگایـانی سیاسـی کـراوە. ڕاسـتی ئـەوەی دەزگا ئابوورییەکانی چین تا ئێستاش دوورن لـە دەزگـای کـراوەی تـەواو ئـەوە پێـشنیاز دەکـەن کـە گواسـتنەوەیەکی هاوشـێوەی ئـەوەی باشـووری کۆریـا ئەگەری ڕوودانی لاوازە، هەرچەندە بێگومان مەحاڵ نییە.

گرنگە ئەوە بزانین کـە مەرکەزیـەتی سیاسـی کلیلـی ئـەو دوو ڕێگایەیـە کـە بەهۆیانەوە گەشەکردن لە سایەی دەزگای سیاسی چەوسێنەردا دەشێ ڕووبـدا. بەبێبوونی ئەندازەیەك لە مەرکەزیەتی سیاسی، نوخبە چێنەرەکەی بەربەیدۆز و کوبا و هایتی و جامایکا نەیاندەتوانی یاسا و ئاسـایش بـسەپێنن و بـەرگری لـە موڵـك و سـەرمایەکانیان بکـەن. بـەبێبوونی مەرکەزیـەتی سیاسـی بەرچـاو و کۆنترۆڵکردنی توندی دەسەڵاتی سیاسی، نوخبە لـە باشـووری کۆریـا و حیزبـی کۆمیۆنیـستی چـین ئەوەنـدە هەسـتیان بـە جـێگیری نـەدەکرد تـا چاکـسازی ئابووری گرنگ ئەنجامبدەن و لە هەمانکاتیـشدا بەردەوامیبـدەن بـە دەسـەڵاتی

سیاسی خۆیان. بەبێبوونی مەرکەزیـەتێکی لـەم چەشـنە، دەوڵـەت لـە یـەکێتی سۆڤیەت و چین نەیانـدەتوانی هەماهـەنگی لـە نێـوان چالاکیە ئابوورییـەکان دا دروســـتبکەن و دەرامەتـــەکان بـــەرەو ســـێکتەرە بەرهەمـــدارە زۆرەکـــان ئاراستەبکەن. لەبـەر ئـەوە هێڵـی جیاکـەرەوەی سـەرەکی لـە نێـوان دەزگـا سیاسـییە چەوسـێنەرە جیاوازەکـان دا بریتییـە لـە ئەنـدازەی مەرکەزیـەتی سیاسـییان. ئـەو دەزگایانـەی مەرکەزیـەتی سیاسـییان نییـە، وەکـو زۆربـەی ئەوانەی وولاتانی باشووری بیابانی ئەفەریقا، زۆر زەحمەت ئەبێ بۆیان تەنانەت گەشەکردنی سنوورداریش ئەنجامبدەن.

هەرچـــەندە دەزگـــا چەوســـێنەرەکان دەتـــوانن هەنـــدیك گەشـــەکردن ئەنجامبدەن، بەڵام ناتوانن گەشـەکردنی ئـابووری بـەردەوام ئەنجامبـدەن و بـە دڵنیاییەوە ناتوانن ئەو جـۆرە گەشـەکردنە ئەنجامبـدەن کـە تێکدانی بنیاتنـەر لەگـەڵ خـۆی دا دەهێنـێ. کاتێـك هـەردوو دەزگایـانی سیاسـی و ئـابووری چەوسێنەر دەبن، هیچ هاندانێك بۆ تێکدانی بنیاتنـەر و گۆڕانکـاری تەکنـەلۆجی لە ئارادا نابێ. ڕەنگە دەوڵەت بتوانێ بۆ ماوەیـەك گەشـەکردنی ئـابووری خێـرا ئەنجامبدا لە ڕێگەی فەرمانکردن بۆ تەرخانکردنی دەرامەت و هێزی کـار، بـەڵام ئەم پرۆسەیە لە جەوهەردا سنوورداره. کاتێك دەگاتە ئەو سنوورە، گەشەکردن دەوەستێ، هـەروەك لـە یـەکێتی سۆڤیەت لـە ١٩٧٠ کـان دا ڕوویـدا. تەنانـەت کاتێـك سـۆڤیەتیەکان توانیـان گەشـەکردنی ئـابووری خێـرا بەدەسـتبهێنن، گۆڕانکـاری کـەمی تەکنـەلۆجی لـە زۆربـەی بوارەکـانی ئـابووری دا ڕوویـدا، هەرچـەندە بـە تـەرخانکردنی دەرامـەتی گـەورە بـۆ بـواری سـەربازی توانیـان تەکنەلۆجی عەسکەری پەرەپێبدەن و تەنانەت لە بواری کێبڕکێی فەزا و نـاوکی دا بـۆ ماوەیـەکی کـورت پـێش ویلایەتـە یـەکگرتوەکان بکەونـەوە، بـەڵام ئـەم گەشەکردنە بەبێ تێکدانی بنیاتنەر و بـەبێ نوێکـاری بنکـەفراوانی تەکنـەلۆجی نەتوانرا بەردەوامی پێبدرێ و لە ناکاو وەستا.

جگە لەمانە، ئەو ڕێکخستنانەی لە سایەی دەزگایانی سیاسـی چەوسـێنەردا پشتگیری گەشـەکردنی ئـابووری دەکـەن، بـە پێـی سروشـتی خۆیـان، لاوازن ـ دەشێ تووشی ڕمـان ببن یـان بـە ئاسـانی تێکبـچن لـە ئـەنجامی ئـەو ململانـێ ناوخۆییەوە کە خـودی دەزگـا چەوسـێنەرەکان دروسـتیاندەکەن. لـە راسـتیدا، دەزگایانی ئابووری و سیاسی چەوسێنەر بۆخۆیان دروستکاری مـەیلی ململانـێ ناوخۆییـەکانن، چـونکە ئـەم دەزگایانـە دەبنـەهۆی چـڕکردنەوەی سـامان و

دەسەڵات لە دەستی نوخبەیەکی کەم دا. ئەگەر گروپێکی تر بتوانێ بەسەر ئەم نوخبەیەدا زاڵ بێ و کۆنترۆڵی دەوڵەت بکا، ئەوا ئەم گروپە سوود لەو سامان و دەسەڵاتە وەردەگرێ. لە ئەنجامدا، هەروەك گفتوگۆکانمان دەربارەی ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما و شارەکانی مایا ڕوونیدەکەنەوە، شەڕی کۆنترۆڵکردنی دەوڵەتی بەهێز هەمیشە لە بۆسەدا خۆی شاردۆتەوە و ناو بەناو خەستدەبێتەوە و دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ئەم ڕژێمانە، هەروەك چۆن بەرەو جەنگی ناوخۆ وەردەچەرخێ و هەندێجاریش دەبێتە هۆی پەککەستن و ڕمانی دەوڵەتەکە. ئاکامێکی ئەمەش بریتییە لەوەی کە تەنانەت ئەگەر کۆمەڵگایەك لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا لە سەرەتادا ئەندازەیەك مەرکەزیەتی دەوڵەت بەدەستبهێنێ، ئەو مەرکەزیەتە بەردەوامنابێ. لە ڕاستیدا، ململانێی ناوخۆ بۆ دەستگرتن بەسەر دەزگا چەوسێنەرەکان دا زۆرجار دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی ناوخۆ و ئاژاوەی بەربڵاو و بزربوونی بەردەوامی مەرکەزیەتی دەوڵەت، هەروەك چۆن لە ناو چەندین نەتەوەی وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا و هەندێك نەتەوانی ئەمەریکای لاتین و باشووری ئاسیا دا ڕوودەدا.

لە کۆتایی دا، کاتێك گەشەکردن لە سایەی دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەکان دا ئەنجامدەدرێ بەڵام دەزگا ئابوورییەکان سروشتی کراوەیان هەیە، هەروەك لە باشووری کۆریا دا ڕوویدا، هەمیشە ئەو مەترسیە لە ئارادایە کە دەزگا ئابوورییە کان ببنە دەزگای چەوسێنەر و گەشەکردن بوەستێ. ئەوانەی کۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسی دەکەن لە ئەنجامدا بۆیان دەردەکەوێ کە قازانجی زیاتر دەکەن ئەگەر دەسەڵاتەکەی خۆیان بەکاربهێنن بۆ سنووردارکردنی کێبڕکێکردن و پشکیان لە کێکەدا زیادبکەن و تەنانەت خەڵکی تر تاڵان بکەن و دزییان لێبکەن، لە بری ئەوەی پشتگیری گەشەکردنی ئابووری بکەن. دابەشکردنی دەسەڵات و توانای بەکارهێنانی دەسەڵات لە کۆتایی دا بناخەکانی خۆشگوزەرانی ئابووری دەهەژێنن، ئەگەر دەزگا سیاسییەکان لە دەزگایانی چەوسێنەرەوە نەگۆڕێن بۆ دەزگایانی کراوە.

## ٤

# جیاوازییە بچووکەکان و وەرچەرخانە مێژووییەکان: قورسایی مێژوو

### ئەو جیهانەی تاعون دروستیکرد

لە ساڵی ١٣٤٦ دا تاعونی ڕەش، یان مردنی ڕەش، گەیشتە مینای شاری تانا لە زاری ڕووباری دۆن لەسەر دەریای ڕەش. تاعونەکە لە ڕێگەی ئەو کێچانەوە کە لەسەر جرج دەژین بۆ مرۆڤ گوێزرایەوە و لە چینەوە بەهۆی ئەو بازرگانانەی لە ڕێگەی ئاوریشم دا کاریاندەکرد کە شاخوێنبەری بازرگانی ئاسیا بوو، تەشەنەیکرد. لە ڕێگەی بازرگانانی جێنوەوە، جرجەکان هەر زوو تاعونەکەیان لە تاناوە بۆ دەریای ناوەڕاست بڵاوکردەوە. لە سەرەتای ١٣٤٧ دا تاعونەکە گەیشتە کۆنستەنتینۆپڵ. لە بەهاری ١٣٤٨ دا لە فەڕەنساو باکووری ئەفریقادا بڵاو بۆوە و گەیشتە ئیتالیا. تاعونەکە نیوەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیەی لەناودەبرد کە تیایدا بڵاودەبۆوە. گەیشتنی تاعونەکە بۆ شاری فلۆڕەنسی ئیتالی لە لایەن نووسەری ئیتالی، جیۆڤانی بۆکاکشۆ، چاودێریکرابوو، دواتر دەگێڕێتەوە:

*(لەبەردەم شاڵاوی تاعونەکەدا، دانایی و لێهاتوویی پیاو دەستەوسان بوون ... تاعونەکە بە شێوەیەکی ترسناک و سەیر دەستیپێکرد تا کاریگەرییە وێرانکارەکانی خۆی پیشانبدا. بەو شێوازە دەرنەکەوت کە لە ڕۆژهەڵات دا دەرکەوتبوو، کە هەرکەسێك خوێنی لووتی بەربوایە، ئەوا ئەوە نیشانەی مردنی مسۆگەر بوو. بە پێچەوانەوە، نیشانە سەرەتاییەکانی بریتیبوون لە دەرکەوتنی هەندێك ئاوساویی لە بنڕان و بنشان دا، و هەندێك لەو ئاوساویانە لە شێوەی هێلکە و ئەوانی تر بە قەبارەی سێوێکی ئاسایی بوون. دواتر*

*نیشانەکانی نەخۆشییەکە دەگۆڕان و خەڵکێکی زۆر قوونێر و درزی ڕەشیان لەسەر باڵ و ڕان و بەشەکانی تری لەشیان دەبینی ... بەرامبەر بەم دەردە... هەموو ئامۆژگاری پزیشك و هەموو هێزی دەرمانەکان بێسوود و دەستەوستان بوون ... لە زۆربەی حاڵەتەکان دا، نەخۆشەکان لەدوای سێ ڕۆژ لە دەرکەوتنی ئەو نیشانانەی باسمانکردن، دەمردن).*

دانیشتوانی ئینگلتەرە دەیانزانی تاعونەکە بەرەو لای ئەوان دێ و زۆر باش ئاگاداری ئەو مردنە چاوەڕێکراوەبوون. لە ناوەڕاستی ئابی ١٣٤٨ دا، ئێدواردی سێیەم، پاشای ئینگلتەرە داوای لە سەرۆکی قەشەکان کرد تا نوێژ و پاڕانەوە ڕێکبخا و چەندین ئەساقفە نووسراویان بۆ قەشەکان نارد تا لە کڵێسەکان دا بیانخوێننەوە بۆ ئەوەی بەرگەی ئەوە بگرن کە خەریکە تووشی دەبن. ڕاڵف شرۆسبێری، بیشۆپی شاری باس، بۆ قەشەکانی نووسی:

*(خوای گەورە هەورە گرمە و بروسکە و لێدانەکانی تر بەکاردەهێنێ کە لە تەختی خۆیەوە دەردەچن تا ئەو ڕۆڵانەی دەیەوێ ڕزگاریان بکا تووشی بەلا بکا. بەم شێوەیە، لە کتێك دا تاعونێکی کارەساتاوی لە ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتۆتە پاشایەتییەکی دراوسێ، دەبێ زۆر جێگای مەترسی بێ و ئەگەر بە پەرۆش و لێبڕانەوە نوێژ نەکەین ئەوا تاعونی هاوشێوە باڵی ژەهراوی خۆی بەسەر ئەم خاکەشدا دەکێشێ و دانیشتوان لەناودەبات. بۆیە پێویستە هەموومان بە پاکانە و ووتنی سروود لە حزووری خودادا بین)*

ئەمە هیچ سوودێکی نەبوو. تاعونەکە هات و بەخێرایی نزیکەی نیوەی دانیشتوانی ئینگلتەرەی لەناوبرد. ئەم جۆرە بەڵایانە کاریگەری گەورەیان لەسەر دەزگایانی کۆمەڵگا دەبێ. ڕەنگە لەوە تێبگەین کە کەسانێکی زۆر شێ بوون. بۆکاکشۆ تێبینیکرد کە *(هەندێك لایانوابوو باشترین ڕێگا بۆ دوورخستنەوەی ئەم بەلا شەیتانیە لەخۆیان بریتیبوو لە خواردنەوەی بەردەوام و چێژوەرگرتنی تەواو لە ژیان وگەڕان وگۆرانی ووتن و ڕابواردن هەر کاتێك بۆیان لوا تێرکردنی ئارەزووەکان وگوێ نەدەنە ئەم شتە وگاڵتەی پێبکەن ... هەر ئەمەش شرۆڤەی ئەوە دەکا کە بۆچی دوای نەخۆشیەکە پاکیزەیی لە ناو ئەو ژنانەی چاك بوونەوە کەمتر بوو)*. لەگەڵ ئەمەش دا، تاعونەکە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەوە کاریگەریەکی ئاڵوگۆڕکاری هەبوو لە سەر کۆمەڵگاکانی ئەورووپای چاخەکانی ناوەڕاست.

لە دوا ساتەکانی سەدەی چواردەیەم دا، ئەوروپا خاوەنی سیستەمی فیودالّی بوو، کە جۆرە ڕێکخستنێکی کۆمەڵگا بوو بۆ یەکەمجار لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا دوای لەناوچوونی ئیمراتۆریەتی ڕۆما سەریهەڵدا. ئەم سیستەمە لەسەر بنەمای پەیوەندی پلەبەندی هەرەمی دامەزرابوو لە نێوان پاشا و ئەو لۆردانەی لە خوار ئەوەوە بوون و ڕەنجدەرانیش لە بنی هەرەمەکەدا بوون. پاشا خاوەنی زەوییەکان بوو کە بەرامبەر خزمەتی سەربازی دەیبەخشیە لۆردەکان. لۆردەکانیش زەوییەکانیان دەدایە ڕەنجدەران و لەبەرامبەردا دەبوایە ڕەنجدەران بە بەبێ پارە و بە شێوەیەکی بەردەوام کاریانبکردایە و ڕووبەڕووی چەندین شیوازی باج و سەرانە دەبوونەوە. لە بەر پێگە بەندەییەکەیان بەم ڕەنجدەرانە دەوترا بەندە. ئەمانە بە زەوییەکانەوە بەسترابوونەوە و نەیاندەتوانی بەبێ ڕەزامەندی لۆردەکانیان بۆ هیچ جێگەیەك بچن. ئەم لۆردانەش تەنیا خاوەن زەوی نەبوون، بەڵکو لە هەمانکات دا دادوەر و دەستەی سوێندخۆران و هێزی پۆلیسیش بوون. ئەم سیستەمە یەکجار چەوسێنەر بوو کە تیایدا سامان بەرەو سەرەوە دەڕویشت، لە ژمارەیەکی زۆری ڕەنجدەرەوە بۆ ژمارەیەکی کەمی لۆردەکان.

کەمبوونەوەی گەورەی ژمارەی کرێکاران بەهۆی تاعونەکەوە، بناخەکانی سیستەمی فیودالّی هەژاند. ئەمەش هانی ڕەنجدەرانی دا تا داوای گۆڕانکاری بکەن. لە ئینشام ئەبی، بۆ نموونە، ڕەنجدەران داوایانکرد بەشێکی زۆر لە سەرانە و کارکردنی خۆڕایی کەمبکرێنەوە. ئەوەی ویستیان بەدەستیانهێناو گرێبەستە نوێکەیان بە ڕوونی تیایدا هاتبوو (لەکاتی ئەو مردن و تاعونەی لە ساڵی ١٣٤٩ دا ڕوویاندا، تەنیا دوو کرێکار لە مانۆرەکەدا مابوونەوە و ئەوانیش بەتەمای ڕۆیشتن بوون، ئەگەر برا نیکۆلاسی ئەپتن و کە دواتر بوە باوك، و لۆردی مانۆرەکە گرێبەستێکی نوێیان لەگەڵ دا مۆر نەکردنایە) ئەو گرێبەستەکەی لەگەڵ دا مۆرکردن.

ئەوەی لە ئینشام ڕوویدا لە هەموو جێگایەك ڕوویدا. ڕەنجدەران کەوتنە خۆ قوتارکردن لە ئەنجامدانی کاری زۆرەملێ و بەشێکی زۆر لەو بێگارانەی لە لایەن لۆردەکانیانەوە خرابوە سەر شانیان. کرێ کەوتە بەرزبوونەوە. حکومەت هەوڵی دا ئەمە بوەستێنێ و لە ساڵی ١٣٥١ دا یاسای کرێکارانی دەرکرد، کە بەم شێوەیە دەستپێکرد:

*(لەبەر ئەوەی بەشێکی زۆری دانیشتوان بەتایبەتی کرێکاران و خزمەتکاران لە تاعونەکەدا مردن، هەندێك کەس، دادپەروەری خودانەکانیان و کەمی خزمەتکارانیان قۆزتۆتەوە و نایانەوێ خزمەتبکەن ئەگەر کرێی لەڕادەبەدەر وەرنەگرن ... ئێمە، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ناهەموارییە گەورەیەی کە ڕەنگە بەهۆی کەمی، بەتایبەتی ڕەنجدەران و ئەم کرێکارانەوە پەیدابێ، وامان بە باش زانی بڕیاربدەین: کە هەموو پیاو و ئافرەتێکی پاشایەتییەکەمان لە ئینگلتەرە پێویسە خزمەتی (خودانەکەی) بکا، ئەگەر خودانەکەی پێویستی بە خزمەتی ئەو بوو، ئەویش تەنیا ئەو کرێ یان پۆشاك یان پاداشت یان موچەیە وەردەگرێ کە بیست ساڵ دوای دانیشتنمان لەسەر تەختی ئینگلتەرە لەو شوێنەی ئەو خزمەتی تێدادەکا ( ئێدوارد پاشای سێیەم لە ٢٥ کانونی دووەمی ١٣٢٧ دا هاتەسەرتەخت، کەواتە ساڵی مەبەست لێرەدا ساڵی ١٣٤٧ ە) یان پێنج یان شەش ساڵ پێشتر، باو بوە بدرێ).*

ئەم یاسایە هەوڵی دا کرێکان، لە ئاستی کرێکانی پێش مردنی ڕەش جێگیر بکا. ئەوەی بەتایبەتی جێگەی نیگەرانی نوخبەی ئینگلیزی بوو، بریتیبوو لە "فریودان" کە ئەویش بریتیبوو لە هەوڵدانی لۆردێك بۆ ڕاکێشانی ڕەنجدەرە کەمەکانی لۆردێکی تر. چارەسەری ئەمەش بریتیبوو لە سەپاندنی سزای بەندکردن بەسەر هەموو ئەوانەی بەبێ ڕەزامەندی خاوەن کارەکەیان شوێنی کارکردنیان بەجێدەهێشت:

*(هەر ڕەنجدەرێك یان چیمەنبڕێك، یان هەر کرێکارێکی تر، یان خزمەتکارێك، لە هەر پێگەو بارودۆخێکدا بێ، کار بۆ هەر کەسێك بکا، پێش ئەوەی ماوەی کارکردنەکەی تەواوبێ بەو شێوەیەی لەسەری ڕێکەوتون، بەبێ ڕەزامەندی خاوەن کارەکە یان پاساوێکی گونجاو، ئەو کارەی بەجێبهێڵێ، ئەوا ئەو کەسە تووشی سزای بەندکردن دەبێ و نابێ هیچ کەسێك ... بۆخۆی یان بوار بداە کەسێکی تر کرێی زیاتر یان پۆشاك یان پاداشت بداە هەر کەسێکی تر زیاتر لەوەی باو بوە بەو شێوەیەی باسکرا).*

هەوڵەکانی دەوڵەتی ئینگلیز بۆ ڕێگرتن لە گۆڕینی دەزگاکان و کرێکان کە لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی مردنی ڕەش سەریهەڵدا، شکستیانهێنا. لە ساڵی ١٣٨١ دا شۆڕشی ڕەنجدەران دەستیپێکرد و یاخیبوان بەسەرکردایەتی وات تایلەر، تەنانەت زۆربەی لەندەنیان داگیرکرد. هەرچەندە سەرەنجام ئەوان

تێشکێنران و تایلەر لـە سێدارەدرا، بـەڵام هـیچ هـەوڵێکی تـر نـەدرا تـا یاسـای کرێکاران پیادەبکرێ. شێوازی کاری فیودالّی بەرەبەرە بەرەو نـەمان ڕۆیـشت و بازاڕێکی زیاتر کراوەی هێزی کار لە ئینگلتەرە دا سەریهەڵدا و کرێکـان زیادیـان کرد.

پێدەچـێ تاعونەکـە زۆربـەی ناوچـەکانی دنیـای گرتبێتـەوە و لـە هـەموو شوێنێکیـشدا هەمانـشێوە لێکترازانـی دانیـشتوانی دروسـتکردبێ. کاریگـەری دیمۆگرافی تاعونەکە لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات دا هەمانشێوەی کاریگەری بـوو لـە ئینگلتـەرە و ئـەورووپای ڕۆژئـاوادا. لـە هـەمانکات دا، ئـەو هێـزە کۆمەڵایـەتی و ئابوورییانەی باڵادەست بوون لە هەردوو لا وەك یـەك بـوون. هێـزی کـار کـەم و خەڵك داوای ئازادی زیاتریان دەکرد. بەڵام لە ڕۆژهـەڵات دا لـۆجیکێکی نـاکۆکی بەهێز لە کاردا بوو. لە بازاڕی کراوەی هێزی کاردا، کەمی ژمارەی خـەڵك مانـای بەرزبوونەوەی کرێی دەگەیاند، ئەمـەش هانـدانی زیـاتری دەدایـە لۆردەکـان تـا بازاڕەکانی هێزی کار چەوسێنەر تر بکەن و ڕەنجدەرەکان زیاتر بچەوسێننەوە. لە ئینگلتەرەش دا ئەم مۆتیڤە لـە کـاردا بـوو هـەروەك لـە یاسـای کرێکـاران دا ڕەنگیدایەوە. بەڵام کرێکاران هێندە هێزیان هەبوو کە توانییان ئەوەی ویستیان بیبەنەسەر. بەڵام لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات دا بەو شێوەیە نەبوو. دوای تاعونەکە، لـۆردە خـاوەن زەوییـەکانی ئـەورووپای ڕۆژهـەڵات دەسـتیانکرد بـە دەسـتگرتن بەسەر ڕووبەرێکی زۆری زەوی و فراوانکردنی موڵکەکانیان کە هەر لە سەرەتاوە زیاتر بوون لەوانەی کە لۆردەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا هەیانبوو. شـاران لاوازتـر و دانیشتوانی کەمتریان تێدا بوو، لەبری ئەوەی سەربەستییان زیاتر بێ، کرێکاران بینیان ئەو سەربەستییانەی ئەو کاتە هەیانبوو، بەرتەسك دەبێتەوە.

کاریگەرییەکان، بەتایبەتی لە دوای ساڵی ١٥٠٠ وە زیاتر دەرکـەوتن، کاتێـك داخوازی ئەورووپای ڕۆژئاوا بۆ بەروبومی کشتوکاڵی وەکو گەنم و حـەوینج (rye) و ئاژەڵ کە لەڕۆژهەڵات دا بەرهەمدەهێنران، زیاتر بوو. ٪٨٠ ی ئەو حەوینجەی هاوردەدەکرا بۆ ئەمستەردام، لە دۆڵی ڕووبارەکـانی ئێلـب و ڤیـسچولا و ئـۆدێر بەرهەمـدەهێنران. نیـوەی بازرگـانی برەوسـەندووی ئەمـستەردام، لەگـەڵ ئـەورووپای ڕۆژهـەڵات دا بـوو. بـە فراوانبـوونی داخوازییـەکانی ڕۆژئـاوا، لـۆردە زەویدارەکانی ڕۆژهـەڵات دەسـەڵاتی خۆیـان بەسـەر هێـزی کـاردا زیـاترکرد بـۆ ئـەوەی کەلوپـەلی زیـاتر دابینبکـەن. ئەمـە پێیـدەوترا بەندایـەتی دوەم کـە لـە

شێوازە کۆنەکەی سەرەتای چاخەکانی ناوەڕاست جیاواز و قورس تر بوو. لۆردەکان ئەو باجانەیان زیادکرد کە خستبویانە سەر پارچە زەوی ڕەنجدەرەکان و نیوەی بەروبومەکانیان بۆخۆیان دەبردن. لە کۆرتزین لە پۆلۆنیا لە ساڵی ١٥٣٣ دا هەموو ئەو کارانەی بۆ لۆرد دەکرا بە پارە بوو، بەڵام بە هاتنی ساڵی ١٦٠٠ نیوەی ڕەنجدەرەکان بە زۆر و بەبێ پارە کاریان پێدەکرا. لە ساڵی ١٥٠٠ دا کرێکارانی مەکلێنبێرگ لە ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا تەنیا چەند ڕۆژێك لە ساڵێکدا بەبێ پارە کاریاندەکرد، بە هاتنی ساڵی ١٥٥٠، ئەو ڕۆژانەی بێپارە کاریاندەکرد بریتیبوو لە ڕۆژێك لە حەفتەیەك دا و لە ساڵی ١٦٠٠ دا سێ ڕۆژ لەحەفتەیەك دا. منداڵانی کرێکاران دەبوایە بۆ چەندین ساڵ بە خۆڕایی کاریان بۆ لۆردەکان بکردایە. لە هەنگاریا، لۆردە زەویدارەکان لە ساڵی ١٥١٤ دا بەتەواوی دەستیان بەسەر زەوییەکان دا گرت و بە یاسا ئەوەیان چەسپاند کە پێویستە هەر کرێکارێك حەفتەی یەك ڕۆژ بە خۆڕایی کار بۆ لۆردەکەی بکا. لە ساڵی ١٥٥٠ دا ئەمە زیادکرا بۆ دوو ڕۆژ لە حەفتەیەك دا و لە کۆتایی سەدەکەدا بوە سێ ڕۆژ لە حەفتەیەك دا. لەو سەردەمەدا ئەو بەندانەی ئەم یاسایانە دەیانگرتنەوە ٪٩٠ ی دانیشتوانی گوندنشینەکانی پێکدەهێنا.

هەرچەندە لە ساڵی ١٣٤٦ دا چەند جیاوازییەکی کەم لە ڕووی دەزگایانی ئابووری و سیاسی لە نێوان ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا هەبوو، بە هاتنی ساڵی ١٦٠٠ دنیایەك لە یەکتر دووربوون. لە ڕۆژئاوا کرێکاران لە قەرز و سەرانەو ڕێساکان ڕزگاریان بوو، بوونە بەشی سەرەکی برەوی ئابووری بازاڕ. لە ڕۆژهەڵاتیشدا کرێکاران لەم برەوسەندنەدا بەشداربوون، بەڵام وەك بەندەی ناچارکراو بۆ بەرهەمهێنانی ئەو کاڵایانەی لە ڕۆئاواوە داوادەکران. ئابووری ئەوانیش ئابووری بازاڕ بوو، بەڵام کراوە نەبوو. ئەم لێکدوورکەوتنەوە دەزگاییە ئەنجامی بارودۆخێك بوو کە جیاوازی لەنێوان ئەم ناوچانەدا لەسەرەتادا زۆر بچووك بوو: لە ڕۆژهەڵات لۆردەکان کەمێك باشتر خۆیان ڕێکخستبوو، ئەوان کەمێك زیاتر مافیان هەبوو، خاوەن زەویوزاری زۆر بوون. شاران لاوازترو بچووك تر بوون، ڕەنجدەران لاوازتر بوون لە ڕێکخستنی خۆیان دا. لە نەخشە گەورەکەی مێژوودا، جیاوازی بچووك لە نێوانیان دا هەبوو. لەگەڵ ئەمەش دا، ئەم جیاوازییە بچووکانەی نێوان ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات زۆر چارەنوسازبوون بۆ ژیانی دانیشتوانەکانیان و بۆ ڕێچکەی داهاتووی پەرەپێدانی دەزگایی کاتێك

سیستەمی فیودالّی بەهۆی مردنی ڕەشەوە هەژا.

مردنی ڕەش نموونەیەکی زیندوی وەرچەرخانی مێژووییە، ڕووداوێکی سەرەکی یان یەکگرتنی ئەو فاکتەرانەی دەبنە هۆی تێکدانی ئەو هاوسەنگیە سیاسییەی لە ناو کۆمەڵگایەك دا هەیە. وەرچەرخانی مێژوویی شمشێرێکی دوو سەرەیە کە دەبێتە هۆی وەرچەرخانێکی تیژ لە ڕێڕەوی نەتەوەیەکدا. لەلایەکەوە، دەتوانێ ڕێگا خۆشکاری پچڕاندنی بازنەی دەزگا چەوسێنەرەکان بێ و ڕێگا خۆشکاری سەرهەڵدانی دەزگایانی زیاتر کراوە بێ، هەروەك لە ئینگلتەرە دا ڕوویدا. یان دەتوانێ سەرهەڵدانی دەزگایانی چەوسێنەر چڕتر بکاتەوە، هەروەك ئەو حاڵەتەی لە کاتی بەندایەتی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا ڕوویدا.

تێگەیشتن لەوەی چۆن مێژوو و وەرچەرخانە مێژووییەکان ڕێچکەی دەزگایانی ئابووری و سیاسی دادەڕێژن، توانای ئەوەمان دەداتێ کە تیۆرییەکی تەواو تر دەربارەی بنچینەکانی هەژاری و دەوڵەمەندی دابڕێژین. جگە لەمە، توانای ئەوەمان دەداتێ کە چۆنیەتی باری زەوی تێبگەین و لەوەش بگەین بۆچی هەندێك نەتەوە بەرەو دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوە گواستنەوە ئەنجامدەدەن، لە کاتێك دا نەتەوانی تر ناتوانن ئەمە بکەن.

## دروستبوونی دەزگا کراوەکان

لە ناو نەتەوەکانی ئەو سەردەمەدا، ئینگلتەرە نەتەوەیەکی ناوازە بوو چونکە توانی لە سەدەی حەڤدەیەم دا گەشەکردنێکی ئابووری بەردەوام ئەنجامبدا. بەر لە گۆڕانکارییە ئابوورییە سەرەکییەکان لەو وولاتەدا، شۆڕشێکی سیاسی بەرپاکرابوو، کە بوە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێك دەزگای ئابووری و سیاسی جیاوازی ئەوتۆ کە زۆر کراوەتر بوون لە دەزگاکانی کۆمەڵگاکانی پێشوو تر. ئەم دەزگایانە کاریگەری یەکجار گەورەیان هەبوو نەك تەنیا بۆ هاندانە ئابوورییەکان و خۆشگوزەرانی، بەڵکو بۆ ئەوانەش کە سوودەکانی ئەم خۆشگوزەرانییەیان دەچنیەوە. ئەودەزگایانەش لە سەر بنەمای سازان دانەمەزرابوون، بەڵکو ئەنجامی ململانێی توندی گروپانی جیاواز بوون کە کەوتبوونە کێبڕکێ لە پێناوی بەدەستهێنانی هێز و بەرەنگاربوونەوەی

دەسـەڵاتی ئـەوانی تـر و هەوڵـدانیان بـۆ پێکهێنـانی دەزگاکـان بـە شـێوەیەك خزمـەتی بەرژەوەندییـەکانی ئـەوان بکـا. ئاکـامی ململانێکـان بـۆ پێکهێنـانی دەزگاکان لە سەدەکانی شازدەیەم وحەڤدەیـەم دا، دوو ڕووداوی گـرنگ بـوون: شـەڕی نـاوخۆی ئینگلتـەرە لـە سـاڵی ١٦٤٢ و ١٦٥١ و بەتایبـەتیش شۆڕشـی شکۆداری ساڵی ١٦٨٨ بوو.

شۆڕشی شکۆدار بوە هۆی سنووردارکردنی دەسـەڵاتی پاشـا و حکومـەت و دەسـەڵاتی دیـاریکردنی دەزگـا ئابوورییـەکانی گواسـتەوە بـۆ پەرلـەمان. لـە هـەمانکات دا، ئـەم شۆڕشـە سیـستەمی سیاسـی لەبـەردەم بەشـێکی زۆری کۆمەڵگادا کردەوە و توانیان کاریگەری بەرچاویان لەسەر شێوازی بەڕێوەبردنی دەوڵـەت دا هـەبێ. شۆڕشـی شـکۆدار بناخـەی کۆمەڵگایـەکی پلورەلیـستی دامەزراند و بوە هۆی دامەزراندن و خێراکردنی پرۆسەی مەرکەزیـەتی سیاسـی. ئەو شۆڕشە یەکەم کۆمەڵە دەزگای سیاسی کراوەی لە جیهان دا هێنایەئاراوە.

لە دەرئەنجامدا، دەزگا ئابوورییـەکان بـەرەو کرانـەوەی زیـاتر ڕۆیـشتن. نـە کۆیلەیەتی و نە ڕێگریە ئابوورییە توندەکانی فیوداڵیزمی سـەردەمی چـاخەکانی ناوەڕاست لە سـەرەتای سـەدەی حەڤدەیـەم دا لـە ئینگلتـەرە لـە ئـارادابوون. هەرچەندە چەندین ڕێگر لەبەردەم بەشداری خەڵك لە چالاکیە ئابوورییـەکان دا هـــەبوون. هـــەردوو ئـــابووری نـــاوخۆ و نێودەوڵـــەتی بـــەهۆی مۆنۆپۆڵیـــەوە خنکێنرابوون. دەوڵەت بە شێوەیەکی ڕەمەکی باجی دادەناو دەستی وەردەدایە سیـستەمی یاسـایی. زۆربـەی زەوییـەکان بـە شـێوازی کـۆنی مـافی موڵکـداری ڕێکخرابـوون، کـە فرۆشـتنیان مـەحاڵ و ئەنجامـدانی وەبـەرهێنان تیایانـدا مەترسـیداربوو. ئەمـە لـە دوای شۆڕشـی شـکۆدار گۆڕانکـاری بەسـەرداهات. حکومـەت کۆمـەڵێك دەزگـای ئـابووری ئـەوتۆی هێنایـەئاراوە کـە بوونـە هـۆی دەستەبەرکردنی هاندان بۆ وەبەرهێنان و بازرگانی ونوێکـاری. حکومـەت مـافی موڵکداری خستەگەڕ، لەو مافانەش مافی داهێنان کە بریتیبوو لە پێدانی مـافی خاوەنـدارێتی ئایـدیاکان، بەمـەش پـشتگیری گـەورەی نوێکاریکرد. حکومـەت توانی یاسا و ئاسایش بپارێزێ. لە ڕووی مێژووییـەوە لەوەبـەر ڕوویـنـەدابوو کـە یاسـای ئیگلیـزی بـە سـەر هـەموو هاوڵاتییـان دا جێبـەجێبکرێ. دانـانی بـاجی ڕەمـەکی وەسـتا، مۆنۆپۆلیـەکان نزیکـەی بـە تـەواوەتی نـەهێڵران. دەوڵـەتی ئینگلتـەرە لێبڕاوانـە کەوتـە بـرەودان بـە چـالاکیە بازرگانییـەکان و هـەوڵی دا

برەوبدا بە پێشەسازی ناوخۆیی، نەك تەنیا لەڕێگەی لابردنی بارستەكانی بەردەم فراوانبوونی چالاكیە پیشەسازییەكان، بەڵكو لە هەمانكات دا خستنەگەڕی هێزی تەواوی لەشكری دەریایی ئینگلتەرا بۆ پاراستنی بەرژەوندییە بازرگانییەكان. بە ڕێكخستنی مەنتیقیانەی مافی موڵكداری، حكومەت توانی ڕێخۆشكار بێ بۆ دروستكردنی ژێرخان بەتایبەتی ڕێگا و كەناڵ و دواتریش ڕێگای ئاسنین كە دەركەوت كاریگەری گەورەی هەبوو بۆ گەشەپێدانی پیشەسازی.

ئەم بنەمایانە بەشێوەیەكی بنەڕەتی هاندانی خەڵكیان گۆڕی و بزوێنەری خۆشگوزەرانیان خستەگەڕ و ڕێگاخۆشكار بوون بۆ شۆڕشی پیشەسازی. لە هەمووی گرنگتر، شۆڕشی پیشەسازی پشتی بەو پێشكەوتنە تەكنەلۆجییانە بەستبوو كە لەسەر ئەو بنەما زانیارییانە هەڵچنرابوون لەسەدەكانی ڕابووردودا لە ئەوروپادا بەدەستهاتبوون. ئەمەش دابڕانێكی ڕیشەیی بوو لە ڕابوردوو، كە بەهۆی لێكۆڵینەوەی زانستی و لێهاتوویی ژمارەیەك كەسانی تایبەتەوە هاتبوەئاراوە. هێزی گەورەی ئەم شۆڕشە لە بازاڕەوە سەرچاوەی گرتبوو كە لە ئەنجامی پەرەپێدان و بەكارهێنانی تەكنەلۆجییكانەوە دەرفەتی بەدەستهێنانی قازانجی ڕەخساندبوو. ئەوە سروشتی كراوەی بازاڕەكان بوو كارێكی وای كردبوو خەڵك بتوانن ئەو جۆرە كارانە هەڵبژێرن كە لەگەڵ تواناكانیان دا دەگونجێن. لە هەمانكات دا، ئەم شۆڕشە پشتی بە پەروەردە و لێهاتوویی دەبەست، چونكە ئاستی بەرزی پەروەردە، بەلایەنی كەمەوە بە پێی ستانداردی ئەو سەردەمە، بوە هۆی دەركەوتنی كەسانی كارزان. ئەمانە خاوەنی دیدی بەكارهێنانی تەكنەلۆجیای نوێ بوون بۆ بزنسەكانیان و هەوڵیان دا كرێكاری شارەزای وا بدۆزنەوە كە بتوانن ئەم تەكنەلۆجیایانە بەكاربهێنن.

ڕێكەوت نییە كە شۆڕشی پیشەسازی چەند دەیەیەك دوای شۆڕشی شكۆدار لە ئینگلتەرەوە دەستیپێكرد. داهێنەرە شكۆدارەكانی وەك جەیمس وات (داهێنەری بزوێنەری هەڵمی) و ڕیچارد تریڤیسیك (دروستكاری یەكەم شەمەنەفەری هەڵمی) و ڕیچارد ئاركڕایت (داهینەریئامێری جۆلایی) و ئیزامبارد كینگدەم برونێڵ (دروستكاری چەندین پاپۆڕی هەڵمی)، توانییان ئەودەرفەتە ئابوورییانە بقۆزنەوە كە بیرۆكەكەنیان ڕەخساندبوونی و دڵنیابوون كە مافی موڵكدارییان پارێزراو دەبێ و دەستیان دەگاتە ئەو بازاڕانەی كە دەتوانرا تیایان

دا داهێنانەکانیان بە قازانج بفرۆشرێن و بەکاربهێنرێن. لە ساڵی ١٧٧٥ دا دوای ئەوەی مافی داهێنانەکەی لەسەر بزوێنەری هەڵمی نوێکرایەوە کە بە (بزوێنەری ئاگر) ناویدەبرد، جەیمس وات نامەیەکی بۆ باوکی نووسی :

•

**ئازیزم بابە،**

*(دوای زنجیرەیەك بەرهەڵستی توند وجیاواز، لە کۆتایی دا لە پەرلەمانەوە یاسایەکم بۆ دەرچووکە من و ئەوانەی من دیارییان دەکەم کردە خاوەنی بزوێنەری ئاگرە نوێیەکەم و لە ناو هەموو بەریتانیای مەزن و کۆلۆنییەکانی بۆ ماوەی ٢٥ ساڵی داهاتوو، کە هیوادارم سوودێکی زۆری بۆ من هەبێ چونکە هەر ئێستا داخوازییەکی زۆر بۆ ئەم بزوێنەرانە هەیە).*

ئەم نامەیە دوو شت دەردەخا. یەکەم، وات، بەهۆی ئەو دەرفەتانەی چاوەڕێیدەکرد بازار بۆی بڕەخسێنێ لە ڕێگەی (داخوازییەکی زۆر) لە ناو بەریتانیای مەزن وکۆلۆنییەکانی ئینگلتەرا لەدەرەوە، هاندانی خرایە بەردەم. دوەم، ئەم نامەیە ئەوە دەردەخا کە ئەو چۆن توانیویەتی کاریکاتە سەر پەرلەمان بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی ویستویەتی، چونکە پەرلەمان ئامادەبوە گوێ بۆ داواکانی تاکەکان و نوێکاران بگرێ.

پێشکەوتنە تەکنەلۆجییەکان و هەوڵدانی بزنسەکان بۆ فراوانکردنی چالاکیەکانیان و ئەنجامدانی وەبەرهێنان و بەکارهێنانی بەهرە و تواناکان بە شێوەیەکی کارامە بەهۆی ئەو دەزگا ئابوورییە کراوانەوە هاتنەدی کە ئینگلتەرە توانی پەرەیانپێبدا. ئەمانەش بە دەوری خۆیان لەسەر بنەماکانی دەزگا سیاسییە کراوەکانی ئەم وڵاتە دامەزرابوون.

دوو فاکتەر بوونە هۆی ئەوەی ئینگلتەرە بتوانێ ئەم دەزگا سیاسییە کراوانە دابمەزرێنێ. فاکتەری یەکەم بوونی دەزگا سیاسییەکان بوو، لەوانە دەوڵەتێکی ناوەندی کە وایکرد ئینگلتەرە بتوانێ هەنگاوی ڕادیکاڵانە و لە ڕاستیشدا بێوێنە بەرەو دامەزراندنی دەزگا کراوەکان بنێ لە سەرەتای سەرهەڵدانی شۆڕشی شکۆدار دا. لە کاتێك دا ئەم فاکتەرە ئینگلتەرای لە زۆربەی وڵاتانی جیهان جیاکردەوە، بەڵام بەشێوەیەکی بەرچاو جیاینەکردەوە لە وڵاتەکانی ئەورووپای ڕۆژئاوای وەکو فەرەنساو ئیسپانیا. لەمەش گرنگتر، فاکتەری دوەم بوو. ئەو ڕووداوانەی بەر لە شۆڕشی شکۆدار ڕوویاندا

هاوپەیمانییەکی بەهێز و فراوانی دروستکرد کە توانی سنوورێکی خۆگر بۆ دەسەڵاتی پاشایەتی و حکومەت دابنێ کە ناچارکران گوێ لە داواکارییەکانی ئەم هاوپەیمانییە بگرن. ئەمەش بناخەی دەزگا سیاسییە پلورالسیتەکانی دامەزراند کە دواتر بوونە هۆی پەرەپێدانی ئەو دەزگا ئابوورییانەی بناخەی یەکەم شۆڕشی پیشەسازییان داکوتا.

## ئەو جیاوازییە بچووکانەی کە گرنگن

نایەکسانییەکانی جیهان بە شێوەیەکی بەرچاو لە ئاکامی شۆڕشی پیشەسازی بەریتانی یان ئینگلیزی دا زیادیان کرد، چونکە تەنیا هەندێک ناوچەی جیهان ئەم نوێکاری و تەکنەلۆجییە نوێیانەیان بەکارهێنا کە پیاوانی وەك ئارکرایت و وات و هەموو ئەوانەی تر کە دوای ئەوان هاتن، هێنایانەئاراوە. سوودوەرگرتنی نەتەوە جیاوازەکان لەم شەپۆلە تەکنەلۆجییانە، کە ئەوەی یەکلاییدەکردەوە ئایا ئەم نەتەوانە لە هەژاری دا دەتلێنەوە یان دەیانەوێ گەشەکردنی ئابووری بەردەوام ئەنجامبدەن، بە شێوەیەکی سەرەکی بەندبوو بە ڕێچکەی جیاوازی مێژوویی دەزگاکانیان. لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەم دا جیاوازی بەرچاو لە دەزگا سیاسی و ئابورییەکان لە جیهان دا پەیدابووبوو. بەڵام ئایا ئەم جیاوازییانە لە کوێوە سەرچاوەیان گرتبوو؟

دەزگا سیاسییەکانی ئینگلتەرە لە ساڵی ١٦٨٨ دا بە بەراوورد لەگەڵ دەزگا سیاسییەکانی فەرەنسا و ئیسپانیا بەرەو پلورەلیزمی زیاتر دەچوون، بەڵام ئەگەر ١٠٠ ساڵ بۆ دواوە و بۆ ساڵی ١٥٨٨ بگەڕێینەوە ئەوا جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوانیان دا نەبوو. هەموونەم وولاتانە بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە لایەن ڕژێمی پاشایەتی دەسەڵات ڕەهاوە فەرمانڕەواییدەکران: ئیلیزابێسی یەکەم لە ئینگلتەرا و فیلیپی دوەم لە ئیسپانیا و هێنری دوەم لە فەرەنسا. هەموویان لەگەڵ ئەنجومەنی هاوڵاتییان دا لە ململانێدا بوون ـ وەکو پەرلەمان لە ئینگلتەرا و کۆرتیز لە ئیسپانیا و ئیستەیت جەنەراڵ لە فەرەنسا ـ کە داوای مافی زیاتر و زیاتر کۆنترۆڵکردنی پاشایەتییان دەکرد. هەموو ئەم ئەنجومەنانە دەسەڵات و مەودای جیاوازیان هەبوو. بۆ نموونە، پەرلەمانی ئینگلیزی و

کۆرتیزی ئیسپانی دەسەلاتیان لە دیاریکردنی باج دا هەبوو لە کاتێک دا ئیستەیت جەنەڕاڵ ئەو دەسەلاتەیان نەبوو. ئەمە لە ئیسپانیا زۆر گرنگ نەبوو چونکە لە دوای ساڵی ١٤٩٢ تاجی ئیسپانی خاوەنی ئیمپراتۆریەتێکی گەورە بوو لە ئەمەریکا و سوودێکی یەکجار زۆریان لەو ئاڵتوون و زیوە وەردەگرت کە لە ئەمەریکادا دۆزیبویانەوە. بارودۆخەکە لە ئینگلتەرە جیاواز بوو. ئیلیزابسی یەکەم لە ڕووی داراییەوە سەربەخۆیی زۆر کەمتربوو، بۆیە دەبوایە لە پەرلەمان بپاڕایەوە بۆباجی زیاتر. لە بەرامبەر ئەمەدا پەرلەمان داوای تەنازولی زیاتری دەکرد بەتایبەتی سنووردارکردنی مافی ئیلیزابس بۆ دروستکردنی مۆنۆپۆڵی. ئەمە ململانێیەك بوو کە پەرلەمان بەرەبەرە سەرکەوتنی تێدا بەدەستهێنا. لە ئیسپانیا کۆرتیز ململانێ هاوچەشنەکەی دۆڕاند. بازرگانی نەك تەنیا پاوانکرا، بەڵکو بوە پاوانی پاشایەتی ئیسپانیا.

ئەم جیاوازییانە کە لەسەرەتادا پێدەچوون بچووکبن، بەلام لە سەدەی حەڤدەیەم دا گرنگی زیاتریان پەیداکرد. هەرچەندە ئەمەریکا لە ساڵی ١٤٩٢ دۆزرابۆوە و ڤاسکۆ دا گاما لە ساڵی١٤٩٨ دا گەیشتبوە هیندستان بە خولانەوە بە دەوری لوتکەی هیوای باش لە سوچی خوارەوەی ئەفەریقا دا، تەنیا لە دوای ساڵی ١٦٠٠ ەوە بازرگانی فراوانی جیهانی بەتایبەتی لە زەریای ئەتڵەسی دەستیپێکرد. لە ساڵی ١٥٨٥ دا، یەکەم کۆلۆنیکردنی باکووری ئەمەریکا لە ڕۆنۆك کە ئێستا سەرووی کارۆلینایە دەستیپێکرد. لە ساڵی ١٦٠٠ کۆمپانیای ڕۆژهەلاتی هیندستان دامەزرا. لە ساڵی ١٦٠٢ دا هاوتا هۆڵەندییەکەی دامەزرا. لە ساڵی ١٦٠٧ دا کۆلۆنی جەیمستاون لە لایەن کۆمپانیای ڤێرجینیاوە دامەزرا. لە ساڵانی ١٦٢٠ ەوە ناوچەکانی کاریبی کرانە کۆلۆنی و باربەیدۆز لە ساڵی ١٦٢٧ دا داگیرکرا. لە هەمانکات دا فەڕەنسا قەڵەمڕەوی خۆی لە ئەتڵەسی دا فراوانکرد و شاری کیوبێکی دروستکرد وەکو پایتەختی فەڕەنسای نوێ کە بریتییە لە کەنەدای ئێستا. ئەنجامەکانی ئەم فرانبوونە ئابوورییە بۆ دەزگاکان لە ئینگلتەرە و ئیسپانیا و فەڕەنسادا زۆر جیاوازبوون، لەبەر ئەو جیاوازییە کەمانەی لە سەرەتادا لەنێوان ئەو وولاتانەدا هەبوون.

ئەلیزابسی یەکەم و جێگرەوەکانی نەیانتوانی بازرگانی نێوان ئینگلتەرە و وولاتانی ئەمەریکا قۆرخبکەن، بەلام بنەماڵە پاشایەتییەکانی تری ئەورووپا توانیان ئەمە بکەن. کەواتە لە کاتێکدا بازرگانی ئەتڵەسی و کۆلۆنیکردن بوونە

هۆی دروستکردنی گروپێکی گەورەی بازرگانی دەوڵەمند کە پەیوەندی کەمیان لەگەڵ تاج دا هەبوو، ئەمە لە فەرەنساو ئیسپانیادا ڕوویندەدا. بازرگانە ئینگلیزەکان ناڕازیبوون بەرامبەر کۆنترۆڵی بنەماڵەی پاشایەتی و داوایانکرد گۆڕانکاری لە دەزگا سیاسییەکان دا بکرێ و سنوور بۆ ئیمتیازەکانی خێزانی پاشا دابنرێ. ئەم بازرگانانە ڕۆڵێکی گرنگیان لە جەنگی ناوخۆی و ئینگلتەرە و شۆڕشی شکۆدار دا بینی. ململانێی لەم چەشنە لە هەموو شوێنێك ڕوویاندا. بۆ نموونە، پاشاكانی فەرەنسا ڕووبەرووی یاخیبوونەکەی فرۆند بوونەوە لە نێوان ساڵانی ١٦٤٨ و ١٦٥٢ دا. جیاوازییەکە لەوەدابوو کە لە ئینگلتەرە دا ئەگەری سەرکەوتنی بەرهەڵستکارانی دەسەڵاتی ڕەهایی زۆر زیاتر بوو چونکە ئەوان دەوڵەمەندترو ژمارەشیان زیاتر بوو لەوانەی بەرهەڵستی دەسەڵاتی ڕەهاییان دەکرد لە فەرەنسا و ئیسپانیا.

ڕێچکە جیاوازەکانی کۆمەڵگایانی ئینگلتەرە و فەرەنسا و ئیسپانیا لە سەدەی حەڤدەیەم دا گرنگی کارلێکردنی جیاوازییە دەزگاییە بچووکەکان لە گەڵ وەرچەرخانە مێژووییەکان دا ڕووندەکەنەوە. لە کاتی وەرچەرخانە مێژووییەکان دا، ڕووداوێکی سەرەکی، یان کارلەیەکردنی فاکتەرەکان، باڵانسی ئەو هێزە سیاسی و ئابوورییانەی لەناو نەتەوەیەکدا هەن تێکدەدەن. ئەمەش دەشێ تەنیا کاریگەری لەسەر وڵاتێك هەبێ وەکو مردنی ماوتسی تۆنگ لە ساڵی ١٩٧٦ دا کە لە سەرەتادا وەرچەرخانی بۆ چینی کۆمیۆنیست هێنایەئاراوە. بەهەرحاڵ، زۆرجار وەرچەرخانەکان کار لە کۆمەڵێك کۆمەڵگا دەکەن هەروەکو چۆن بەکۆلۆنیکردن و دواتر هەڵوەشاندنەوەی کۆلۆنییەکان، کاریگەری لەسەر زۆربەی وڵاتانی دنیا هەبوو.

ئەم جۆرە وەرچەرخانە مێژووییانە گرنگن، چونکە کۆسپی یەکجار گەورە لەبەردەم چاکساری بەرەبەرەدا هەیە کە لە ئەنجامی پێکەوە کارکردنی دەزگا سیاسی و ئابوورییە چەوسێنەرەکان و ئەو پشتگیرییەی ئەو دەزگایانە لە یەکتری دەکەن دروستدەبێ. بەردەوامی ئەم ئەڵقەی هاوکاریکردنەی یەکتر بازنەی ناهەمواری دروستدەکا. ئەوانەی سوود لە بارودۆخی هەنووکەیی وەردەگرن دەوڵەمەندن وخۆیان باش ڕێکخستوە ودەتوانن دژی هەر گۆڕانکارییەکی گەورە بوەستنەوە کە ئیمتیازە ئابوورییەکانیان و دەسەڵاتی سیاسییان لێدەسێنێتەوە.

کاتێك وەرچەرخانی مێژوویی دێتەگۆڕێ، ئەو جیاوازییە بچووکانەی کە

گرنگن بریتین لە جیاوازییە سەرەتاییەکانی دەزگاکان کە بەپێرچوونەوەی جیاواز دەخەنەگەڕ. هەر لەبەر ئەمە بوو کە جیاوازییە ڕێژەییە بچووکەکانی نێوان ئینگلتەرە و فەڕەنسا و ئیسپانیا بوونە هۆی جیاوازی بنەڕەتی لە ڕێچکەی پەرەپێدانی ئەم وولاتانەدا. ڕێچکەکان لە ئەنجامی ئەو وەرچەرخانە مێژووییەوە هاتنەئاراوە کە دەرفەتە ئابوورییەکانی بازرگانی ئەتلەسی لە بەردەم ئەورووپییەکان دا کردیەوە.

ئەگەر جیاوازییە دەزگاییە بچووکەکان لە کاتی سەرهەڵدانی وەرچەرخانە مێژوویەکان دا زۆر گرنگ بن، خۆ هەموو جیاوازییە دەزگاییەکان بچووك نین. بێگومان جیاوازییە دەزگاییە گەورەکان دەبنە هۆی سەرهەڵدانی پاتێرنی زیاتر لێکدوورکەوتوو لەکاتی ئەم وەرچەرخانە مێژوویانەدا. لە کاتێك دا جیاوازییە دەزگاییەکانی نێوان ئینگلتەرە و فەڕەنسا لە ساڵی ١٥٨٨ دا بچووك بوون، جیاوازییەکانی نێوان ئەورووپای ڕۆژئاواو ئەورووپای ڕۆژهەڵات زۆر گەورەتر بوون. لە ڕۆژئاوادا، دەوڵەتی بەهێزی خاوەن مەرکەزیەتی وەك ئینگلتەرە و فەڕەنسا و ئیسپانیا خاوەنی دەزگایانی دەستووریی وەك (پەرلەمان و ئیستەیت جەنەراڵ و کۆرتیز) بوون. لە هەمانکات دا لێکچوونی گرنگ لە ڕووی دەزگایانی ئابوورییەوە لە نێوانیان دا هەبوو، وەکو نەبوونی بەندایەتی.

ئەورووپای ڕۆژهەڵات مەسەلەیەکی تر بوو. بۆ نموونە، پاشایەتی پۆڵۆنیا ـ لیسوانیا لە لایەن چینێکی نوخبەوە فەرمانڕەواییدەکران کە پێیان دەوترا شلاختا. ئەم چینە هێندە بەهێزبوون تەنانەت هەڵبژاردنی پاشایان هێنابوە کایەوە. ئەمە فەرمانڕەوایی ڕەها نەبوو بەشێوەی فەڕەنسا لە کاتی فەرمانڕەوایی لویسی چواردەیەم دا، پاشای ڕۆژ، بەڵام فەرمانڕەوایی ڕەهای نوخبە و دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر، هەمان شتن.

شلاختا زیاتر حوکمی ناوچە گوندنشینەکانی دەکرد کە زۆربەیان بەندەکان بوون، کە ئازادی هاتوچۆ و دەرفەتی ئابووریيان نەبوو. زیاتر بەرەو ڕۆژهەڵات، ئیمپراتۆری ڕوسیا، پیتەری مەزن، حوکمی ڕەهایی چڕتر و چەوسێنەر تری لەوەی لویسی چواردەیەم دەچەسپاند. نەخشەی (٨) ڕێگایەکی ساکار پیشاندەدا بۆ بینینی ڕادەی لێکدوورکەوتنەوەی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەم دا. نەخشەکە ئەوە دەخاتەڕوو ئەگەر وولاتێك لە ساڵی ١٨٠٠ هێشتا سیستەمی بەندایەتی هەبوە یان نا. ئەو وولاتانەی بە ڕەنگی

ڕەش پیشاندراون ئەوانەن کە لەو سەردەمەدا بەندایەتییان هەبوە. ئەوانەی بە ڕەنگی کاڵ پیشاندراون ئەوانەن کە بەندایەتییان نەبوە. ئەورووپای ڕۆژهەلات ڕەنگی ڕەشە و ئەورووپای ڕۆژئاوا ڕەنگی کاڵە.

## نەخشەی ( ٨ ): بەندایەتی لە ئەوروپا دا لە ساڵی ١٨٠٠ دا




لەگەل ئەمەش دا، دەزگاکانی ئەورووپای ڕۆژئاوا هەمیشە هێندە جیاواز نەبوون لەوانەی ئەورووپای ڕۆژهەلات. هەروەك پێشتر بینیمان، دەزگاکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات لە سەدەی چواردەیەم دا دەستیان بە لێکجیابوونەوە کرد، کاتێك مردنی ڕەش لە ساڵی ١٣٤٦ دا بڵاوبۆوە. بەر لەوە، جیاوازی کەم لە نێوان دەزگا سیاسی و ئابوورییەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات دا هەبوو. ئینگلتەرە و هەنگاریا تەنانەت لە لایەن ئەندامانی هەمان خێزانەوە حوکمیانەدەکرا کە

ئــەنجڤین بــوو. ئــەو جیاوازییــە دەزگاییــە گرنگانــەی دوای مردنــی ڕەش هاتنـەئاراوە، ئـەو باکگراونـدەیان دروسـتکرد کـە بەهۆیـەوە لێکجیابوونـەوەی گەورەتر لە نێوان ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات دا لە سەدەکانی حەڤدەیەم و هەژدەیەم و نۆزدەیەم دا سەریانهەڵدا.

بەڵام ئەم جیاوازییە دەزگاییـە بـچووکانە کـە پرۆسـەی لێکجیابوونەوەکـەی دروستکرد، لە سەرەتادا لـە کوێـوە سـەریانهەڵدا؟ بۆچـی ئـەورووپای ڕۆژهــەڵات دەزگایانی سیاسـی و ئـابووری جیاوازتریـان هـەبوو لەسـەدەی چواردەیەم دا؟ بۆچی باڵانسی هێز لە نێوان پاشا و پەرلـەمان دا لـە ئینگلتـەرە دا جیـاواز بـوو لـەوەی لـە فەڕەنـسا و ئیـسپانیا دا هـەبوو؟ هـەروەك لـە چـاپتەری داهـاتوودا دەبینین، تەنانەت کۆمەڵگایانی زۆر کەمتر ئاڵۆز لە کۆمەڵگایانی ئەم سەردەمە، دەزگایانی سیاسـی و ئـابووری ئـەوتۆ دروسـتدەکەن کـە کاریگـەری گـەورەیان لەسـەر ژیـان و گـوزەرانی ئەنـدامانیان دەبـێ. ئەمـە تەنانـەت بـۆ کۆمــەڵگا ڕاوچییەکانیش ڕاستە، هەروەك لەو کۆمەڵگایانەی تـا ئێـستا ماونەتـەوە بۆمـان دەردەکەوێ، وەکو گەلی سان کە لە بۆتـسوانای ئـەمڕۆدا دەژیـن کـە کـشتوکاڵ ناکەن و تەنانەت شوێنی نیشتەجێبوونی هەمیشەییان نییە.

هـیچ دوو کۆمەڵگایـەك هـەمان دەزگایـان دروسـتناکەن: نـەریتی جیـاواز و سیستەمی جیاوازی مافی موڵکداری و ڕێگـای جیـاوازی دابەشـکردنی ئـاژەڵێکی ڕاوکراو یان ئەو کەلوپەلە تاڵانیانەی لە گروپێکی تـری دەدزن. هەنـدێك ڕێـز لـە دەسـەڵاتی پیرەکانیـان دەگـرن و هەنـدێکی تـری نـایگرن، هەنـدێك هـەر زوو ئەندازەیەك لە مەرکەزیـەتی سیاسـی بەدەسـتدەهێنن بـەڵام ئـەوانی تـر لەمـەدا سەرکەوتوو نابن. کۆمەڵگاکان بەشێوەی بەردەوام ڕووبەڕووی ململانێی ئابووری و سیاسـی دەبنـەوە کـە بەشـێوەی جیـاواز چارەسـەردەکرێن لەبـەر جیـاوازی مێـژوویی دیـاریکراو لـە نێوانیـان دا یـان ڕۆڵـی تاکـەکان یـان تـەنیا فاکتـەری ڕێکەوت.

ئەم جیاوازییانە زۆرجار لەسەرەتادا بچووکن، بەڵام لەسەر یەك کەڵەکەدەبن و پرۆسـەی لێکترازانـی دەزگـایی دروسـتدەکەن. هـەروەك چـۆن دوو کۆمـەڵی زیندەوەری هاوشێوە دوای جیاکردنەوەیان بە هێواشی لێکدەترازێن لە پرۆسەی لێکترازانی جێنیتیـك دا(Genetic Drift) چـونکە بـازە جێنیتیکـە ڕێکەوتـەکان کەڵەکـەدەبن. دوو کۆمــەڵگای هاوشــێوە هــەروەها بــە هێواشــی لــە ڕووی

دەزگاییـەوە لێکـدەترازێن. هەرچـەندە هەمانـشێوەی لێکترازانـی جێنیتیکـی، لێکترازانی دەزگایی ڕێچکەی پێشتر دیاریکراوی نییە و تەنانەت پێویستیش ناکا کەڵەکـە بـوون ڕووبـدا، بـە تێپـەڕبوونی سـەدەکان دەبێتـە هـۆی سـەرهەڵدانی جیاوازی بەرچاو و هەندێجاریش جیاوازی گرنگ. ئەو جیاوازییانەی لە ئـەنجامی لێکترازانـی دەزگاییـەوە دێنـەئاراوە، گرنگـی تایبـەت پەیدادەکـەن چـونکە کاریگـەرییان لەسـەر کاردانـەوەی کۆمـەڵگا دەبـێ بەرامبـەر گۆڕانکـاری لـە بارودۆخـە ئـابووری و سیاسـییەکان دا لـەکاتی سـەرهەڵدانی وەرچـەرخانە مێژووییەکان دا.

پاتێرنەکانی لێکدوورکەوتنەوەی پەرەپێدانی ئابووری لە جیهان دا پشت بـە کـارلێکردنی نێـوان وەرچـەرخانە مێژووییـەکان و لێکترازانـە دەزگاییـەکان دەبەستن. ئەو دەزگا سیاسی و ئابوورییانەی لە کۆمەڵگایەك دا هەن ـ هەندێجار بەهۆی پرۆسـەی دووردرێـژی لێکترازانـی دەزگاییـەوە و هەنـدێجاریش بـەهۆی جیـاوازی کۆمـەڵگاکان لـە سـوود وەرگـرتن لـە وەرچـەرخانە مێژووییـەکانی پێـشووتر. ئـەو سـەکۆیە دروسـتدەکەن کـە گۆڕانکـاری داهـاتووی لەسـەر دادەڕێـژرێ. مردنـی ڕەش و فراوانبـوونی بازرگـانی جیهـانی لـە دوای ١٦٠٠، هەردووکیان وەرچەرخانی مێژوویی سـەرەکی بـوون بـۆ هێـزە ئەوروپییـەکان و لەگەڵ دەزگا سـەرەتاییە جیاوازەکـان دا کاریـان لەیـەکترکرد بـۆ دروسـتکردنی لێکجیابوونەوەی گەورە. لەبەرئەوەی لە ساڵی ١٣٤٦ دا ڕەنجدەرانی ئـەورووپای ڕۆژئاوا دەسەڵات و ئۆتۆنـۆمی زیاتریـان هـەبوو لەوانـەی ئـەورووپای ڕۆژهـەڵات، مردنـی ڕەش بـوە هـۆی هەڵوەشاندنەوەی فیـودالیزم لـە ئـەورووپای ڕۆژئـاوا و سەرهەڵدانی بەندایەتی دوەم لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات دا. لەبەر ئەوەی ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە سەدەی چواردەیەم دا دەستیان بە لێکجیابوونەوە کـرد، دەرفەتە ئابوورییە نوێکانی سـەدەکانی حەڤدەیـەم و هەژدەیـەم و نۆزدەیـەم، ئاکامی جیاوازی بۆ ئەم بەشە جیاوازانەی ئەورووپا هەبوو. لەبەر ئەوەی لە ١٦٠٠ دا کـۆنترۆڵی پاشـا لـە ئینگلتـەرە لاواز تـر بـو لەوانـەی فەڕەنسا و ئیـسپانیا، بازرگانی ئەتڵەسی ڕێگا خۆشکار بوو بۆ دامەزرانـدنی دەزگایـانی نـوێی خـاوەن پلـورەلیزمی زیـاتر لـە ئینگلتـەرە، لـە کاتێـك دا ئـەم بازرگانییـە بـوە هـۆی بەهێزکردنی پاشایەتی لە فەڕەنسا و ئیسپانیادا.

## ڕێچکەی پەیوەستی مێژوو ( The contingent path of history )

دەرەنجامەکانی ڕووداوەکان لە کاتی وەرچەرخانە مێژووییەکان دا بەهۆی قورسایی مێژووەوە دادەڕێژرێن، کاتێک دەزگا ئابووری و سیاسییە هەنووکەییەکان بالآنسی هێز دادەڕێژن و ئەوە دیاریدەکەن کە لەڕووی سیاسییەوە شیاوی ئەنجامدانە. دەرەنجامەکان لە لایەن مێژووەوە پێشتر دیارینەکرێن، بەڵکو پەیوەستن (contingent). ڕێچکەی دروستی پەرەپێدانی دەزگاکان لەم کاتانەدا پشت بەوە دەبەستێ کام لەهێزە دژ بەیەکەکان سەر دەکەون و کام لە گروپەکان دەتوانن هاوپەیمانی کاریگەر دروستبکەن و کام لە سەرکردەکان دەتوانن ڕووداوەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاربهێنن.

دەشێ ڕۆڵی پەیوەستی لە ڕێگەی بنچینەی دەزگا سیاسییە کراوەکانی ئینگلتەرەوە ڕوونبکرێتەوە. لە کاتی سەرهەڵدانی شۆڕشی شکۆداری ساڵی ١٦٨٨دا، نەک تەنیا ڕووننەبوو، کە لەئەنجامی سەرکەوتنی ئەو گروپانەی هەوڵی سنووردارکردنی دەسەلآتی پاشایان دەدا و هەوڵی دانانی دەستوورێکی زیاتر پلورەلیستییان دەدا، چی ڕوودەدا، بەڵکو سەراپای ئەو ڕێچکەیەی بەرەو ئەم شۆڕشە سیاسییە دەڕویشت لە ژێر ڕەحمەتی ڕووداوە پەیوەستەکان دا بوو. سەرکەوتنی گروپە براوەکان بە توندی بەستڕابۆوە بەو وەرچەرخانە مێژووییەوە کە بەهۆی سەرهەڵدانی بازرگانی ئەتڵەسی هاتەئاراوە، کە بوەهۆی دەوڵەمەندکردن و هاندانی ئەو بازرگانانەی دژایەتی پاشایان دەکرد. بەلآم سەدەیەك بەر لەوە هیچ ڕووننەبوو کە ئینگلتەرە توانایەکی ئەوتۆی دەبێ دەسەلآتی خۆی بەسەر دەریادا بسەپێنێ و چەندین ناوچەی کاریبی و باکووری ئەمەریکا بکاتە کۆلۆنی خۆی یان دەستبگرێ بەسەر ئەو هەموو بازرگانییە چەورانەدا کە لەگەڵ هەردوو ئەمەریکا و ڕۆژهەلآت دا ئەنجامدەدران. ئێلیزابسی یەکەم و پاشاکانی تری بنەماڵەی تیودۆر کە پێش ئەو هاتبوونە سەر حوکم، هێزێکی دەریایی بەهێز و یەکگرتوویان پێکەوە نەنابوو. هێزی دەریایی ئینگلتەرە پشتی بە هێزە تایبەت و کەشتییە بازرگانییە سەربەخۆکان بەستبوو و زۆر بێهێز تر بوو لە هێزی دەریایی ئیسپانیا. قازانجی چالاکییە

بازرگانییەکانی زەریای ئەتڵەسی ئەم هێزە دەریاییە تایبەتانەی هاندا تا تەحەدای باڵادەستی ئیسپانییەکان لە دەریادا بکەن. لە ساڵی ١٥٨٨ دا ئیسپانییەکان بڕیاریان دا کۆتایی بەم تەحەدایانە بەرامبەر مۆنۆپۆلیەکەیان بهێنن و لەهەمانکات دا کۆتایی بەدەستوەردانی ئینگلیزەکان لە کاروباری هۆڵەندەدا بهێنن کە ئەو کاتە دژی ئیسپانییەکان دەجەنگی بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی.

فیلیپی دوەم، پاشای ئیسپانیا کەشتیگەلێکی بەهێزی نارد، کە ئارمادا بوو، لە لایەن دۆقی مەدینە سیدۆنیاوە سەرکردایەتیدەکرا. پێدەچوو زۆر کەس گەیشتبوونە ئەو ئەنجامگیریەی کە ئیسپانییەکان بە تەواوی ئینگلیزەکان تێکدەشکێنن و مۆنۆپۆلیەکەیان لە ئەتڵەسی دا زیاتر دەچەسپێنن و ڕەنگە تەنانەت ئیلیزابسی یەکەم لەسەر تەخت لابەرن و لە ئەنجامیشدا دوورگەکانی بەریتانیا داگیربکەن. لەگەڵ ئەمەش دا ئەنجامی ئەم جەنگە شتێکی زۆر جیاواز بوو. کەشوهەوای خراپ و هەڵەی ستراتیجی لە لایەن سیدۆنیاوە، کە لە دوا ساتەکان دا بەرپرسیارێتی هێرشەکەی وەرگرتبوو لە ئەنجامی مردنی فەرماندەیەکی خاوەن ئەزموونتر، بوە هۆی ئەوەی ئارمادای ئیسپانی لایەنی بەهێزی خۆی لە دەسبدا. سەرەڕای هەموو کۆسپەکان، ئینگلیزەکان زۆربەی کەشتیگەلەکەی دوژمنە بەهێزترەکەیان تێشکاند. دەریاکانی ئەتڵەسی بۆ ئینگلیزەکان کرایەوە لەسەر بنەمای یەکسانتر. بەبێ ئەم سەرکەوتنە چاوەڕێنەکراوە بۆ ئینگلیزەکان، ئەو ڕووداوانەی کە وەرچەرخانی گرنگی ئاڵوگۆڕکاریان دروستکردو دەزگا سیاسییە پلورەلیستیەکانی دوای ساڵی ١٦٨٨ یان دامەزراند، هەرگیز ڕووناکیان نەدەبینی. نەخشەی (٩) ڕێچکەی کەشتییە تێشکاوەکانی ئیسپانیا پیشاندەدا کاتێک ئارمادا بەدەوری دوورگەکانی بەریتانیا دا ڕاودەنرا.

**نەخشەی (٩): ئارمادای ئیسپانی و کەشتییە تێشکاوەکان و ئەو شوێنە سەرەکییانەی کە خاڵی وەرچەرخانیان دروستکرد.**



بێگومـان هـیچ کـەس لـە سـاڵی ١٥٨٨ دا پێـشبینی ئەنجامـەکانی ئـەو سـەرکەوتنەی ئینگلتـەرەیان نـەدەکرد. ڕەنگـە خـەڵکێکی کـەم لـەو کاتـەدا تێگەیشتبن کە ئەم سەرکەوتنە وەرچەرخانێکی مێژوویی دروستدەکا و ڕێگا بـۆ شۆڕشێکی گەورەی سیاسی خۆش دەکا کە سەدەیەك دواتر ئەنجامدرا.

نابیـت وادابنـێین کـە هـەموو وەرچـەرخانێکی مێـژوویی دەبێتـە هـۆی سەرهەڵدانی شۆڕشی سیاسی سەرکەوتوو، یان گۆڕانکاری بەرەو بارێکی باشتر. مێـژوو پـڕە لـە نموونـەی شـۆڕش و بزووتنـەوەی ڕادیکـاڵ کـە زۆردارێکیـان لـە جێگەی زۆردارێکی تر داناوە بـە شـێوەیەك کـە کۆمەڵناسـی ئـەڵمانی، ڕۆبـەرت میـشێلس نـاوی نـاوە یاسـای ئاسـنینی حـوکمی ئۆلیگـارکی (کەمینـە)، کـە شێوازێکی نەگریسی بازنەی ناهەمواریيە. کۆتاییهاتنی کۆلۆنیالیزم لە دەیەکانی دوای دووەم جەنگی جیهانی دا، وەرچـەرخانی مێـژوویی دروسـتکرد بـۆ زۆربـەی ئەو وولاتانەی پێشتر کۆلۆنی بوون. لەگەڵ ئەمەش دا، لـە زۆربـەی هـەرە زۆری حاڵەتـەکانی وولاتـانی باشـووری بیابـانی ئـەفریقی و چـەندین وولاتـی ئاسـیا، حکومەتەکانی دوای سەربەخۆیی لـە کۆلۆنیـالیزم لاپەڕەیـەکیان لـە کتێبەکـەی ڕۆبەرت میشێلس وەرگرت و کارە ناڕەواکانی ئەوانەی پێش خۆیان خەست تـرو دووبـارەکردەوە. زۆرجـار دابەشـکردنی دەسـەڵاتی سیاسـییان بـە تونـدی تەسککردەوە و ئەو جڵەوگیرییانەی لەسەر فەرمانڕەوایان هەبوون نەیانهێشتن و ئەو هاندانە کەمانەشی کە دەزگا ئابوورییەکان ڕەخساندبوویانن بۆ وەبـەرهینان و پێـشکەوتنی ئـابووری، کـەمکردەوە. تـەنیا لـە چـەند حاڵـەتێکی کـەم دا، کۆمـەڵگایانی وەك بۆتـسوانا، وەرچـەرخانە مێژووییـەکان بـەکارهێنران بـۆ دەسپێکردنی گۆڕانکاری سیاسی و ئابووری کە ڕێگای بۆ گەشەکردنی ئـابووری خۆشکرد.

دەشێ وەرچەرخانە مێژووییەکان گۆڕانکاری سەرەکی دروسـتبکەن بـەرەو، نەك دوورکەوتنەوە لە، دەزگایانی چەوسێنەر. دەزگایانی کـراوەش، هەرچـەندە ئـەوانیش ئەڵقـەی فیـدباکی خۆیـان هەیـە کـە بازنـەی بەختەوەرییـە، دەتـوانن ئاراستەکەیان بگۆڕن و بەرەبەرە بەرەو دەزگایانی چەوسێنەر بڕۆن بەهۆی ئـەو تەحەدایانەی لە کاتی وەرچەرخانە مێژووییـەکان دا ڕووبەڕوویاندەبنـەوە ـ ئایـا ئەمـە ڕوودەدا دیسانەوە پەیوەستە. کۆمـاری ڤێـنس، هـەروەك لـە چـاپتەری شەش دا دەبینـین، لـە چاخەکانی ناوەڕاست دا هـەنگاوی گـەورەی نـا بـەرەو

دەزگاکانی سیاسی و ئابووری کراوە، بەڵام لە کاتێك دا ئەم جۆرە دەزگایانە لە ئینگلتەرە دوای شۆڕشی شکۆداری ١٦٨٨ بەرەو بەهێزی دەچوون، لە ڤێنس دا لە کۆتایی دا خۆیان بەرەو دەزگایانی چەوسێنەر گۆڕی لە ژێر کۆنترۆڵی نوخبەیەکی بچووك دا کە قۆرخی هەردوو دەرفەتە ئابوورییەکان و دەسەڵاتی سیاسییان کردبوو.

## تێگەیشتن لە چۆنیەتی باری زەوی

سەرهەڵدانی ئابووری بازاڕ لەسەر بنەمای دەزگایانی کراوە و گەشەکردنی ئابووری بەردەوام لە ئینگلتەرەی سەدەی هەژدەیەم دا کاریگەری لەسەر سەرلپای جیهان هەبوو، نەك تەنیا لە بەرئەوەی ئەو بوارەی دایە ئینگلتەرە کە بەشێکی گەورەی ئەو جیهانە بکاتە کۆڵۆنی خۆی. ئەگەر کاریگەری گەشەکردنی ئابووری ئینگلتەرە بە دڵنیاییەوە لە جیهان دا بڵاو بۆوە، ئەوا ئەو دەزگا سیاسی و ئابوورییانەی ئەم گەشەکردنەیان دروستکرد بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و بەو شێوەیە بڵاونەبوونەوە. بڵاوبوونەوەی شۆڕشی پیشەسازی کاریگەری جیاوازی لەسەر جیهان هەبوو، بە هەمانشێوەی ئەو کاریگەرییەی مردنی ڕەش هەیبوو لەسەر ئەورووپای ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات و بە هەمانشێوەی ئەو کاریگەرییەی بازرگانی ئەتڵەسی هەیبوو لەسەر ئینگلتەرە و ئیسپانیا. ئەوە ئەو دەزگایانە بوون کە لەو کاتانەدا لە ناوچە جیاوازەکانی جیهان دا لە ئارادا بوون کاریگەریی ئەو وەرچەرخانە مێژووییانەیان دیاریکرد و لە ڕاستیشدا ئەم دەزگایانە جیاوازبوون ـ جیاوازییە بچووکەکان چەندین جار گەورە کرابوون بەهۆی وەرچەرخانە مێژووییەکانی پێشووترەوە. ئەم جیاوازییە دەزگاییانە و کاریگەرییەکانیان تا ئەمڕۆش بەردەوامن بەهۆی بازنەکانی ناهەمواری و بەختەوەرییەوە، هەڵبەت بە شێوەیەکی پێرفێکت نا، و ئەوانە کلیلی تێگەیشتنن دەربارەی چۆنیەتی سەرهەڵدانی نایەکسانی لە جیهان دا و سروشتی چۆنیەتی باری زەوی دەوری ئێمە.

هەندێك ناوچەی جیهان دەزگایانی ئەوتۆیان دامەزراند کە زۆر لەوانەی ئینگلتەرە نزیك بوون، هەرچەندە لە ڕێگەی زۆر جیاوازەوە ئەمەیان ئەنجامدا.

ئەمەش بەتایبەتی بۆ هەندێك "كۆڵۆنی نیشتەكاران" ی ئەورووپای وەك ئوستڕالیا و كەنەدا و ویلایەتە یەكگرتوەكان ڕاست بوو، هەرچەندە كاتێك شۆڕشی پیشەسازی دەستیپێكرد دەزگاكانیان تازە دادەمەزران. هەروەك لە چاپتەری یەكەم دا بینیمان، ئەم پرۆسەیە، كە بە دروستكردنی كۆڵۆنی جەیمستاون لە ساڵی ١٦٠٧ دا دەستیپێكرد تا گەیشتە جەنگی سەربەخۆیی و پەسەندكردنی دەستووری ویلایەتە یەكگرتوەكان، لە چەندین سیمای وەك خەباتی دوورودرێژی پەرلەمان لە ئینگلتەرە دژی پاشایەتی هاوبەشن. دیسانەوە ئەم پرۆسەیەش بوە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتێكی مەركەزی خاوەن دەزگای سیاسی پلورەلیستی. دواتر شۆڕشی پیشەسازی بەخێرایی بۆ ئەم وڵاتانە بڵاوبۆوە.

ئەورووپای ڕۆژئاوا، كە بە چەندین پرۆسەی مێژوویی هاوشێوەی ئەوەی ئینگلتەرە دا تێپەڕیبوبوو، لە كاتی سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی دا دەزگایانی هاوشێوەی ئەوانەی ئینگلتەرەیان هەبوو. جیاوازی بچووك، بەڵام خاوەن كاریگەریی گەورە لە نێوان ئینگلتەرە و ئەوانی تردا هەبوو، هەر لەبەر ئەمەش بوو كە شۆڕشی پیشەسازی لە ئینگلتەرە بەرپا بوو نەك لە فەڕەنسادا. دواتر ئەم شۆڕشە بارودۆخێكی تەواو جیاوازی دروستكردو كۆمەڵێك تەحەدای تەواو جیاوازی بۆ ڕژێمەكانی ئەورووپا هێنایەئاراوە كە ئەوانیش بە دەوری خۆیان كۆمەڵێك ململانێی نوێیان دروستكرد كە بوونە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی فەڕەنسی. شۆڕشی فەڕەنسی وەرچەرخانێكی گرنگی تر بوو كە بوە هۆی نزیكبوونەوەی دەزگایانی ئەورووپای ڕۆژئاوا لە دەزگایانی ئینگلتەرە، لە كاتێك دا دەزگایانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات زیاتر دووركەوتنەوە.

وڵاتانی تری جیهان ڕێچكەی دەزگایی جیاوازیان گرتەبەر. بەكۆڵۆنیكردنی وڵاتانی تر لە لایەن ئەورووپییەكانەوە ڕێگای خۆشكرد بۆ لێكدووركەوتنەوەی دەزگایی لە هەردوو ئەمەریكا دا، بە پێچەوانەی دەزگا كراوەكانی ویلایەتە یەكگرتوەكان و ئوستڕالیا و كەنەدا، دەزگایانی چەوسێنەر لە ئەمەریكای لاتین دامەزران كە شرۆڤەی پاتێرنەكانی ئەو نایەكسانییە دەكەن كە لە هەردوو ئەمەریكادا دەیبینین. دەزگا ئابووری و سیاسییە چەوسێنەرەكانی داگیركارانی ئیسپانیا لە ئەمەریكای لاتین دا بەرگەی مانەوەیان گرت و بوونە هۆی هەژاری بەشی زۆری ناوچەكە. هەرچەندە ئەرجەنتین و چیلی لە وڵاتەكانی تری

ناوچەکە باشتر بوون. ئەم دوو وڵاتە دانیشتوانێکی کەمتری خەڵکی خۆماڵی و کانی دەوڵەمەندی کەمتریان تێدا بوو، هەر بۆیە "پشتگوێخران" لە کاتێك دا ئیسپانییەکان بایەخیان بەو ناوچانە دا کە شارستانییەکانی مایا و ئازتێك و ئینکای تێدا نیشتەجێبوون. ڕێکەوت نییە کە هەژارترین بەشی ئەرجەنتین بریتییە لە باکووری ڕۆژئاوا کە تەنیا بەشێکی ئەو وڵاتە بوو تێکەڵاوی ئابووری کۆلۆنیالی ئیسپانی بوو. لەم ناوچەیەدا هەژاری بەردەوام و پاشماوەی دەزگا چەوسێنەرەکان هاوشێوەیەی ئەوانەن کە لە لایەن پۆتۆسی میتا لە بۆلیڤیا و پیرۆ دروستکران.

ئەفریقا، ئەو بەشەی جیهان بوو کە خاوەنی دەزگایانی ئەوتۆ بوو کە کەمترین توانایان هەبوو بۆ سوودوەرگرتن لەو دەرفەتانەی شۆڕشی پیشەسازی هێنانیەئاراوە. بەلایەنیکەمەوە، لە ماوەی هەزار ساڵی ڕابوردوودا، جگە لە هەندێك ناوچەی بچووك و بۆ ماوەی کەم و سنووردار، ئەفریقا لە ڕووی تەکنەلۆجی و پەرەپێدانی سیاسی و خۆشگوزەرانی لە دوای ناوچەکانی تری جیهانەوە بوە. ئەفریقا ئەو بەشەی جیهانە کە تیایدا دەوڵەتانی خاوەن مەرکەزیەت زۆر درەنگ و زۆر بەلاوازی دامەزران. لەو شوێنانەش دا کە دەوڵەتی مەرکەزی تێدا دامەزرا، هێندەی کۆنگۆ دەوڵەتی دەسەڵات ڕەها بوون و زۆرجاریش تەمەنکورت بوون و ڕووخاون. ئەفریقا لە ڕێچکەی نەبوونی مەرکەزیەتی دەوڵەت دا هاوشێوەی وڵاتانی وەك ئەفغانستان و هایتی و نیپاڵە، کە ئەوانیش لە سەپاندنی ئاسایش دا بەسەر ناوچەکانیان دا شکستیان هێناوە و نەیانتوانیوە شتێك کە بۆنی سەقامگیری لێبێ دروستبکەن بۆ ئەوەی لایەنی کەمی گەشەکردنی ئابووری بەدەستبهێنن. هەرچەندە کەوتونەتە ناوچەی زۆر جیاوازی جیهانەوە، ئەفغانستان و هایتی و نیپاڵ لە ڕووی دەزگاییەوە زۆر هاوشێوەی زۆربەی نەتەوەکانی باشووری بیابانی ئەفریقان و بەمەش بەشێکن لە هەژارترین وڵاتانی ئەمڕۆی جیهان.

چۆن دەزگاکانی ئەفریقا بەرەو ئەم شێوازە چەوسێنەرەی ئەم ڕۆژگارە گۆڕان، دیسانەوە ئەم گۆڕانە پرۆسەی لێکترازانی دەزگایی بارگاوی بە وەرچەرخانە مێژووییەکان، ڕووندەکاتەوە، بەڵام ئەمجارە بە دەرەنجامی زۆر کاریگەرترەوە، بەتایبەتی لەکاتی تەشەنەکردنی بازرگانی کۆیلەی ئەتڵەسی دا. کاتێك بازرگانانی ئەورووپا گەیشتنە کۆنگۆ، دەرفەتی ئابووری نوێ بۆ ئەو

پاشـایەتییە ڕەخـسا، بازرگـانیی شـوێنەدوورەکان کـە گۆڕانکـاری بەسـەر ئـەوروپادا هێنـا لـە هـەمانکات دا گۆڕانکـاری بەسـەر کۆنگـۆش دا هێنـا، بـەڵام دیسانەوە جیاوازییە دەزگاییە سەرەتاییەکان کاریگـەرییان هـەبوو. دەسـەڵاتی ڕەهای کۆنگۆ بە شێوەیەکی نالەبار گۆڕا لە کۆمەڵگایەکی تـەواو کـۆنترۆڵکراوی خاوەن دەزگای ئابووری چەوسـێنەری ئـەوتۆوە کـە نزیکـەی هـەموو بەروبومـە کشتوکاڵیەکانی هاوڵاتییانی زەوتدەکرد، بـۆ بەکۆیلـەکردنی بەکۆمـەڵی خـەڵك و فرۆشتنیان بە پورتوگالیەکان بەرامبەر وەرگرتنی تفـەنگ و کەلوپـەلی گـران بـۆ نوخبەکەی کۆنگۆ.

جیاوازییە سەرەتاییەکانی نێوان ئینگلتەرە و کۆنگۆ مانای وابـوو لـە کاتێـك دا دەرفەتی بازرگانیکردن لەگـەڵ شـوێنە دوورەکـان دا وەرچـەرخانی مێـژوویی بەرەو دروستکردنی دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی لە ئینگلتەرە دا ڕەخساند، هـەموو هیوایـەکی شکـستهێنانی دەسـەڵاتی ڕەهـای لـە کۆنگـۆ کوژانـەوە. لـە زۆربـەی ناوچـەکانی ئـەفریقا دا ئـەو قازانجـە زۆرەی لـە بازرگـانی کۆیلـەوە دەستدەکەوت، نەك تەنیا بـوە هـۆی زیـادبوونی کۆیلەیـەتی و مـافی موڵکـداری نـاجێگیرتر، بـەڵکو بـوە هـۆی هەڵگیرسـاندنی شـەڕی خەسـت و تێکـدانی ئـەو دەزگایانەشـی کـە هـەبوون. لـە مـاوەی چـەند سـەدەیەکی کـەم دا هـەموو پرۆسـەیەکی مەرکەزیـەتی دەوڵـەت بـە تـەواوی پێـچەوانە کرایـەوە و چـەندین دەوڵەتی ئـەفریقی بـە تـەواوی ڕووخـان. هەرچـەندە هەنـدێك دەوڵـەتی تـازە و هەندێجاریش بەهێز دروستبوون بۆ سوود وەرگرتن لە بازرگانی کۆیلە، بەڵام ئەو دەوڵەتانە لەسەر بنەمای شەڕ وکوشتن و تاڵانکردن دامەزرابوون. وەرچـەرخانی مێژوویی دۆزینەوەی هەردوو ئەمەریکا ڕەنگە هاوکـاری ئینگلتـەرەی کردبـێ بـۆ دامەزرانـدنی دەزگایـانی کـراوە، بـەڵام ئـەم دۆزینەوەیـە بـوە هـۆی ئـەوەی دەزگایانی ئەفریقا تەنانەت ببنە دەزگایانی چەوسێنەر تر.

هەرچـەندە بازرگـانی کۆیلـە بـە زۆری لـە دوای ١٨٠٧ کۆتاییهـات، بـەڵام بـەکۆلۆنیکردنی دواتـری ئـەفریقا لەلایـەن ئەوروپییەکانـەوە، نـەك تـەنیا ئـەو نوێکردنـەوە ئابوورییـە ئومێدبەخشەی هەنـدێك ناوچـەی باشـوور و خۆرئـاوای پێچەوانە کـردەوە، بـەڵکو هـەموو ئەگـەرێکی چاکسازی دەزگـایی لـە لایـەن دانیـشتوانە خۆماڵیەکـەوە، لـەناوبرد. ئەمـەش مانـای وابـوو کـە تەنانـەت لـە دەرەوەی ناوچەکانی وەك کۆنگۆ و مەدەغەشقەر و نامیبیا و تەنزانیا کە تاڵانی

و ئاژاوە و تەنانەت کۆشتاری بە کۆمەڵیش تیایان دا حوکمیدەکرد، دەرفەتێکی ئەوتۆ نەبوو بۆ ئەفریقا تا ڕێچکەی دەزگایی خۆی بگۆڕێ.

تەنانەت لەمەش خراپتر، پێکهاتەکانی حوکمی کۆلۆنیالی، کە لە ١٩٦٠ ەکان دا بەجێمان، ئەفریقای تووشی پاشماوەی دەزگایی ئالۆز ترو نەگریس تر کرد لەوەی لەسەرەتای سەردەمی کۆلۆنیالیدا هەبوون. پەرەپێدانی دەزگایانی سیاسی و ئابووری لە چەندین کۆلۆنی ئەفریقی دا مانای وابوو لە بری ئەوەی سەربەخۆیی وەرچەرخانی مێژوویی دروستبکا بۆ چاکسازی لە دەزگاکان دا، دەرفەتی بەخشیە سەرکردە بێویژدانەکان تا دەسەڵات بگرنە دەست و ئەو چەوساندنەوەیە خەست تر بکەنەوە کە کۆلۆنیستە ئەوروپییەکان دروستیان کردبوو. ئەو هاندانە سیاسیانەی ئەم دەزگایانە دروستیان کردن بوونە هۆی پیادەکردنی شێوازێکی ئەوتۆی سیاسەت کە پاتێرنە مێژوویەکانی مافی موڵکداری ناجێگیر و ناکارامەی بەرهەمهێنایەوە لەو دەوڵەتانەدا کە ئارەزووی دەسەڵاتی ڕەهایان زۆر و بەلام هیچ دەسەڵاتێکی مەرکەزییان بەسەر زۆربەی ناوچەکانیان دا نەبوو.

شۆڕشی پیشەسازی هێشتا نەگەیشتۆتە ئەفریقا چونکە ئەو کیشوەرە ڕووبەڕووی بازنەی درێژی بەردەوامی ناهەمواری و بەرهەمهێنانەوەی دەزگا سیاسی و ئابوورییە چەوسێنەرەکان بۆتەوە. بۆتسوانا لەمە بەدەرە. هەروەك دەبینین لە سەدەی نۆزدەیەم دا، خاما پاشا، باپیری یەکەم سەرۆك وەزیرانی بۆتسواناى دواى سەربەخۆیی، سێرتسی خاما، دەستیکرد بە گۆڕانکاری لە دەزگاکان دا بۆ نوێکردنەوەی دەزگا سیاسی و ئابوورییەکانی هۆزەکەی. شتێکی دەگمەن بوو کە ئەم دەزگایانە لە ماوەی کۆلۆنیالیدا تێکنەدران. هۆکاری ئەمە تا ڕادەیەك دەگەڕێتەوە بۆ تەحەدای زیرەکانەی خاما و سەرۆك هۆزەکانی تر بۆ دەسەڵاتی کۆلۆنیالی. کارلێکردنی ئەم دەزگایانە لەگەڵ ئەو وەرچەرخانە مێژووییەی سەربەخۆیی لە حوکمی کۆلۆنیالی دروستیکرد، بناخەی سەرکەوتنی ئابووری و سیاسی بۆتسواناى دانا. ئەوەش حاڵەتێکی تری گرنگی جیاوازییە مێژووییە بچووکەکان پیشاندەدا.

ئارەزووی ئەوە لە ئارادایە کە ڕووداوە مێژووییەکان وەك ئەنجامی مسۆگەری هێزە ڕیشە داکوتراوەکان ببینرێن. لە کاتێك دا ئێمە جەختێکی زۆر لەسەر ئەوە دەکەین کە چۆن مێژووی دەزگا ئابووری و سیاسییەکان بازنەی

ناهەمواری و بازنەی بەختەوەری دروستدەکەن، پەیوەستی، هەروەك لە میانەی پەرەسەندنی دەزگاکانی ئینگلتەرە دا جەختمان لەسەر کرد، هەمیشە دەشێ فاکتەرێك بێ. سێرتسی خاما، کە لە ئینگلتەرە لە ساڵانی ١٩٤٠ دا خوێندنی تەواو کردبوو، کەوتە داوی خۆشەویستی رووس ویلیام کە ئافرەتێکی سپیپێست بوو. لە ئەنجامی ئەمەدا ڕژێمی ڕەگەزپەرستی ئەفریقای باشوور حکومەتی ئینگلیزی ڕازیکرد تا نەیەڵێ ئەو بچێتەوە ناوچەکەی کە ئەوکات پێیدەوترا بێچوانالاند کە ( لە لایەن کۆمسیۆنی باڵای ئەفریقای باشوورەوە بەڕیوە دەبرا) و ئەویش ناچار وازیهێنا لە تەختی پاشایەتی. کاتێك گەڕایەوە تا سەرکردایەتی خەباتی دژە کۆلۆنیالی بکا، ئەو بە مەبەستی قایمکردنی دەزگا تەقلیدییەکان نەگەڕایەوە، بەڵکو ویستی ئەو دەزگایانە لەگەڵ جیهانی مۆدێرن دا بگونجێنێ. خاما پیاوێکی زۆر نائاسایی بوو، ئارەزووی دەوڵەمەندکردنی خۆی نەبوو و لێبڕابوو بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵاتەکەی. زۆربەی وڵاتە ئەفریقیەکانی تر هێندە بەختەوەر نەبوون. هەردوو شتەکان گرنگ بوون: پەرەسەندنی مێژوویی دەزگاکان لە بۆتسوانا و فاکتەرە پەیوەستەکان کە بوونە هۆی ئەوەی ئەم دەزگایانە پەرەیانپێبدرێ لە بری ئەوەی هەڵبوەشێنرێنەوە یان تێکبدرێن هەروەك لە ناوچەکانی تری ئەفریقا دا ڕوویدا.

لە سەدەی نۆزدەیەم دا، دەسەڵاتی ڕەها کە هێندە جیاوازی نەبوو لەوانەی ئەفریقا و ئەورووپای ڕۆژهەڵات دا بەری بە ڕێچکەی بەپیشەسازیبوون لە زۆربەی ئاسیا دا گرتبوو. لە چین، دەوڵەت بە ڕادەیەکی زۆر، ڕەها بوو، شارانی سەربەخۆ و بازرگانان و پیشەسازیکاران یان بوونیان نەبوو یان لە رووی سیاسییەوە زۆر لاوازبوون. چین خاوەن هێزی دەریایی گەورە بوو، چەندین سەدە پێش ئەورووپییەکان بە قورسی سەرقاڵی بازرگانی بوو لەگەڵ ناوچە دوورەکان دا، بەڵام لە ساتێکی هەڵەدا وازی لە بازرگانی ناو زەریاکان هێنا، کاتێك ئیمپراتۆریەتەکانی مینگ لە کۆتایی سەدەی چواردەیەم و سەرەتای سەدەی پازدەیەم دا بڕیاریان دا کە زیادبوونی بازرگانی شوێنە دوورەکان ڕەنگە ئەو تێکدانە بنیاتنەرە بەدوای خۆی دا بهێنێ کە لەوانە بوو هەڕەشە لە حوکمەکەیان بکا.

لە هیندستان دا، لێکترازانی دەزگایی بە شێوەیەکی جیاواز کاری خۆی کرد و بوەهۆی پەرەپێدانی سیستەمی ڕەقی پلەبەندی هەرەمی چینایەتی کە بوە

هـۆی سـنووردارکردنی چـالاکی بازاڕەکـان و دابەشـکردنی هێـزی کـار بەسـەر پیـشەکاندا و زۆر خـراپتر لـەوەی سیـستەمی فیـودالّیزم کـردی لـە ئـەورووپای چاخەکانی ناوەڕاست دا. لە هەمانکات دا بوە هۆی قـایمکردنی شـێوازێکی تـری دەسـەلاّتی ڕەهـا لـە سـایەی فـەرمانڕەواکانی موگـالّ دا. زۆربـەی وولاّتـە ئەورووپییەکان سیستەمی هاوشێوەیان هەبوو لە چاخەکانی ناوەڕاست دا و ناوی خێزانی ئەنگلۆ ساکسۆنی ئـەم سـەردەمەی وەك بەیکـەر و کووپـەر و سمـیس، پاشماوەی ڕاستەوخۆی ئەو کاتەگۆرییە پیشەییە هەرەمیانەی ئەو سەردەمەن. بەیکـەرەکان نانیـان دروسـتدەکرد و کووپـەرەکان بـەرمیل و سمیـسەکان ئاسـنگەرییان دەکـرد. بـەلاّم ئـەم کاتەگۆرییانـە هـەرگیز وەك جیاکردنـەوە چـینایەتیەکەی هیندسـتان ڕەق نـەبوون و بەرەبـەرە ماناکـەی خۆیـان وەك دەرخەری پیشەی کەسێك لەدەست دا. هەرچەندە بازرگانـانی هیندسـتان لـە سەرتاسەری زەریای هیند بازرگانییان دەکـرد و پیـشەسازی سـەرەکی قومـاش دامـەزرا، بـەلاّم سیـستەمی پلەبەنـدی چینایەتی و دەسـەلاّتی ڕەهـای موگـالّ کۆسـپی گـەورەی بـەردەم پەرەپێـدانی دەزگایـانی ئـابووری کـراوە بـوون لـە هیندسـتان دا. بـەهاتنی سـەدەی نۆزدەیـەم بارودۆخەکـە تەنانـەت کـەمتر ڕێخۆشـکار بـوو بـۆ بەپیـشەسازیبوون، کاتێـك هیندسـتان بـوە کۆلۆنییـەکی چەوساوەی ئینگلتەرە. چین، هەرگیز بە فەرمی لە لایـەن هێزێکـی ئەورووپیـەوە نەکراوەتە کۆلۆنی، بەلاّم دوای ئەوەی ئینگلیزەکان سەرکەوتوانە چینیەکانیان لە جەنگەکانی ئۆپیۆم دا لە نێوان سالاّنی ١٨٣٩ و ١٨٤٢ دا و دواتریش دووبارە لە نێوان سالاّنی ١٨٥٦ و ١٨٦٠ دا تێشکاند، چین ناچـار بـوو کـە زنجیرەیـەك ڕێکەوتنامـەی ئابڕووبـەر ئیمـزا بکـا و بـواری هاتنـە نـاوەوەی هـەناردە ئەورووپییەکان بدا. لەبەر ئـەوەی چـین و هیندسـتان و وولاّتـانی تـر نـەیانتوانی سوود لە دەرفەتە پیشەسازی و بازرگانییەکان وەربگرن، ئاسیا جگە لە یابـان، لە دواوە مانەوە، لە کاتێك دا ئەورووپای ڕۆژئاوا بەرەو پێشەوە دەڕۆیشت.

ئاڕاستەی پەرەپێدانی دەزگایی کە یابان لە سەدەی نۆزدەیەم دا گرتیەبەر، دیسانەوە کارلێکردنی نێوان وەرچەرخانە مێژووییەکان و جیاوازییە بچووکەکان کە بەهۆی لێکترازانی دەزگاییەوە دروستدەبن، ڕووندەکاتەوە. یابان وەك چـین لە ژێر حوکمی ڕەهادا بوو. بنەمالّەی تۆکۆگـاوا لـە سـالّی ١٦٠٠ دا دەسـەلاّتیان گرتەدەست و لە ڕێگەی سیستەمێکی فیودالّیەوە حوکمیان دەکرد کە بازرگـانی

نێودەوڵەتی قەدەغەکرد. یابانیش خۆی لەبەردەم وەرچەرخانێکی گرنگ دا بینیەوە کاتێك چوار کەشتی جەنگی ئەمەریکی بە فەرماندەیی ماسیۆ سی پێری چونە ناو کەنداوی ئیدۆ لە تەمووز ١٨٥٣ دا و داوای تەنازولاتی بازرگانی هاوشێوەی ئەوەی ئینگلتەرەیان کرد کە لە چینی وەرگرتبوو لە جەنگەکانی ئۆپیۆم دا. بەڵام ئەم وەرچەرخانە مێژووییە لە یابان زۆر جیاواز کاریکرد. سەرەڕای نزیکی یابان و چین لەیەکەوە وکاریگەرییان لەسەریەکتر، بە هاتنی سەدەی نۆزدەیەم چین و یابان لە ڕووی دەزگاییەوە لێکترازا بوون.

لە کاتێك دا حوکمی تۆکۆگاوا لە یابان حوکمێکی ڕەها و چەوسێنەر بوو، دەسەڵاتی کەمی بەسەر سەرکردەکانی ناوچە فیوداڵیە سەرەکییەکانی تردا دەشکاو مەترسی ڕووبەڕووبوونەوەی لەسەربوو. هەرچەندە یاخیبوونی ڕەنجدەران و ناڕەزایی مەدەنی لە ئارادا بوو، دەسەڵاتی ڕەها لە چین بەهێز تر بوو، ڕێکخستنەکانی ئۆپۆزیۆسۆن لاوازترو خاوەن ئۆتۆنۆمی کەمتر بوون. سەرکردەکانی ناوچەکانی تر لە چین دا نەیاندەتوانی تەحەدای حوکمی ڕەهای ئیمپراتۆر بکەن و ڕێچکەیەکی دەزگایی ئەڵتێرنەتیف دیاریبکەن. ئەم جیاوازییە دەزگاییانەی کە لە زۆر ڕووەوە بچووك بوون بە بەراوورد لەگەڵ ئەو جیاوازییانەی چین و یابانی لە ئەوروپای ڕۆژئاوا جیادەکردەوە، ئاکامی چارەنوس سازیان هەبوو لە کاتی ئەو وەرچەرخانە مێژووییەی بەهۆی بەخورتی گەیشتنی ئینگلیز و ئەمەریکییەکانەوە سەریهەڵدا. چین بەردەوامبوو لەسەر ڕێچکەی ڕەهایی دەسەڵاتی خۆی دوای جەنگەکانی ئۆپیۆم، لە کاتێك دا هەڕەشەی ئەمەریکا بوە هۆی بەهێزکردنی ئۆپۆزیۆسۆن دژی حوکمی تۆکۆگاوا لە یابان و بوە هۆی بەرپاکردنی شۆڕشێکی سیاسی کە گەڕانەوەی مێجی بوو، هەروەك لە چاپتەری دەیەم دا دەبینین. ئەم شۆڕشە سیاسییەی یابان بوە هۆی پەرەسەندنی دەزگایانی سیاسی کراوەتر و دەزگایانی ئابووری زۆر کراوەتر و دانانی بناخەی ئەو گەشەکردنە خێرایەی لە یابان ڕوویدا، لە کاتێك دا چین لە ژێر حوکمی ڕەهادا مایەوە.

چۆنیەتی کاردانەوەی یابان بەرامبەر هەڕەشەی کەشتییە جەنگییەکانی ویلایەتە یەککگرتوەکان بە دەسپێکردنی پرۆسەی گۆڕانکاری بنەڕەتی لە دەزگاکان دا، یارمەتیمان دەدا تا ڕویەکی تری چۆنیەتی باری زەوی دەوری خۆمان تێبگەین: گواستنەوە لە چەقبەستنی ئابووری بەرەو گەشەکردنی خێرا.

باشووری کۆریا و تایوان و دواتریش چین لە دوای دوەم جەنگی جیهانیەوە ڕێژەی بەرچاوی گەشەکردنی ئابوورییان بەدەستهێنا لە ڕێگەی گرتنەبەری ڕێچکەی هاوشێوەی ئەوەی یابان. لە هەریەکێك لەم حاڵەتانەدا گەشەکردن دوای گۆڕانکاری مێژوویی لە دەزگا ئابوورییەکان دا ئەنجامدرا، هەرچەندە هەمیشە ئەو گۆڕانکارییە دەزگا سیاسییەکانیشی نەگرتۆتەوە، هەروەك حاڵەتی چین پیشانیدەدا.

لۆجیکی ئەوەی کە چۆن چەندین قۆناخی گەشەکردنی خێرا لە ناکاو کۆتاییدێ و پێچەوانە دەبێتەوە، دیسانەوە هاوپەیوەندن. بەهەمان ئەو شێوەیەی کە هەنگاوی لیبڕاوانە بەرەو دەزگایانی ئابووری کراوە دەبێتەهۆی کڵپەی گەشەکردنی ئابووری خێرا، دوورکەوتنەوەی خێرا لە دەزگا کراوەکان دەبێتە هۆی چەقبەستنی ئابووری. بەڵام زۆرجار ڕمانی گەشەکردنی خێرای وەك ئەوانەی ئەرجەنتین و یەکێتی سۆڤیەت ئەنجامی گەشەکردنن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا. هەروەك بینیمان، دەشێ ئەمە بەهۆی ململانێی ناوخۆوە لەسەر ئەو دەسکەوتانەی دەزگا چەوسێنەرەکان دەیانهێننەئاراوە ڕوویدا و لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی ڕوخانی ڕژێمەکە، یان لەبەرئەوەی نەبوونی نوێکاری و تێکدانی بنیاتنەر لە سایەی دەزگا چەوسێنەرەکان دا، گەشەکردنی بەردەوام سنووردار دەکا. چۆن یەکێتی سۆڤیەت دەکەوێتە چوارچێوەی ئەم سنوورانەوە، بە درێژی زیاتر لە چاپتەری داهاتوودا باسی ئەکەین.

ئەگەر دەزگا سیاسی و ئابوورییەکانی ئەمەریکای لاتین لە ماوەی پێنج سەد ساڵی ڕابووردودا لە لایەن کۆلۆنیالیزمی ئیسپانییەوە دارێژرابن، ئەوا ئەوانەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە لایەن عوسمانییەکانەوە دارێژران. لە ساڵی ١٤٥٣ دا، عوسمانیەکان بە سەرکردایەتی سوڵتان محەمەدی دوەم قوستەنتەنیەیان داگیرکرد و کردیانە پایتەختی خۆیان. لە ماوەی ساڵانی دواتری ئەو سەدەیەدا بەشێکی گەورەی بەلقان و ناوچەکانی تری تورکیایان داگیرکرد. لە نیوەی یەکەمی سەدەی شازدەیەم دا، حوکمی عوسمانیەکان لە سەرتاپای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقا دا بڵاوبۆوە. بە هاتنی ١٥٦٦ و تا کاتی مردنی سوڵتان سولەیمانی یەکەم کە بە سوڵتان سولەیمانی قانوونی ناسرابوو، ئیمپراتۆریەتەکەیان لە تونسەوە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ میسر و تا دەگاتە مەکە لە دوورگەی عەرەبی و بەرەو ئەوەی ئەمڕۆ عێراقە، درێژ بۆوە. دەوڵەتی عوسمانی

دەوڵەتێکی ڕەها بوو، سوڵتان بەرامبەر ژمارەیەکی کەم بەرپرسیار و کەسیش هاوبەشی دەسەڵاتەکەی نەبوو. ئەو دەزگا ئابوورییانەی عوسمانییەکان سەپاندیان زۆر چەوسێنەر بوون. مافی موڵکداری زەوی نەبوو چونکە هەموو زەوییەکان بە فەرمی هی دەوڵەت بوون. باجی زەوی و بەروبومە کشتوکاڵییەکان لەگەڵ تالانییەکانی جەنگ سەرچاوەی سەرەکی داهاتی حکومەت بوون. لەگەڵ ئەمەش دا دەوڵەتی عوسمانی دەسەڵاتی بەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا نەدەشکا بەو شێوەیەی دەسەڵاتی بەسەر ناوجەرگەی دەوڵەتەکەی دا کە ئەنازۆڵ بوو دەشکا و تەنانەت بەو ڕادەیەی کە دەوڵەتی ئیسپانی دەسەڵاتی بەسەر کۆمەڵگای ئەمەریکای لاتین دا دەشکا. دەوڵەتی عوسمانی ڕووبەڕووی تەحەدای بەردەوامی بەدەوی و هێزی هۆزەکانی تری دوورگەی عەرەبی بۆوە. نەك تەنیا توانای ئەوەی نەبوو کە ئاسایشێکی جێگیر بەسەر زۆربەی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا بسەپێنێ، بەڵکو توانای کارگێڕیشی نەبوو باج کۆبکاتەوە. لەبەر ئەوە مافی کۆکردنەوەی باجی فرۆشتە کەسانی تر بۆ کۆکردنەوەی باج بە هەر شێوەیەك دەیانتوانی. ئەم باج دانەرانە بوونە خاوەن ئۆتۆنۆمی و دەسەڵاتدار. ڕێژەی باج لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا زۆر بەرز بوو، دەیکردە نیوە یان دوو لە سەر سێی دەسکەوتی جووتیاران. زۆربەی ئەم داهاتە لە لایەن دانەرانی باجەوە گل دەدرایەوە. لەبەرئەوەی دەوڵەتی عوسمانی نەیدەتوانی ئاسایشی جێگیر دابینبکا لەو ناوچانەدا، مافی موڵکداری جێگیر نەبوو، هەڵگەڕانەوە لە یاسا و چەتەیی باو و بڵاوبوون، لە کاتێك دا گروپە چەکدارەکان هەوڵی بەدەستهێنانی دەسەڵاتی ناوچەییان دەدا. بۆ نموونە، لە فەلەستین بارودۆخەکە هێندە خراپبوو کە لە کۆتایی سەدەی شازدەیەمەوە ڕەنجدەرەکان زەوییە بەپیتەکانیان بەجێهێشت و ڕوویانکردە ناوچە شاخاوییەکان کە پارێزگاری زیاتری پێدەبەخشین لەدەست چەتەکان. دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکان لە ناوچە شارنشینەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا لە بارودۆخێکی باشتردا نەبوون. بازرگانی لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەت دا بوو، پیشەکان بە توندی لە لایەن خاوەن مۆنۆپۆلی و سەندیکاکانەوە ڕێکخرابوون. ئەنجامی ئەمەش ئەوەبوو کە لەکاتی سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی دا دەزگا ئابوورییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چەوسێنەر بوون وناوچەکە لە ڕووی ئابوورییەوە چەقیبەستبوو.

بە هاتنی ساڵانی ١٨٤٠ ەکان، عوسمانییەکان هەوڵیان دا چاکسازی لە دەزگاکان دا ئەنجامبدەن - بۆ نموونە، بە پێچەوانەکردنەوەی باجی کێڵگە و کۆنترۆڵکردنی ئەو گروپە ناوچەییانەی خاوەن ئۆتۆنۆمی بوون. بەڵام دەسەڵاتی ڕەها تا یەکەم جەنگی جیهانی بەردەوامبوو، هەوڵەکانی چاکسازی لەباربران بەهۆی ترسی ئاسایی لە تێکدانی بنیاتنەر و نیگەرانییەکانی گروپانی نوخبە لەوەی کە لە ڕووی ئابووری یان سیاسییەوە زەرەردەکەن. لە کاتێك دا ڕیفۆرمخوازە عوسمانییەکان باسی هێنانە ئارای مافی موڵکداری زەوییان دەکرد بۆ برەوپێدانی بەرهەمداریی کشتوکاڵی، واقیعی حاڵ بەردەوامبوو، لەبەر خواستی نوخبە بۆ هێشتنەوەی دەسەڵاتی سیاسی و وەرگرتنی باج. دوای کۆلۆنیکردنی ناوچەکە لە لایەن عوسمانییەکان، کۆلۆنیکردنی ئەوروپییەکان لە دوای ساڵی ١٩١٨ ەوە دەستیپێکرد. کاتێك کۆنترۆڵی ئەوروپییەکان نەما، هەمان ئەو داینەمیکەی لە وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا بینیمان کەوتەکار بە کۆنترۆڵکردنی دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکان لە لایەن نوخبە سەربەخۆکانەوە. لە هەندێك حاڵەتدا، وەك پاشایەتی لە ئەردەن دا، ئەو نوخبانە دەستنێژی ڕاستەوخۆی هێزە کۆلۆنیاڵەکان بوون، بەڵام ئەمەش چەندین جار لە ئەفریقا ڕوویدا، هەروەك دواتر دەبینین. وڵاتانی ئەمڕۆی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە خاوەنی نەوت نین، ئاستی داهاتیان هاوشێوەی نەتەوە هەژارەکانی ئەمەریکای لاتینە. ئەو وڵاتانە گیرۆدەی هێزە شێوێنەرەکانی وەك بازرگانی کۆیلە نەبوون و بۆ ماوەیەکی زۆریش سوودیان لەو لێشاوە تەکنەلۆجییە وەرگرت کە لە ئەوروپاوە دەهات. لە چاخەکانی ناوەڕاست دا، خودی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ڕووی ئابوورییەوە بەشێوەیەکی ڕێژەیی بەشێکی پێشکەتووی جیهان بوو. هەرچەندە ئەمڕۆ ئەوەندەی ئەفریقا هەژار نییە، بەڵام بەشی سەرەکی دانیشتوانەکەی تا ئێستاش لە هەژاری دا دەژین.

بینیمان کە تیۆرییەکانی پشت بەستوو بە جوگرافیا و کەلتوور و نەشارەزایی هاوکار نین بۆ شرۆڤەکردنی چۆنیەتی باری زەوی دەورمان. ئەم تیۆریانە لێکدانەوەیەکی یەکلاکارمان ناخەنە بەردەم دەربارەی ڕێچکە دیارەکانی نایەکسانی لە جیهان دا: ڕاستی ئەوەی پرۆسەی لێکترازانی ئابووری لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازی لە ئینگلتەرە دا لە سەدەکانی هەژدەیەم و

نۆزدەیەم دا دەستیپێکرد ودواتر بۆ ئەورووپای ڕۆژئاواو کۆلۆنییەکانی ئەورووپا بڵاوبۆوە و لێکترازانی بەردەوامی نێوان ناوچە جیاوازەکانی ئەمەریکاکان و هەژاری ئەفریقا یان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لێکترازانی نێوان ئەورووپای ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات وگواستنەوە لەچەقبەستنەوە بۆ گەشەکردن و هەندێجار کۆتایی لە ناکاوی هەنگاوەکانی گەشەکردن. تیۆرییە دەزگاییەکەی ئێمە هاوکارە بۆ ئەم لێکدانەوانە.

لە چاپتەرەکانی داهاتوودا، بە شێوەیەکی درێژتر باسی ئەوە دەکەین کە چۆن ئەم تیۆرییە دەزگاییە کاردەکا و دیاردە هەمەجۆرەکان ڕووندەکەینەوە کە ئەم تیۆرییە دەیانگرێتەوە. هەر لە بنچینەکانی شۆڕشی کشتوکاڵ تا هەرەسهێنانی چەندین شارستانی، یان لەبەرئەوەی ئەو شارستانیانە گەیشتنە سنووری سروشتی گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا یان لەبەر ئەوەی ئەو هەنگاوە کەمانەی بەرە و کرانەوە نران، پێچەوانە بوونەوە.

دەبینین کە چۆن و بۆچی لە کاتی شۆڕشی شکۆدار دا لە ئینگلتەرە دا هەنگاوی یەکلاکار نرا بەرەو دەزگایانی سیاسی کراوە بەتایبەتی سەیری ئەمانەی خوارەوە دەکەین.

- چۆن دەزگایانی کراوە سەریانهەڵدا لە ئەنجامی کار لەیەککردنی ئەو وەرچەرخانە مێژووییەی بەهۆی بازرگانی ئەتڵەسیەوە دروستبوو لەگەڵ سروشتی ئەو دەزگایانەی کە پێشتر لە ئینگلتەرە دا هەبوون.
- چۆن ئەم دەزگایانە بەردەوامبوون و بەهێزکران تا بناخەی شۆڕشی پیشەسازی دابمەزرێنن. بەشێك لە هۆکاری ئەمەش بوونی بازنەی بەختەوەری و بەشەکەی تریش سورانەوەی بەختهێنەری پەیوەستی(contigency) بوو.
- چۆن چەندین ڕژێم کە کۆن[illegible]ڵی دەزگا ڕەها و چەوسێنەرەکانیان دەکرد بە بەردەوامی بەرەنگاری بڵاوبوونەوەی ئەو تەکنەلۆجییە نوێیانەیان دەکرد کە شۆڕشی پیشەسازی هێنانیەئاراوە.
- چۆن ئەورووپییەکان بۆخۆیان هەموو ئەگەرەکانی گەشەکردنی ئابوورییان لە چەندین ناوچەی جیهان دا کە داگیریان کردبوون، سەرکوتکرد.
- چۆن بازنەی ناهەمواری و یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکی ویستی بەهێزی بۆ مانەوەی دەزگایانی چەوسێنەر دروستکرد و هەر ئەمەش بوە هۆی ئەوەی

کە ئەو ناوچانەی لە بنچینەوە شۆڕشی پیشەسازییان تیدا بڵاونەبۆوە، بە هەژاری بمێننەوە.

- بۆچی شۆڕشی پیشەسازی و تەکنەلۆجییە نوێکانی تر لە ناو ئەو ناوچانەی جیهان دا بڵاونەبوونەوە و پێشناچێ بڵاوببنەوە کە نەیانتوانیوە کەمترین رادەی مەرکەزیەتی دەوڵەت بچەسپێنن.

گفتوگۆکانی ترمان ئەوە پیشاندەدەن کە هەندێك ناوچەی دیاریکراو توانیان دەزگاکان بەرەو دەزگای کراوەتر بگۆڕن، وەکو فەرەنسا یان یابان، یان ئەو ناوچانەی نەیانهێشت دەزگای چەوسێنەر دابمەزرێن، وەکو ویلایەتە یەکگرتوەکان یان ئوسترالیا، ئامادەیی زیاتریان تێدا بوو بۆ بڵاوکردنەوەی شۆڕشی پیشەسازی و پێش ئەوانی تر کەوتنەوە. هەروەك لە ئینگلتەرە دا روویدا، ئەمە هەمیشە پرۆسەیەکی بێ کێشە نەبوە و لەو رێگایەدا چەندین تەحەدا بەرامبەر دەزگا کراوەکان کپکراون، هەندێجار بەهۆی داینەمیکی بازنەی بەختەوەری و هەندێجاریش بەهۆی پەیوەستی رێچکەی مێژوەوە.

لە کۆتایی دا، باسی ئەوە دەکەین کە چۆن شکستهێنانی نەتەوانی ئەمڕۆ، کاریگەری قورسی مێژووی دەزگایی ئەو نەتەوانەی لەسەرە و چەندە راوێژ دەربارەی پۆلیسی لە سەر بنەمای گریمانە هەڵەکان و، لە ناوەرۆکدا چەواشەکار، ئامادەکراون و چۆن نەتەوان ئێستاش دەتوانن وەرچەرخانە مێژووییەکان بەکاربهێنن و قاڵبەکە بشکێنن و بەرەو ریفۆرمی دەزگاکانیان هەنگاوبنێن و بکەونە سەر رێچکەی خۆشگوزەرانی زیاتر.

## ٥

# (داهاتووم بینیوه و ئەو داهاتوەش دێتەدی)
# گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەر دا

## داهاتووم بینیوه

جیاوازییە دەزگاییەکان بە درێژایی مێژوو ڕۆڵی گرنگیان بینیوە لە شرۆڤەکردنی گەشەکردنی ئابووری دا. ئەگەر زۆربەی کۆمەڵگایان لەمێژوودا لەسەر بنەمای دەزگایانی سیاسی و ئابووری چەوسێنەر دامەزرابن، ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە گەشەکردن هەرگیز ڕوونادا؟. بێگومان نەخێر. دەزگا چەوسێنەرەکان، بە پێی لۆجیکی خۆیان کاردەکەن، ئەو دەزگایانە پێوستە سامان دروستبکەن بۆ ئەوەی ئەو سامانە لە خەڵك بسەندرێ. فەرمانڕەوایەك کە قۆرخی دەسەڵاتی سیاسی بکا و حوکمی دەوڵەتێکی خاوەن مەرکەزیەت بکا، دەتوانێ ئەندازەیەك لە یاسا و ئاسایش و سیستەمێکی یاساکان بخاتەکار و چالاکی ئابووری بخاتەگەڕ.

بەلام گەشەکردن لە سایەی دەزگا چەوسێنەرەکان دا جیاوازە لەو گەشەکردنەی لە سایەی دەزگا کراوەکان دا ئەنجامدەدرێ. لە هەمووشی گرنگتر، گەشەکردن لەسایەی دەزگا چەوسێنەرەکان دا ئەو گەشەکردنە بەردەوامە نییە کە پشت بە گۆڕانکاری تەکنەلۆجی دەبەستێ، بەڵکو ئەو جۆرە گەشەکردنەیە کە پشت بە تەکنەلۆجی هەنووکەیی دەبەستێ. ڕێچکە ئابوورییەکەی یەکێتی سۆڤیەت نموونەیەکی زیندوو پیشاندەدا دەربارەی ئەوەی کە چۆن دەسەلات و هاندان کە لە لایەن دەوڵەتەوە دەخرێنەگەڕ، دەتوانن گەشەکردنی ئابووری خێرا لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەر دا ئەنجامبدەن و چۆن ئەم جۆرە گەشەکردنە لە ئاکام دا کۆتاییدێ و هەرەسدەهێنێ.

یەکەم جەنگی جیهانی کۆتاییهاتبوو، هێزە سەرکەوتوو و ژێرکەوتوەکان لە

کۆشکی مەزنی ڤێرسای لە دەرەوەی پاریس کۆبوونەوە بۆ بڕیاردان لەسەر چوارچێوەکانی ئاشتی. ئەوەی لە ناو ئامادەبوان دا دیار بوو بریتیبوو لە ودرۆ ویڵسۆن، سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئەوەشی کە لە ناو ئامادەنەبوان دا دیار بوو بریتیبوو لە نوێنەرایەتی ڕوسیا. کۆنە ڕژێمی قەیسەریەت لە لایەن بۆڵشەڤیکەکانەوە لە تشرینی یەکەم ی ١٩١٧ دا لەناوبرابوو. دواتر جەنگی ناوخۆ لە نێوان سوورەکان (بەڵشەڤیکەکان) و سپیەکان دا بەرپا بوو. ئینگلیز و فەرەنسی و ئەمەریکیەکان هێزێکی پیادەیان نارد تا دژی بۆڵشەڤیکەکان شەڕبکەن. شاندێك بە سەرکردایەتی دیپلۆماتێکی لاو کە ناوی ویلیام بولیت بوو لەگەڵ ڕووناکبیر و ڕۆژنامەنووسی ناسراو، لینکۆڵن ستێفنس، ڕەوانەی مۆسکۆ کرا تا لینین ببینیّ و هەوڵبدا نیازی بۆڵشەفیکەکان تێبگات و بگاتە ڕێکەوتنێك لەگەڵیاندا. ستێفنس وەك ڕۆژنامەنووسێکی ڕادیکاڵ و لێکۆڵەر ناسرابوو کە بەردەوام دژایەتی سروشتی دزێوی کاپیتالیزمی دەکرد لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا. ئەو لە کاتی سەرهەڵدانی شۆڕشەکە دا لە ڕوسیا بووبوو. بوونی ئەو لە شاندەکەدا بۆ ئەوە بوو کە کاری شاندەکە زیاتر جێی متمانەو کەمتر دژایەتی پێوە دیاربێ. شاندەکە گەڕایەوە و لەگەڵ خۆیدا هێڵە گشتیەکانی ئۆفەرێکی لە لینینەوە هێنایەوە دەربارەی ئەوەی کە پێوستە بکرێ بۆ چەسپاندنی ئاشتی لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتی تازە دامەزراودا. ستێفنس تووشی سەرسوڕمان بوو بەوەی دەربارەی توانا شاراوەکەی ڕژێمی یەکێتی سۆڤیەت بینی.

ئەو لە ئۆتۆبایۆگرافیەکەی ١٩٣١ دا نوسیویەتی"*(ڕوسیای سۆڤیەت، حکومەتێکی شۆڕشگێڕ و خاوەن پلانێکی پەرەپێدان بوو. پلانەکەیان بریتینەبوو لە کۆتاییهێنان بە شتە دزێوەکانی وەك هەژاریی و دەوڵەمەندی و گەندەڵی و ئیمتیاز و زۆرداری و جەنگ لە ڕیگەی کاری ڕاستەوخۆوە، بەڵکو بریتیبوو لە گەڕان بە دوای هۆکارەکانیان و لەناوبردنی ئەو هۆکارانە. ئەوان دیکتاتۆریەتێکیان دامەزراندوە کە لە لایەن کەمینەیەکی بچووکی مەشقپێکراوەوە پشتگیری دەکرێ تا بۆ چەند نەوەیەك ڕێکخستنەوەیەکی زانستی هێزە ئابوورییەکان ئەنجامبدەن و بیهێڵنەوە کە لە سەرەتادا دەبێتە هۆی هاتنەدی دیموکراسی ئابووری و لە کۆتاییشدا دیموکراسی سیاسی)*

کاتێك ستێفنس لە گەشتە دیپلۆماسیەکەی گەڕایەوە، چوو بۆ بینینی

هاوڕێی دێرینی، پەیکەرتاش جۆ دەیڤیدسۆن و بینی کە خەریکی دروستکردنی پۆرترەیتی نیوە پەیکەری بێرنارد باروخی دەوڵەمەندە. باروخ لێی پرسی ( کەواتە تۆ لە ڕوسیا بووی) لە وەڵام دا ستێفنس ووتی (من لە داهاتوو بووم و ئەو داهاتوەش دێتەدی) ئەو ئەم قسەیەی بە شێوەك دەربڕی کە بەم شێوەیە چوە ناو مێژووەوە (داهاتووم بینیوە و ئەو داهاتوەش دێتەدی)

تا سەرەتای ساڵانی ١٩٨٠ کانیش، چەندین کەسانی ڕۆژئاوایی داهاتوویان لە یەکێتی سۆڤیەت دا دەبینی و لەسەر ئەو باوەڕەش بەردەوامبوون کە ئەو داهاتووە دێتەدی. تاڕادەیەکیش هاتبوەدی، یان بەلایەنی کەمەوە بۆ ماوەیەك بەو شێوەیە بوو. لینین لە ساڵی ١٩٢٤ دا لە دنیا دەرچوو، بە هاتنی ساڵی ١٩٢٧، جۆزیف ستالین دەسەڵاتی خۆی بەسەر وڵات دا سەپاند. ئەو بەرهەڵستکارانی خۆی تەفروتونا کرد و دەستی بە هەوڵی بەپیشەسازیکردنی خێرای وڵات کرد. ئەم کارەی لە ڕێگەی کاراکردنی کۆمیتەی پلاندانانی دەوڵەتەوە کە گۆسپلان بوو ئەنجامدا کە لە ساڵی ١٩٢١ دا دامەزرابوو. گۆسپلان یەکەم پلانی پێنج ساڵەی ئامادەکرد بۆ ساڵانی نێوان ١٩٢٨ تا ١٩٣٣. گەشەکردنی ئابووری لەسەر شێوازی ستالین سادەبوو: پەرە بە پیشەسازی بدە لە ژێر فەرماندەی حکومەت و دەرامەتی پێویست بۆ ئەمە پەیدابکە لە ڕێگەی باجدانانی زۆرەوە لەسەر کشتوکاڵ. دەوڵەتی کۆمیۆنیستی سیستەمی کاریگەری کۆکردنەوەی باجی نەبوو، لە بری ئەمە ستالین کشتوکاڵی کردە "هەرەوەزی". ئەم پرۆسەیەش مانای نەهێشتنی مافی موڵکداری تایبەتی زەوی و کۆکردنەوەی دانیشتوانی گوندنشینەکان لە کێڵگەی گەورەی هەرەوەزی دا کە لە لایەن حیزبی کۆمیۆنیستەوە بەڕێوەدەبران. ئەمەش کارئاسانی بۆ ستالین کرد تا هەموو بەروبومە کشتوکاڵیەکان کۆبکاتەوە و بەکاریانبهێنێ بۆ تێرکردنی هەموو ئەو کەسانەی کارگەی نوێیان دروستدەکرد و کاریان تێدادەکردن. ئاکامی ئەمەش بۆ دانشیتوانی گوندەکان کارەساتاوی بوو. کێڵگە هەرەوەزییەکان هیچ هاندانێکیان بۆ خەڵك نەبوو تا بە جدی کاریان تێدابکەن و بەرهەمی کشتوکاڵی بە خێرایی دابەزی. بەشی زۆری ئەوەی بەرهەمدەهێنرا بە زۆر لە جووتیاران وەردەگیرا و بڕی پێویست نەدەمایەوە بۆ خواردن. مردنی خەڵك لە برساندا دەستپێکرد. لە کۆتایی دا نزیکەی شەش ملیۆن کەس لە ئەنجامی گرانی دا مردن، لە کاتێك دا سەدان هەزار کەسی تر

کوژران یان ڕەوانەی سایبیریا کران لە کاتی بە خورتی دروستکردنی کێڵگە هەرەوەزییەکان دا.

پیشەسازییە تازە دامەزراوەکە و کێڵگە هەرەوەزییەکان لە ڕووی ئابوورییەوە کارامە نەبوون، لەو ڕوانگەیەوە کە بتوانن ئەو دەرامەتانەی یەکێتی سۆڤیەت هەیبوون بە باشترین شێوە بەکاربهێنن. پێدەچوو کە ئەمە ڕەچەتەیەك بێ بۆ کارەسات و چەقبەستنی ئابووری، ئەگەر هەرەسهێنانی تەواوەتیش نەبێ. بەڵام یەکێتی سۆڤیەت بە خێرایی گەشەیکرد. تێگەیشتن لە هۆکاری ئەمە زەحمەت نییە. بواردان بە خەڵك تا بۆخۆیان بڕیاری خۆیان لە ڕێگەی بازاڕەکانەوە بدەن باشترین ڕێگایە تا کۆمەڵگایەك بتوانێ بە شێوەیەکی کارامە دەرامەتەکانی خۆی بەکاربهێنێ. کاتێك دەوڵەت یان نوخبەیەکی بچووك لە بری ئەوان کۆنترۆڵی ئەو دەرامەتانە دەکەن، نە دەتوانرێ هاندانی دروست، دروستبکرێ و نە دەتوانرێ شارەزایی و بەهرەی خەڵك بە شێوەیەکی کارامە بخرێتەگەڕ. بەڵام لە هەندێك حاڵەت دا ڕەنگە بەرهەمداریی هێزی کار و سەرمایە لە سێکتەرێك یان چالاکیەك دا هێندە بەرزتر بێ لەوانی تر، وەك سێکتەری پیشەسازی قورس لە یەکێتی سۆڤیەت، کە تانەت پرۆسەی لە سەرەوە بۆخوارەوە کە لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا دەرامەت بۆ ئەو سێکتەرە تەرخاندەکا، بتوانێ گەشەکردن ئەنجامبدا. هەروەك لە چاپتەری سێیەم دا بینیمان دەزگایانی چەوسێنەر لە دوورگەکانی کاریبی وەك باربەیدۆز و کوبا و جامایکا توانیان ئاستی ڕێژەیی بەرزی داهات دروستبکەن چونکە ئەو دەزگایانە دەرامەتەکانیان بۆ بەرهەمهێنانی شەکر تەرخانکردبوو، کە کاڵایەك بوو لە هەموو جیهان دا ڕەواجی هەبوو. بەرهەمهێنانی شەکر کە پشتی بە کۆیلان دەبەست بێگومان "کارامە" نەبوو و هیچ گۆڕانکارییەکی تەکنەلۆجی یان تێکدانی بنیاتنەر لەم کۆمەڵگایانەدا ڕوویاننەدا، بەڵام ئەمە ڕێگەی بەدەستهێنانی بڕێك گەشەکردنی لێنەگرتن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەر دا. بارودۆخەکە لە یەکێتی سۆڤیەت دا هاوشێوە بوو، ئەمجارە پیشەسازی ڕۆڵی شەکری وڵاتانی کاریبی دەگێڕا. گەشەکردنی ئابووری لە یەکێتی سۆڤیەت ئەنجامدرا چونکە تەکنەلۆجییەکەی بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی ئەورووپا و ویلایەتە یەکگرتوەکان هێندە دواکەوتووتر بوو کە توانرا دەسکەوتی گەورە بەدەسبهێنرێ لە ڕێگەی تەرخانکردنەوەی دەرامەت بۆ سێکتەری پیشەسازی،

هەرچەندە ئەمە بە شێوەیەکی ناکارامە و لە رێگەی بەکارهێنانی هێزەوە ئەنجامدرا.

بەر لە ساڵی ١٩٢٨، زۆربەی ڕوسەکان لە لادێکان دا دەژیان. ئەو تەکنەلۆجییەی لە لایەن ڕەنجدەرانەوە بەکاردەهێنرا سەرەتایی بوو، هاندەری کەم لە ئارادا بوون تا ئەم ڕەنجدەرانە بەرهەمەکانیان زیاتر کەن. لە راستیدا، دوا پاشماوەی فیوداڵیزمی ڕوسی تەنیا ماوەیەکی کورت پێش یەکەم جەنگی جیهانی لەناوبران. لەبەر ئەوە دەتوانرا توانایەکی بەکارنەهاتووی ئابووری بخرێتەگەڕ بە گواستنەوەی ئەم هێزی کارە لە کشتوکاڵەوە بۆ پیشەسازی. بە پیشەسازیکردنی ستالینی، رێگایەکی بێبەزەییانەی خستنەگەڕی ئەم توانایە بوو. ستالین بەزۆر ئەم دەرامەتە زۆر خراپ بەکارهاتوەی کشتوکاڵی گواستەوە بۆ پیشەسازی، کە توانرا بە بەرهەمدارییەکی زیاترەوە بخرێنە کار، هەرچەندە خودی پیشەسازییەکە بۆخۆی بە شێوەیەکی زۆر ناکارامە رێکخرابوو بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی کە دەکرا بەرهەمبهێنرایە ئەگەر ئەم پیشەسازییە بە باشی رێکبخرایە. لە نێوان ساڵانی ١٩٢٨ و ١٩٦٠ داهاتی نەتەوەیی ساڵانە ٦٪ زیادیکرد، کە ڕەنگە خێراترین رێژەی گەشەکردنی ئابووری بوبێ تا ئەو کاتە لەمێژوودا. ئەم گەشەکردنە ئابوورییە خێرایە لە رێگەی گۆڕانکاری تەکنەلۆجییەوە ئەنجامنەدرا، بەڵکو لە رێگەی تەرخانکردنەوەی هێزی کار و کەڵەکەکردنی سەرمایە لە رێگەی دروستکردنی ئامێر و کارگەی ترەوە ئەنجامدرا.

گەشەکردن هێندە خێرا بوو کە نەك تەنیا لینکۆڵن ستێفنس، بەڵکو چەندین نەوەی ڕۆژئاوای سەرسامکردبوو، ئاژانسی هەواڵگری ناوەندیی ئەمریکای سەرسامکردبوو. تەنانەت سەرکردەکانی یەکێتی سۆڤیەتی وێنەی نیکیتا خرۆشێڤیشی سەرسامکردبوو، کە بە شانازییەوە لە ووتارێکی دا بۆ دیپلۆماتانی ڕۆژئاوا لە ١٩٥٦ دا ڕایگەیاند (ئێوە "ڕۆژئاوا" دەخەینە ژێر زەوییەوە) تەنانەت لە ساڵی ١٩٧٧یش دا کتێبێکی ئەکادیمی ناسراو کە لەلایەن ئابووریناسێکی ئینگلیزییەوە نووسرابوو، لای وابوو کە ئابووری لەسەر شێوازی سۆڤیەت لە ئابووری کاپیتالیستی سەرکەوتوو ترە لە ڕووی گەشەکردنی ئابوری و پەیداکردنی کار بۆ هەموان و جێگیرکردنی نرخ و تەنانەت پەروەردەکردنی خەڵك بە مۆتیڤی دوور لە خۆپەرستیەوە. کاپیتاڵیزمە داماوە کۆنەکەی ڕۆژئاوا

تەنیا لە ڕووی دابینکردنی ئازادی سیاسییەوە باشتر بوو. لە ڕاستیدا کتێبێکی خوێندنی زانکۆ دەربارەی ئابووری بە بڵاوی بەکاردەهێنرا کە لە لایەن براوەی خەڵاتی نۆبڵ، پۆڵ سامیۆڵسن نووسرابوو، چەندین جار پێشبینی زاڵبوونی ئابووری یەکێتی سۆڤیەتی کردبوو لە داهاتوودا. لە چاپی ١٩٦١ دا سامیۆڵسن پێشبینیکرد کە داهاتی نەتەوەیی یەکێتی سۆڤیەت تا ساڵی ١٩٨٤ ڕەنگە پێش ئەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکان بکەوێتەوە، بەڵام بە دڵنیاییەکی زیاترەوە تا ساڵی ١٩٩٧ ئەمە ڕوودەدا. لە چاپی ١٩٨٠ دا گۆڕانکاری کەم لە شیکردنەوەکەی دا هەبوو، هەرچەندە دوو ڕێکەوتەکە گۆڕا بوون بۆ ٢٠٠٢ و ٢٠١٢.

هەرچەندە سیاسەتەکانی ستالین و سەرکردە سۆڤیەتیەکانی دوای ئەو توانیان گەشەکردنی ئابووری خێرا ئەنجامبدەن، بەڵام ئەوان نەیانتوانی ئەو گەشەکردنە بە شێوەیەکی بەردەوام بهێڵنەوە. بە هاتنی ١٩٧٠ کان گەشەکردنی ئابووری جگە لە گیرخواردن هیچی تر نەبوو. گرنگترین وانە بریتییە لەوەی کە دەزگایانی چەوسێنەر ناتوانن گۆڕانکاری تەکنەلۆجی بەردەوام دروستبکەن لەبەر دوو هۆ: نەبوونی هاندانی ئابووری و بەرهەڵستیکردنی نوخبەکان. جگە لەمانەش، کاتێك هەموو ئەو دەرامەتانەی بەشێوەیەکی زۆر ناکارامە بەکاردەهێنران، گوێزرانەوە بۆ پیشەسازی، دەسکەوتی ئابووری کەم لە بەکارهێنانی بەزۆر تەرخانکردنی دەرامەتەکان لەم ڕێگەیەوە مایەوە. دوای ئەوە سیستەمی سۆڤیەتی گەیشتە بەربەست و نەبوونی نوێکاری و لاوازی هاندانی ئابووری بوونە ڕێگر لەبەردەم پێشکەوتنی زیاتری ئابووری دا. تەنیا مەیدانێك کە سۆڤیەتەکان توانیان بەردەوامی بە هەندێك نوێکاری بدەن لە ئەنجامی تەقەلایەکی زۆر دا بریتیبوو لە بواری تەکنەلۆجی سەربازی و فەزا دا. لە ئەنجامی ئەمەدا توانیان یەکەم سەگ، لایکا و یەکەم پیاو، یۆری گاگارین بنێرن بۆ فەزا. لەهەمانکات دا ئەی کەی ٤٧ یان لە پاش خۆیان بۆ جیهان بەجێهێشت.

گۆسپلان بەهێزترین ئاژانسی پلاندانانی بەرپرس لە دانانی پلانی ناوەندی یەکێتی سۆڤیەت بوو. یەکێك لە سوودەکانی پلانە پێنج ساڵیە یەك لەدوا یەکەکان کە لە لایەن گۆسپلانەوە دەنووسران و سەرپەرشتیدەکران بریتیبوو لە مەودای درێژخایەنی پێویست بۆ وەبەرهێنان و نوێکاری مەنتیقی. لە واقیعدا

ئەوەی لە پیشەسازی سۆڤیەت دا جێبەجێکرا پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە پلانەکانی پێنج ساڵیەوە نەبوو کە زووزوو پێداچوونەوەیان تێدا دەکراو دەنووسرانەوە یان هەر پشتگوێدەخران. پەرەپێدانی ئابووری لە رێگەی فەرمانەکانی ستالین و مەکتەبی سیاسییەوە ئەنجامدەدرا کە زووزوو رای خۆیان دەگۆڕی و زۆرجاریش بە تەواوی پێداچوونەوەیان بۆ بڕیارەکانی پێشووتریان دەکرد. هەموو پلانەکان ئاماژەی "رەشنووس" یان "سەرەتایی"یان لەسەر کرابوو، تەنیا کۆپی پلانێك لەسەری نووسرابوو "کۆتایی" ـ کە ئەویش بۆ پیشەسازی سووك بوو لە ساڵی ١٩٣٩ دا ـ رووناکی بینی. ستالین بۆخۆی لە ساڵی ١٩٣٧ دا ووتی (تەنیا بیرۆکراتەکان وا بیردەکەنەوە کە کاری پلاندانان بە دروستکردنی پلانەکە تەواودەبێ، دروستکردنی پلان تەنیا سەرەتایە. ئاراستەی راستەقینەی پلانەکە تەنیا دوای تەواوکردنی پلانەکە گەڵاڵەدەبێ) ستالین دەیویست دەسەڵاتی خۆی بەکاربهێنێ بۆ پاداشتکردنی ئەو کەسانە یان گروپانەی لە رووی سیاسییەوە دڵسۆزی بوون و بۆ سزادانی ئەوانەی بە پێچەوانەوە رەفتاریاندەکرد. رۆڵی سەرەکی گۆسپلان بریتیبوو لە کۆکردنەوەی زانیاری بۆ ستالین تا بتوانێ بە شێوەیەکی باشتر چاودێری دۆست و دوژمنانی بکا. لە راستیدا گۆسپلان خۆی لە بڕیاردان دووردەخستەوە، چونکە ئەگەر بڕیارێکت بدایە و ئەنجامەکەی خراپ بوایە، رەنگە بکوژرایتایە. باشترە خۆت لە هەموو بەرپرسیارێتیەك بەدووربگری.

نموونەیەکی ئەوەی کە چی روویدەدا ئەگەر کارەکەت بە جدی بکردایە لە بری ئەوەی زیرەکانە مەزەندەی ئەوەت بکردایە کە حیزبی کۆمیۆنیست دەیویست، لە رێگەی سەرژمێری ساڵی ١٩٣٧ ەوە رووندەبێتەوە. کاتێك ئەنجامەکان گەڕانەوە، دیار بوو کە ئەو ئەنجامانە پیشانیان دەدا کە ژمارەی دانیشتوان ١٦٢ ملیۆن کەس بوو، زۆر کەمتر لەوەی کە ستالین چاوەڕێیدەکرد و کەمتر لە ١٦٨ ملیۆن کەس کە ستالین بۆخۆی لە ساڵی ١٩٣٤ دا رایگەیاندبوو. سەرژمێری ساڵی ١٩٣٧، یەکەم سەرژمێری بوو لە دوای ساڵی ١٩٢٦ ەوە، یەکەم سەرژمێری بوو لە دوای برسێتی و قەڵاچۆکردنەکانی سەرەتای ١٩٣٠کان دا. ژمارەی راستەقینەی دانیشتوان رەنگدانەوەی ئەمە بوو. کاردانەوەی ستالین بەرامبەر بەم ئەنجامە بریتیبوو لە گرتن و دوورخستنەوەی ئەوانەی سەرژمێرییەکەیان ئەنجامدابوو بۆ سایبیریا یان

کوشتنیان. ئەو فەرمانی ئەنجامدانی سەرژمێرییەکی تری دا کە لە ساڵی ١٩٣٩ دا ئەنجامدرا. ئەمجارە ئەنجامدەرانی سەرژمێرییەکە کارەکەیان بە دروستی کرد: بۆیان دەرکەوت کە لە راستیدا ژمارەی دانیشتوان ١٧١ ملیۆن کەس بوو.

ستالین دەیزانی لە ئابووری سۆڤیەت دا، خەڵك هاندانی ئەوتۆیان نەبوو بۆ ئەوەی بە جدی کاربکەن. کاردانەوەی سروشتی بەرامبەر بەمە دەبوایە پێدانی ئەو هاندانانە بوایە و هەندێجاریش ئەمەی دەکرد ـ بۆ نموونە، بە گواستنەوەی کەلوپەلی خۆراك بۆ ئەو ناوچانەی کە بەرهەمدارییی تیایان دا دابەزیبوو ـ بۆ پاداشتکردنی پێشکەوتن. جگە لەمە، هەر لە ساڵی ١٩٣١ ەوە ئەو وازی لە ئایدیای دروستکردنی " پیاوان و ژنانی سۆشیالیست" هێنا کە بەبێ پاداشتی دارایی کاریاندەکرد. لە ووتارێکی بە ناوبانگ دا ستالین رەخنەی لە " بانگێشەکردنی یەکسانی" گرت و دوای ئەوە نەك تەنیا کارە جیاوازەکان کرێی جیاوازیان بۆ دیاریکرا، بەڵکو سیستەمی پاداشتیش خرایەگەڕ. جێگەی خۆیەتی بزانین ئەمە چۆن کاریدەکرد. کۆمپانیایەك بە پێی پلانی ناوەندی دەبوایە بگەشتایەتە ئەو بەرهەمە دیاریکراوەی لە پلانەکەدا دانرابوو، هەرچەندە ئەم پلانانە زۆرجار دەسکاریدەکران و گۆڕانکارییان تێدادەکرا. لە ساڵانی ١٩٣٠ ەکانەوە کرێکاران پاداشتدەکران ئەگەر بگەشتنایەتە ئەو ئاستەی بەرهەمهێنانە. ئەم پاداشتانە هەندێجار زۆر بەرز بوون، بۆ نموونە، دەگەیشتنە ٣٧٪ ی کرێکانیان بۆ بەڕێوەبەران و ئەندازیارە پێشکەوتوەکان. بەڵام پێدانی ئەم جۆرە پاداشتانە بوونە هۆی کەمکردنەوەی هەموو جۆرە هاندانێك بۆ گۆڕانکاری تەکنەلۆجی. هۆکارێکی ئەمەش ئەوە بوو، نوێکاری، کە دەبوە هۆی دوورخستنەوەی دەرامەت لە بەرهەمهێنانی هەنووکەیی دا، ڕیسکی نەگەیشتن بە ئاستی بەرهەمهێنانی دیاریکراوی دروستدەکرد و بەمەش ڕیسکی پێنەدانی پاداشتەکان. هۆکارێکی تر بریتیبوو لەوەی کە تارگێتەکانی بەرهەمهێنان لەسەر بنەمای ئاستی بەرهەمهێنانی پێشووتر دیاریدەکران. ئەمەش هاندانی گەورەی دروستدەکرد بۆ ئەوەی هەرگیز بەرهەم زیاد نەکرێ چونکە زیادکردنی بەرهەم تەنیا مانای ئەوە بوو کە لە داهاتوو دا پێویستە بەرهەم زیاتر بکرێ، چونکە تارگێتەکانی داهاتوو لەسەر بڕی بەرهەمهێنانی هەنووکە دیاریدەکران. کارکردنی کەم هەمیشە باشترین ڕێگا بوو بۆ پێکانی تارگێ و وەرگرتنی پاداشت. لەبەر ئەوەی پاداشتەکان مانگانە دەدران، هەموو کەسێکی وا

لێکردبوو جەخت لە سەر حازر بکا، لە کاتێك دا نوێکاری بریتییە لە قوربانیدان لەمڕۆدا بۆ ئەوەی سبەینێ زیاترت هەبێ.

تەنانەت لە کاتێك دا پاداشت و هاندان لە گۆڕینی ڕەفتار دا کاریگەر بوون، زۆر جار کێشەی تریان دروستدەکرد. پلاندانانی ناوەندی ئەوەندە باش نەبوو تا جێگەی ئەوەی ئابووریناسی مەزنی سەدەی هەژدەیەم، ئادەم سمیس پێیدەووت " دەستی نادیار"ی بازاڕ، بگرێتەوە. لە کاتێك دا پلانەکە باسی لەوحەی ئاسنی دەکرد بە تەن، لەوحەکان وا دروستدەکران کە قورس بن، لە کاتێك دا بە پێی ڕووبەری لەوحەی ئاسن پلانەکە دادەڕێژرا، لەوحەکان زۆر تەنك دروستدەکران. کاتێك پلانی دروستکردنی سوورەیا بەپێی تەن دادەڕێژرا، سوورەیاکان هێندە قورس دروستدەکران کە بە زەحمەت هەڵدەواسران.

لە ساڵانی ١٩٤٠ کان دا، سەرکردەکانی یەکێتی سۆڤیەت، تەنانەت ئەگەر ئەوانەی لە ڕۆژئاوادا سەرسامی ئەزموونی سۆڤیەت بوون دەرکیان بەمە نەکردبێ، زۆرباش ئاگاداری ئەم هاندانە چەوتانە بوون. سەرکردەکانی سۆڤیەت وا ڕەفتاریان دەکرد کە ئەمانە بەهۆی کێشەی تەکنیکیەوە ڕوودەدەن و دەکرێ بەسەر ئەم کێشانەدا زاڵبن. بۆ نموونە، وازیان لە پێدانی پاداشت هێنا کە لەسەر بنەمای تارگێتەکانی بەرهەم دەدران و ڕێگەیان دا بە کۆمپانیاکان تا بەشێك لە قازانجەکانیان تەرخانبکەن بۆ پێدانی پاداشت. بەڵام "مۆتیڤی قازانجکردن" نەبوە هۆی هاندانی زیاتر بۆ ئەنجامدانی نوێکاری لەو هاندانەی لە ڕێگەی تارگێتەکانی بەرهەمەوە خرابوەگەڕ. سیستەمی نرخ کە بۆ ژماردنی قازانج بەکاردەهێنرا هیچ پەیوەندیەکی نەبوو بە بەهای نوێکاری و تەکنەلۆجی نوێوە. بە پێچەوانەی ئابووری بازاڕەوە، نرخ لە یەکێتی سۆڤیەت لە لایەن حکومەتەوە دادەنرا، بۆیە پەیوەندییەکی ئەوتۆی بە بەهاوە نەبوو. بۆ ئەوەی هاندانی تایبەت بۆ نوێکاری دروستبکەن، یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٤٦ دا پاداشتی زیاتر دیاریکراوی بۆ نوێکاری تەرخانکرد. هەر لە ساڵی ١٩١٨ ەوە پرینسیپی پێدانی هاندان لەبەرچاوگیرابوو کە پێویستە داهێنەر پاداشتی دارایی بۆ داهێنانەکەی وەربگرێ، بەڵام پاداشتەکان کەم بوون و پەیوەندی نەبوو بە بەهای تەکنەلۆجییە نوێکەوە. ئەمە تەنیا لە ساڵی ١٩٥٦ دا گۆڕا کاتێك داواکرا کە پێویست بوو پاداشت بە گوێرەی بەرهەمداریی نوێکارییەکە دیاریبکرێ. لەبەر ئەوەی بەرهەمداریی بە پێی سوودەکانی ئابووری دەپێورا بە بەکارهێنانی

سیستەمی نرخ، ئەمەش دیسانەوە هاندانێکی ئەوتۆ نەبوو بۆ ئەنجامدانی نوێکاری. دەتوانرێ چەندین لاپەڕە پڕبکرێتەوە لەسەر نموونەکانی هاندانی نابەجێ کە ئەم سکیمانە دروستیاندەکرد. بۆ نموونە، لەبەر ئەوەی قەبارەی ئەو پارەیەی بۆ پاداشتی نوێکاری تەرخاندەکرا بە پێی کۆی ئەو کرێیانەی کۆمپانیایەك دەیدا دیاریدەکرا، ئەمە هاندانی بۆ نوێکاری وخستنەگەڕی تەکنەلۆجییای نوێ کەمکردەوە کە دەبوە هۆی کەمکردنەوەی هێزی کار.

گرنگیدان بە ڕێسای جیاواز و سکیمی جیاواز بۆ پاداشتکردن، گرفتی بنچینەیی سیستەمەکەی ڕوپۆشدەکرد. هەتا هێزو دەسەلاتی سیاسی لەچنگی حیزبی کۆمیۆنیست دا بمایەتەوە، مەحالێ بوو بە شێوەیەکی بنەڕەتی ئەو هاندانە گرنگانە بگۆڕرێ کەخەڵك ڕووبەڕووی بووبونەوە، پاداشت هەبوایە یان نا. هەر لە کاتی دامەزراندنیەوە حیزبی کۆمیۆنیست نەك تەنیا هەر گێزەر بەڵکو گۆچانیشی بەکارهێناوە، گۆچانی گەورە بۆ ئەنجامدانی مەرامەکانی خۆی. بەرهەمداریی لەئابووری دا جیاواز نەبوو. کۆمەڵێکی زۆر یاسا دانران بۆ ئەوەی خۆدزینەوەی کرێکاران لە کارکردن وەك تاوان لەقەڵەم بدرێ. لە حوزەیرانی ١٩٤٠ دا. بۆنمونە، یاسایەك دانرا و بە پێی یاساکە، ئامادەنەبوون، کە پێناسە کرا بە هەر بیست خولەکێك ئامادەنەبوونی بێمۆڵەت یان تەنانەت خۆخلەفاندن لە کاتی کارکردن دا، بوە سەرپێچی تاوانکاری کە سزاکەی بریتیبوو لە شەش مانگ کاری قورس و بڕینی ٪٢٥ موچە. شێوەی جیاوازی هەمان جۆر سزادان خرانەگەڕ و بە خێرایی سەرسوڕهێنەر جێبەجێدەکران. لە نێوان سالانی ١٩٤٠ و ١٩٥٥ دا، ٣٦ ملیۆن کەس، کە دەیکردە یەك لەسەر سێی ژمارەی کەسانی پێگەیشتووی دانیشتوان، بەم تاوانانە سزادران. لەم ٣٦ ملیۆن کەسە، ١٥ ملیۆنیان خرانە بەندیخانە و ٢٥٠,٠٠٠ کەسیش گوللە باران کران. لە هەر ساڵێك دا، یەك ملیۆن کەس لە بەندیخانەدا بوون بەهۆی سەرپێچییەکانی کارەوە. ئەمە ئەو ٢,٥ ملیۆن کەسە ناگرێتەوە کە ستالین ڕەوانەی سەربازگەکانی سایبیریای کردبوون. هەموو ئەمانە هێشتا کاریگەری نەبوو. هەرچەندە دەتوانی خەڵك بگوێزیتەوە بۆ کارگەکان، بەلام ناتوانی بە زۆر و هەڕەشکردنی کوشتن خەڵك ناچار بکەیت بیربکەنەوە و بیرۆکەی باش پێشکەشبکەن. ناچارکردن بۆ کارکردنی لەم جۆرە ڕەنگە بەرهەمی شەکری لە باربەیدۆز و جامایکا زیاد کردبێ، بەلام ئەمە، لە ئابووری پیشەسازی مۆدێرن دا، ناتوانێ جێگەی هاندان

بگرێتەوە.

ڕاستی ئەوەی کە نەدەکرا هاندانی ڕاستەقینە و کاریگەر لە ئابوورییەك دا بخرێتە گەڕ کە لە ناوەندەوە پلانی بۆ دادەنرا، لەبەر گرفتی تەکنیکی دیزاینی سکیمەکانی پاداشت نەبوو، بەڵکو لەناو هەناوی هەموو ئەو شێوازە دا بوو کە بەهۆیانەوە گەشەکردنی چەوسێنەر ئەنجامدرابوو. ئەم جۆرە گەشەکردنە بە فەرمانی حکومەت ئەنجامدەدرا کە دەیتوانی هەندێك گرفتی بنەڕەتی ئابووری چارەسەربکا، بەڵام خستنەگەڕی گەشەکردنی ئابووری بەردەوام پێویستی بەوە بوو کە تاکەکان بەهرە و ئایدیاکانی خۆیان بەکاربهێنن و ئەمەش هەرگیز لە ڕێگەی سیستەمی ئابووری شێواز سۆڤیەتەوە نەدەکرا ئەنجامبدرێ. فەرمانڕەوایانی یەکێتی سۆڤیەت دەبوایە وازیان لە دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکان بهێنایە، بەڵام ئەم وازهێنانە دەسەڵاتی سیاسی ئەوانی دەخستە مەترسییەوە. لە ڕاستیدا کاتێك مایکل گۆرباچۆڤ لە دوای ساڵی ١٩٨٧ ەوە دەستیکرد بە دوورکەوتنەوە لە دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر، دەسەڵاتی حیزبی کۆمیۆنیست هەرەسیهێناو لەگەڵیشیدا هەموو یەکێتی سۆڤیەت.

یەکێتی سۆڤیەت توانی گەشەکردنی خێرا ئەنجامبدا، تەنانەت لە سایەی دەزگا چەوسێنەرەکان دا، چونکە بۆلشەڤیکەکان توانیان دەوڵەتێکی بەهێزی خاوەن مەکەزیەت دابمەزرێنن و ئەمەشیان بەکارهێنا بۆ تەرخانکردنی دەرامەتەکان بۆ سێکتەری پیشەسازی. بەڵام هەروەك هەموو حاڵەتەکانی گەشەکردن لە سایەی دەزگا چەوسێنەرەکان دا، ئەم ئەزموونە گۆڕانکاری تەکنەلۆجی لە خۆ نەگرت و بەردەوامنەبوو. گەشەکردن لە سەرەتادا هێواش بۆوە و دواتریش بە تەواوی هەرەسیهێنا. هەرچەندە لە ئەنجامدا نامێنێ، ئەم جۆرە گەشەکردنە، ئەوە ڕووندەکاتەوە کە چۆن دەزگایانی چەوسێنەر دەتوانن چالاکی ئابووری بخەنەگەڕ.

بە درێژایی مێژوو زۆربەی کۆمەڵگاکان لە لایەن دەزگایانی چەوسێنەرەوە حوکمیانکراوە و ئەوانەی توانیویانە ئەندازەیەك لەئاسایش لە وڵاتەکانیان دا بچەسپێنن، توانیویانە برێك لە گەشەکردنی سنووردار ئەنجامبدەن ـ هەتا ئەگەر هیچ کام لەم کۆمەڵگا چەوسێنەرانە نەیانتوانیبێ گەشەکردنی بەردەوام ئەنجامبدەن. لە ڕاستیدا هەندێك لە خاڵە وەرچەرخێنەرەکانی مێژوو لە ڕێگەی ئەو نوێکارییە دەزگاییانەوە هاتنەدی کە دەزگا چەوسێنەرەکانیان پتەوتر کرد

و بوونە هۆی زیادکردنی دەسەلاتی یەکێك لە گروپەکان تا یاساو ئاسایش بسەپێنن و سوود لە چەوسانەوەکە وەرگرن. لە بەشەکانی تری ئەم چاپتەرەدا، یەکەم، باسی سروشتی نوێکاری دەزگایی دەکەین کە ئەندازەیەك لە مەرکەزیەتی دەوڵەت دەسەپێنێ و دەبێتە هۆی گەشەکردن لە سایەی دەزگا چەوسێنەرەکان دا. دواتر، ئەوە ڕووندەکەینەوە کە چۆن ئەم ئایدیایانە هاوکاریمان دەکەن تا لە شۆڕشی کشتوکاڵی تێبگەین کە گواستنەوەیەکی یەکجار گرنگ بوو بەرەو کشتوکاڵ کە چەندین لایەنی شارستانی ئێستامان پشتیپێدەبەستێ. لە کۆتایی چاپتەرەکە دا ئەوە ڕووندەکەینەوە، بە هێنانەوەی نموونەی دەوڵەتی ـ شاری مایا، کە چۆن گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا سنووردارە، نەك تەنیا لەبەر نەبوونی پێشکەوتنی تەکنەلۆجی، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە دەبێتە هۆی هاندانی شەڕی ناوخۆ لە نێوان گروپە ناکۆکەکان دا کە دەیانەوێ دەستبگرن بەسەر دەوڵەت و ئەو دەسکەوتانەی دەزگا چەوسێنەرەکان دەیانهێننەئاراوە.

## لە کەنارەکانی ڕووباری کاسای دا

یەکێك لە لقە مەزنەکانی ڕووباری کۆنگۆ بریتییە لە کاسای. کاسای لە ئەنگۆلاوە هەڵدەقوڵێ و بەرەو باکوور دەڕوات و لە باکووری ڕۆژهەلاتی کینشاسا، پایتەختی کۆماری دیموکراسی کۆنگۆی ئەمڕۆ، تێکەڵی ڕووباری کۆنگۆ دەبێ. هەرچەندە کۆماری دیموکراسی کۆنگۆ بە بەراورد لەگەڵ ناوچەکانی تری جیهان هەژارە، بەلام هەمیشە جیاوازی گەورە لە نێوان دەوڵەمەندی گروپە جیاوازەکانی ناو کۆنگۆ دا هەبوە. ڕووباری کاسای سنووری نێوان دوو لەم گروپانەیە. هەرزوو دوای ئەوەی دەچێتە ناو کۆنگۆ و بە کەناری ڕۆژئاوای ڕووبارەکەدا دەڕوێت، تووشی گەلی لیلی دەبیت و لە کەناری ڕۆژهەلاتیش دا گەلی بوشنگ دەژین نەخشەی (٦). ئەگەر ڕووکەش سەیربکەین پێویستە چەند جیاوازییەکی کەم لە نێوان خۆشگوزەرانی ئەم دوو گروپەدا هەبێ. ئەوان تەنیا بە ڕووبارێك لە یەکتر جیاکراونەتەوە کە هەریەك لەم گروپانە دەتوانێ بە بەلەم لێیبپەڕێتەوە. ئەم دوو هۆزە جیاوازە خاوەن یەك ڕەچەڵەك

و زمانەکانیان لە یەکەوە نزیکن. جگە لەمەش بەشی زۆری ئەو شتانەی دروستیان دەکەن لە ستایەڵ دا هاوشێوەن، لەوانە خانوو و جلوبەرگ و کارە دەستیەکانیان.

لەگەڵ ئەمەش دا، کاتێك زانای مرۆڤناسی (Anthropologist)، مێری دۆگلاس و مێژووناس جان ڤانسینا، لە ساڵی ١٩٥٠ دا لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەم گروپانەکرد، هەندێك جیاوازی سەرسوڕهێنەریان لە نێوانیان دا دۆزیەوە. هەروەك دۆگلاس باسیدەکا: (لیلی هەژارن، لە کاتێك دا بوشۆنگ دەوڵەمەندن ... هەموو ئەو شتانەی لیلی هەیانە یان دەتوانن ئەنجامیبدەن، بوشۆنگ زیاتریان هەیە و دەتوانن باشتر ئەنجامیبدەن) شرۆڤەی سادەی ئەم نایەکسانییە ئاسانە. جیاوازییەك، کە جیاوازی نێوان ئەو شوێنانەی پیرۆمان بیردەخاتەوە کە لە ژێر کاریگەری پۆتۆسی میتا دا بوون و ئەوانەی ئەم کاریگەرییەیان لەسەر نەبوو، ئەوەیە کە لیلی تەنیا بەشی بەکاربردنی خۆیان شتیان بەرهەمدەهێنا، لە کاتێك دا بوشۆنگ بۆ فرۆشتن لە بازاڕەکان دا شتیان بەرهەمدەهێنا. لە هەمانکات دا دۆگلاس و ڤانسینا تێبینیانکرد کە لیلی تەکنەلۆجی دواکەوتوو بەکاردەهێنن. بۆ نموونە، تۆڕیان بۆ ڕاوکردن بەکارنەدەهێنا هەرچەندە ئەمە بەرهەمداریی زۆر زیاد دەکردن. دۆگلاس پێیوابوو (نەبوونی تۆڕ گونجاوە لەگەڵ ویستی گشتی لیلی دا بۆ وەبەرهێنان نەکردن بە کات و هێزی کار لە کەلوپەلی درێژخایەن دا)

لە هەمانکات دا جیاوازی گرنگ لە تەکنەلۆجییەکانی کشتوکاڵ و ڕێکخستن دا هەبوو. بوشۆنگ شێوازێکی ئاڵۆزی کشتوکاڵی تێکەڵیان بەکاردەهێنا کە پێنج جۆر ڕوەك لە دەورەیەکی دوو ساڵەدا یەك لە دوای یەك دەچێنران. ئەوان یام وپەتاتەی شیرین و مانیۆك و فاسۆلیا یان دەچاند و ساڵانە دوو جار و هەندیجاریش سێ جار بەروبومی گەنمەشامیان دەدروەوە. لیلی خاوەنی سیستەمی لەمجۆرە نەبوون و دەیانتوانی تەنیا ساڵی یەك جار گەنمەشامی پێبگەیەنن.

لە هەمانکات دا جیاوازی بەرچاو لە ڕووی پاراستنی یاسا و ئاسایشەوە لە نێوانیان دا هەبوو. لیلی لە ناو گوندە چوار دەورگیراوە بڵاوەکان دا دەژیان کە بەردەوام لەگەڵ یەکتردا لە ململانێ دا بوون. هەرکەسێك لە نێوان دوو لەو گوندانەدا هاتووچۆی بکردایە یان بیویستایە بۆ کۆکۆدنەوەی خواردن بچێتە ناو

دارستان ئەوا ڕەنگە ڕووبەڕووی هێرش یان ڕفاندن ببوایەتەوە. لە ناوچەکەی بوشۆنگ دا ئەمە ڕووینەئەداو گەر بشبوایە ئەوا زۆر کەم بوو.

ئایا چی لە پشت ئەم جیاوازییانەی پاتێرنی بەرهەمهێنان و تەکنەلۆجی کشتوکاڵ و پاراستنی ئاسایشەوە هەیە؟ ئاشکرایە جوگرافیا نییە کە لیلی وا لێکردوە تەکنەلۆجی ڕاوکردن و کشتوکاڵی دواکەوتوو بەکاربهێنن. بێگومان ئەوە نەشارەزایی نییە چونکە ئەوان ئاگاداری ئەو ئامێرانە بوون لە لایەن بوشۆنگەوە بەکاردەهێنران. شرۆڤەیەکی ئەلتەرنەتیڤ ڕەنگە کەلتوور بێ. ئایا دەبێ ئەوە کەلتوور بێ کە هانی لیلی نەئەدا تا لە تۆڕەکانی ڕاوەماسی و خانووی باشتردا وەبەرهێنانبکەن؟ بەڵام دیسانەوە پێنەدەچوو ئەمە ڕاست بێ. هەروەك گەلی کۆنگۆ، لیلی زۆر حەزیان لە کڕینی تفەنگ بوو، دۆگلاس تەنانەت ئامارژەیداوە بەوەی کە (ئارەزووی زۆریان بۆ کڕینی چەك ... ئەوە پیشاندەدا کە کەلتوورەکەیان ناچاریان ناکا تەکنەلۆجی دواکەتوو بەکاربهینن کاتێك تەکنەلۆجی پێشکەوتوو پێویستی بە هەماهەنگی و هەوڵدانی درێژخایەن نییە) کەواتە نە ڕقی کەلتووری لە تەکنەلۆجی و نە نەشارەزایی و نە جوگرافیا، هاوکاریەکی باشمان ناکەن بۆ شرۆڤەکردنی خۆشگوزەرانی زیاتری بوشۆنگ بە بەراوورد لەگەڵ لیلی دا.

هۆکاری جیاوازی نێوان ئەم دوو گەلە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی لە دەزگایانی سیاسی دا کە لە خاکی بوشۆنگ و لیلی دا دامەزران. پێشتر تێبینیمانکرد کە لیلی لە گوندە چوار دەورگیراوەکان دا دەژیان کە بەشێك نەبوون لە سترەکچەرێکی سیاسی یەکگرتوو. لە کەنارەکەی تری کاسای دا، ئەمە جیاواز بوو.

لە دەوری ساڵی ١٦٢٠ دا شۆڕشێکی سیاسی لە لایەن پیاوێکەوە کە ناوی شیام بوو بەرپاکرا کە پاشایەتی کیوبای دامەزراند و لە سەر نەخشەی (٦) بینیمان، بوشۆنگ بوە دڵی پاشەیەتیەکەی و بۆخۆشی بوە پاشا. بەر لەم کاتە، ڕەنگە جیاوازی کەم لە نێوان لیلی و بوشۆنگ دا هەبووبێ. جیاوازییەکان لە ئەنجامی ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتی ڕووباری کاسای لەلایەن شیامەوە سەریانهەڵدا. ئەو دەوڵەت و هەیکەلی دەزگایانی سیاسی دروستکرد. ئەمانە تەنیا خاوەنی ئەندازەیەکی زۆرتری مەرکەزیەت نەبوون لەوانەی پێش خۆیان، بەڵکو پێکهاتەی ئاڵۆزتریان لەخۆگرت. شیام و ئەوانەی جێگەیان

گرتەوە بیرۆکراسییان دروستکرد بۆ کۆکردنەوەی باج و سیستەمێکی دادوەری و هێزی پۆلیس یان دامەزراند بۆ جێبەجێکردنی یاسا. سەرکردەکان لە لایەن ئەنجوومەنەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵ دا دەکرا و دەبوایە ئەم سەرکردانە پێش بڕیاردان ڕاوێژیان لەگەڵ دا بکردنایە. تەنانەت دادگاییکردن لە ڕێگەی دەستەی سوێندخۆرانەوە ئەنجامدەدرا، کە دیاردەیەکی دەگمەن بوو لە وولاتانی باشووری بیابان پێش کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی. لەگەڵ ئەمەش دا، ئەو دەوڵەتە مەرکەزیەی شیام دروستیکرد ئامرازی چەوسانەوە و زۆریش ڕەها بوو. هەڵبژێراوی خەڵك نەبوو، پۆلیسی دەوڵەت لەسەرەوە دادەڕێژرا، نەك لە ڕێگەی بەشداری جەماوەرییەوە.

ئەو شۆڕشە سیاسییەی کە مەرکەزیەتی دەوڵەت و یاسا و ئاسایش لە وولاتی کیوبا هێنایەئاراوە، بە دەوری خۆی شۆڕشی پیشەسازیشی بەرپاکرد. کشتوکاڵ ڕێکخرایەوە و تەکنەلۆجی نوێ پەیڕەوکرا بۆ زیادکردنی بەرهەمداریی. ئەو ڕووەکانەی پێشتر بەرهەمی سەرەکی بوون گۆڕان بە ڕووەکی نوێ و بە برشت تر کە لە هەردوو ئەمەریکاوە هێنرابوون (بەتایبەتی گەنمەشامی و کاسافا و بیبەری تیژ). سووڕی کشتوکاڵی چڕی تێکەڵاو لەم کاتانەدا دەستیپێکرا و بڕی ئەو خواردنەی بۆ هەر تاکێك بەرهەمدەهێنرا بوە دوو هێندە. بۆ ئەوەی بتوانرێ ئەم جۆرە ڕووەکانە بڕوێنرێن و سووڕی کشتوکاڵی ڕێکبخرێتەوە، هێزی کاری زیاتر لە کێڵگەکان دا پێویست بوو. لەبەر ئەوە تەمەنی هاوسەرگیری کەمکرایەوە بۆ بیست ساڵ کە بوە هۆی ڕاکێشانی پیاوان بۆ هێزی کاری کشتوکاڵی لە تەمەنێکی کەمتردا. جیاوازییەکان لەگەڵ لیلی گەورە بوون. پیاوەکانیان لە تەمەنی سیو پێنج ساڵی دا هاوسەرگیرییان دەکرد و تەنیا دوای ئەوە لە کێڵگەکان دا کاریاندەکرد. تا ئەو کاتە ژیانی خۆیان بۆ شەڕکردن و تاڵانکردن تەرخاندەکرد.

پەیوەندی نێوان شۆڕشە سیاسی و شۆڕشە ئابوورییەکە ساکار بوو. شیام پاشاو ئەوانەی پشتگیرییان دەکرد دەیانویست باج و سامان لە خەڵکی کیوبا وەرگرن، بۆیە دەبوایە خەڵکیش زیاد لەوەی خۆیان پێویستیان پێیبوو بەرهەمبهێنایە. لە کاتێك دا شیام و پیاوەکانی دەزگایانی کراوەیان لە کەناری ڕۆژهەلاتی کاسای دانەمەزراند، بەڵام برێك خۆشگوزەرانی ئابووری گرنگە بۆ دەزگایانی چەوسێنەر کە هەندێك مەرکەزیەتی دەوڵەت ئەچەسپێنن و یاسا و

ئاسایش دابیندەکەن. پشتگیری چالاکی ئابووری بێگومان لە قازانجی شیام و پیاوەکانی بوو، چونکە بەبێ چالاکی ئابووری هیچ سامانێك نەدەبوو لە خەڵکی وەرگرن. بە هەمانشێوەی ستالین، شیام لە ڕێگەی فەرمانەوە کۆمەڵە دەزگایەکی دروستکرد کە بتوانن سامانی پێویست پەیدابکەن بۆ پشتگیری سیستەمەکە. بە بەراورد لەگەڵ نەبوونی یاسا و ئاسایش کە باڵی بەسەر کەنارەکەی تری ڕووباری کاسای دا کێشابوو، بارودۆخی ئەم کەنارە سامانی گەورەی هێنایەئاراوە ـ تەنانەت ئەگەر زۆرێك لەم سامانە لە لایەن شیام و نوخبەکانیەوە لە خەڵك دەسەنرا. بەڵام ئەم خۆشگوزەرانییە سنووردار بوو. هەروەك لە یەکێتی سۆڤیەت دا، تێکدانی بنیاتنەر و نوێکاری تەکنەلۆجی لە پاشایەتی کیوبا دا ڕوویاننەدا دوای ئەم گۆڕانکارییە سەرەتاییە. ئەم بارودۆخە کەموزۆر وەك خۆی مابۆوە کاتێك بۆ یەکەمجار کاربەدەستە کۆلۆنیاڵە بەلجیکییەکان لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دا گەیشتنە پاشایەتییەکە.

دەسکەوتەکانی شیام پاشا ئەوە ڕووندەکەنەوە کە چۆن دەکرێ لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا ئەندازەیەکی سنووردار لە سەرکەوتنی ئابووری بەدەستبهێنرێ. ئەنجامدانی ئەم جۆرە گەشەکردنە پێویستی بە دەوڵەتێکی خاوەن مەرکەزیەت هەیە. بۆ ئەوەی مەرکەزیەت بۆ دەوڵەت دروستبکرێ زۆرجار شۆڕشێکی سیاسی پێویستە. کاتێك شیام ئەم دەوڵەتەی دروستکرد، توانی دەسەڵاتی خۆی بەکاربهێنێ بۆ ڕێکخستنەوەی ئابووری و زیادکردنی بەرهەمداریی کشتوکاڵ کە دواتر باجی خستەسەر.

ئایا بۆچی بوشۆنگ نەك لیلی شۆڕشی سیاسییان بەرپاکرد؟ ئایا نەدەکرا لیلی پاشایەکی وەك شیام پاشایان هەبوایە؟ ئەوەی شیام بەدەستیهێنا بریتیبوو لە نوێکاری دەزگایی و پەیوەندی نەبوو بە هیچ شێوازیکی پێشتر دیاریکراوی وەك جوگرافیا و کەلتوور و نەشارەزایی. لیلی دەیانتوانی ئەم جۆرە شۆڕشە بەرپابکەن و دەزگاکانیان بگۆڕن، بەڵام ئەمەیان نەکرد. ڕەنگە ئەمە لەبەر کۆمەڵە هۆکارێك بێ کە ئێمە نایزانین لەبەر کەمی زانیارییەکانی ئەمڕۆمان دەربارەی ئەو کۆمەڵگایە. زیاتریش ڕەنگە لەبەر سروشتی پەیوەستی مێژوو بێ. ڕەنگە هەمان پەیوەستی لە کاردا بووبێ کاتێك دوازدە هەزار ساڵ لەمەوبەر هەندێك لە کۆمەڵگاکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا دەستیانکرد بە تەنانەت ئەنجامدانی نوێکاری دەزگایی ڕیشەیی تر کە لە ئاکامدا بوە هۆی هاتنەئارای

کۆمەڵگایانی نیشتەجێ و دواتریشماڵیکردنی ڕوەك و ئاژەڵ، هەورەك دواتر باسیدەکەین.

## هاوینە درێژخایەنەکە

نزیکەی ١٥,٠٠٠ ساڵ پێش زاین، چاخی سەهۆڵبەندان کۆتاییهات، کاتێك کەشی زەوی گەرم بوو. بەڵگەی دەسکەوتوو لە سەهۆڵی ئایسلاندەوە ئەوە پیشاندەدەن کە پلەی گەرما بە شێوەیەکی تێکڕا تا پازدە پلەی سەدی لە مەودایەکی کاتی کەمدا بەرزبۆوە. پێدەچێ ئەم گەرمبوونە هاوکاتی زیادبوونی خێرای ژمارەی دانیشتوان بووبێ کاتێك گەرمبوونی گێتی بوە هۆی فراوانبوونی ژمارەی ئاژەڵان و زیادبوونی بەرچاوی خۆراك و ڕوەکانی کێوی. ئەم پرۆسەیە لە دەوری ساڵی ١٤,٠٠٠ پێش زاین دا بە خێرایی پێچەوانە بۆوە بەهۆی ماوەیەك لە کەشی ساردەوە کە بەستنی گەورە، یان بە دریەسی نوێتر، ناسراوە، بەڵام دوای ٩٦٠٠ پێش زاین، پلەی گەرمای گێتی دیسانەوە بە بڕی حەوت پلەی سەدی لە ماوەیەکی کەمتر لە دەساڵ دا، بەرزبۆوە و لە کاتەوە بە بەرزی ماوەتەوە. شوێنەوارناس، برایان فاگان، پێیدەڵێ هاوینی درێژخایەن. گەرمبوونی کەش وەرچەرخانێکی گەورەی مێژوویی بوو کە بوە باکگراوندی شۆڕشی کشتوکاڵی، کە تیایدا کۆمەڵگایانی مۆرڤ گواستنەوەیان بەرەو قۆناخی نیشتەجێبوون و کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ ئەنجامدا. ئەم ماوەیە و ماوەکانی دواتری مێژووی مرۆڤایەتی لەبەر هەتاوی ئەم هاوینە درێژخایەنەدا بەڕێوەچوە.

جیاوازییەکی گەورە لە نێوان کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵ لەگەڵ خۆراك پەیداکردن لە ڕێگەی ڕاوەوە هەیە. یەکەمیان پشت بە ماڵیکردنی جۆرەکانی ڕوەك و ئاژەڵ دەبەستێ لەگەڵ دەسکاریکردنی چالاك لە سووڕی ژیانی ئەو ڕوەك و ئاژەڵانەدا بۆ گۆڕینی پێکهاتەی جینەکانیان بۆ ئەوەی ئەو جۆرانە والێبکرێن سوودیان بۆ مرۆڤ زیاتر بێ. ماڵیکردن بریتییە لە گۆڕانکارییەکی تەکنەلۆجی کە وا لە مرۆڤ دەکا بتوانێ بڕێکی زۆر زیاتر خۆراك لەو ئاژەڵ و ڕوەکانەی لە ئارادان بەرهەمبهێنێ. ماڵیکردنی گەنمەشامی، بۆ نموونە، لەو

کاتەوە دەستپێکرد کە مرۆڤ کەوتە کۆکۆدنەوەی تیۆسینت کە دانەوێڵەیەکی کێویە و باوانی گەنمە شامیە. گوڵەکانی تیۆسینت زۆر بچووکن و تەنیا چەند سانتیمەترێك درێژن. لەچاو گەنمەشامی ئەم ڕۆژگارەدا زۆر بچووك بوون. لەگەڵ ئەمەش دا، بەرەبەرە لە ڕێگەی هەڵبژاردنی گوڵی گەورەتری تیۆسینت و ئەو ڕوەکانەی کە گوڵەکانیان نەدەشکان و لە سەر لاسکەکە ئەمانەوە تا کاتی لێکردنەوەیان، مرۆڤ توانی گەنمەشامی مۆدێرن دروستبکا، دانەوێڵەیەك کە خۆراکێکی زۆر زیاتر لە هەمان ڕووبەر زەوی بەرهەمدەهێنێ.

کۆنترین بەڵگە دەربارەی کشتوکاڵ و ئاژەڵ بەخێوکردن و ماڵیکردنی ڕوەك و ئاژەڵ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا دۆزراوەتەوە، بەتایبەتی لەو ناوچەیەی ناسراوە بە دامێنە گردییەکان کە لە ئیسرائیلی ئەمڕۆوە درێژدەبێتەوە بۆ فەلەستین و کەناری ڕۆژئاوای ڕووباری ئەردەن و بەرەو سوریا و باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیا و باکووری عێراق و ڕۆژئاوای ئێران. لە دەوروبەری ساڵی ٩٥٠٠ پێش زاین دا، یەکەم ڕوەکی ماڵیکراو کە جۆرە گەنم و جۆرە جۆیەکی گوڵی دوو ڕیزە بوە، لە ئەریحای کەناری ڕۆئاوای ڕووباری ئەردەن لە فەلەستین چێنراوە و گەنم و پۆڵکە و نیسك لە تەل ئەسوەد، زیاتر بەرەو باکوور، لە سوریادا دۆزراوەتەوە. ئەم دوو شوێنانە مەڵبەندی ئەوەی پێیدەوترێ کەڵتووری ناتوفی بوون و خاوەنی گوندی گەورە بوون. ژمارەی دانیشتوانی گوندی ئەریحا لەو سەردەمەدا گەیشتبوە پێنج سەد کەس.

بۆچی یەکەم گوندی خاوەن کشتوکاڵ لێرەدا دروستکرا، نەك لە شوێنی تر؟ بۆچی ناتۆفییەکان نەك خەڵکی تر، پۆڵکە و نیسکیان ماڵیکرد؟ ئایا ئەوان خاوەنی بەخت بوون و وا ڕێکەوتبوو کە لەو شوێنەدا بژین کە جۆری باشی تێدابوو بۆ ماڵیکردن؟ لە کاتێك دا ئەمە ڕاستە، بەڵام چەندین گەلی تر لەناو ئەم جۆرە ڕوەکانەدا دەژیان و نەیانتوانی ئەمانە ماڵیبکەن. هەروەك لە چاپتەری دوەم دا لە نەخشەی (٤) و (٥) دا بینیمان، لێکۆڵینەوەکان لە لایەن زانایانی جین ناسی و شوێنەوارناسی بۆ دەستنیشانکردنی چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی بنەچە کێویەکانی ئاژەڵ و ڕوەکە ماڵیکراوەکانی ئەم سەردەمە، ئەوە ڕووندەکەنەوە کە چەندین لەم بنەچانە لە ڕووبەری یەکجار گەورەدا بڵاو بووبوونەوە و ڕەنگە ملیۆنان کیلۆمەتری چوارگۆشەی گرتبێتەوە. بنەچە کێویەکانی جۆرەکانی ئاژەڵە ماڵیکراوەکان لە سەراپای یۆراسیادا بڵاو

بووبوونەوە. هەرچەندە دامێنە گردییەکان خاوەنی ژمارەیەکی زۆری جۆرەکانی ڕوەکی کێوی بوون، بەڵام ئەمە بە ئەندازەیەك نەبوو لەم ڕووەوە پێگەیەکی تایبەتیان هەبێ. هۆکارەکە ئەوە نەبوو کە ناتوفیەکان لە ناوچەیەك دا دەژیان کە لەڕووی بوونی جۆرە کێویەکانی ئاژەڵ و ڕوەکەوە تایبەت بوو، ئەمەش پێگەیەکی تایبەتی دابوونێ، بەڵکو هۆکارەکە ئەوە بوو کە ئەوان بەر لەوەی ڕوەك و ئاژەڵ ماڵی بکەن نیشتەجێبوون. بەڵگەیەك لە دانی ئاسکەوە وەرگیراوە کە لە سێمێنتەم پێکهاتوە کە شانەی ئێسکێن و لە چەندین چین پێکهاتوە. لەکاتی بەهار و هاوین دا، کە گەشەکردنی سێمێنتەم خێراترینە، چینەکان ڕەنگیان جیاوازترە لەو چینانەی لە زستان دا دروستدەبن. بە وەرگرتنی قاشێك لە دانەکە دەتوانی ڕەنگی دوا چین کە دروستبوە پێش مردنی ئاسکەکە، ببینی. بە بەکارهێنانی ئەم تەکنیکە دەتوانی بزانی کە ئاسکەکە لە هاوین دا یان لە زستان دا کوژراوە. لە ناوچەکانی ناتوفیەکان دا ئەوە بەدیدەکرێ کە ئاسك لە هەموو وەرزەکان دا ڕاوکراوەو ئەمەش ئەوە پێشنیازدەکا کە بە درێژایی ساڵ نیشتەجێبوون لەو ناوچانەدا هەبوە. گوندی ئەبو هورێرە لە کەناری ڕوباری فورات، یەکێکە لەو نشینگانەی ناتوفیەکان کە زۆرترین لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە. بۆ ماوەی نزیکەی چل ساڵ شوێنەوارناسەکان لێکۆڵینەوەیان لەسەر چینەکانی خاکی گوندەکە ئەنجامداوە، کە یەکێك لە باشترین نموونەی تۆمارکراو دەربارەی ژیانی نیشتەجێی پێش و دوای گواستنەوە بەرەو کشتوکاڵکردن پیشاندەدەن. نشینگەی ئەبو هورێرە ڕەنگە لە دەوروبەری ساڵی ٩٥٠٠ پێش زاین دامەزرابێ و دانیشتوەکانی بۆ ماوەی پێنج سەد ساڵی تر لەسەر شێوازی ژیانی ڕاوچێتی بەردەوامبوون بەر لەوەی دەستبکەن بە کشتوکاڵکردن. شوێنەوارناسان مەزەندە دەکەن کە دانیشتوانی گوندەکە بەر لە دەسپێکردنی کشتوکاڵ لە نێوان ١٠٠ تا ٣٠٠ کەس دا بووبێ.

دەشێ بیر لە جۆرەها هۆکار بکەیتەوە کە بۆچی ڕەنگە کۆمەڵگایەك لە بەرژەوەندیدا بێ ببێتە کۆمەڵگایەکی نیشتەجێ. ژیانی کۆچەری گرانە و پێویستە منداڵان و پیران بگوێزرێنەوە و کاتێك لە کۆچی بەردەوامدایت هەڵگرتنی خۆراك بۆ کاتی پێویست زۆر زەحمەت دەبێ. جگە لەمانەش ئامێرەکانی وەکو دەستاڕ و داس کە بۆ ئامادەکردنی خۆراکی کێوی گرنگ

بوون هەڵگرتنیان قورس بوو. بەڵگە لە ئارادایە کە تەنانەت ڕاوچییەکانیش خۆراکیان لە جێگای دەسنیشانکراوی وەك ئەشکەوتەکان دا کۆگاکردوە. یەکێك لە لایەنە سەرنجڕاکێشەکانی گەنمەشامی ئەوەیە کە دەشێ بە باشی کۆگابکرێ و ئەمەش هۆکاری سەرەکی چاندنی گەنمەشامیە بە شێوەیەکی زۆر چڕ لە هەردوو ئەمەریکا دا. توانای کۆگاکردن بە شێوەیەکی کاریگەرتر و کۆکردنەوەی خۆراك دەبێ هاندەری سەرەکی پەیڕەوکردنی شێوازی ژیانی نیشتەجێ بووبێ.

لە کاتێك دا ڕەنکە ئارەزووی بەکۆمەڵ هەبێ بۆ نیشتەجێبوون، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە هەمیشە ئەمە ڕوودەدا. پێویستە گروپێکی کۆچەری ڕاوچییان لەسەر ئەنجامدانی ئەمە ڕازیبن، یان کەسێك بە زۆر ڕازییانبکا. هەندێك لە شوێنەوارناسان لایان وایە کە زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و دابەزینی ئاستی گوزەران، فاکتەری سەرەکی بوون لە سەرهەڵدانی ژیانی نیشتەجێبوون و ناچارکردنی خەڵکێکی گەڕۆك کە لە شوێنێك دا بمێننەوە. لەگەڵ ئەوەش دا چڕی دانیشتوانی مەڵبەندەکانی ناتوفیەکان زیاتر نییە لە چڕی گروپەکانی پێشتر، لەبەر ئەوە پێناچێ بەڵگەیەکی ئەوتۆ لە ئارادابێ دەربارەی زیادبوونی چڕی دانیشتوان. بەڵگەکانی پەیکەر و دانەکان، خراپبوونی باری تەندروستی خەڵکەکە پیشاننادەن. بۆ نموونە، کەمی خۆراك دەبێتەهۆی دروستبوونی هێڵی باریك لە مینای دانی خەڵك دا، ئەمەش حاڵەتێکە پێیدەوترێ هایپۆپلاسیا. لە ڕاستیدا ئەم هێڵانە لە ناو ناتوفیەکان دا کەمتر دەرکەوتوون بە بەراورد لەگەڵ خەڵکە کشتوکاڵیەکانی دواتر دا.

لە مەش گرنگتر ئەوەیە، لە کاتێك دا ژیانی نیشتەجێ لایەنی ئیجابی هەبوو، لە هەمانکات دا لایەنی سلبیشی هەبوو. چارەسەرکردنی ململانێکان ڕەنگە زۆر زەحمەتر بووبێ بۆ گروپە نیشتەجێکان، چونکە ناکۆکیەکان تەنیا بە دوورکەوتنەوەی خەڵك یان گروپان بە ئاسانی چارەسەرنەدەکران. کاتێك خەڵك خانووی هەمیشەییان دروستکرد و بوونە خاوەنی کەلوپەلی زیاتر لەوەی بتوانن لەگەڵ خۆیان دا بیانگوێزنەوە، دوور کەوتنەوە بژاردەیەکی کەمتر خوازراو بوو. لە بەر ئەمە گوندەکان پێویستیان بە ڕێگای کاریگەرتری چارەسەرکردنی ململانێکان و دانانی تێگەی مولکداری بوو. دەبوایە بڕیار بدرایە دەربارەی ئەوەی کێ دەتوانێ کام پارچە زەوییە بەکاربهێنێ کە لە گوندەکەوە نزیکبوە، یان کێ دەتوانێ میوەی کام ڕیزە درەختە بچنێ و لە کام بەشەی چەمەکە دا

ماسی بگرێ. پێویست بوو ڕێساکان پەرەیان پێبدرایە و ئەو دەزگایانەی ئەم ڕیسایانەیان دادەناو دەیانسەپاندن دابمەزرانایە.

بۆ ئەوەی ژیانی نیشتەجێبوون دەستپێبکا، دەبوایە ڕاوچییەخۆراک کۆکەرەوەکان ناچار بکرانایە کە نیشتەجێبن و دەبوایە بەر لەمەش نوێکاری دەزگایی ئەنجامبدرایە بۆ چڕکردنەوەی دەسەڵات لە دەستی گروپێك دا کە دەبوە نوخبەی سیاسی بۆ جێبەجێکردنی مافی موڵکداری و پاراستنی ئاسایش و لە هەمانکاتیشدا کەڵك لە پێگەکەی خۆیان وەرگرن لە ڕێگەی سەندنی دەرامەت لە باقی کۆمەڵگا. لە ڕاستیدا، شۆڕشێکی سیاسی هاوشێوەی ئەوەی لە لایەن شیام پاشاوە ئەنجامدرا، تەنانەت ئەگەر لە ئاستێکی بچووکتریش دا بووبێ، پێدەچێ ئەو تەکانە بووبێ کە بوە هۆی سەرهەڵدانی ژیانی نیشتەجێبوون.

لە ڕاستیدا بەڵگەکانی شوێنەوارناسیی ئەوە پێشنیاز دەکەن کە ناتوفیەکان کۆمەڵگای ئاڵۆزیان دامەزراندوە کە خاوەنی پلەبەندی کۆمەڵایەتی و ئاسایش و نایەکسانی بوون ـ سەرەتای ئەوەی ئێمە بە دەزگایانی چەوسێنەر ناویان دەبەین ـ ماوەیەکی زۆر بەر لەوەی ببنە جووتیار. بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگری ئەم پلەبەندی و نایەکسانییە لە گۆڕی ناتوفیەکانەوە سەرچاوەدەگرێ. هەندێك کەس لەگەڵ بڕێکی زۆر لە قاوخی ئۆبسیدیان و دێنتالیۆم، کە لە کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست نزیك چیای کەرمل هێنراون، نێژراون. جۆرەکانی تری زەخرەفە بریتیبوە لە ملوانکە وئاسق و بازنە کە لە دان و ئێسکی قاچی ئاسك و سەدەف دروستدەکران. خەڵکی تر بەبێ هیچ شتێك لەمانە نێژراون. سەدەف و ئۆبسیدیان بازرگانیان پێوەکراوە و زۆر ڕێگەی تێدەچێ کە کۆنترۆڵکردنی ئەم بازرگانییە سەرچاوەی کەڵەکەکردنی دەسەڵات و نایەکسانی بوبێ. بەڵگەی زیاتر دەربارەی نایەکسانی سیاسی و ئابووری لە مەڵبەندی ناتوفیای عین مالاها لە باکووری دەریاچەی تەبەریا دۆزراوەتەوە. لە ناو نزیکەی پەنجا کوخی خڕ و چەندین چاڵ دا، کە بۆ کۆگاکردن بەکارهاتوون، بینایەکی گەورەی جوان سیواخدراو لە نزیك شوێنێکی پاکراوەی ناوەندییەوە هەیە. ئەم بینایە بێگومان خانووی سەرۆکێك بوە. لە ناو گۆڕەکانی ئەو شوێنەدا، هەندێکیان زۆر ڕازاوەترن و هەروەها بەڵگەی پەرستنی کەللە سەر بەدیدەکرێ کە ڕەنگە نیشانەی پەرستنی باوان بێ. ئەم شێوە پەرستنە لە مەڵبەندەکانی

ناتوفیەکان بڵاوە بەتایبەتی لە ئەریحا. بەشی زۆری بەڵگەکان لە مەڵبەندەکانی ناتوفیەکان ئەوە پێشنیازدەکەن کە ئەمانە لەو سەردەمەدا کۆمەڵگای دامەزراو بوون و خاوەنی دەزگایانی ئاڵۆز بوون کە میراتگری پایەی نوخبەیان دیاریکردوە. ئەوان سەرقاڵی بازرگانی بوون لەگەڵ شوێنانی دوور و خاوەن شێوازی ساوای ئایین و پلەبەندی سیاسی بوون.

زۆر ڕێی تێدەچێ کە سەرهەڵدانی نوخبە سیاسییەکان بووبێتە هۆی دروستکردنی گواستنەوە، یەکەمجار بەرەو ژیانی نیشتەجێبوون و دواتر بەرەو کشتوکاڵ. هەروەك مەڵبەندەکانی ناتوفیا پیشانی دەدەن، مەرج نییە ژیانی نیشتەجێبوون مانای کشتوکاڵکردن و بەخێوکردنی ئاژەڵ بووبێ. دەکرێ خەڵك نیشتەجێبووبن بەڵام هێشتا ژیانیان لە ڕێگەی ڕاو و کۆکردنەوەی خۆراکەوە دابینکردبێ. هەرچونێك بێ، هاوینە درێژخایەنەکە بوە هۆی ئەوەی ڕوەکە کێوییەکان زۆروزەبەند بن و ڕاو و کۆکردنەوەی خۆراك زیاتر سەرنجڕاکێشبن. ڕەنگە زۆربەی خەڵك بە ژیانی کولەمەرگی ڕازیبووبن کە پشتی بە ڕاو و کۆکردنەوەی خۆراك دەبەست و پێوستیان بە هەوڵدانێکی زۆر نەبووبێ. تەنانەت مەرج نییە نوێکاری تەکنەلۆجی ببێتە هۆی زیادبوونی بەرهەمی کشتوکاڵی. لە ڕاستیدا، دەرکەوتوە کە نوێکاری سەرەکی تەکنەلۆجی، وەك بەکارهێنانی گاسنی ئاسن لە ناو گروپێکی دانیشتوانی ڕەسەنی ئوسترالیادا کە بە یێر یۆرۆنت ناسراون، نەبوە هۆی زیادبوونی بەرهەمهێنان بەڵکو بوە هۆی نووستنی زیاتر، چونکە ئەم تەکنەلۆجییە بوە هۆی ئەوەی کە خەڵکەکە خۆراکی پێویست بۆ ژیانی خۆیان ئاسانتر پەیدابکەن و هاندانێکی ئەوتۆیان نەبوو کە کاربکەن تا بەرهەمی زیاتریان دەستبکەوێ.

شرۆڤە تەقلیدییەکەی پشتبەستوو بە جوگرافیا بۆ شۆڕشی کشتوکاڵی - جەوهەری ئارگیومێنتەکەی جارد دایەمۆند کە لە چاپتەری دوەم دا باسمانکرد - ئەوەیە کە ئەم شۆڕشە بەهۆی بوونی چەندین جۆری ڕوەك و ئاژەڵ کە توانرا بە ئاسانی ماڵیبکرێن، سەریهەڵدا. ئەمەش کارێکی وایکرد کە کشتوکاڵکردن و بەخێوکردنی ئاژەڵ سەرنجڕاکێش بن و ژیانی نیشتەجێبوونی هێنایەئاراوە. دوای ئەوەی کۆمەڵگاکان نیشتەجێبوون و دەستیان بە کشتوکاڵکردن کرد، ئینجا دەستیان بە دامەزراندنی هەرەمی سیاسی و ئایین و دەزگایانی زۆر ئاڵۆز تر کرد. هەرچەندە ئەم شرۆڤەیە بە شێوەیەکی فراوان پەسەندکراوە، بەڵام

بەڵگەکانی ناتوفیا ئەوە پێشنیازدەکەن کە ئەم شرۆڤە تەقلیدییە عارەبانەکە دەخاتە پێش ئەسپەکەوە. گۆڕانکاری دەزگایی لە کۆمەڵگاکان دا ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی بەرەو کشتوکاڵکردن بگوێزنەوە ڕوویدا و زۆریش ڕێیتێدەچێ کە ئەم گۆڕانکارییە دەزگاییانە هۆکاری گواستنەوە بووبن بەرەو نیشتەجێبوون، کە ئەو گۆڕانکارییە دەزگاییانەی بەهێزترکرد و هۆکاری سەرهەڵدانی شۆڕشی کشتوکاڵی دواتریش بن. ئەم پاتێرنە پێشنیازدەکرێ نەك تەنیا لە ڕێگەی بەڵگەکانی دامێنە گردییەکانەوە، کە ناوچەیەکە چڕترین لێکۆڵینەوەی تێدا کراوە، بەڵکو لە هەمانکات دا لە ڕێگەی بەڵگە گرنگەکانی هەردوو ئەمەریکا و باشووری بیابانی ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە.

بە دڵنیاییەوە، گواستنەوە بەرەو کشتوکاڵکردن بوە هۆی زیادبوونی بەرهەمداریی کشتوکاڵی و فراوانبوونی بەرچاوی دانیشتوان. بۆ نموونە، لە مەڵبەندانی وەك ئەریحا و ئەبو هورێرە ئەوە دەبینرێ کە گوندی سەرەتای کشتوکاڵکردن زۆر گەورەتر بوە لەوەی بەر لە کشتوکاڵکردن هەبوە. بەگشتی، گوندەکان دوو تا شەش هێندە زیادیانکرد، کاتێك گواستنەوە بەرەو کشتوکاڵکردن ڕوویدا. جگە لەمە، چەندین لەو ئەنجامانەی خەڵك بە شێوەیەکی تەقلیدی لایان وابوە کە لە ئەنجامی ئەم گواستنەوەیەوە هاتوونەتەئاراوە، بێگومان ڕوویاندا. تایبەتمەندێتی زیاتری پیشەیی و پێشکەوتنی خێراتری تەکنەلۆجی ڕوویاندا و پەرەسەندنی دەزگایانی سیاسی ئاڵۆزتر و ڕەنگە کەمتر یەکسان دەستیپێکردبێ. ڕوودانی ئەمانە لە شوێنێکی دیاریکراودا نەبەسترابۆوە بەبوونی جۆرەکانی ڕوەك و ئاژەڵ لەو شوێنەدا. بەڵکو ئەمانە ئەنجامی مامەڵەی کۆمەڵگا بوون لەگەڵ ئەو جۆرە نوێکارییە دەزگایی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەی کە ڕێگەخۆشکار بوو بۆ سەرهەڵدانی ژیانی نیشتەجێبوون و دواتریش کشتوکاڵکردن.

هەرچەندە هاوینە درێژخایەنەکە و بوونی جۆرەکانی دانەوێڵە و ئاژەڵ، ڕێگەیان دا ئەم گواستنەوەیە ڕووبدا، بەڵام ئەوەیان دیارینەکرد، دوای گەرمبوونی کەش، بەتەواوی کەی و لە کوێ ڕوودەدا. گواستنەوەکە لە ئەنجامی کارلێکردنی وەرچەرخانی مێژوویی، کە ئەویش هاوینی درێژخایەن بوو، لەگەڵ جیاوازییە دەزگاییە بچووك، بەڵام گرنگەکان دا، ڕوویدا. لەگەڵ گەرمبوونی کەش دا، هەندێك کۆمەڵگای وەکو ناتوفیەکان دەزگایانی خاوەن مەرکەزیەت و

پلەبەندییان دامەزراند، هەرچەندە ئەمانە بە ئەندازەیەکی کەم بوون بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی دەوڵەتی نەتەوەیی ئەم سەردەمە. هەروەك بوشۆنگ لە ژێر فەرمانڕەوایی شیام دا، کۆمەڵگاکان خۆیان ڕێکخستەوە تا سوودی زیاتر لەو دەرفەتانە وەربگرن کە زۆرووزەبەندی ئاژەڵ و ڕووەکی کێوی ڕەخساندبوونی، گومانی تێدانییە کە ئەوە نوخبە سیاسییەکە بوو سوودمەندی سەرەکی ئەم دەرفەتە نوێیانە و پرۆسەی مەرکەزیەتی سیاسی بوون. ئەو شوێنانەی تر کە دەزگای کەمێك جیاوازتریان هەبوو، بواری نوخبە سیاسییەکەیان نەدا کە سوودی هاوشێوە لەم وەرچەرخانە مێژووییە وەربگرن، ئەمەش بوە هۆی دواکەوتنیان لە پرۆسەی مەرکەزیەتی سیاسی و دروستکردنی کۆمەڵگایانی نیشتەجێ و خاوەن کشتوکاڵ و ئاڵۆزتر. ئەمەش بە دەوری خۆی ڕێگای بۆ ئەو جۆرە لێکترازانەی خۆشکرد کە لەمەوپێش باسمانکرد. کاتێك ئەم جیاوازیانە سەریانهەڵدا، بۆ هەندێك شوێن گوێزرانەوە و هەندێك شوێنی تر لێیان بێبەش بوون. بۆ نموونە، کشتوکاڵکردن لە دەوری ٦٥٠٠ ساڵ پێش زاین دا، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە گوێزرایەوە بۆ ئەوروپا، زیاتر لە ڕێگەی کۆچکردنی جووتیارانەوە. دەزگاکان لە ئەوروپا دا لەگەڵ دەزگاکانی بەشەکانی تری جیهانی وەك ئەفریقا لێکترازان کە دەزگا سەرەتاییەکان تیایان دا جیاواز بوون و ئەو نوێکارییانەی بەهۆی هاوینی درێژخایەنەوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا هاتبوونەئاراوە زۆر درەنگتر لەو شوێنانەدا ڕوویدا و، کە ڕووشیان دا، بە شێوازێکی جیاواز ڕوویاندا.

نوێکارییە دەزگاییەکانی ناتوفیەکان، هەرچەندە زۆر ڕێیتێدەچێ کە بناخەی شۆڕشی کشتوکاڵییان دارشتبێ، میراتێکی سادەی لە مێژووی جیهان دا جێنەهێشت و نەبوە هۆی مسۆگەرکردنی خۆشگوزەرانی درێژخایەن لە وڵاتانی ئیسرائیل و فەلەستین و سوریای ئەم سەردەمە دا. سوریا و فەلەستین لە ناوچە هەژارەکانی جیهانی ئەمڕۆن و خۆشگوزەرانی ئیسرائیل زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ نیشتەجێبوونی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی جولەکە لەم وڵاتەدا لە دوای دووەم جەنگی جیهانی و بەرزی ئاستی پەروەردەیان و ئاسان دەسکەوتنی تەکنەلۆجییای نوێ. نەتوانرا بەردەوامی بدرێ بە گەشەکردنی سەرەتایی ناتوفیەکان لەبەر هەمان ئەو هۆیەی کە بوە هۆی ڕمانی یەکێتی سۆڤیەت دوای گەشەکردنێکی زۆر لە سەرەتادا. هەرچەندە گەشەکردنی

ناتوفیەکان گەلێك بایەخدار و تەنانەت بۆ کاتی خۆی شۆڕشگێڕانەش بوە، بەڵام ئەمە گەشەکردن بوو لە سایەی دەزگا چەوسێنەرەکان دا. لە هەمانکات دا، ڕەنگە ئەم جۆرە گەشەکردنە ململانێی سەختی بۆ کۆمەڵگای ناتوفی دروستکردبێ لە سەر ئەوەی کێ کۆنترۆڵی دەزگاکان و ئەو دەسکەوتانەی دەکرد کە ئەم دەزگایانە دروستیانکردبوو. بەرامبەر هەر نوخبەیەك کە سوود لە چەوسانەوە وەردەگرێ، کەسێکی نا نوخبە هەیە کە حەزدەکا جێگەی نوخبەکە بگرێتەوە. هەندێجار شەڕی ناوخۆ دەبێتە هۆی جێگرتنەوەی نوخبەیەك لە لایەن نوخبەیەکی ترەوە. هەندێجار ئەم جێگرتنەوەیە سەراپای کۆمەڵگا چەوسێنەرەکە لەناودەبات و جڵەوی پرۆسەی دارمانی دەوڵەت و کۆمەڵگا بەرەڵا دەکا، هەروەك ئەو شارستانییە مەزنەی دەوڵەتی ـ شاری مایا بەر لە زیاتر لە هەزار ساڵ دروستیکرد، دووچاری بوو.

## چەوساندنەوەی ناجێگیر

کشتوکاڵکردن لەچەندین شوێنی جیهان دا بە شێوەیەکی سەربەخۆ سەریهەڵدا. لەو ناوچەیەی کە ئێستا مەکسیکی ئەمڕۆیە، کۆمەڵگایانی ئەوتۆ دروستبوون کە دەوڵەت و شوێنی نیشتەجێبوونیان دامەزراند و گواستنەوەیان بەرەو کشتوکاڵ ئەنجامدا. بە هەمانشێوەی ناتوفیەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، ئەوانیش ئەندازەیەك لە گەشەکردنی ئابووریيان ئەنجامدا. لە ڕاستیدا، دەوڵەتانی ـ شاری مایا لە ناوچەی باشووری مەکسیك و بێلیز و گواتیمالا و ڕۆژئاوای هیندۆراس، شارستانی گەلێك ئاڵۆزیان لە سایەی مۆدێلی دەزگایانی چەوسێنەری تایبەت بە خۆیان دامەزراند. ئەزموونی مایا نەك تەنیا ئەگەری گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەر دا پیشاندەدا، بەڵکو ئاستەنگێکی بنەڕەتی تریش لەبەردەم ئەم جۆرە گەشەکردنەدا ڕووندەکاتەوە: ئەو ناجێگیرییە سیاسییەی سەرهەڵدەدا و لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی دارمانی کۆمەڵگا و دەوڵەت، کاتێك گروپان و خەڵکانی جیاواز شەڕدەکەن تا بۆخۆیان ببنە چەوسێنەر.

شارەکانی مایا یەکەمجار لە دەوری ساڵی ٥٠٠ پێش زاین دا دەستیان بە

پەرەسەندنکرد. لە ئەنجامدا، ئەم شارە سەرەتاییانە لە دەوروبەری سەدەی یەکەمی زاین دا شکستیان هێنا. دواتر مۆدێلێکی سیاسی نویێ سەریهەڵدا کە بناخەی سەردەمی کلاسیکی نێوان ساڵانی ٢٥٠ تا ٩٠٠ زاینی دامەزراند. ئەم ماوەیە سەردەمی گەشانەوەی تەواوی کەلتوور و شارستانی مایا بوو. بەڵام دیسانەوە ئەم شارستانییە زیاتر ئاڵۆزەش لە ماوەی شەش سەد ساڵی دواتردا هەرەسیهێنا. لەو کاتەدا کە ئیسپانییە داگیرکارەکان لە سەرەتای سەدەی شازدەیەم دا گەیشتن، پەرستگا و کۆشکە مەزنەکانی شوێنەکانی مایای وەك تایکاڵ و پالانکیۆ و کالاکموڵ کشابوونەوە بۆ ناو دارستان و تا سەدەی نۆزدەیەم نەدۆزرانەوە.

شارانی مایا هەرگیز لە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتێك دا یەکیاننەگرت، هەرچەندە هەندێ شار ملکەچی ئەوانی تر بوون و پێدەچێ زۆرجار هاوکاری یەکتریان کردبێ بەتایبەتی لە کاتی جەنگ دا. پەیوەندی سەرەکی نێوان دەوڵەتی - شارانی ناوچەکە، کە دەتوانین پەنجا لەو شارانە لە رێگەی پیتە وێنەییەکانیانەوە دەسنیشانبکەین، بریتیبوو لەوەی گەلەکانیان بە نزیکەی سی و یەك زمانی مایای جیاواز، بەڵام نزیك لەیەکەوە قسەیانکردوە. مایاکان سیستەمی نووسینیان هێنایەئارا و بەلایەنی کەمەوە پازدە هەزار نەخش ماوەتەوە کە وەسفی چەندین لایەنی ژیانی نوخبە و کەلتوور و ئایین دەکەن. لە هەمانکات دا رۆژمێری پێشکەوتویان هەبوە بۆ تۆمارکردنی بەروارەکان و بە ژماردنی درێژ ناسراوە. ئەمەش بەوەدا کە ژماردنی ساڵەکانی لە بەروارێکی جێگرەوە دەستیپێدەکرد، زۆر لە رۆژمێرەکەی خۆمان دەچوو و لە لایەن هەموو شارەکانی مایاوە بەکاردەهێنرا. ژماردنی درێژ لە ساڵی ٣١١٤ پێش زاین دا دەستیپێکرد، هەرچەندە نازانین ئەم بەروارە چ جۆر گرنگیەکی بۆ مایاکان هەبوو. ئەم بەروارە زۆر پێش سەرهەڵدانی شتێکی ئەوتۆ دێ کە لە کۆمەڵگای مایا بچێ.

مایاکان بیناسازی کارامە بوون و بە شێوەیەکی سەربەخۆ چیمەنتۆیان داهێنا. بینا و نەخشەکانیان زانیاری گرنگ دەربارەی رێرەوی شارانی مایا دەخەنەڕوو کە زۆرجار رووداوەکانیان تۆمارکردوە بە گوێرەی ژماردنی درێژ. بە سەیرکردنی هەموو شارەکانی مایا، شوێنەوارناسان دەتوانن بزانن چەند بینا لە ساڵێکی دیاریکراودا تەواوکراوە. لە دەوری ساڵی ٥٠٠ زاین دا، ژمارەیەکی کەم

شوێنەواری بەروار لەسەر هەیە. بۆ نموونە، بەرواری ژماردنی درێژ کە بەرامبەر ساڵی ٥١٤ زاینە تەنیا دە دانەی تۆمارکردوە. دوای ئەوە زیادبوونێکی بەردەوام ڕوویداوە و ئەو ژمارەیە لە ساڵی ٦٧٢ زاین دا گەیشتە بیست و لە ناوەڕاستی سەدەی هەشتەم دا گەیشتە چل دانە. دوای ئەم ماوەیە، شوێنەوارە بەروار لەسەرەکان نامێنن. بەهاتنی سەدەی نۆزدەیەم ژمارەکە بۆ دە دانە دادەبەزێ و لە سەدەی دەیەم دا ژمارەکەدەبێتە سفر. ئەم نەخشە خاوەن بەروارانە وێنەیەکی ڕوونمان پێشکەشدەکەن دەربارەی فراوانبوونی شارەکانی مایا و پوکانەوەی دواتریان لە کۆتایی سەدەی هەشتەم دا.

دەکرێ ئەم شیکردنەوەی بەروارانە لە ڕێگەی لیستی پاشاکانەوە کە مایاکان تۆماریان کردوون دەوڵەمەند بکرێن. لە کۆپان، کە شارێکی مایا بوو، ئێستا دەکەوێتە ڕۆژئاوای هینذۆراس، مۆنیومێنتێکی بەناوبانگ هەیە کە بە ئەڵتار کیو ناسراوە. ئەڵتار کیو ناوی هەموو پاشاکانی تۆمارکردوە، هەر لە دامەزرێنەری بنەماڵەی فەرمانڕەوا، کینیچ یاکس کوک مۆ، یان " ڕۆژ پاشا ـ سەوز یەکەم کویتزاڵ ماکاو" کە نەك تەنیا بە ناوی ڕۆژەوە ناونراوە، بەڵکو بە ناوی دوو باڵندەی جوانی دارستانی ناوەڕاستی ئەمەریکا ناونراوە کە پەڕەکانی جێگەی بایەخی زۆری مایاکان بوو. کینیچ یاکس کوك مۆ لە ساڵی ٤٢٦ زاین دا لە کۆپان دەسەڵاتی گرتۆتەدەست و ئەمەش لە ڕێگەی بەرواری ژماردنی درێژ لەسەر ئەڵتار کیو دەزانین. ئەو بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوای دامەزراند کە بۆ ماوەی چوار سەد ساڵ بەردەوامبوو. هەندێك لە جێگرەوەکانی کینیچ یاکس ناوی وێنەییان هەبوە. فەرمانڕەوای سیازدەیەم کە وەرگێڕانی پیتە وێنەییەکان مانای "١٨ کەروێشك" دەگەیەنن و دوای ئەویش " مەیمونی دووکەڵ" و دواتریش "سەدەفی دوکەڵ" کە لە ساڵی ٧٦٣ زاین دا مردوە فەرمانڕەواییان کردوە. دوا ناو لەسەر ئەڵتار بریتییە لە یاکس پاساج چان یۆئات پاشا، یان " خودای یەکەم هەورەبروسکە" کە شازدەیەمین فەرمانڕەوای ئەم بنەماڵەیە بوو کە دوای مردنی سەدەفی دوکەڵ هاتۆتە سەرتەخت. دوای ئەو زانیاریمان تەنیا دەربارەی پاشایەکی تر هەیە کە یۆکیت تووك " پارێزەری بەردەئەستێ"ەو لە پارچەیەکی ئەڵتارەوە ناوەکەی زانراوە. دوای یاکس پاساج، بیناو نەخشەکان نەمان و پێدەچی کە بنەماڵە فەرمانڕەواکە دوای ماوەیەکی کەم لەناوبرابێ. یوکیت تووك ڕەنگە میراتگری ڕاستەقینەی تەخت نەبووبێ و تەنیا داوکاری

تەخت بووبێ.

دوا شێوازی لێکۆڵینەوە لەم بەڵگەیەی کۆپان، لە لایەن شوێنەوارناسان ئانکۆرین فریتەر و نانسی کۆنلین و دەیڤید وێبستەر پەیڕەوکراوە. ئەم باسکارانە نەخشەی سەرهەڵدان و کەوتنی کۆپانیان کێشاوە لە ڕێگەی ووردبونەوە لە بڵاوبوونەوەی نشینگەکان لە دۆڵی کۆپان لە ماوەی ٨٥٠ ساڵ دا، هەر لە ٤٠٠ تا ١٢٥٠ زاینەوە بە بەکارهێنانی تەکنیکێك کە پێیدەوترێ شێکردنی ئۆبسیدیان. کە بڕی ئاوی ناو بەردەکە لە ڕۆژی دەرهێنانی لە کانەکەدا دەپێوێ. دوای دەرهێنانی بەردەکە لە کان، بڕی ئاوی ناو بەردەکە بە ڕێژەیەکی زانراو کەمدەبێتەوە، لێرەوە شوێنەوارناسان دەتوانن بەرواری دەرهێنانی پارچە بەردەکە لە کانەکە حساب بکەن. دواتر فریتەر و کۆنلین و وێبستەر توانیان کە ئەو شوێنانەی پارچەی ئۆبسیدیانی تێدا دۆزراوەتەوە لە دۆڵی کۆپان لەگەڵ بەرواری دۆزینەوەیان بخەنە سەر نەخشەو ئەوە دیاریبکەن کە چۆن شارەکە فراوانبوەو دواتر بچووك بۆتەوە. لە کاتێك دا دەکرێ مەزەندەیەکی گونجاو دەربارەی ژمارەی بینا وخانوەکان لە ناوچەیەکی دیاریکردودا بکرێ، دەتوانرێ ژمارەی گشتی دانیشتوانی شارەکە مەزەندە بکرێ. لە ماوەی ٤٠٠ـ٤٤٩ زاین دا، دانیشتوانی شار زۆر کەم و نزیکەی شەش سەد کەس بوە. ژمارەکە بە شێوەیەکی بەردەوام زیادیکرد تا گەیشتە بیست و هەشت هەزار کەس لە ماوەی نێوان ٧٥٠ـ٧٩٩ زاین دا. هەرچەندە ئەم ژمارەیە بە پێی ستانداردی شارنشینی نوێ پێناچێ زۆر بێ، بەڵام بۆ ئەو کاتە یەکجار زۆر بوە: ئەم ژمارانە ئەوە دەگەیەنن کە لەو سەردەمەدا، ژمارەی دانیشتوانی کۆپان لە لەندەن یان پاریس زیاتر بوە. شارەکانی تری مایا، وەك تیکاڵ و کالاکموڵ بە دڵنیاییەوە زۆر گەورەتر بوون. بە پێی بەڵگەی بەروارەکانی ژماردنی درێژ، ساڵی ٨٠٠ زاین، ساڵی لوتکەی ژمارەی دانیشتوانی کۆپان بوە. دوای ئەمە دەستی بە کەمبوونەوە کردوە و بە هاتنی ساڵی ٩٠٠ زاین ژمارەی دانیشتوان هاتۆتە خوار بۆ نزیکەی پازدە هەزار کەس و لەو کاتە بەدواوەش کەمبوونەوەکە بەردەوامبوە و بە هاتنی ساڵی ١٢٠٠ زاین، ژمارەی دانیشتوان گەڕاوەتەوە بۆ ژمارەی هەشت سەد ساڵ پێشتر.

بنەمای پەرەپێدانی ئابووری سەردەمی کلاسیکی مایا، هەمان بنەمای پەرەپێدانی ئابووری بوشۆنگ و ناتوفیەکان بوو: دامەزراندنی دەزگایانی

چەوسێنەر لەگەڵ ئەندازەیەك لە مەرکەزیەتی دەوڵەت. ئەم دەزگایانە چەندین توخمی سەرەکییان هەبوو. لە دەوری ساڵی ١٠٠ زاین دا، لە شاری تیکاڵ لە گواتیمالا، بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوای نوێ سەریهەڵدا. چینێکی فەرمانڕەوا کە لەسەر بنەمای ئاجاو (لۆرد یان فەرمانڕەوا) دامەزرابوو، لەسەردەمی پاشایەك دا کە پێیدەوترا کوبول ئاجاو (لۆردی خودایی) ڕەگی داکوتا. لە خوار پاشاوە هەرەمێکی ئەریستۆکراتەکان هەبوو. لۆردی خودایی بە هەماهەنگی ئەم نوخبانە کۆمەڵگای بەڕێوەدەبرد و لەگەڵ خوداوەندەکانیش دا پەیوەندیدەکرد. هەتا ئەو ڕادەیەی ئێمە دەیزانین، ئەم کۆمەڵە دەزگا سیاسییە نوێیانە بواری هیچ جۆرە بەشداریەکی جەماوەری نەدەدا، بەڵام سەقامگیریی سەپاندبوو. کوبول ئاجاو باجی لە جووتیاران وەردەگرت و هێزی کاری بۆ دروستکردنی مۆنیومێنتە مەزنەکان بەکاردەهێنا و تەبایی نێوان ئەم دەزگایانە بناخەی فراوانبوونێکی بەرچاوی ئابووری دروستکرد. ئابووری مایاکان پشتی بەتایبەتمەندێتی چڕی پیشەیی بەستبوو، بە بوونی گڵێنەکار و جۆلا و دارتاش و دروستکاری ئامرازەکانی ڕازاندنەوەی کارامە. ئەوان هەروەها خەریکی بازرگانی ئۆبسیدیان و پێستی پڵنگ و سەدەفی دەریایی و کاکاو و خوێ و پەڕبوون لە ناو خۆیان دا و لەگەڵ گەلەکانی تر لە شوێنە دوورەکانی مەکسیك. ڕەنگە ئەوان پارەشیان هەبوبێ و وەکو ئازتێکەکان دەنکی کاکاویان وەك پارە بەکارهێنابێ.

ئەو شێوازەی کە سەردەمی کلاسیکی مایا لە ڕێگەی دروستکردنی دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەکانەوە لەسەری دامەزرابوو، زۆر هاوشێوەی بارودۆخەکەی بوشۆنگ بوو، لەوەدا کە یاکس ئیهب خوك لە تیکاڵ ڕۆڵێکی هاوشێوەی ڕۆڵی شیام پاشای بینی. دەزگا سیاسییە نوێکان بوونە هۆی زیادبوونێکی بەرچاوی خۆشگوزەرانی ئابووری و بەشی زۆر لەم سامانەش لە لایەن نوخبە نوێکەوە کە دەورەی کوبول ئاجاویان دابوو، زەوتدەکرا. کاتێك ئەم سیستەمە، لە دەوری ساڵی ٣٠٠ زاین دا جێگەی خۆی قایمکرد، گۆڕانکاری کەمی تری تەکنەلۆجی هاتەئاراوە. هەرچەندە هەندێك بەڵگە لەبەردەستدایە دەربارەی باشتربوونی باری ئاودێری و تەکنیکەکانی بەڕێوەبردنی ئاو، بەڵام تەکنەلۆجیای کشتوکاڵی سەرەتایی و پێدەچێ گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتبێ. بە تێپەڕبوونی کات بیناکاری و تەکنیکەکانی هونەری دەسکرد زیاتر پێشکەوتن، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی نوێکاری کەم ئەنجامدرا.

تێکدانی بنیاتنەر ڕووینەدا. بەڵام شێوازی تری تێکدان پەیدابوو، کاتێك ئەو سامانەی دەزگا چەوسێنەرەکان بۆ کبول ئاجاو و نوخبەکەی مایا بەرهەمیان هێنا بوە هۆی شەڕوشۆڕی بەردەوام و بە تێپەڕبوونی کاتیش بارودۆخەکە خراپتر بوو. زنجیرەی ململانێکان لەسەر نەخشەکانی مایا بە پیتی وێنەیی تایبەت تۆمارکراون و پیشانیشدراوە کە جەنگ لە چ بەروارێکی تایبەتی بە پێی ژماردنی درێژ ڕوویداوە. ئەستێرەی ڤینۆس پارێزەری خودایی جەنگ بوە و مایاکان لایانوابوە کە هەندێك قۆناخی سوڕانەوەی هەسارە ڤێنۆس بۆ بەرپاکردنی جەنگ پیرۆزی تایبەتی هەبوە. ئەو پیتە وێنەییانەی ئاماژەیانکردوە بۆ جەنگ و لە لایەن شوێنەوارناسانەوە بە "جەنگەکانی ئەستێرە" ناودەبرێ، ئەستێرەیەك پیشاندەدەن کە شلەیەك دەبارێنێتە سەر زەوی کە ڕەنگە ئاو یان خوێن بووبێ. نەخشەکان پاتێرنی هاوپەیمانی و ڕکابەری پیشاندەدەن. ململانێی گەورە لە ناو دەوڵەتە گەورەکانی وەك تیکاڵ و کالاکمول و کۆپان و پالینکیو دا هەبوە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات، و ئەمانیش دەوڵەتە بچووکەکانیان خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و کردوویانن بە دەوڵەتی سەر بەخۆیان. بەڵگە بۆ ئەمە لەو پیتە وێنەییانەوە دێ کە ئاماژەدەکەن بۆ هاتنە سەر تەختی پاشایەتی. لەم ماوەیەدا پیتە وێنەییەکان دەکەونە پیشاندانی ئەوەی کە دەوڵەتانی بچووکتر لە لایەن فەرمانڕەوایەکی دەرەکی ترەوە دەستیبەسەرداگیراوە.

نەخشەی (١٠)، شارە جیاوازەکانی مایا و شێوازەکانی پەیوەندیکردن لە نێوانیان دا پیشاندەدا کە لەلایەن هەردوو شوێنەوارناس نیکۆلاس گروب و سایمۆن مارتین دروستکراوەتەوە. ئەم شێوازانە ئەوە پیشاندەدەن کە هەرچەندە شارە گەورەکانی وەك کالاکمۆل و دۆز پیلاس و پیدراس نیرگاس و یاکس چیلان پەیوەندی دیپلۆماسی خەست لە نێوانیان دا هەبوە، بەڵام هەندێکیان لە لایەن ئەوانی ترەوە دەستیانبەسەرداگیراوە و و لە هەمانکاتیشدا دژی یەکتر شەڕیانکردوە.

## نەخشەی (١٠) دەوڵەتانی شاری مایا و پەیوەندی و ململانێکانی نێوان شارەکان




ڕاستی حاشاهەڵنەگر دەربارەی هەرەسهێنانی مایا ئەوەیە کە ئەم هەرەسهێنانە هاوکات بوە لەگەڵ لەناوچوونی ئەو مۆدێلە سیاسییەی لەسەر بنەمای کوبول ئاجاو دامەزرابوو. لە کاتی باسکردنی کۆپان دا بینیمان کە دوای مردنی یاکس پاساج لە ساڵی ٨١٠ زاین دا، پاشای تر نەهاتەسەرتەخت. لە دەوروبەری ئەم کاتەدا کۆشکە پاشایەتییەکان چۆڵکران. بیست میل لە باکووری کۆپان، لە شاری کیریگوا، دوا پاشا، جەید سکای لە نێوان ساڵانی ٧٩٥ تا ٨٠٠ زاین دا هاتەسەرتەخت. دوا مۆنیومێنتی بەروار لەسەر بە پێی ژماردنی درێژ ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٨١٠ زاین، هەمان ساڵی مردنی یاکس پاساج. شارەکە ماوەیەکی کەم دوای ئەو چۆڵکرا. لە سەراپای ناوچەی مایا دا چیرۆکەکە هەمان شتە: ئەو دەزگا سیاسییانەی زەمینەی فراوانبوونی بازرگانی و کشتوکاڵ و زیادبوونی دانیشتوانیان ڕەخساندبوو، لەناوچوون. دادگاکانی پاشایەتی لە کارکەوتن و چیتر مۆنیومێنت و پەرستگاکان نەخشیان لەسەر

هەڵنەکەندرا و کۆشکەکان چۆڵکران. کاتێك دەزگا سیاسی و ئابوورییەکان ڕمان و مەرکەزیەتی دەوڵەت لاوازبوو، ئابووری هاتەوە یەك و ژمارەی دانیشتوان کەمیکرد.

لە هەندێك حاڵەت دا، ناوەندە سەرەکییەکان لە ئەنجامی تەشەنەکردنی توندوتیژیدا هەرەسیانهێنا. ناوچەی پیێکسباتوون لە گواتیمالا ـ کە پەرستگا مەزنەکانی ئەم شوێنە دواتر ڕووخێنران و بەردەکانیان بەکارهێنران بۆ دروستکردنی دیواری بەرگری بەهێز۔ نموونەیەکی زیندوو دەخاتەڕوو. هەروەك لە چاپتەری داهاتوودا دەبینین، ئەمە زۆر هاوشێوەی ئەوە بوو کە لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆما دا ڕوویدا. دواتر، تەنانەت لە جێگای وەك کۆپان، کە نیشانەی کەمتری توندو تیژیی تێدا بوو لە کاتی هەرەسهێنانی دا، چەندین مۆنیومێنت ڕووخساریان تێکدرا یان ڕوخێنران. لە هەندێك جێگادا نوخبەکە مانەوە تەنانەت دوای لە ناوبردنی سەرەتایی کوبول ئاجاو. لە کۆپان بەڵگەی ئەوە هەیە کە نوخبە بەردەوامبوون لە دروستکردنی بینای نویێ بۆ ماوەی لایەنی کەم دوو سەد ساڵی تر پێش ئەوەی ئەوانیش دیارنەمێنن. لە شوێنەکانی تردا پێدەچیێ نوخبەکان لە هەمانکاتی نەمانی لۆردانی خودایی دا دیارنەمابن.

بەڵگە شوێنەوار (ئارکیۆلۆجی)یە بەردەستەکان هێندە زانیاریمان نادەنیێ تا بگەینە دەرەنجامێکی یەکلاکار دەربارەی ئەوەی کە بۆچی کوبول ئاجاو و نوخبەکەی دەوری دەسەڵاتیان لێسەندرایەوە و ئەو دەزگایانەی کە سەردەمی کلاسیکی مایایان دروستکرد، شکستیان هێنا. ئێمە دەزانین کە ئەمە لە سەر زەمینەی شەڕی نێوان شارەکان دا ڕوویدا و پێشدەچیێ کە ئۆپۆزیۆسۆن و یاخیبوون لە ناو شارەکان دا، کە ڕەنگە لە لایەن تاقمی تری نوخبەکەوە سەرکردایەتیکرابن، دەزگاکانی لەناوبردبیێ.

هەرچەندە ئەو دەزگا چەوسێنەرانەی کە مایاکان دروستیانکردن، سامانی تەواویان دەستەبەرکرد تا شارەکان ببوژێنەوە و نوخبەکان دەوڵەمەند ببن و هونەر و بینای مەزن بەرهەمبهێنن، بەڵام سیستەمەکە سەقامگیر نەبوو. ئەو دەزگا چەوسێنەرانەی ئەم نوخبە کەمە حوکمیاندەکردن، نایەکسانی گەورەی دروستکرد و ئەمەش بوەهۆی دەرکەوتنی پۆتێنشیەڵی شەڕی ناوخۆ لە نێوان ئەوانەی دەیانتوانی سوود لە دەرکێشانی سامان لە خەڵك وەربگرن. بۆیە لە کۆتایی دا ئەم ململانێیە بوە هۆی لەناوبردنی شارستانی مایا.

## ئایا کێشەکە لە کوێدایە؟

دەزگایانی چەوسێنەر لەمێژوودا زۆرن چونکە لۆجیکی بەهێزیان هەیە: ئەو دەزگایانە دەتوانن بڕێکی سنووورداری سامان بهێننەئاراوە و لە هەمانکاتیشدا ئەو سامانە بەسەر نوخبەیەکی بچووك دا دابەشبکەن. بۆ ئەوەی ئەم گەشەکردنە ڕووبدا، پێویستە مەرکەزیەتی سیاسی لە ئارادا بێ. کاتێك ئەمە ئەنجامدەدرێ، دەوڵەت ـ یان ئەو نوخبەیەی کۆنترۆڵی دەوڵەت دەکا ـ ئەو هاندانەی دەبێ کە وەبەرهێنانبکا و سامان بەرهەمبهێنێ و هانی خەڵکی تریش بدا تا وەبەرهێنانبکەن بۆ ئەوەی دەوڵەت بتوانێ دەرامەت لە خەڵك دەربکێشێ و تەنانەت لاسایی هەندێك لەو پرۆسانە بکاتەوە کە بە شێوەیەکی ئاسایی لە لایەن دەزگایانی کراوە و بازاڕەکانەوە ئەنجامدەدرێن. لە ئابووری کشتوکاڵی کاریبی دا، دەزگا چەوسێنەرەکان ئەو شێوازەیان لەخۆگرتبوو کە نوخبە بێگاریان بەکاردەهێنا تا کۆیلەکان ناچار بکەن شەکر بەرهەمبهێنن. لە یەکێتی سۆڤیەت دا ئەو شێوازەیان لە خۆگرتبوو کە حیزبی کۆمیۆنیست دەرامەتەکان لە کشتوکاڵەوە بگوێزێتەوە بۆ پیشەسازی و هەندێك شێوازی هاندان پێشکەشبکا بە بەڕێوەبەر و کرێکاران. هەروەك بینیمان، ئەم جۆرە هاندانانە بەهۆی سروشتی سیستەمەکەوە بنکۆڵکران.

توانای ئەنجامدانی گەشەکردنی بەردەوام دەبێتە پاڵنەر بۆ دروستکردنی مەرکەزیەتی سیاسی و هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو کە شیام پاشا ویستی پاشایەتی کیوبا دابمەزرێنێ و ڕەنگە هەر ئەوەش هۆکاری ئەوە بووبێ کە ناتوفییەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا شێوازێکی سەرەتایی یاسا وئاسایش و پلەبەندی و دەزگایانی چەوسێنەریان دامەزراند کە لە ئەنجامدا بوە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕشی کشتوکاڵی. هەروەها پێدەچێ پرۆسەی هاوشێوە لە هەردوو ئەمەریکادا بووبێتە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵگایانی نیشتەجێ و گواستنەوە بەرەو کشتوکاڵ و ئەمەش لەو شارستانییە پێشکەتوەدا بەدیدەکرێ کە مایا دروستیکرد لە سەر ئەو بناخانەی لە لایەن دەزگایانی زۆر چەوسێنەرەوە دانرابوون و زۆربەی دانیشتوانیان ناچاری

بێگاری دەکرد بۆ قازانجی نوخبەیەکی بچووك.

ئـەو گەشـەکردنەی بـەهۆی دەزگایـانی چەوسـێنەرەوە دروسـتدەبێ سروشـتی زۆر جیـاوازە لـەو گەشـەکردنەی لـە سـایەی دەزگایـانی کـراوەدا دروسـتدەبێ. لـە هـەمووی گـرنگتر ئەوەیـە کـە ئەوگەشـەکردنە نـاتوانێ بـەردەوامبێ. بـە پێـی سروشـتی خۆیـان دەزگایـانی چەوسـێنەر تێکـدانی بنیاتنەر ناهێننەئاراوە و لە باشـترین حاڵـەت دا تـەنیا بڕێکـی سـنووردار لـە پێشکەوتنی تەکنـەلۆجی دروسـتدەکەن. هـەر بۆیـە ئـەو گەشـەکردنەی ئـەو دەزگایانـە دروسـتیدەکەن هـەر بـۆ ئـەو ماوەیـە بەردەوامـدەبێ. ئـەزموونی سۆڤیەتی نموونەیەکی زینـدووی ئـەم سـنووردارییە ڕووندەکاتـەوە. ڕوسـیای سۆڤیەتی گەشـەکردنی خێـرای ئەنجامـدا کاتێـك بـە خێرایـی گەیـشتەوە بـە هەنـدێك لـە پێـشکەوتووترین تـەکنەلۆجییـەکانی جیهـان و دەرامەتـەکان لـە سێکتەری زۆر ناکارامەی کشتوکاڵەوە گوێزرانەوە بۆ پیـشەسازی. بـەڵام لـە ئاکام دا ئەو هاندانانەی لە هەموو سێکتەرەکان دا پێشکەشدەکران، هـەر لـە کـشتوکاڵەوە بـۆ پیـشەسازی، نـەیانتوانی پێـشکەوتنی تەکنـەلۆجی گورجبکەن. ئەم پێشکەوتنی تەکنەلۆجییە تەنیا لە چـەند بەشـێکی بـچووك دا ڕوویـدا دوای ئـەوەی دەرامـەت بـە شـێوەیەکی چـڕ بـۆ ئـەم بەشـانە تەرخانکران و نوێکاری تیایان دا بە خەستی بەداشـتکران لەبـەر ئـەو ڕۆڵـەی کـە لـە ڕکابـەری لەگـەڵ ڕۆژئـاوادا دەیـانگێڕا. گەشـەکردنی سـۆڤیەت، هەرچەندە خێرا بووبێ، هەر دەبوایە تەمەن کورت بوایـە و بـە هـاتنی ١٩٧٠ کان توانای بەردەوامی خۆی لە دەستدابوو.

نەبوونی تێکدانی بنیاتنەر و نەبوونی نوێکاری تەنیا هۆکار نین بۆ بـوونی ئاستەنگی گەورە لەبەردەم گەشەکردن دا لە سایەی دەزگایـانی چەوسـێنەر دا. مێژووی دەوڵەتانی ـ شاری مایا کۆتاییەکی نـەگریس و بەداخیـشەوە زۆر بـڵاو ڕووندەکاتـەوە، کـە دیـسانەوە لـە نـاو هـەناوی لـۆجیکی دەزگایـانی چەوسێنەردا خۆی حەشارداوە. کاتێـك ئـەم دەزگایانـە قـازانجی گـەورە بـۆ نوخبەکە بەدەستدەهێنن، هانـدانی بـەهێز دروسـتدەبێ بـۆ نوخبـەی تـر تـا جێگـەی نوخبـەی دەسـەڵاتدار بگرنـەوە. شـەڕی نـاوخۆ و ناسـەقامگیریی سـیمای بۆمـاوەیی دەزگایـانی چەوسـێنەرە و نـەك تـەنیا ناکارامـەیی زیـاتر دەهێننـەئاراوە، بـەڵکو زۆرجـار ئـەو مەرکەزیەتـە سیاسییەشـی کـە هەیـە

پێچەوانەدەکەنەوە و هەندێجاریش دەبنە هۆی لەناوبردنی یاسا و ئاسایش و شۆڕبوونەوە بۆ ناو ئاژاوە، هەروەك دەوڵەتانی ـ شاری مایا تووشیبوون دوای سەرکەوتنە ڕێژەییەکەیان لەسەردەمی کلاسیکییان دا.

هەرچەندە سنووردارە، بەڵام گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا کاتێك دەستپێدەکا زۆر سەرنجراکێش دەردەکەوێ. خەڵکێکی زۆر لە یەکێتی سۆڤیەت و خەڵکێکی زیاتریش لە ڕۆژئاوا دا واقیان لە گەشەکردنی سۆڤیەت وڕمابووله سالآنی ١٩٢٠ و ٣٠ و ٤٠ و ٥٠ و ٦٠ ەکان دا و تەنانەت تا ساڵانی ٧٠ کانیش، بەهەمان ئەو شێوەیەی کە هەنگاوە خێراکانی گەشەکردنی ئابووری ئەمڕۆی چین هۆشی لێبڕیون. بەڵام هەروەك بە شێوەیەکی درێژتر لە چاپتەری پازدەیەم دا باسی دەکەین، چین لە سایەی حوکمی حیزبی کۆمیۆنیست دا نموونەیەکی تری کۆمەڵگایە کە گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا ئەنجامدەدا و بەهەمانشێوە پێناچێ بتوانێ گەشەکردنی بەردەوام ئەنجامبدا ئەگەر ئاڵوگۆڕێکی سیاسی بنەڕەتی بەرەو دەزگایانی سیاسی کراوە ئەنجامنەدات.

# ٦

# لیکترازان

## چۆن ڤینس بوە مۆزەخانە؟

ئەو کۆمەڵە دوورگەیەی کە ڤێنس پێکدەهێنن دەکەونە ئەوپەڕی باکووری دەریای ئەیدریاتیک. لە چاخەکانی ناوەڕاست دا ڕەنگە ڤێنس دەوڵەمەندترین شوێنی جیهان بووبێ و خاوەنی کۆمەڵێك پێشکەوتووترین دەزگای ئابووری کراوە بوو کە لەسەر بنەمای کرانەوەی سیاسی ئومێدبەخش دامەزرابوون. ڤێنس سەربەخۆیی خۆی لە ساڵی ٨١٠ زاین دا وەرگرت، وەك دەرکەوت کاتێکی لەبار بوو. ئابووری ئەورووپا دوای ئەو ڕۆچوونەی لە ئەنجامی هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما تووشی بوو، بەرەو بوژانەوە دەڕۆیشت و پاشایانی وەك شارلیمان دەسەڵاتی سیاسی مەرکەزی بەهێزیان پێکەوەدەنایەوە. ئەمە بوە هۆی سەقامگیریی و ئاسایشی زیاتر و فراوانبوونی بازرگانی کە ڤێنس لە پێگەیەکی تایبەت دا بوو بۆ سوودوەرگرتن لێی. ئەو نەتەوەیەکی دەریاوانان بوو، کەوتبوە ناوەڕاستی دەریای ناوەڕاست. لە ڕۆژهەڵاتەوە بەهارات و ئەو کەلوپەلانەی لە بێزەنتیە دروستدەکران و کۆیلانی بۆ دەهات. ڤێنس دەوڵەمەندبوو. لە ساڵی ١٠٥٠ دا، کاتێك ڤێنس لە ڕووی ئابوورییەوە سەدەیەك بوو گەشەیدەکرد، ژمارەی دانیشتوانی ٤٥,٠٠٠ کەس بوو. بە هاتنی ساڵی ١٢٠٠ ئەم ژمارەیە ٥٠٪ زیادی کردو بوە ٧٠,٠٠٠ کەس. لە ساڵی ١٣٣٠ دا، دیسانەوە ژمارەی دانیشتوان ٥٠٪ ی تر زیادی کردو بوە ١١٠,٠٠٠. ڤێنس لەو دەمەدا هێندەی پاریس گەورە و ڕەنگە سێ هێندەی لەندەن بووبێ.

یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی بوژانەوەی ئابووری ڤێنس بریتیبوو لە زنجیرەیەك نوێکاری لە شێوازی ئەنجامدانی گرێبەست دا کە بوە هۆی ئەوەی دەزگا ئابوورییەکان زۆر کراوەتر بن. بەناوبانگترینیان بریتیبوو لە کۆمێندا، جۆرێکی سەرەتایی لە کۆمپانیای هاوبەش، کە تەنیا بۆ ماوەی گەشتێکی

بازرگــانی پێکــدەهێنرا. کۆمێنــدا لــە دوو هاوبــەش پێکهــاتبوو، هاوبەشــێکی نیشتەجێ کە لە ڤێنس دەمایەوە و هاوبەشێکیش کە سـەفەریدەکرد. هاوبەشـە نیشتەجێیەکە سەرمایەی دەخستە ناو کارە بازرگانییەکەوە، لـە کاتێـك دا ئـەو هاوبەشـــەی ســـەفەریدەکرد سەرپەرشـــتی کارگۆکـــەی دەکـــرد. هاوبەشـــە نیشتەجێیەکە هەمیشە پشکی شێری لە سەرمایەکەدا هەبوو. بزنسمانە لاوەکان کە بۆخۆیان خاوەنی سامان نەبوون، دەیانتوانی هاوبەشی بزنسە بازرگانییەکان بکـەن بــە سەرپەرشــتیکردنی کەلوپەلــە بازرگانییــەکان. ئەمــەش کــەناڵێکی سەرەکی جوڵاندنی کۆمەڵایەتی بەرەو سەرەوە بوو. هەموو زیانەکانی سـەفەرە بازرگانییەکە لـە نێـوان دوو هاوبەشـەکەدا بـە گـوێرەی بـڕی ئـەو سـەرمایەیەی دایانــدەنا بەشــدەکرا. ئەگــەر ســەفەرە بازرگانییەکــە قــازانجی بکردایــە ئــەوا قازانجەکە بە پێی دوو جۆرە گرێبەستی کۆمێندا دابەشدەکرا. ئەگەر کۆمێنداکە تاکلایەنە بوایە، ئەوا دەبوایە بازرگانە نیشتەجێکە ٪١٠٠ی سەرمایەکەی دابنایە و ٪٧٥ی قازانجەکەی بەردەکەوت. ئەگـەر گرێبەسـتەکە دوو لایەنـە بوایـە ئـەوا بازرگانــە نیــشتەجێکە ٪٦٧ ی ســەرمایەکەی دادەنــاو ٪٥٠ ی قازانجەکــەی بەردەکەوت. بە لێکۆڵینـەوە لـە دۆکیومێنتـە فەرمییـەکان، دەکـرێ بزانـرێ کـە کۆمێنــدا چ ڕۆڵێکــی لــە جووڵانــدنی کۆمەڵایــەتی بــۆ ســەرەوە بینیــوە: ئــەم دۆکیومێنتانە پڕن لە ناوی نوێ، کەسانێك کە پێشتر لە ناو نوخبەی ڤێنسیەکان دا نــەبوون. لــە دۆکیومێنتــەکانی مــیری ســاڵانی ٩٦٠ و ٩٧١ و ٩٨٢ زایــن دا، ژمــارەی نــاوە نوێکــان بــە ڕیــز، بــریتین لــە ٪٦٩ و ٪٨١ و ٪٦٥ ی نــاوی ئــەو کەسانەی تۆمارکرابوون.

کرانەوەی ئابووری و بەرزبوونەوەی خێزانە نوێکان لە ڕێگەی بازرگانییــەوە، سیستەمی سیاسـی ناچـارکرد کـە لـەوەش زیـاتر کـراوە بـێ. دۆج کـە حـوکمی ڤێنسی دەکرد لە لایەن ئەنجوومەنی گشتیەوە بۆ ماوەی ژیـان وەك فـەرمانڕەوا هەڵدەبژێرا. هەرچەندە ئەمـە کۆبوونەوەیـەکی گشتی هـەموو هاوڵاتییـان بـوو، بەڵام لە پراکتیس دا ئەنجوومەنی گشتی لـە لایـەن گروپێکـی سـەرەکی خێزانـە دەسـەڵاتدارەکانەوە کـۆنترۆڵ کرابـوو. هەرچـەندە دۆج زۆر بـەهێز بـوو، بـەڵام دەسـەڵاتەکەی بەرەبــەرە لــە ڕێگــەی گۆڕانکــاری لــە دەزگــا سیاســییەکان دا کەمکرایـــەوە. لـــە دوای ســـاڵی ١٠٣٢، دۆج شانبەشـــانی ئەنجوومـــەنی تازەدروستکراوی دۆق هەڵبژێرا کە یەکێك لە کارەکانی بریتی بوو لەوەی نەیەڵێ

دۆج دەسەڵاتی ڕەها پەیدابکا. یەکەم دۆج کە دەسەڵاتی سنووردارکرا بریتیبوو لە دۆمینیکۆ فلابیانیکۆ کە بازرگانێکی دەوڵەمەندی ئاوریشم بوو، لە خێزانێك بوو کە پێشتر پێگەی باڵایان نەبوو. ئەم گۆڕانکارییە دەزگاییە، فراوانبوونی دەسەڵاتی بازرگانی و هێزی دەریایی گەورەی بە دوای خۆیدا هێنا. لە ساڵی ١٠٨٢ دا ڤێنس لە لایەن قوستەنتەنیەوە ئیمتیازی بازرگانی گەورەی پێدرا و گەڕەکێك بۆ خەڵکی ڤێنس لەو شارەدا دروستکرا. ماوەیەکی کەم دوای ئەوە ئەم گەڕەکە بوە جێگای دە هەزار کەسی خەڵکی ڤێنس. لێرەدا دەبینین دەزگایانی ئابووری و سیاسی شانبەشانی یەکتر کاردەکەن.

فراوانبوونی ئابووری ڤێنس، کە گوشاری زیاتری بۆ گۆڕانکاری سیاسی دروستکرد، لە دوای ئەو گۆڕانکارییانەی لە دەزگایانی ئابووری و سیاسی دوای کوشتنی دۆج لە ساڵی ١١٧١ دا هاتنەئاراوە، زیاتر پەرەیسەند. یەکەم نوێکاری گەورە بریتیبوو لە دامەزراندنی ئەنجوومەنی مەزن، کە لەم کاتە بە دواوە بوە تاکە سەرچاوەی دەسەڵاتی سیاسی لە ڤێنس. ئەنجوومەنەکە پێکهاتبوو لە کاربەدەستە باڵاکانی دەوڵەتی ڤێنس، دادوەران و ئەریستۆکراتان تیایدا باڵادەست بوون. جگە لەم کاربەدەستانە، هەموو ساڵێك سەد ئەندامی نوێ لە لایەن کۆمیتەیەکی هەڵبژاردنەوە دەسنیشاندەکران. چوار ئەندامی ئەم کۆمیتەیە لە ناو ئەندامانی ئەنجوومەنی مەزن دا هەڵدەبژێران. دواتر ئەنجوومەنی مەزن ئەندامانی دوو ئەنجوومەنی تر کە لە خوار ئەنجوومەنی مەزنەوە بوون هەڵدەبژارد کە بریتیبوون لە سەنات و ئەنجوومەنی چل کەسی کە ئەرکی هەمەجۆری یاسادانان و جێبەجێکردنیان هەبوو. ئەنجوومەنی مەزن ئەنجوومەنی دۆقیشی هەڵدەبژارد کە لە دوو ئەندامەوە فراوانکرا بۆ شەش ئەندام. نوێکاری دوەم بریتیبوو لە دامەزراندنی ئەنجوومەنێکی تریش کە لە لایەن ئەنجوومەنی مەزنەوە بە تیرووپشك دیاریدەکران بۆ دەسنیشانکردنی دۆج. هەرچەندە دیاریکردنەکە دەبوایە لە لایەن ئەنجوومەنی گشتیەوە بڕیاڕی لەسەر بدرایە، چونکە تەنیا یەك کەس کاندیت دەکرا، بەڵام ئەم پرۆسەیە هەڵبژاردنی دۆجی خستە ژێر دەسەڵاتی ئەنجوومەنەکەوە. نوێکاری سێیەم بریتیبوو لەوەی کە دەبوایە دۆجی نوێ سوێندی یاسایی بخواردایە و ئەمەش دەسەڵاتەکانی سنووردارەکرد. بە تێپەڕبوونی کات ئەم جڵەوگیریانە فراوانترکران و دۆجەکانی کە دواتر دەسەڵاتیان گرتەدەست دەبوایە پابەندی بڕیارەکانی دادوەر بوونایە و

هـــەموو بڕیارەکانیـــشیان لـــە لایـــەن ئەنجوومـــەنی دۆقـــەوە پەســـەندبکرانایە. ئەنجوومــەنی دۆق ڕۆڵــی ئەوەشــی وەرگــرت کــە دەبوایــە دۆجــی ناچــارکردایە پابەندی هەموو بڕیارەکانی ئەنجوومەنی مەزن بوایە.

ئــەم ڕیفۆرمــە سیاســییانە بوونــە هــۆی ئەنجامــدانی زنجیرەیــەکی تــر لــە نوێکــاری: لــە یاســا و دامەزرانــدنی دادوەری ســەربەخۆ و دادگــا و دادگــای تێهەڵچوونەوە و یاسای نویٚ بـۆ گرێبەسـتی تایبـەت و مایەپوچـی. ئـەم دەزگـا نوێیانەی ڤێنس بواری دروستکردنی شێوازی یاسایی نوێی بزنس و جۆری نـوێی گرێبەسـتەکانی ڕەخـساند. نوێکـاری خێـرا لـە بـواری دارایـی دا سـەریهەڵدا و سەرەتای سیستەمی بانکی نـویٚ لـەم کاتانـەدا لـە ڤێـنس پەیـدابوو. پێدەچـوو داینەمیکی بردنی ڤێنس بەرەو دەزگایانی تەواو کراوە نەدەکرا بوەستێنریٚ.

بەڵام لە ناو هەموو ئەمانەدا گرژییەك بەدیدەکرا. گەشەکردنی ئابووری کە لە لایەن دەزگا کراوەکـانی ڤێنـسەوە پـشتگیریدەکرا، تێکـدانی بنیاتنـەری لەگـەڵ خۆی دا هێنا. هەر کۆمەڵێك لەو پیـاوە لاوە بازرگانانـەی لـە ڕێگـەی کۆمێنـدا و دەزگای ئابووری هاوشێوەوە دەوڵەمەند دەبوون، دەبـوە هـۆی کەمکردنـەوەی قـازانج و دەســکەوتە ئابوورییــەکانی نوخبــەی دەســەڵاتدار. ئــەوان تــەنیا قازانجـەکانی ئـەو نوخبەیـەیان کەمنـدەکردەوە، بـەڵکو تەحـەدای دەسـەڵاتی سیاسی ئەوانیشیان دەکرد. بۆیە هەمیشە نوخبەی ئەندام لە ئەنجوومەنی مەزن دا نیازیان هەبوە ئەگەر بۆیان بچوایەتە سەر ئەوا سیستەمەکەیان بەسەر هەموو ئەو خەڵکە نوێیەدا دادەخست.

لەســـەرەتای دامەزرانـــدنی ئەنجوومـــەنی مـــەزن دا، ســـاڵانە ئەنـــدامێتی ئەنجوومەنەکە دیاریدەکران. هەروەك بینیمان، لە کۆتایی ساڵ دا، چوار ئەنـدام بە شێوەیەکی ڕەمەکی دیاریدەکران بۆ دەسنیـشانکردنی سـەد ئەنـدامی سـاڵی دواتر کە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لە لایەن ئەنجوومەنەوە پەسەنددەکران. لـە ۳ تشرینی یەکەم ی ساڵی ١٢٨٦، پێشنیازێك خرایە بەردەم ئەنجوومەنی مەزن بـۆ دەســکاریکردنی یاســاکان بــۆ ئــەوەی دەسنیــشانکردنی ســەد ئەنــدامی ئەنجوومەکە لە لایەن ئەنجوومەنی چل کەسیەوە بە زۆربەی دەنـگ ڕەزامەنـدی لەسەر بدریٚ و ئەم ئەنجوومەنە چل کەسیەش لە لایەن بنەماڵـەی نوخبەکانـەوە کۆنترۆڵکرابوو. ئەمەش مافی ڤیتۆی دەدایە نوخبە دەربارەی دەسنیـشانکردنی ئەندامی نویٚ بۆ ئەنجوومەنەکـە، ئەمـەش شـتێك بـوو لەوەبـەر نوخبـە نـەیبوو.

پێشنیازەکە شکستیهێنا. لە ٥ تشرینی یەکەم ی ساڵی ١٢٨٦ دا، پێشنیازێکی تر پێشکەشکرا، ئەمجارە سەرکەوتنی بەدەستهێنا. لەو کاتە بەدواوە دەبوایە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ڕەزامەندی لەسەر دەسنیشانکردنی کەسێك بدرایە ئەگەر باوکی یان باپیرانی لە ئەنجوومەنی مەزن دا ئەندام بووبن. بە پێچەوانەوە ڕەزامەندی ئەنجوومەنی دۆق پێویست بوو. لە ١٧ تشرینی یەکەم دا، گۆڕانکارییەکی تر لە ڕێساکان دا تێپەڕێندرا کە بوە هۆی ئەوەی دیاریکردن بۆ ئەنجوومەنی مەزن دەبوایە لە لایەن ئەنجوومەنی چل کەسی و دۆج و ئەنجوومەنی دۆقەوە پەسەند بکرایە.

گفتوگۆ و هەموارکردنە دەستوورییەکانی ساڵی ١٢٨٦ سەرەتایەکی شوومی لا سێراتا (داخستن)ی ڤێنس بوو. لە شوباتی ساڵی ١٢٩٧ دا، بڕیاردرا ئەگەر لە ماوەی چوار ساڵی پێشووتردا ئەندامی ئەنجوومەنی مەزن بووبێت، ئەوا بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەسنیشاندەکرایت و پەسەندیشدەکرایت. دەسنیشانکراوانی نوێ، دەبوایە لە لایەن ئەنجوومەنی چلییەوە پەسەندبکرانایە بەڵام تەنیا دوزادە دەنگ بۆ ئەو پەسەندکردنە پێویست بوو. لە دوای ١١ ئەیلولی ساڵی ١٢٩٨، ئەندامانی هەنووکەیی و خیزانەکانیان پێویستیان بە ڕەزامەندی نەبوو. ئەنجوومەنی مەزن لەو دەمەدا بە ڕووی خەڵکانی دەرەوەی ئەنجوومەن دا داخرا و ئەوانەی لە سەرەتادا بوونە ئەندام، بۆخۆیان بوونە ئەریستۆکراتی میراتی. ئەم داخستنە لە ساڵی ١٣١٥ بە هێنانەئارای "کتێبی ئاڵتون" کە بریتیبوو لە تۆمارکردنێکی فەرمی پیاوماقوڵانی ڤێنس بە تەواوی جێبەجێکرا.

ئەوانەی لە دەرەوەی ئەم پیاوماقوڵیە نوێیە بوون نەیانهێشت بێ بەرەنگاربوونەوە دەسەڵاتەکەیان لە کیسبچێ. ناکۆکی سیاسی لە ڤێنس لە نێوان ساڵانی ١٢٩٧ و ١٣١٥ دا بەرەبەرە تاویسەند. بەشێك لە کاردانەوەی ئەنجوومەنی مەزن بریتیبوو لە زیادکردنی ژمارەی ئەندامانی. لە هەوڵێکی دا بۆ لەخۆگرتنی نەیارە بەرچاوەکانی، ژمارەی ئەندامانی لە ٤٥٠ ئەندامەوە زیادکرد بۆ ١٥٠٠ئەندام. ئەم فراوانبوونە هاوکات بوو لەگەڵ بە کارهێنانی سەرکوتکردن دا. هێزێکی پۆلیس بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٣١٠ خرایەگەڕ و ناچارکردن و بێگاری لە زیادبوون دا بوو، بێگومان ئەمانەش وەك ڕێگەیەك بۆ قایمکردنی سیستەمی نوێی سیاسی بەکارهێنران.

دوای جێبەجێکردنی داخستنی سیاسی، ئەنجوومەنی مەزن دەستیکرد بە داخستنی ئابووری. گۆڕان بەرەو دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر هەوڵی ملنان بەرەو دەزگایانی ئابووری چەوسێنەری بە دواداهات. لە هەمووی گرنگتر، گرێبەستەکانی کۆمێندا قەدەخەکران، کە یەکێك بوو لەو نوێکارییە مەزنانەی بوەهۆی دەوڵەمەندبوونی ڤێنس. نابێ ئەمە جێگەی سەرسوڕمان بێ: کۆمێندا لە بەرژەوەندی بازرگانانی نوێ بوو کە نوخبەی خاوەن دەسەلات هەوڵی دوورخستنەوەیانی دەدا. ئەمەش تەنیا هەنگاوێك بوو بەرەو دەزگایانی ئابووری چەوسێنەرتر. هەنگاوێکی تر کاتێك نرا کە لە ساڵی ١٣١٤ دا دەوڵەتی ڤێنس دەستیکرد بە دەستگرتن بەسەر بازرگانی دا و کردنی بە بازرگانی کەرتی گشتی. دەوڵەت پاوانی گەورەی خستەکار بۆ ئەنجامدانی چالاکی بازرگانی و لە ساڵی ١٣٢٤ بەدواوە دەستیکرد بە دانانی باجی زۆر لەسەر ئەو کەسانەی بەشداری کاری بازرگانییان دەکرد. بازرگانی شوێنانی دوور بوە پاوانی پیاوماقوڵان. ئەمەش سەرەتای کۆتایهاتنی خۆشگوزەرانی ڤێنس بوو. بە قۆرخکردنی جومگە سەرەکییەکانی بزنس لە لایەن نوخبەیەکەوە کە بەردەوام لە کەمبوون دا بوون، دارمان دەستیپێکرد. پێدەچوو ڤێنس لە لێواری بوونە یەکەم کۆمەڵگای کراوەدا بووبێ، بەڵام کودێتایەك لەناویبرد. دەزگا سیاسی و ئابوورییەکان چەوسێنەرتر بوون و ڤێنس بەرەو دارمانی ئابووری ملینا. بە هاتنی ساڵی ١٥٠٠، ژمارەی دانیشتوان هاتەسەر سەد هەزار کەس. لە نێوان ساڵانی ١٦٥٠ و ١٨٠٠، کاتێك ژمارەی دانیشتوانی ئەوروپا بە خێرایی زیادیدەکرد، ژمارەی دانیشتوانی ڤێنس لە کەمبوونەوەدا بوو.

ئەمڕۆ تەنیا ئابوورییەك کە ڤێنس هەیەتی، جگە لە بڕێکی کەم ماسیگرتن، بریتییە لە گەشتیاریی. لە بری ئەوەی پێشەنگی ڕێگا بازرگانییەکان و دەزگایانی ئابووری بێ، ڤێنسیەکان پیتزا و ئایسکریم دروستدەکەن و لە ڕێگەی فووتێکردنەوە شووشەی ڕەنگاوڕەنگ دروستدەکەن بۆ گەشتیارانی بیانی. گەشتیاران دێن تا کارە سەرسوڕهێنەرەکانی ڤێنسی پێش داخستن ببینن، وەك کۆشکەکەی دۆج و شێرەکانی کڵێسای قەدیس مارك کە لە ئەنجامی تاڵانکردنی بێزەنتیەکانەوە دەستیانکەوتبوو کاتێك ڤێنس حوکمی دەریای ناوەڕاستی دەکرد. ڤێنس لە سەنتەری هێز و دەسەڵاتی ئابوورییەوە بوە مۆزەخانە.

لەم چاپتەرەدا تەرکیز دەکەینە سەر پەرەسەندنی مێژوویی دەزگاکان لە

ناوچە جیاوازەکانی دنیا و شرۆڤەی ئەوە دەکەین بۆچی ئەو دەزگایانە بە شێوازی جیاواز پەرەیانسەند. لە چاپتەری چوارەم دا بینیمان چۆن دەزگایانی ئەورووپای ڕۆژئاوا لە دەزگایانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات دوورکەوتنەوە و چۆن دواتر ئەوانی ئینگلتەرە لەوانەی ناوچەکانی تری ئەورووپا دوورکەوتنەوە. ئەمە ئاکامی جیاوازی بچووکی دەزگایی نێوانیان بوو، کە بە زۆری لە ئەنجامی کارلێکردنی لێکترازانی دەزگایی و وەرچەرخانە مێژووییەکان دا دروستبوو. ڕەنگە وابیربکرێتەوە کە ئەم جیاوازییە دەزگاییانە تەنیا نموونەیەکی بچووکی کیشەیەکی قووڵی مێژوویی بن و لە ژێرەوە دەزگایانی ئینگلیزی و ئەورووپی لێبڕاوانە لە دەزگایانی شوێنەکانی تر ترازان، لەبەر ئەو جیاوازییە دەزگاییانەی هەزار ساڵ لەمەوبەر هەبوون. ئەوەشی دەمێنێتەوە، وەك دەڵێن، مێژوە.

ئەمە وانییە. لەبەر دوو هۆ. یەکەم، هەنگاونان بەرەو دەزگایانی کراوە، هەروەك باسەکەمان دەربارەی ڤێنس پیشانیدەدا، دەکرێ پێچەوانە بکرێتەوە. ڤێنس دەوڵەمەندبوو، بەڵام دەزگا سیاسی و ئابوورییەکانی لەناوبران و ئەو خۆشگوزەرانییە پێچەوانەکرایەوە. ئەمڕۆ ڤێنس دوڵەمەندە تەنیا لەبەر ئەوەی خەڵك کە داهات لە شوێنی تر پەیدادەکەن، حەز دەکەن لەوی خەرجیبکەن چونکە سەرسامن بە شکۆمەندی ڕابوردووی. ڕاستی ئەوەی کە دەشێ دەزگایانی کراوە بۆ دواوە بگەڕێنەوە ئەو پیشاندەدا کە پرۆسەی سادەی لەسەریەك کەڵەکەبونی پێشکەوتنی دەزگایی بوونی نییە.

دوەم، جیاوازییە دەزگاییە بچووکەکان، کە ڕۆڵی کاریگەر لە کاتی سەرهەڵدانی وەرچەرخانە مێژووییەکان دا دەبینن، بەپێی سروشتی خۆیان شیاوی پووکانەوەن. لەبەر ئەوەی بچووکن دەکرێ پێچەوانە ببنەوە و دواتر دەربکەونەوە و دیسانەوە پێچەوانە ببنەوە. لەم چاپتەرەدا دەبینین کە، بە پێچەوانەی ئەوەی لە تیوریەکانی جوگرافیاو کەڵتوور چاوەڕێی دەکەین، ئینگلتەرە، کە تیایدا هەنگاوی یەکلاکار بەرەو دەزگایانی کراوە لە سەدەی حەڤدەیەم دا نرا، قەتیسی خواردبوو نەك تەنیا لە هەزار ساڵی دوای شۆڕشی کشتوکاڵی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، بەڵکو لەسەرەتای چاخەکانی ناوەڕاستیشدا، دوای ڕوخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما. دوورگەکانی بەریتانیا زۆر جێگەی بایەخی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما نەبوون، بە دڵنیاییەوە گرنگی کەمتریان لە وولاتانی تری ئەورووپا و باکووری ئەفریقا و بەلقان و قوستەنتەنیە یان

ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەبوو. کاتێك ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕۆژئاوا لەسەدەی پازدەیەمی زاین دا هەرەسیهێنا، بەریتانیا تووشی پوکانەوەیەکی تەواو بوو. بەڵام ئەو شۆڕشە سیاسییانەی کە لە کۆتایی دا بوونە هۆی بەرپاکردنی شۆڕشی پیشەسازی، لە ئیتالیا و تورکیا و تەنانەت ئەورووپای ڕۆژئاواش ڕوویاننەدا، بەڵکو لە دوورگەکانی بەریتانیا دا ڕوویاندا.

بۆ تێگەیشتن لە ڕێڕەوی بەرەو شۆڕشی پیشەسازی ئینگلتەرە و ئەو وڵاتانەی شوێنپێی ئینگلتەرەیان هەڵگرت، میراتی ڕۆما، لەبەر چەندین هۆکار گرنگە. یەکەم، ڕۆما، بەهەمانشێوەی ڤێنس لە سەرەتادا نوێکاری سەرەکی دەزگایی ئەنجامدا. هەروەك لە ڤێنس، سەرکەوتنی سەرەتایی ئابووری ڕۆما لەسەر بنەمای دەزگایانی کراوە دامەزرابوو- بەلایەنی کەمەوە بە پێی ستانداردی ئەو کاتەی خۆیان. هەروەك لە ڤێنس، ئەم دەزگایانە بە تێپەڕبوونی کات بوونە دەزگایانی چەوسێنەرتر. لە ڕۆما، ئەمە ئاکامی گۆڕین بوو لە سیستەمی کۆمارییەوە (٥١٠ — ٤٩ پێش زاین) بۆ ئیمپراتۆریەت (٤٩ پێش زاین — ٤٧٦ زاین). هەرچەندە لە سەردەمی کۆماری دا، ڕۆما ئیمپراتۆریەتێکی مەزنی دروستکرد و بازرگانی دوور ماوە و گواستنەوە گەشەیانکرد، بەڵام زۆربەی ئابووری ڕۆما لەسەر بنەمای چەوساندنەوە دامەزرابوو. گواستنەوە لە کۆمارییەوە بۆ ئیمپراتۆریەت چەوساندنەوەکەی زیاتر کرد و لە کۆتایی دا بوە هۆی سەرهەڵدانی ململانێی ناوخۆ و ناسەقامگیری و هەرەسهێنان، هەروەك لە دەوڵەتی ـ شاری مایا بینیمان.

دوەم و گرنگتر، دەبینین کە پەرەسەندنی دەزگایی دواتری ئەورووپای ڕۆژئاوا، هەرچەندە میراتی ڕاستەوخۆی ڕۆما نەبوو، ئەنجامی ئەو وەرچەرخانە مێژووییە بوو کە لە ئەنجامی هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕۆژئاوا، لە هەموو ناوچەکەدا هاتبوەئاراوە. هاوشێوەی ئەم وەرچەرخانە مێژووییانە لە ناوچەکانی تری جیهانی وەك ئەفریقا و ئاسیا و ئەمەریکاکان دا زۆر دەگمەن بوون، هەرچەندە لە ڕێگەی مێژووی ئەسیوپیاوە ئەوە پیشاندەدەین کە کاتێك ناوچەکانی تر وەرچەرخانی مێژوویی هاوشێوەیان بۆ ڕێکەوت، هەندێجار بە شێوازێکی تارادەیەکی زۆر هاوشێوە بە پیربانەوە چوون. لاوازبوونی ڕۆما بوە هۆی سەرهەڵدانی فیوداڵیزم، کە نەمانی کۆیلەیەتی بەرهەمێکی لاوەکی ئەمە بوو. فیوداڵیزم بوە هۆی پەیدابوونی شارانی ئەوتۆ کە لەدەرەوەی بازنەی

دەسەڵاتی پاشاکان و ئەریستۆکراتەکان بوون و لە ئەنجامیشدا ئەم شارانە کۆمەڵە دەزگایەکی ئەوتۆیان دامەزراند کە دەسەڵاتی سیاسی فەرمانڕەواکان تیایان دا لاواز بوو. لە سەر ئەم زەمینە فیودالّیە بوو کە مردنی ڕەش کارەساتی نایەوە و شارە سەربەخۆ و ڕەنجدەرەکانی بەهێزتر کرد لەسەر حسابی پاشا و ئەریستۆکرات و موڵکدارانی گەورە. هەر لەم چوارچێوەیەدا بوو کە ئەو دەرفەتانەی بەهۆی بازرگانی ئەتڵەسیەوە هاتبوونەئاراوە، کاریخۆیانکرد. چەندین ناوچەی جیهان بەم گۆڕانکارییانەدا تێنەپەڕین و لە ئاکام دا لێکترازان ڕووی دا.

## جوانڕەوشتی ڕۆما (Roman Virtues)

لە ساڵی ۱۳۳ پێش زاین دا، سەرۆکی ئەنجوومەنی هاوڵاتییان، تایبیریۆس گراکۆس لە لایەن سەناتۆرەکانی ڕۆماوە کوژرا و لاشەکەی بەبێ هیچ مەراسیمێك فڕێدرایە ڕووباری تایبەر. بکوژەکانی تایبیریۆس وەك خۆی ئەریستۆکرات بوون و کوشتنەکەش لە لایەن پابلیۆس کۆرنیلیۆسی ئامۆزایەوە ڕێکخرابوو. تایبیریۆس گراکۆس وەك نەوەی هەندێك لە سەرکردە هەرە دیارەکانی کۆماری ڕۆما، خاوەن بنەچەیەکی بێخەوشی ئەریستۆکراتی بوو، لەوانە لۆشیەس ئەیمیلیەس پۆڵەس، پاڵەوانی جەنگەکانی ئیلیریەکان و دوەم جەنگی هانیباڵ و سیسپیۆ ئەفریکانەس، ئەو جەنەڕاڵەی بەسەر هانیباڵ دا سەرکەوت لە دوەم جەنگی هانیباڵ دا. ئایا بۆچی سەناتۆرە بەهێزەکانی ئەو ڕۆژگارە، تەنانەت ئامۆزاکەی خۆی دژی وەستان؟

وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر شتمان دەربارەی ناکۆکیەکانی ناو کۆماری ڕۆما و ڕۆچوونی دواتری پێدەڵێ. ئەوەی وای لە تایبیریۆس کرد بکەوێتە دژایەتی ئەو سەناتۆرە بەهێزانە بریتیبوو لە ویستی ئەو بۆ بەرەنگاربوونەوەیان لە مەڕ پرسێکی زۆر گرنگی ئەو ڕۆژگارە: تەرخانکردنی زەوی و مافەکانی هاوڵاتییانی ئاسایی ڕۆما.

لە سەردەمی تایبیریۆس گراکۆس دا، ڕۆما کۆمارێکی تەواو دامەزراو بوو. دەزگا سیاسی و فەزیلە بەرزەکانی سەربازانی ـ هاوڵاتی ـ هەروەك لە ڕێگەی

تابلۆ بەناوبانگەکەی جاك لویس دەڤید، سوێندی هۆراتی، پیشاندراوە، تا ئێستاش لە لایەن زۆر لە مێژووناسانەوە بە بناخەی سەرکەوتنی ڕۆما دادەنرێن. ئەم تابلۆیە پیشانیدەدا کە چۆن کوڕان لەبەردەم باوکانیان دا سوێندیان دەخوارد کە تا مردن بەرگری لە کۆماری ڕۆما بکەن. هاوڵاتییانی ڕۆما کۆمارەکەیان لە ڕێگەی لەسەر تەخت لابردنی پاشاکەیانەوە، لوشەس تاکیونیەس سوپەربەس کە بە تارکیۆنی سەربەرز ناسرابوو، لە ساڵی ٥١٠ پێش زاین دا، دامەزراند. کۆمارەکە ژیرانە دەزگایانی سیاسی دامەزراند کە چەندین ڕووی کراوەیان لەخۆ گرتبوو. کۆمارەکە لە لایەن چەندین قازیەوە بەڕێوەدەبرا کە بۆ ماوەی یەك ساڵ هەڵدەبژێران. لەبەر ئەوەی پێگەی قازی ساڵانە هەڵدەبژێرا و لە هەمانکاتیشدا لایەن چەندین کەسەوە بەڕێوەدەبرا، بوە هۆی کەمکردنەوەی توانای هەر تاکە کەسێك بۆ خۆقایمکردن و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتەکەی. دەزگاکانی کۆمارەکە سیستەمی لێپرسینەوە و ڕاگرتنی باڵانسیان لەخۆ گرتبوو کە بوە هۆی دابەشکردنی دەسەڵات بە شێوەیەکی فراوان. هەرچەندە هەموو هاوڵاتییانیش خاوەن نوێنەرایەتی یەکسان نەبوون چونکە دەنگدان ناڕاستەوخۆ بوو. لە هەمانکات دا، ژمارەیەکی زۆر کۆیلە هەبوون کە بۆ بەرهەمهێنان لە زۆربەی ئیتالیادا گرنگ بوون و ڕەنگە یەك لە سەر سێی دانیشتوانیان پێکهێنابێ. بێگومان کۆیلان نەك نوێنەرایەتی سیاسی، بەڵکو مافیشیان نەبوو.

هەورەك لە ڤێنس، دەزگایانی سیاسی ڕۆما تۆخمی پلورەلیستیان لەخۆ گرتبوو. هاوڵاتییانی ئاسایی ئەنجوومەنی تایبەت بەخۆیان هەبوو کە دەیتوانی سەرۆکی ئەنجوومەن هەڵبژێرێ و ئەویش دەسەڵاتی ئەوەی هەبوو ڤیتۆی کارەکانی قازیەکان بکا و داوای کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی هاوڵاتییان بکا و پێشنیازی یاسای نوێ بکا. ئەوە ئەنجوومەنی هاوڵاتییان بوو کە تایبیریۆس گراکۆسیان لە ساڵی ١٣٣ پێش زاین دا هێنایە سەر دەسەڵات. دەسەڵاتی هاوڵاتییان پشتی بە "جیابوونەوە" بەستبوو، کە شێوازێك بوو لە مانگرتن لە لایەن هاوڵاتییانەوە بەتایبەتی سەربازان کە بەرەو گردێکی دەرەوەی شار دەکشانەوە و هەموو هاوکارییەکیان لە گەڵ قازیەکان دا ڕەتدەکردەوە تا ئەو کاتەی سکاڵاکانیان گوێی لێدەگیرا. هەڕەشەکە بێگومان بەتایبەتی لە کاتی جەنگ دا کاریگەر بوو. گوایە لە کاتی ئەم جۆرە جیابوونەوەیەدا بوە لە

سـەدەی پێنجـەمی پـێش زایـن دا هاوڵاتییـان مـافی ئـەوەیان بەدەستهێنا کـە بۆخۆیان سەرۆکی خۆیان هەڵبژێرن و ئەو یاسـایانە دابنـێن کـە کۆمەڵگاکـەیانی بەڕێوەدەبرد. پارێزگاریە سیاسی و یاساییەکان، هەرچەندە بە پێی سـتانداردی ئـەمڕۆ سـنووردار بـوون، بـەڵام دەرفـەتی ئـابووری بـۆ هاوڵاتییـان ڕەخـساند و ئەندازەیەك لە کرانەوەی لە دەزگا ئابوورییەکان دا هێنایەئاراوە. لـە ئەنجامـدا، بازرگـانی لـە سـایەی کۆمـاری ڕۆمـا دا لـە سەرتاسـەری دەریـای ناوەڕاسـت دا گەشەیکرد. بەڵگە ئارکیۆلۆجییەکان ئـەوە دەردەخـەن کـە هەرچـەندە زۆربـەی هاوڵاتییان و کۆیلان گوزەرانیان زۆر لـە سـەروو ئاسـتی کولەمەرگیـەوە نـەبوو، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی ڕۆمـا و لەوانـە هاوڵاتییـانی ئاسـایی، داهـاتی بـەرزیان دەسـتدەکەوت و سـوودیان لـە خزمـەتگوزاری گـشتی وەك ئـاوەڕۆی ناوشـار و ڕووناکردنەوەی شەقامەکان وەردەگرت.

جگـە لەمـەش، بەڵگـەی ئـەوە هەیـە کـە هەنـدێك گەشـەکردنی ئـابووری لـە سایەی کۆماری ڕۆما دا ڕوویداوە. دەتوانین سامانی ئابووری ڕۆما لە پاشماوەی کەشتییەکانیانەوە مەزندە بکەین. ئەو ئیمپراتۆریەتەی ڕۆمانەکان دروستیانکرد بریتیبوو لە تەونێکی شارانی مینا ـ لە ئەسیناوە و ئەنتاکیا و ئەسکەندەریە لـە ڕۆژهەڵات و بە ڕۆما و قەرتاج دا بەرەو لەندەن لەوپەڕی ڕۆژئاوا دا. شانبەشـانی فراوانبـوونی ناوچـەکانی ڕۆمـا، بازرگـانی و چـالاکی دەریـایی تەشـەنەیکرد کـە دەکرێ لە ڕێگەی پاشماوەی ئەو کەشتیانەی لە لایەن ئارکیۆلۆجییەکانـەوە لـە دەریای ناوەڕاست دا دۆزراونەتەوە دەسنیشانبکرێن. دەکرێ ئەم پاشماوانە بـە چـەندین شـێوە مێـژووەکانیان دیـاریبکرێ. زۆرجـار کەشـتییەکان گۆزەیـان باردەکرد کە پڕبوون لە شەراب یان ڕۆنـی زەیتـوون کـە لـە ئیتالیـاوە بـۆ گـۆڵ دەگوێزرانەوە، یان ڕۆنی زەیتوونی ئیسپانییان بۆ فرۆشتن یان دابەشکردنی بـە خـۆڕایی دەهێنـا بـۆ ڕۆمـا. زۆرجـار گۆزەکـان کـە داخـراو بـوون و لـە قـوڕ دروسـتدەکران، زانیارییـان دەربـارەی ئـەوەی کـێ دروسـتیکردوون و کـەی دروستکراون لە خۆدەگرت. لە نزیـك ڕووبـاری تایبـەر لـە ڕۆمـا گردێکـی بـچووك هەیە کە پێیدەوترێ چیای تێستاسیۆ بە چیای کەلوپـەلی قـوڕین ناسـراوە، لـە نزیکەی پەنجاو سێ ملیۆن گۆزە پێکهاتوە. کاتێـك گۆزەکـان لـە کەشـتییەکان دادەگیران، فڕێدەدران و بە درێژایی سەدەکان گردێکی گەورەیان دروستکردوە.

دەکرێ هەندێجار مێـژووی دروسـتکردنی کالاکـانی تـری نـاو کەشـتییەکان و

خــودی کەشــتییەکە دیــاریبکرێن بــەهۆی شــێوازی بــەروار دیــاریکردنی ڕادیۆکاربۆنــەوە کــە تــەکنیکێکی بــەهێزە و لــە لایــەن شوێنەوارناســانەوە بەکاردەهێنری بۆ دیاریکردنی تەمەنی پاشماوە ئۆرگانییەکان. ڕووەك لە ڕێگـەی فۆتۆسێنسێسس ووزە دروستدەکا و ووزەی خۆر بەکاردەهێنن بۆ گۆڕینی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بۆ شەکر. کاتێك ئەمە دەکەن، ڕووەك بڕێك لە ڕادیۆئایزۆتۆپ، کاربۆن ـ١٤ کە لە سروشت دا هەیە دەگرنە خۆیان. دوای مردنیان، کاربۆن ـ١٤ ی ناو ڕووەکەکان بەرەبەرە لەناودەچێ بەهۆی شیبوونەوەی ڕادیۆئەکتیڤەوە.
کاتێك شوێنەوارناسان پاشماوەی کەشتییەك دەدۆزنەوە، دەتوانن بەرواری دروستبوونی تەختــەی کەشــتییەکە دیاریبکــەن لــە ڕێگــەی بــەراوردکردنی پاشماوەی کاربۆن ـ١٤ی نـاو تەختەکـە لەگـەڵ ئـەو بـڕە کـاربۆن ـ١٤ لـە ئەتمۆسفێردا هەبوە. لەم ڕێگەیەوە دەتوانرێ بخەملێنرێ کە درەختەکە کەی براوە. تەنیا پاشماوەی ٢٠ کەشتی، بەرواری دروستکردنی گەڕێنراوەتەوە بۆ پێش ساڵی ٥٠٠ پێش زاین. لەوانەیە ئەمانە کەشتی ڕۆمانەکان نەبووبن و زۆر ڕێیتێدەچێ، بۆ نموونە، کەشتی قەرتاجیەکان بووبن. بەڵام لەم بەرواره بەدواوە ژمارەی کەشتییە ڕۆمانییەکان بەخێرایی زیادیانکردوە. لە دەوروبەری سەردەمی لە دایکبوونی حەزرەتی عیسا دا، ژمارەیان گەیشتە لوتکە کە ١٨٠ کەشتی بوون.
پاشماوەی کەشتییان شێوازێکی بەهێزە بۆ دیاریکردنی کۆنتۆری ئابووری کۆماری ڕۆما و هەندێك بەڵگەی گەشەکردنی ئابووری دەخەنەڕوو، بەڵام دەبێ ئەم بەڵگانە لەو ڕوانگەیەوە سەیربکرێن. ڕەنگە دوو لەسەر سێی کاڵای ناو کەشتییەکان موڵکی دەوڵەتی ڕۆما بووبن. باج و سەرانە لە ناوچەکانەوە نێراون بۆ ڕۆما یان دانەوێڵە و زەیتوون لە باکووری ئەفریقاوە هێنراوە بۆ ڕۆما تا بە خۆڕایی بەسەر هاوڵاتییانی شارەکەدا دابەشبکرێن. ئەوە بەرهەمی ئەو چەوساندنەوەیە بوو کە بە زۆری چیای تێستاسیۆی دروستکرد.
ڕێگایەکی تری سەرسوڕهێنەر بۆ پەیداکردنی بەڵگەی گەشەکردنی ئابووری بریتییە لە پرۆژەی ستوونی سەهۆڵی گرینلاند. کاتێك کلوە بەفرەکان دێنەخوار، بڕێکی کەم خەوشی ئەتمۆسفێر لەگەڵ خۆیان دا هەڵدەگرن، بەتایبەتی کانزاکانی زیو و قورقوشم و مس. بەفرەکە دەیبەستێ و لەسەر ئەو بەفرەی ساڵانی پێشتر باریوە کەڵەکە دەبێ. ئەم پرۆسەیە بۆ هەزاران ساڵ

بەردەوامبوە و دەرفەتێكی بێهاوتا دەبەخشێتە زانایان بۆ تێگەیشتن لە رادەی پیسبوونی هەوا هەزاران ساڵ لەمەوبەر. لە ساڵانی ١٩٩٠ـ١٩٩٢ دا پرۆژەی ستوونی سەهۆڵ بە قووڵایی ٣,٠٣٠ مەتر سەهۆڵیان بڕی، كە مێژووی ٢٥٠,٠٠٠ ساڵی مرۆڤایەتی لەخۆ گرتبوو. یەكێك لە دۆزینەوەسەرەكییەكانی ئەم پرۆژەیە و ئەوانی تریش كە پێشووتر ئەنجامدرابوون، ئەوە بوو كە لە ساڵی ٥٠٠ ی پێش زاینەوە زیادبوونێكی بەرچاو لە خەوشی ئەتمۆسفێردا بەدیدەكرێ. برەكانی قورقوشم و زیو و مس لە ئەتمۆسفێردا لەو كاتە بەدواوە بەردەوام زیادیان كردوە تا گەیشتۆتە لوتكە لە سەدەی یەكەمی زاین دا. تەنیا لە سەدەی سیازدەیەم دا بڕی قورقوشم گەیشتەوە ئەم لوتكەیە. ئەم دۆزینەوانە ئەو پیشاندەدەن كە چالاكی كان چەند چڕ بوە بەبەراوورد لەگەڵ سەردەمی پێش و پاش رۆمانەكان. ئەم هەڵكشانە لە چالاكی كان دا بە روونی برەوسەندنی ئابووری دەردەخا.

بەڵام گەشەكردنی ئابووری رۆمانەكان نەیتوانی بەردەوامبێ و لە سایەی دەزگایانێك دا روویدا كە نیوە كراوە و نیوە چەوسێنەر بوون. هەرچەندە هاوڵاتییانی رۆما مافی سیاسی و ئابوورییان هەبوو، بەڵام كۆیلەیەتی بڵاو و زۆر چەوسێنەر بوو، نوخبە كە چینی سەناتۆرەكان بوون دەستیان بەسەر سیاسەت و ئابووری دا گرتبوو. سەرەرای بوونی ئەنجوومەنی هاوڵاتییان و سەرۆكی ئەنجوومەنەكە، بۆ نموونە، دەسەڵاتی راستەقینە لای سەنات بوو كە ئەندامانی لە بنەماڵە خاوەن زەوییە گەورەكان بوون و چینی سەناتیان پێكدەهێنا. بە رای لیڤی، مێژووناسی سەردەمی رۆمانەكان، سەنات لە لایەن رۆمۆلۆس، یەكەم پاشای رۆماوە دامەزرا و لە سەد پیاو پێكهاتبوو. نەوەكانی ئەمان چینی سەناتۆریان پێكدەهێنا، هەرچەندە خوێنی تازەشی بۆ زیادكرا. دابەشكردنی زەوی زۆر نایەكسان و زۆریش پێدەچێ بە هاتنی سەدەی دووەمی پیش زاین، ئەم دابەشكردنە نایەكسانتر بوبێ. ئەمەش ریشەی ئەو كێشەیە بوو كە تایبێریۆس گراكۆس وەك سەرۆكی ئەنجوومەنی هاوڵاتییان هێنایەپێشەوە.

لە كاتێك دا فراوانبوون لە سەرتاسەری دەریای ناوەراست دا بەردەوامبوو، رۆما بوە خاوەنی سامانێكی زۆر، بەڵام ئەم لێشاوە تەنیا لە لایەن چەند خێزانێكی دەوڵەمەند لە پلەی سەناتۆردا دەستیبەسەردا دەگیرا و نایەكسانی لە نێوان دەوڵەمەند و هەژاردا زیادیكرد. سامانی سەناتۆرەكان نەك تەنیا لە

ڕێگەی کۆنترۆڵی ناوچە دەوڵەمەندەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو، بەڵکو لە ڕێگەی موڵکی زۆریشەوە لە سەراپای ئیتالیا دەستیاندەکەوت. ئەم موڵکانە لەلایەن تاقمی کۆیلانەوە چاودێریدەکران کە زۆرجار لەو جەنگانەدا بە دیلدەگیران کە ڕۆما بەرپایدەکردن. بەلام زەوی ئەم موڵکانە لە کوێوە دەهاتن بە هەمانشێوە گرنگ بوو. سوپای ڕۆما لە سەردەمی کۆماردا لە هاونیشتمانیانی سەرباز پێکهاتبوو کە زەویداری بچووك بوون لە ناو ڕۆما و دواتریش لە ناوچەکانی تری ئیتالیادا. بە شێوەیەکی تەقلیدی ئەوان لە کاتی پێویست دا لەناو سوپادا دەجەنگان و دواتر دەگەڕانەوە سەر کێڵگەکانیان. کاتێك ڕۆما فراوان و هەڵمەتە سەربازیەکان درێژخایەن تر بوون، ئەم مۆدیلە نەیتوانی بەردەوامبیّ. سەربازان لە هەموو هەڵمەتێك دا بە درێژایی چەندین ساڵ لە کێڵگەکانیان دووردەکەوتنەوە و زۆر لە زەوییەکان کەڵکی بەکارهێنانیان نەدەما. خێزانی سەربازەکان زۆرجار دەکەوتنە بن چیایەك لە قەرز و ژیانی کولەمەرگیان بەسەر دەبرد. زۆربەی کێڵگەکان بەرە بەرە چوڵکران و خرانە سەر موڵکی سەناتۆرەکان. کاتێك چینی سەناتۆرەکان دەوڵەمەند و دەوڵەمەند تر بوون، خەڵکێکی زۆری بیّ زەوی لە ڕۆما کۆبوونەوە، زۆرجار دوای ئەوەی خزمەتی سەربازییان تەواودەکرد. بە نەبوونی زەوی تا بۆی بگەڕێنەوە، لە ڕۆما بە دوای کاردا دەگەڕان. لە کۆتایی سەدەی دوەمی پێش زاین دا بارودۆخەکە گەیشتە خاڵی تەقینەوە، لەبەر ئەوەی لە سەرێکەوە بۆشایی نێوان دەوڵەمەند و هەژار بە شێوەیەك فراوان بووبوو کە لەوەبەر ڕووینەدابوو و لە سەرێکی ترەوە، چونکە کۆمەڵانی هاوڵاتییانی ناڕازی لە ناو ڕۆما دا بوون کە ئامادەی یاخیبوون بوون لە دژی ئەم نادادپەروەریانەو دژی ئەریستۆکراسی ڕۆما. بەلام دەسەڵاتی سیاسی لە بندەست خاوەن زەوییە گەورەکانی چینی سەناتۆرەکان دا بوو کە سوودمەندبوون لەو گۆڕانکارییانەی لە ماوەی دوو سەدەی پێشتردا هاتبوونەئاراوە. زۆربەیان نیازی گۆڕینی ئەو سیستەمەیان نەبوو کە وا بەباشی خزمەتیکردبوون.

پلوتارك، مێژووناسی ڕۆما، لایوایە، کاتێك تایبێریۆس گراکۆس بەناو ئێترووریا، کە ناوچەیەکی ناوەندی ئیتالیای ئەمڕۆیە، گەشتیدەکرد، ئاگاداری ئەو ناهەمواریيانە بوو کە خێزانەکانی سەربازانی ـ هاوڵاتی تووشی بووبوون. لەبەر ئەم ئەزموونەی بووبیّ یان لە ئەنجامی ناکۆکی لەگەڵ سەناتۆرە

بەهێزەکانی ئەو سەردەمەدا، ئەو هەر زوو دەستی بە جێبەجێکردنی پلانێکی بوێرانە کرد بۆ گۆڕینی شێوازی دابەشکردنی زەوی لە ئیتالیادا. ئەو لە ساڵی ١٣٣ پێش زاین دا خۆی بۆ سەرۆکی ئەنجوومەنی هاوڵاتییان پاڵاوت و دواتریش پێگەکەی خۆی بەکارهێنا بۆ ئەنجامدانی چاکسازی لە دابەشکردنی زەویوزاردا: کۆمسیۆنێك لەوە دەکۆڵێتەوە کە ئایا زەوی دەوڵەت بە شێوەیەکی نایاسایی دەستیبەسەرداگیراوە و هەموو ئەو زەوییانەی لە سێ سەد ئەیکەر زیاترن دابەشدەکرێن بەسەر هاوڵاتییە بێزەوییەکانی ڕۆما دا. دیاریکردنی بڕی سێ سەد ئەیکەر لە راستیدا بەشێك بوو لە یاسایەکی کۆن، هەرچەندە بۆ چەندین سەدە پشتگوێخرابوو و جێبەجێنەکرابوو. پێشنیازەکانی تایبێریۆس گراکۆس شەپۆلی نارەزایی لە ناو چینی سەناتۆرەکان دا دروستکرد و توانیان بۆ ماوەیەك جێبەجێکردنی پێشنیازەکانی بەربەستبکەن. کاتێك تایبێریۆس توانی هێزی ئەو جەماوەرەی پشتگیریدەکرد بەکاربهێنێ بۆ لادانی سەرۆکێکی تر کە هەڕەشەی ڤیتۆکردنی چاکسازییەکانی زەوی دەکرد، ئەو کۆمسیۆنەی ئەو پیشنیازیکردبوو لە کۆتایی دا دامەزرا. لەگەڵ ئەمەش دا، سەنات لە رێگەی پێنەدانی پارە بە کۆمسیۆنەکە، جێبەجێکرنەکەی وەستاند.

شتەکان گەیشتنە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوە کاتێك تایبێریۆس گراکۆس داوایکرد لەو پارەیەی کە لە لایەن پاشای پێرگامەم کە شارێکی یونانی بوو بۆ خەڵکی ڕۆما بەجێهێڵرابوو، خەرجی کۆمسیۆنی چاکسازییەکانی زەوی دابینبکرێ. لەهەمانکات دا، هەوڵی دا بۆ جاری دوەم خۆی بۆ سەرۆکی ئەنجوومەن بپاڵێوێتەوە، بەشێك لە هۆکاری ئەمەش ئەوەبوو لەوە دەترسا کە دوای وازهێنانی لە لایەن سەناتەوە تۆڵەی لێبکرێتەوە. ئەمەش بیانووی دایەدەست سەناتۆرەکان تا تایبێریۆس بەوە تۆمەتباربکەن کە نیازی وایە خۆی بکاتە پاشا. ئەو و لایەنگرانی هێرشیانکرایە سەر و چەندین کەسیان لێکوژرا. تایبێریۆس گراکۆس یەکێك بوو لەوانەی هەر زوو لەناوبرا، هەرچەندە کوشتنەکەی کێشەکەی چارەسەرنەکرد و کەسانی تریش هەوڵیان دا چاکسازی لە دابەشکردنی زەوی و لایەنەکانی تری ئابووری وکۆمەڵگای ڕۆما دا بکەن. زۆریش لەوانە تووشی هەمان چارەنووس بوونەوە. بۆ نموونە، گایۆس، برای تایبێریۆس گراکۆس دوای ئەوەی ویستی چاو لە براکەی بکا، لە لایەن خاوەن زەوییەکانەوە کوژرا.

ئەم ناکۆکییانە ناوبەناو لە سەدەی دواتردا سەریانهەڵدەدایەوە ـ بۆ نموونە،

بونەهۆی بەرپابوونی "جەنگی کۆمەڵایەتی" لە نێوان ساڵانی ٩١ و ٨٧ پێش زایین دا. داکۆکیکاری سەرسەخت لە بەرژەوەندییەکانی سەنات، لوشەس کۆرنیلیۆس سولا، نەك تەنیا هەموو داواکارییەکانی بۆ گۆڕانکاری سەرکوتکردن، بەڵکو دەسەڵاتەکانی ئەنجوومەنی هاوڵاتییانیشی کەمکردەوە. هەمان ئەم مەسەلانە دیسانەوە بوونە فاکتەری سەرەکی پشتگیری خەڵکی ڕۆما بۆ جولیەس سیزەر لە ململانێکانی دا لەگەڵ سەنات.

ئەو دەزگا سیاسییانەی بڕبڕەی پشتی کۆماری ڕۆما بوون لە ساڵی ٤٩ پێش زاین دا لە لایەن جولیەس سیزەرەوە لەناوبران کاتێك سوپاکەی لە ڕووباری ڕۆبیکۆن پەڕاندەوە، ئەو ڕووبارەی ناوچەکانی سیزئەلپاین گۆل لە ئیتالیا جیادەکردەوە. ڕۆما کەوتە بندەستی سیزەر و جەنگێکی تری ناوخۆ بەرپابوو. هەرچەندە سیزەر سەرکەوتوو بوو، بەڵام لە لایەن سەناتۆرە نارازییەکانەوە بەسەرکردایەتی بروتەس کاسیۆس لە ساڵی ٤٤ پێش زاین دا کوژرا. کۆماری ڕۆما جارێکیتر دانەمەزرایەوە. جەنگێکی ناوخۆی نوێ لە نێوان لایەنگرانی سیزەر، بەتایبەتی مارك ئەنتۆنی و ئۆکتاڤیان لە لایەك و دوژمنەکانی سیزەر لە لایەکی ترەوە سەریهەڵدا. دوای ئەوەی ئەنتۆنی و ئۆکتاڤیان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، لەگەڵ یەکتردا کەوتنە شەڕ تا ئۆکتاڤیان لە ساڵی ٣١ پێش زاین دا لە شەڕی ئاکتیۆن دا سەرکەوت. لە ساڵی دوای ئەو سەرکەوتنەوە و بۆماوەی چلوپێنج ساڵ ئۆکتاڤیان کە لە دوای ساڵی ٢٨ پێش زاینەوە بە ئۆگەستۆس سیزەر ناسرا، بە تەنیا فەرمانڕەوایی ڕۆمای کرد. ئۆگەستۆس ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای دامەزراند، هەرچەندە ئەو ناونیشانی پرینسیپی پێباشتر بوو کە واتای "یەکەم لە ناو یەکسانان دا"ی دەگەیاند و بە ڕژێمەکەشی دەووت پرینسیپەیت. نەخشەی (١١) ئیمپراتۆریەتی ڕۆما پیشاندەدا لە کاتی گەورەترین قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی دا لە ساڵی ١١٧ زاین دا. هەروەها نەخشەکە ڕووباری ڕۆبیکۆن پیشاندەدا کە سیزەر پەڕینەوە چارەنوس سازەکەی لێئەنجامدابوو.

## نەخشەی (١١): ئیمپراتۆریەتی ڕۆما لە ساڵی ١١٧ زاین دا




ئـەم گواسـتنەوەیە بـوو لـە کۆمـارەوە بـۆ پرینـسیپەیت و دواتـریش بـۆ ئیمپراتۆریـەتی زەق کـە تـۆوی داهێزرانـی ڕۆمـای چـاند. دەزگـا سیاسـییە تـا ڕادەیەك کراوەکان، کە بناخەی سـەرکەوتنی ئابوورییـان داڕشـتبوو، بەرەبـەرە لاوازکران. هەرچەندە کۆماری ڕۆمـا مەیـدانێکی لێـژی گەمـەی لـە بەرژەوەنـدی چینی سەناتۆر و ڕۆمانە دەوڵەمەندەکان دروسـتکردبوو، بـەڵام ڕژێمێکـی ڕەهـا نەبوو. هەرگیز پێشتر ئەو هەموو دەسەڵاتەی لە یەك پێگەدا چڕنەکردبۆوە. ئەو گۆڕانکارییانـەی لـە لایـەن ئۆگەستۆسـەوە ئەنجامـدران، هـەروەك سـیراتای ڤێنسیەکان، لە سەرەتادا سیاسی بوون، بەڵام دواتر ئاکامی ئابووری گـەورەیان

لێکەوتەوە. لە ئەنجامی ئەم گۆڕنکاریانەدا، بە هاتنی سەدەی پێنجەمی زاین، ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕۆژئاوا، کە دوای ئەوەی لە بەشی ڕۆژهەلأت جیابۆوە وای پێدەوترا، لە ڕووی ئابووری و سوپاییەوە لاواز و لە سەر لێواری ڕووخان دا بوو.

## بەدڕەوشتی ڕۆما (Roman Vices)

فلاڤیۆس ئەیتیۆس کارێکتەرێکی هەڵکەوتووی دوا ساتەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما بوو، لە لایەن دۆگلاس گیبۆن، نووسەری کتێبی لاوازبوون و لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما، وەك "دواکەسی ڕۆمانەکان" وەسفکراوە لە نێوان ساڵانی ٤٣٣ و ٤٥٤ زاین دا. ئەیتیۆس، تا کوشتنی لە لایەن ئیمپراتۆر ڤالەنتینیانی سێیەمەوە، وەك جەنەڕاڵێك بە دەسەلأتترین کەسی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما بوە. ئەو هەردوو سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەی داڕشتەوە و سەرکردایەتی زنجیرەیەك جەنگی گرنگی دژی بەربەرەکان و ڕۆمانەکانی تر کرد لە میانەی شەڕی ناوخۆدا. ئەو لەوەدا لەو جەنەڕاڵانەی بەشداری جەنگە ناوخۆیەکانیان دەکرد جیاواز بوو کە بۆخۆی بەتەما نەبوو ببێتە ئیمپراتۆر. لە دوای کۆتایی سەدەی دوەم دا، جەنگی ناوخۆ بووبوە ڕاستیەکی ژیان لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆما دا. لە نێوان ساڵی مردنی مارکیۆس ئۆرۆلیۆس لە ساڵی ١٨٠ ی زاین دا و تا هەرەسهێنانی ئیمپراۆریەتی ڕۆمای ڕۆژئاوا لە ساڵی ٤٧٦ زاین دا، زۆر کەم ڕێکەوتوە کە دەیەیەك بەبێ جەنگی ناوخۆ یان کۆدێتای کۆشك دژی ئیمپراتۆر تێپەڕیبێ. ژمارەیەکی کەم لە ئیمپراتۆرەکان بە هۆکاری سروشتی مردوون، یان لە شەڕدا کوژراون. زۆربەیان لە لایەن زەوتکارانی دەسەلأت یان سوپاکانی خۆیانەوە کوژراون.

پیشەی ئەیتیۆس گۆڕانکارییەکان لە کۆماری ڕۆما و سەرەتای ئیمپراتۆریەتەکە بۆ قۆناخەکانی دواتری ئیمپراتۆریەتەکە ڕووندەکاتەوە. نەك تەنیا بەشداری ئەو لە جەنگە ناوخۆییە بەردەوامەکان و دەسەلأتی لە هەموو بوارەکانی کاری ئیمپراتۆریەتەکەدا جیاواز بوو لە جەنەڕاڵ و سەناتۆرە دەسەلأت سنووردارترەکانی سەردەمانی پێشووتر، بەڵکو پیشەکەی ئەو ئەوە

ڕووندەکاتەوە کە چۆن گوزەرانی ڕۆمانەکان لە ڕووی تەرەوە بە شێوەیەکی ڕیشەیی لە سەدەکانی دواتردا گۆڕانکاری بەسەرداهات.

لە قۆناخە دواییەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما دا، ئەوانەی پێیان دەڵێن بەربەرییەکان، کە لەسەرەتادا کۆنترۆڵکراو و لە ناو سوپاکانی ڕۆما دا ڕێکخرابوون یان وەك کۆیلە بەکاردەهێنران، زۆربەی ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتەکەیان خستە ژێر دەستی خۆیانەوە. وەك پیاوێکی لاو، ئەیتیۆس لە لایەن بەربەرەکانەوە بە بارمتە گیرا، یەکەمجار لە لایەن گۆسیەکان لە ژێر سەرکردایەتی ئەلاریك و دواتر لە لایەن هەنەکانەوە. پەیوەندییەکانی ڕۆما لەگەڵ ئەم بەربەریانە ئاماژەن بۆ ئەوەی کە چۆن شتەکان دوای سەردەمی کۆمار گۆڕانکارییان بەسەرداهاتبوو. ئەلاریك لە لایەکەوە دوژمنی سەرسەخت و لە لایەکی تریشەوە هاوپەیمانی ڕۆمانەکان بوو تا ئەو ڕادەیەی لە ساڵی ٤٠٥ دا کرایە یەکێك لە جەنەڕاڵە باڵاکانی سوپای ڕۆمانی. بەهەرحاڵ، ئەم پێکەوە هەڵکردنە کاتی بوو. بە هاتنی ساڵی ٤٠٨، ئەلاریك شەڕی دژی ڕۆما دەسپێکرد و ئیتالیای داگیرکرد و کاربەدەستانی ڕۆمای دەرکرد.

هەنەکانیش دوژمنی بەهێز و لە هەمانکات دا زووزووش دەبوونە هاوپەیمانی ڕۆمانەکان. هەرچەندە ئەوانیش ئەیتیۆسیان بە بارمتەگرت، دواتر لە جەنگێکی ناوخۆیی دا شانبەشانی ئەو شەڕیانکرد. بەڵام هەنەکان بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ لایەك دا نەدەمانەوە و بە سەرکردایەتی ئەتیلاس لە ساڵی ٤٥١ دا شەڕێکی گەورەیان لەو بەری ڕووباری ڕاینەوە دژی ڕۆمانەکان بەرپاکرد. ئەمجارە ئەوانەی بەرگرییان لە ڕۆمانەکان کرد بریتیبوون لە گۆسەکان بەسەرکردایەتی سیۆدۆریك.

هەموو ئەمانەش نەبوونە ڕێگر لەبەردەم نوخبە ڕۆمانییەکان دا تا هەوڵی ڕازیکردنی فەرماندە بەربەرەکان بدەن، زۆرجاریش لە پێناوی پاراستنی خاکی ڕۆما دا نەبوو، بەڵکو بۆ هێشتنەوەی باڵادەستیان بوو لەو ململانێ ناوخۆییانەی لەسەر دەسەڵات لە ئارادابوون. بۆ نموونە، ڤاندالەکان لە سەردەمی گایسیریك پاشادا، چەندین ناوچەی دوورگەی ئایبریایان تاڵانکرد و دواتریش لە دوای ساڵی ٤٢٩ ەوە سەرچاوەی خۆراکی ڕۆمانەکانیان لە باکووری ئەفریقا داگیرکرد. کاردانەوەی ڕۆما بۆ ئەمە بریتیبوو لە پێشکەشکردنی کچە منداڵەکەی ئیمپراتۆر ڤالانتینیانی سێیەم وەك بوك بە گایسریك. گایسریك لەو دەمەدا کچی یەکێك لە

سەرکردەکانی گۆسەکان ژنی بوو، بەڵام ئەمە پیناچێ ئەوی لە کارەکەی وەستانبێ. ئەو هاوسەریەکەی بەتاڵکردەوە بەو بیانوەی کە ژنەکەی ویستویەتی بیکوژێ ناردیەوە بۆ خێزانەکەی دوای ئەتککردنی بەبڕینی هەردوو گوێ و لووتی. لە بەختی بووکی داهاتوو لەبەر کەمی تەمەنی لە ئیتالیا هێشتیانەوە و شووکردنەکەی بە گایسریك نەچوە سەر. دواتر شووی بە جەنەڕاڵێکی بەهێزکرد کە پیٚرۆنیۆس ماکزیمەس بوو، هەر ئەویش پلاندانەری کوشتنی ئەیتیۆس بوو لەلایەن ئیمپراتۆر ڤالانتینیانی سێیەمەوە و دواتریش ئیمپراتۆر لە پیلانێکدا کە لە لایەن ماکزیمەسەوە دانرا بوو، کوژرا. ماکزیمەس خۆی کردە ئیمپراتۆر، بەڵام دەسەڵاتەکەی زۆر کورت و زوو کۆتاییهات و لە هێرشێکی گەورەدا دژی ئیتالیا لە لایەن ڤاندالەکانەوە بە سەرکردایەتی گایسریك، کوژرا، کە بوە هۆی داگیرکردنی ڕۆما و خاپوورکردنی بە شێوەیەکی دڕاندانە.

لە سەرەتای سەدەی پێنجەم دا بەربەرییەکان گەیشتبوونە دەروازەی ڕۆما. هەندێك لە مێژووناسان لایان وایە کە ئەمە ئەنجامی ڕووبەڕووبوونەوەی ڕۆمانەکان بوو لەگەڵ دوژمنە زیاتر سەرسەختەکانیان دا. بەڵام سەرکەوتنی گوس و هەن و ڤاندالەکان نیشانە بوون نەك هۆکاری لاوازبوونی ڕۆما. لە سەردەمی کۆماردا، ڕۆما ڕووبەڕووی دوژمنی سەرسەخت تر و ڕێکخراو تری وەك قەرتاجەکان بوبۆوە. لاوازبوونی ڕۆما لە ئەنجامی هۆکاری هاوشێوەی هۆکارەکانی لاوازبوونی دەوڵەتی - شاری مایا بوو. دەزگا سیاسی وئابوورییەکانی ڕۆما کە تا دەهات چەوسێنەرتر دەبوون، بوونە هۆی لەناوچوونی، چونکە ئەم دەزگایانە بوونە هۆی سەرهەڵدانی ململانێ لە ناو فەرمانڕەوایان و هەڵگیرسانی جەنگی ناوخۆ.

بنچینەکانی لاوازبوون بەلایەنی کەمەوە دەگەڕێنەوە بۆ دەستگرتن بەسەر دەسەڵات دا لە لایەن ئۆگەستۆسەوە، کە ڕەوڕەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی خستە جووڵە کە دەزگا سیاسییەکانیان چەوسێنەرترکردن. هەندێك لەو گۆڕانکارییانە بریتیبوون لە گۆڕانکاری لە هەیکەلی سوپا دا کە بوە هۆی ئەوەی جیابوونەوە ئەستەم بێ، بەمەش ئەو توخمە گرنگەی لەناوبرد کە نوێنەرایەتی سیاسی بۆ ڕۆمانە ئاساییەکان مسۆگەرکردبوو. ئیمپراتۆر تایبێریۆس کە دوای ئۆگەستۆس لە ساڵی ١٤ زاین دا دەسەڵاتی گرتەدەست، ئەنجومەنی هاوڵاتییانی

هەڵوەشاندەوە و دەسەڵاتەکانی گواستەوە بۆ سەنات. لە بری دەنگی ئازاد، هاوڵاتییانی ڕۆما بە خۆڕایی گەنم و دواتریش ڕۆنی زەیتوون و شەراب و گۆشتی بەرازیان بەسەردا دابەشکرا و لە ڕێگەی کێبڕکێکانی سێرکەس و زۆرانبازییەوە سەرگەرمی رابواردن کران. لە ئەنجامی چاکسازییەکانی ئۆگەستۆس دا، ئیمپراتۆرەکان لە بری پشتبەستن بە سوپای پێکهاتوو لە سەربازانی ـ هاوڵاتی، کەوتنە پشتبەستن بە پاسەوانانی پریتۆری کە گروپی نوخبەی سەربازانی پرۆفیشەنەڵ بوون و لە لایەن ئۆگۆستەسەوە پێکهێنرا. زۆری نەخایاند پاسەوانەکان بۆخۆیان بوونە هێزی کاریگەری سەربەخۆ لە دانانی ئیمپراتۆردا و زۆرجاریش لە ڕێگەی شێوازی ئاشتیانەوە نا بەڵکو لە ڕێگەی جەنگی ناوخۆ و پیلانگێڕییەوە. لە هەمانکات دا ئۆگەستۆس ئەریستۆکراسی لە دژی هاوڵاتییانی ئاسایی ڕۆما بەهێزکردو ئەو نایەکسانییەی کە ڕیشەی ململانێکانی نێوان تایبیریۆس گراکۆس و ئەریستۆکراتەکانی پێکهێنابوو، بەردەوامبوو، ڕەنگە بەهێز تریش بوبێ.

چڕبوونەوەی دەسەڵات لە ناوەندا بوە هۆی ئەوەی مافی موڵکداری ڕۆمانە ئاساییەکان کەمتر جێگیربێ. زەویوزاری دەوڵەت لە ڕێگەی زەوتکردنەوە فراوانتر بوو، تا ئەو ڕادەیەی لە چەندین ناوچەی ئیمپراتۆریەتەکەدا زەوی دەوڵەت گەیشتە نیوەی هەموو زەوییەکان. مافی موڵکداری لە ئەنجامی چڕکردنەوەی دەسەڵات لە ناو دەستی ئیمپراتۆر و دەستوپێوەندەکانی دا زۆر ناجێگیر بوو. بە شێوازێك کە زۆر جیاواز نەبوو لەوەی لە دەوڵەتی ـ شاری مایا دا ڕوویدا و ململانێی ناوخۆ بۆ دەستگرتن بەسەر ئەم پێگە بەهێزە دا زیادیکرد. تەنانەت پێش سەدەی پێنجەمی پڕ ئاژاوە کە بەربەرییەکان دەسەڵاتی بالایان پەیداکرد، جەنگەکانی ناوخۆ بەردەوام ڕوویاندەدا. بۆ نموونە، سیپتیمیۆس سێڤێرەس دەسەڵاتی لە دیدیۆس جولیانۆس سەندەوە و دواتر، دوای کوشتنی پێرتیناکس لە ساڵی ١٩٣ زاین دا، خۆی کردە ئیمپراتۆر. سێڤێرەس کە سێیەم ئیمپراتۆری ئەوەی پێیدەوترێ ساڵی پێنج ئیمپراتۆرەکە بوو، دواتر جەنگی لە دژی ئەو نەیارانەی بەرپاکرد کە چاویان بڕیبوە جێگەکەی. ئەوانیش بریتیبوون لە جەنەڕال پێسینیۆس نیگەر، لە ساڵی ١٩٤ زاین دا و جەنەڕاڵ کلۆدیۆس ئەلبینۆس لە ساڵی ١٩٧ زاین دا تێکشکێنران. سێڤێرەس هەموو زەوییەکانی ئەو دوژمنانەی لە جەنگە ناخۆییەکان دا بەشداربوون زەوتکرد. هەرچەندە

فەرمانڕەوایانی توانـاداری وەك تـرەیجن ( لـە سـاڵی ٩٨ تـا ١١٧ زایـن دا) و هادریـان و مـارکۆس ئۆریلیـۆس لـە سـەدەی دواتـردا، توانیـان دارمـانی ئیمپراتۆریەتەکە بوەستێنن، بەڵام نەیانتوانی یان نەیانویست چارەسەری کێشە دەزگاییە بنەڕەتیەکان بکەن. هیچ یەکێك لەم پیاوانە پێشنیازی وازهێنـان لـە ئیمپراتۆریەت یان دامەزراندنـەوەی دەزگایـانی سیاسـی کاریگـەری هاوشـێوەی ئەوانـەی کۆمـاری ڕۆمایـان نـەکرد. مـارکۆس ئۆریلیـۆس، لەگـەڵ هـەموو سەرکەوتنەکانی دا، لە لایەن کوڕەکەیەوە کۆمۆدۆس جێگەیگیرایەوە کـە زیـاتر لە کالیگۆلا و نیرۆ دەچوو نەك لە باوکی.

زیـادبوونی نـاجێگیریی لـە شـێوازی بڵاوبوونـەوەو جێگـای شـارانی ئیمراتۆریەتەکەدا دیار بـوو. بـە هـاتنی سەدەی سێیەمی زایـن، هـەموو شـارە گەورەکانی ئیمپراتۆریەتەکە دیواری بـەرگرییان هـەبوو. لـە چـەندین حاڵـەت دا مۆنیومێنتەکان تاڵانکران بۆ پەیداکردنی بەرد کـە لـە قـایمکردنی دیوارەکـان دا بەکاردەهێنران. لە گۆڵ، بەر لە گەیشتنی ڕۆمانەکان لە سـاڵی ١٢٥ پـێش زایـن دا، ئاسایی بوو کە شوێنی نیشتەجێبوون لەسەر گردەکان دروستبکرێن چـونکە دەتوانرا بە ئاسانی بەرگرییان لێبکـرێ، لـە سـەرەتای گەیـشتنی ڕۆمانـەکان دا ئـەم شـوێنی نیـشتەجێبوونانە گوێزرانـەوە بـۆ دەشـتەکان، بـەڵام لـە سـەدەی سێیەم دا ئەم ڕێچکەیە پێچەوانەبۆوە.

شانبەشانی تەشەنەکردنی ناسـەقامگیریی سیاسـی گۆڕانکـاری ئـەوتۆ لـەناو کۆمەڵگادا هاتەئاراوە کە دەزگا ئابوورییەکانیان بەرەو دەزگایانی چەوسێنەر تر برد. هەرچەندە هاوڵاتیبوون فراوانتر کرا تا ئـەو ڕادەیـەی کـە بـە هـاتنی سـاڵی ٢١٢ زاین، نزیکەی هـەموو دانیـشتوانی ئیمپراتۆریەتـەکـە هـاوڵاتی بـوون، بـەڵام هەموو هەستکردنێك بەبوونی یەکسانی بەرامبەر یاسا بەرەو لاوازی ڕۆیشت. بـۆ نموونـە، لـە کـاتی دەسـەڵاتی هادریـان دا (سـاڵی ١١٧ بـۆ سـاڵی ١٣٨ زایـن) جیـاوازی ئاشـکرا لـە جـۆری ئـەو یاسـایانەدا هـەبوو کـە بـە سـەر کاتەگۆریـە جیاوازەکانی هاوڵاتییانی ڕۆما دا جێبەجێدەکران. بە هەمانـشێوە گـرنگ، ڕۆڵـی هاوڵاتییان بە تـەواوی جیـاواز بـوو لـەو ڕۆڵـەی لـە سـەردەمی کۆمـاری ڕۆمـا دا هەیانبوو، کە دەیانتوانی جۆرێك لە دەسەڵاتیان لە وەرگرتنی بڕیارە سیاسـی و ئابوورییەکان دا هەبێ لە ڕێگەی ئەنجوومەنەکانی ناو ڕۆماوە.

کۆیلەیەتی لە هەموو ڕۆما دا بەردەوامبوو، هەرچەندە جۆرە ناڕوونیەك هەیە

له بارەی ئەوەی کە ڕەنگە ڕێژەی کۆیلان لە ناو دانیشتوان دا بە درێژایی سەدەکان کەمی کردبێ. بەهەمانشێوە گرنگ، لەگەڵ پەرەسەندنی ئیمپراتۆریەتەکەدا، تا دەهات ژمارەی زیاتری کرێکارانی کشتوکاڵی پلەیان بۆ ئاستی نیمچە بەندە نزمدەکرایەوە و بە زەوییەکانیانەوە دەبەسترانەوە. بارودۆخی ئەم بەندانە "کۆلۆنی" بە خەستی لە دۆکیومێنتە یاساییەکانی وەك کۆدێکس سیۆدۆسیانۆس و کۆدێکس جەستینیانۆس دا باسکراوە و لەوانەیە لە سەردەمی دەسەلاتی دیۆکلیتیان ( ساڵی٢٨٤ بۆ ساڵی ٣٠٥ زاین) ەوە سەریانهەڵدابێ. مافی خاوەن زەوییەکان بەسەر کۆلۆنییەکانەوە لە زیادبووندا بوو. ئیمپراتۆر کۆنستانتین لە ساڵی ٣٣٢ دا ڕێگەی دا بە خاوەن زەوییەکان تا کەسێکی کۆلۆنیکراو پێوەند بکەن کە گومانی هەڵاتنی لێدەکرا و لە ساڵی ٣٦٥ ەوە کۆلۆنییەکان نەیاندەتوانی موڵکی خۆیان بەبێ ڕەزامەندی خاوەن زەوییەکانیان بفرۆشن.

هەروەك چۆن دەتوانین پاشماوەی کەشتییەکان و ستوونی سەهۆڵی گرینلاند بەکاربهێنین بۆ زانینی فراوانبوونی ئابووری ڕۆما لە سەردمی کۆن دا، دەشتوانین بەکاریانبهێنین بۆ زانینی لاوازبوونی ئەو ئابوورییە. بە هاتنی ساڵی ٥٠٠ زاین، لوتکەی ژمارەی کەشتییەکان لە ١٨٠ وە هاتەخوار بۆ بیست کەشتی. کاتێك ڕۆما بەرەو لاوازی چوو، بازرگانی لە دەریای ناوەڕاست دا هەرەسیهێناو تەنانەت هەندێك لە زانایان لایانوایە کە بازرگانی نەگەڕایەوە دۆخە بەرزەکەی سەردەمی ڕۆمانەکان تا سەدەی نۆزدەیەم. سەهۆڵەکەی گرینلاند چیرۆکێکی هاوشێوەمان پێدەڵێ. ڕۆمانەکان زیویان لە بری پارە بەکاردەهێنا و قورقوشمیش بە چەندین شێوە بەکارهێنراوە، لەوانە بۆ دروستکردنی بۆری و پێویستیەکانی سەر مێزی نانخواردن. دوای ئەوەی لە سەدەی یەکەمی زاین دا بڕی ئەم کانزایانە گەیشتە لوتکە، دواتر نیشتوەکانی قورقوشم و زیو و مس لە ستوونە سەهۆڵەکان دا کەمیکرد.

ئەزموونی گەشەکردنی ئابووری لە سەردەمی کۆماری ڕۆمادا سەرنجڕاکێش بوو، هەروەك نموونەکانی تری گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا، یەکێتی سۆڤیەت یەکێکە لە نموونەکان. بەلام گەشەکردنەکە سنووردار و نەتوانرا بەردەوامی پێبدرێ، تەنانەت ئەگەر ئەوەش لەبەرچاوبگیرێ کە ئەم گەشەکردنە لە سایەی دەزگایانی نیمچە کراوەدا ڕوویدا. گەشەکردن لەو

سەردەمەدا لە ئەنجامی بەرهەمداریی ڕێژەیی بەرزی کشتوکاڵ و وەرگرتنی سەرانەی قورس لە هەرێمەکان و بازرگانی شوێنە دوورەکان، ڕوویدا، بەڵام لەسەر بنەمای پێشکەوتنی تەکنەلۆجی و تێکدانی بنیاتنەر دانەمەزرابوو. ڕۆمانەکان هەندێك تەکنەلۆجی سەرەتایی وەکو ئامرازی ئاسنی و چەك و خوێندن و کشتوکاڵ بە گاسن و تەکنیکەکانی بیناسازییان بە میرات بۆ مابۆوە. ئەوانیش لە قۆناخە سەرەتاییەکانی کۆمار دا شتی نوێیان دروستکرد: چیمەنتۆی بیناسازی و پەمپ و ناعوور. بەڵام دواتر پێشکەوتنی تەکنەلۆجی لە هەموو ماوەی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما دا وەستا. لە دروستکردنی کەشتی دا، بۆ نموونە، پێشکەوتنی کەم لە بواری دیزاینی کەشتی یان کەرەستەکانی ئاژووشتنی کەشتی دا ڕوویدا و ڕۆمانییەکان هەرگێز سوکانی ئاژووشتنیان دانەهێنا و ئاژوشتنی کەشتی لە ڕێگەی سەوڵەوە ئەنجامدەدرا. ناعوور زۆر بە هێواشی بڵاوبۆوە، بۆیە هێزی ئاو نەیتوانی شۆڕش لە ئابووری ڕۆمادا ئەنجامبدا. تەنانەت دەسکەوتە گرنگەکانی وەك کەناڵی ئاو و ئاوەڕۆی شاران، تەکنەلۆجییە باوەکانی تێدا بەکارهێنرا، هەرچەندە کاتێك ڕۆمانەکان ئەم تەکنەلۆجییانەیان بەکاردەهێنا ژیرانە بەکاریاندەهێنا. دەکرا هەندێك گەشەکردنی ئابووری بەبێ نوێکاری ئەنجامبدرێ بە پشتبەستن بە تەکنەلۆجی بەردەست، بەڵام ئەمە گەشەکردنێك بوو بەبێ تێکدانی بنیاتنەر و زۆری نەخایاند. لە کاتێك دا مافی موڵکداری ناجێگیر تر بوو و مافە ئابوورییەکانی هاوڵاتییانیش شانبەشانی لاوازبوونی مافە سیاسییەکانیان بەرەو لاوازی ڕۆیشتن و بەهەمانشێوەش گەشەکردنی ئابووری لاوازبوو.

شتێکی بەرچاو دەربارەی تەکنەلۆجی نوێ لە سەردەمی ڕۆمادا بریتییە لەوەی کە ڕەنگە دروستکردن و بڵاوکردنەوەیان لە لایەن دەوڵەتەوە ئەنجامدرابێ. ئەمە شتێکی باشە تا ئەو کاتەی حکومەت بڕیاردەدا کە چیتر نایەوێ گرنگی بە پەرەپێدانی تەکنەلۆجی بدا ـ ئەمەش چەندین جار ڕوویداوە لە ترسی تێکدانی بنیاتنەر. نووسەری مەزنی ڕۆمانی، پلینی گەورە، ئەم چیرۆکە دەگێڕێتەوە: لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیمپراتۆر تایبیریۆس، پیاوێك جۆرە شووشەیەکی داهێنا کە نەدەشکا و چوو بۆ لای ئیمپراتۆر و بە تەمابوو خەڵاتێکی گەورە بکرێ. ئەو داهێنانەکەی نمایشکرد و تایبێریۆس گراکۆس لێی پرسی کە ئایا ئەو کەسی دەربارەی داهێنانەکەی ئاگادارکردوە. کاتێك پیاوەکە

بە نەخێر وەڵامیدایەوە، تایبیریۆس فەرمانی دوورخستنەوە و کوشتنی پیاوەکەی دەرکرد، (بۆ ئەوەی بەهای ئاڵتوون کەمنەبێتەوە بۆ بەهای قوڕ). ئەم چیرۆکە دوو شتی سەرنجڕاکێش لەخۆدەگرێ. یەکەم، پیاوەکە یەکەمجار چوە لای تایبێریۆس گراکۆس بۆ وەرگرتنی خەڵات، لە بری ئەوەی بزنسێك بۆخۆی دابمەزرێنێ و لە ڕێگەی فرۆشتنی شووشەوە قازانجی دەستبکەوێ. ئەمەش ڕۆڵی حکومەتی ڕۆما لە کۆنترۆڵکردنی تەکنەلۆجی دا پیشاندەدا. تایبیریۆس ئامادەبوو داهێنانەکە لەناوبەرێ لەبەر کاریگەری خراپی ئابووری کە داهێنانەکە دەیهێنایەئاراوە. ئەمەش ترسی کاریگەریی ئابووری تێکدانی بنیاتنەرە.

بەڵگەی ڕاستەخۆ لەبەردەستدایە دەربارەی ترس لە ئاکامە سیاسییەکانی تێکدانی بنیاتنەر لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتەکەدا. سوتۆنیۆس پێمان دەڵی کە چۆن ئیمپراتۆر ڤێسپاسیان، کە لە ماوەی ساڵانی ٦٩ و ٧٩ زاین دا فەرمانڕەواییکردوە، لە لایەن پیاوێکەوە پەیوەندی پێوەکراوە کە ئامێرێکی داهێنابوو بۆ گواستنەوەی ستوونی بەردی بە نرخێکی کەم بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی لە قەڵای ڕۆما دا. ستوونەکان گەورە و قورس بوون و گواستنەوەیان زۆر زەحمەت بوو. دەبوایە ستوونەکان لە شوێنی دروستکردنیانەوە کە کانەکان بوون بگوێزرایانەوە بۆ ڕۆما و پێویستی بە کاری هەزاران پیاو و لەسەر حکومەتیش زۆر گران دەکەوت. ڤێسپاسیان پیاوەکەی نەکوشت بەڵام ئامادەش نەبوو نوێکارییەکەی بەکاربهێنێ و ڕایگەیاند ( ئایا چۆن دەتوانم خەڵکەکەم تێر بکەم؟). دیسانەوە داهێنەرێك پەنای بۆ حکومەت هێنا. ڕەنگە ئەمە لە شووشە نەشکاوەکە سروشتی تر بووبێ چونکە حکومەتی ڕۆما بە قورسی خەریکی دروستکردنی ستوون و گواستنەوەیان بوو. دیسانەوە نوێکارییەکە ڕەتکرایەوە لەبەر هەڕەشەکردنی تێکدانی بنیاتنەر، نەك لەبەر کاریگەریی ئابووری، بەڵکو لە ترسی تێکدانی بنیاتنەری سیاسی. ڤێسپاسیان خەمی ئەوەی بوو ئەگەر خەڵك شاد نەکات و کۆنترۆڵیان نەکات، ئەوا لە ڕووی سیاسییەوە ناسەقامگیریی دروستدەبێ. دەبوایە هاوڵاتییانی ڕۆما سەرقاڵ و گوێڕایەڵ بکرانایە، بۆیە باشتر بوو کار هەبوایە و کاریان پێبکرایە، کاری وەك گواستنەوەی ستوونەکان. ئەمە تەواوکاری نان و سێرکس بوو کە بە خۆڕایی دابینکرابوو تا خەڵك ڕازیبن. شایانی باسە کە ئەم دوو نموونەیە ماوەیەکی کەم

دوای ڕووخانی کۆمارەکە سەریانهەڵداوە. ئیمپراتۆرەکانی ڕۆما دەسەڵاتی گەلێك زیاتریان هەبوو لەچاو فەرمانڕەوایانی سەردەمی کۆمار دا بۆ بەربەستکردنی گۆڕانکاری.

هۆکارێکی گرنگی تر بۆ نەبوونی نوێکاری تەکنەلۆجی بریتیبوو لە بەربڵاوی کۆیلەیەتی. بە فراوانبوونی ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەڵاتی ڕۆما دا بوون، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك کرانە کۆیلە و زۆرجاریش دەهێنرانەوە بۆ ئیتالیا تا لەسەر موڵکە گەورەکان کاربکەن. ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ڕۆما پێویستیان بەوە نەبوو کاربکەن و لەسەر ئەو کۆمەکانە دەژیان حکومەت دەیدانێ. ئایا دەبێ نوێکاری لە کویوە بهاتایە؟ باسی ئەوەمانکرد کە نوێکاری لە لایەن کەسانی نوێی خاوەن ئایدیای نوێوە ئەنجامدەدرێ و چارەسەری نوێ بۆ کێشە کۆنەکان دەدۆزنەوە. لە ڕۆما ئەو خەڵکەی خەریکی بەرهەمهێنان بوون کۆیلەکان بوون و دواتریش کەسانی نیمچە بەندەی کۆڵۆنی بوون کە هاندانێکی ئەوتۆیان نەبوو تا نوێکاری بکەن، چونکە خودانەکانیان نەك ئەوان سوودیان لە بەرهەمی نوێکارییەکان وەردەگرت. هەروەك چەندین جار لەم کتێبەدا دەبینین، ئەو ئابوورییانەی لەسەر بنەمای چەوساندنەوەی هێزی کار و سیستەمی هاوشێوەی کۆیلەیەتی و بەندایەتی دامەزراون نوێکار نین. ئەمەش بۆ جیهانی کۆن و سەردەمی نویش ڕاستە. بۆ نموونە، لە ویلایەتە یەککگرتوەکان دا ویلایەتەکانی باکوور نەك باشوور بەشدارییان لە شۆڕشی پیشەسازی دا کرد. بێگومان کۆیلەیەتی و بەندایەتی سامانێکی زۆری بۆ ئەوانە پێکەوە نا کە خاوەنی کۆیلەکان بوون و کۆنترۆڵی بەندەکانیان دەکرد، بەڵام نەیانتوانی نوێکاری تەکنەلۆجی یان خۆشگوزەرانی بۆ کۆمەڵگا بهێننەئاراوە.

## هیچ کەسێك لە ڤیندۆلانداوە نامە نانێرێ

بە هاتنی ساڵی ٤٣ زاین، کلاودیۆس، ئیمپراتۆری ڕۆما ئینگلتەرەی داگیرکردبوو، بەڵام نەگەیشتبوە سکۆتلەند. دوا هەوڵی بێسوود لە لایەن ئەگریکۆلا، فەرمانڕەوای ڕۆما لە ئینگلتەرە دا درا و دواتر وازیهێنا و لە ساڵی ٨٥ زاین دا زنجیرەیەك بنکەی سەربازی دروستکرد بۆ پاراستنی سنوورەکانی

باکووری ئینگلتەرە. یەکێك لە گەورەترینی ئەم بنکانە لە ڤیندۆلاندا بوو کە سی و پێنج میل لە ڕۆژئاوای نیوکاسڵەوە دوورە و لە سەر نەخشەی (١١) پیشاندراوە و ئەو کاتە دەکەوتە باکووری ڕۆژئاوای ئیمپراتۆریەتەکەوە. دواتر، ڤیندۆلاندا خرایە ناو شورایەکی بەرگری هەشتاو پێنج میلیەوە کە لە لایەن ئیمپراتۆر هادریان دروستکرا، بەڵام لە ساڵی ١٠٣ زاین دا کاتێك فەرماندەی ڕۆمانی کاندیدۆس لەوێدا سوپاکەی دامەزراندبوو، ئەمە بنکەیەکی دابڕاو بوو. کاندیدۆس پەیوەندیکرد بە ئۆکتاڤیۆسی هاوڕێی بۆ دابینکردنی ئازوقە بۆ حامیەکەی ڕۆما و ئۆکتاڤیۆس وەڵامی نووسراوێکی کاندیدۆسی بەم جۆرە داوەتەوە:

## لە ئۆکتۆڤیۆسەوە بۆ کاندیدۆسی برای، سڵاو

*چەند جارێك بۆم نوسیوویی کە نزیکەی پێنج هەزار مۆدی گوڵە دانەوێڵەم کڕیوە، بۆیە پێویستم بە پارەی کاش هەیە. ئەگەر هەندێك پارەی کاشم بۆ نەنێری، بە لایەنیکەمەوە، پێنج سەد دیناری، ئەوا ئەنجامەکەی بریتیدەبێ لە لەکیسچوونی ئەوەی وەك پێشەکی دامناوە، کە نزیکەی سێسەد دیناری یەو دەکەومە دۆخێکی نەشیاوەوە. بۆیە داوات لێدەکەم کە بە زووترین کات هەندێك کاشم بۆبنێری. ئەو پێستانەی دەربارەیان نووسیوتە وان لە کاتاراکتۆنیۆم ــ بۆیان بنووسە کە ئەوانە و ئەو عەرەبانەیەی دەربارەی نووسیوتە بدرێنە من. بۆخۆم دەچووم بۆ وەرگرتنیان، بەڵام نەمویست ئازاری ئاژەڵەکان بدەم چونکە ڕێگاکان زۆر خراپن. لەگەڵ تێرتیۆس بەدواداچوون بکە بۆ ئەو ٨,٥ دیناری یە لە فەتالیسەوە پێیگەیشتوە. ئەو هێشتا نەیخستونەتە سەر حسابەکەم. هەوڵبدە پارەی کاشم بۆ بنێری تا بتوانم گوڵە دانەوێڵەکان لەسەر خەرمان بکڕم. سڵاو لە سپێکتاتەس و فێرمەس. بەخێربچیت.*

نوسراوەکانی نێوان کاندیدۆس و ئۆکتاڤیۆس هەندێك لایەنی گرنگی خۆشگوزەرانی ئابووری ئینگلتەرەی ڕۆما پیشاندەدەن: ئابوورییەکی دراویی پێشکەوتوو دەخاتەڕوو کە خاوەنی خزمەتگوزاری دارایی بوە. ئەوە پیشاندەدەن کە ڕێگای دروستکراو هەبوە هەرچەندە هەندێجار لە باری خراپدا

بوون. ئەو نووسراوانە بوونی سیستەمی نەختینە پیشاندەدەن کە باجی کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی مووچەی کاندیدۆسی پێبدرێ. لەهەمووشی گرنگتر، ئەو نووسراوانە ئەوە پیشاندەدەن کەهەردوو پیاوەکە خوێندەوار بوون و جۆرە خزمەتگوزارییەکی پۆست هەبوە. ئینگلتەرەی ڕۆما سوودمەند بوە لە دروستکردنی کەلوپەلی قوڕینەی کوالیتی بەرز بەتایبەتی لەناوچەی ئۆکسفۆردشێر و خاوەن شاری خاوەن گەرماو و تەلاری گشتی و تەکنیکەکانی دروستکردنی خانوو بە بەکارهێنانی مۆرتار و خشت بۆ دروستکردنی بانی بیناکان بوە.

به هاتنی سەدەی چوارەم، ئەمانە هەموویان بەرەو لاوازبوون چوون و دوای سالّی ٤١١ زاین ئیمپراتۆریەتی ڕۆما وازی لە ئینگلتەرە هێنا. سوپاکان پاشەکشەیان پێکران و ئەوانەی بەجێمان موچەکانیان بڕان. لەگەلّ هەرەسهێنانی دەولّەتی ڕۆما، بەرپرسە کارگێڕییەکان لە لایەن دانیشتوانەوە دەرکران. بە هاتنی سالّی ٤٥٠ زاین، هەموو هێماکانی خۆشگوزەرانی ئابووری نەمان. جولّەی پارە وەستا و ناوچە شارییەکان چۆلّکران و تەلارەکان بەردەکانیان لێکرایەوە. ڕێگاکان بە گیا داپۆشران. تەنیا جۆرێك کەلوپەلی قوڕینە کە دروستدەکرا سادە و دەستکردبوون، نەك لە کارگەدا دروستبکرێن. خەلّك بەکارهێنانی مۆرتەریان لەبیرچۆوە و خوێندەواری بە شێوەیەکی بەرچاو کەمیکرد. بانەکان لە لقی درەخت دروستکران نەك خشت. چیتر کەس لە ڤیندۆلانداوە نامەی نەنارد.

دوای سالّی ٤١١ زاین، ئینگلتەرە تووشی داڕمانی ئابووری هات و بوە وولاتێکی دابڕاوی هەژار- ئەمەش یەکەمجار نەبوو. لە چاپتەری پێشووتردا بینیمان کە چۆن شۆڕشی کشتوکالّی لە دەوری سالّی ٩٥٠٠ پێش زاین دا لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا دەستپێکرد. لە کاتێك دا دانیشتوانی ئەریحا و ئەبو هورەیرە لە شارانی بچووك دا دەژیان و کشتوکالّیان دەکرد، دانیشتوانی ئینگلتەرە هێشتا خەریکی ڕاوکردن بوون و خۆراکیان کۆدەکردەوە و بەلایەنیکەمەوە تا ٥,٥٠٠ سالّی تریش بەم شێوەیە بەردەوامبوون. تەنانەت ئەو کاتەش ئینگلیزەکان کشتوکالّ و بەخێوکردنی ئاژەلّیان دانەهێنا: کشتوکالّ و بەخێوکردنی ئاژەلّ لە لایەن ئەو کۆچبەرانەوە هێنران کە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە هاتبوون و لە سەرتاسەری ئەورووپادا هەزاران سالّ بوو

بڵاوبووبوونــەوە. کاتێـك دانیـشتوانی ئینگلتــەرە بــەم نوێکارییــە ســەرەکیانە گەیـشتنەوە، دانیـشتوانی ڕۆژهــەڵاتی ناوەڕاســت شــار و نووســین و کەلوپــەلی قوڕینیان داهێنابوو. بە هاتنی ساڵی ٣,٥٠٠ پێش زاین، شارانی وەك ئورك و ئور لە مێزۆپۆتامیا کە عێراقی ئەمڕۆیە، دروستکران، ڕەنگە ئـورك لـە سـاڵی ٣,٥٠٠ پـێش زایـن دا، دانیـشتوانێکی چـواردە هــەزار کەســی هــەبووبێ و ماوەیـەکی کەمیش دوای ئەوە ژمارەکە گەیشتبێتە چل هەزار کەس. ڕەوڕەوەی قـوڕین لـە مێزۆپۆتامیا داهێنرا لە هەمانکاتی داهێنانی هاتووچۆی ڕەوڕەوەدار. ماوەیـەکی کەم دوای ئەوە مێمفیس، پایتـەختی میسر، وەك شـارێکی گـەورە سـەریهەڵدا. نووسین بەجیا لە هـەردوو ناوچـەکەدا پەیـدابوو. لـە کاتێـك دا میـسرییەکان لـە دەوری ساڵی ٢٥٠٠ پێش زاین دا، ئەهرامە مەزنەکانیان لە جیـزە دروسـتدەکرد، ئینگلیزەکان هەرە بەناوبانگترین مۆنیومێنتی خۆیان کە بازنەی بەردین بـوو لـە ستۆنهێنج دروستکرد. ئەمەش بە پێی ستانداردی ئینگلیز شـتێکی کـەم نـەبوو، بـەڵام هێنـدە گـەورە نـەبوو کـە تەنانـەت جێگـای یـەکێك لـەو بەلەمانـەی تێـدا ببێتەوە کە لە کاتی بۆنەکان دا بەکاردەهێنرا و لە دامێنـی هەرەمەکـەی خۆفـۆ پاشـا لـە ژێـر گڵەوەیـە. ئینگلتـەرە بـەردەوامبوو لـە دواکـەوتن و فێربـوون لـە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوچەکانی تری ئەورووپاوە، هەتا سەردەمی ڕۆمانەکان و تەنانەت لەو سەردەمەش دا.

ســەرەڕای ئــەم مێـژووە پـڕ نەهامەتیـە، لـە ئینگلتــەرەدا بـوو کـە یەکـەم کۆمەڵگای کراوەی ڕاستەقینە سـەریهەڵدا و تیایـدا شۆڕشـی پیـشەسازی بـەرپا بوو. پێشتر باسمانکرد کە ئەمە لە ئـەنجامی زنجیرەیـەك کـارلێکردن لـە نێـوان جیاوازییە بچووکە دەزگاییەکان و وەرچەرخانە مێژووییەکان دا هاتەئاراوە ـ بـۆ نموونە، مردنی ڕەش و دۆزینەوەی ئەمەریکاکان. جیابوونـەوەی ئینگلتــەرە لـە وڵاتانی تر، ڕەگی قووڵی هەبوو، بەڵام هەروەك دیمەنی ڤیندۆلاندا پێشنیازدەکا ئــەم ڕەگانــە هێنــدە قــووڵ نــەبوون و بــە دڵنیاییــەوە لــە ڕووی مێژووییــەوە پێشوەخت دیارینەکرابوون. ئەم ڕەگانە لە شۆڕشی کشتوکاڵی دا و تەنانەت لـە سـەدەکانی فـەرمانڕەوایی ڕۆمانـەکان دا دانـەکوترابوون. بـە هـاتنی سـاڵی ٤٥٠ زایـن، لـە سـەرەتای ئـەوەی مێژووناسـان بـە چـاخە تاریکـەکان نـاوی دەبـەن، ئینگلتــەرە گەڕایــەوە نــاو هــەژاری و ئــاژاوەی سیاســی. دەوڵــەتێکی خــاوەن مەرکەزیەتی کاریگەر لە ئینگلتەرەدا بۆ سەدان ساڵ بوونی نەبوو.

# ڕێچکە لێکجیابووەکان

سەرهەڵدانی دەزگایانی کراوە و گەشەکردنی پیشەسازی دواتر لە ئینگلتەرەدا، پاشماوەی ڕاستەوخۆی دەزگایانی سەردەمی ڕۆما یان سەردەمانی پێشووتر نەبوون. ئەمە مانای ئەوەنییە کە هیچ شتێکی گرنگ بە ڕمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕۆژئاوا ڕوویندا، کە ڕووداوێکی گرنگ و کاریگەری لەسەر زۆربەی ئەورووپا هەبوو. لەبەرئەوەی ناوچە جیاوازەکانی ئەورووپا هاوبەش بوون لە هەمان وەرچەرخانە مێژووییەکان دا، دەزگاکانیان بەهەمانشێوە لێکترازان و ڕەنگە ئەم لێکترازانە شێوەیەکی تایبەتی ئەورووپی وەرگرتبێ. کەوتنی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما لایەنی هەرە گرنگی ئەم وەرچەرخانە مێژووییە هاوبەشانە بوو. ئەم ڕێچکە ئەورووپییە جیاواز بوو لە ڕێچکەکانی بەشەکانی تری جیهان، لەوانە وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا و ئاسیا و هەردوو ئەمەریکا کە بەشێوەی جیاواز پەرەیانسەند و بەشێك لە هۆکارەکانیش ئەوە بوون کە ڕووبەڕووی هەمان وەرچەرخانی مێژوویی نەبوونەوە.

ئینگلتەرەی ڕۆما بە تەقینەوە هەرەسیهێنا. ڕووخانی ئیمپراترۆیەتەکە کاریگەری کەمتری هەبوو لەسەر ئیتالیا یان گۆڵ (فەڕەنسای ئێستا) و تەنانەت باکووری ئەفریقا، کە چەندین دەزگایانی کۆن، کەم یان زۆر، بەردەوامییان پێدرا. لەگەڵ ئەمەش دا، گومانی تێدا نییە کە گۆڕانکاری لە باڵادەستی، یەکدەوڵەتی ڕۆماوە بۆ سەرهەڵدانی چەندین دەوڵەت کە لە لایەن فرانکەکان و ڤیزیگۆسەکان و ئۆستڕۆگۆسەکان و ڤاندالەکان بێرگوندیەکان فەرمانڕەواییان دەکرا، گرنگ بوو. دەسەڵاتی ئەم دەوڵەتانە زۆر لاوازتر و پەلامارەکانی ناوچەکانی دەوروبەریان تەنگی پێهەڵچنیبوون. لە باکوورەوە ڤایکینگەکان و دانەکان بە بەلەمە درێژەکانیانەوە و لە ڕۆژهەڵاتەوە هەنە ئەسپدارەکان کەوتنە پەلاماردان. لە کۆتاییشدا، پەیدابوونی ئیسلام وەك هێزێکی ئاینی و سیاسی لە دوای مردنی موحەمەد لە ساڵی ٦٣٢ زاین دا، بوە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتانی نوێی ئیسلامی لە زۆربەی ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی و باکووری ئەفریقا و ئیسپانیادا. ئەم پرۆسە هاوبەشانە ئەورووپای هەژاند و بەهۆشیانەوە جۆرێکی تایبەت لە کۆمەڵگا، کە بە کۆمەڵگای فیوداڵی ناودەبرێ، سەریهەڵدا. کۆمەڵگای فیوداڵی خاوەن مەرکەزیەت نەبوو، چونکە دامەزراندنی دەوڵەتی مەرکەزی بەهێز زەحمەت بوو، هەرچەندە هەندێك فەرمانڕەوای وەك شارلیمان هەوڵی

دامەزراندنەوەی ئەم جۆرە دەوڵەتەیان دا.

دەزگایانی فیودالّی، کە پشتیان بە هێزی کاری ژێردەستەیی و بێگاریی دەبەست (بەندەکان) بە ڕوونی چەوسێنەر بوون و بناخەی چەوساندنەوەی دووروودرێژ و گەشەکردنی هێواشیان لە ئەورووپادا لە چاخەکانی ناوەڕاست دا دامەزراند. ئەو دەزگایانە کاریگەرییان لەسەر پەرەپێدانی دواتریش هەبوو. بۆ نموونە، لە کاتی کەمکردنەوەی پێگەی هەموو دانیشتوانی لادێکان بۆ پایەی بەندایەتی، کۆیلەیەتی لە ئەورووپادا نەما. لە کاتێك دا دەکرا نوخبەکان هەموو دانیشتوانی لادێکان بکەنە بەندەی خۆیان، چیتر پێویستی نەدەکرد چینێکی جیاوازی کۆیلەیان هەبێ هەروەك چۆن لە هەموو کۆمەڵگاکانی پێشووتر دا هەیانبوو. فیودالّیزم بۆشایی دەسەلاتیشی دروستکرد کەتیای دا ئەو شارانەی سەربەخۆ بوون و لە بواری بەرهەمهێنان و بازرگانی دا شارەزا بوون، توانیان گەشەبکەن. بەلام کاتێك تەرازووی هێز لە دوای مردنی ڕەش، گۆڕانکاری بەسەرداهات و بەندایەتی لە ئەورووپای ڕۆژئاوا دا بەرەو هەڵوەشاندنەوە چوو، زەمینەی هاتنە ئارای کۆمەڵگایەکی پلورەلیست تری بێ کۆیلە خۆشبوو.

ئەو وەرچەرخانە مێژووییانەی بوونەهۆی سەرهەڵدانی فیودالّیزم جیاواز بوون، بەلام بە تەواوی تایبەت نەبوون بە ئەورووپا. بەراوردێکی گونجاو، بەراوردکردنی ئەورووپایە لەگەڵ وولاتێکی مۆدیرنی ئەفریقی وەك ئەسیوپیا کە لە شانشینی ئاکسۆمەوە پەرەیسەند کە لە باکووری وولاتەکەدا لە دەوری سالّی ٤٠٠ پێش زاین دا دامەزرابوو. ئاکسۆم شانشینێکی تا ڕادەیەك پەرەسەندوو بوو بۆ کاتی خۆی و خەریکی بازرگانی نێودەوڵەتی بوو لەگەڵ هیندستان و عەرەبستان و یونان و ئیمپراتۆریەتی ڕۆما. شانشینەکە لە زۆر ڕووەوە لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕۆژهەلاتی ئەو کاتە دەچوو. خاوەنی پارە بوو، تەلاری گشتی و ڕێگای دروستکرد و خاوەنی تەکنەلۆجی زۆر هاوشێوەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕۆژهەلات بوو، بۆ نموونە، لە کشتوکاڵ و دروستکردنی کەشتی دا. لە هەمانکات دا، لێکچوونی ئایدۆلۆجی سەرنجڕاکێش لە نێوان ئاکسۆم و ڕۆما دا هەبوو. لە سالّی ٣١٢ زاین دا، ئیمپراتۆری ڕۆما، کۆنستانتین، بوە مەسیحی هەروەك پاشای ئاکسۆم، ئیزانا، لە دەوری هەمانکات دا، وەرگەڕایە سەر ئاینی مەسیحی. نەخشەی (١٢) شوێنی دەوڵەتی مێژوویی ئاکسۆم لە ئەسیوپیا و ئەریتیریای ئەمڕۆدا پیشاندەدا کە کۆلۆنی لە کەناری ئەوبەری دەریای سوور لە سعودیەی عەرەبی و یەمەن دا هەبوو.

## نەخشەی (١٢): ئیمپراتۆریەتی ئاکسۆم و بنەماڵە تیرەییەکانی سۆماڵ



له کاتێك دا ڕۆما بەرەو لاوازی ڕۆیشت، بەهەمانشێوەش ئاکسۆم لاواز بوو، لاوازیەکەشی شێوازێکی نزیك شێوەی لاوازی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕۆژئاوای لەخۆگرت. ئەو ڕۆڵەی هەن و ڤاندالەکان گێڕایان بۆ لاوازی ڕۆما، عەرەبەکان هەمان ڕۆڵیان بۆ لاوازی ئاکسۆم گێڕا و لە سەدەی حەوتەم دا دەسەلاتی خۆیان بەرەو دەریای سوور و بەشی باشووری دوورگەی عەرەبی فراوانکرد. ئاکسۆم، کۆلۆنییەکانی لە عەرەبستان و ڕێگا بازرگانییەکانی لەدەستچوو. ئەمەش بوە هۆی لاوازی ئابووری: دروستکردنی پارە وەستا و دانیشتوانی شارنشین کەمیکرد و دەولەت تا دەهات بەرەو ناوەوەی وولات دەکشایەوە تا گەیشتە بەرزاییەکانی ئەسیوپیای ئەمڕۆ.

لە ئەورووپا، دەزگایانی فیودالی دوای هەرەسهێنانی دەسەلاتی دەولەتی مەرکەزی سەریانهەلدا. هەمان شتیش لە ئەسیوپیا ڕوویدا. ئەوەی ئەسیوپیا لەسەر بنەمای سیستەمێك دامەزرابوو پێیان دەوت گولت، کە بریتیبوو لە بەخشینی زەوی لە لایەن ئیمپراتۆرەوە. ئەم دەزگایە لە دەسخەتەکانی سەدەی سیازدەیەم دا ناوی هاتوە و ڕەنگە زۆر زووتر سەریهەلدابێ. زاراوەی گولت لە ووشەیەکی ئەمهاریك وەرگیراوە و واتا "مافی پێدانی زەوی ". بەرامبەر پێدانی زەوییەکە دەبوایە خاوەنی گولتەکە خزمەتگوزاری پێشکەشبکردایە بە ئیمپراتۆر بەتایبەتی خزمەتی سەربازی و لەبری ئەمەش خاوەن گولت دەیتوانی سەرانە لەو کەسانە وەربگرێ کە زەوییەکانیان دەکردە کشتوکال. سەرچاوەی جیاوازی مێژوویی ئاماژە بەوە دەکەن کە خاوەن گولت نیوە تا سێ لەسەر چواری بەرهەمە کشتوکالیەکانی ڕەنجدەرانی بۆ خۆی بردوە. ئەم سیستەمە سەربەخۆ دامەزرا و لێکچوونی بەرچاوی لەگەل فیودالیزمی ئەورووپیدا هەبوو، ڕەنگە تەنانەت لە فیودالیزمی ئەورووپیش چەوسێنەر تر بووبێ. لە لوتکەی فیودالیزمی ئینگلتەرەدا بەندەکانی زەوی تووشی چەوسانەوەی کەمتر دەبوون و نزیکەی نیوەی بەرهەمەکانیان لە لایەن لۆردەکانیانەوە لێوەردەگیرا.

هەموو ناوچەکانی تری ئەفریقا وەك ئەسیوپیا نەبوون و بەندایەتی تیایان دا جێگەی کۆیلەتی نەگرتەوە. کۆیلەیەتی لە ئەفریقا دا و ئەو دەزگایانەی پشتگیریی کۆیلەیەتیان دەکرد بۆ چەندین سەدەی تر بەردەوامبوون. تەنانەت ئەو ڕێچکەیەی دواجار ئەسیوپیا گرتیەبەر زۆر جیاواز بوو. لە دوای سەدەی

حەوتەمەوە ئەسیوپیا لە چیاکانی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقادا قەتیسی خوارد و لەو پرۆسانە دابڕا کە لە ئاکام دا کاریکردە سەر ڕێچکەی دەزگایی ئەوروپا، پرۆسەکانی وەکو سەرهەڵدانی شارە سەربەخۆکان و سنووردارکردنی دەسەڵاتی پاشاکان و فراوانبوونی بازرگانی ئەتڵەسی دوای دۆزینەوەی هەردوو ئەمەریکا. لە ئەنجامدا، شێوازی دەزگا ڕەهاکانی ئەسیوپیا بێ بەرەنگاربوونەوە بەردەوامبوون. دواتر کیشوەری ئەفریقا بە فۆرمێکی زۆر جیاواز لەگەڵ ئەوروپا و ئاسیا دا مامەڵەیان لەگەڵ یەکترکرد. ئەفریقای ڕۆژهەڵات بوە دابینکاری سەرەکی کۆیلان بۆ جیهانی عەرەب و ڕۆژئاوا و ناوەندی ئەفریقا. لە کاتی فراوانبوونی دەسەڵاتی ئەوروپییەکان دا بەهۆی بازرگانی ئەتڵەسییەوە، ئەفریقا وەك دابینکاری کۆیلان تێکەڵاوی ئابووری جیهان بوو. چۆن بازرگانی ئەتڵەسی بوەهۆی لێکدوورکەوتنەی گەورەی ڕێچکەکان لە نێوان ئەوروپای ڕۆژئاوا و ئەفریقا دا، نموونەیەکی تری لێکدوورکەوتنەوەی دەزگاییە کە لە ئەنجامی کارلەیەك کردنی نێوان وەرچەرخانە مێژووییەکان و جیاوازییە هەنووکەییە دەزگاییەکان دا سەرهەڵدەدا. لە کاتێك دا لە ئینگلتەرە دا قازانجی بازرگانی کۆیلان یارمەتیدەر بوو بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەوانەی بەرهەڵستی دەسەڵاتی ڕەها بوون، لە ئەفریقا دا ئەم بازرگانییە یارمەتی دروستکردن و بەهێزکردنی دەسەڵاتی ڕەهای دا.

دوورترلە ئەوروپا، پرۆسەی لێکترازانی دەزگایی سەربەست تر بوو لە گرتنەبەری ڕێگای خۆی دا. لە ئەمەریکاکان دا، بۆ نموونە، کە بە هۆی توانەوەی ئەو سەهۆڵەی ئەلاسکا و ڕوسیای پێکەوە دەبەستەوە، لە ساڵی ١٥,٠٠٠ پێش زاین دا لە ئەوروپا دابڕابوو، نوێکاری هاوشێوەی نوێکارییەکانی ناتوفیەکان ئەنجامدران کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی ژیانی نیشتەجێبوون و پلەبەندی و نایەکسانی ـ بە کورتی دەزگایانی چەوسێنەر. ئەمانەش یەکەمجار لە مەکسیك و پیرۆی ئەندی و بۆلیڤیا سەریانهەڵدا و بوونە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕشی کشتوکاڵی کە بە ماڵیکردنی گەنمە شامی دەستپێکرد. ئا لەم شوێنانەدا بوو کە شێوازە سەرەتاییەکانی گەشەکردنی چەوسێنەرانە هاتنەئاراوە، هەروەك لە دەوڵەتی ـ شاری مایا دا بینیمان. بەڵام بەهەمان ئەو شێوەیەی کە سەرکەوتنی گەورە بەرەو دەزگایانی کراوە و گەشەکردنی ئابووری لە ئەوروپا دا، لەوشوێنانەوە سەرچاوەیان نەگرت کە مەڵبەندی

بەهێزی ڕۆمانەکان بوون، دەزگایانی کراوە لە ئەمەریکاکانیش دا لە خاکی ئەم شارستانییە کۆنانەوە پەیدانەبوو. لە ڕاستیدا، هەروەك لە چاپتەری یەکەم دا بینیمان ئەم شارستانییە نیشتەجێبوانە بەشێوەیەکی خراپ کارلێکردنی لەگەڵ کۆلۆنیالیزمی ئەورووپی دا ئەنجامدا و "پێچەوانەبوونەوەی بەختەوەری" دروستکرد و بوە هۆی ئەوەی ئەو ناوچانەی بە شێوەیەکی ڕێژەیی لەو سەردەمانە دا لە هەردوو ئەمەریکا دا دەوڵەمەندبوون، لەم سەردەمە دا لەچاو وولاتانی تردا هەژار بن. ئەمڕۆ ویلایەتە یەکگرتوەکان و کەنەدا، کە ئەو کاتە زۆر لە دوای شارستانییە ئاڵۆزەکانی مەکسیك و پیرۆ و بۆلیڤیاوە بوون، زۆر دەوڵەمەند ترن لە وولاتانی تری هەردوو ئەمەریکا.

## ئاکامەکانی گەشەکردنی پێشووتر

ماوەی درێژی نێوان شۆڕشی کشتوکاڵی، کە لە ساڵی ٩٥٠٠ پێش زاین دا دەستیپێکرد و شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیا دا لە درەنگانێکی سەدەی هەژدەیەم دا، پڕە لە نموونەی فیچقەی گەشەکردنی ئابووری. ئەم فیچقانە لەڕێگای نوێکاری دەزگاییەوە سەریانهەڵداو لەکۆتاییشدا پوکانەوە. لە ڕۆمای کۆن دا، دەزگاکانی کۆمارەکە، کە ئەندازەیەك لە بوژانەوەی ئابوورییان دروستکرد و بواری دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەیان ڕەخساند، دوای کۆدیتاکەی جولیەس سیزەر و پێکەوەنانی ئیمپراتۆریەت لە سەردەمی ئۆگەستۆس دا، بەرەو لاوازی ڕۆیشت. چەندین سەدەی خایاند تا ئیمپراتۆریەتی ڕۆما بەتەواوی لەناوچوو، لاوازیەکە ماوەیەکی زۆری خایاند بەلام کاتێك دەزگا کۆمارییە تاڕادەیەك کراوەکان لە لایەن دەزگایانی زیاتر چەوسێنەرەوە جێگەیان گیرایەوە، دواکەوتنی ئابووری بوە شتێکی مسۆگەر.

داینەمیکی گەشەکردن و پوکانەوەی ڤێنس هاوشێوەی ئەوەی ڕۆما بوو. خۆشگوزەرانی ئابووری ڤێنس لەلایەن ئەو دەزگایانەوە داڕێژران کە توخمی گرنگی کرانەوەیان لەخۆگرتبوو، بەلام ئەم دەزگایانە بنکۆڵکران کاتێك نوخبەی بالادەست سیستەمەکەیان لە ڕووی بەشدارانی نوێ دا داخست و تەنانەت ئەو دەزگا ئابوورییانەیان قەدەخەکرد کە خۆشگوزەرانی کۆمارەکەیان

دروستکردبوو.

لەگەڵ سەرنجڕاکێشی ئەزموونی ڕۆما دا، میراتی ڕۆما نەبوو کە ڕاستەوخۆ بوە هۆی سەرهەڵدانی دەزگایانی کراوە لە ئینگلتەرە و شۆڕشی پیشەسازی بەریتانی. فاکتەرەمێژووییەکان یارمەتی پەرەسەندنی دەزگاکان دەدەن، بەڵام ئەمە پرۆسەیەکی ساکار و پێشتر بڕیار لەسەر دراو و لەسەریەك کەڵەکە بوو نییە. ڕۆما و ڤێنس ئەوە ڕووندەکەنەوە کەچۆن هەنگاوە سەرەتاییەکان بەرەو کرانەوە پێچەوانەکرانەوە. ئەو لاندسکەیپە ئابووری ودەزگاییەی کە ڕۆما لە سەرانسەری ئەورووپا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا دایمەزراند نەبوە هۆی سەهەڵدانی دەزگایانی کراوەی ڕیشە قایمتر لەسەدەکانی دواتر دا. لە ڕاستیدا ئەم دەزگایانە یەکەمجار و بەهێزی زیاترەوە لەئینگلتەرە دا دەرکەوتن، ئەو شوێنەی کەدەسەلاتی ڕۆما تیای دا لاوازترین بوو، بەتەواویش ئەو دەسەلاتە لە سەدەی پێنجەمی زاین دا و بەبێ جێهێشتنی هیچ کاریگەرییەك لەناوچوو. لەبری ئەمە، هەروەك لە چاپتەری پێنجەم دا باسمانکرد، مێژوو ڕۆڵی گەورە دەگێڕێ لە ڕێگەی لێکترازانی دەزگایی کە جیاوازیی دەزگایی دروستدەکەن، هەڵبەت هەندێجار ئەو جیاوازییانە بچووکن، بەڵام دواتر کاتێك لەگەڵ وەرچەرخانە مێژووییەکان دا کار لەیەکتردەکەن، گەورەتر دەبن. لەبەر ئەوەی ئەم جیاوازییانە زۆرجار بچووکن دەشێن بە ئاسانی پێچەوانەبکرێنەوە و مەرج نییە ئاکامی پرۆسەیەکی سادەی لەسەریەك کەڵەکەبوون بن.

بێگومان، ڕۆما کاریگەری درێژخایەنی لەسەر ئەورووپا هەبوو. یاسا و دەزگاکانی ڕۆما کاریگەرییان لەسەر ئەو یاسا و دەزگایانە هەبوو کە شانشینەکانی بەربەرەکان لە دوای لەناوچوونی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕۆژئاوا دایانمەزراندن. هەر لەناوچوونی ڕۆما بوو کە ڕێگەی بۆ سیستەمی لا مەرکەزی سیاسی خۆشکرد و دواتر پەرەیسەند بۆ سیستەمی فیودالی. هەڵوەشاندنەوەی کۆیلەیەتی و سەرهەڵدانی شارە سەربەخۆکان بەرهەمی (بێگومان لە ڕووی مێژووییەوە پەیوەست (contingent)، درێژخایەنی ئەم پرۆسەیە بوو. ئەمانەش بەتایبەتی ئاکامی کاریگەریان هەبوو کاتێك مردنی ڕەش بە توندی بناخەی کۆمەڵگای فیودالی هەژاند. لە ناو خۆڵەمیشی مردنی ڕەش دا شاروشارۆچکەی بەهێز تر سەریانهەڵدا و چیتر ڕەنجدەران گیرۆدەی زەوی و ملکەچی فەرمانە فیودالّیەکان نەبوون. هەر ئەم وەرچەخانە مێژووییانە بوون

که له ئەنجامی ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆماوە سەریانهەڵدا کە بوونە هۆی لێکترازانی دەزگایی بەهێز و کاریان لەسەر هەمووئەوروپا کرد بەشێوەیەك لەووڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا وئاسیا و هەردوو ئەمەریکا دا وێنەی نەبوو.

به هاتنی سەدەی شازدەیەم، ئەوروپا لە ڕووی دەزگاییەوە زۆر جیاواز بوو لە باشووری بیابانی ئەفریقا و هەردوو ئەمەریکا. هەرچەندە ئەوروپا زۆر دەوڵەمەند تر نەبوو لە زۆربەی شارستانییە دیارەکانی هیندستان و چین، بەڵام لە هەندێك ڕێگای گرنگەوە لەم قەوارە سیاسییانەجیاواز بوو. بۆ نموونە، ئەوروپا جۆرێك لە دەزگایانی خاوەن نوێنەرایەتی پەرەپێدا کە لەو شوێنانەی تر دا نەبوون. ئەم دەزگایانە ڕۆڵی گرنگیان لە دامەزراندنی دەزگایانی کراوە دا بینی. هەروەك لە دوو چاپتەری داهاتوودا دەبینین، جیاوازییە بچووکە دەزگاییەکان ئەو جیاوازییانە بوون کە بۆ ئەوروپا گرنگ بوون و ئەمانەش زیاتر لەبەرژەوەندی ئینگلتەرە بوون، چونکە ئەوە لە ئینگلتەرەدا بوو کە سیستەمی فیودالی بە شێوەیەکی زۆر فراوان ڕێگەی چۆڵکرد بۆ جووتیارانی خاوەن بیرۆکەی بازرگانی و سەنتەرە پێشکەوتوە سەربەخۆکان کە تیایان دا بازرگانان و خاوەن پیشەسازییان بتوانن برەوبسێنن. ئەم گروپانە کەوتبوونە داواکردنی مافی موڵکداری جێگیرتر و دەزگایانی ئابووری جیاواز و دەنگی سیاسی لە پاشاکانیان. هەموو پرۆسەکەش لە سەدەی حەڤدەیەم دا خۆی دەرخست.

# ٧

# خاڵی وەرچەرخان

## کێشەی گۆرموییەکان

لە ساڵی ١٥٨٣ دا ولیام لی، لە خوێندن لە کەیمبریج گەڕایەوە و بوە قەشە لە کالڤێرتۆنی ئینگلتەرە. ئیلیزابسی یەکەم (١٥٥٨ـ١٦٠٣)، تازە فەرمانی کردبوو کە پێویست بوو هەمیشە گەلەکەی شەبقەی چنراویان لەسەر بکردایە. لی دەگێڕێتەوە کە *(چنەران تەنیا کەسانێك بوون دەیانتوانی ئەم شەپقانە بچنن، بەڵام ماوەیەکی زۆری پێدەچوو تا دانەیەکیان تەواودەکرد. دەستم بە بیرکردنەوەکرد. سەیری دایکم و خوشکەکانم دەکرد کە لەبەر زەردەی ئێواران دا دادەنیشتن و دەرزیەکانیان بەکاردەهێنا. ئەگەر شەپقەکان بە دوو دەرزی و داوێك دەزوو دروستبکرێن، بۆچی ناکرێ چەند دەرزیەك دەزوەکە بگرن)*

ئەم بیرە گرنگە سەرەتای بە ئامێرکردنی بەرهەمهێنانی قوماش بوو. لی، بەتەواوی سەرگەرمی دروستکردنی ئامێرێك بوو کە بیتوانیایە خەڵك لە کاری چنینی دەستی بێکۆتایی ڕزگاربکا. ئەو دەگێڕێتەوە: *(کەوتمە ئەوەی ئەرکەکانم بەرامبەر کڵێسا و خێزانەکەم پشتگوێبخەم. بیرۆکەی ئامێرەکەم و دروستکردنی دڵ و مێشکمیان داگیرکرد)*

لە کۆتایی دا، لە ساڵی ١٥٨٩ دا ئامێری چنینەکەی "ئامێری گۆرەوی چنین" ئامادەبوو. لی، بە شادییەوە بەرەو لەندەن کەوتەڕێ بۆ ئەوەی هەوڵی چاوپێکەوتنی ئیلیزابسی یەکەم بدا تا بۆی باسبکا کە ئامێرەکەی چەند بەسوود دەبێ و داوای لێبکا مافی پاراستنی داهێنانی پێبدا تا خەڵکی تر کۆپی دیزاینەکەی نەکەن. ئەو بینایەکی بەکرێگرت تا ئامێرەکەی تێدا دابمەزرێنێ و بە یارمەتی ئەندام پەرلەمانی ناوچەکە، ڕیچارد پارکینس، توانی هێنری کێری، لۆرد هەندسۆن، کە ئەندامی ئەنجوومەنی ڕاوێژکاریی شاهانە بوو، ببینێ. لۆرد هەندسۆن سەردانی شاژنی بۆ بینینی ئامێرەکە ڕێکخست، بەڵام کاردانەوەی شاژن لە کاتی بینینی ئامێرەکەدا بۆ لی ڕووخێنەربوو. شاژن ئامادەنەبوو مافی

پاراستنی داهێنان بداتە لی و لە وەڵام دا ووتی (هەرچەندە ئامانجت بەرزە، بەڕێز لی، بیربکەرەوە کە داهێنانەکەت چی بەسەر هاوڵاتییە هەژارەکانم دا دەهێنێ. بێگومان ئەوان تووشیماڵوێرانی دەکا بەوەی کە بێکاریان دەکا و وایان لێدەکا ببنە سواڵکار) لی تێکشکا و بەرەو فەڕەنسا کەوتەڕێ تا بەختی خۆی لەوێ تاقیبکاەوە. کاتێك لەوێش سەرکەتوو نەبوو، گەڕایەوە بۆ ئینگلتەرە و داوای لە جەیمس پاشای یەکەم (١٦٠٣ـ١٦٢٥) کرد کە جێگرەوەی ئیلیزابسی یەکەم بوو تا مافی پاراستنی داهێنانی بداتێ، جەیمسی یەکەمیش لەبەر هەمان هۆکارەکانی ئیلیزابسی یەکەم، داواکەی ڕەتکردەوە. هەردووکیان لەوە ترسان کە بە ئامێرکردنی بەرهەمهێنانی گۆرەوی ببێتە هۆی ناسەقامگیری سیاسی. خەڵکی بێکاردەکرد و بێکاری و ناسەقامگیری سیاسی دروستدەکرد و هەڕەشەی لە دەسەڵاتی پاشایەتی دەکرد. ئامێری چنینی گۆرەوی نوێکارییەك بوو کە بەڵێنی زیادکردنی بەرچاوی بەرهەمداریی دەدا، بەڵام لە هەمانکات دا دەبوە هۆی دروستکردنی تێکدانی بنیاتنەر.

کاردانەوە بەرامبەر داهێنانە بلیمەتانەکەی لی بیرۆکەی سەرەکی ئەم کتێبە ڕووندەکاتەوە. ترس لە تێکدانی بنیاتنەر هۆکاری سەرەکی ئەوەیە کە بۆچی لە نێوان شۆڕشی کشتوکاڵی و شۆڕشی پیشەسازی دا بەرزبوونەوەی بەردەوام لە ستانداردی ژیان دا ڕوویندەدا. نوێکاری تەکنەلۆجی دەبێتە هۆی خۆشگوزەرانی کۆمەڵگایانی مرۆیی، بەڵام لە هەمانکات دا دەبێتە هۆی جێگرتنەوەی کۆن بە نوێ و نەهێشتنی ئیمتیازە ئابووری و دەسەڵاتە سیاسییەکانی خەڵکێکی دیاریکراو. بۆ ئەوەی گەشەکردنی ئابووری بەردەوام ڕووبدا، پێویستمان بە تەکنەلۆجی و شێوازی نوێی ئەنجامدانی کارەکان هەیە و زۆرجاریش ئەمانە لە لایەن کەسانی نوێی وەك لی یەوە پێشکەشدەکرێن. ڕەنگە ئەمە خۆشگوزەرانی زیاتر بۆ کۆمەڵگا بهێنێ، بەڵام پرۆسەی تێکدانی بنیاتنەر کە بە هۆیەوە دێتەئاراوە، هەڕەشە لە گوزەرانی ئەوانە دەکا کە تەکنەلۆجی کۆن بەکاردەهێنن، وەك چنەرانی دەستیی کە بەهۆی تەکنەلۆجییەکەی لی یەوە بێکار دەبوون. لەوەش گرنگتر نوێکاری گەورەی وەك ئامێری چنینی گۆرەوی لی هەڕەشەی دارشتنەوەی دەسەڵاتی سیاسی دەکا. لە کۆتایی دا، ئەوە خەمی ئاییندەی ئەوانە نەبوو کە لەوانە بوو بەهۆی ئامێرەکەی لی یەوە بێکار بوونایە، وای لە ئیلیزابسی یەکەم و جەیمسی یەکەم کرد کە داواکەی لی بۆ مافی

پاراستنی داهێنان ڕەتبکەنەوە، بەڵکو ئەوە ترسی دۆڕاندنیان بوو لە ڕووی سیاسییەوە، ترسیان لەوەی کە ئەوانەی بەهۆی داهێنانەکەوە بێکار دەبوون ناسەقامگیری سیاسی دروستبکەن و هەڕەشە لە دەسەڵاتی خۆیان بکەن. هەروەك لە حاڵەتی لوودیەکان دا بینیمان، زۆرجار دەکرێ، دژایەتی کرێکارانی چنەرانی دەستیی وەلابنرێ، بەڵام نوخبە، بەتایبەتی کاتێك دەسەڵاتی سیاسییان دەکەوێتە بەر هەڕەشە، بەربەستێکی سەخت تر بەرامبەر نوێکاری دروستدەکەن. لەبەر ئەو ڕاستیەی کە ئەو نوخبانە لە ئەنجامی تێکدانی بنیاتنەرەوە تووشی زیانی گەورە دەبن، ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوان نەك تەنیا هیچ نوێکارییەکی نوێ ئەنجامنادەن، بەڵکو زۆرجاریش بەرەنگاری ئەم نوێکاریيانە دەبنەوە و هەوڵدەدەن بیانوەستێنن. کۆمەڵگا پێویستی بە کەسانی نوێ هەیە بۆ ئەوەی ڕادیکالترین نوێکاری پێشکەشبکەن، و ئەم کەسە نوێیانە و ئەو بنیاتنانە تێکدەرانەی ئەمانە دروستیدەکەن پێویستە بەسەر چەندین سەرچاوەی بەرەنگاربوونەوەدا زاڵبن، لەوانەش ئەو بەرەنگاربوونەوەیەی لە فەرمانڕەوایان و نوخبە خاوەن دەسەڵاتەکانەوە سەرچاوەدەگرن.

بەر لە ئینگلتەرەی سەدەی حەڤدەیەم، دەزگایانی چەوسێنەر لە سەرتاسەری مێژوودا شێوازی باو بوون. ئەم دەزگایانە لە هەندیك سەردەم دا توانیویانە گەشەکردنی ئابووری ئەنجامبدەن، هەروەك لە دوو چاپتەری دواییدا خستمانەڕوو، بەتایبەتی کاتێك ئەم دەزگایانە توخمی کراوەیان لەخۆ گرتبوو هەروەك لەڤینس و ڕۆما دا ڕوویدا. بەڵام ئەم دەزگایانە نەیانهێشت تێکدانی بنیاتنەر ڕووبدا. ئەو گەشەکردنەی ئەو دەزگایانە هێنایانەئاراوە نەتوانرا بەردەوامی پێبدرێ و لە ئەنجامدا کۆتاییان هات چونکە نەیانتوانی نوێکاری نوێ ئەنجامبدەن لەبەر ئەو ململانێ ناوخۆییە سیاسییانەی هەوڵدان بۆ سوود وەرگرتن لە چەوساندنەوە هێنانیەئاراوە یان لەبەر ئەوەی توخمە ساوا کراوەکان بە تەواوی پێچەوانە کرانەوە، هەروەك لە ڤێنس دا ڕوویدا.

تەمەن درێژی دانیشتویەکی گوندی ناتوفی ئەبو هوریرە ڕەنگە زۆر جیاوازی نەبوبێ لە تەمەن درێژی هاوڵاتییەکی ڕۆمای کۆن. تەمەن درێژی هاوڵاتییەکی ئاسایی ڕۆمانی تا ڕادەیەکی زۆر هاوشێوەی تەمەن درێژی دانیشتویەکی مامناوەندی ئینگلتەرە بوە لە سەدەی حەڤدەیەم دا. لە ڕووی داهاتەوە، لە

ساڵی ۳۰۱ زاین دا، ئیمپراتۆر دیۆکلێیان بڕیارێکی دەربارەی بەرزترین نرخ دەرکرد کە خشتەیەکی جۆرە جیاوازەکانی ئەو کرێیانەی لەخۆگرتبوو کە دەدرا بە کرێکاران. ئێمە نازانین تا چ ڕادەیەك ئەو نرخ و کرێیانەی لە لایەن دیۆکلێیانەوە دانران جێبەجێکران، بەڵام کاتێك مێژووناس، ڕۆبەرت ئەلن بڕیارەکەی بەکارهێنا بۆ حسابکردنی ئاستی گوزەرانی کرێکارێکی ئاسایی بێبەهرە، بۆی دەرکەوت کە ئاستی گوزەرانی ئەم کرێکارانە نزیکەی بەتەواوی وەکو ئاستی گوزەرانی کرێکارێکی بێبەهرەی ئیتالیای سەدەی حەڤدەیەم بوە. زیاتر بەرەو باکوور لە ئینگلتەرە دا، کرێکان بەرزتر و زیاتریش دەبوون و بارودۆخەکە لە گۆڕان دا بوو. ئایا ئەمە چۆن ڕوویدا، بابەتی ئەم چاپتەرەیە.

## ململانێی سیاسی هەمیشە ئامادە

ململانێ لەسەر دەزگاکان و دابەشکردنی دەرامەتەکان بە درێژایی مێژوو لە ئارادا بوە. بۆ نموونە، بینیمان چۆن ململانێی سیاسی شێوازی پەرەسەندنی ڕۆمای کۆن و ڤێنیسی دارشت، کە لە ئاکام دا ئەم ململانێیانە لە بەرژەوەندی نوخبەکان کۆتاییهات و توانیان دەسەڵاتی خۆیان زیاتربکەن.

مێژووی ئینگلتەرە بەهەمانشێوە پڕە لە ململانێ لە نێوان پاشایەتی و هاوڵاتییانی و لە نێوان تاقمە جیاوازەکان دا کە لە پێناوی دەسەڵات دا شەڕیان دەکرد و لە نێوان نوخبە و هاوڵاتییان دا، هەرچەندە ئەنجامی ئەم ململانێیانە هەمیشە بریتینەبوە لە بەهێزکردنی ئەوانەی دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوە. لە ساڵی ۱۲۱۵ دا بارۆنەکان، چینی نوخبەی خوار پاشاوە، بەرامبەر جۆن پاشا وەستان و ناچاریان کرد ماگنا کارتا (دەستووری شکۆدار) ئیمزا بکا لە ڕەنیمێد نەخشەی (۹). ئەم دۆکیومێنتە هەندێك پرینسیپی بنەڕەتی لە خۆگرتبوو کە تەحەدای گەورە بوون بۆ پاشا. لە هەموویان گرنگتر، ماگنا کارتا ئەوەی جێگیر کرد کە پاشا لە کاتی زیادکردنی باج دا پێویست بو ڕاوێژ لەگەڵ بارۆنەکان دا بکا. مادەیەك کە زۆرترین مشتومڕی لەسەر بوو بریتیبوو لە مادەی ٦١، کە جەختیکردوە (بارۆنەکان دەتوانن بە ئارەزووی خۆیان بیست و پێنج بارۆنی پاشایەتییەکە دەسنیشانبکەن، ئەوان بە هەموو توانای خۆیانەوە هەڵدەستن بە

چاودێریکردن و بەرقەرارکردن و دانانی ڕێوشوێن بۆ چاودێریکردنی ئاشتی و ئەو سەربەستییانەی ئێمە بەخشیومانن وئەم دەستووره جەختیان لەسەر دەکا) بە واتایەکی تر، بارۆنەکان ئەنجوومەنێکیان دروستکرد تا جەخت لەسەر ئەوە بکا کە پاشا دەستوورەکە جێبەجێدەکا و ئەگەر نەیکرد ئەوا ئەو بیست و پێنج بارۆنە مافی ئەوەیان هەبوو کە دەستبگرن بەسەر قەڵا و زەوی و موڵك و ماڵ دا (... هەتا، ئەوان دەگەنە ئەو بڕوایەی کە پێشێلکارییەکان لابراون) جۆن پاشا بە ماگنا کارتا ڕازینەبوو، هەر زوو دوای بڵاوەلێکردنی بارۆنەکان، پاپای ڕازیکرد تا دەستوورەکە بەتاڵبکاتەوە. بەڵام دەسەڵاتی سیاسی بارۆنەکان و کاریگەری ماگنا کارتا بەردەوامبوو. ئینگلتەرە هەنگاوی یەکەمی بە دوودڵییەوە نا بەرەو پلورەلیزم.

ململانێ لەسەر دەزگایانی سیاسی بەردەوامبوو، و دەسەڵاتی پاشایەتی لە ڕێگەی یەکەم پەرلەمانی هەڵبژێراوەوە لە ساڵی ١٢٦٥ دا سنووردارتر کرا. بە پێچەوانەی ئەنجوومەنی هاوڵاتییان لە ڕۆما و ئەنجوومەنەکانی نوێنەرانی ئەم سەردەمە، ئەندامانی پەرلەمان پیاوماقوڵانی فیودالْ بوون و دواتریش سوارچاکان و ئەریستۆکراتە هەرە دەوڵەمەندەکانی نەتەوە بوون. هەرچەندە، لە نوخبەکان پێکهاتبوو، پەرلەمانی ئینگلتەرا دوو شەقڵی دیاری هێنایەئاراوە. یەکەم، پەرلەمانەکە تەنیا نوێنەرایەتی ئەو نوخبانەی نەدەکرد کە هاوپەیمانی نزیکی پاشا بوون، بەڵکو نوێنەرایەتی کۆمەڵێك بەرژەوەندی فراوانی دەکرد، لەوانە بەرژەوەندی ئەریستۆکراتە بچووکەکەن کە لە لایەنە جیاوازەکانی ژیان دا ڕۆڵیان هەبوو، وەکو بازرگانی و پیشەسازی و دواتریش نوێنەرایەتی ئەو جووتیارانەی دەکرد کە بوونە چینێکی بازرگان و ڕۆڵیان لە زیادبوون دا بوو. بەم شێوەیە پەرلەمان هێزی بەخشیە بەشێکی زۆر فراوانی کۆمەڵگا ـ بەتایبەتی بەپێی ستانداردی ئەو سەردەمە. دوەم و زیاتر وەك ئەنجامی شەقڵی یەکەم، چەندین ئەندامی پەرلەمان بەردەوام بەرهەڵستی هەوڵەکانی پاشایەتی یان دەکرد بۆ زیادکردنی دەسەڵاتەکانی و بوونە پێشەنگی ئەوانەی لە شەڕی ناوخۆی ئینگلتەرە دا و دواتریش لە شۆڕشی شکۆدار دا دژی پاشایەتی شەڕیانکرد.

سەرەڕای بوونی ماگنا کارتا و یەکەم پەرلەمانی هەڵبژێراو، ململانێی سیاسی لەسەر دەسەڵاتی پاشایەتی و کێ ببوایە بە پاشا، بەردەوامبوو.

ململانێی نێو نوخبەکان بە جەنگی گوڵەباخەکان (War of the Roses) کۆتاییهات کە شەڕێکی درێژخایەن بوو لە نێوان دوو بنەماڵەی لانکاستەر و یۆرك کە دوو خێزان بوون و هەریەك لە دوو خێزانەکە بانگەشەی پاشایەتییان دەکرد. براوەکان بنەماڵەی لانکاستەر بوون و کاندیدێیان بۆ بوون بە پاشا هێنری تیودۆر بوو کە لە ساڵی ١٤٨٥ دا بوە هێنری پاشای حەوتەم.

دوو پرۆسەی هاوپەیوەندی تر ڕوویاندا. یەکەمیان بریتیبوو لە زیادبوونی مەرکەزیەتی سیاسی کە لە لایەن تیودۆرەکانەوە خرایەگەڕ. لە دوای ساڵی ١٤٨٥ ەوە هێنری حەوتەم چەکی لە ئەریستۆکراتەکان سەندەوە و بەمەش لە چالاکی سەربازی دووریخستنەوە و لەم ڕێگەیەشەوە دەسەڵاتی دەوڵەتی مەرکەزی لەڕادە بەدەر زیادکرد. کوڕەکەی، هێنری هەشتەم لە ڕێگەی سەرۆك وەزیرانەوە کە تۆماس کرۆموێڵ بوو، شۆڕشێکی لە ناو حکومەت دا بەرپاکرد. لە ساڵی ١٥٣٠ دا کرۆموێل دەوڵەتێکی بیرۆکراتی ساوای دامەزراند. لە بری ئەوەی حکومەت تەنیا ماڵێکی تایبەتی پاشا بێ، بوە کۆمەڵە دەزگایەکی جیاوازی چەسپاو. ئەمەش بە جیابوونەوەی هێنری هەشتەم لە کڵێسای کاسۆلیکی ڕۆما و "هەڵوەشاندنەوەی تەکیەکانی خوداپەرستی" قایمترکرا و لەم ڕێگەیەشەوە هێنری هەموو زەوییەکانی کڵێسای زەوتکرد. نەهێشتنی دەسەڵاتی کڵێسا بەشێك بوو لە هەوڵەکان بۆ زیادکردنی مەرکەزیەتی دەوڵەت. ئەم زیادکردنەی مەرکەزیەتی دەزگایانی دەوڵەت مانای ئەوە بوو کە بۆ یەکەمجار، ئەگەری سەهەڵدانی دەزگایانی کراوەی سیاسی هاتەوەئاراوە. ئەم پرۆسەیە کە لە لایەن هێنری حەوتەم و هێنری هەشتەمەوە دەستیپێکرا نەك تەنیا مەرکەزیەتی بۆ دەزگایانی دەوڵەت دروستکرد، بەڵکو داخوازی بۆ نوێنەرایەتی سیاسی بنکە فراوان زیاترکرد. لە ڕاستیدا پرۆسەی مەرکەزیەتی سیاسی دەشێ بەرەو جۆرێك لە سیستەمی سیاسی ڕەها هەنگاو بنێ کاتێك پاشا و لایەنگرانی دەتوانن گروپە بەهێزەکانی تری ناو کۆمەڵگا لەناوبەرن. هەر ئەمەش یەکێك لەو هۆکارانەیە کە بۆچی مەرکەزیەتی دەوڵەت بەرهەڵستیدەکرێ هەروەك لە چاپتەری سێیەم دا بینیمان. هەرچۆنێکبێ، لە بەرهەڵستکردنی ئەم هێزە دا، دروستکردنی مەرکەزیەتی دەزگایانی دەوڵەت دەتوانێ داخوازی دروستبکا بۆ شێوازێکی ساوای پلورەلیزم، هەروەك لە ئینگلتەرەی تیۆدۆر دا ڕوویدا. کاتێك بارۆنەکان و نوخبە لۆکاڵەکان هەستدەکەن کە دەسەڵاتی

سیاسی زیاتر مەرکەزی دەبێ و وەستاندنی ئەمەش کارێکی زەحمەتە، ئەوان دەکەونە داواکردنی ئەوەی کە ڕۆڵیان لە چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم دەسەڵاتە مەرکەزیەدا هەبێ. لە ئینگلتەرە دا لە کۆتایی سەدەکانی پازدەیەم و شازدەیەم دا، ئەمە مانای وابوو کە ئەم گروپانە هەوڵێکی زیاتر بدەن تا پەرلەمان وا لێبکەن ببێتە پارسەنگی پاشایەتی و نیمچە کۆنترۆڵێکیان لەسەر بەڕێوەبردنی دەوڵەت دا هەبێ. بەم شێوەیە پرۆژەکەی تیۆدۆر نەك تەنیا مەرکەزیەتی سیاسی دەسپێکرد، کە پایەیەکی دەزگایانی کراوەیە، بەڵکو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش یارمەتی سەرهەڵدانی پلورەلیزمی دا، کە پایەکەی تری دەزگایانی کراوەیە.

ئەم پەرەسەندنانە لە دەزگایانی سیاسی دا لە سیاقی گۆڕانکارییە گەورەکانی تردا لە سروشتی کۆمەڵگا دا ڕوویاندا. ئەوەی کە لەم ڕووەوە گرنگی تایبەتی هەبوو بریتیبوو لە فراوانبوونی ململانێی سیاسی و ئەمەش ئەو جۆرە گروپانەی فراوانکرد کە توانایان هەبوو داخوازی بخەنە بەردەم پاشا و نوخبە سیاسییەکە. شۆڕشی ڕەنجدەران لە ساڵی ١٣٨١ دا، گرنگ بوو کە دوای ئەوە نوخبەی ئینگلیز بەهۆی زنجیرەیەکی درێژ لە ڕاپەڕینی جەماوەرییەوە خرایە لەرزین. دەسەڵاتی سیاسی دابەشکرایەوە نەك تەنیا لە پاشاوە بۆ لۆردەکان، بەڵکو لە نوخبەکانەوە بۆ خەڵکیش. ئەم گۆڕانکارییانە، هاوتا لەگەڵ زیادبوونی سنووردارکردنی دەسەڵاتی پاشا، سەرهەڵدانی هاوپەیمانییەکی دژی ڕەهایی دروستکرد و ئەمەش بناخەی دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی دانا.

هەرچەندە جێگەی مشتومڕە، ئەو دەزگا سیاسی و ئابوورییانەی تیۆدۆرەکان بە میرات بۆیان مایەوە و بەردەوامییان پێدان بە ڕوونی چەوسێنەر بوون. لە ساڵی ١٦٠٣ دا ئیلیزابسی یەکەم، کچی هێنری هەشتەم کە لە ساڵی ١٥٥٣ دا هاتبوە سەرتەخت، بەبێ منداڵ لە دنیا دەرچوو، تیۆدۆرەکان لە لایەن بنەماڵەی فەرمانڕەوایی ستوارتەکان جێگەیان گیرایەوە. یەکەم پاشای ستوراتەکان کە جەیمسی یەکەم بوو، نەك تەنیا میراتگری دەزگاکانی سەردەمی پێشوو بوو، بەڵکو میراتگری ململانێکانی ناو ئەو دەزگایانەش بوو. ئەو ئارەزووی ئەوەی دەکرد ببێتە فەرمانڕەوایەکی ڕەها. هەرچەندە دەوڵەت بووبوە دەوڵەتێکی خاوەن مەرکەزیەتی زیاتر و گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان بووبوونە هۆی دابەشکردنەوەی دەسەڵات لە ناو کۆمەڵگادا، بەڵام دەزگا

سیاسییەکان هێشتا نەبووبوونە دەزگای پلورەلیستی. لە بواری ئابووری دا، دەزگایانی چەوسێنەر نەك تەنیا خۆیان لە دژایەتیکردنی داهێنانەکەی لی دا بەرجەستەکرد، بەڵکو لە بواری قۆرخکردن و قۆرخکردنی زیاتریش دا خۆیان بەرجەستەکرد. لە ساڵی ١٦٠١ دا لیستێکی ئەم قۆرخکردنانە لە پەرلەمان دا خوێنرایەوە و یەکێك لە ئەندامانی پەرلەمان بە گاڵتەجارییەوە پرسیاریکرد (ئایا نان لە ناو لیستەکەدا نییە؟). بە هاتنی ساڵی ١٦٢١ حەوت سەد جۆری قۆرخکردن هەبوو. هەروەك مێژووناسی ئینگلیزی، کریستۆفەر هیڵ باسی دەکا، پیاو:

*(لە خانویەك دا دەژیا کە لە خشتی قۆرخکراو دروستکرابوو، پەنجەرەکانی لە شووشەی قۆرخکراو دروستکرابوون، بە خەڵوزی بەردینی قۆرخکراو گەرمدەکرا (لە ئیرلەندا بە داری قۆرخکراو)، ئاگردانێکی بەکاردەهێنا کە لە ئاسنی قۆرخکراو دروستکرابوو ... ئەو پیاوە بە سابوونێکی قۆرخکراو خۆی دەشت، جلەکانی بە بۆنخۆشکارە قۆرخراوەکان دەشت. ئەو بۆیەنباخی قۆرخکراوی دەبەست و جلەکانی لە کەتان و چەرمی قۆرخکراو دروستکرابوو ... جلەکانی بە قایش و دووگمە و قۆپچەی قۆرخکراو دەبەست کە بە ڕەنگی قۆرخکراو ڕەنگکرابوون. ئەو ڕۆنەکەرەی قۆرخکراو و کشمیش و ماسی چاوشینکە و سالمۆن و لۆبستەری قۆرخکراوی دەخوارد. خواردنەکەی خوێی قۆرخکراوی تێدەکراو بیبەری قۆرخکرا و سرکەی قۆرخکراوی بەکاردەهێنا. ئەو بە پاندانی قۆرخکراو و لەسەر کاغەزی قۆرخکراو دەینووسی، ئەو پیاوە ( بە هۆی چاویلکە قۆرخکراوەکان و لەبەر مۆمە قرخکراوەکان دا) کتێبە خۆرخکراوەکانی دەخوێندەوە).*

ئەم قۆرخکردنانە، و زۆر زیاتریش لەمانە، مافی ڕەهای دایە تاك یان گروپەکان کە کۆنترۆڵی بەرهەمهێنانی چەندین کاڵا بکەن. ئەوانە بونە ڕێگر لەبەردەم بەکارهێنانی بەهرەکان دا کە بۆ خۆشگوزەرانی ئابووری گرنگە.

جەیمسی یەکەم و کوڕ و جێگرەوەکەی کە چارڵسی یەکەم بوو، هەوڵیان دا پاشایەتی بەهێزبکەن و کاریگەری پەرلەمان کەمبکەنەوە و دەزگایانی ڕەهای هاوشێوەی ئەوانەی لە ئیسپانیا و فەڕەنسا دادەمەزران، دروستبکەن بۆ زیادکردنی کۆنترۆڵی خۆیان و کۆنترۆڵی نوخبەکان بەسەر ئابووری و کردنی دەزگاکان بە دەزگایانی زیاتر چەوسێنەر. ململانێی نێوان جەیمسی یەکەم و

پەرلەمان لە ساڵی ١٦٢٠ گەیشتە ئەوپەڕی. خاڵی ناوەندیی ئەم ململانێیە بریتیبوو لە دەستگرتن بەسەر بازرگانی دا، بازرگانی دەرەوە و ناو دوورگەکانی بەریتانیا. دەسەڵاتی پاشایەتی بۆ بەخشینی مونۆپۆڵی سەرچاوەی سەرەکی داهاتی دەوڵەت بوو، زۆرجار ئەمە بەکاردەهێنرا بۆ بەخشینی مافی مۆنۆپۆڵی تەواو بە لایەنگرانی پاشا. جێگەی سەر سوڕمان نییە ئەم دەزگا چەوسێنەرە کە دەرفەتی بەشداری خەڵکی نەهێشتبوو و چالاکی بازاڕی پەکخستبوو، لە هەمانکات دا کاریگەری خراپی هەبوو بۆ چالاکی ئابووری و زیانی لە بەرژەوەندی چەندین ئەندامانی پەرلەمان دەدا. لە ساڵی ١٦٢٣ دا پەرلەمان سەرکەوتنێکی بەرچاوی بەدەستهێنا لە ڕێگەی دەرکردنی یاسای مۆنۆپۆلییەکانەوە کە بەخشینی مونۆپۆڵی ناوخۆیی نوێی لە لایەن جەیمسی یەکەمەوە قەدەخەکرد. پاشا هەر دەیتوانی مۆنۆپۆڵی بۆ بازرگانی نێودەوڵەتی ببەخشێ، چونکە پەرلەمان لە کاروبارەکانی دەرەوەدا خاوەنی دەسەڵات نەبوو. ئەو مۆنۆپۆلیانەی تا ئەو کاتە ڕەزامەندییان لەسەردرابوو، ناوخۆیی و نێودەوڵەتی، وەکو خۆیان مانەوە. پەرلەمان بە شێوەیەکی بەردەوام کۆنەدەبۆوە و دەبوایە پاشا داوای کۆبوونەوەی پەرلەمانی بکردایە. ئەو ڕێکەوتنەی دوای ماگنا کارتا هاتەئاراوە ئەوە بوو کە پاشا دەبوایە پەرلەمانی کۆبکردایەتەوە بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندییان دەربارەی زیادکردنی باج. چارڵسی یەکەم لە ساڵی ١٦٢٥ دا هاتەسەرتەخت و لە دوای ساڵی ١٦٢٩ ەوە ئامادە نەبوو داوای کۆبوونەوەی پەرلەمان بکا و هەوڵەکانی جەیمسی یەکەمی زیاتر چڕکردەوە بۆ دامەزراندنی ڕژێمێکی ڕەها تر. ئەو قەرزی ناچاریی هێنایە کایەوە کە مانای ئەوەبوو دەبوایە خەڵك پارەیان بە قەرز بدایەتێ و تاکلایەنەش مەرجەکانی قەرزەکەی دەگۆڕی و ئامادە نەبوو ئەو قەرزانە بداەوە. لەو بوارە دا کە یاساکە ڕێیپێدابوو کە ئەویش بازرگانی دەرەوە بوو، مۆنۆپۆلییەکانی دەبەخشی و دەفرۆشت. سیستەمی دادوەری لاوازکرد و هەوڵیدا کار بکاتە سەر ئەنجامی سکاڵا یاساییەکان. چەندین غەرامە و رسوماتی سەپاند و لە هەمووشیان زیاتر جێگەی مشتومڕ بریتیبوو لە "پارەی کەشتی". لە ساڵی ١٦٣٤ باجی خستە سەر ئەو ناوچانەی لە کەناری دەریا بوون بۆ یارمەتیدانی هێزی دەریایی پاشایەتی و لە ساڵی ١٦٣٥ دا ئەم باجە درێژکرایەوە بۆ ناوچەکانی تریش. باجی کەشتی ساڵانە وەردەگیراو تا ساڵی

١٦٤٠ بەردەوامبوو.

هەڵسوکەوتی ڕەها و سیاسەتی چەوسێنەرانەی چارڵس نارەزایی و بەرەنگاربوونەوەی لە سەرتاسەری وولآت دا دروستکرد. لە ساڵی ١٦٤٠ دا لەگەڵ سکۆتلەندەدا تووشی ناکۆکی بوو، بەبێئەوەی پارەی تەواوی هەبێ تا سوپایەکی بەهێز بخاتە مەیدانەوە، ناچارکرا تا داوای کۆبوونەوەی پەرلەمان بکا بۆ کۆکردنەوەی باجی زیاتر. ئەوەی پێی ووترا کۆبونەوەی کورتی پەرلەمان، تەنیا بۆ سێ حەفتە کۆبوونەوەکان بەردەوابوون. ئەو ئەندام پەرلەمانانەی هاتبوونە لەندەن ئامادەنەبوون لە کۆبوونەوەکانی پەرلەمان دا باسی باج بکەن، بەڵام چەندین سکاڵایان پێشکەشکرد تا چارڵس ناچار بوو بیانکاتە دەرەوە. سکۆتلەندییەکان زانیان کە چارڵس پشتگیری نەتەوەکەی نییە، بۆیە پەلاماری ئینگلتەرەیان داو شاری نیوکاسڵ یان داگیرکرد. چارڵس داوای گفتوگۆکردنی کرد و سکۆتلەندییەکان داوایانکرد پەرلەمان بەشداری گفتوگۆکان بێ. ئەمەش وای لە چارڵس کرد داوای، ئەوەی دواتر پێیووترا، دانیشتنی درێژی پەرلەمان بکا چونکە کۆبوونەوەکان تا ساڵی ١٦٤٨ بەردەوامبوون و ئامادەی هەڵوەشاندنەوە نەبوو، تەنانەت کاتێکیش چارڵس داوای ئەوەی لێکردن.

لە ساڵی ١٦٤٢ دا جەنگی ناوخۆ لە نێوان چارڵس و پەرلەمان دا دەستیپێکرد، هەرچەندە لە ناو پەرلەمان دا چەندین ئەندام هەبوون کە پشتگیری چارڵسیان دەکرد. شێوازی ململانێکان ڕەنگدەرەوەی هەوڵەکانی کۆنترۆڵکردنی دەزگا سیاسی و ئابوورییەکان بوون. پەرلەمان ویستی کۆتایی بە دەزگا سیاسییە ڕەهاکان بهێنێ، بەڵام پاشا دەیویست ئەم دەزگایانە بەهێزبکا. ئەم ململانێیانە لەناو ئابووری دا ڕیشەیان داکوتابوو. چەندین کەس لەمانە پشتگیری پاشایان دەکرد چونکە مۆنۆپۆلی چەوریان پێدرابوو. بۆ نموونە، مۆنۆپۆلییە ناوخۆییەکان لە لایەن بازرگانە دەوڵەمەند و خاوەن دەسەلآتەکانی شرێسبێری و ئۆسوێستری کۆنترۆڵکرابوون لە لایەن پاشاوە پارێزگارییان لێدەکرا بەرامبەر بازرگانەکانی لەندەن. ئەم بازرگانانە پشتگیری چارڵسی یەکەمیان دەکرد. لە لایەکی ترەوە، پیشەسازی کانزا لەدەوری بێرمەنگهام پەرەیسەندبوو چونکە مۆنۆپۆلییەکان لەو ناوچەیەدا لاواز و ئەوانەی تازە دەستیاندەکرد بە پیشەسازی پێویست نەبوو حەوت ساڵ مەشقی

پیشەسازییان بکردایە هەروەك لە ناوچەکانی تری وولات دا دەیانکرد. لە کاتی جەنگی ناوخۆدا، ئەمانە شمشێریان دروستدەکرد و خەڵکی خۆبەخشیان بۆ لایەنی پەرلەمان دابیندەکرد. بە هەمانشێوە، نەبوونی ڕێسای سەندیکاکان لە ناوچەی لانکەشێر بواری پەرەسەندنی "پەردەی نوێ"ی ڕەخساند بەر لە ساڵی ١٦٤٠، کە جۆرێکی نوێی قوماشی سووکتر بوو. ئەو ناوچەیەی کە بەرهەمهێنی ئەم جۆرە قوماشانەی تێدا چڕبۆوە، تەنیا بەشی لانکەشێر بوو کە پشتگیری پەرلەمانی کرد.

بەسەرکردایەتی ئۆلیڤەر کرۆموێڵ، لایەنگرانی پەرلەمان کە پێیان دەوترا سەرخڕەکان، لەبەر شێوازی قژ بڕینیان، لایەنگرانی پاشایان تێکشکاند کە بە سوارەکان ناسرابوون. چارڵس دادگاییکراو لە ساڵی ١٦٤٩ دا لە سێدارەدرا. لەناوچوونی چارڵس و هەڵوەشاندنەوەی پاشایەتی نەبوونە هۆی دروستبوونی دەزگایانی کراوە. لە بری ئەمە پاشایەتی بە دیکتاتۆریەتی ئۆلیڤەر کرۆموێڵ جێگەیگیرایەوە. لە دوای مردنی کرۆموێڵ، پاشایەتی لە ساڵی ١٦٦٠ دا دانرایەوە و بەشێکی زۆری ئەو ئیمتیازانەی بەدەستهێنابوو کە پێشتر لە ساڵی ١٦٤٩ دا لێیان سەندرابۆوە. کوڕی چارڵس، چارڵسی دوەم کەوتەوە پەیڕەکردنی هەمان پرۆگرامی دامەزراندنی ڕەهایی لە ئینگلتەرەدا. ئەم هەوڵانە لە لایەن جەیمسی دوەمی برایەوە کە دوای مردنی چارڵس لە ساڵی ١٦٨٥ دا هاتەسەرتەخت، چڕترکرانەوە.

لە ساڵی ١٦٨٨ هەوڵەکانی جەیمس بۆ سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی ڕەهایی قەیرانێکی تر و جەنگێکی تری ناوخۆی بەرپاکرد. ئەمجارەیان پەرلەمان یەکگرتوو تر و ڕێکخراو تر بوو. ئەوان داوایانکرد لە حاکمی هۆڵەندا، ولیامی ئۆرەنج و مێری ژنی کە کچە پرۆتستانتی جەیمس بوو تا جێگەی جەیمس بگرێتەوە. ولیام بە خۆی و سوپایەکەوە هات و تەختی پاشایەتی داگیرکرد بۆ ئەوەی بۆخۆی ببێتە پاشا، بەڵام نەك وەك پاشایەکی دەسەڵات ڕەها، بەڵکو وەك پاشایەکی دەستووری کە لە لایەن پەرلەمانەوە ڕێکخرابوو. دوو مانگ دوای ئەوەی ویلیام گەیشتە دوورگەکانی بەریتانیا و لە بریکسهام لە دێڤن دابەزی نەخشەی (٩)، سوپاکەی جەیمس بڵاوەیانلێکرد و بۆخۆشی ڕایکرد بۆ فەڕەنسا.

# شۆڕشی شكۆدار

دوای سەركەوتنی شۆڕشی شكۆدار، پەرلەمان و ولیام دەستوورێكی نوێیان دارشت. گۆڕانكارییەكانی ناو دەستوورەكە لە جاڕنامەكەی ولیام دا كە ماوەیەكی كەم پێش لە داگیركردنەكەی بڵاویكردبۆوە، ئاماژەیانپێدرابوو. ئەم گۆڕنكارییانە زیاتر لە جاڕی مافەكان دا كە لە لایەن پەرلەمانەوە لە ساڵی ١٦٨٩ ئامادەكرا، چەسپێنرا. جاڕەكە لە هەمان ئەو كۆبوونەوەیەی پەرلەمان دا كە تیایدا تاجی پاشایەتی پێشكەشكرا بە ولیام، خوێندرایەوە. جاڕەكە دوای ئەوە بوە یاسا و بە ناوی یاسای مافەكان ناوبرا، لە زۆر ڕووەوە ناڕۆشن بوو. لەگەڵ ئەوەش دا، هەندێك پرینسیپی بنەڕەتی دەستووریی دامەزراند. دەستوورەكە چۆنیەتی هاتنە سەرتەختی پاشایەتی دیاریكرد و بە شێوەیەكی زۆر جیاواز لە پرینسیپە میراتگرییەكانی ئەوكاتە ئەمەی دیاریكرد. ئەگەر پەرلەمان توانیبێتی جارێك پاشایەك لەسەر تەخت لاببا و یەكێكی تر كە جێگەی ڕەزامەندی ئەوان بێ بهێنێنتە جێگەی، بۆچی ناتوانێ جارێكیتریش ئەمە بكا؟ جاڕنامەی مافەكان جەختی لەسەر ئەوە كردبوو كە پاشا ناتوانێ یاساكان هەڵپەسێرێ یان لایان ببا و دووپاتی نایاسایی دانانی باجی بەبێ ڕەزامەندی پەرلەمان كردەوە. جگە لەمەش لە جاڕنامەكەدا هاتبوو كە نەدەكرا بەبێ ڕەامەندی پەرلەمان سوپای هەمیشەیی لە ئینگلتەرە دا پێكبهێنرێ. ناڕۆشنی لە هەندێك مادەی وەك مادەی ٨ دا دیار بوو كە (پێویستە هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمان ئازاد بێ) بەڵام ئەوەی ڕوونەكردبۆوە كە "ئازادی" چۆن دیاریدەكرا. تەنانەت لەو مادەیەش ناڕۆشنتر مادەی ١٣ بوو كە مەبەستی سەرەكی بریتیبوو لەوەی كە پێویست بوو پەرلەمان زوزو كۆببوایەتەوە. لەبەر ئەوەی مەسەلەی كەی و لە چ بارودۆخێك دا پێویست بوو پەرلەمان كۆببوایەتەوە جێگای مشتومڕێكی زۆربوو بە درێژایی سەدەكە، چاوەڕێدەكرا كە ئەم مادەیە زیاتر ڕۆشن بێ. لەگەڵ ئەمەش دا، هۆكاری ئەم ناڕۆشنیە ئاشكرایە. مادە یاساییەكان دەبێ جێبەجێبكرێن. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی چارڵسی دوەم دا، یاسای ترایینیەڵ كاری پێدەكرا كە جەختی لەسەر ئەوە دەكرد كە پێویست بوو پەرلەمان، بەلایەنی كەمەوە، هەر سێ ساڵ جارێك كۆببوایەتەوە، بەڵام چارڵس ئەم یاسایەی پشتگوێ خست و هیچیش

ڕووینەدا، چونکە هیچ میکانیزمێك نەبوو تا جێبەجێکردنی یاساکە مسۆگەربکا. لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە پەرلەمان دەیتوانی هەوڵی دانانی ڕێگایەك بۆ جێبەجێکردنی ئەم مادەیە بدا، هەر وەك چۆن بارۆنەکان ئەمەیان لە ڕێگەی ئەنجوومەنەکەیانەوە کرد دوای ئەوەی جۆن پاشا ماگنا کارتای ئیمزاکرد. ئەندامانی پەرلەمان ئەمەیان نەکرد چونکە پێویستیان پێی نەبوو. ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە دەسەڵات و هێزی بڕیاردان لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە گوێزرانەوە بۆ پەرلەمان. تەنانەت بەبێ بوونی ڕێسا یان یاسای دەستووریی تایبەت، ولیام چەندین لە پراکتیسەکانی پاشاکانی پێشووتری واز لێهێنا. ئەو وازی لە دەستەوەردان لە بڕیارە یاساییەکان هێنا و "مافەکان"ی پێشتری وەکو وەرگرتنی هەتاهەتایی گومرگی، وازلێهێنا. ئەم گۆڕانکارییانە هەموویان پێکەوە لە دەزگایانی سیاسی دا سەرکەوتنی گەورەی پەرلەمان بوو بەسەر پاشادا و بەو هۆیەشەوە کۆتایی سیستەمی ڕەهایی بوو لە ئینگلتەرە و دواتریش لە بەریتانیای مەزن دا ـ کاتێك ئینگلتەرە و سکۆتلەندە لەئەنجامی یاسای یەکێتی ساڵی ١٧٠٧ دا یەکیانگرت. لەو کاتە بەدواوە پەرلەمان بە توندی کۆنترۆڵی سیاسەتی دەوڵەتی کرد. ئەمەش جیاوازی گەورەی دروستکرد چونکە بەرژەوەندییەکانی پەرلەمان زۆر جیاواز بوون لە بەرژەوەندییەکانی پاشای بنەماڵەی ستوارت. لەبەر ئەوەی بەشێکی زۆر لەوانەی لە پەرلەمان بوون خاوەنی بەرهەمهێنان بوون لە بازرگانی و پیشەسازی دا، بەرژەوەندی گەورەیان لە جێبەجێکردنی مافی موڵکداری دا هەبوو. ستوارتەکان کە زۆرجار دەسدرێژییان دەکردە سەر مافی موڵکداری، چیتر ڕێگەیان پێنەدرا ئەوە بکەن. جگە لەمەش، کاتێك ستوارتەکان کۆنترۆڵی چۆنیەتی خەرجکردنی پارەیان کردبوو لە لایەن دەوڵەتەوە، پەرلەمان دژی زیادکردنی باج و لەگەڵ بەهێزکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت دا نەبوو. کاتێك پەرلەمان بۆخۆی کۆنترۆڵی خەرجکردنی دەکرد، خۆشحاڵ بوو بە زیادکردنی باج و خەرجکردنی ئەو پارەیە بۆ ئەو چالاکیانەی بۆخۆی پێی باش بوو. لە هەمووشیان گرنگتر، خەرجکردنی پارە بوو بۆ بەهێزکردنی هێزی دەریایی کە بەرژەوەندییە بازرگانییەکانی زۆرێك لە ئەندامانی پەرلەمانی دەپاراست.

تەنانەت گرنگتریش لە بەرژەوەندی ئەندامانی پەرلەمان، سەرهەڵدانی سروشتی پلورەلیستی دەزگایانی سیاسی بوو. خەڵکی ئینگلتەرە بە شێوەیەك

لـه پەرلـەمان و ئـەو سیاسـەتە ئـابووری و دەزگایانـەی لـە نـاو پەرلـەمان دا دروستدەکران نزیك بوونەوە کە هەرگیز لەو سەردەمەی سیاسەتەکان لـە لایـەن پاشاوە دادەنران ڕووینەدابوو. ئەمەش تاڕادەیەك لەبەر ئەوە بوو کە ئەندامانی پەرلەمان هەڵدەبژێران. بەڵام لەبەر ئەوەی ئینگلتەرەی ئەو سـەردەمە دووربـوو لەوەی ببێتە دیموکراسی، ئەم نزیکبوونەوەیە تەنیا برێکـی کـەمی نوێنەرایـەتی هێنایەئاراوە. یەکێك لەو نایەکسانییە زۆرانە بریتیبوو لەوەی کە کەمتر لە ٢٪ی دانیـشتوان دەیـانتوانی لـە سـەدەی هەژدەیـەم دا دەنـگ بـدەن و ئەوانەشـی دەنگیـان دەدا پیـاو بـوون. ئـەو شـارانەی کـە شۆڕشـی پیـشەسازی تیایـان دا ڕوویدا، بێرمنگەهام و لیدس و مانچێستەر و شێفیلد، نوێنەرایەتی سـەربەخۆیان لە پەرلەمان دا نەبوو. لە جیاتی ئەمە، ناوچە گوندنشینەکان زیـاد لـە پێویـست خـاوەنی نوێنەرایـەتی بـوون. لەمـەش خـراپتر، مـافی دەنگدان لـە لادێکـان دا "قەزاکان" لەسەر بنەمای خاوەنـدارێتی زەوی دارێـژرابوو، و چـەندین ناوچـەی شارنشین "شارەوانییەکان" لە لایەن نوخبەیەکی بچووکەوە کۆنترۆڵکرابوون کە نەیاندەهێشت ئەوانەی تازە دەستیان بە کاری پیـشەسازی کردبـوو دەنگبـدەن یان خۆیان بۆ هـیچ پێگەیـەك بپـاڵێون. بـۆ نموونـە، لـە شـارەوانی بـەکینگهام، سـیازدە نوێنـەر مـافی تـەواوی دەنگدانیان هـەبوو. لـە سـەروو ئەمانەشـەوە "شارەوانییە ڕزیوەکان" هەبوو، کە لە ڕووی مێژووییەوە مافی دەنگدانیان هەبوو بەڵام "توشی ڕزین بـوون" یـان لەبـەر ئـەوەی دانیـشتوانیان بـە درێـژایی کـات باریان کردبوو، یان وەك لە حاڵەتی دەنویچ دا لە کەناری ڕۆژهەڵاتی ئینگلتـەرە دا، ڕۆچوبوە ناو زەریا لـە ئـەنجامی دامـاڵینی کـەنارەکان دا. لـە هەریـەك لـەم شارەوانییە ڕزیوانەدا ژمارەیەکی کەم لە دەنگدەران دوو ئەنـدامی پەرلـەمانیان هەڵدەبژارد. سارومی کۆن حەوت دەنگدەری هەبوو، دەنویچ سیو دوو، هەریـەك لەمانەش دوو ئەندامی پەرلەمانیان هەڵدەبژارد.

بەڵام ڕێگای تر هەبوون بۆ کارکردنە سەر پەرلـەمان و لەوێـشەوە کارکردنـە سەر دەزگا ئابوورییەکان. گرنگترینـی ئـەو ڕێگایانـە بریتیبـوون لـە تکـاکردن و ئەمــەش زۆر گــرنگتر بــوو لــەو دیموکراســییە ســنووردارەی کــە هــەبوو بــۆ سـەرهەڵدانی پلـورەلیزم لـە دوای شۆڕشـی شـکۆدار. هەمووکەسـێك دەیتـوانی تکانامـە بخاتـە بـەردەم پەرلـەمان و لـەوەش گـرنگتر، کاتێـك ئـەم تکانامەیـە پێشکەشدەکرا پەرلـەمان گـوێی دەگـرت. ئەمـە زیـاد لـە هـەموو شـتێکی تـر

نیشانەی شکستهێنانی ڕەهایی و هێزدارکردنی کەرتێکی فراوانی کۆمەڵگا و سەرهەڵدانی پلورەلیزمە لە ئینگلتەرەدا لە دوای ساڵی ١٦٨٨. چالاکی گەرمی تکاکردن ئەوە دەردەخا کە گروپی فراوانی لەم چەشنەی ناو کۆمەڵگا بوو، فراوانتر لەوانەی لەناو پەرلەمان دا بوون و تەنانەت فراوانتر لەو کەسانەی لە ناو پەرلەمان دا نوێنەرایەتیان دەکرا، خاوەن دەسەڵاتی ئەوتۆ بوون کە بتوانن کاریگەرییان لە سەر شێوەی بەڕێوەبردنی دەوڵەت هەبێ. ئەم گروپە فراوانە دسەڵاتەکەی خۆیان بەکارهێنا.

مۆنۆپۆڵییەکان بە باشترین شێوە ئەمە ڕووندەکەنەوە. لەسەرەوە بینیمان کە چۆن مۆنۆپۆلییەکان لەسەدەی حەڤدەیەم دا پیشەی دەزگا چەوسێنەرەکانیان پێکهێنابوو. ئەم مۆنۆپۆلییانە لە ساڵی ١٦٢٣ دا، بە دەرچوونی یاسای مۆنۆپۆلییەکان، کەوتنە بەر هێرش و لەکاتی جەنگی ناوخۆی ئینگلتەرەدا جێگای مشتومڕی گەرم بوون. پەرلەمانە تەمەن درێژەکە هەموو ئەو مۆنۆپۆلیە ناوخۆییانەی هەڵوەشاندەوە کە ژیانی خەڵکیان تاڵ کردبوو. هەرچەندە چارلسی دوەم و جەیمسی دوەم نەیانتوانی ئەم مۆنۆپۆلییانە بگێڕنەوە، بەڵام دەسەڵاتی بەخشینی مۆنۆپۆلی دەرەوەیان لای خۆیان هێشتەوە. یەکێك لەو مۆنۆپۆلییانە بریتیبوو لە کۆمپانیای پاشایەتی ئەفریقا، کە یاسای مۆنۆپۆلییەکەی لە لایەن چارلسی دوەم لە ساڵی ١٦٦٠ ەوە دەرکرابوو. کۆمپانیاکە مۆنۆپۆلی لەسەر بازرگانی چەوری کۆیلەی ئەفریقی هەبوو، سەرۆك و خاوەن پشکی سەرەکی لە کۆمپانیاکەدا جەیمسی برای چارلس بوو، کە دواتر بوە جەیمسی دوەم. لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە، کۆمپانیاکە نەك تەنیا سەرۆکەکەی، بەڵکو لایەنگری سەرەکیشی لە دەستدا. جەیمس پێشتر لێبڕاوانە پارێزگاری لە مۆنۆپۆلی کۆمپانیاکە دەکرد لە دژی "بازرگانە بچووکەکان" کە بازرگانی سەربەخۆ بوون وهەوڵیان دەدا کۆیلان لە ڕۆژئاوای ئەفریقا بکڕن و لە هەردوو ئەمەریکادا بیانفرۆشن. ئەمە بازرگانییەکی زۆر قازانجهێنەر بوو، کۆمپانیای پاشایەتی ئەفریقا ڕووبەڕووی تەحەدای زۆر بۆوە چونکە هەموو کارە بازرگانییەکانی تری ئینگلتەرە لە زەریای ئەتڵەسی دا ئازادبوون. لە ساڵی ١٦٨٩ دا کۆمپانیاکە دەستی بەسەر کارگۆی بازرگانێکی سەربەخۆدا گرت کە نایتینگەیڵ بوو. نایتینگەیڵ لە دادگا سکاڵای دژی کۆمپانیاکە تۆمارکرد لەسەر بنەمای زەوتکردنی نایاسایی کەلوپەل لە لایەن

کۆمپانیای پاشایەتی ئەفریقاوە و دادوەر هۆڵت بڕیاریدەرکرد کە زەوتکردنەکە نایاسایی بوە چونکە کۆمپانیاکە مافی مۆنۆپۆلی بەکارهێنابوو کە بە بڕیارێکی پاشایەتی درابوو. هۆڵت هۆکاری بڕیارەکەی گێڕایەوە بۆ ئەوەی کە پێویست بوو ئیمتیازی لەو چەشنە تەنیا بە یاسا بدرێ و ئەمە دەبوایە لە لایەن پەرلەمانەوە دەربکرایە. بەم شێوەیە، هۆڵت نەک تەنیا مۆنۆپۆلی کۆمپانیای پاشایەتی ئەفریقا، بەڵکو هەموو مۆنۆپۆلییەکانی داهاتووی خستە ژێر ڕکێفی پەرلەمانەوە. بەر لە ساڵی ١٦٨٨ جەیمسی دوەم هەر زوو ئەو دادوەرەی دەردەکرد کە بڕیاری لەم چەشنەی بدایە. لە دوای ساڵی ١٦٨٨ شتەکان جیاواز بوون.

پەرلەمان دەبوایە بڕیاری بدایە کەچی لە مۆنۆپۆلیەکان بکا و لێشاوی تکانامەکان دەستیپێکرد. سەدو سیو پێنج تکانامە لە بازرگانە بچووکەکانەوە پێشەکەشکران کە داوای بەشداری ئازادیان دەکرد لە بازرگانی ئەتڵەسی دا. هەرچەندە کۆمپانیای پاشایەتی ئەفریقاش بەهەمانشێوە تکانامەی پێشکەشکرد، بەڵام نەیتوانی لە ژمارەو ئەندازەدا هاوتای ئەو تکانامانە بێ کە داوای هەڵوەشاندنەوەی کۆمپانیاکەیان دەکرد. بازرگانە بچووکەکان سەرکەوتوو بوون لە دارشتنی بەرهەڵستیەکانیان دا بەرامبەر کۆمپانیاکە نەک تەنیا لە ڕوانگەی بەرژەوەندی خودیی تەسکەوە، بەڵکو لە ڕوانگەی بەرژەوەندی نەتەوەییەوە و لە ڕاستیشدا هەر وابوو. لە ئەنجامدا، تەنیا پێنج لەو سەدو سیو پێنج تکانامانە لە لایەن خودی بازرگانە بچووکەکانەوە ئیمزا کرابوون و حەفتاو سێ لە تکانامەی بازرگانە بچووکەکان لە ناوچەکانی دەرەوەی لەندەن هاتبوون بەرامبەر هەشت دانەی کۆمپانیاکە. لە کۆلۆنییەکانەوە کە بواری پێشکەشکردنی تکانامەیان پێدرابوو، بازرگانە بچووکەکان بیست و حەوت تکانامەیان کۆکردەوە بەرامبەر بە یازدە دانەی کۆمپانیاکە. بازرگانەکان ژمارەیەکی یەکجار زیاتر ئیمزایان بۆ پشتگیریی تکانامەکانیان کۆکردەوە و کۆی گەیشتە ٨،٠٠٠ لە کاتێك دا کۆمپانیاکە ٢،٥٠٠ ئیمزای کۆکردەوە. ئەم ململانێیە تا ساڵی ١٦٩٨ بەردەوامبوو کە مۆنۆپۆلی کۆمپانیای پاشایەتی ئەفریقا هەڵوەشێنرایەوە.

شانبەشانی ئەم مەڵبەندە نوێیە بۆ دیاریکردنی ئاراستەی دەزگا ئابوورییەکان و بەهاناچوونی نوێ لە دوای ساڵی ١٦٨٨، پەرلەمانتارەکان

دەستیانکرد بە ئەنجامدانی زنجیرەیەك گۆڕانکاری لە دەزگا سەرەکییەکانی ئابووری و سیاسەتەکانی حکومەت دا کە دواتر بوونە ڕێخۆشکار بۆ سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازی. مافی موڵکداری کە لە سایەی ستوارتەکان دا تەنك کرابوو بەهێزکرا. پەرلەمان دەستیکرد بە پرۆسەیەکی چاکسازی لە دەزگا ئابوورییەکان دا بۆ برەوپێدانی دامەزراندنی کارگە لە بری دانانی باج و ڕێگرتن لەو چالاکییانە. "باجی ئاگردان" کە باجێکی ساڵانە بوو لەسەر ئاگردان و زۆپا و خراپترین کاریگەری هەبوو لەسەر دروستکارانی ئەم کاڵایانە و ئەوانیش بە توندی دژی بوون، لە ساڵی ١٦٨٩ دا و ماوەیەکی کەم دوای هاتنە سەرتەختی ویلیام و مێری، هەڵوەشێنرایەوە. لە بری باجی ئاگردان، پەرلەمان دەستیکرد بە باج دانان لەسەر زەوی.

دابەشکردنەوەی قورسایی باج تەنیا سیاسەتی هاوکاری پیشەکاران نەبوو کە پەرلەمان پشتگیری کرد. زنجیرەیەك یاسا کە بوونە هۆی فراوانکردنی بازاڕ و زیادکردنی قازانجی قوماشی خوری، دەرکران. ئەمەش لە ڕووی سیاسییەوە ڕێی گونجاو بوو چونکە زۆربەی لایەنگرانی پەرلەمان کە دژی جەیمس بوون، بە خەستی لەم بزنسە نوێیانەی دروستکردن وەبەرهێنانیان کردبوو. دیسانەوەپەرلەمان یاسایانی ئەوتۆی دەکرد کە دەرفەتی ڕەخساند بۆ ڕێکخستنەوەی تەواوی مافی موڵکدای لە زەوی دا و بواری جێگیرکردن و لابردنی چەندین شێوازی کۆنی موڵکداری و مافەکانی بەکارهێنەری زەوی ڕەخساند.

ئەولەویەتێکی تری پەرلەمان بریتیبوو لە چاکسازی لە سیستەمی دارایی دا. هەرچەندە فراوانبوون لە بانك و دارایی دا لە ماوەی پێش شۆڕشی شکۆدار دا ڕوویدابوو، بەڵام ئەم پرۆسەیە لە ڕێگەی دامەزراندنی بانکی ئینگلتەرەوە لە ساڵی ١٦٩٤ دا وەك سەرچاوەی پارە بۆ کەرتی پیشەسازی، قایمتر کرا. ئەوەش ئاکامێکی ڕاستەوخۆی شۆڕشی شکۆدار بوو. دامەزراندنی بانکی ئینگلتەرە، ڕێگای خۆشکرد بۆ "شۆڕشێکی دارایی" زۆر چڕوپڕ تر کە بوە هۆی فراوانبوونی بەرچاوی بازاڕەکان و بانکەکان. بە هاتنی سەدەی هەژدەیەم، هەر کەسێك بیتوانیایە بارمتە دابنێ دەیتوانی قەرز وەربگرێ. تۆمارەکانی بانکێکی تا ڕادەیەك بچووك، (سی. هۆرەیس ئاند کۆ) لە لەندەن، کە لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٧٠٢ ـ ١٧٢٤ وەك خۆیان ماونەتەوە، ئەم خاڵە ڕووندەکەنەوە.

هەرچەندە بانکەکان قەرزیان دەدایە ئەریستۆکرات و لۆردەکانیش، دوو لەسەر سێی قەرز وەرگرە گەورەکانی بانکی هۆرەیس لەم ماوەیەدا لە چینە کۆمەلایەتیە خاوەن ئیمتیازەکان نەبوو. بە پێچەوانەوە، قەرز وەرگرەکان بازرگانان و بزنسمانان بوون کە یەکێك لەوانە جۆن سمیس بوو، پیاوێك کە ناوی پیاوێکی ئاسایی ئینگلیزی هەبوو. ئەم پیاوە لە ماوەی نێوان سالانی ١٧١٥-١٧١٩ لە لایەن بانکەوە ٢,٦٠٠ پاوەندی بە قەرز دراوەتێ.

تا ئێستا ئێمە جەختمان لەسەر ئەوە کردوە کە چۆن شۆڕشی شکۆدار ئالوگۆڕی لە دەزگا سیاسییەکانی ئینگلیزی دا کردو ئەوانی کردە دەزگایانی زیاتر پلورەلیستی و لە هەمانکات دا دەستیانکرد بە دانانی بناخەی دەزگایانی ئابووری کراوە. گۆڕانکارییەکی تری گرنگ لە دەزگاکان دا لە ئەنجامی شۆڕشی شکۆدار دا ڕوویدا: پەرلەمان بەردەوامیی دا بە پرۆسەی مەرکەزیەتی سیاسی کە لە لایەن تیۆدۆرەکانەوە دەستپێکرا. تەنیا ئەوە نەبوو کە جلەوگیرییەکان زیاتر کران، یان دەولەت بە شێوازێکی جیاواز سەرپەرشتی ئابووری دەکرد، یان دەولەتی ئینگلیزی پارەی بۆ شتی جیاواز خەرجدەکرد، بەلکو توانا و دەسەلاتی دەولەت لە هەموو ڕویەکەوە زیادی کرد. ئەمەش دیسانەوە پەیوەندی نێوان مەرکەزیەت و پلورەلیزم پیشاندەدا: پەرلەمان، بەر لە سالی ١٦٨٨، ناڕازیبوو بە کاراترکردنی دەولەت و زیادکردنی دەرامەتەکانی چونکە نەیدەتوانی کۆنترۆلی دەولەت بکا. لە دوای سالی ١٦٨٨ چیرۆکەکە جیاواز بوو.

دەولەت دەستیکرد بە فراوانبوون، خەرجییەکانی گەیشتە ١٠٪ ی داهاتی نەتەوەیی. ئەم خەرجییانە لە ڕێگەی فراوانکردنی بنەمای باجەوە پشتگیری کران بەتایبەتی باجی گومرگی کە لیستێکی درێژی ئەو کالایانەی لەخۆگرتبوو لە ناوخۆدا دروستدەکران. ئەمەش، بۆ ئەو کاتە، بودجەیەکی گەورەی دەولەت بوو، لە ڕاستی دا گەورەتر بوو لەو بودجەیەی ئەمڕۆ لە چەندین ناوچەی جیهان دا دەیبینین. بۆ نموونە، بودجەی دەولەت لە کۆلۆمبیا تەنیا لە سالی ١٩٨٠دا گەیشتە ئەم ئاستە ڕێژەییە. لە چەندین ناوچەی باشووری بیابانی ئەفریقادا، بۆ نموونە، لە سیارا لیۆن، بودجەی دەولەت تەنانەت ئەمڕۆش بە بەراوورد لە گەل قەبارەی ئابووری دا زۆر بچووکترە ئەگەر هاوکارییە نێودەولەتییەکانی لێدەرکرێ.

بەلام فراوانبوونی قەبارەی دەولەت تەنیا بەشێکی پرۆسەی مەرکەزیەتی

سیاسییە. زۆر گرنگتر لەمە بریتیبوو لە کوالێتی شێوەی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و شێوازی هەڵسوکەوتی ئەوانەی کۆنترۆڵی دەوڵەتیان کردبوو و ئەوانەی لەناو دەوڵەت دا کاریاندەکرد. دامەزراندنی دەزگایانی دەوڵەت لە ئینگلتەرە دەگەڕێتەوە بۆ چاخەکانی ناوەڕاست، بەڵام هەروەك بینیمان، هەنگاو بەرەو مەرکەزیەتی سیاسی و پەرەپێدانی کارگێریی مۆدێرن بەتەواوی لە لایەن هێنری حەوتەم و هێنری هەشتەمەوە نرا. لەگەڵ ئەمەش دا، دەوڵەت زۆر دووربوو لەو شێوازە مۆدێرنەی کە لە دوای ساڵی ١٦٨٨ سەریهەڵدا. بۆ نموونە، گەلێك لەوانەی دادەمەزران لەسەر بنەمای سیاسی دادەمەزران نەك لە سەر بنەمای توانا و لێهاتووییان و توانای دەوڵەت بۆ کۆکردنەوەی باج سنووردار بوو.

لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە پەرلەمان کەوتە باشکردنی توانای کۆکردنەوەی داهات لە ڕێگەی باجەوە، ئەمەش پەرەسەندنێك بوو کە بیرۆکراسی کۆکردنەوەی باج بە باشی ڕوونی دەکاتەوە و ژمارەیان بە خێرایی لە ١٢١١ کەسەوە لە ساڵی ١٦٩٠ دا زیادیکرد بۆ ٤,٨٠٠ کەس لە ساڵی ١٧٨٠ دا. سەرپەرشتیارانی باج لە هەموو شوێنێکی وڵات دا بنکەیان هەبوو کە لە لایەن کۆکارەکانەوە چاودێری دەکران. کۆکارەکان هەڵدەستان بە سەردانی پشکنین بۆ پێوان و ووردبینیکردنی بڕی نان و بیرە و کاڵاکانی تر کە باج دەیگرتنەوە. دەشێ ئەندازەی ئەم چالاکیانە ڕوونبکرێنەوە لە ڕێگەی ژماردنی گەشتەکانی کۆکردنەوەی باج لە لایەن سەرپەرشتیار کاوپێرسوەیت ئەنجامدراوە لە نێوان ١٢ حوزەیران و ١٥ تەمووزی ساڵی ١٧١٠ و لە لایەن مێژووناس جۆن بروەر تۆمارکراوە. سەرپەرشتیار کاوپێرسوەیت ٢٩٠ میل لە ناوچەی ڕیچمۆندی سەر بە یۆرکشێر گەشتیکردوە. لەم ماوەیەدا ئەو سەردانی ٢٦٣ شوێنی ئازووقە و ٧١ کارگەی نشاستەی بیرە و ٢٠ شوێنی فرۆشتنی مۆم و یەك شوێنی دروستکردنی بیرەی کردوە. هەموو پێکەوە ٨١ کاری پێوانی بەرهەمی جیاوازی ئەنجامداوە و ووردبینی بۆ کاری ٩ کەسی جیاواز کردوە کە کاریان بۆ ئەو کردوە و هەڵساون بە کۆکردنەوەی باج. هەشت ساڵ دواتر، دەبینین بەهەمانشێوە کاردەکا، بەڵام لە ناوچەی وەیکفیلد لە بەشێکی تری یۆرکشێر. لە وەیکفیلد تێکڕا ڕۆژنە ١٩ میل گەشتیکردوە و حەفتەی شەش ڕۆژ کاری کردوە و چوار یان پێنج شوێنی پشکنیوە. لە ڕۆژی پشووی دا کە یەکشەمە بوە، تۆمارەکانی ڕێکخستوە، بۆیە تۆمارێکی تەواوی هەموو چالاکیەکانیمان

هەیە. لە راستیدا، سیستەمی کۆکردنەوەی باج تۆمارکردنێکی ڕێکوپێکی زانیارییەکانی هەبوە. کاربەدەستان سێ جۆری جیاواز تۆمارەکانیان هەڵگرتوە کە دەبوایە هەرسێکیان هاوشێوەی یەکتر بوونایە و هەر دەسکارییەکی ئەم تۆمارانە تاوانێکی قورس بوو. ئاستی سەرپەرشتی کۆمەڵگا لە لایەن دەوڵەتەوە زیاتر بوو لەوەی کە حکومەتەکانی زۆربەی دەوڵەتانی هەژاری ئەمڕۆ ئەنجامی دەدەن و ئەمەش لە ساڵی ١٧١٠ دا وابوە. بە هەمانشێوە گرنگ، دەوڵەت لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە کەوتە ئەوەی زیاتر پشت بە تواناکان و کەمتر پشت بە دامەزراندنە سیاسییەکان ببەستێ و ژێرخانێکی پتەوی بۆ بەڕێوەبردنی وڵات دامەزراند.

## شۆڕشی پیشەسازی

شۆڕشی پیشەسازی لە هەموو بوارێکی ئابووری ئینگلتەرە دا ڕەنگیدایەوە. گۆڕانکاری گەورە لە بواری گواستنەوە و میتالۆرگی و هێزی هەڵم دا هاتەئاراوە. بەڵام گرنگترین بواری نوێکاری بریتیبوو لە ئامێرکردنی بەرهەمهێنانی قوماش و دامەزراندنی کارگەکان بۆ بەرهەمهێنانی ئەم قوماشانە. ئەم پرۆسە داینەمیکیە لە ڕێگەی ئەو گۆڕانکارییە دەزگاییانەوە سەریانهەڵدا کە لە شۆڕشی شکۆدارەوە سەرچاوەیان گرتبوو. ئەمەش تەنیا بریتینەبوو لە هەڵوەشاندنەوەی مۆنۆپۆلییە ناوخۆییەکان کە بە هاتنی ساڵی ١٦٤٠ ئەنجامدرابوو، یان دانانی باجە جیاوازەکان یان ئەو گۆڕنکارییانەی لە بواری بەدەستهێنانی پارە دا ئەنجامدرابوو، بەڵکو بریتیبوو لە ڕێکخستنەوەی بنەڕەتی دەزگایانی ئابووری لە قازانجی نوێکاران و بزنسمانان، کە لە سەر بنەمای سەرهەڵدانی مافی موڵکداری جێگیر تر و کارامە تر دامەزرابوو.

باشکردنی جێگیری و کارامەیی مافی موڵکداری، بۆ نموونە، ڕۆڵی سەرەکی بینی لە بواری "شۆڕشی گواستنەوە" دا و ئەویش ڕێگاخۆشکار بوو بۆ شۆڕشی پیشەسازی. وەبەرهێنان لە دروستکردنی کەناڵ و ڕێگاوبان ئەوەی پێیدەوترێ تێرنپایك (ڕێگاوبانی دروستکراو لە لایەن کەرتی تایبەتەوە) لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە زیادیکرد. ئەم وەبەرهێنانانە، لە ڕێگەی کەمکردنەوەی تێچووی

بواری گواستنەوەوە، یارمەتیدەر بوون بۆ خۆشکردنی زەمینە بۆ شۆڕشی پیشەسازی. بەر لە ساڵی ١٦٨٨، وەبەرهێنان لەم چەشنە ژێرخانانەدا لە ڕێگەی ئەو یاسایانەی لە لایەن پاشاکانی ستوارتەوە دەردەکران، کۆسپیان بۆ دروستدەکرا. گۆڕانی بارودۆخەکە لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە لە ڕێگەی نموونەی ڕووباری سالوێرپ لە ڕێستەرشێری ئینگلتەرە بە جوانی ڕوونکراوەتەوە. لە ساڵی ١٦٦٢ دا پەرلەمان یاسایەکی دەرکرد بۆ هاندانی وەبەرهێنان لە ڕووباری سالوێرپ بۆ ئەوەی بەکاربهێنرێ بۆ گواستنەوە. بنەماڵەی بۆڵدوین بڕی ٦،٠٠٠ پاوەندیان وەبەرهینانکرد بۆ ئەنجامدانی کارەکە. بەرامبەر بەم وەبەرهێنانە مافی وەرگرتنی پارەیان وەرگرت بۆ گواستنەوەی خەڵك لە ناو ڕووبارەکە دا. لە ساڵی ١٦٩٣ دا پرۆژە یاسایەك درایە پەرلەمان بۆ گواستنەوەی مافی وەرگرتنی کرێی گواستنەوە بۆ ئێرلی شرۆبەری و لۆرد کۆڤێنتری. سێر تیمۆسی بۆڵدوین دژی پرۆژە یاساکە وەستا و هەر زوو تکانامەیەکی پێشکەشکرد بە پەرلەمان و ڕایگەیاند کە ئەم پرۆژە یاسایە دەبێتە هۆی زەوتکردنی موڵکی باوکی کە وەبەرهێنانی زۆری لە ڕووبارەکەدا کردبوو بە نیازی وەرگرتنی کرێی گواستنەوە. بۆڵدوین داکۆکی لەوەکرد کە (ئەم یاسا نوێیە یاسا کۆنەکە بەتاڵ دەکاتەوە و هەموو ئەو کەلوپەل و کەرەسانە زەوتدەکا کە بۆ جێبەجێکردنی کارەکە بەکارهێنراون) سەندنەوەی لەم جۆرەی ماف و پێدانی بە کەسێکی تر ئەو جۆرە شتانە بوون کە پاشاکانی ستوارت دەیانکرد. بۆڵدوین تێبینیکرد ( لێسەندنی مافی کەسێك بەبێ ڕەزامەندی خۆی کە بە پێی یاسایەکی پەرلەمان پێی درابێ ئاکامێکی مەترسیداری دەبێ) لەم دۆخەدا پرۆژە یاساکە سەرکەوتوو نەبوو و مافەکانی بۆڵدوین پارێزران. مافەکانی موڵکداری لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە زۆر جێگیر تر بوون، بەشێك لە هۆکاری ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە جێگیرکردنی ئەم مافانە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی پەرلەمان دا یەکیان دەگرتەوە و بەشەکەی تری هۆکارەکە ئەوە بوو کە دەکرا لە ڕێگەی تکانامەکانەوە کاربکرێتە سەر دەزگایانی پلورەلیستی. لێرەدا دەبینین کە لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە سیستەمی سیاسی بە شێوەیەکی بەرچاو بوە سیستەمێکی زیاتر پلورەلیستی و گۆڕەپانی تەختی گەمەی بە شێوەیەکی ڕێژەیی لە ناو ئینگلتەرە دا دروستکرد.

ئەوەی کە بوەهۆی بەرپابوونی شۆڕشی گواستنەوە و لەوەش گرنگتر

ڕێکخستنەوەی زەوی لە سەدەی هەژدەیەم دا بریتیبوو لەو یاسایانەی پەرلەمان کە سروشتی خاوەندارێتی زەوییان گۆڕی. تا ساڵی ١٦٨٨ یش ئەو یاسا خەیاڵییە باو بوو کە وای دادەنا پاشایەتی خاوەنی هەموو زەوییەکانی ئینگلتەرە بوو، کە پاشماوەی ڕاستەوخۆی ڕێکخستنی زەوی سەردەمی فیودالی بوو. بەکارهێنانی چەندین پارچە زەوی کێشەی تێکەوتبوو بەهۆی چەندین شێوازی کۆنی مافی موڵکداری و بانگێشەی خاوەندارێتی جیاوازەوە. زۆربەی زەوییەکان لە شێوازی ئەوەی پێیدەوترێ زەویوزاری هاوبەش کە مانای وابوو خاوەن زەوییەکە نەیدەتوانی زەوییەکە بدا بەکرێ یان پارەی لەسەر وەربگرێ یان بیفرۆشێ. زەوی گشتی تەنیا بۆ بەکارهێنانە گشتییەکان سوودیان لیوەردەگیرا. چەندین تەگەرە لەبەردەم بەکارهێنانی ئابوورییانەی زەوی دا هەبوو. پەرلەمان دەستیکرد بە ئەنجامدانی گۆڕانکاری لەم ڕووەوە و دەرفەتی دایە کۆمەلانی خەڵك تا تکانامە پێشکەشبکەن بۆ ئاسانکردن و سەر لەنوێ ڕێکخستنەوەی مافی موڵکداری. لە ئاکام دا ئەم گۆڕانکارییانە لە ناو سەدان یاسای پەرلەمان دا ڕەنگیاندایەوە.

ئەم ڕێکخستنەوەیەی دەزگایانی ئابووری لە دەرکەوتنی ئەجێندایەکیش دا ڕەنگیدایەوە بۆ پاراستنی بەرهەمی قوماشی ناوخۆیی بەرامبەر هاوردەی دەرەکی. جێگەی سەرسوڕمان نییە کە پەرلەمانتاران و دەنگدەرانیان دژی هەموو جۆرە بەربەستێکی بەشدارانی نوێ و مۆنۆپۆلییەك نەبوون. ئەوانەی کە بازاڕ و قازانجەکانیانی زیاددەکرد پێشوازییان لێدەکرا. بەهەرحاڵ، دەزگا سیاسییە پلورەلیستەکان ـ ئەو ڕاستییەی کە پەرلەمان نوێنەرایەتی کەرتێکی فراوانی کۆمەڵگای دەکرد و گوێیلێدەگرتن و هێزداریدەکردن ـ مانای ئەوە بوو کە بەربەستەکانی بەردەم بەشدارابوون نەدەبوونە هۆی خنکاندنی خاوەن پیشەسازییەکانی تر یان دەرگایان لەسەر بەشدارانی نوێ دانەدەخست بەو شێوەیەی سیراتا لە ڤێنس ئەنجامی دا. خاوەن کارگە بەهێزەکانی خوری هەر زوو ئەمەیان بۆ دەرکەوت.

لە ساڵی ١٦٨٨ دا هەندێك لە گرنگترین هاوردەکان بۆ ئینگلتەرە بریتیبوون لە قوماش کە خام و مۆزلین بوون و لە هیندستانەوە هاوردەدەکران کە یەك لەسەر چواری هەموو قوماشی هاوردەی پێکدەهێنا. لە هەمانکات دا قوماشی هاوردەی گرنگی تر بریتیبوو لە ئاوریشم کە لە چینەوە هاوردەدەکرا. خام و

ئاوریشم لە لایەن کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانەوە هاوردەدەکران کە بەر لە ساڵی ١٦٨٨ لە لایەن حکومەتەوە مۆنۆپۆلی بازرگانیکردنی لەگەڵ ئاسیادا پێدرابوو. دەسەڵات و مۆنۆپۆلی کۆمپانیای ڕۆژهەلاتی هیندستان لە ڕێگەی بەرتیلی قورس بۆ جەیمسی دوەم بەردەوامی پێدرابوو. لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە کۆمپانیاکە کەوتە پێگەیەکی لاواز و، هەر زووش ڕووبەڕووی هێرش بۆوە. ئەم هێرشەش شێوازی جەنگێکی قورسی پێشکەشکردنی تکانامەی لەخۆگرت لە لایەن ئەو بازرگانانەوە کە دەیانویست بازرگانی لەگەڵ ڕۆژهەلاتی دوور و هیندستان دا بکەن و داوایاندەکرد لە پەرلەمان تا ڕێوشوێن بۆ ڕکابەریی لە لایەن کۆمپانیای ڕۆژهەلاتی هیندستانەوە دابنێ، لە کاتێک دا کۆمپانیاکە تکانامەی پێچەوانەیان پێشکەشکرد و ئامادەیی خۆیان پیشاندا بۆ پێدانی قەرز بە پەرلەمان. کۆمپانیاکە دۆڕاندی و کۆمپانیای ڕۆژهەلاتی هیندستانی نوێ دامەزرا تا لەگەڵ کۆمپانیا کۆنەکە دا ڕکابەرییبکا. بەڵام بەرهەمهێنەرانی قوماش تەنیا ڕکابەریی زیاتریان لە بازرگانی دا لەگەڵ هیندستان دا نەدەویست، ئەوان دەیانویست هاوردەی قوماشی هەرزان لە هیندستانەوە باجی لەسەر دابنرێ یان بە تەواوی قەدەخەبکرێ. ئەم بەرهەمهێنەرانە ڕووبەڕووی ڕکابەریی توند بووبوونەوە لەگەڵ ئەم هاوردە هەرزانانە لە هیندستانەوە. لەم کاتەدا گرنگترین بەرهەمهێنەرانی ناوخۆ قوماشی خورییان بەرهەمدەهێنا، بەڵام تا دەهات بەرهەمهێنەرانی قوماشی لۆکە لە ڕووی ئابوورییەوە گرنگییان زیاتر دەبوو، لە کاتێك دا لە ڕووی سیاسییەوە بەهێز تر دەبوون.

پیشەسازی خوری هەر لە ساڵی ١٦٦٠ ەوە کەوتە هەوڵدان بۆ پارێزگاریکردن لە خۆی و کەوتە هێنانەپێشەوەی "یاساکانی شیکپۆشی". یەکێك لەو شتانەی یاساکە قەدەخەیکرد، لەبەرکردنی جلی سووك بوو. ئەم پیشەسازییە دیسانەوە لە ساڵانی ١٦٦٦ و ١٦٧٨ دا لۆبی پەرلەمانیان کرد بۆ دەرکردنی جۆرە یاسایەك بۆ نایاساییکردنی هەموو جۆرە قوماشێك بۆ پێچانەوەی مردوو لە کاتی ناشتنی دا جگە لە کفنی خوری. هەردوو هەوڵەکان پارێزگاری لە بازاڕی کاڵای خوری دەکرد و ئەو ڕکابەرییەی کەمدەکردەوە کە بەرهەمهێنەرانی ئینگلیز لە ئاسیاوە ڕووبەڕووی دەبوونەوە. بەهەرحاڵ، لەم ماوەیەدا کۆمپانیای ڕۆژهەلاتی هیندستان هێندە بەهێز بوو کە توانی هاوردەکردنی قوماشی ئاسیا کەمنەکاتەوە. بارودۆخەکە لە دوای ساڵی ١٦٦٨

ەوە گۆڕا. لە نێوان ساڵانی ١٦٩٦ و ١٦٩٨ بەرهەمهێنەرانی قوماشی خوری لە ڕۆژهەلاتی ئەنگلیا و ڕۆژئاوای وولات لەگەڵ چنەرانی ئاوریشم لە لەندەن و کانتەربێری و کۆمپانیای لاڤێنت، هاوپەیمانییەکیان دروستکرد بۆ کەمکردنەوەی هاوردەکان. هاوردەرانی ئاوریشم لە کۆمپانیای لاڤێنت، هەرچەندە تازە مۆنۆپۆلی هاوردەی ئاوریشمیان لە دەستدابوو، حەزیانکرد ئاوریشمی ئاسیا قەدەخەبکرێ تا بتوانن بازاڕێکی تایبەت بە ئاوریشمی هاوردەکراو لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە دابمەزرێنن. ئەم هاوپەیمانییە دەستیکرد بە پێشکەشکردنی پرۆژەیاسا بۆ پەرلەمان بۆ دانانی سنوور لەسەر لەبەرکردنی جلی لۆکە و ئاوریشمی ئاسیایی و دانانی سنوور لەسەر ڕەنگکردن و چاپکردنی قوماشی ئاسیا لە ئینگلتەرە. پەرلەمان لە بەرامبەردا لە ساڵی ١٧٠١ یاسایەکی دەرکرد *(یاسایەك بۆ باشتر خستنەکاری هەژاران لە ڕێگەی هاندانی کارگەکانی ئەم پاشایەتییەوە)*. یاساکە فەرمانی دا کە لە ئەیلولی ساڵی ١٧٠١ ەوە *( هەموو ئاوریشمێکی خۆشکراو و بێنگاڵ و خوری کە تێکەڵاوکرابێ لەگەڵ ئاوریشمی هێربا و لە ئێران و چین یان ڕۆژهەلاتی هیندستان دروستکرابن و هەموو خامێك کە لەو وولاتانەدا بۆیەکرابن یان خومکرابن یان چاپکرابن یان ڕەنگکرابن کە بۆ ئەم پاشایەتییە هاوردەکراون یان هاوردەدەکرێن، نابێ لەبەربکرێن)*.

ئیتر لەبەرکردنی ئاوریشم و خامی ئاسیا لە ئینگلتەرە دا نایاسایی بوو. بەڵام دەکرا ئەو کاڵایانە هاوردەبکرێن و هەناردەبکرێن بۆ ئەورووپا و جێگای تر، بەتایبەتی بۆ کۆلۆنییەکانی ئەمەریکا. جگە لەمە، دەکرا خامی سادە هاوردەبکرێ و لە ئینگلتەرە دا دەسکاریبکرێ، قەدەخەکردنەکە مۆزۆلینی نەگرتەوە. دوای تەقەلایەکی زۆر ئەم درزانە لە یاساکەدا، هەروەك دروستکارانی ناوخۆی قوماشی خوری پێیان دەوت، لە ڕێگەی یاسای خامی ساڵی ١٧٢١ەوە داخران *(لە دوای ٢٥ کانونی یەکەمی ساڵی ١٧٢٢ ەوە نایاسایی دەبێ بۆ هەر کەسێك یان کەسانێك لە بەریتانیای مەزن دا هەر جۆرە پۆشاکێکی خامی چاپکراو یان بۆیەکراو یان ڕەنگکراو یان خومکراو لەبەربکەن یان بەکاربهێنن)* هەرچەندە ئەم یاسایە ئەو ڕکابەرییەی نەهێشت کەبەرهەمهێنەرانی خوری ئینگلیزی لە ئاسیاوە ڕووبەڕووی بووبوونەوە، بەڵام پیشەسازییەکی چالاکی ناوخۆی لۆکە و کەتانی هێشتەوە کە ڕکابەری لەگەڵ بەرهەمەکانی خوری دا

دەکرد. لۆکە و کەتان تێکەڵدەکران بۆ دروستکردنی جۆرە جلێکی ڕەواجدار پێیدەوترا فوستیان. دوای ئەوەی پیشەسازی خوری ڕکابەری لە ئاسیاوە نەهێشت، ئینجا کەوتە تەنگهەڵچنین بە کەتان. بە شێوەیەکی سەرەکی کەتان لە سکۆتلەندە و ئیرلەندە دا دروستدەکران کە بواری ڕەخساند بۆ هاوپەیمانییەکی ئینگلیزی بۆ ئەوەی داوای دوورخستنەوەی ئەو دوو وڵاتە بکەن لە بازاڕی ئینگلیزی. بەهەرحاڵ، دەسەڵاتی بەرهەمهێنەرانی خوری سنووردار بوو. هەوڵە نوێکانیان ڕووبەڕووی بەرهەڵستییەکی توند بۆوە لە لایەن بەرهەمهێنەرانی فوستیانەوە لە ناوەندە پیشەسازییە گەشەکردوەکانی وەکو مانچێستەر و لانکاستەر و لیڤەرپوڵ. دەزگا سیاسییە پلورەلیستیەکان ئەوەیان دەگەیاند کە هەموو ئەم گروپە جیاوازانە دەرفەتی بەشداریکردنیان بۆ ڕەخسابوو لە پرۆسەی گەڵاڵەکردنی سیاسەت لە ناو پەرلەمان دا لە ڕێگەی دەنگدان و لە هەمووشی گرنگتر پێشکەشکردنی تکانامە. هەرچەندە تکانامەکان لە هەردوو لاوە هاتن و ژمارەیەکی زۆر ئیمزا لەگەڵ و دژ کۆکرانەوە، بەڵام دەرئەنجامی ئەم ململانێیە سەرکەوتن بوو بۆ بەرژەوەندییە نوێکان لە دژی پیشەسازی خوری. یاسای مانچێستەری ساڵی ١٧٣٦ کۆك بوو لەسەر ئەوەی کە *(بڕی زۆری ئەو کاڵایانەی لە بەنی کەتان و لۆکە دروستدەکرێن، لە ماوەی چەندین ساڵانی ڕابوردوا لە ناو ئەم پاشایەتییەی بەریتانیای مەزن دا چاپکراون و بۆیەکراون )* یاساکە دواتر جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە *(نابێ هیچ شتێك لە یاسای ناوبراو دا "یاسای ساڵی ١٧٢١" لە ناو پاشایەتی بەریتانیای مەزن دا ببێتە هۆی قەدەخەکردنی لەبەرکردن یان بەکارهێنانی لە جلوبەگ و کەلوپەلی ناوماڵ دا یان شتی تری ئەو شتانەی لە کەتان و لۆکە دروستدەکرێن و چاپدەکرێن یان بۆیەدەکرێن بە هەر ڕەنگێك یان ڕەنگەکان).*

یاسای مانچێستەر سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆبەرهەمێنەرانی ساوای لۆکە، بەڵام لە ڕاستیدا بایەخی مێژوویی و ئابووری زۆر لەوە زیاتر بوو. یەکەم، یاساکە سنووردارێتی بەربەستەکانی بەردەم بەشداربوونی پیشاندا کە دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی ئینگلتەرەی پەرلەمانیی بواریدەدا. دوەم، لە ماوەی نیو سەدەی دواتر دا، نوێکارییە تەکنەلۆجییەکان لە دروستکردنی جلوبورگی لۆکە دا ڕۆڵی ناوەندییان لە شۆڕشی پیشەسازی دا بینی و لە ڕێگەی هێنانەئارای سیستەمی کارگەوە، کۆمەڵگایان بەشێوەیەکی بنەڕەتی گۆڕی.

هەرچەندە لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە، لە ناوخۆدا، مەیدانی تەختی گەمە سەریهەڵدا، بەڵام لە ئاستی نێودەوڵەتی دا پەرلەمان هەوڵی دا مەیدانەکە بە قازانجی ئینگلتەرە لێژ بکا. ئەمەش نەك تەنیا لە یاسای خام دا بە ڕوونی دیار بوو، بەڵکو لە یاساکانی گواستنەوەی دەریاییشدا ڕوون بوو، کە یەکەم یاسایان لە ساڵی ١٦٥١ دا دەرکرا و بە هەندێك دەسکارییەوە بۆ دوو سەد ساڵی دواتر بەردەوامبوون. ئامانجی ئەم یاسایانە بریتیبوو لە مۆنۆپۆلیکردنی بازرگانی نێودەوڵەتی لە لایەن ئینگلتەرەوە ـ هەرچەندە ئەمە مۆنۆپۆلیکردن نەبوو لە لایەن دەوڵەتەوە، بەڵکو مۆنۆپۆلیکردن بوو لە لایەن کەرتی تایبەتەوە. پرینسیپی بنەڕەتی بریتیبوو لەوەی کە دەبوایە بازرگانی ئینگلیزی لە ناو کەشتیانی ئینگلیزی دا ئەنجامبدرایە. یاساکان گواستنەوەی کاڵاکانیان لە دەرەوەی ئەورووپا بۆ ئینگلتەرە یان کۆلۆنییەکانی ئینگلتەرە لە لایەن کەشتیانی بیانییەوە کردە کاری نایاسایی و بە هەمانشێوەش کاری نایاسایی بوو کەشتیانی وولاتێکی تر هەڵبستن بەگواستنەوەی کاڵاکان لە هەر وولاتێکی ئەورووپاوە بۆ ئینگلتەرە. ئەم باڵادەستییە بۆ بازرگانان و پیشەکارانی ئینگلیز بوە هۆی زیادکردنی قازانج و ڕەنگە بوشبێتە هۆی هاندانی زیاتر بۆ نوێکاری لەم چالاکیە نوێ و قازانجهێنەرانەدا.

بە هاتنی ساڵی ١٧٦٠، پێکەوەکارکردنی هەموو ئەم فاکتەرانە ـ مافی موڵکداری نوێ و باشتر و ژێرخانی تۆکمە تر و گۆڕانکاری لە سیستەمی نەختینە و دەرفەتی بەدەستهێنانی پارە و پارێزگاری توند لە بازرگانان و پیشەکاران ـ دەستیان بە نواندنی کاریگەریکرد. لە دوای ئەم ڕێکەوتەوە، بازدانی گەورە لە ژمارەی بەخشینی مافی داهێنان ڕوویدا و سەرەتای گۆڕانکاریی تەکنەلۆجی شکۆدار کە بوە ناوکی شۆڕشی پیشەسازی، بە ڕوونی دەرکەوت. نوێکاری لە چەندین ڕووەوە ئەنجامدرا کە ڕەنگدەرەوەی ژینگە دەزگاییە پێشکەوتوەکە بوون. یەکێك لە بوارە گرنگەکان بواری هێز بوو، لە هەمووشیان بەناوبانگتر، گۆڕانکاری لە بەکارهێنانی بزوێنەری هەڵمی دا بوو کە ئەنجامی ئایدیاکانی جەیمس وات بوون لە ساڵانی ١٧٦٠ ەکان دا.

سەرکەوتنی سەرەتایی وات بریتیبوو لە دروستکردنی چامبەرێکی جیاواز بۆ خەستکردنەوەی هەڵم بۆ ئەوەی ئەو سلیندەرەی کە پیستۆنەکەی تێدابوو بە بەردەوامی بەگەرمی بمێنێتەوە، لە بری ئەوەی گەرمبکرێتەوە و

ساردبکرێتەوە. ئەو دواتر چەندین ئایدیای تری پەرەپێدا، لەوانە پەرەپێدانی شێوازێکی زۆر کارا تر بۆ گۆڕینی جوولەی بزوێنەری هەڵمی بۆ هێزی بەکەڵك ودیارترتینیان سیستەمی"خۆر و هەسارەکان " بوو. لە هەموو ئەم بوارانەدا نویکاریە تەکنەلۆجییەکان لەسەر کاری پێشووتری کەسانی تر بیناکرابوون. هێندەی پەیوەندی بە بزوێنەری هەڵمیەوە هەیە، داهێنانی ئەم بزوێنەرە سوودی وەرگرتوە لە کاری پیشووتری داهێنەری ئینگلیزی تۆماس نیوکۆمن و هەروەها کاری دایۆنیسۆس پاپین کە فیزیاکار و داهێنەرێکی فەرەنسی بوو.

چیرۆکی داهێنانەکەی پاپین نموونەیەکی تری ئەوەیە کە چۆن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا، هەڕەشەی تێکدانی بنیاتنەر کۆسپی بۆ گۆڕانکاری تەکنەلۆجی دروستکرد. پاپین لە ساڵی ١٦٧٩ دا دیزاینێکی پەرەپێدا بۆ "دەفری بەهەڵمکردن" و لە ساڵی ١٦٩٠ دا پەرەی زیاتر بەم دیزاینە دا بۆ بزوێنەری پیستۆن. لە ساڵی ١٧٠٥ دا ئەو ئەم دیزاینە سەرەتاییەی بەکارهینا بۆ دروستکردنی یەکەم بەلەمی هەڵمی لە جیهان دا. پاپین لەو کاتەدا پرۆفیسۆری ماتماتیك بوو لە زانکۆی مێربۆرگ لە ویلایەتی کاسێڵی ئەڵمانی، بڕیاری دا کە بەلەمە هەڵمییەکەی لە ڕووباری فولداوە بەرێ بۆ ڕووباری وێزەر. هەر بەلەمێك ئەم گەشتەی بکردایە، دەبوایە لە شاری موندن بوەستایە. لەو سەردەمەدا هاتوچۆی ناو ڕووباری فولدا و وێزەر مۆنۆپۆڵی سەندیکایەکی خاوەن بەلەمەکان بوو. دەبێ پاپین هەستی هاتنە پێشەوەی کێشەی کردبێ، بۆیە هاوڕێ و ئامۆژگاریکاری، فیزیاکاری بەناوبانگی ئەڵمانی، گۆتفرید لایبنیز. نووسراوێکی بۆ سەرۆکی ویلایەتی کاسێڵ نووسی و تیایدا داوایکردبوو کە پاپین ڕێگای پێبدرێ لە کاسێڵ "... بەبێ گێچەڵ تێپەڕێ ..." لەگەڵ ئەوەش دا، داواکارییەکەی لایبنیز ڕەتکرایەوە و وەڵامێکی کورت و ڕەقی پێگەیشت کە " ڕاوێکارانی هەڵبژاردن کێشەی گەورەیان هەیە بۆ پەسەندکردنی داواکارییەکەی سەرەوە و بێئەوەی هۆکارەکانیان ڕوونبکەنەوە، منیان ڕاسپاردوە تا بڕیارەکەی ئەوانت پێبگەیەنم، بۆیە ناتوانرێ داواکاریەکەت لە لایەن پایەبەرز سەرۆکی ڕاوێژکارانەوە جێبەجێبکرێ" بە هەرحاڵ پاپین گوێی نەدایە وەڵامەکە و بڕیاری دا گەشتەکە بکا. کاتێك بەلەمە هەڵمییەکەی گەیشتە مۆندن، سەندیکای خاوەن بەلەمەکان لەسەرەتادا هەوڵی دا دادوەرێکی ناوچەکە بڕیاری گلدانەوەی بەلەمەکەی دەربکا، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. دواتر خاوەن

بەلەمەکان چوونە ناو بەلەمەکەی پاپین و بەلەمەکەی و بزوێنەرە هەڵمییەکەیان پارچە پارچە کرد. پاپین بە هەژاری مرد و لە قەبرێکی بێ ناونیشان دا نێژرا. لە ئینگلتەرەی ستوارت و تیودۆرەکان دا، ڕەنگە پاپین تووشی هەمان مامەڵەی دوژمنکارانە ببوایەتەوە، بەڵام ئەمە هەمووی لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە گۆڕا. لە ڕاستیدا، پاپین نیازی وابوو کە، بەر لە تێشکاندنی، بەلەمەکەی بەرەو لەندەن بهاژوێ.

لە میتالۆرجی (کانزاناسی) دا، هاوبەشی سەرەکی لە ساڵی ١٧٨٠ دا لە لایەن هێنری کۆرت پێشکەشکرا، کاتێك تەکنیکی نوێی هێنایەئاراوە بۆ چارەسەرکردنی خەوشەکانی ناو ئاسن و بەوە هۆی بەرهەمهێنانی ئاسنی کوالیتی زۆر باشتر. ئەمەش گرنگ بوو بۆ دروستکردنی پارچەی ئامێرەکان و بزمار و کەرەسەکان. نوێکارییەکانی ئەبرەهام داربی و کوڕەکانی لە ساڵی ١٧٠٩ دا بۆ بەکارهێنانی خەڵوزی بەردین بۆ توانەوەی ئاسن، ڕێگای خۆشکرد بۆ بەرهەمهێنانی ئاسن بە بڕی زۆر و بەهۆی بەکارهێنانی تەکنیەکەکانی کۆرت. ئەم پرۆسەیە لە ساڵی ١٧٦٢ دا بەهێزتر کرا لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێزی ئاوەوە لە لایەن جۆن سمیتۆن بۆ کارپێکردنی سلینەدەری فولیکار بۆ دروستکردنی خەڵوزی کۆك. دوای ئەمە خەڵوز بۆ بەرهەمێنانی ئاسن کاری پێنەکرا و لە لایەن خەڵووزی بەردینەوە جێگەیگیرایەوە کە زۆر هەرزانتر و باشتریش دەسدەکەوت.

هەرچەندە نوێکاری، بێگومان، پرۆسەیەکی لەسەر یەك کەڵەکەبوە، بەڵام لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەم دا تینوگوڕی دیاریکراوی بەخۆوە بینی. ئەمەش لە هیچ بوارێك دا هێندەی بەرهەمهێنانی قوماش دیارنەبوو. کاری هەرە بنەڕەتی بەرهەمهێنانی قوماش ڕستنە. کە بریتییە لە بەکارهێنانی فایبەری ئاژەڵی یان ڕوەکی وەك خوری و لۆکە و پێکەوە بادانیان بۆ دروستکردنی بەن یان دەزوو. ئەوانیش دەچنرێن و قوماشیان لێدروستدەکرێ. یەکێك لە نوێکارییە تەکنەلۆجییە شکۆدارەکانی چاخەکانی ناوەڕاست بریتیبوو لە چەرخی ڕستن کە جێگەی ڕستنی دەستی گرتەوە. ئەم داهێنانە لە دەوری ساڵی ١٢٨٠ لە ئەوروپادا دەرکەوت، کە ڕەنگە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە بڵاوبووبێتەوە. شێوازەکانی ڕستن تا سەدەی هەژدەیەم گۆڕانکارییان بەسەردا نەهات. نوێکاری گرنگ لە ساڵی ١٧٣٨ دا ئەنجامدرا کاتێك لویس پۆل مافی

داهێنانی شێوازێکی نوێی ڕستنی پێدرا بە بەکارهێنانی بەکرە بۆ جێگرتنـەوەی دەستەکانی مرۆڤ بـۆ ڕاکێشانی ئـەو تاڵاتـەی دەڕێسران. ئامێرەکـە بـە باشـی کارینـەکرد و نوێکارییەکـەی ڕیـچارد ئارکرایـت و جـەیمس هـارگریڤس بـوو کـە بەڕاستی شۆڕشی لە بواری ڕستن دا بەرپاکرد.

لە ساڵی ١٧٦٩ دا ئارکرایت، کە کەسایەتییەکی دیاری شۆڕشی پیشەسازی بوو، مافی داهێنانی، بۆ "ئامێری ئاو" وەرگرت کە بەرەوپێشبردنێکی گـەورەی بواری ڕستن بوو لەچاو ئامێرەکەی پۆڵ دا. ئـەو هاوبەشیەکی لەگـەڵ جێدێـدیا ستروت و ساموێل نید پیکهێنا کە دروستکاری گۆرەوی بـوون. لـە سـاڵی ١٧٧١ دا پێکەوە یەکێك لە یەکەم کارگەکانی جیهانیان لە کرۆمفۆرد دامەزراند. ئامێرە نوێکـەیان بـە ئـاو کاریـان دەکـرد، بـەڵام دواتـر ئارکرایـت گۆڕانکـاری گرنگـی ئەنجامـداو هێـزی ئـاوی گـۆڕی بـۆ هێـزی هـەڵم. بـە هـاتنی سـاڵی ١٧٧٤، کۆمپانیاکەی شەش سەد کەسی خستە کار و بە خێراییش فراوان بوو، کارگـەی لـە مانچێـستەر و مـاتلۆك و بـاس و نیـولانراك لـە سـکۆتلەندە دامەزرانـد. نوێکارییەکانی ئارکرایت لە ڕێگەی داهێنانی "سپینینگ جێنی" هارگرەیڤس لـە سـاڵی ١٧٦٤ دا بـەهێزکران کـە لـە لایـەن سـاموێل کرۆمپتـۆن لـە سـاڵی ١٧٧٩ پەرەی زیاتریان پێدرا بـۆ "مـوڵ" و دواتـریش لـە لایـەن ڕیـچارد ڕۆبـەرتس بـۆ "موڵی خۆبزوێن". کاریگەریی ئەم نوێکارییانە بەڕاسـتی شۆڕشـگێڕانە بـوو: لـە سەرەتای سەدەکە دا، ڕستنی سەد پاوەند لۆکە پێویـستی بـە ٥٠,٠٠٠ کاتـژمێر کاری چنەرانی دەستی هەبوو. ئامێرە ئاوەکەی ئارکرایت دەیتوانی ئەم کارە لە ٣٠٠ کاتــژمێردا ئەنجامبــدا و مــوڵی خــۆبزوێن دەیتــوانی لــە ١٣٥ کاتــژمێردا ئەنجامیبدا.

شانبەشانی بەئامێرکردنی ڕستن، بەئامێرکردنی جۆلایی هاتـەئاراوە. یەکـەم هەنگاوی گرنگ بریتیبوو لە داهێنانی "فلاینگ شەتڵ" لە لایـەن جـۆن کـەی لـە ساڵی ١٧٣٣. هەرچەندە لەسەرەتادا تەنیا بەرهەمداریی جۆلایی دەسـتیی زیـاد کرد، بەڵام کاریگەریی درێژخایەنی بریتیبوو لە ڕێگاخۆشکردن بۆ بە ئامێرکردنی جۆلایی. بە پشتبەستن بە فلاینگ شـەتڵ، ئێدمۆنـد کارترایـت لـە سـاڵی ١٧٨٥ پاوەر لوومی دروستکرد، کـە هـەنگاوی یەکـەمی زنجیرەیـەك نوێکـاری بـوو کـە بوونە هۆی ئەوەی ئامێرەکان جێگای کاری دەستی بگرنەوە لە جـۆلاییکردن دا هەروەك لە بواری ڕستن دا ئەنجامدرابوو.

پیــشەسازی قوماشــی ئینگلیــزی نــەك تــەنیا هێــزی پاڵنــەری شۆڕشــی پیــشەسازی بــوو، بــەڵکو شۆڕشــی لــە ئــابووری جیهــان دا بــەرپاکرد. کــاڵای هەناردەی ئینگلیزی، لە پێش هەمووشیانەوە قوماشی لۆکە لـە نێـوان سـاڵانی ١٧٨٠ و ١٨٠٠ بوە دوو هێندە. گەشەکردن لەم کەرتە دا بوو هەموو ئابووری بە دوای خۆیدا ڕاکێشا. پێکـەوە کـارکردنی نوێکـاری تەکنـەلۆجی و ڕێکخراوەیـی، مۆدێلی پێشکەوتنی ئابووری دەستەبەرکرد و ئـاڵوگۆڕی لـە ئـابووری جیهـان دا هێنایەئاراوە کە دواتر دەوڵەمەندبوو.

خەڵکی نوێ بە ئایدیای نوێوە گرنگ بوون بۆ ئەم ئاڵوگۆڕە لـە ئـابووری دا. بیر لە نوێکاری لە بواری گواستنەوە دا بکەرەوە. چـەندین شـەپۆل لـەم جـۆرە نوێکارییانــە لــە ئینگلتــەرە دا ســەریانهەڵدا: یەکــەم لــە کــەناڵ دا و دوەم لــە ڕێگاوبان دا و لە کۆتاییشدا لە بواری ڕێگای ئاسنین دا. لە هەریەك لەم شـەپۆلە نوێکارییانەدا، نوێکارەکان کەسانی نوێ بوون. کەناڵ لە دوای ساڵی ١٧٧٠ ەوە دەستی بە پەرەسەندنکرد و بە هاتنی ساڵی ١٨١٠ ئەم کەناڵانە زۆربـەی ناوچـە گرنگــە خــاوەن پیــشەسازییەکانیان بــە یەکەوەبەســتەوە. کاتێــك شۆڕشــی پیــشەسازی ســەریهەڵدا، کەناڵــەکان ڕۆڵــی گــەورەیان بینــی لــە کەمکردنــەوەی تێچووی گواستنەوەی کاڵا پیشەسازییە نوێیە دروستکراوەکانی وەکـو قوماشـی لۆکـە و ئــەو کەرەســانەی کــە بــۆ دروســتکردنی ئــەو کاڵایانــە پێویــست بــوون بەتایبــەتی لۆکــەی خــاو و خــەڵووزی بــەردین بــۆ کــارپێکردنی بزوێنــەرە هەڵمییەکان. نوێکارانی سەرەتا لە دروستکردنی کەناڵ دا پیاوانی وەك جەیمس برینــدلی بــوون، کــە کــاری بــۆ دۆق بریجۆتــەر دەکــرد، کــەناڵی بریجۆتــەریان دروستکرد کە بوە هۆی پێکەوە بەستنەوەی شاری پیشەسازی مانچێستەر بـە مینــای لیڤــەرپول. برینــدلی کــە لــە ناوچــە گوندنــشینەکانی داربەشــێر دا لــە دایکبووبوو بە پیشە وەستای دروستکردنی کەلوپەلی ئاش بوو. نێوبانگی ئەو بۆ دۆزینەوەی چارەسەری خوڵقینــەر بـۆ گرفتـە ئەندازیارییـەکان سـەرنجی دۆقـی ڕاکێــشا. ئــەو ئــەزموونی پێــشتری لــە گرفتــەکانی گواســتنەوە دا نــەبوو، بەهەمانشێوەی ئەندازیارە شـکۆدارەکانی بـواری دیزاینـی کـەناڵی وەك تۆمـاس تێڵفۆرد کە وەك بەردتاش یان جۆن سمیتۆن وەك دروستکاری ئامێر و ئەندازیار ژیانی دەسپێکرد

هــەروەك چــۆن ئەنــدازیارە مەزنــەکانی کــەناڵ پەیوەنــدی پێــشتریان بــە

گواستنەوەوە نەبوە، بە هەمانشێوەش ئەندازیارە مەزنەکانی ڕێگاوبان و ڕێگای ئاسنین پەیوەندییان بەم بوارانەوە نەبوە. جۆن ماکدام کە لە ساڵی ١٨١٦ دا تارماکی داهێنا، کوڕی دوەمی ئەریستۆکراتێکی بچووك بوو. یەکەم شەمەنەفەری هەڵمی لە ساڵی ١٨٠٤ دا لە لایەن ڕیچارد ترێڤیسیك دروستکرا. باوکی ترێڤیسیك خەریکی کاری کان بوو لە کۆرنوێڵ و ڕیچارد لە سەرەتای تەمەنی دا دەستی بە هەمان کار کرد و سەرسام بوو بەو بزوێنەرە هەڵمییانەی بۆ دەرهێنانی ئاوی کانەکان بەکاردەهێنران. لەوانەش گرنگتر، داهێنانەکانی جۆرج ستیفنسەن بوو کە کوڕی دایك و باوکێکی نەخوێندەوار و داهێنەری شەمەنەفەری بەناوبانگ "زە ڕۆکێ بوو" کە وەك ئیشپێکەری بزوێنەری هەڵمی لە کانێك دا کاریدەکرد.

دیسانەوە پیاوانی نوێ بوون کە پیشەسازی قوماشی لۆکەیان بەرەوپێشبرد. هەندێك لە پێشەنگەکانی ئەم پیشەسازییە نوێیە کەسانێك بوون کە پێشتر بە قورسی بەشدار بوون لە بەرهەمهێنان و بازرگانی پۆشاکی خوری دا. بۆ نموونە، جۆن فۆستەر لەو دەمەدا کە پیشەسازی خوری گۆڕی بۆ پیشەسازی لۆکە کاری بە حەوت سەد چنەر دەکرد و لە ساڵی ١٨٣٥ ئاشی (بلاك دایك)ی کردەوە. بەڵام پیاوانی وەك فۆستەر کەمینە بوون. تەنیا یەك لەسەر پێنجی ئەوانەی لەم سەردەمەدا خاوەن پیشەسازییە دیارەکان بوون پێشتر بەشداری چالاکییەکی پیشەکارییان کردبوو. ئەمەش جێگەی سەرسوڕمان نییە. پیشەسازی لۆکە لە شارە تازەکانی باکووری ئینگلتەرە دا پەرەیسەند. کارگەکان شێوازێکی نوێی تەواو جیاوازی ڕێکخستنی بەرهەمهێنان بوون. پیشەسازی خوری بە شێوازیکی تەواو جیاواز ڕێکخرابوو لە ڕێگەی پێدانی کەرەسە بە خەڵك لە ماڵەکانیان دا کە بۆخۆیان خوریەکەیان دەڕست و تەوندەکرد. بۆیە زۆربەی ئەوانەی لە پیشەسازی خوری دا کاریان دەکرد هێندە شارەزا نەبوون کە بتوانن پیشەکانیان بگۆڕن بۆ پیشەسازی لۆکە بەو شێوەیەی فۆستەر کردی. کەسانی نوێ پێویست بوون بۆ پەرەپێدان و بەکارهێنانی تەکنەلۆجییە نوێکان. فراوانبوونی خێرای پیشەسازی لۆکە جێگەی بە پیشەسازی خوری لێژکرد - تێکدانی بنیاتنەر لە گەرمەی کاردا.

تێکدانی بنیاتنەر تەنیا داهات و سامان دابەشناکاتەوە، بەڵکو دەسەڵاتی سیاسیش دابەشدەکاتەوە هەروەك ولیام لی بۆیدەرکەوت کاتێك بینی دەسەڵاتداران بەو ئەندازەیە ئامادە نەبوون پێشوازی لە داهێنانەکەی بکەن

چونکە ئەوان لە ئاکامی سیاسی داهێنانەکەی دەترسان. کاتێك ئابووری پیشەسازی لە مانچیستەر و بێرمەنگهام فراوان بوو، خاوەنی کارگە نوێکان و گروپانی چینی ناوەڕاست کە لە دەوری ئەو کارگانە پەیدابوون کەوتنە نارەزایی دەربڕین بەرامبەر زەوتکردنی مافەکانیان و ئەو پۆلیسییانەی حکومەت کە دژی بەرژەوەندییەکانی ئەوان بوون. ئامانجی سەرەکی نارەزاییەکان بریتیبوو لە یاساکانی گەنمەشامی کە هاوردەکردنی گەنمەشامی - هەموو جۆرە خەلە و دانەویڵەیەك، بەتایبەتی گەنمی، قەدەخە کردبوو ئەگەر نرخی ئەمانە زۆر نزم بۆوە، بەمەش هێشتنەوەی قازانجی خاوەن زەوییە گەورەکانی بە بەرزی مسۆگەرکردبوو. پۆلیسییەکە بۆ خاوەن زەوییە گەورەکان زۆر باش بوو کە گەنمیان بەرهەمدەهێنا بەڵام بۆ سەنعەتکاران خراپبوو چونکە دەبوایە کرێی زیاتریان بدایە تا قەرەبووی نرخی بەرزی نانی بکردایەتەوە.

بە چڕبوونەوەی کرێکاران لە کارگە نوێکان و ناوەندە پیشەسازییەکان دا، کاری ڕێکخستن و نانەوەی ئاژاوە ئاسانتر بوو. بە هاتنی ساڵی ١٨٢٠ ەکان، پشتگوێخستنی پیشەکارانی نوێ و ناوەندە پیشەییەکان لە ڕووی سیاسییەوە، ئیتر تەحەمولنەدەکرا. لە ١٦ ئابی ساڵی ١٨١٩ دا، پلاندانرا بۆ ئەنجامدانی گردبوونەوەیەك لە سەینت پیتەرەس فیڵد لە مانچێستەر بۆ نارەزایی دەربڕین بەرامبەر سیستەمی سیاسی و پۆلیسیەکانی حکومەت. ڕێکخەری گردبوونەوەکە جۆزێف جۆنسۆن بوو کە پیشەکارێکی لۆکاڵی فلچە و یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی ڕۆژنامەی ڕادیکاڵی مانچێستەر ئۆبزێرڤەر. شەست هەزار کەسی نارازی کۆبوونەوە، لافیتەی جیاواز لە لایەن بەشداربوانەوە بەرز کرانەوە، لافیتەی وەکو " نەخێر بۆ یاسای گەنمەشامی" و "مافی دەنگدانی گشتی" و " دەنگدان لە ڕێگای دەنگدانی نهێنییەوە" (واتا پێویستە دەنگدان بەنهێنی بێ نەك بە ئاشکرا وەك لە ساڵی ١٨١٩ دا ئەنجامدرا). دەسەڵاتداران زۆر نیگەرانبوون بەرامبەر بە گردبوونەوەکە و هێزێکی سوارەی شەش سەد کەسی لە هێزی سوارەی پازدەیەم هێنرایە شوێنی گردبوونەوەکە. کاتێك ووتارەکان دەستیان پێکرد، دادوەرێکی ناوخۆیی فەرمانی دەسگیرکردنی ووتاربێژەکانی دەرکرد. کاتێك پۆلیس هەوڵی دا فەرمانەکە جێبەجێبکا، تووشی بەرهەڵستی ئامادەبوان بوونەوە و شەڕ دەستیپێکرد. لەم کاتەدا پۆلیس هێرشیانکردە سەر ئامادەبوان و لە ماوەی چەند خولەکێکی پڕ هەرادا یازدە کەس مردن و نزیکەی شەش سەد کەسیش بریندار بوون. ڕۆژنامەی مانچێستەر ئۆبزێرڤەر بە

کوشتاری پیتەرلوو ناوبرد.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە دەزگا ئابووری و سیاسییەکان دا هاتبوونەئاراوە، سەرکوتکردنی درێژخایەن چارەسەر نەبوو لە ئینگلتەرەدا. کوشتاری پیتەرلوو وەك ڕووداوێکی دابڕاو مایەوە. دوای ئەو ئاژاوەیە، دەزگا سیاسییەکانی ئینگلتەرە ملیان بۆ گوشار و هەڕەشەی ناسەقامگیریی و نائارامی فراوانتری کۆمەڵگا، دا، بەتایبەتی لە دوای شۆڕشی ساڵی ١٨٣٠ لە فەرەنسا دژی چارڵسی دەیەم کە هەوڵی گێڕانەوەی ڕژێمی ڕەهایی دەدا کە لە لایەن شۆڕشی فەڕەنسای ساڵی ١٧٨٩ لەناوبرابوو. لە ساڵی ١٨٣٢ دا حکومەت یەکەم یاسای چاکسازی دەرکرد. مافی دەنگدانی دا بە بێرمەنگهام و لیدز و مانچێستەر و شیفیلد و بنکەی دەنگدانی فراوانکرد بۆ ئەوەی پیشەکاران بتوانن نوێنەریان لە ناو پەرلەمان دا هەبێ. ئاکامی ئەم شیفتە لە دەسەڵاتی سیاسی دا پۆلیسی بەو ئاڕاستەیەدا برد کە ئەو بەرژەوەندییە نوێیانەی لە پەرلەمان دا نوێنەرایەتییان دەکرا مەبەستیان بوو. لە ساڵی ١٨٤٦ دا توانیان یاسا قێزەونەکانی گەنمەشامی هەڵبوەشێننەوە، ئەمەش دیسانەوە نیشاندەری ئەوە بوو کە تێکدانی بنیاتنەر نەك تەنیا مانای دابەشکردنەوەی داهات بوو، بەڵکو مانای دابەشکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسیش بوو. بە شێوەیەکی سروشتی گۆڕانکاری لە دابەشکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی دا بە تێپەڕبوونی کات دەبێتە هۆی دابەشکردنەوەی زیاتری داهات. ئەوە سروشتی کراوەی دەزگایانی ئینگلیزی بوو کە بواری بۆ ئەنجامدانی ئەم پرۆسەیە ڕەخساند. ئەوانەی لە ئەنجامی پرۆسەی تێکدانی بنیاتنەردا تووشی زیان بوون، چیتر نەیانتوانی ئەو پرۆسەیە بوەستێنن.

## بۆچی لە ئینگلتەرەدا؟

شۆڕشی پیشەسازی لە ئینگلتەرە دا دەستیپێکرد و گەورەترین هەنگاوەکانی لەو وڵاتەدا نا لەبەر بوونی دەزگایانی ئابووری کراوەی بێوێنە. ئەم دەزگا ئابوورییە کراوانەش لە سەر بناخەی دەزگایانی سیاسی کراوە دامەزران کە شۆڕشی شکۆدار هێنانیەئاراوە. ئەوە شۆڕشی شکۆدار بوو کە مافی موڵکداری بەهێزکرد و خستیە قاڵبێکی گونجاو و بازاڕەکانی دارایی

ڕێکخست و مۆنۆپۆلی بازرگانی دەرەوەی لە لایەن دەوڵەتەوە لاوازکرد و کۆسپەکانی بەردەم فراوانبوونی پیشەسازی لابرد. ئەوە شۆڕشی شکۆدار بوو کە بوە هۆی ئەوەی سیستەمی سیاسی کراوە و وەڵامدەرەوەی داخوازی و پێویستیە ئابوورییەکانی کۆمەڵگا بێ. ئەم دەزگا ئابوورییە کراوانە دەرفەت و هاندانی دایە کەسانی خاوەن بەهرە و خاوەن دیدی وەك جەیمس وات تا بەهرە و ئایدیاکانیان پەرەپێبدەن و کاریکەنە سەر سیستەمەکە بەشێوەیەك بۆخۆیان و بۆ نەتەوەکەیان بەکەڵك بن. سروشتی یە کە کاتێك ئەم پیاوانە سەرکەوتن، هەمان ئارەزووی کەسانی تریان هەبێ. ویستیان ڕێگەی خەڵکی تر بگرن بێنە ناو بزنسەکانیانەوە و ڕکابەرییان لەگەڵ دا بکەن و لە پرۆسەی تێکدانی بنیاتنەر دەترسان کە لەوانەبوو بزنسەکانیان لە چنگ دەربێنێ هەروەك چۆن ئەوانیش خەڵکی تریان بێکار و مایەپووچ کردبوو. بەڵام ئەم ڕێگەگرتنە لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە زەحمەت تر بوو. ڕیچارد ئارکرایت مافی پاراستنی داهێنانی وەرگرت بەو هیوایەی ئەمە مافی مۆنۆپۆلیکردنی پیشەسازی ڕستنی لۆکە، کە بە خێرایی فراوان دەبوو، لە داهاتوودا بەو دەبەخشێ. ئەو نەیتوانی بڕیاری دادگا بۆ جێبەجێکردنی ئەم خواستەی بەدەستبهێنێ.

بۆچی ئەم پرۆسە ناوازەیە لە ئینگلتەرە دا دەستیپێکرد و لە سەدەی حەڤدەیەم دا سەریهەڵدا؟ بۆچی ئینگلتەرە پەرەی بە دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی دا و لە دەزگایانی چەوسێنەر دوورکەوتەوە؟ هەروەك بینیمان، پەرەسەندنە سیاسییەکانی بەر لە شۆڕشی شکۆدار لە ڕێگەی چەندین پرۆسەی هاوپەیوەندەوە داڕێژران. لە هەموویان گرنگتر ململانێی نێوان سیستەمی ڕەهایی و نەیارەکانی بوو. دەرەنجامی ئەم ململانێیە، نەك تەنیا کۆتایی بە هەوڵەکانی دامەزراندنی سیستەمی نوێ و بەهێزتری ڕەهایی لە ئینگلتەرە داهێنا، بەڵکو بوە هۆی هێزدارکردنی ئەوانەی حەزیاندەکرد دەزگاکانی کۆمەڵگا بە شێوەیەکی بنەڕەتی بگۆڕن. نەیارانی ڕەهایی هەوڵی ئەوەیان نەدا جۆرێکی جیاوازی ڕەهایی دابمەزرێنن. ئەمە بریتینەبوو لە سەرکەوتنی بنەماڵەی لانکاستەر بەسەر بنەماڵەی یۆرك دا لە جەنگی گوڵەباخەکان دا. لە بری ئەمە شۆڕشی شکۆدار بوە هۆی سەرهەڵدانی ڕژێمێکی نوێ کە لەسەر بنەمای دەستوور و پلورەلیزم دامەزرابوو.

ئەم دەرەنجامە ئاکامی لێکترازان بوو لە دەزگایانی ئینگلیزی و ئەو

شێوازەی ئەم دەزگایانە لەگەڵ وەرچەرخانە مێژووییە گرنگەکان دا کاریان لەسەر یەکترکرد. لە چاپتەری پێشووتردا بینیمان کە چۆن دەزگایانی فیودالّی لە ئەورووپای ڕۆژئاوا دا دامەزران لە دوای ڕمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمای ڕۆژئاوا. فیودالّیزم لە زۆربەی ناوچەکانی ئەورووپادا بڵاوبۆوە، لە ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات دا. بەڵام هەروەك چاپتەری چوارەم پیشانی دا، ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا لە دوای مردنی ڕەشەوە دەستیانکرد بە لێکدوورکەوتنەوە بە شێوەیەکی ڕادیکاڵی. جیاوازییە بچووکەکان لە دەزگا سیاسی و ئابوورییەکان دا مانای ئەوەبوو کە لە ڕۆژئاوا دا تەرازووی هێز بوە هۆی پێشکەوتنی دەزگایی و لە ڕۆژهەڵات بوە هۆی دواکەوتنی دەزگایی. بەڵام ئەمە ڕێچکەیەك نەبوو کە هەر دەبوایە بەرەو دەزگایانی کراوە بڕوات. دەبوایە لەو ڕێگایەدا چەندین هەورازی گرنگی تر ببڕایە. هەرچەندە ماگنا کارتا هەوڵی دا هەندێك بناخەی گرنگی دەزگایی بۆ حوکمی دەستووری دابمەزرێنێ، بەڵام چەندین ناوچەی تری ئەورووپا تەنانەت ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیش تێکۆشانی هاوشێوەی لەگەڵ دۆکیومێنتی هاوشێوەدا بەخۆوە بینی. لەگەڵ ئەوەش دا لە دوای مردنی ڕەش ئەورووپای ڕۆژئاوا بە شێوەیەکی بەرچاو لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات ترازا. لە کاتێك دا دۆکیومێنتەکانی هاوشێوەی ماگنا کارتا دەستیانکرد بە نواندنی کاریگەری زیاتر لە ڕۆژئاوا دا، لە ڕۆژهەڵات دا مانایەکی ئەوتۆیان نەبوو. لە ئینگلتەرە دا، تەنانەت بەر لە ململانێکانی سەدەی حەڤدەیەم، نەریتێك لە ئارادا بوو کە پاشا نەیدەتوانی بەبێ ڕەزامەندی پەرلەمان باجی نوێ دابنێ. ترازانی هێواش و بەرەبەرەی دەسەڵات لە نوخبەکانەوە بۆ هاوڵاتییان بە شێوەیەکی گشتی، گرنگی لەوانی تر کەمتر نەبوو، هەروەك لە خرۆشانی سیاسی کۆمەڵگا گوندنشیەنەکان دا دەرکەوت و لە ئینگلتەرە دا بە جۆشوخرۆشێکی وەك ڕاپەڕینی ڕەنجدەرانی ساڵی ١٣٨١ خۆینواند.

لێکترازانی دەزگاکان لەگەڵ وەرچەرخانێکی مێژوویی تردا کاریان لە یەکترکرد کە بەهۆی فراوانبوونی گەورەی بازرگانی ناو زەریای ئەتڵەسی هاتەئاراوە. هەروەك لە چاپتەری چوارەم دا بینیمان، ڕێگایەکی گرنگ کە بەهۆیەوە ئەم بازرگانییە کاری لەسەر داینەمیکی دەزگایی دواتر کرد پەیوەست بوو بەوەی کە ئایا پاشا دەیتوانی ئەم بازرگانییە قۆرخ بکا یان نا. لە ئینگلتەرە دا، دەسەڵاتی تا ڕادەیەك زیاتری پەرلەمان مانای ئەوەبوو کە

پاشاکانی تیۆدۆر و ستوارتەکان نەیاندەتوانی ئەمە بکەن. ئەمەش چینێکی نوێی بازرگانان و بزنسمانانی دروستکرد کە شێلگیرانە دژی دامەزراندنی ڕەهایی بوون لە ئینگلتەرە دا. بۆ نموونە، بە هاتنی ساڵی ١٦٨٦، لە لەندەن دا ٧٠٢ بازرگان هەبوون کە کاڵایان بۆ کاریبی هەناردەدەکرد و ١,٢٨٣ بازرگان خەریکی بازرگانی هاوردەکردن بوون. باکووری ئەمەریکا ٦٩١ بازرگانی هەناردەکردن و ٦٢٦ بازرگانی هاوردەکرنی هەبوو. ئەوانە کرێکاری کۆگا و دەریاوان و کاپتن و کرێکارانی میناکان و کاتب یان هەبوو کە بەرژەوەندی هەموویان بە شێوەیەکی گشتی هاوبەش بوون لەگەڵ بەرژەوەندی بازرگانەکان دا. مینا زیندوەکانی تری وەك بریستۆڵ و لیڤەرپوڵ و پۆرتسمیس بەهەمانشێوە پڕبوون لەم بازرگانانە. ئەم پیاوە تازانە داوای دەزگایانی ئابووری جیاوزاییان دەکرد و دەویست و کاتێکیش لە ڕێگەی بازرگانییەوە دەوڵەمەند تر بوون، دەسەڵاتی زیاتریان پەیداکرد. هەمان ئەو هێزانە لە فەڕەنسا و ئیسپانیا و پورتوگالیش دا لەکاردا بوون، بەڵام لەو وڵاتانەدا پاشاکانیان توانایان زیاتر بوو بۆ کۆنترۆڵکردنی بازرگانی و قازانجی ئەو بازرگانییانە. هەمان ئەو گروپانەی لە ئینگلتەرە دا پەیدابوون، لەو وڵاتانەش دا سەریانهەڵدا، بەڵام زۆر بچووکتر و لاواز تر بوون.

کاتێك لە ساڵی١٦٤٢ دا پەرلەمانی ماوەدرێژ کۆبۆوە و جەنگی ناوخۆ دەستیپێکرد، ئەم بازرگانانە بوونە لایەنگری داخوازییەکانی پەرلەمان. لە ساڵی ١٦٧٠ دا ئەوان بەشداری کاریگەرانەی دامەزراندنی حیزبی ویگ یان کرد بۆ بەرهەڵستیکردنی ڕەهایی ستوارتەکان و لە ساڵی ١٦٨٨ دا هەر ئەوان ڕۆڵی سەرەکیان لە لابردنی جەیمسی دوەم دا بینی. کەواتە فراوانبوونی دەرفەتە بازرگانییەکان کە بازرگانی لەگەڵ هەردوو ئەمەریکا هێنایەئاراوە و بەشداربوونی بە کۆمەڵی بازرگانانی ئینگلیز لەم بازرگانییەدا و پەرەسەندنی ئابووری کۆلۆنییەکان و ئەو سامانەی لەم پرۆسانەدا دەستیانکەوتن، تەرازووی هێزی لە مللانێی نێوان پاشایەتی و ئەوانەی دژی ڕەهایی بوون گۆڕی لە بەرژەوەندی ئەوانەی دژی ڕەهایی بوون.

لە هەمووشی گرنگتر، دەرکەوتن و هێزدارکردنی بەرژەوەندییە جیاوازەکان - هەر لە زەویدارە گەورەکان، کە چینێکی جووتیاری بازرگان بوون و لەسەردەمی تیۆدۆرەکان دا پەیدابووبوون تا دەگاتە جۆرە جیاوازەکانی

سەنعەتکاران و بازرگانانی ئەتڵەسی ـ ئەوەی دەگەیاند کە هاوپەیمانی دژی سیستەمی ڕەهایی ستوارتەکان نەك تەنیا بەهێز بوو، بەڵکو فراوانیش بوو. ئەم هاوپەیمانییە بە پێکهێنانی حیزبی ویگ لەساڵی ١٦٧٠ دا هێزی زیاتری پەیداکرد کە بووە هۆی ڕەخساندنی ڕێکخراوێك بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان. هێزدارکردنی ئەم بەرژەوەندییانە بوو کە ڕیشەی پلورەلیزمی لە دوای شۆڕشی شکۆدار داکوتا. ئەگەر هەموو ئەم تێکۆشانانە دژی ستوارتەکان خاوەن هەمان بەرژەوەندی و هەمان باکگراوند بوونایە، ئەوا لە ناوبردنی پاشایەتی ستوارتەکان لەوانە بوو کە دووبارەکردنەوەی ململانێکانی نێوان بنەماڵەکانی لانکاستەر و یۆرك بوایە و شەڕی بەرژەوەندی تەسکی گروپێك بوایە دژی بەرژەوەندی گروپێکی تر و لە ئەنجامیشدا هەمان بان دەزگایانی جیاوازی چەوسێنەر دابمەزرانایە و جێگەی ئەوانەی کۆنی گرتایەوە. هاوپەیمانی فراوان مانای ئەوە بوو کە داخوازی زیاتر لە ئارادا بوو بۆ پێکەوەنانی دزگایانی سیاسی پلورەلیستی. بەبێ جۆرێك لە پلورەلیزم، ئەو مەترسییە هەبوو کە یەکێك لە بەرژەوەندییە جیاوازەکان لە سەر حسابی ئەوانی تر دەسەڵات زەوتبکا. ئەو ڕاستییەی کە پەرلەمان لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە نوێنەرایەتی ئەم جۆرە هاوپەیمانییەی دەکرد فاکتەری گرنگ بوون بۆ ئەوەی ئەندامانی پەرلەمان گوێ بۆ داخوازییەکانی خەلك بگرن تەنانەت ئەگەر ئەو داخوازییانە لە خەڵکانی دەرەوەی پەرلەمان و تەنانەت ئەوانەی کە مافی دەنگدانیان نەبوو سەرچاوەیان بگرتایە. ئەمەش فاکتەرێکی گرنگی ڕێگرتن بوو لە هەوڵەکانی گروپێك بۆ دامەزراندنی مۆنۆپۆلی لەسەر حسابی ئەوانی تر، هەروەك پیشەسازی خوری ویستی بیکات بەر لە دەرچوونی یاسای مانچێستەر.

شۆڕشی شکۆدار ڕووداوێکی چارەنوس ساز بوو لەبەر ئەوەی لە لایەن هاوپەیمانییەکی فراوانی متماسك، بەخۆوە سەرکردایەتیکرا و ئەم هاوپەیمانییەشی هێزدارتر کرد و توانی ڕژێمێکی دەستووری دابمەزرێنێ کە سنووری بۆ دەسەڵاتی جێبەجێکردن و بە هەمانشێوەش گرنگ دەسەڵاتی هەریەك لە ئەندامەکانی دانا. بۆ نموونە، ئەو سنووردارییە بوو کە ڕێگر بوو لەبەردەم سەنعەتکارانی خوری دا تا بتوانن ڕکابەریی لە لایەن سەنعەتکارانی لۆکە و فوستیان تێبشکێنن. بۆیە ئەم هاوپەیمانییە فراوانە گرنگ بوو بۆ دامەزراندنی پەرلەمانێکی بەهێز لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە و لە هەمانکات دا ئەم

هاوپەیمانییە فراوانە مانای ئەوە بوو کە لە ناو خودی پەرلەمان دا چاودێری بەسەر هەریەك لە گروپەکانەوە هەبوو تا زۆر بەهێز نەبێ و دەسەڵاتی خۆی بە شێوەیەکی خراپ بەکارنەهێنێ. ئەمەش فاکتەری گرنگی سەرهەڵدانی دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی بوو. هێزدارکردنی هاوپەیمانییەکی وا فراوان دیسانەوە ڕۆڵی گرنگی بینی لە بەردەوامی و بەهێزکردنی ئەم دەزگا سیاسی و ئابوورییە کراوانەدا، هەروەك لە چاپتەری یازدەیەم دا دەبینین.

هەموو ئامانەش نەبوونە هۆی مسۆگەرکردنی سەرهەڵدانی ڕژێمێکی تەواو پلورەلیستی و سەرهەڵدانی ئەم ڕژێمە تا ڕادەیەك ئاکامی ڕێچکەی پەیوەستیی مێژوو بوو. هاوپەیمانییەك کە زۆر نامۆ نەبوو بە ڕژێمی پلورەلیستی لە دوای جەنگی ناوخۆی ئینگلتەرەدا دژی ستوارتەکان سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەڵام ئەمە تەنیا بوە هۆی سەرهەڵدانی دیکتاتۆریەتی ئۆلیڤەر کرۆموێڵ. بەهێزیی ئەم هاوپەیمانییەش گەرەنتی نەبوو بۆ ئەوەی سیستەمی ڕەهایی شکستبهێنێ. دەکرا جەیمسی دوەم بەسەر ولیامی ئۆرەنج دا سەربکەوێ. ڕیچکەی گۆڕانکاری گەورە، هەروەك هەمیشە، کەمتر پەیوەست نەبوو لە دەرەنجامی ململانێ سیاسییەکانی تر. ئەمە بەو شێوەیە بوو ئەگەر چی ڕێچکەی تایبەتی لێکترازانی دەزگایی کە بوە هۆی دروستکردنی هاوپەیمانی فراوان دژی ڕەهایی و ئەو وەرچەرخانە مێژووییەی بەهۆی دەرفەتی بازرگانی ئەتڵەسیەوە هاتەئاراوە کارتەکانی دژی ستوارەتەکان ڕێکخست. بۆیە لەم حاڵەتەدا، پەیوەستی و هاوپەیمانی فراوان فاکتەری بڕیاردەری پتەوکردنی سەرهەڵدانی پلورەلیزم و دەزگایانی کراوە بوون.

## ٨

# له بەردەمی ماڵەکەی من دا نا

## کۆسپەکانی بەردەم پەرەپێدان
## ڕێگە بە چاپکردن نادرێ

لە ساڵی ١٤٤٥ دا لە شاری مەینزی ئەڵمانیادا، جۆهانس گۆتەنبێرگ نوێکارییەکی خستەڕوو کە ئاکامی گرنگی بۆ مێژووی دواتری ئابووری هەبوو: چاپخانە کە لەسەر بنەمای جۆری جۆلاو دامەزرابوو. تا ئەو کاتە، کتێب دەبوایە یان لە لایەن دەسنووسەکانەوە بە دەست کۆپی بکرایە کە پرۆسەیەکی هێواش و ماندووکار بوو، یان بەشێوەی بلۆك چاپبکرایە لە ڕێگەی بەکارهێنانی پارچەی تایبەتی تەختە بۆ چاپکردنی هەر لاپەڕەیەك. کتێب کەم و درەنگ درەنگ بڵاودەکرانەوە و زۆریش گران بوون. لە دوای داهێنانەکەی گۆتەنبێرگ، شتەکان دەستیانکرد بە گۆڕان. کتێبان چاپکران و زیاتر کەوتنە بەردەست. بەبێ ئەم نوێکارییە، خوێندەواری و پەروەردەی گشتی مەحاڵ بوو.

لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا، گرنگی چاپخانە هەر زوو دەرکیپێکرا. لە ساڵی ١٤٦٠ دا، چاپخانە لەو دیو سنووری ئەڵمانیاوە، لە ستراسبۆرگی فەڕەنسادا سەریهەڵدا. لە کۆتایی ١٤٦٠ ەکان دا، تەکنەلۆجییەکە لە هەموو ئیتالیادا بڵاوبۆوە و چاپخانە لە ڕۆم و ڤێنس و ماوەیەکی کەمیش دوای ئەوە لە فلۆرەنس و میلان و تۆرین دامەزران. بە هاتنی ١٤٧٦ ویلیام کاکستۆن چاپخانەیەکی لە لەندەن دامەزراند و دوو ساڵیش دواتر یەکێکی تر لە ئۆکسفۆرد دامەزرا. لە هەمان ماوەدا، چاپکردن لە وڵاتانی نزمەوە بەرەو ئیسپانیا وتەنانەت بەرەو ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیش بڵاوبۆوە و چاپخانەیەك لە بوداپێست لە ساڵی ١٤٧٣ و ساڵێکیش دواتر لە کراکۆ دامەزران.

هەموو کەسێك وەك نوێکارییەکی خوازراو پێشوازی لە چاپکردن نەکرد. هەر

لە ساڵی ١٤٨٥ ەوە سوڵتانی عوسمانی، بایەزیدی دوەم فەرمانێکی دەرکرد بۆ قەدەخەکردنی چاپکردن بە زمانی عەرەبی لە لایەن موسڵمانانەوە. فەرمانەکە لە لایەن سوڵتان سەلیمی یەکەمەوە لە ساڵی ١٥١٥ دا زیاتر جەختی لەسەر کرایەوە. تا ساڵی ١٧٢٧ رێگە نەدرا یەکەم چاپخانە لە خاکی عوسمانییەکان دا سەرهەڵبدا. لەو ساڵەدا سوڵتان ئەحمەدی سێیەم فەرمانێکی دەرکرد بۆ مۆڵەتدان بە ئیبراهیم موتەفریکە بۆ دامەزراندنی چاپخانەیەك. تەنانەت ئەم هەنگاوە درەنگەش سنوردار کرابوو. هەرچەندە فەرمانەکە تیایدا هاتبوو (*ئەو رۆژە پرشنگدارەی پەردە لەسەر ئەم تەکنیکە رۆژئاواییە وەك بوکێك هەڵدەدرێتەوە و جارێکتر ناشاردرێتەوە*)، بەڵام چاپخانەکەی مۆتەفریکە دەبوایە لە نزیکەوە چاودێریبکرایە. لە مەرسومەکە دا هاتوە:

*(بۆ ئەوەی کتێبە چاپکراوەکان هیچ هەڵەیەکی چاپیان تێدا نەبێ، زانایانی ئاینی دانا و رێزدار و شارەزا و پسپۆڕ لە بواری شەریعەتی ئیسلامیدا، جەنابی قازی ئەستەنبوڵ مەولانا ئیسحاق و قازی سیلانیك مەولانا ساحیب و قازی گەلەتە مەولانا ئەسعەد، چاکەیان زیاد بێ، لە مەقامە ئاینییە درەوشاوەکانەوە، پایەی دروستی زانایانی ئاینی، شێخی مەولەویخانەی قاسم پاشا، مەولانا موسا، دانایی و زانیاری زیاد بێ، سەرپەرشتی هەڵەچنی کتێبەکان دەکەن).*

مۆتەفریکە مۆڵەتی دامەزراندنی چاپخانەیەکی پێدرا، بەڵام هەرچییەکی چاپدەکرد دەبوایە لە لایەن لیژنەیەکی پێکهاتوو لە سێ زانای بواری ئاین و یاسا کە قازی بوون پشکنینی بۆ بکرایە. ڕەنگە دانایی و زانیاری قازییەکان، وەك هەموو کەسێکی تر، زۆر خێراتر زیادبیکردایە ئەگەر چاپخانە خێراتر دابمەزرایە. بەڵام ئەمە بەو شێوەیە نەبوو، تەنانەت دوای ئەوەشی کە مۆتەفریکە مۆڵەتی دامەزراندنی چاپخانەیەکی پێدرا.

جێگەی سەرسوڕمان نییە کە مۆتەفریکە لە کۆتایی دا تەنیا چەند کتێبێکی کەمی چاپکرد، کە بریتیبوو لە حەڤدە کتێب، هەر لە ساڵی ١٧٢٩ ەوە کە چاپخانەکە کەوتەکار تا ساڵی ١٧٤٣ کە لە کارکردن وەستا. بنەماڵەکەی هەوڵیان دا لەسەر ئەو نەریتە بەردەوامبن، بەڵام توانیان تەنیا حەوت کتێبی تر چاپبکەن تا لە ساڵی ١٧٩٧ دا بەتەواوی دەسبەرداری چاپخانەکە بوون. لە دەرەوەی ناوجەرگەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا کە تورکیا بوو، چاپکردن تەنانەت دواکەوتوو تریش بوو. بۆ نموونە، لە میسر، یەکەم چاپخانە لە ساڵی

١٧٩٨ دا لە لایەن ئەو فەڕەنسییانەوە دامەزرا کە بەشێك بوون لە هەوڵە شکستخواردوەکەی ناپلیۆن بۆناپارت بۆ داگیرکردنی وولاتەکە. هەتا نزیکەی نیوەی دوەمی سەدەی نۆزدەیەم بەرهەمهێنانی کتێب لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا بە شێوەیەکی سەرەکی لە لایەن دەسنووسەکانەوە و لە ڕێگەی کۆپیکردنەوەی ئەو کتێبانەی لە ئارادابوون ئەنجامدەدرا. مەزەندەدەکرێ کە لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەم دا هەشتا هەزار لەم جۆرە نووسەرە دەستییانە لە ئەستەنبوڵ دا کاریانکردبێ.

ئەم بەرهەڵستیکردنەی چاپخانە ئاکامی ئاشکرای بۆ خوێندەواری و پەروەردە و سەرکەوتنی ئابووری هەبوو. لە ساڵی ١٨٠٠ دا تەنیا ٢ تا ٣٪ی هاوڵاتییانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی خوێندەوار بوون، بە بەراوورد لەگەڵ ٦٠٪ی پیاوانی لاو و ٤٠٪ ئافرەتانی لاو لە ئینگلتەرە دا. لە هۆڵەندا و ئەڵمانیادا ڕێژەی خوێندەواری تەنانەت لەوەش بەرز تر بوو. وولاتانی عوسمانی زۆر لە دوای ئەو وولاتە ئەورووپیانەوە بوون کە خاوەنی نزمترین ئاستی پەروەردە بوون لەو سەردەمەدا، وولاتانی وەکو پورتوگال کە تەنیا نزیکەی ٢٠٪ لاوان دەیانتوانی بنووسن و بخوێننەوە.

بە لەبەرچاوگرتنی دەزگایانی یەکجار ڕەهاو چەوسێنەری عوسمانییەکان، دژایەتیکردنی سوڵتانەکان بۆ چاپخانە تێگەیشتنی ئاسانە. کتێب ئایدیاکان بڵاودەکاتەوە و دەبێتەهۆی ئەوەی کۆنترۆڵکردنی دانیشتوان زۆر زەحمەت تر بێ. هەندێك لەم ئایدیایانە ڕەنگە شێوازی پڕبایەخی زیادکردنی گەشەکردنی ئابووری بن، بەڵام ڕەنگە ئایدیای تر تێکدەر بن و تەحەدای بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەنووکەیی بکەن. لە هەمانکات دا کتێب دەسەڵاتی ئەوانەی کۆنترۆڵی زانیاری زارەکی دەکەن لەقدەکا چونکە هەموو ئەوانەی دەتوانن ببنە خوێندەوار دەتوانن ئەو زانیارییانە بەدەستبهێنن. ئەمەش هەڕەشەی لەقکردنی بارودۆخی هەنووکەیی دەکرد کە تیای دا نوخبەکان کۆنترۆڵی زانیارییان کردبوو. سوڵتانەکانی عوسمانی و دامەزراوە ئاینییەکە لە تێکدانی بنیاتنەر دەترسان کە دەهاتەئاراوە. چارەسەری ئەوان بۆ ڕێگرتن لەم دۆخە قەدەخەکردنی چاپکردن بوو.

شۆڕشی پیشەسازی وەرچەرخانی مێژوویی هێنایەئاراوە کە کاریگەری لەسەر نزیکەی هەموو وولاتێك هەبوو. هەندێك نەتەوەی وەك ئینگلتەرە، نەك

تەنیا بواری دا بەڵکو چالاکانە کەوتە هاندانی بازرگانی و پیشەسازی و کارزانی (entrepreneurship) و بە خێرایی گەشەیکرد. چەندین نەتەوەی تری وەك ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و چین و ڕژێمە ڕەهاکانی تر، بە دواکەوتوویی مانەوە کاتێك تەگەرەیان دروستکرد لەبەر دەم، یان بەلایەنیکەمەوە، شتێکی ئەوتۆیان نەکرد بۆ هاندانی بڵاوبوونەوەی پیشەسازی. دەزگایانی سیاسی و ئابووری شێوازی بەپیرەوەچوونیان بۆ نوێکاری تەکنەلۆجی داڕشت و جارێکیتر ڕێچکەی ئاشنای کارلەیەککردنی نێوان دەزگا هەنووکەییەکان و وەرچەرخانە مێژووییەکانیان دروستکرد کە بوە هۆی لێکدوورکەوتنەوەی دەزگاکان و دەرەنجامە ئابوورییەکان.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە ڕەهایی مایەوە تا لە کۆتایی یەکەم جەنگی جیهانی دا هەرەسیهێنا و توانی سەرکەوتوانە بەرهەڵستی یان تەگەرە بخاتە بەردەم نوێکاری لە چەشنی دانانی چاپخانە و تێکدانی بنیاتنەر کە ئەم نوێکارییانە ئەیانهێنایەئاراوە. هۆکاری ئەوەی کە ئەو گۆڕانکارییە ئابوورییانەی لە ئینگلتەرە دا ڕوویاندا و لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا ڕوویاننەدا بریتییە لە پەیوەندی سروشتی نێوان دەزگایانی سیاسی ڕەها و چەوسێنەر و دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر. ڕەهایی جۆرە فەرمانڕەواییەکە کە یاسا و ویستی کەسانی تر ناتوانن سنووری بۆ دابنێن، هەرچەندە لە واقیعدا فەرمانڕەوا ڕەهاکان بە هاوکاری هەندێك گروپی بچووك فەرمانڕەواییدەکەن. بۆ نموونە، لە ڕوسیای سەدەی نۆزدەیەم دا قەیسەرەکان فەرمانڕەوایانی ڕەها بوون و لە لایەن نۆبڵەکانەوە کە تەنیا ٪١ ی دانیشتووانیان پێکدەهێنا، پشتگیریدەکران. گروپە بچووکەکە دەزگا سیاسییەکانیان وا ڕێکخستبوو کە درێژەبدەن بە دەسەڵاتیان. پەرلەمان و نوێنەرایەتی سیاسی گروپەکانی تر لە کۆمەڵگای ڕووسی دا تا ساڵی ١٩٠٥، کە قەیسەر دۆمای دامەزراند، بوونیان نەبوو، هەر چەندە هەر زوو ئەو چەند دەسەڵاتە کەمەشی کەمکردەوە کە بە دۆمای دابوو. جێگەی سەرسوڕمان نییە کە دەزگا ئابوورییەکان چەوسێنەر بوون و وا دیزاین کرابوون تا دەکرا قەیسەر ونۆبڵەکانی دەوری دەوڵەمەند بکەن. بنەمای ئەمەش، هەروەك چەندین سیستەمی ئابووری چەوسێنەری تر، بریتیبوو لە سیستەمێکی فراوانی کۆنترۆڵکردن و ناچارکردنی هێزی کار لە شێوازی بەندایەتی تایبەت بە ڕوسیا.

ڕەهایی تەنیا جۆری دەزگایانی سیاسی نەبوو کە ڕێگر بوون لەبەردەم

بەپیشەسازیکردن دا. هەرچەندە ڕژێمە ڕەهاکان پلورەلیستی نەبوون و لە تێکدانی بنیاتنەر دەترسان، بەڵام زۆربەیان خاوەنی دەوڵەتی مەرکەزی بوون، یان بەلایەنیکەمەوە خاوەن دەوڵەتی ئەوتۆ بوون کە هێند مەرکەزی بوون بتوانن نوێکاری لە چەشنی دامەزراندنی چاپخانە قەدەغە بکەن. تەنانەت ئەمڕۆش، وولاتانی وەك ئەفغانستان و هایتی و نیپال دەوڵەتی نەتەوەیی یان هەیە کە مەرکەزیەتی سیاسیان نییە. لە وولاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا بارودۆخەکە تەنانەت خراپتریشە. هەروەك پێشتر باسمانکرد، بەبێ بوونی دەوڵەتی خاوەن مەرکەزیەت کە ئاسایش بپارێزی و یاساکان بسەپێنێ و مافی موڵکداری بپارێزێ، ناکرێ دەزگایانی کراوە سەرهەڵبدەن. لەم چاپتەرەدا دەبینین کە لە زۆربەی ناوچەکانی باشووری بیابانی ئەفریقا دا (بۆ نموونە، سۆماڵ و باشووری سودان) کۆسپی سەرەکی بەردەم بەپیشەسازیکردن بریتیبوە لە نەبوونی هیچ شێوازێکی مەرکەزیەتی سیاسی. بەبێ بوونی ئەم مەرجە سروشتیانە، بەپیشەسازیکردن هیچ دەرفەتێکی پێگرتنی نابێ.

ڕەهایی و نەبوون یان لاوازی مەرکەزیەتی سیاسی دوو کۆسپی جیاوازی بەردەم بڵاوبوونەوەی پیشەسازین. بەڵام لە هەمانکات دا پەیوەندییان پێکەوە هەیە: هەردووکیان ترس لە تێکدانی بنیاتنەر دەیانهێڵێتەوە و لەبەر ئەوەی پرۆسەی مەرکەزیەتی سیاسی زۆرجار ئارەزوو بەرە و ڕەهایی دروستدەکا. مۆتیڤی بەرهەڵستیکردنی مەرکەزیەتی سیاسی هاوشێوەی مۆتیڤی بەرهەڵستیکردنی دەزگایانی سیاسی کراوەن: ترس لە لەدەستدانی دەسەڵاتی سیاسی، ئەمجارەیان بۆ دەوڵەتە نوێیە خاوەن مەرکەزیەتەکە و ئەوانەی کۆنترۆڵی ئەم دەوڵەتە دەکەن. لە چاپتەری پێشوو تردا بینیمان کە چۆن پرۆسەی مەرکەزیەتی سیاسی لە سەردەمی پاشا تیودۆرەکانی ئینگلتەرە دا داخوازی نوخبە ناوخۆییە جیاوازەکانی بۆ بیستنی دەنگیان و نوێنەرایەتیکردنیان لە دەزگا سیاسییە نەتەوەییەکان دا زیاترکرد وەك ڕێگەیەك بۆ قەرەبووکردنەوەی لەدەستدانی دەسەڵاتی سیاسییان. پەرلەمانێکی بەهێزتر دامەزرێنرا و لە کۆتایی دا بوە هۆی سەرهەڵدانی دەزگایانی سیاسی کراوە.

بەڵام لە چەندین باری تردا، بە تەواوی پێچەوانەی ئەمە ڕوودەدا و پرۆسەی مەرکەزیەتی سیاسی لە سەردەمی ڕەهایی دا دەسپێدەکا. ئەمەش لە ڕێگەی سیستەمی ڕەهایی ڕوسیاوە ڕووندەکرێتەوە کە لە لایەن پیتەری مەزنەوە لە

نێوان ساڵانی ١٦٨٢ و مردنی دا لە ساڵی ١٧٢٥ دا دارێژرا. پیتەر پایتەختێکی نوێی لە سەینت پیتەرسبورگ دروستکرد و دەسەڵاتی لە ئەریستۆکراسی کۆن کە بۆیارەکان بوون سەندەوە بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی بیرۆکراتی مۆدێرن و سوپایەکی مۆدێرن دابمەزرێنێ. ئەو تەنانەت دومای بۆیاری هەڵوەشاندەوە کە ئەویان کردبوە قەیسەر. پیتەر خشتەی پلەکانی هێنایەئاراوە کە پلەبەندیەکی تەواو نوێی کۆمەڵایەتی بوو کە جەوهەرەکەی بریتیبوو لە خزمەتکردنی قەیسەر. ئەو هەروەها دەستیگرت بەسەر کڵێسا دا هەروەك هێنری هەشتەم کردی کاتێك دەوڵەتی کردە دەوڵەتێکی مەرکەزی لە ئینگلتەرەدا. لە ڕێگەی پرۆسەی مەرکەزیەتی سیاسییەوە، پیتەر دەسەڵاتی لە خەڵك سەندەوە و بەرەو خۆی ئاڕاستەیکرد. ڕیفۆرمە سوپاییەکانی بونە هۆی ئەوەی گاردی پاشایەتی تەقلیدی، سترێڵتسی، یاخین لێی. یاخیبوونەکەیان یاخیبوونی تری وەکو یاخیبوونی باشکیرەکان لە ناوەڕاستی ئاسیا و یاخیبوونی بوڵاڤینی بە دوادا هاتن، بەڵام هیچیان سسەرکەوتوو نەبوون.

هەرچەندە پرۆژەکەی پیتەری مەزن بۆ هێنانەئارای مەرکەزیەتی سیاسی سەرکەوتنی بەدەستهێنا و توانی بەسەر بەرهەڵستکاریی دا زاڵ بێ، بەڵام ئەو جۆرە هێزانەی دژی مەرکەزیەتی دەوڵەت بوون وەکو سترێڵتسی، کە لایانوابوو تەحەدای دەسەڵاتیان کراوە، لە چەندین ناوچەی جیهان دا سەرکەوتن و لاوازبوونی مەرکەزیەتی دەوڵەت کە لە ئەنجامی ئەمەدا هاتەئاراوە، مانای بەردەوامیی جۆری جیاوازی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر بوو.

لەم چاپتەرەدا دەبینین کە چۆن لە کاتی ئەو وەرچەرخانە مێژووییەی بەهۆی شۆڕشی پیشەسازییەوە دروستبوو، چەندین نەتەوە نەیانتوانی سواری بەلەمەکە بین و نەیانتوانی سوود لە بڵاوبوونەوەی پیشەسازی وەربگرن. یان لەبەر ئەوەی دەزگایانی سیاسی ڕەها و ئابووری چەوسێنەریان هەبوو، هەروەك لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا، یان لە بەر ئەوەی مەرکەزیەتی سیاسییان نەبوو، هەروەك سۆماڵ.

# ئەو جیاوازییە بچووکەی کە گرنگ بوو

لە سەدەی حەڤدەیەم دا ڕەهایی لە ئینگلتەرە دا هەرەسیهێنا بەڵام لە ئیسپانیا دا بەهێزتر بوو. هاوشێوەی پەرلەمانی ئینگلیزی لە ئیسپانیا دا بریتیبوو لە کۆرتیز کە تەنیا بەناو بوونی هەبوو. ئیسپانیا لە ساڵی ١٤٩٢ دامەزرا لە ئەنجامی یەکگرتنی هەردوو پاشایەتی کاستیلّ و ئاراگۆن لە ڕێگەی هاوسەرگیری ئیزابێلا شاژن و فێردیناند پاشا. ئەم ڕێکەوتە هاوکات بوو لەگەڵ کۆتایهاتنی داگیرکردنەوە، کە پرۆسەیەکی دوورودرێژی دەرکردنی عەرەبەکان بوو کە هەر لەسەدەی هەشتەمەوە باشووری ئیسپانیایان داگیرکردبوو و شارە مەزنەکانی وەك گرانادا کۆردۆڤا و سێڤیلیان دروستکردبوو. دوا دەوڵەتی عەرەب لە دوورگەی ئایبێریا کە گرانادا بوو، کەوتە دەست ئیسپانیا لە هەمان ئەو کاتەی کریستۆفەر کۆڵەمبەس گەیشتە ئەمەریکاکان و بە ناوی ئیزابێلا شاژن و فێردیناند پاشاوە دەستیگرت بەسەر زەوییەکان دا چونکە ئەوان خەرجی گەشتەکەیان دابینکردبوو.

یەکگرتنی هەردوو پاشایەتی کاستیلّ و ئاراگۆن و هاوسەرگیری نێوان بنەماڵەی فەرمانڕەوا و میراتەکان دەوڵەتێکی زلی ئەورووپییان دروستکرد. ئیزابیلا لە ساڵی ١٥٠٤ دا مرد و جوانای کچی کرایە شاژنی کاستێل. جوانا شوویکرد بە فیلیپ لە بنەماڵەی هابسبێرگ و کوڕی ماکسیمیلانی یەکەم، کە ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی ڕۆما بوو. لە ساڵی ١٥١٦ دا چارڵس کە کوڕی جوانا و فیلیپ بوو بوە چارڵسی یەکەم و پاشای کاستیل و ئاراگۆن. کاتێك باوکی مرد، چارڵس هۆڵەندا و فرانك کۆمتۆی بە میرات بۆ مایەوە و خستنیە سەر ناوچەکانی تری ژێردەسەڵاتی لە ئایبیریا و ئەمەریکاکان. لە ساڵی ١٥١٩ دا کاتێك ماکسیمیلانی یەکەم مرد، چارڵس ناوچەکانی هابسبێرگی لە ئەڵمانیا بە میرات بۆ مایەوە و بوە ئیمپراتۆر چارڵس پێنجەمی ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی ڕۆما. ئەوەی کە لە ساڵی ١٤٩٢ تەنیا یەکگرتنی دوو پاشایەتی ئیسپانیا بوو، بوە ئیمپراتۆریەتێکی ناو چەندین کیشوەر و چارڵس بەردەوامبوو لە بەهێزکردنی ئەو دەوڵەتە ڕەهایەی کە ئیزابیلا و فێردیناند دایانمەزراندبوو.

دۆزینەوەی کانزا بەنرخەکان لە ئەمەریکاکان دا پارمەتیەکی زۆری

هەوڵەکانی دامەزراندن و قایمکردنی ڕەهایی لە ئیسپانیادا دا. لە ساڵانی ١٥٢٠ کان دا، زیو بە بڕێکی زۆر لە گواناجۆتۆ و ماوەیەکی کەمیش دوای ئەوە لە زاکاتیکاس لە مەکسیك دۆزرابۆوە. داگیرکردنی پیرۆ لە دوای ساڵی ١٥٣٢ سامانێکی زۆرتری بۆ پاشایەتی بەدەستهێنا. ئەمەش لە شێوەی پشك " یەك لەسەر پێنجی پاشایەتی" دەدرایە پاشا لەو تاڵانییانەی لە داگیرکردنەکان و کانەکانەوە دەستدەکەوتن. هەروەك لە چاپتەری یەکەم دا بینیمان، شاخێکی زیو لە پۆتۆسی لە ساڵانی ١٥٤٠ ەکان دا دۆزرایەوە و سامانێکی زیاتری ڕژانە خەزێنەی پاشای ئیسپانیاوە.

لە هەمان ئەو کاتەدا کە کاستێل و ئاراگۆنا یەکیانگرت، ئیسپانیا یەکێك بوو لە ناوچە هەرە سەرکەوتوەکانی ئەورووپا لە ڕووی ئابوورییەوە. دوای ئەوەی سیستەمە سیاسییە ڕەهاکەی خۆی داکوتا، ئەو دەوڵەتە بەرەو لاوازیەکی ڕێژەیی و دواتریش لە دوای ساڵی ١٦٠٠ ەوە بەرەو لاوازیی ئابووری تەواو ملی نا. هەنگاوە یەکەمەکانی ئیزابیلا و فێردیناند دوای سەندنەوەی ناوچە داگیرکراوەکان لە عەرەبەکان، بریتیبوو لە زەوتکردنی موڵك و ماڵی جولەکەکان. نزیکەی دوو سەد هەزار جولەکەکەی ئیسپانیا چوار مانگ مۆڵەتیان درایە بۆ جێهێشتنی ئیسپانیا. دەبوایە هەموو موڵك و کەلوپەلەکانیان بە نرخێکی هەرزان بفرۆشتایە و نەدەبوایە ئاڵتوون یان زیو ببەنە دەرەوەی وڵات. تراجیدیایەکی مرۆیی هاوشێوە سەد ساڵ دواتر دووبارە بۆوە. لە نێوان سالانی ١٦٠٩ و ١٦١٤ دا فیلیپی سێیەم مۆریسکۆکانی دەرکرد کە پاشماوەی هاوڵاتییانی دەوڵەتانی پێشووی عەرەب بوون لە باشووری ئیسپانیادا. بە هەمانشێوەی جولەکەکان، مۆریسکۆکان دەبوایە وڵاتیان جێبهێشتایە تەنیا بەو شتانەوە کە دەیانتوانی هەڵیانبگرن و بواری ئەوەیان پێنەدرا کە هیچ ئاڵتوون و زیو یان کانزای بەنرخی تر لەگەڵ خۆیان دا بەرن.

مافی موڵکداری لە سایەی فەرمانڕەوایەتی هابسبێرگ لە ئیسپانیا دا ناجێگیر بوو. فیلیپی دوەم کە لە ساڵی ١٥٥٦ دا جێگەی چارلسی پێنجەمی باوکی گرتەوە، لە ساڵی ١٥٥٧ و دواتریش لە ساڵی ١٥٦٠ دا قەرزەکانی سەری نەدایەوە و لە ئەنجامیشدا هەردوو بنەماڵەی خاوەن بانکی فیوگەر و ویلسێری مایەپوچکرد. دواتر، بنەماڵەی بانکیی جینویز جێگەی بنەماڵە ئەڵمانییە خاوەن بانکەکانی گرتەوە و ئەوانیش بەهۆی سەرپێچیکردنی ئیسپانیاوە لە گێڕانەوەی

قەرزەکانی سەری لە کاتی فەرمانڕەوایی هابسبێرگەکان دا لە سالآنی ١٥٧٥ و ١٥٩٦ و ١٦٠٧ و ١٦٢٧ و ١٦٤٧ و ١٦٥٢ و ١٦٦٠ و ١٦٦٢ دا مایەپوچبوون.

ناجێگیری مافی مۆلکداری لە ئیسپانیای ڕەهادا چەند کاریگەری هەبوو، ڕەهایی هەمان کاریگەری لەسەر دەزگا ئابوورییەکانی بازرگانی و پەرەسەندنی ئیمپراتۆریەتی کۆلۆنیالی ئیسپانیا هەبوو. هەروەك لە چاپتەری پێشووتردا بینیمان، سەرکەوتنی ئابووری ئینگلتەرە لە سەر بناخەی فراوانبوونی خێرای بازرگانی دامەزرا. هەرچەندە بە بەراوورد لەگەڵ ئیسپانیا و پورتوگال دا، ئینگلتەرە درەنگ بەشداریکرد لە بازرگانی ئەتڵەسی دا، بەلآم ئەو ڕێگای بەشدارییەکی بنکەفراوانی ڕێژەیی کردەوە لە بازرگانی و ئەو دەرفەتانەی کۆلۆنیالیزمی ئینگلیزی ڕەخساندبوونی. ئەوەی بوە هۆی پڕکردنی خەزێنەی پاشایەتی لە ئیسپانیادا، چینە بازرگانە تازە دەرکەوتوەکەی ئینگلتەرەی دەوڵەمەندکرد. ئەوە ئەم چینە بازرگانە بوو کە بناخەی داینەمیزمی ئابووری سەرەتایی لە ئینگلتەرە دا داڕشت و بووە قەلآی هاوپەیمانی سیاسی دژی سیستەمی ڕەهایی.

ئەو پرۆسانەی بوونە هۆی پێشکەوتنی ئابووری و گۆڕانکاری دەزگایی لە ئینگلتەرە دا، لە ئیسپانیا ڕوویاننەدا. دوای ئەوەی هەردوو ئەمەریکا دۆزرابوونەوە، ئیزابیلا و فێردیناند بازرگانی نێوان کۆلۆنییە نوێکان و ئیسپانیایان لە ڕێگەی سەندیکایەکی بازرگانانەوە لە سێڤیل ڕێکخست. ئەم بازرگانانە کۆنترۆڵی هەموو بازرگانییان کرد و ڕێگەوشوێنی پێویستیان گرتەبەر تا پاشایەتی پشکی خۆیان لە سامانی هەردوو ئەمەریکا چنگبکەوێ. بازرگانی ئازاد لەگەڵ هیچ یەکێك لە کۆلۆنییەکان دا لە ئارادانەبوو. هەموو ساڵێك گەلە کەشتییەکی گەورە لە ئەمەریکاکانەوە دەگەڕانەوە و کانزای دەگمەن و کەلوپەلی بەنرخیان لەگەڵ خۆیان دەهێنایەوە بۆ سێڤیل. بنکە تەسك و مۆنۆپۆڵکراوەکەی ئەم بازرگانییە مانای وابوو کە نەشێ چینێکی فراوانی بازرگانان لە ڕێگەی بازرگانیکردن لەگەڵ کۆلۆنییەکان دا سەرهەڵبدا. تەنانەت بازرگانی لە نێوان کۆلۆنییەکان دا بە قورسی کۆنترۆڵکرابوو. بۆ نموونە، بازرگانێك لە کۆلۆنییەکی وەك ئیسپانیای نوێ، کە دەکاتە مەکسیکی ئەمڕۆ، نەیدەتوانی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ بازرگانێکی گرانادای نوێ کە کۆلۆمبیای ئەمڕۆیە بازرگانیبکا. ئەم سنووردارکردنەی بازرگانی لە ناو

ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیا دا خۆشگوزەرانی ئابووری کەمکردەوە و، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش، بوە هۆی کەمکردنەوەی ئەو سوودانەی کە دەشیا ئیسپانیا بەدەستیانبهێنی لە ڕێگەی بازرگانیکردنەوە لەگەڵ ئیمپراتۆریەتێکی تری پێشکەوتوو تردا. لەگەڵ ئەمەش دا، ئەم سنووردارکردنی بازرگانییە جێگەی بایەخبوو چونکە بوە هۆی مسۆگەرکردنی هاتنی ئاڵتوون و زیو بۆ ئیسپانیا.

دەزگا چەوسێنەرە ئابوورییەکانی ئیسپانیا ئەنجامی ڕاستەوخۆی دامەزراندنی سیستەمی ڕەهایی و ئەو ڕێچکە جیاوازە بوو، بەبەراورد لەگەڵ ئینگلتەرە، کە دەزگایانی سیاسی ئیسپانیا گرتیانەبەر. هەردوو پاشایەتی کاستێل و پاشایەتی ئاراگۆن کۆرتیزی خۆیان هەبوو کە پەرلەمان بوون و نوێنەرایەتی گروپە جیاواز "ئیستەیت" ەکانی پاشایەتییەکانیان دەکرد. بەهەمانشێوەی پەرلەمانی ئینگلیزی، دەبوایە کۆرتیزی کاستیل کۆبوایەتەوە بۆ ئەوەی ڕەزامەندی لەسەر دانانی باجی نوێ بدایە. بەهەرحاڵ، کۆرتیزەکانی کاستێل و ئاراگۆن بە زۆری نوێنەرایەتی شارە گەورەکانیان دەکرد لە بری نوێنەرایەتیکردنی ناوچە گوندنشین و شارنشینەکان، بەو شێوەیەی پەرلەمانی ئینگلیزی کردی. لە سەدەی پازدەیەم دا کۆرتیز تەنیا نوێنەرایەتی هەژدە شاری دەکرد کە هەریەکەیان دوو نوێنەری لە کۆرتێزدا هەبوو. لە ئەنجامدا کۆرتیز نوینەرایەتی گروپانی هێندە فراوانی وەك پەرلەمانی ئینگلیزی نەکرد وهەرگیز پەیوەندی نێوان بەرژەوەندییە جیاوازەکانی دروستنەکرد کە هەوڵبدەن سنوور بۆ دەسەڵاتی ڕەهایی دابنێن. کۆرتیز نەیدەتوانی یاسا دابنێ و تەنانەت ئەندازەی دەسەڵاتیشی دەربارەی دانانی باج سنووردار بوو. ئەمانە هەموویان بوونە هۆی ئەوەی کە پاشایەتی ئیسپانیا بە ئاسانی بتوانێ کۆرتێز پشتگوێبخا لە پرۆسەی قایمکردنی دەسەڵاتی ڕەهای خۆی دا. تەنانەت لەگەڵ هاتنی زیویش دا لە ئەمەریکاکانەوە، چارڵسی پێنجەم و فیلیپی دوەم پێویستیان بە باجی زیاتر هەبوو بۆ دابینکردنی خەرجی زنجیرەیەك جەنگی گران. لە ساڵی ١٥٢٠ دا چارڵسی پێنجەم بڕیاری دا داوایەك بۆ زیادکردنی باج بخاتە بەردەم کۆرتیز. نوخبەکانی شار ئەم دەرفەتەیان قۆزتەوە بۆ داواکردنی گۆڕانکاری گەورە لە کۆرتیز و دەسەڵاتەکانی دا. ئەم بەرهەڵستیکردنە گۆڕا بۆ توندوتیژی و خێراش بە یاخیبوونی کۆمیونێرۆ ناسرا. چارڵس توانی لە ڕێگای

سوپای دڵسۆز بۆخۆی یاخیبوونەکە تێبشکێنێ. بە درێژایی سەدەی شازدەیەم ململانێکان بەردەوامبوون و تەختی پاشایەتی هەوڵی دا هەموو ئەو مافانەی کۆرتیز هەیبوون بۆ دانانی باجی نوێ و زیادکردنی باجە کۆنەکان بسەنێتەوە. هەرچەندە ئەم ململانێیانە لە داکشان و هەڵکشان دا بوون، بەڵام لە کۆتایی دا بەسەرکەوتنی پاشایەتی کۆتاییان هات. لە دوای ساڵی ١٦٦٤ وە جارێکیتر کۆرتیز کۆنەبۆوە تا کاتی داگیرکردنەکانی ناپلیۆن، نزیکەی سەدو پەنجا ساڵ دواتر، کورتێز سەرلەنوێ دامەزرایەوە.

لە ئینگلتەرە دا، هەرەسهێنانی ڕەهایی لە ساڵی ١٦٨٨ دا نەك تەنیا بوە هۆی سەرهەڵدانی دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی، بەڵکو بوە هۆی پەرەسەندنی زیاتری دەوڵەتێکی کاریگەرتر و خاوەن مەرکەزیەتی زیاتر. لە ئیسپانیادا لە ئاکامی سەرکەوتنی ڕەهایی دا، پێچەوانە ڕوویدا. هەرچەندە پاشایەتی کۆرتێزی لغاوکرد و هەموو سنورداركردنێكی سیاسی لەسەر دەسەڵاتەکەی خۆی وەلانا، بەڵام کۆکردنەوەی باج زەحمەت تر بوو تەنانەت لەڕێگەی گفتوگۆکردنی ڕاستەوخۆشەوە لەگەڵ یەکە یەکەی شارەکان دا. لە کاتێك دا دەوڵەتی ئینگلیز بیرۆکراسیەکی مۆدێرن و چوستی کۆکردنەوەی باجی دادەمەزراند، دیسانەوە دەوڵەتی ئیسپانیا بە ئاڕاستەی پێچەوانە هەنگاوی نا. پاشایەتی ئیسپانیا نەك تەنیا لە دابینکردنی مافی موڵکداری جێگیردا بۆ بزنسمان و بازرگانیی قۆرخکراو دا سەرکەوتوو نەبوو، بەڵکو کەوتە فرۆشتنی پلەو پایە و کردنیان بە میراتی و فێڵکردن لە باج و تەنانەت فرۆشتنی خۆپاراستن لە دادوەری.

ئاکامی ئەم دەزگا چەوسێنەرە سیاسی و ئابوورییانە لە ئیسپانیا دا پێشبینیکراو بوو. لە ماوەی سەدەی حەڤدەیەم دا، لە کاتێك دا ئینگلتەرە بەرەو گەشەکردنی بازرگانی و دواتریش بەپیشەسازیبوونی خێرا هەنگاویدەنا، ئیسپانیا بەرەو لاوازبوونی بەربڵاوی ئابووری شۆڕدەبۆوە. لە سەرەتای سەدەکە دا، یەك لەسەر پێنجی دانیشتوانی ئیسپانیا لە ناوچە شارنشینەکان دا دەژیان، لە کۆتایی سەدەکەدا ئەم ژمارەیە بوە نیوە و یەك لەسەر دە لە پرۆسەیەك دا کە هاوکات بوو لەگەڵ خراپبوونی باری گوزەرانی دانیشتوانی ئیسپانیا دا. داهاتەکانی ئیسپانیا کەمبوونەوە لە کاتێك دا ئینگلتەرە دەوڵەمەندبوو.

بەردەوامی و بەهێزبوونی ڕەهایی لە ئیسپانیادا، لە کاتێك دا لە ئینگلتەرە دا ڕیشەکێشدەکرا، نموونەیەکی تری ئەو جیاوازییە بچووکانەن کە لە کاتی وەرچەخانە مێژووییەکان دا ڕۆڵی گرنگ دەبینن. جیاوازییە بچووکەکان لە بەهێزی و سروشتی ئەو دەزگایانەدا خۆیان دەنواند کە نوێنەرایەتی خەڵکیان دەکرد و وەرچەرخانە مێژووییەکەش بریتیبوو لە دۆزینەوەی ئەمەریکاکان. کارلەیەککردنی ئەمانە ئیسپانیای بە ڕێچکەیەکی دەزگایی زۆر جیاوازتر لەوەی ئینگلتەرەدا برد. ئەو دەزگا ئابوورییە کراوە ڕیژەییانەی لە ئینگلتەرە دا هاتنەئاراوە داینەمیزمێکی ئابووری بێوینەیان دروستکرد کە خۆیان لە شۆڕشی پیشەسازی دا بەرجەستەکرد، لە کاتێك دا بەپیشەسازیبوون لە ئیسپانیادا هیچ دەرەفەتێکی سەرکەوتنی بۆ نەمابۆوە. لەو کاتەی تەکنەلۆجی پیشەسازی لە زۆربەی ناوچەکانی جیهان دا بڵاو دەبۆوە، ئابووری ئیسپانیا هێندە لاواز بووبوو کە تەنانەت پێویستی نەدەکرد پاشایەتی یان نوخبە زەویدارەکانی ئیسپانیا بەپیشەسازیبوون بوەستێنن.

## ترس لە پیشەسازی

بەبێ ئەنجامدانی گۆڕانکاریی لە دەزگایانی سیاسی و دەسەڵاتی سیاسی هاوشێوەی ئەوانەی لە ئینگلتەرەدا لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە سەریانهەڵدا، دەرەفەتێکی ئەوتۆ لەبەردەم وڵاتە سیستەم ڕەهاکان دا نەبوو تا سوود لە نوێکاری و تەکنەلۆجییە نوێکانی شۆڕشی پیشەسازی وەرگرن. بۆ نموونە، لە ئیسپانیادا، نەبوونی مافی موڵکداری جێگیر و لاوازی ئابووری مانای ئەوە بوو کە خەڵك هاندانیان نەبوو تا وەبەرهێنانی پێویست بکەن و خۆیان ماندووکەن. لە ڕوسیا و نەمسا ـ هەنگاریا تەنیا نەشارەزایی و خراپ بەڕێوەبردنی نوخبەکان و ڕۆچوونی نالەباری ئابووری نەبوو لە سایەی دەزگا چەوسێنەرەکان دا کە ڕێگربوو لە بەردەم بەپیشەسازیبوون دا، بەڵکو دەسەڵاتداران بۆخۆیان چالاکانە کەوتنە ڕاگرتنی هەموو هەوڵێك بۆ هێنانی ئەم تەکنەلۆجییانە و ئەنجامدانی وەبەرهێنانی بنەڕەتی لە ژێرخانی وەکو ڕێگای ئاسنین کە دەکرا ببێتە ئامرازی گواستنەوەی ئەو تەکنەلۆجی و وەبەرهێنانانە.

له كاتی شۆڕشی پیشەسازی دا لەسەدەی هەژدەیەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم دا نەخشەی سیاسی ئەورووپا زۆر جیاواز بوو لەوەی ئەمڕۆ. ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی ڕوما، وەك لێفەیەكی پینەكراو لە زیاتر لە چوارسەد قەوارە، كە لە دواییدا زۆربەیان لە ئەڵمانیادا خڕبوونەوە، زۆربەی ناوەڕاستی ئەورووپای داگیركردبوو. بنەماڵەی هابسبێرگ تا ئەو ساتەش هێزێكی سیاسی سەرەكی بوون، ئیمپراتۆریەتەكەشیان كە بە ئیمپراتۆریەتی هابسبێرگ یان نەمسا ــ هەنگاریا ناسرابوو، ناوچەیەكی فراوانی نزیكەی ٢٥٠,٠٠٠، میل چوارگۆشەی گرتبۆوە، هەرچەندە چیتر ئیسپانیای تێدا نەبوو دوای ئەوەی كە بۆربۆنەكان تەختی پاشایەتی ئیسپانیایان لە ساڵی ١٧٠٠ دا گرتبوەدەست. لەڕووی دانیشتوانەوە، سێیەم دەوڵەتی گەورەی ئەورووپا بوو كە یەك لەسەر حەوتی دانیشتوانی ئەورووپای پێكدەهێنا. لە كۆتایی سەدەی هەژدەیەم دا، لە ڕۆژئاواوە، ئەوەی ئەمڕۆ بەلجیكایە و ئەو كاتە بە هۆڵەندای نەمسا ناسرابوو، كەوتبوە ناو ناوچەكانی هابسبێرگ. ناوچە گەورەكانی هابسبێرگ بریتیبوون لەو ناوچانەی كەوتبوونە دەوروبەری نەمسا و هەنگاریا، لەوانە كۆماری چیك و سلۆڤاكیا لە باكوورەوە و سلۆڤانیا و كرۆواتیا و بەشێكی زۆری ئیتالیا و سێربیا لە باشوورەوە. لە ڕۆژهەڵاتەوە زۆربەی ناوچەكانی ئەوەی ئەمڕۆ ڕۆمانیا و پۆلۆنیا پێدەهێنن، گرتبوەخۆی.

بازرگانانی ناوچەكانی بندەستی هابسبێرگ گرنگیان زۆر كەمتر بوو لەوانەی ئینگلتەرە و بەندایەتی لە ناوچەكانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات دا مایەوە. هەروەك لە چاپتەری چوارەم دا بینیمان، هەنگاریا و پۆلۆنیا ناوجەرگەی بەندایەتی دوەم بوون لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات دا. هابسبێرگەكان، بە پێچەوانەی ستوارتەكانەوە، لە هێشتنەوەی دەسەڵاتی ڕەهای بەهێزدا سەركەتوو بوون. فرانسیسی یەكەم كە وەك دوا ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی ڕۆما لە نێوان ساڵانی ١٧٩٢ و ١٨٠٦ دا و دواتریش وەك ئیمپراتۆری نەمسا ــ هەنگاریا تا مردنی لە ساڵی ١٨٣٥ دا، فەرمانڕەواییكرد، ئیمپراتۆرێكی دەسەڵات ڕەهای بێوێنە بوو. ئەو باوەڕی بە هیچ سنوورێك نەبوو بۆ دەسەڵاتەكەی و زیاد لە هەموو شتێكیش دەیویست بارودۆخی سیاسی وەك خۆی بهێڵێتەوە. ستراتیژی بنەڕەتی ئەو بریتیبوو لە دژایەتیكردنی گۆڕانكاری، هەر گۆڕانكارییەك بوایە. لە ساڵی ١٨٢١ دا ئەو ئەمەی لە ووتارێكدا، كە نموونەی بۆچوونەكانی فەرمانڕەواكانی هابسبێرگ بوو، بۆ مامۆستایانی قوتابخانەیەك لە لایباخ ڕوونكردەوە. لە

ووتارەکەیدا جەختی لە سەر ئەوەکرد کە ( *من شارەزایانم ناویّ، بەڵکو کالآم دەویّ، هاولآتییانی ڕاستگۆم دەویّ. ئەرکی سەرشانتان ئەوەیە گەنجان بەم شێوەیە پەروەردەبکەن. ئەوەی خزمەتی من دەکا دەبێ ئەو وانەیە بڵێتەوە کەمن فەرمانتان پێدەکەم. ئەگەر هەرکەسێك ئەمە نەکات یان ئایدیای نوێ بهێنێتەئاراوە، دەتوانێ بڕوات یان بۆخۆم لایدەبەم)*

ئیمپراتۆر ماریا تێرێزا کە لە نێوان سالآنی ١٧٤٠ و ١٧٨٠ دا فەرمانڕەواییکردوە، زۆر جار وەلآمی پێشنیازەکانی بۆ چاکسازی و گۆڕانکاری بەوە ئەدایەوە کە *(با هەموو شتێك وەك خۆی بمێنێتەوە)* لەگەڵ ئەمەش دا، ئەو و جۆزێفی دوەمی کوڕی کە لە نێوان سالآنی ١٧٨٠ و ١٧٩٠ دا ئیمپراتۆر بوون، خاوەنی هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی مەرکەزیی بەهێزتر و سیستەمێکی کاریگەرتری کارگێڕیی بوون. ئەوان ئەم هەوڵەیان لە چوارچێوەی سیستەمێکی سیاسی دا خستەگەڕ کە سنووری ڕاستەقینەی دانەنابوو بۆ ڕەفتارەکانیان و چەند توخمێکی کەمی پلورەلیزمی لە خۆگرتبوو. پەرلەمانی نەتەوەیی ئەوتۆ نەبوو کە کەمترین کۆنترۆڵ بخاتە سەر دەسەلآتی پاشا و تەنیا سیستەمێکی دەسەلآتدار و ئەنجوومەنی ناوچەیی هەبوو کە لە ڕووی مێژووییەوە هەندێك دەسەلآتی لەسەر باج دانان و خزمەتی سەربازی دا هەبوو. تەنانەت کۆنترۆڵی کەمتر لەسەر ڕەفتارەکانی هابسبێرگەکانی نەمسا ـ هەنگاریا هەبوو لەوەی لەسەر پاشاکانی ئیسپانیا هەیبوو، دەسەلآتی سیاسی بە خەستی لە چنگی هابسبێرگەکان دا چڕکرابۆوە.

لە کاتێك دا ڕەهایی هابسبێرگ لە سەدەی هەژدەیەم دا بەهێز بوو، دەسەلآتی هەموو دەزگایانی دەرەوەی بازنەی پاشایەتی زیاتر لاواز بوو. کاتێك شاندێکی نوێنەرانی پارێزگای تایرۆل نەمسا داخوازییەکیان خستە بەردەم فرانسیس بۆ دانانی دەستوور، ئەو پێی ڕاگەیاندن ( *کەواتە، ئێوە دەستوورتان دەوێ ... سەیرکەن، من هیچ بایەخێکی پێنادەم، من دەستوورتان دەدەمێ، بەلآم دەبێ بزانن کە سەربازەکان فەرمانەکانی من جێبەجێدەکەن و ئەگەر پێویستم بە پارە بوو داواکەم دووبارە ناکەمەوە، بە هەرحاڵ، ئامۆژگاریتان دەکەم کە ووریا بن لەوەی دەیڵێن"* بەرامبەر بەم هەڵوێستە، سەرکردەکانی تایرۆل وەلآمیاندایەوە( *ئەگەر تۆ وا بیردەکەیتەوە، ئەوا باشترە دەستوورمان نەبێ)* و فرانسیسیش پێیڕاگەیاندن کە *(منیش هەر ئەو ڕایەم هەیە)*

فرانسیس ئەو ئەنجوومەنەی دەوڵەتی هەڵوەشاندەوە کە ماریا تێرێزا وەك

پلاتفۆرمێکی ڕاوێژکاریی لەگەڵ وەزیرەکانی دا بەکاریدەهێنا. لەو کاتە بەدواوە ئیتر هیچ ڕاوێژکردن و گفتوگۆیەکی جەماوەری دەربارەی بڕیارەکانی پاشا لە ئارادا نەما. فرانسیس دەوڵەتێکی داپڵۆسێنەری دروستکرد و بێڕەحمانە هەموو ئەو شتانەی کە کەمێکیش ڕادیکاڵ بوون خستە ژێر چاودێرییەوە. فەلسەفەی ئەو بۆ حوکمکردن لە لایەن کاونت هارتیگ کە یاریدەدەرێکی لە مێژینەی بوو، خرابووەڕوو کە بریتیبوو لە " پاراستنی شێلگیرانەی دەسەلاتی خاوەن سەروەریی و نکۆڵیکردن لە هەموو بانگەشەیەکی خەڵك بۆ بەشداریکردن لەو دەسەلاتەدا" ئەو لە هەموو ئەمانەدا لە لایەن شازادە مێتێرنیش، کە لە ساڵی ١٨٨٩ دا کرایە وەزیری دەرەوە، هاوکاریدەکرا. دەسەلات و کاریگەری مێتێرنیش لە دەسەلات و کاریگەری فرانسیس درێژخایەن تربوو. ئەو وەك وەزیری دەرەوە بۆ ماوەی نزیکەی چل ساڵ مایەوە.

سیستەمی فیودالّی و بەندایەتی چەقی دەزگا ئابوورییەکانی هابسبێرگ یان پێکهێنابوو. ئەگەر لە ناو ئیمپراتۆریەتەکە دا بەرەو ڕۆژهەلات بڕۆشتیتایە، فیودالّیزم بەهێز تر دەبوو کە ڕەنگدانەوەی بارودۆخی دەزگا ئابوورییەکان بوون وەك لە چاپتەری چوارەم دا بینیمان، کاتێك لە ئەورووپای ڕۆژئاواوە بەرەو ئەورووپای ڕۆژهەلات بڕۆشتیتایە، جووڵەی هێزی کار سنووردار و کۆچکردن نایاسایی بوو. کاتێك مرۆڤپارێزی ئینگلیزی ڕۆبەرت ئەوین هەوڵی دا حکومەتی نەمساوی ڕازیبکا بۆ ئەنجامدانی هەندێك چاکسازی کۆمەلایەتی بۆ باشکردنی باری گوزەرانی هەژاران، یەکێك لە یاریدەدەرانی مێتێرنیش، فریدریش ڤۆن گێنتز وەلامیدایەوە *( ئێمە بە هیچ شێوەیەك حەزناکەین کە باری گوزەرانی جەماوەر باشبێ و سەربەخۆبن ... ئایا چۆن دەتوانین حوکمیان بکەین ئەگەر باری گوزەرانیان باشبێ؟)*

جگە لە بەندایەتی کە بە تەواوەتی بوە هۆی ڕێگرتن لەبەردەم پەیدابوونی بازاڕی کار و جەماوەری لادێکانی لە داهێنان و دەسپێشخەری دوورخستەوە، ڕەهایی هابسبێرگ لەسەر مۆنۆپۆلی و سنووردارکردنی تری بازرگانی نەشونمای کرد. ئابووری شارەکان لەلایەن سەندیکاکانەوە کۆنترۆلکرابوو کە بەشداریکردنی خەڵکی لە پیشەکان دا سنووردار کردبوو. تا ساڵی ١٧٧٥ گومرگی ناوخۆیی لەناو خودی نەمسا و لە هەنگاریاش تا ساڵی ١٧٨٤ وەردەگیرا. گومرگی یەکجار زۆر لەسەر کالا هاوردەکان و چەندین قەدەخەکردنی ئاشکرا لەسەر هاوردەکردن و هەناردەکردنی کالاکان دانرابوو.

سـەرکوتکردنی بازاڕەکـان و دامەزرانـدنی دەزگایـانی ئـابووری چەوسـێنەر بێگومان بەشێکن لە سروشتی ڕەهایی، بەڵام فرانسیس لەوەشی تێپەڕاند. تەنیا ئەوەندە نەبوو کە دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر هاندانیان لەبـەردەم تاکـەکان دا بۆ ئەنجامدانی نوێکاری یان بـەکارهێنانی تەکنـەلۆجی نـوێ دا نەهێشت. لـە چاپتەری دوەم دا بینینمـان کـە چـۆن لـە پاشـایەتی کۆنگـۆ دا هەوڵـەکان بـۆ بەکارهێنانی گاسن سەرنەکەوتن چونکە خەڵك هیچ هاندانێکیان نەبوو لە سایەی سروشتی چەوسێنەرانەی دەزگا ئابوورییەکان دا. پاشای کۆنگۆ دەیزانی ئەگـەر خەڵك ناچارکات تا گاسن بەکاربهێنن، بەرهەمـداریی کـشتوکاڵ بـەرزتر دەبـێ و سامانێکی زیاتر بەرهەمدەهێنرێ کە ئەو دەیتوانی سوودی لێـوەرگرێ. ئەمـەش هاندانێکی شاراوەی بەهێزە بۆ هەموو حکومەتێك تەنانەت حکومەتـە دەسـەڵات ڕەهاکـانیش. گرفتەکـەی کۆنگـۆ ئـەوەبوو کـە خـەڵك دەیزانـی هەرچـییەك بەرهەمبهێنن لە لایەن پاشا ڕەهاکەوە زەوتدەکرێ، هەر بۆیە هـیچ هانـدانێکیان نەبوو تا تەکنەلۆجی نـوێ بـەکاربهێنن یـان وەبـەرهێنانی تێدابکـەن. لـە خـاکی هابـسبێرگ دا، فرانـسیس هـانی هاوڵاتییـەکانی نـەدا تـا تەکنـەلۆجی نـوێ بـەکاربهێنن و بەپێـچەوانەوە ئـەو بەرهەڵـستی ئەمـەی کـرد و ڕێگـەی لـە بڵاوبوونەوەی ئەو تەکنەلۆجییانە گرت کە خەڵك دەیانویست لـە سـایەی دەزگـا ئابوورییە هەنووکەییەکان دا بەکاریانبهێنن.

بەرهەڵستیکردنی نوێکاری لە دوو ڕێگاوە بەرجەستەکرا. یەکەم، فرانسیسی یەکـەم دژی پەرەپێـدانی ئـابووری بـوو. پیـشەسازی دەبـوە هـۆی کردنـەوەی کارگـەکان و کارگـەکانیش کرێکـارانی هـەژاری لـە شـارەکان دا کـۆدەکردەوە، بەتایبەتی لە ڤیەنای پایتـەخت دا. ئـەو کرێکارانـە لەوانـەبوو دواتـر ببوونایەتـە لایـەنگرانی ئەوانـەی دژی ڕەهـایی بـوون. ئامـانجی سیاسـەتەکانی فرانـسیس بریتیبوو لە بەردەوامیی پشتگیریی نوخبە تەقلیدیەکە بۆی و هێشتنەوەی باری سیاسـی و ئـابووری هەنووکـەیی. ئـەو ویـستی کۆمـەڵگا بـە کۆمەڵگایـەکی کشتوکاڵی بهێڵێتەوە. فرانسیس لەو بڕوایەدا بوو کە باشترین ڕێگا بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە بریتیبوو لە، هەر لە سەرەتاوە، ڕێگرتن لە دامەزراندنی کارگـەگان. ئەو ئەمەی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەنجامدا، بـۆ نموونـە، لـە سـاڵی ١٨٠٢ دا دامەزراندنی کارگەی نوێی لە ڤیەنا دا قەدەخەکرد. لە بری هاندانی هاوردەکردن و بەکارهێنانی ئامێری نوێ کە بنەمای بەپیـشەسازیبوون بـوون، ئـەو تـا سـاڵی ١٨١١ هەموو ئەمانەی قەدەخەکرد.

دووەم، فەرانسیس دژی دروستکردنی ڕێگای ئاسنین بوو، کە یەکێك بوو لەو تەکنەلۆجییە سەرەکییانەی لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازی دا هات. کاتێك پلانی دروستکردنی ڕێگای ئاسنینی باکوور خرایە بەردەم فەرانسیسی یەکەم، وەلامەکەی ئەو ئەوەبوو *( نا نا من هیچ بایەخێك بەمە نادەم، نەوەك شۆڕش ڕوویکاتە وولات)*

لەبەر ئەوەی حکومەت مۆڵەتی دروستکردنی ڕێگای ئاسنینی نەدا کە بەهەڵم کار بکا، یەکەم ڕێگای ئاسنین کە لە ئیمپراتۆریەتەکەدا دروستکرا دەبوایە فارغۆنەکانی بە ئەسپ رابکێشرانایە. ئەو هێڵەی لە شاری لینز لەسەر ڕووباری دانیوب دەچوە شاری بەدوایزی بۆهیمی لەسەر ڕووباری مۆڵداو، لێژی و سوچی تێدابوو. ئەمەش مانای ئەوەبوو نەدەتوانرا ئەم هێڵە دواتر بگۆڕدرێ بۆ ڕێگای ئاسنین. بۆیە تا ساڵی ١٨٦٠ ئەم هێڵە لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێزی ئەسپەوە بەردەوامبوو. سوودی ئابووری پەرەپێدانی ڕێگای ئاسنین لە ئیمپراتۆریەتەکە دا هەر زوو لە لایەن سالۆمۆن ڕۆزچایەڵد هەستیپێکرا. ڕۆزچایەڵد نوێنەری ڤیەنای بنەماڵەی ناسراوی خاوەن بانکی ڕۆزچایەڵد بوو. ناسان، برای ساڵمۆن کە لە ئینگلتەرە دادەنیشت، بزوێنەرەکەی جۆرج ستێفنسۆن "زە ڕۆکێت" و گواستنەوەی لە ڕێگەی هەڵمەوە زۆر بە دڵ بوو. ئەو پەیوەندی بە براکەیەوە کرد تا لە دەرفەتی پەرەپێدانی ڕێگای ئاسنین لە نەمسا بکۆڵێتەوە چونکە ئەو لای وابوو کە خێزانەکەیان دەتوانێ لە ڕێگەی دابینکردنی سەرمایە بۆ پرۆژەکانی ڕێگای ئاسنین قازانجێکی زۆر بکەن. ناسان ڕازیبوو، بەلام پرۆژەکە هیچ ئاکامێکی نەبوو چونکە دیسانەوە ئیمپراتۆر فەرانسیس ڕازینەبوو.

دژایەتیکردنی پیشەسازی و ڕێگای ئاسنینی هەڵمی لەو ترسەی فەرانسیسەوە سەرچاوەی گرتبوو لە تێکدانی بنیاتنەر هەیبوو کە پەرەپێدانی ئابووری مۆدێرن لەگەڵ خۆی دا دەیهێنا. ئەولەویەتە سەرەکییەکانی ئەو بریتیبوون لە دڵنیابوون لە سەقامگیریی دەزگا چەوسێنەرەکان کە ئەو حوکمیدەکردن و پاراستنی بەرژەوەندی نوخبە تەقلیدییەکان کە پشتگیری ئەویاندەکرد. نەك هەر شتێکی ئەوتۆی لە بەپیشەسازیبون دەستنەدەکەوت کە بناخەی سیستەمی فیودالی لەرزۆك دەکرد لە ڕێگای ڕاکێشانی هێزی کارەوە لە لادێکانەوە بەرەو شارەکان، بەڵکو فەرانسیس دەرکی بەوە کردبوو کە ئەنجامدانی گۆڕانکاری گەورەی ئابووری دەبوە هەڕەشەی گەورە بۆ سەر

دەسەڵاتی سیاسی خۆی. لە ئەنجامدا ئەو ڕێگەی لە پیشەسازی و پێشکەوتنی ئابووری گرت و لە دواکەوتنی ئابووری دا قەتیسیخوارد کە لـە چـەندین ڕێگـەوە خۆی بەرجەستەکرد. بۆ نموونە، تا کاتێکی درەنگی وەك ساڵی ١٨٨٣ کـە ٪٩٠ ی ئاسنی دنیا لە ڕێگەی بەکارهێنانی خەڵوزی بەردینەوە بەرهەمدەهێنرا، زیاتر لە نیوەی بەرهەمەکانی ئاسن لە ناوچەکانی هابسبێرگ دا تا ئەو کاتەش بەهۆی خەڵوزی چوستیی کەمترەوە بەرهەمدەهێنرا. بە هەمانشێوە، تا یەکەم جـەنگی جیهانیش، کاتێك ئیمپراتۆریەتەکە هەرەسیهێنا، تەونکردنی قوماش بـە تـەواوی لە ڕێگەی ئامێرەوە بەرهەمنەدەهێنرا و هەر بە دەستدەکرا.

ئیمپراتۆریەتی نەمسا۔ هەنگاریا لە ترسان لە پیشەسازی، تەنیا نەبوون. لـە ڕۆژهەڵاتەوە، ڕوسیا کۆمەڵە دەزگایەکی هەمانشێوە ڕەهای هەبوو کە لە لایـەن پیتـەری مەزنـەوە داڕێـژرابوون، هـەروەك پێـشتر لـەم چـاپتەرەدا بینیمـان. بەهەمانـشێوەی نەمـسا ــ هـەنگاریا، دەزگـا ئابووریيـەکانی ڕوسـیا یـەکجار چەوسێنەر بوون و لە سـەر بنـەمای بەندایـەتی دامـەزرابوون و بەلایەنیکەمـەوە نیوەی دانیشتوانیان بە زەوییەکانەوە بەستبۆوە. دەبوایـە بەنـدەکان حەفتـەی سـێ ڕۆژ بـە خـۆڕایی کاریـان لەسـەر زەوی لۆردەکانیـان بکردایـە. ئـەوان نەیانـدەتوانی بـچنە شـوێنی تـر و ئـازادی هەڵبـژاردنی پیـشەکانیان نـەبوو، لۆردەکانیـان دەیـانتوانی بـە ئـارەزوی خۆیـان بیانفرۆشـن بـە لـۆردێکی تـر. فەیلەسـوفی ڕادیکـاڵ، پیتـەر کرۆپـۆتکین کـە یەکێکـە لـە دامەزرێنـەرانی ئەنارشـیزمی مـۆدێرن، وێنەیـەکی زینـدووی بەجێهێـشتوە دەربـارەی شـێوازی بەندایەتی سەردەمی قەیسەر نیکۆلاسی یەکەم کە لە ساڵی ١٨٢٥ ەوە تا ساڵی ١٨٥٥ حـوکمی ڕوسـیای کـردوە. ئـەو یادگارەکـانی سـەردەمی منـداڵی خـۆی دەگێڕێتەوە:

*(چیرۆکی ئەو پیاو و ئافرەتانەی لە خێـزان و گونـدەکانیان دەردەهێنـران و دەفرۆشران و لە قومار دا دەدۆڕێنران یان بە جووتێك سەگی ڕاو دەگۆڕانـەوە و بـۆ هەنـدێك ناوچـەی دوورە دەسـتی ڕوسـیا دەگوێزرانـەوە.... چـیرۆکی ئـەو منداڵانەی لە باوك و دایکانیان دەفرێنـدران و دەفرۆشـرانە خودانـە بێبـەزەیی و ڕەوشت نزمەکان، چیرۆکی ئەو تێهەڵدانانەی "لە تەویلـەکان دا" هـەموو ڕۆژێـك بە دڵڕەقیەکی بێوێنەوە ئەنجامدەدران، چیرۆکی ئەو کچەی کە خۆخنکاندنی لە ئاودا تەنیا ڕێگەی ڕزگاری بوو، چیرۆکی ئەو پیاوە پیرەی کە لـە خزمـەتکردنی خودانەکـەی دا سـەری سـپی کردبـوو و لـە کۆتـایی دا لـە ژێـر پەنجـەرەی*

*خودانەکەی دا خۆی هەڵواسی، چیرۆکی ڕاپەڕینەکانی بەندان کە لە لایەن جەنەراڵەکانی نیکۆلاسی یەکەمەوە سەرکوتکران لە ڕێگەی بە شەق کوشتنی هەریەك لە دە یان یەك لە پێنجی ئەو پیاوانەی لە ریزەکان دا دەردەهێنران و سەرکوتدەکران لە ڕێگەی وێرانکردنی گوندەکانیانەوە... بەڵام دەربارەی ئەو هەژارییەی لە ماوەی گەشتەکەم دا لە هەندێك لە گوندەکان دا بینیم، بەتایبەتی لەو گوندانەی کە هی بنەماڵەی فەرمانڕەوا بوون، ووشەکان ناتوانن وەسفی ناهەمواربیەکان بۆ خوێنەران بکەن کە ئەو ناهەمواربیانەیان نەدیوە).*

هەروەك لە نەمسا-هەنگاریا، ڕەهایی لە ڕوسیا دا تەنیا کۆمەڵە دەزگایەکی ئابووری دروستنەکرد کە کۆسپی بەردەم خۆشگوزەرانی کۆمەڵگا بوون. بەهەمانشێوەی نەمسا ـ هەنگاریا، لە ڕوسیاش دا ترس لە تێکدانی بنیاتنەر و ترس لە پیشەسازی و ڕێگای ئاسنین لە ئارادا بوون. لە ناوجەرگەی ئەمانەدا لە کاتی فەرمانڕەوایی نیکۆلاسی یەکەم دا کۆنت ئیگۆن کانکرین بوو کە لە نێوان ساڵانی ١٨٢٣ و ١٨٤٤ دا وەزیری دارایی بوو. ئەو ڕۆڵی سەرەکی لە دژایەتیکردنی ئەو گۆڕانکارییانەدا بینی کە بۆ دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی ئابووری پێویست بوون.

پۆلیسیەکانی کانکرین ئامانجیان بەهێزکردنی کۆڵەکە سیاسییە تەقلدیەکانی ڕژێمەکە بوو، بەتایبەتی ئەریستۆکراتە زەویدارەکان و هێشتنەوەی کۆمەڵگا وەك کۆمەڵگایەکی گوندنشین و کشتوکاڵی. هەر لە کاتی دەستبەکاربوونی وەك وەزیری دارایی، کانکرین دژی ئەو پیشنیازە وەستا و پێچەوانەشی کردەوە کە گۆریف وەزیری دارایی پێش خۆی خستبویە ڕوو بۆ دامەزراندنی بانکێکی بازرگانی حکومی بۆ پێدانی قەرز بە کەرتی پیشەسازی. لە بری ئەمە، کانکرین جارێکیتر بانکی پێدانی قەرزی حکومی کردەوە کە لە کاتی جەنگەکانی ناپلیۆن دا داخرابوون. ئەم بانکە لە بنەڕەت دا بۆ ئەوە دامەزرابوو تا بە سوودێکی کەم قەرز بداتە خاوەن زەوییە گەورەکان، ئەمەش پۆلیسیەك بوو کە بە دڵی کانکرین بوو. بەرامبەر وەرگرتنی قەرزەکان، دەبوایە داواکارانی قەرزەکان بەندەیان وەك زەمانەت یان بارمتە دابنایە بۆ ئەوەی تەنیا فیوداڵە خاوەن زەوییەکان بتوانن ئەم قەرزانە وەربگرن. بۆ تەمویلکردنی بانکی قەرزپێدانی حکومی، کانکرین پارەی لە بانکە بازرگانییەکانەوە گواستەوە، بەمەش دوو باڵندەی بە بەردێك کوشت: بەم شێوەیە پارەیەکی کەم مایەوە تا بە قەرز بدرێتە کەرتی پیشەسازی.

هەڵوێستەکانی کانکرین لەو ترسەوە سەرچاوەیان گرتبوو کە گۆڕانکاری لە ئابووری دا گۆڕانکاری سیاسی لەگەڵ خۆی دا دەهێنێ و ئەمەش هەمان هەڵوێستی قەیسەر نیکۆلاس بوو. گرتنەدەستی دەسەلات لە لایەن نیکۆلاسەوە لە دیسیمبەری ١٨٢٥ دا، هێندەی نەمابوو لە رێگەی کۆدێتایەکەوە لە لایەن ئەفسەرانی سوپاوە کۆتایی پێبهێنرێ، ئەو ئەفسەرانەی بە دیسێمبریستەکان ناسرابوون و پرۆگرامێکی رادیکاڵییان بۆ گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی هەبوو. نیکۆلاس لە نووسراوێك دا بۆ دۆقی مەزن میخایل نووسی *( شۆڕش لەبەر دەرگای ڕوسیادایە، بەڵام سوێنددەخۆم تا هەناسەیەك لە گیانم دا مابی لە وڵات دا تەشەنەنەکا)*

نیکۆلاس لەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییانە دەترسا کە دروستکردنی ئابوورییەکی مۆدێرن دەیهێنانەئاراوە. هەروەك لە ووتارێکدا بۆ خاوەن پیشەسازییەکان لە پیشانگایەکی پیشەسازی دا لە مۆسکۆ ڕوونیکردەوە :

*(پێویستە دەوڵەت و خاوەن پیشەسازییەکان بایەخ بە بابەتێك بدەن، بەبێ ئەمە کارگەکان دەبنە شەیتان لە بری ئەوەی خێروخۆشی بهێنن: ئەویش پاراستنی کرێکارانە کە ساڵانە ژمارەیان زیاددەکا. ئەوانە پێویستیان بە سەرپەرشتی بەردەوام و باوکانەی مۆراڵەکانیانە: بەبێ ئەم سەرپەرشتیکردنە، ئەم خەڵکە زۆرە بەرەبەرە گەندەڵ دەبن و دەبنە چینێکی داماو و جێگەی مەترسی بۆ سەر خودانەکانیان).*

بە هەمانشێوەی فرانسیسی یەکەم، نیکۆلاس لەوە دەترسا تێکدانی بنیاتنەر، کە ئابووری پیشەسازی مۆدێرن دەیهێنایەئاراوە، باری هەنووکەیی لە ڕوسیادا لەقبکا. لەسەر داوای نیکۆلاس، کانکرین هەنگاوی تایبەتی گرتەبەر بۆ خاوکردنەوەی توانای بەپیشەسازیبوون. ئەو چەندین پیشانگای پیشەسازی قەدەخەکرد کە پێشتر ناوبەناو رێکدەخران بۆ خستنەڕووی تەکنەلۆجی نوێ و رێخۆشکردن بۆ بە بەکارهێنانی تەکنەلۆجی.

لە ساڵی ١٨٤٨ دا ئەورووپا بەهۆی زنجیرەیەك لە ڕابوونی شۆڕشگێڕییەوە تووشی هەژان بوو. بەرامبەر بەمە، ئەی ئەی زاکریڤسکی کە فەرمانڕەوای سەربازیی مۆسکۆ و بەرپرسی پاراستنی ئاسایشی گشتی بوو، بۆ نیکۆلاسی نووسی: *(بۆ دابینکردنی هێمنی و خۆشگوزەرانی، کە لەم کاتەی ئێستا دا تەنیا لە ڕوسیا دا بەرقەرارە، پێویستە حکومەت بواری کۆبوونەوەی بێماڵان و ڕەوشتنزمان نەدات کە بە ئاسانی بەشداری لە هەموو بزووتنەوەیەك دا دەکەن*

*و ئاشتی کۆمەڵایەتی و تایبەت تێکدەدەن).* ئامۆژگاریەکەی خرایە بەردەم وەزیرانی نیکۆلاس و لە ساڵی ١٨٤٩ دا یاسایەکی نوێ دەرکرا کە کردنەوەی کارگەکانی لە هەموو ناوچەیەکی مۆسکۆدا بە شێوەیەکی بەرچاو سنووردارکرد. یاساکە بە دیاریکراوی کردنەوەی هەموو کارگەی ڕستنی لۆکە و خوری و دارشتنی ئاسنی قەدەخەکرد. پیشەسازیەکانی تری وەك تەونکردن و ڕەنگکردن، ئەگەر بیانویستایە کارگەی نوێ بکەنەوە، دەبوایە تکانامەیان پێشکەشبکردایە بە فەرمانڕەوا سەربازییەکە. لە ئاکام دا ڕستنی لۆکە بە تەواوەتی قەدەخەکرا. مەبەستی یاساکە بریتیبوو لە ڕێگرتن لە چڕبوونەوەی کرێکاران، کە گومانی ڕاپەڕینیان لێدەکرا، لە ناو شاردا.

لە ڕوسیا دا دژایەتیکردنی ڕێگای ئاسنین دوابەدوای دژایەتیکردنی پیشەسازی هات بە هەمان ئەو شێوەیەی لە نەمسا۔ هەنگاریا دا ڕوویدابوو. بەر لە ساڵی ١٨٤٢ تەنیا یەك ڕێگای ئاسنین لە ڕوسیادا هەبوو. ئەمەش ڕێگای ئاسنینی تزارسکۆ سێلۆ بوو کە ڕێگایەکی حەڤدە میلی بوو لە سەینت پیتەرسبورگەوە بۆ جێگای حەوانەوەی قەیسەر لە تزارسکۆ سێلۆ و پاڤلۆڤسك. هەورەك چۆن دژایەتی پیشەسازی کرد، کانکرین هیچ هۆکارێکی بەدینەکرد بۆ ئەوەی برەوبدا بە ڕێگای ئاسنین، کە لای وابوو جموجوڵێکی مەترسیدار لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لەگەڵ خۆی دا دەهێنێ و لەو بڕوایەدا بوو کە *(مەرج نییە ڕێگای ئاسنین لە ئەنجامی پێویستی سروشتیەوە بێ، بەڵکو زیاتر پێویستیەکی دەسکرد یان کەمالیاتە. ڕێگای ئاسنین دەبێتە هۆی هاندانی گەشتی زیاتر لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر کە لەم ڕۆژگارەدا باوە)*

کانکرین چەندین داوای بۆ دروستکردنی ڕێگای ئاسنین ڕەتکردەوە و تەنیا لە ساڵی ١٨٥١ دا بوو کە هێڵێك دروستکرا بۆ بەستنەوەی مۆسکۆ و سەینت پیتەرسبۆرگ. سیاسەتەکانی کانکرین لە لایەن کۆنت کلینمیشیلێ، کە بوە بەڕێوەبەری سەرەکی گواستنەوە و خانوبەرەی گشتی، بەردەوامیپێدرا. ئەم دەزگایە بوە بڕیادەری سەرەکی لە بواری دروستکردنی ڕێگای ئاسنین دا و ئەویش بۆ هێواشکردنەوەی دروستکردنیان بەکاریهێنا. لە دوای ساڵی ١٨٤٩ ئەو تەنانەت دەسەڵاتەکەی خۆی بەکارهێنا بۆ سڕینەسەرکردنی هەموو گفتوگۆیەك دەربارەی پەرەپێدانی ڕێگای ئاسنین.

نەخشەی (١٣) ئەنجامی پەیڕەوکردنی ئەم لۆجیکە ڕووندەکاتەوە. لە کاتێك دا بەریتانیا و زۆربەی ناوچەکانی سەرووی ڕۆژئاوای ئەوروپا لە ساڵی ١٨٧٠ ەدا

بە تۆڕی ڕێگای ئاسنین تەنرا بوون، ژمارەیەکی کەم لە ڕێگای ئاسنین ناوچە فراوانەکانی ڕوسیای گرتبۆوە. سیاسەتی دژە ڕێگای ئاسنین تەنیا دوای بەزاندنی تەواوی ڕوسیا لە لایەن هێزەکانی بەریتانیا و فەرەنسا و عوسمانییەکان لە جەنگی کرایمین لە نێوان سالآنی ١٨٥٣ و ١٨٥٦ دا، پێچەوانەکرایەوە، کاتێك ڕوسیا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دواکەوتنی تۆڕەکانی گواستنەوە مەترسییەکی گەورەیە بۆ سەر ئاسایشی وولآتەکە. بەهەمانشێوە پەرەپێدانی کەم لە ڕێگای ئاسنین دا هەبوو لە ئیمپراتۆریەتی نەمسا ـ هەنگاریا لە دەرەوەی نەمسا و ناوچەکانی ڕۆژئاوای ئیمپراتۆریەتەکە دا، هەرچەندە شۆڕشی ١٨٤٨ گۆڕانکاری لەم ناوچانەدا ئەنجامدابوو، بەتایبەتی هەڵوەشاندنەوەی بەندایەتی.

**نەخشەی (١٢): ڕێگای ئاسنین لە ئەوروپا دا لە ساڵی ١٨٧٠ دا**




ڕێگای ئاسنین ساڵی 1870

—— سنوران ساڵی 1870

# ڕێگە بە بەکارهێنانی کەشتی نادرێ

ڕەهایی نەك تەنیا لە زۆربەی ئەورووپا دا، بەڵکو لە ئاسیاش دا باڵادەست و بە هەمانشێوەش ڕێگەی لە بەپیشەسازیبوون گرت لە کاتی ئەو وەرچەرخانە مێژووییەی شۆڕشی پیشەسازی هێنایەئاراوە. بنەماڵە فەرمانڕەواکانی مینگ و کینگ لە چین و ڕەهایی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئەم ڕێچکەیە ڕووندەکەنەوە. لە سایەی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی سۆنگ دا لە نێوان ساڵانی ٩٦٠ و ١٢٧٩ دا، چین لە زۆربەی بوارەکانی نوێکاری تەکنەلۆجی دا پێشەنگی جیهان بوو. چینییەکان کاتژمێر و باروتی تفەنگ و کاغەز و پارەی کاغەز و پۆرسلین و کورەخانەی دروستکردنی ئاسنی داڕێژراویان پێش ئەورووپا داهێنا. ئەوان بە شێوەیەکی سەربەخۆ چەرخی خەرەك و هێزی ئاویان داهێنا، کەموزۆر لە هەمان ئەو کاتەی ئەمانە لە بەرەکەی تری یۆراسیادا سەریانهەڵدا. لە ئەنجامی ئەمانەدا، لە ساڵی ١٥٠٠ دا ئاستی گوزەرانی خەڵك بەلایەنیکەمەوە هێندەی ئەورووپا بەرز بوو. بۆ چەندین سەدە چین دەوڵەتی خاوەن مەرکەزیەت و دەوڵەتی خاوەن فەرمانبەرانی کەرتی گشتی بوو کە لەسەر بنەمای توانا دادەمەزران.

لەگەڵ ئەمەش دا، چین دەوڵەتێکی ڕەها و گەشەکردن لە سایەی بنەماڵەی فەرمانڕەوای سۆنگ دا لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا بوو. هیچ نوێنەرایەتییەك بۆ گروپە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگا جگە لە پاشایەتی، لە ئارادا نەبوو. هیچ شتێك نەبوو کە لە پەرلەمان یان کۆرتیز بچێ. هەمیشە بازرگانان پێگەیەکی ناشایستەیان لە چین دا هەبوو، داهێنانە مەزنەکانی سۆنگ بەهۆی هاندانی بازاڕەوە سەرچاوەیان نەگرتبوو، بەڵکو لە ژێر چاودێری و تەنانەت بە فەرمانی حکومەت ئەنجامدرابوون. زۆر کەم لەمانە خرابوونە چوارچێوەی بازرگانییەوە. کۆنترۆڵی دەوڵەت لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بنەماڵەکانی مینگ و کینگ کە دوای سۆنگ هاتن توندتر بوو. هۆکاری سەرەکی هەموو ئەمانە لۆجیکی ئاسایی دەزگایانی چەوسێنەر بوو. بەهەمانشێوەی زۆربەی ئەو فەرمانڕەوایانەی حوکمی دەزگایانی چەوسێنەر دەکەن، ئیمپراتۆرەکانی چینیش دژایەتی گۆڕانیان کرد و هەوڵی سەقامگیرییان داو لە تێکدانی بنیاتنەر

دەترسان.

ئەمەش لە ڕێگەی مێژووی بازرگانی نێودەوڵەتییەوە بەباشی ڕووندەکرێتەوە. هەروەك بینیمان، دۆزینەوەی هەردوو ئەمەریکا و شێوازی ڕێکخستنی بازرگانی نێودەوڵەتی، ڕۆڵی سەرەکییان بینی لە ململانێ سیاسییەکان و گۆڕانکاری دەزگایی لەقۆناخە سەرەتاییەکانی ئەورووپای مۆدێرن دا. لە چین، لە کاتێکدا بازرگانانی کەرتی تایبەت دەیانتوانی لە ناوەوەی چین دا بازرگانیبکەن، بازرگانی نێودەوڵەتی لە لایەن دەوڵەتەوە قۆرخکرابوو. کاتێك بنەماڵەی مینگ لە ساڵی ١٣٦٨ دا دەسەڵاتیان گرتەدەست، ئیمپراتۆر هۆنگو یەکەمجار هاتەسەرتەخت و بۆ ماوەی سی ساڵ فەرمانڕەواییکرد. هۆنگو نیگەرانبوو لەوەی کە بازرگانی دەرەوە لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە ناسەقامگیریی دروستدەکرد، بۆیە هێشتی بازرگانی نێودەوڵەتی ئەنجامبدرێ بە مەرجێك تەنیا لە لایەن حکومەتەوە ڕێکبخرایە و بازرگانان سەرانەیان بدایەتە حکومەت و چالاکی بازرگانییان ئەنجامنەدایە. هۆنگو سەدان کەسی لە سێدارە دا بە تاوانی ئەوەی هەوڵیان دابوو گەشتەکانی کۆکردنەوەی سەرانە بگۆڕن بۆ چالاکی بازرگانی. لە نێوان ١٣٧٧ و ١٣٩٧ دا تەنانەت هیچ گەشتێکی ناو زەریا بۆ کۆکردنەوەی سەرانەش ڕێگەی پێنەدرا. ئەو بازرگانیکردنی هاوڵاتییانی لەگەڵ بیانی یان دا قەدەخە کرد و نەیهێشت چینییەکان گەشتی دەریایی بەرەو دەرەوە بکەن.

لە ساڵی ١٤٠٢ دا ئیمپراتۆر یەنگلی هاتەسەرتەخت و بەناوبانگترین سەردەمی مێژووی چینی دەسپێکرد لە ڕێگەی دەسپێکردنەوەی بازرگانی دەرەوە بە ئەندازەیەکی گەورە و پشتگیرکراو لە لایەن حکومەتەوە. یەنگلی خەرجیەکانی گەشتکردنی ئەدمیراڵ ژانگ هوی گرتەئەستۆ بۆ ئەنجامدانی شەش گەشتی گەورە بۆ باشووری ڕۆژهەڵات و باشووری ئاسیا و وڵاتی عەرەب و ئەفریقا. چینییەکان زانیارییان دەربارەی ئەم شوێنانە هەبوو لە ڕێگەی مێژوویەکی درێژی پەیوەندی بازرگانییەوە، بەڵام لەوەبەر شتێکی بەم ئەندازەیە گەورە ڕووینەدابوو. یەکەم کەشتیگەل پێکهاتبوو لە ٢٧,٨٠٠ پیاو و ٦٢ کەشتی گەورەی خەزنە هەڵگرتن کە ١٩٠ کەشتی بچووکتریان لەگەڵ دا بوو، هەندیك لەو کەشتیانە تەنیا ئاوی سازگار و هەندێکی تریان ئازووقە و ئەوانی تریش سەربازیان هەڵگرتبوو. لەگەڵ ئەمەش دا ئیمپراتۆر یەنگلی بۆ ماوەیەکی

کاتی گەشتەکەی لە ساڵی ١٤٢٢ دا ڕاگرت و دواتریش گەشتەکە لە لایەن جێگرەوەکەیەوە کە ئیمپراتۆر هۆنگسی بوو لە ساڵی ١٤٢٤ تا ١٤٢٥ فەرمانڕەواییکرد، بە تەواوی ڕاگیرا. مردنی ناوەختی هۆنگسی، ئیمپراتۆر خواندی هێنایەسەرتەخت کە یەکەمجار هێشتی لە ساڵی ١٤٣٣ دا ژانگ هو دوا گەشتبکا. دوای ئەم گەشتە هەموو بازرگانییەك لەگەڵ دەرەوە دا قەدەخەکرا. بە هاتنی ساڵی ١٤٣٦ دروستکردنی کەشتی کرایە نایاسایی. قەدەخەکردنی بازرگانی دەرەوە تا ساڵی ١٥٦٧ بەردەوامبوو.

ئەم ڕووداوانە، هەرچەندە تەنیا مشتێکی ناو خەرواری ئەو چەوساندنەوانە بوون کە ڕێگر بوون لەبەردەم چەندین چالاکی ئابووری دا و ناسەقامگیرییان هێنایەئاراوە، کاریگەری بنەڕەتییان لەسەر پەرەپێدانی ئابووری چین هەبوو. هەر لەو کاتەی کە بازرگانی نێودەوڵەتی و دۆزینەوەی هەردوو ئەمەریکا ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لە دەزگاکانی ئینگلتەرە دا دەهێنایەئاراوە، چین خۆی لەم وەرچەرخانە مێژووییانە دادەبڕی و ڕووی بەرەو ناوەوە وەردەگێڕا. ئەم گەڕانەوەیە بۆ ناوەوە لە ساڵی ١٥٦٧ دا کۆتاییهات. بنەماڵەی فەرمانڕەوای مینگ لە ساڵی ١٦٤٤ دا لە لایەن گەلی جورچن لەناوبران کە مەنچوەکانی ناوەوەی ئاسیا بوون و بنەماڵەی فەرمانڕەوایی کینگیان دامەزراند. دوای ئەوە سەردەمێکی ناسەقامگیریی سیاسی بەردەوام دەستیپێکرد. کینگەکان دەستیان بە زەوتکردنی بەرفراوانی موڵك و ماڵی خەڵك کرد. لە ساڵی ١٦٩٠ دا، تانگ چێن کە زانایەکی خانەنشینکراو و بازرگانێکی تێشکاو بوو، نووسی:

*(زیاتر لە پەنجا ساڵ بەسەر دامەزراندنی بنەماڵەی فەرمانڕەوایی چینگ (کینگ) دا تێپەڕیوە و ئیمپراتۆریەتەکە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ هەژارتر دەبێ. جووتیاران داماو و کاربەدەستانیش داماون. دانەوێڵە هەرزانە، بەڵام زەحمەتە سکی یەکێك تێر بکا. پۆشاك هەرزانە، بەڵام زەحمەتە پێستی یەکێك داپۆشێ. پڕ بە بەلەمەکان کەلوپەل لە بازاڕێکەوە بۆ بازاڕێکی تر دەگوێزرێنەوە، بەڵام دەبێ ئەو کەلوپەلانە بە زەرەر بفرۆشرێن. کاربەدەستان کاتێك کارەکانیان بەجێدەهێڵن بۆیان دەردەکەوێ کە پاشەکەوتێکیان نییە خێزانەکانیانی پێ بەخێوبکەن. لە ڕاستیدا هەر چوار پیشەکە هەموویان بێدەرامەتن).*

لە ساڵی ١٦٦١ دا ئیمپراتۆر کانگسی فەرمانیکرد کە هەموو دانیشتوانی کەناری دەریا هەر لە ڤێتنامەوە تا چێکیانگ ـ کە هەموو کەناری باشووری دەگرتەوە و سەردەمێك ئەو ناوچانە لە ڕووی بازرگانییەوە چالاکترین ناوچەی

چین بوون ـ حەقدە میل بەرەو ناوەوە بگوێزرێنەوە. کەنارەکان لە لایەن سوپاوە چاودێریکران بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکە و تا ساڵی ١٦٩٣ کەشتیوانی بە درێژایی کەنارەکە قەدەخەکرا. ئەم قەدەخەکردنە ناوبەناو لە سەدەی هەژدەیەم دا پیادەدەکرا و سەرهەڵدانی بازرگانی دەرەوەی لە لایەن چینەوە لە گرێژەنەبرد. هەرچەندە هەندێك بازرگانیی سەریهەڵدا، بەڵام کەم کەس ئارەزووی ئەوەی هەبوو وەبەرهێنانبکا لە کاتێك دا ئیمپراتۆر دەیتوانی ڕای خۆی بگۆڕێ و بازرگانی قەدەخەبکا و وەبەرهێنان لە دروستکردنی کەشتی و کەلوپەل و پەیوەندییە بازرگانییەکان دا بێسود و تەنانەت خراپتریش بوو.

پاساوەکانی دەوڵەتەکانی مینگ و کینگ بۆ دژایەتیکردنی بازرگانی نێودەوڵەتی دەبێ ئێستا لامان ڕوونبێ: ترس لە تێکدانی بنیاتنەر. ئامانجی سەرەکی سەرکردەکان بریتیبوو لە سەقامگیریی سیاسی. بازرگانی نێودەوڵەتی لە جەوهەردا فاکتەری ناسەقامگیریی بوو چونکە بازرگانەکان دەوڵەمەند دەبوون و پشتئەستوور دەبوون، بەهەمان ئەو شێوەیەی لە ئینگلتەرە دا لە سەردەمی فراوانبوونی بازرگانی ئەتڵەسی دا ڕوویدا. ئەمە تەنیا بیروڕای فەرمانڕەوایانی مینگ و کینگ نەبوو، بەڵکو هەمان هەڵوێستی فەرمانڕەوایانی بنەماڵەی فەرمانڕەوایی سۆنگیش بوو هەرچەندە ئەوان ئامادەبوون خەرجی نوێکاری تەکنەلۆجی دابینبکەن و بواری ئازادی زیاتری بازرگانی برەخسێنن بەمەرجێك ئەمە لە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان دا بوایە. بارودۆخەکە لە سایەی فەرمانڕەوایی مینگ و کینگ دا خراپتر بوون کاتێك کۆنترۆڵی دەوڵەت لەسەر چالاکیە ئابوورییەکان توندتر و بازرگانی دەرەوە قەدەخەکرا. بە دڵنیاییەوە لە چینی سەردەمی مینگ و کینگ دا بازاڕ و بازرگانی هەبوون و حکومەت باجی سووکی لەسەر ئابووری ناوخۆ دانابوو، بەڵام حکومەت شتێکی ئەوتۆی نەکرد بۆ یارمەتیدانی نوێکاری و پەرەسەندنی بازرگانی یان خۆشگوزەرانی پیشەسازی گۆڕییەوە بە سەقامگیریی سیاسی. ئاکامی هەموو ئەم کۆنترۆڵکردنە ڕەهایەی ئابووری پێشبینیکراو بوو: ئابووری چین لە سەرتاسەری سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم دا چەقیبەست لە کاتێك دا ئابوورییەکانی تر خەریکی بەپیشەسازیبوون بوون. هەر لەو کاتەدا کە ماو ڕژێمە کۆمیۆنیستەکەی دامەزراند، چین بووبوە یەکێك لە هەژارترین وولاتانی جیهان.

# ڕەهایی پرێستەر جۆن

ڕەهـایی وەك كۆمـەڵێك دەزگـای سیاسـی و ئـەو ئاكامـە ئابوورییانـەی ئـەم دەزگا سیاسییانە دروستیانكردن تـەنیا تایبـەت نـەبوون بـە ئـەورووپا و ئاسـیا، بەڵكو لە ئەفریقاش دا هەبوو. بۆ نموونە، لە پاشـایەتی كۆنگـۆ دا، هـەروەك لـە چـاپتەری دوەم دا بینیمـان. تەنانـەت نموونەیـەكی درێژخایـەنتری ڕەهـایی ئەفریقی بریتییە لە ئەسیوپیا یان ئەبیسینیا كە لە چاپتەری شەشـەم دا باسـی ڕیشەكانی ئەم ڕەهاییە كرا كاتێك باسی فیودالیزممان كرد لە دوای لەناوچـوونی ئاكسۆم. ڕەهایی ئەبیسینیا لەوانەی ئەورووپا درێژخایـەنتر بـوو چـونكە تووشـی تەحەدا و وەرچەرخانی مێژوویی جیاواز بۆوە.

دوای ئەوەی ئێزانای پاشای ئاكسۆم بـوە مەسـیحی، ئەسـیوپیەكان لەسـەر ئـاینی مەسـیحی مانـەوە و بـە هـاتنی سـەدەی چـواردەیەم بوونـە مەڵبەنـدی ئەفسانەی پرێستەر جۆن پاشـا. پرێـستەر جـۆن پاشـایەكی مەسـیحی بـوو كـە بەهۆی زیادبوونی دەسەڵاتی ئیسلامەوە لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا لـە ئەورووپا دابڕابوو. لەسـەرەتادا وا بیردەكرایـەوە كـە پاشـایەتییەكەی كەوتبێتـە هیندستانەوە، بەڵام بە زیادبوونی زانیاری ئەورووپییەكان دەربارەی هیندسـتان، دەركەوت كە ئەمە ڕاست نەبوو. پاشای ئەسیوپیا لەبەر ئەوەی مەسـیحی بـوو، بوە ئامانجی سروشـتیی ئەفسانەكە. لـە ڕاسـتیدا پاشـاكانی ئەسـیوپیا هـەوڵی زۆریـان دا تـا هاوپـەیمانی لەگـەڵ پاشـاكانی ئـەورووپا دا دژی پـەلامارەكانی عەرەبەكان پێكبهێنن. بەلایەنیكەمەوە لە دوای ساڵی ١٣٠٠ ەوە دەسـتیان كـرد بـە نـاردنی شـاندی دیپلۆماسـی و تەنانـەت پاشـای پورتوگالیـان ڕازیكـرد كـە سەربازیان بۆ بنێرێ.

ئەم سەربازانە شانبەشانی دیپلۆماتـەكان و یەسـوعیەكان و گەشـتیاران كـە حەزیاندەكرد پرێستەر جـۆن ببیـنن، چـەندین زانیارییـان دەربـارەی ئەسـیوپیا بەجێهیشتوە. هەندێك لەو زانیارییانە كە لە ڕووی ئابوورییـەوە بایـەخیان هەیـە لـە لایـەن فرانـسیس ئـەلڤارس كـە قەشـەیەكی هـاوڕای شـاندی دیپلۆماسـی پورتوگالیەكان و لە ساڵی ١٥٢٠ تا ١٥٢٧ لە ئەسیوپیا بـوو، تۆمـاركراوە. جگـە لەمەش، زانیاری تر لە لایەن یەسوعی مانۆیل دی ئەلەمایدا كە لە ساڵانی ١٦٢٤

ەوە لە ئەسیوپیا ژیاوە و جۆن بروس کە گەشتیارێك بوو لە نێوان ساڵانی ١٧٦٨ و ١٧٧٣ دا لەو وولاتەدا ژیاوە، خراوەتەڕوو. نووسینەکانی ئەم کەسانە زانیاری دەوڵەمەند دەربارەی دەزگایانی سیاسی و ئابووری ئەو کاتەی ئەسیوپیا دەخەنەڕوو و هیچ گومانێك ناهێڵنەوە کە ئەسیوپیا نموونەیەکی روونی ڕەهایی بوە و هیچ جۆرە دەزگایەکی پلورەلیستی و هیچ جۆرە چاودێری و جڵەوگیرییەك بۆ دەسەڵاتی ئیمپراتۆر نەبوە کە وای دانابوو گوایە وەچەی سولەیمان پاشا و شاژنی شێبای ئەفسانەییە.

ئاکامی ڕەهایی، ناجێگیریی بەرچاوی مافی مۆڵکداری بوو، کە ستراتیژی سیاسی ئیمپراتۆر هێنابویەئاراوە. بۆ نموونە، بروس دەگێڕێتەوە:

*(هەموو زەوییەکان هی پاشان: ئەو لەکاتی رأبواردن دا دەیانبەخشێ بە ئەو کەسانەی دەیەوێ کاتێکیش حەزبکا وەریاندەگرێتەوە. کاتێکیش دەمرێ هەموو زەوییەکانی پاشایەتییەکە دەکەونە بندەستی تاجەوەو بەوەندەشەوە ناوەستن، بەڵکو کاتێك خاوەنی هەنووکەیی زەوییەك دەمرێ، هەموو ئەو موڵك و ماڵانەی هەیەتی دەبنە هی پاشا و نادرێنە کوڕە گەورەکەی).*

ئەلڤارس پێیوابوو کە *(بەروبومێکی زیاتر دەستدەکەوت ئەگەر پیاوە مەزنەکان بە خراپی مامەڵەیان لەگەڵ خەڵکەکەدا نەکردایە)* زانیارییەکانی ئەلەمایدا دەربارەی ئەوەی کە کۆمەڵگاکە چۆن بەڕێوەچوە، زۆر هاوشێوەیە. ئەو سەرنجی دا:

*(هێندە ئاسایییە بۆ ئیمپراتۆر کە هەر دوو یا سێ ساڵ جارێك و تەنانەت چەندین جاریش لە ساڵێك دا زەوی پیاوێك بگۆڕێتەوە و گۆڕانکاری تێدا بکا و لێی بسەنێتەوە کە هیچ سەرسوڕمانێك دروستناکا. زۆرجار پیاوێك زەوییەکە دەکێڵێ و یەکێکی تر تۆوی پێوەدەکا و یەکێکی تر بەرهەمەکەی دەخوا. ئەمەش دەبێ بە هۆی ئەوەی کەس نەبێ بایەخ بەو زەوییە بدا بەدەستیەوەیەتی، تەنانەت هیچ کەسێك نییە درەختێك بڕوێنێ چونکە دەیزانێ هەرچەندە ئەو درەختەکەی ڕواندوە بەڵام زۆر کەم ڕێدەکەوێ کە هەر خۆی بەرەکەی کۆبکاتەوە. هەرچونێك بێ سوودی پاشای تێدایە کە ئەوان بەو ئەندازەیە پشتببەستن بە ئەو).*

ئەم وەسفکردنانە پێشنیازی لێکچوونی گەورە دەکەن لە نێوان پێکهاتەی سیاسی و ئابووری ڕەهای ئەسیوپیا و ئەوانەی ئەوروپا دا، هەرچەندە روونیان

کردۆتەوە کە ڕەهایی لە ئەسیوپیادا توندتر و دەزگا ئابوورییەکانیش تەنانەت چەوسێنەر تر بوون. جگە لەمە، هەروەك لە چاپتەری شەشەم دا جەختمان لەسەر کرد، ئەسیوپیا ڕووبەڕووی هەمان ئەو وەرچەرخانە مێژووییانە نەبۆوە کە هاوکاری لاوازکردنی ڕژێمە ڕەهاکەی ئینگلتەرەی کرد. ئەسیوپیا لە چەندین لەو پرۆسانەی جیهانی ئەمرۆیان دارشت، دابڕا. خۆ ئەگەر بارودۆخەکە بەم شێوەیەش نەبوایە، ئەوا توندی ڕەهاییەکەی ڕەنگە ببوایەتە زیاتر بەهێزکردنی ڕەهایی. بۆ نموونە، هەروەك ئیسپانیا، بازرگانی نێوەدەوڵەتی لە ئەسیوپیا، لەوانە بازرگانی چەوری کۆیلان لە لایەن پاشاوە کۆنترۆڵکرابوو. ئەسیوپیا بەتەواوەتی دانەبڕابوو: ئەوروپییەکان لە گەڕان دا بوون بۆ پرێستەر جۆن و ناچار بوو لەگەڵ قەوارە موسڵمانەکانی دراوسێی دا شەڕبکا. لەگەڵ ئەمەش دا مێژووناس ئێدوارد گیبۆن سەرنجیدا *( لە هەموو لایەکەوە بە دوژمنانی ئاینەکەیان دەورەدرابوون، ئەسیوپییەکان بۆ نزیکەی هەزار ساڵ خەویان لێکەوت و جیهانیان لە بیرچۆوە و جیهانیش ئەوانی لە بیرچۆوە)*

کاتێك لە سەدەی نۆزدەیەم دا بەکۆلۆنیکردنی ئەفریقا دەستپێکرد، ئەسیوپیا پاشایەتییەکی سەربەخۆ بوو لە ژێر فەرمانڕەوایی ڕاس (دۆق) کاسا کە لە ساڵی ١٨٥٥ دا وەك ئیمپراتۆر تیۆدرۆسی دوەم تاجی لەسەر نا. تیۆدرۆس دەستیکرد بە نوێکردنەوەی دەوڵەت و دروستکردنی بیرۆکراسی و دادوەرییەکی زۆر مەرکەزی تر و پێکەوەنانی سوپایەك کە توانای کۆنترۆڵکردنی وولات و بەرەنگاربوونەوەی ئەوروپییەکانی هەبوو. ئەو کاربەدەستە سەربازیانەی کە بەرپرسیاربوون لە کۆکردنەوەی باج و ناردنی بۆ ئەو، کردە بەرپرسی هەموو پارێزگاکان. دانوستانەکانی لەگەڵ هێزە ئەوروپییەکان دا زەحمەت بوو، لە کاتی هەڵچوونی دا کونسوڵی ئینگلیزی بەندکرد. لە ساڵی ١٨٦٨ دا ئینگلیزەکان هێزێکی تەمێکردنیان ڕەوانەی ئەسیوپیا کرد کە پایتەختەکەیان داگیرکرد و تیۆدرۆسیش خۆی کوشت.

بەهەمانشێوە، ئەو حکومەتەی لە دوای تیۆدرۆس دروستکرابۆوە توانی یەکێك لە سەرکەوتنە گەورەکانی دژە کۆلۆنیالی سەدەی نۆزدەیەم دژی ئیتالییەکان تۆماربکا. لە ساڵی ١٨٨٩ دا مینیلیکی دوەم بوە پاشا و هەر زوو ڕووبەڕووی داخوازییەکی ئیتالیا بۆوە بۆ دامەزراندنی کۆلۆنییەك لە وولاتەکەی دا. لە ساڵی ١٨٨٥ دا بیسمارکی چانسلەری ئەڵمانیا کۆنفرانسێکی لە بەرلین

ڕێکخستبوو کە تیایدا ئەوروپییەکان پلانی "بەدەستهێنانی ئەفریقا" یان خستبوەڕوو کە بریتیبوو لە بڕیاردان دەربارەی چۆنیەتی دابەشکردنی ئەفریقا بەسەر چەندین ناوچەی پاراستنی بەرژەوەندی ئەوروپییەکان دا. لە کۆنفرانسەکەدا ئیتالیا مافی دامەزراندنی کۆلۆنی لە ئەریتریا لەسەر کەنارەکانی ئەسیوپیا و لە سۆمالْ مسۆگەرکرد. هەرچەندە ئەسیوپیا لە کۆنفرانسەکەدا نەبوو، بەلاّم بەبێ دەستێوەردان لە وولاّتەکەی دا ڕزگاری بوو. بەلاّم ئیتالییەکان هەر چاویان بڕیبوە ئەسیوپیا و لە ساڵی ١٨٩٦ دا بە سوپاکەیانەوە بەرەو باشووری ئەریتریا کەوتنەڕێ. وەلاّمی مینیلیك هاوشێوەی وەلاّمی پاشایەکی چەرخەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا بوو. ئەو سوپایەکی پێکەوە نا لە ڕێگەی ناچارکردنی پیاوماقوڵەکانەوە بۆ کۆکردنەوەی پیاوەکانیان. ئەم ڕێگەیە نەیتوانی سوپایەك بۆ ماوەیەکی درێژ لە مەیدانی شەڕدا پێکەوە بنێ بەلاّم توانی ئەمە بۆ ماوەیەکی کورت ئەنجامبدا. ئەم ماوە کورتەش بەس بوو بۆ تێشکاندنی ئیتالییەکان، کە سوپا پازدە هەزار کەسییەکەیان لە لایەن سوپا سەد هەزار کەسییەکەی مینیلیکەوە لە شەڕی ئەدۆوا لە ساڵی ١٨٩٦ دا بەزێنرا. ئەمەش گرنگترین دۆڕاندن بوو کە وولاّتێکی ئەفریقی پێش کۆلۆنیالی بتوانێ بەسەر هێزێکی ئەوروپی دا بسەپێنێ و سەربەخۆیی ئەسیوپیای بۆ ماوەی چل ساڵی دواتر مسۆگەرکرد.

دوا ئیمپراتۆری ئەسیوپیا، ڕاس تافاری بریتیبوو لە هیلا سیلاسی لە ساڵی ١٩٣٠ دا. هیلا سیلاسی فەرمانڕەواییکرد تا بەهۆی دوەم پەلاماری ئیتالیاوە کە لە ساڵی ١٩٣٥ دا دەستیپێکرد لە سەرتەخت لابرا، بەلاّم لە ساڵی ١٩٤١ بە یارمەتی ئینگلیزەکان گەڕایەوە و فەرمانڕەواییکرد تا لە ساڵی ١٩٧٤ دا لە لایەن درێگ "کۆمیتەکە" کە گروپێکی ئەفسەرانی سوپای مارکسی بوون لە ڕێگەی کۆدێتاوە لە سەرتەخت لابرا، ئەوانیش بوونە هۆی زیاتر هەژارکردن و وێرانکردنی وولاّت. دەزگا ئابوورییە بنەڕەتییەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕەهای ئەسیوپی وەکو گولْت و ئەو فیوداڵیزمەی دوای لەناوچوونی ئاکسۆم دامەزرا، تا هەڵوەشاندنەوەیان لە ئەنجامی شۆڕشەکەی ١٩٧٤ دا مانەوە.

ئەمڕۆ ئەسیوپیا یەکێکە لە هەژارترین وولاّتانی جیهان. داهاتی تاکێکی مامناوەندی ئەسیوپی نزیکەی یەك لەسەر چواردەی داهاتی هاوولاّتییەکی مامناوەندی ئینگلتەرەیە. زۆربەی دانیشتوانەکەی لە لادێکان دا دەژین و تەنیا بەشی تێرکردنی سکی خۆیان کشتوکاڵ دەکەن. ئاوی پاك و کارەبا و

قوتابخانـەی ڕێکوپێـك و خزمـەتگوزاری تەندروسـتییان نییـە. تێکـڕای تەمـەن نزیکەی پەنجاو پێنج ساڵەو تەنیا یـەك لـە سـەر سـێی کەسـانی سـەروو تەمـەن هـەژدە سـاڵ خوێنـدەوارن. بـەراوردکردن لـە نێـوان ئینگلتـەرە و ئەسـیوپیا نایەکسانی لە جیهان دا دەردەخا. هۆکاری ئەوەی کە ئەسیوپیا لـەو پێگەیـەی ئەمڕۆیدایە ئەوەیە کە بە پێچەوانەی ئینگلتەرەوە ڕەهایی لە ئەسیوپیادا هـەتا ڕابوردویـەکی نـزیکیش بـەردەوامبوو. لەگـەڵ ڕەهـایی دا، دەزگایـانی ئـابووری چەوسـێنەر و هـەژاری بـەرۆکی جـەماوەری ئەسـیوپیایان گـرت، هەرچـەندە ئیمپراتۆر و پیاوماقوڵەکان قازانجی زۆریان کـرد. ئاکامی کاریگـەرتری ڕەهـایی ئـەوە بـوو کـە کۆمـەڵگای ئەسـیوپی نـەیتوانی کـەڵك لـە دەرفەتـەکانی بەپیـشەسازیبوون لـە سـەدەی نۆزدەیـەم و سـەرەتای سـەدەی بیـستەم دا وەربگـرێ و ئەمـەش بـوە هۆکـاری سـەرەکی هـەژاری هاوڵاتییـانی ئـەمڕۆی ئەسیوپیا.

## نەوەکانی ساماڵی ( Childern of Samaale )

دەزگایانی سیاسی ڕەهـا لـە سەرتاسـەری جیهـان دا کۆسـپبوون لەبـەردەم بەپیـشەسازیبوون دا، یـان بـە شـێوەیەکی ناڕاسـتەوخۆ لـە ڕێگـەی شـێوازی ڕێکخستنی ئابوورییـەوە، یـان بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ هـەروەك لـە نەمسا-هەنگاریا و ڕوسیا دا بینیمان. بەڵام ڕەهایی تەنیا کۆسپی بەردەم سـەرهەڵدانی دەزگایانی ئابووری کراوە نەبوو. لـە کـازێوەی سـەدەی نۆزدەیـەم دا، چـەندین ناوچەی جیهان، بەتایبەتی لە ئەفریقا دا، دەوڵەتی ئەوتۆیان نـەبوو کـە بتـوانن کەمترین ئاستی پاراستنی یاسا و ئاسایش دابینبکەن کە پێشمەرجە بـۆ بـوونی ئابوورییەکی مۆدێرن. هاوشێوەی پیتەری مەزنی ڕوسیا کە دەستی بە پرۆسەی مەرکەزیەتی سیاسی کرد و دواتـریش سیـستەمی ڕەهـای دامەزرانـد، لـە ئـارادا نەبوو، باسی تیودۆرەکانی ئینگلتـەرە هـەر مەکـە کـە مەرکەزیـەتی دەوڵـەتیان دامەزراند بێئەوەی بە تەواوی پەرلەمان و ئـەو سـنووردارییانەی تـر کـە لەسـەر دەسەڵاتیان هەبوو لەناوبەرن - یان ڕاستر بێئەوەی بتوانن لە ناویانبەرن - بـەبێ بوونی ئەندازەیەك لـە مەرکەزیـەتی سیاسـی، تەنانـەت ئەگـەر نوخبـەکانی ئـەم قەوارە ئەفریقییانە حەزیشیان بکردایە باوەش بـۆ بەپیـشەسازیبوون بکەنـەوە،

شتێکی ئەوتۆیان پێنەدەکرا.

سۆماڵ کە دەکەوێتە قۆچی (Horn)ی ئەفریقاوە، کاریگەری تێکدەرانەی نەبوونی مەرکەزیەتی سیاسی ڕووندەکاتەوە. لە ڕووی مێژووییەوە، سۆماڵ لە لایەن گەلێکەوە کە لەشەش خێڵ پێکهاتوە بەڕێوەچوە. گەورەترین چوار لەم خێڵانە بریتین لە دیر و دارۆد و ئیسحاق و هاویە و هەموویان بنەچەی خۆیان بۆ بنەچەیەکی ئەفسانەیی دەگێڕنەوە کە سامالّی یە. ئەم بنەماڵە خێڵەکییانە لە باکووری سۆماڵ سەریانهەڵداوە و بەرەبەرە بەرەو باشوور و ڕۆژهەلات بڵاوبوونەوە و تەنانەت ئەمڕۆش بە شێوەیەکی سەرەکی کۆچەرن و لەگەڵ ڕانە مەڕ و بزن و حوشترەکانیان دا ژیانی کۆچەری بەسەردەبەن. لە باشوور دا، دیگیل و ڕەحانوین کە نیشتەجێن و خەریکی کشتوکاڵن، دوو بنەماڵە خێڵەکییەکەی تر پێکدەهێنن. ناوچەکانی نیشتەجێبوونی ئەم خێڵانە لەسەر نەخشەی (١٢) پیشاندراوە.

ئینتیمای سۆماڵییەکان یەکەم بۆ خێڵەکانیانە، بەلام ئەم خێڵانە زۆر گەورەن و چەندین گروپی بچووکتریان لە خۆگرتوە. لە ڕیزی پێشەوەی ئەمانە ئەو خێڵانەن کە بنەچەی خۆیان دەگێڕنەوە بۆ یەکێك لە خێڵە گەورەکان. لەهەمووشی گرنگتر، ئەو گروپانەی ناو خێڵەکانن کە پێیان دەوترێ گروپانی پارەدەری دیا کە لە کەسانی خزمی نزیکی یەکتر پێکهاتوون و دیا، یان "پارەی خوێن" دەدەن یان کۆدەکەنەوە وەك قەرەبووکردنەوە بەرامبەر کوشتنی یەکێك لە ئەندامانیان. خێڵە سۆماڵییەکان و گروپانێك کە دیا دەدەن بە درێژایی مێژوو لە شەڕوشۆڕی بەردەوام دا بوون لەسەر ئەو دەرامەتە کەمانەی لەبەردەستیان دا بوە بەتایبەتی سەرچاوەکانی ئاو و لەوەڕگای باش بۆ ئاژەڵەکانیان. ئەو خێڵانە بەردەوام پەلاماری ئاژەڵەکانی خێڵ و گروپانی دیا دەری دراوسێیان داوە. هەرچەندە خێڵەکان سەرکردەیان هەبوو کە پێیان دەوترا سوڵتان و هەروەها ڕیشسپیان هەبوو، بەلام ئەمانە هیچ دەسەلاتێکی ڕاستەقینەیان نەبوو. دەسەلاتی سیاسی بە شێوەیەکی زۆر فراوان دابەشکرابوو، هەموو پیاوێکی سۆماڵی دەیتوانی قسەی هەبێ لەسەر ئەو بڕیارانەی کە لەوانەبوو کاریگەرییان بۆ سەر خێڵ یان گروپەکە هەبوایە. ئەمەش لە ڕێگەی ئەو ئەنجوومەنە نافەرمییەوە ئەنجامدەدرا کە لە پیاوان پێکهاتبوو یاسای نووسراو و پۆلیس و سیستەمی یاسایی نەبوون جگە لە یاسای شەریعە و لەو چوارچێوەیەدا یاسا نافەرمییەکان داڕێژرابوون. ئەم یاسا

نافەرمییانە بۆ گروپانی دیا دەر لەوەی پێیدەوترا بیر داڕێژرابوون کە بریتیبوون لە کۆمەڵێك ئەرك و بەرپرسیارێتی و ماف کە گروپەکە داوایاندەکرد لەوانی تر لە کاتی مامەڵەکردنیان دا لەگەڵ گروپەکەیان دا پەیڕەوییانبکەن. بە تەشەنەکردنی فەرمانڕەوایی کۆلۆنیالی، دەستکرا بە نووسینەوەی ئەم بیرانە. بۆ نموونە، نەوەی حەسەن ئاغا گروپێکی دیا دەری پێنج سەد پیاوییان پێکدەهێنا و تیرەیەك بوون لە خێڵی دیر لە سۆماڵیلاندی بەریتانی دا. لە مانگی ئازاری ١٩٥٠ بیرەکەیان لە لایەن کۆمسیاری بەریتانی لە ناوچەکەدا تۆمارکرا، کە سێ بەند لە بیرەکە بەم شێوەیە بوون:

1. *کاتێك پیاوێکی گروپی حەسەن ئاغا لە لایەن گروپێکی ترەوە دەکوژرێ، بیست حوشتر لە حەقی خوێنەکەی کە ١٠٠ حوشترە لە لایەن میراتگرەکەیەوە وەردەگیرێ و ئەو هەشتا حوشترەی دەمینێتەوە بەسەر هەموو ئەندامانی گروپی حەسەن ئاغا دا دابەشدەکرێن.*
2. *ئەگەر پیاوێکی گروپی حەسەن ئاغا لە لایەن کەسێکی دەرەکییەوە بریندارکرا و حەقی برینەکەی بریتیبوو لە سیوسێ و یەك لەسەر سێ حوشتر، ئەوا پێویستە دە حوشتر بدرێتە خۆی و ئەوەی دەمێنێتەوە بدرێتە گروپی جیفۆ (کە بەشێك بوو لە گروپی دیا دەر)*
3. *تاوانی کوشتن لە ناو ئەندامانی گروپی حەسەن ئاغا دا دەبێ بە رێژەی سیوسێ و یەك لە سەر سێی حوشترێك قەرەبوو بکرێتەوە و تەنیا دەدرێ بە کەسی میراتگری کوژراوەکە. ئەگەر تاوانبارەکە نەیتوانی هەموو یان بەشێکی قەرەبووکردنەوەکە بدا ئەوا لە لایەن بنەماڵەکەیەوە هاوکاری دەکرێ.*

جەختی سەرەکی بیر لەسەر کوشتن و بریندارکردن، بارودۆخی بەردەوامی شەڕ لە نێوان گروپانی دیا و خێڵەکان دا پیشاندەدا. لە هەمووشی گرنگتر بریتیبوو لە سامانی خوێن و دوژمنایەتی. تاوانێك دژی ئەندامێکی گروپی دیا دەر تاوان بوو دژی هەمووگروپەکە و پێویستی بە قەرەبووکردنەوە هەبوو کە پارەی خوێن بوو. ئەگەر ئەم پارەی خوێنە نەدرایە ئەوا گروپی دیا دەری ئەو کەسەی تاوانەکەی کردوە ڕووبەڕووی تۆڵەکردنەوەی گروپی قوربانییەکە دەبۆوە. کاتێك گواستنەوەی مۆدێرن گەیشتە سومالْ، سامانی خوێن درێژکرایەوە بۆ ئەو کەسانەی کە لە ڕووداوی هاتوچۆدا دەکوژران یان بریندار

دەبوون. دیری حەسەن ئاغا تەنیا ئاماژەی بە کوشتن نەدابوو، بەڵکو بەندی شەشەم بریتیبوو لەوەی *(ئەگەر پیاوێکی گروپی حەسەن ئاغا لە کۆبوونەوەی ئەنجوومەن دا سوکایەتی بە کەسێکی تر کرد ئەوا پێویستە ١٥٠ شیلینگ بداتە ئەو لایەنەی سوکایەتی پێکراوە)*

لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٥ دا ئاژەڵی دوو خێڵ، حەبەر تۆل جەعلو و حەبەر یونس لە ناوچەی دۆمبیرێلی لە نزیك یەکەوە دەلەوەڕان. پیاوێك لە تیرەی یونس، دوای دەمەقاڵێیەك لەسەر لەوەڕاندنی حوشتر لەگەڵ یەکێکی حەبەر تۆل جەعلو، بریندار بوو. خێڵی یونس هەر زوو وەڵامیان دانەوە و هێرشیانکردە سەر خێڵی تۆل جەعلو و پیاوێکیان لێکوشتن. خێڵی یونس، بە پێی بەندەکانی سامانی خوێن پێشنیازی قەرەبووکردنەوەیان کرد و خێڵی تۆل جەعلو ڕازیبوون. دەبوایە سامانی خوێنەکە بە شەخسی و هەروەك باو بوو بە پێدانی حوشتر ئەنجامبدرایە. لە بۆنەی تەسلیمکردنەکە دا ئەندامێکی تۆل جەعلۆ ئەندامێکی خێڵی یونسی کوشت کە وایزانیبوو ئەندامی گروپی دیا دەری بکوژەکەیە. ئەمەش بوە هۆی بەرپابوونی جەنگی سەرتاسەری و لەماوەی چلو هەشت کاتژمێری دواتردا سیازدە کەس لە خێڵی یونس و بیست و شەش کەس لە خێڵی تۆل جەعلو کوژران. جەنگ لە نێوانیان دا بۆ ساڵێکی تریش بەردەوامبوو تا ڕیشسپیەکانی هەردوو خێڵەکە لە لایەن ئیدارەی کۆلۆنیالی بەریتانییەوە بەیەك گەیەنران و توانیان ڕێکیان بخەنەوە لە ڕێگەی پێدانی پارەی خوێنەوە کە هەردوو لا لەسەری ڕێکەوتن و لە ماوەی سێ ساڵی دواتردا درا.

پارەی خوێن لە بەر سێبەری هەڕەشەی بەکارهێنانی هێز و دوژمنایەتییەوە دەدرا و تەنانەت کاتێکیش دەدرا مەرج نەبوو کۆتایی بە ناکۆکیەکان بهێنێ. ناکۆکیەکان هێواش دەبوونەوە و دیسانەوە سەریانهەڵدەدایەوە.

دەسەڵاتی سیاسی بە فراوانی دابەشکرابوو لە ناو کۆمەڵگای سۆماڵی دا، تا ڕادەیەکی زۆر دابەشکردنێکی پلورەلیستی بوو. بەڵام بە بێبوونی دەسەڵاتی دەوڵەتێکی خاوەن مەرکەزیەت بۆ چەسپاندنی ئاسایش، باسی مافی موڵکداری هەرمەکە، ئەمە نەبوە هۆی سەرهەڵدانی دەزگایانی کراوە. کەس ڕێزی دەسەڵاتی کەسێکی تری نەدەگرت و کەسیش، تەنانەت دەوڵەتی کۆلۆنیالی

بەریتانی کاتێك گەیشتە ئەو وولاتە، نەیتوانی ئاسایش بسەپێنێ. نەبوونی مەرکەزیەتی سیاسی کارێکی وایکرد کە ئەستەم بوو سۆماڵ سوود لە شۆڕشی پیشەسازی وەربگرێ. لەم چەشنە کەشەدا نەدەکرا بیر لە وەبەرهێنان یان بەکارهێنانی تەکنەلۆجی نوی بکرێتەوە کە لە بەریتانیاوە دەهاتن یان بیر لە دامەزراندنی ڕێکخراوانی وابکرێتەوە کە پێویست بوون بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانە.

سیاسەتی ئالۆزی سۆماڵ ئاکامی تەنانەت خراپتری بۆ پێشکەوتنی ئابووری هەبوو. پێشتر باسی هەندێك لە لەغزە تەکنەلۆجییە گەورەکانی مێژووی ئەفریقامان کرد. بەر لە تەشەنەکردنی دەسەلاتی کۆلۆنیالی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دا کۆمەڵگایانی ئەفریقی خاوەنی ئامرازەکانی گواستنەوەی چەرخدار یان کشتوکاڵکردن لە ڕێگەی بەکارهێنانی گاسن نەبوون و کەم لەو کۆمەڵگایانە خاوەنی نووسین بوون. ئەسیوپیا هەروەك بینیمان خاوەنی نووسین بوو. سۆمالییەکانیش پیتەکانی نووسینیان هەبوو بەڵام بە پێچەوانەی ئەسیوپیەکانەوە ئەوان بەکاریان نەهێنان. پێشتر حاڵەتی لەم چەشنەمان لە مێژووی ئەفریقادا بینی. ڕەنگە کۆمەڵگایانی ئەفریقی چەرخ و گاسنیان بەکارنەهێنابێ بەڵام بە دڵنیاییەوە زانیارییان دەربارەیان هەبوو. لە حاڵەتی پاشایەتی کۆنگۆ، هەورەك بینیمان، ئەمە لە بنەڕەت دا بەهۆی ئەو ڕاستییەوە بوو کە دەزگا ئابوورییەکان هیچ هاندانێکیان نەخستبوە بەردەم خەڵك بۆ بەکارهێنانی ئەم تەکنەلۆجییانە. ئایا بە بەکارهێنانی نووسین هەمان ئەو کێشانە قووتدەبوونەوە؟

دەتوانین لە میانەی ووردبوونەوە لە پاشایەتی تاکالی کە کەوتبوە باکووری ڕۆژئاوای سۆماڵ لە ناو گردەکانی نوبای باشووری سودان دا هەندێك زانیاریمان دەستبکەوێ. پاشایەتی تاکالی لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم دا لە لایەن کۆمەڵێك جەنگاوەرەوە کە لە لایەن پیاوێکەوە سەرکردایەتیان دەکرا بە ناوی ئیسماعیل دامەزرا و بە سەربەخۆ مایەوە تا لە ساڵی ١٨٨٤ خرایە ناو ئیمپراتۆریەتی بەریتانییەوە. گەل و پاشاکانی تاکالی دەرفەتی نووسینیان بە عەرەبی هەبوو بەڵام بەکاریان نەهێنا ـ تەنیا لە لایەن پاشاکانەوە نەبێ بۆ پەیوەندیکردنی دەرەکی لەگەڵ قەوارە سیاسییەکانی تر و پەیوەندی دیپلۆماسی. پێدەچێ ئەم بارودۆخە لەسەرەتادا زۆر جێگەی سەرسوڕمان بێ.

بۆچوونی تەقلیدی دەربارەی بنچینەی نووسین لە میسۆپۆتامیا ئەوەیە کە نووسین لە لایەن دەوڵەتانەوە پەرەپێدرا بۆ تۆمارکردنی زانیاری و کۆنترۆڵکردنی خەڵك و وەرگرتنی باج. ئایا دەوڵەتی تاکالی حەزی لەمانە نەدەکرد؟

ئەم پرسیارانە لە کۆتایی ۱۹۷۰ کان دا لایەن مێژووناس جانیێ ئێواڵد لێکۆڵینەوەیان لەسەر کرا کاتێك هەوڵی نوسینەوەی مێژووی تاکالی دەدا. بەشێك لە چیرۆکەکە ئەوەیە کە هاوڵاتییان نەیانویست نووسین بەکاربهێنن چونکە لەوە دەترسان کە نووسینەکە بەکاربهێنرێ بۆ کۆنترۆڵکردنی دەرامەتەکانی وەك زەوی بەنرخ لە ڕێگەی بوار ڕەخساندن بۆ دەوڵەت تا بانگەشەی خاوەندارێتی ئەو زەوییانە بکا. لە هەمانکات دا لەوە دەترسان کە نووسین دەبوە هۆی وەرگرتنی سیستەماتیکی زیاتری باج. ئەو فەرمانڕەوایەتییە بنەماڵەییەی ئیسماعیل دایمەزراند نەبوە دەوڵەتێکی بەهێز. تەنانەت ئەگەر حەزیشیان بکردایە ئەوا دەوڵەتەکە هێندە بەهێز نەبوو تا ئیرادەی خۆی بەسەر ناڕەزاییەکانی هاوڵاتییان دا بسەپێنێ. بەڵام فاکتەری تری، نادیارتر لە کاردا بوون. نوخبە جیاوازەکانیش دژی مەرکەزیەتی سیاسی بوون، بۆ نموونە، پەیوەندی زارەکی یان لا باشتر بوو لە نووسین لە پەیوەندییەکانیان دا لەگەڵ هاوڵاتییان دا چونکە ئەمە زۆرترین دەستکراوەیی بۆ دەرەخساندن. ناتوانرێ یاسا یان فەرمانە نووسراوەکان بکێشرێنەوە یان ڕەتبکرێنەوە و گۆڕینیان زەحمەت تر بوو. نووسینەکان ستاندارد دەسنیشاندەکەن کە نوخبەکان ڕەنگە بیانویستایە بیانگۆڕن. کەواتە فەرمانڕەوایان و ئەوانەی لە سایەی فەرمانڕەوایان دا لە تاکالی دەژیان لایانوابوو بەکارهێنانی نووسین لە بەرژەوەندی ئەوان دا نییە. خەڵك لە چۆنیەتی بەکارهێنانی نووسین لە لایەن فەرمانڕەوایانەوە دەترسان و فەرمانڕەوایانیش لایانوابوو کە نەبوونی نووسین هاوکاری چڕکردنەوەی دەسەلاتیان دەکا. ئەوە سیاسەتەکانی تاکالی بوو کە نەیهێشت نووسین بەکاربهێنرێ. هەرچەندە سۆماڵییەکان بە بەراورد لەگەڵ پاشایەتی تاکالی دا تەنانەت خاوەنی نوخبەیەکی کەمتر دیاریکراو بوون، بەڵام زۆر ڕێی تێدەچێ کە هەمان ئەو هێزانە ڕێگر بووبن لەبەردەمیان دا بۆ بەکارهێنانی نووسین و پەیڕەوکردنی تەکنەلۆجییە بنەڕەتیەکانی تر.

نموونـەی سـۆماڵ کاریگـەری نـەبوونی مەرکەزیـەتی سیاسـی لەسـەر گەشەکردنی ئابووری ڕووندەکاتەوە. دۆکیومێنتە مێژووییـەکان هـیچ حاڵـەتێکی هەوڵدانیان بۆ دامەزراندنی ئەم شێوە مەرکەزیەتە لە سـۆماڵ دا تۆمارنـەکردوە. بەهەرحاڵ، ئاشکرایە بۆچی هەوڵدانی لەو شێوەیە زۆر زەحمەت بوو. هێنانەدی مەرکەزیـەتی سیاسـی ئـەوەی دەگەیانـد کـە هەنـدێك لـە خێڵـەکان دەبوایـە بچوونایەتە ژێر کۆنترۆڵی ئەوانی ترەوە. بەڵام خێڵەکان باڵادەستیی لـەم جـۆرە و کەمکردنـــەوەی دەســـەڵاتیان ڕەتکـــردەوە کـــە مەرکەزیـــەتی سیاســـی دەیهێنایەئاراوە. هاوسـەنگی هێـزی سـەربازیش لـە نـاو کۆمـەڵگای سـۆماڵی دا دامەزراندنی ئەم جۆرە دەزگا مەرکەزییانەی زەحمەت کردبوو. لـە راسـتیدا زۆر ڕێی تێدەچوو کە هەر خێڵێك هەوڵی چڕکردنەوەی دەسـەڵاتی خـۆی بدایـە نـەك تەنیا ڕووبەڕووی بەرەنگاربوونەوەی توند دەبۆوە بـەڵکو لەوانـە بـوو ئیمتیـاز و دەسەڵاتەکانی کە هەیبوو لە کیسبچوایە. لە ئەنجامی نەبوونی ئەم مەرکەزیەتی سیاسی و بزربوونی سادەترین جێگیریی مـافی مۆڵکـداری، کۆمـەڵگای سـۆماڵی هەرگیز هاندانی نەخستەگەڕ بۆ وەبەرهێنان لەو تەکنەلۆجییانەی بەرهەمدارییان زیاددەکرد. کاتێك پرۆسەی بەپیشەسازیبوون لە ناوچەکانی تـری جیهـان دا لـە سـەدەی نۆزدەیـەم و سـەرەتای سـەدەی بیـستەم دا بەرەوپێـشەوە دەچـوو، سۆماڵییەکان خەریکی دوژمنایەتی و گێرۆدەی پاراستنی ژیانی خۆیـان بـوون و دواکەوتنی ئابوورییان قووڵتربۆوە.

## دواکەوتنی بەردەوام

شۆڕشی پیـشەسازی لـە سـەدەی نۆزدەیـەم و دواتـر دا، وەرچـەرخانێکی مێژوویی ئاڵوگۆڕکاری هێنایەئاراوە: ئەو کۆمەڵگایانەی هانی هاوڵاتییـەکانیان دا و بواریانـدان تـا وەبـەرهێنان لـە تەکنەلۆجییـە نوێکـان دا بکـەن، توانیـان بـە خێرایی گەشەبکەن. بەڵام چەندین کۆمـەڵگا لـە سەرتاسـەری جیهـان دا لەمـەدا سەرکەوتوو نەبوون، یـان بـە ئاشـکرا ڕێگـای ئەنجامنـەدانی ئەمـەیان گرتەبـەر. نەتەوانی ژێر چەپۆکی دەزگا ئابووری و سیاسـییە چەوسـێنەرەکان ئـەم جـۆرە هاندانانەیان دەستەبەرنەکرد. ئیسپانیا و ئەسـیوپیا نموونـەی ئـەو دەوڵەتانـەن

کە تیایان دا کۆنترۆڵی ڕەهای دەزگا سیاسییەکان و ئەو دەزگا ئابوورییانەی ئەم دەزگا سیاسییانە بەرهەمیان هێنان ماوەیەکی زۆر بەر لە کازێوەی سەدەی نۆزدەیەم هاندانە ئابوورییەکانیان خنکاندبوو. ئاکامەکە هاوشێوە بوو لە ڕژێمە ڕەهاکانی تردا - بۆ نموونە، لە نەمسا ـ هەنگاریا و ڕوسیا و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و چین، هەرچەندە لەم دۆخانەدا فەرمانڕەوایان، لە ترسی تێکدانی بیاتنەر، نەك تەنیا پشتگیری پێشکەوتنی ئابووریيان پشتگوێخست بەڵکو هەنگاوی ئاشکرایان گرتەبەر بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی تەکنەلۆجی نوێ کە دەبوە هۆی هێنانی بەپیشەسازیبوون.

ڕەهایی تەنیا شێوەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر نییە و تەنیا فاکتەر نەبوو کە ڕێگر بوو لەبەردەم بە پیشەسازیبوون دا. دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوە پێویستییان بە ئەندازەیەك مەرکەزیەتی سیاسی هەیە بۆ ئەوەی دەوڵەت بتوانێ یاسا و ئاسایش بسەپێنێ و مافی موڵکداری بپارێزێ و لە کاتی پێویست دا پشتگیری چالاکی ئابووری بکا لە ڕێگای وەبەرهێنان لە خزمەتگوزارییە گشتییەکان دا. لەگەڵ ئەمەش دا، تەنانەت ئەمڕۆش چەندین نەتەوەی وەك ئەفغانستان و هایتی و نیپاڵ و سۆماڵ دەوڵەتی ئەوتۆیان هەیە کە ناتوانن کەمترین ئاسایش دابینبکەن و هاندانی ئابووری تیایان دا لەناوبراوە. حاڵەتی سۆماڵ ئەوە ڕووندەکاتەوە کە چۆن پرۆسەی بە پیشەسازیبوون بەسەر ئەم کۆمەڵگایانەدا تێپەڕی. بەرهەڵستی مەرکەزیەتی سیاسی لەبەر هەمان ئەو هۆیانە بوو کە ڕژێمە ڕەهاکان بەرهەڵستی گۆڕانکارییان کرد: ترس، کە زۆرجار ئەمە ترسێکی شیاو بوو، لەوەی کە گۆڕانکاری دەسەڵاتی سیاسی دەگوێزێتەوە لەوانەوە کە ئەمڕۆ باڵادەستن بۆ کەسان و گروپانی نوێ. کەواتە لە کاتێك دا ڕەهایی ڕێگری لە جوڵاندن بەرەو پلورەلیزم و گۆڕانکاری ئابووری دەکا، بەهەمانشێوەش ئەو نوخبە تەقلیدی و خێڵانەی کۆنترۆڵی مەیدانەکەیان کردوە لەو کۆمەڵگایانەدا کە مەرکەزیەتی سیاسییان نییە، هەمان ڕێگریدەکەن. لە ئاکام دا، ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە سەدەکانی هەژدەیەم و نۆزدەیەم دا خاوەنی ئەم جۆرە مەکەزیەتە نەبوون بەتایبەتی لە سەردەمی پیشەسازی دا، زەرەریان کرد.

لە کاتێك دا دەزگا چەوسێنەرە هەمەجۆرەکان هەر لە ڕەهاییەوە تا دەوڵەتانی خاوەن مەرکەزیەتی کەم، نەیانتوانی سوود لە بڵاوبوونەوەی

پیشەسازی وەرگـرن، وەرچەرخانی مێژوویی کە شۆڕشی پیشەسازی دروستیکرد، کاریگەری زۆر جیاوازی لە ناوچەکانی تری جیهان دا هەبوو. هەروەك لە چاپتەری دەیەم دا دەبینین، ئەو کۆمەڵگایانەی کە پێشتر هەنگاویان بەرەو دامەزراندنی دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوە نابوو، کۆمەڵگایانی وەکو ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئوستراليا و ئەوانەی کە ڕەهایی تیایان دا زۆر جدی تر تووشی بەرەنگاربوونەوە بوو، وەکو یابان و فەڕەنسا، سوودیان لەو دەرەفەتە ئابوورییە نوێیانە وەرگرت و دەستیانکرد بە پرۆسەی گەشەکردنی ئابووری خێرا. بەم شێوەیە پاتێرنی ئاسایی کارلێکردنی نێوان وەرچەرخانێکی مێژوویی و جیاوازییە دەزگاییە هەنووکەییەکان و هێنانە ئارای لێکجیابوونەوەی زیاتری دەزگایی و ئابووری لە سەدەی نۆزدەیەم دا ڕۆڵی خۆی بینی، ئەمجارە تەنانەت بە تەقینەوەیەکی گەورەتر و کاریگەری بنەڕەتی زیاتر لەسەر خۆشگوزەرانی و هەژاری نەتەوان.

## باکووری شووراکە: نۆگاڵس، ئەریزۆنا



**باشووری شووراکە : نۆگاڵس، سۆنۆرا**



**ئاکامەکانی مەیدانی تەختی گەمە : مافی داهێنانی ساڵی ١٨٨٠ ی تۆماس ئەدیسۆن بۆ داهێنانی گلۆپ**



دۆڕاوانی بواری ئابووری تێکدانی بنیاتنەر: لودییە ئامێر شکێنەکان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمی بەریتانیا دا.



ئاکامەکانی نەبوونی مەرکەزیەتی سیاسی لە سۆماڵ دا



**سوودمەندە یەك لەدوای یەکەکانی دەزگایانی چەوسێنەر لە کۆنگۆ: پاشای کۆنگۆ**



**لیۆپۆڵد پاشای دووەم**



**شۆڕشی شکۆدار: ویلیامی سێیەمی ئۆرەنج یاسای مافەکانی بۆ دەخوێندرێتەوە پێش ئەوەی تاجی ئینگلتەرەی بدرێتێ لە لایەن پەرلەمانەوە**



**تاعونی سەدەی چواردەیەم وەرچەرخانێکی مێژوویی دروستدەکا ( تابلۆی سەرکەوتنی مردن دەربارەی مردنی رەش لە لایەن بروگهێل زە ئێلدەر**



سوودمەندی نوێکاری دەزگایی: پاشای کیوبا



دەرکەوتنی پلەبەندی و نایەکسانی بەر لە کشتوکاڵکردن: گۆڕی یەکێك لە نوخبەکانی ناتوفیەکان



گەشەکردنی چەوسێنەرانە : کرێکارێکی گولاگی سۆڤیەتی کار لە دروستکردنی کەناڵی ( سۆفۆتۆ ) ی سەر دەریای سپی دەکا



بەریتانیا زۆر دوادەکەوێ: کەلاوەکانی ئیمپراتۆریەتی رۆما لە ڤیندۆلاندا



**نوێکاری: جەوهەری گەشەسەندنی ئابووری کراوە: بزوێنەرە هەڵمیەکەی جەیمس وات**



**گۆڕانکاریی ڕێکخراوەیی، ئاکامی دەزگایانی کراوە: کارگەکەی ڕیچارد ئارکرایت لە کرۆمفۆرد**

**یەکەم کارگەی یەمووی ئارکرایت لە کرۆمفۆرد**



ARKWRIGHT'S FIRST COTTON FACTORY AT CROMFORD.

**بەری گەشەسەندنی نا پایەداری چەوسێنەرانە : کەشتییەکەی جێنگ هێ بە تەنیشت کەشتییەکەی کۆڵەمبۆس**



**دیمەنێکی گشتی ئابووری دوو فاق لە باشووری ئەفریقا دا : هەژاری لە ترانسکای و خۆشگوزەرانی لە ناتاڵ**



## ئاكامەكانی شۆڕشی پیشەسازی: هێرشكردنە سەر باستیل



## تەحەداكانی بەردەم دەزگایانی كراوە: كۆمپانیای پەترۆڵی ستاندارد



تێکدانی نابنیاتنەر: وێستگەی چۆڵکراوی ڕێگای ئاسنینی هەیستینگس
لەڕێگای بۆ لە سیارا لیۆن




دەزگایانی چەوسێنەری ئەمڕۆ: منداڵان لە کێڵگەی پەمووی ئۆزبەک دا



**شکاندنی قاڵبەکە : سێ سەرۆك هۆزی تسوانا لە گەشتەکەیان دا  بۆ لەندەن**



**شکاندنی قاڵبێکی تر : ڕۆزا  پارکس تەحەدای دەزگا چەوسێنەرەکانی باشووری ویلایەتە یەکگرتوەکان دەکا**



# ٩

# پێچەوانەبوونەوەی پەرەپێدان

## بەهارات و جینۆساید

کۆمەڵە دوورگەکانی مۆلۆکاس لە ئیندۆنیزیای مۆدێرن دا لە سێ گروپ دوورگە پێکدێن. لە سەرەتای سەدەی حەڤدەیەم دا باکووری مۆلوکاس جێگەی پاشایەتییە سەربەخۆکانی تایدۆر و تێرنات و باکان بوو. ناوەڕاستی مۆلۆکاس جێگەی پاشایەتی ئەمبۆن بوو. لە باشوور دا دوورگەکانی باندا هەبوون کە کۆمەڵە دوورگەیەکی بچووک بوون و لە ڕووی سیاسییەوە یەکگرتوو نەبوون. هەرچەندە پێدەچێ ئەو دوورگانە ئەمڕۆ بۆ ئێمە دوورەدەست بن، بەڵام مۆلۆکاسی ئەو سەردەمە مەڵبەندێکی گرنگی بازرگانی جیهانی و تەنیا بەرهەمێنەری مێخەك و مەیس و گوێزی بۆنخۆش(نەتمێگ) بوو. بێگومان مەیس و نەتمێگ، تەنیا لە دوورگەکانی باندا دەڕوان. دانیشتوانی ئەم دوورگانە ئەم بەهاراتە دەگمەنانەیان بەرهەمدەهێناو هەناردەیان دەکردن بەرامبەر هێنانی خواردن و کەلوپەلی دروستکراو لە دوورگەی جاڤاو مینای ئازادی مەلەکا لە نیمچە دوورگەی مالیزیا و هیندستان و چین و نیمچە دوورگەی عەرەبییەوە.

یەکەم پەیوەندی دانیشتوانی ئەم دوورگانە لەگەڵ ئەورووپییەکان دا لە سەدەی شازدەیەم دا بوو لەگەڵ دەریاوانە پورتوگالییەکان دا کە هاتن بۆ کڕینی بەهارات. بەر لەوە دەبوایە بەهارات لە ڕێگەی دەریاوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە لەو ڕێگایانەوە بهێنرایە کە لە لایەن ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە کۆنترۆڵکرابوون. ئەورووپییەکان کەوتنە گەڕان بە دوای ڕێگایەك دا بە دەوری ئەفریقا دا یان لە ڕێگەی زەریای ئەتڵەسییەوە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بگەنە دوورگەکانی بەهارات و بازرگانی بەهارات. دەریاوانی پورتوگالی، بارتۆلۆمیۆ دیاس لە ساڵی ١٤٨٨ دا بە دەوری لوتکەی هیوای باش دا سووڕایەوە و لە ساڵی ١٤٩٨ دا ڤاسکۆ دا گاما لە هەمان ڕێگەوە گەیشتە

هیندستان. بۆ یەکەمجار ئەوروپییەکان بوونە خاوەنی ڕێگای سەربەخۆی خۆیان بۆ گەیشتنە دوورگەکانی بەهارات.

هەر زوو پورتوگالییەکان کەوتنە هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵکردنی بازرگانی بەهارات. ئەوان لە ساڵی ١٥١١ دا مەلەکایان داگیرکرد کە بە شێوەیەکی ستراتیژی کەوتبوە بەشی ڕۆژئاوای نیمچە دوورگەی مالیزیاوە و بازرگانان لە هەموو لایەکی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیاوە دەهاتنە ئەوێ بۆ فرۆشتنی بەهاراتەکانیان بە بازرگانە هیندی و چینی و عەرەبەکانی تر کە ئەوانیش بە ڕێگای دەریادا بەرەو ڕۆژئاوا باریاندەکردن. هەروەك گەشتیاری پورتوگالی تۆمێ پایرێس لە ساڵی ١٥١٥ دا ئاماژەیپێداوە *(بازرگانی و ئاڵوگۆڕکردن لە نێوان نەتەوە جیاوازەکان دا لە دووری هەزار فرسەخ و لە لایەن هەموو کەسێکەوە دەبێ بێنە مەلەکا ... ئەوەی لۆردی مەلەکا بێ دەستی لە قورگی ڤێنس دایە)*

بە دەستگرتن بەسەر مەلەکا دا، پورتوگالییەکان بە شێوەیەکی سیستەماتیکی هەوڵیان دا تا مۆنۆپۆڵی بازرگانی بەنرخی بەهارات بخەنەدەست خۆیان، بەلام سەرکەتوو نەبوون.

ئەو دوژمنانەی ئەوان ڕووبەڕوویانبوونەوە، نەدەکرا پشتگوێبخرێن. لە نێوان سەدەی چواردەیەم و شازدەیەم دا ئەندازەیەکی باش لە پەرەپێدانی ئابووری لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیادا لە ئارادا بوو، کە پشتی بە بازرگانی بەهارات بەستبوو. دەوڵەتانی شاری وەك ئاچێ و بانتێن و مەلاکا و ماکاسەر و پیگۆ و برونێل کە بەهاراتیان بەرهەمدەهێنا و هەناردەیان دەکردن شانبەشانی بەرهەمانی تری وەکو تەختە، بە شێوەیەکی خێرا فراوان بوون.

ئەم دەوڵەتانە، هاوشێوەی ئەو دەوڵەتانەی لە ئەوروپا دا لە هەمان سەردەم دا هەبوون، حکومەتی سروشت ڕەهایان هەبوو. پەرەپێدانی دەزگایانی سیاسی لە ڕێگەی پرۆسەی هاوشێوەی ئەوانەی ئەوروپاوە بەڕێوە دەچوو، لەوانە گۆڕانکاریی تەکنەلۆجی لە شێوازەکانی جەنگ و بازرگانی نێودەوڵەتی دا. دەزگایانی دەوڵەت خاوەن مەرکەزیەتی زیاتر و پاشا کە لە چەقی دەسەلات دا بوو، لافی دەسەلاتی ڕەهای لێدەدا. بە هەمانشێوەی فەرمانڕەوا ڕەهاکانی ئەوروپا، پاشاکانی باشووری ڕۆژهەلات بە قورسی پشتیان بەو داهاتە بەستبوو کە لە بازرگانییەوە دەستیاندەکەوت، چ ئەو بازرگانییانەی

کە خۆیان تیایدا بەشداربوون یان ئەوانەی لە ڕێگەی ئەو مۆنۆپۆلیانەی دەیانبەخشینە نوخبە ناوخۆیی و بیانییەکان. بە هەمانشێوەی ئەورووپای ڕەها، ئەم دەزگایانە هەندێك گەشەکردنی ئابووریان هێنایەئاراوە، بەڵام زۆر دووربوون لە کۆمەڵە دەزگای نموونەیی پێویست بۆ خۆشگوزەرانی ئابووری لەگەڵ بوونی کۆسپی بەرچاوی بەشداریکردن و مافی موڵکداری ناجێگیر بۆ زۆربەی دانیشتوان. بەڵام پرۆسەی برەوپێدانی بازرگانی تەنانەت ئەو کاتەش لە ئارادا بوو کە پورتوگالییەکان هەوڵیاندا باڵادەستی خۆیان لە زەریای هیندی دا بسەپێنن.

وجودی ئەورووپییەکان زیادیکرد و بە گەیشتنی هۆڵەندییەکانیش کاریگەری ئەم وجودە ئەورووپیە زۆرتر بوو. هۆڵەندییەکان هەر زوو گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە مۆنۆپۆلیکردنی دابەشکردنی بەهاراتی بەنرخی مۆلۆکاس قازانجی زیاتر دەبێ لە ڕکابەریکردن لەگەڵ بازرگانە نێوخۆیی و ئەورووپییەکانی تردا. لەساڵی ١٦٠٠ دا فەرمانڕەوای ئەمبۆنیان ڕازیکرد بۆ ئیمزاکردنی ڕێکەوتنامەیەکی تایبەت کە مافی مۆنۆپۆلیکردنی بازرگانی مێخەکی پێبەخشین. بە دامەزراندنی کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانی هۆڵەندی، هەوڵەکانی هۆڵەندییەکان بۆدەستگرتن بەسەر هەموو بازرگانییەکی بەهارات دا و دوورخستنەوەی ڕکابەرەکانیان بە خۆشی یان ناخۆشی بە قازانجی هۆڵەندییەکان و زیانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کۆتاییهات. کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانی هۆڵەندی، دوای کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانی ئینگلیزی، دوەم کۆمپانیای ئەورووپی بوو کە خاوەن پشکی هاوبەش بوو، ئەمەش ڕووداوی سەرەکی بوون لە ڕێڕەوی پەرەسەندنی شێوازی پێکهێنانی کۆمپانیای مۆدێرن دا کە دواتر ڕۆڵی سەرەکی لە گەشەکردنی پیشەسازی ئەورووپی دا بینی. لە هەمانکات دا، ئەم کۆمپانیایە دوەم کۆمپانیا بوو کە خاوەنی سوپای خۆی و خاوەن دەسەڵاتی بەرپاکردنی جەنگ و بەکۆلۆنیکردنی خاکی بیانی بوو. بە خستنەگەڕی هێزی سەربازیی خودی کۆمپانیاکە، هۆڵەندییەکان کەوتنە لەناوبردنی هەموو بازرگانە بچووکەکان بۆ جێبەجێکردنی پەیمانەکەیان لەگەڵ فەرمانڕەوای ئەمبۆن. هۆڵەندییەکان لە ساڵی ١٦٠٥ مینایەکی سەرەکیان داگیرکرد کە لە لایەن پورتوگالییەکانەوە کۆنترۆڵکرابوو، هەموو بازرگانەکانی تریان بە زۆر وەدەرخست. دواتر دەسەڵاتی خۆیان بۆ باکووری مۆلۆکاس

درێژکردەوەو فەرمانڕەوایانی تیدۆر و تێرنات و باکانیان ناچارکرد کە ڕازیبن بە نەڕواندنی مێخەك و بازرگانی پێوەنەکەن لە ناوچەکانیان دا. ئەو پەیمانەی ئەوان بەسەر تێرنات دا سەپاندیان تەنانەت ڕێگەی بە هۆڵەندییەکان دا تا بێن و هەموو ئەو درەختە مێخەکانەی لەوێدا بوون لەناوبەرن. نەخشەی (١٤) دوورگەکانی بەهارات لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا پیشاندەدا.

ئەمبۆن بەشێوەیەك فەرمانڕەواییکرا کە هاوشێوەی فەرمانڕەواییکردنی زۆربەی ئەوروپا و ئەمەریکاکان بوو لەو سەردەمەدا. هاوڵاتییانی ئەمبۆن سەرانەیان دەدا بە فەرمانڕەوا و بەشێوەی بێگار کاریان پێدەکرا. هۆڵەندییەکان ئەم سیستەمانەیان خستەکار و توونـدتریانکردن بۆ بەدەستهێنانی هێزی کار و مێخەکی زیاتر لە دوورگەکەدا. بەر لە گەیشتنی هۆڵەندییەکان، خێزانە گەورەکان سەرانەیان لە شێوەی مێخەك دا دەدایە نوخبەکانی ئەمبۆن. هۆڵەندییەکان کردیانە مەرج کە دەبوایە خێزانەکان لە زەوییەکانیان دوورنەکەوتنایەوەو هەریەك لەوان ژمارەیەکی دیاریکراوی دار مێخەکی بڕواندایەو بەخێوبکردایە و لە هەمانکات دا، خێزانەکان ناچارکرابوون بەشێوەی بێگار کار بۆ هۆڵەندیەکان بکەن.

هۆڵەندییەکان دەستیان بەسەر دوورگەکانی بانداش دا گرت، ئەمجارەیان بە نیازی مۆنۆپۆلیکردنی مەیس و نەتمێگ. بەڵام دوورگەکانی باندا بە شێوەیەکی جیاواز تر لە ئەمبۆن ڕێکخرابوون. ئەو دوورگانە لە چەندین دەوڵەتی ـ شاری بچووکی خاوەن ئۆتۆنۆمی پێکهاتبوون و پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتی پلەبەندییان نەبوو. ئەم دەوڵەتە بچووکانە کە لە ڕاستی دا لە شارۆچکەی بچووك زیاتر نەبوون، لە لایەن ئەنجوومەنی گوندەکانەوە بەڕێوەدەبران و دەسەڵاتێکی ناوەندی نەبوو کە هۆڵەندییەکان ناچاریبکەن پەیمانی مۆنۆپۆلیکردنی لەگەڵ دا مۆربکەن و سیستەمێکی وەرگرتنی سەرانەش نەبوو کە هۆڵەندییەکان دەستی بەسەردا بگرن تا لەو ڕێگەیەوە دابەشکردنی مەیس و نەتمێگ بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە. لە سەرەتادا ئەمە مانای ئەوە بوو کە دەبوایە هۆڵەندییەکان ڕکابەرییان لەگەڵ بازرگانانی ئینگلیزی و پورتوگالی و هیندی و چینی دا بکردایە و کاتێك نرخی بەرزیان نەدایە ئەوا ڕکابەرەکانیان دەبوونە خاوەنی بەهاراتەکە. پلانە سەرەتاییەکانیان بۆ مۆنۆپۆلیکردنی مەیس و نەتمیگ شکستیهێنا، بۆیە پاریزگاری هۆڵەندی ناوچەی باتاڤیا کە جان

پیتەرسزۆن کۆین بوو پلانێکی تری خستەکار. کۆین باتاڤیای لە دوورگەی جاڤا وەك پایتەختی نوێی کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانی هۆڵەندی لە ساڵی ١٦١٨ دا دامەزراندبوو. لە ساڵی ١٦٢١ بەرەو باندا بە خۆی و کەشتیگەلێکەوە کەوتەڕێ و نزیکەی سەراپای دانیشتوانی دوورگەکەی قەلاچۆکرد کە نزیکەی پازدە هەزار کەس دەبوون. هەموو سەرکردەکانیانی لەگەڵ خەڵکەکەی تردا هەڵواسی و تەنیا ژمارەیەکی کەمی بە زیندوویی هێشتەوە کە بەس بوون بۆ هێشتنەوەی شارەزایی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی مەیس و نەتمێگ. دوای تەواوکردنی ئەم جینۆسایدە، کۆین دەستیکرد بە پێکەوەنانی پێکهاتەی سیاسی و ئابووری پێویست بۆ سەرخستنی پلانەکەی: کۆمەڵگایەکی چێنەر. دوورگەکان بەسەر شەست و هەشت پارچەدا دەبەشکران و درانە شەست و هەشت پیاوی هۆڵەندی کە زۆربەیان کارمەندی ئەو کاتە و پێشتری کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانی هۆڵەندی بوون. ئەم خاوەن چاندنگە نوێیانە لە لایەن ئەو کەسە باندایانەوە کە بە زیندوویی مابوونەوە فێرکران کە چۆن بەهارات بەرهەمبهێنن و دەیانتوانی کۆیلە لە کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستان بکڕن و دوورگە چۆڵەکانیان پێ ئاوەدانبکەنەوە و بەهاراتیان پێ بەرهەبهێنن کە دەبوایە ئەو بەهاراتە بە نرخێکی دیاریکراو بفرۆشنەوە بە کۆمپانیاکە.

ئەو دەزگا چەوسێنەرانەی هۆڵەندیەکان لە دوورگەکانی بەهارات دا دایانمەزراندن کاریگەریی خوازراویان هەبوو، هەرچەندە لە باندا ئەمە لەسەر حسابی ژیانی پازدە هەزار کەسی بێتاوان و دامەزراندنی کۆمەڵێك دەزگای سیاسی و ئابووری ئەوتۆ بوو کە ئەو دوورگانەیان بە دواکەوتوویی هێشتەوە. بە کۆتاییاتنی سەدەی حەڤدەیەم، هۆڵەندییەکان بڕی دابەشکردنی ئەم بەهاراتانەیان بە ڕێژەی ٪٦٠ کەمکردەوە و نرخی نەتمێگ دوو هێندە بەرز بۆوە.

هۆڵەندییەکان کەوتنە پیادەکردنی ئەو ستراتیژییەی لە مۆلۆکاس دا تیایدا سەرکەوتوو بوون لە هەموو ناوچەکەدا و ئەمەش ئاکامی یەکجار گەورەی بۆ دەزگا سیاسی و ئابوورییەکانی هەموو ناوچەکانی تری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا هەبوو. فراوانبوونی بازرگانی چەندین دەوڵەتی ناوچەکە کە لە سەدەی چواردەیەمەوە دەستیپێکردبوو، پێچەوانە بۆوە. تەنانەت ئەو قەوارانەشی کە بەشێوەی ڕاستەوخۆ نەکرانە کۆلۆنی بەڵام لە لایەن کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانی

هۆڵەندییەوە تێشکێنران ڕوویانردە ناوەوە و بازرگانییان وازلێهێنا. گۆڕانکاری ئابووری و سیاسی ساوای باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا لە جێگەی خۆی دا وەستێنرا.

## نەخشەی (١٤) : باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، دوورگەکانی بەهارات، ئەمبۆن و باندا لە ساڵی ١٦٠٠دا




بۆ دوورکەوتنەوە لە هەڕەشەکانی کۆمپانیای ڕۆژهەلاتی هیندستانی هۆڵەندی، چەندین دەوڵەتی ناوچەکە وازیان لە بەرهەمهێنانی ڕوەك هێنا بۆ هەناردەکردن و چالاکییە بازرگانییەکانیان وەستاند. بەرهەمهێنان تەنیا بەشی پێویستی خۆیان باشتر بوو لەوەی ڕووبەڕووی هۆڵەندییەکان ببنەوە. لە ساڵی ١٦٢٠ دا دەوڵەتی بانتین لە دوورگەی جاڤا هەموو درەختەکانی ئاڵەتیان بڕی

بەو هیوایەی کە بەم کارە وا لە هۆڵەندییەکان دەکا کێشە بۆ دەوڵەتەکەیان دروستنەکەن. کاتێک بازرگانێکی هۆڵەندی لە ساڵی ١٦٨٦ دا سەردانی ماگیوندانۆی لە باشووری فیلیپین کرد، ئەو پێی ووترا (دەکرێ نەتمێگ و مێخەك لێرەش پروێنرێن بە هەمانشێوەی مەلاکۆ، بەڵام ئێستا ئەوانە بوونیان نییە چونکە فەرمانڕەواکەی پێشوو تر بەر لە مردنی هەمووی لەناوبردبوون چونکە ئەو لەوە ترسا بوو کە کۆمپانیا هۆڵەندییەکە بهاتایە و لەسەر ئەوانە لەگەڵیان بکەوتایەتە شەڕەوە) ئەوەی بازرگانێکی تر دەربارەی فەرمانڕەوای ماگیوندانۆ لە ساڵی ١٦٩٩ دا گوێی لێبوە هەمان شت بوو (فەرمانڕەواکە ڕواندنی ئاڵەتی قەدەخەکردبوو بۆ ئەوەی تووشی جەنگ نەبێ لەگەڵ کۆمپانیای هۆڵەندی یان دەوڵەتەکانی تر). ژیانی شارنشینی کەمیکرد و تەنانەت ژمارەی دانیشتوان دابەزی. لە ساڵی ١٦٣٥ دا بۆرماییەکان پایتەختەکەیان لە پیگۆ کە لەسەر کەنار بوو گواستەوە بۆ ئاڤا کە زۆر لە ناوەوە بوو لەسەر ڕووباری ئیراوادی.

ئێمە نازانین کە ڕێڕەوی پەرەسەندنی ئابووری و سیاسی دەوڵەتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا بێ دەسدرێژییەکانی هۆڵەندییەکان چۆن دەبوو. لەوانەبوو شێوازی ڕەهایی تایبەت بە خۆیان دابمەزراندایە، لەوانەبوو لە هەمان ئەو بارودۆخەی کۆتایی سەدەی شازدەیەم دا بمانایەتەوە، یان لەوانەبوو بەردەوامبوونایە لە پەرەپێدانی بازرگانی لە ڕێگەی بەرەبەرە پەیرەوکردنی دەزگایانی زیاتر کراوەوە. بەڵام بە هەمانشێوەی مۆلۆکاس، کۆلۆنیالیزمی هۆڵەندی بە شێوەیەکی بنەڕەتی پەرەپێدانی ئابووری و سیاسی ئەوانیشی گۆڕی. دانیشتوانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا وازیان لە بازرگانیکردن هێنا و ڕوویانوەرگێڕا بەرەو ناوەوە و بوونە زیاتر ڕەها. لە ماوەی دوو سەدەی دواتر دا، ئەوان نەیاندەتوانی لە پێگەیەکی ئەوتۆدا بن کە بتوانن سوود لەو نوێکارییانە وەرگرن کە لە ئەنجامی شۆڕشی پیشەسازی دا سەریانهەڵدا بوو. لە کۆتاییشدا کشانەوەیان لە بازرگانیکردن نەبوە هۆی ڕزگاربوونیان لە ئەورووپییەکان: لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم دا، هەموو ئەو ناوچانە بەشێك بوون لە ئیمپراتۆریەتە کۆلۆنیاڵییە ئەورووپییەکان.

لە چاپتەری حەوتەم دا بینیمان کە چۆن فراوانبوونی دەسەڵاتی ئەورووپییەکان بەرەو زەریای ئەتڵەسی بوە هاندەری دامەزراندنی دەزگایانی

کراوە لە بەریتانیا دا، بەڵام هەروەك لە ڕێگەی ئەزموونی مۆلۆکاس لە سایەی فەرمانڕەوایی هۆڵەندییەکانەوە ڕوونکرایەوە. ئەم فرانبوونە تۆوی دواکەوتنی لە چەندین قوژبنی جیاوازی دنیا دارشت لە ڕێگەی سەپاندنی یان بەهێزکردنی ئەو دەزگا چەوسێنەرانەی لە ئارادا بوون. ئەمەش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ چالاکی بازرگانی و پیشەسازی ساوای لە سەرتاسەری جیهان دا لەناوبرد، یان بۆخۆیان دەزگایانی ئەوتۆیان خستەگەر کە بەپیشەسازیبوونیان وەستاند. لە ئەنجامدا، لە کاتێك دا بەپیشەسازیبوون لە هەندێك ناوچەی جیهان دا بڵاودەبۆوە، ئەو شوێنانەی بەشێك بوون لە ئیمپراتۆریەتە کۆلۆنیاڵییە ئەوروپییەکان هیچ دەرفەتێکی سوود وەرگرتنیان لەو تەکنەلۆجییە نوێیانە بۆ نەمابۆوە.

## دەزگای زۆر نائاسایی

بڵاوبوونەوەی هێزی دەریایی و بازرگانی ئەوروپییەکان لە سەرەتای سەردەمی مۆدێرن دا ماوەیەکی ئومێدبەخشی برەوسەندنی ئابووری و گۆڕانکاری دەزگایی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا کورتکردەوە. لە هەمان ئەو ماوەیەدا کە کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانی هۆڵەندی لە برەوسەندن دا بوو، جۆرێکی جیاواز لە بازرگانی لە ئەفریقا دا لە برەوسەندن دا بوو: بازرگانی کۆیلان.

لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا، کۆیلەیەتی لە باشوور دا زۆرجار بە "دەزگای نائاسایی" ناودەبرا، بەڵام لە ڕووی مێژووییەوە هەروەك زانای مەزنی کلاسیکی مۆزس فینلەی ئاماژەپێداوە، کۆیلەیەتی نائاسایی نەبوە و لە نزیکەی هەموو کۆمەڵگایەك دا بوونی هەبوە. کۆیلەیەتی، هەروەك پێشتر بینیمان، باو و بڵاو بوو لە ڕۆمای کۆن و لە ئەفریقاش دا کە بۆ ماوەیەکی زۆر سەرچاوەی هێنانی کۆیلان بوو بۆ ئەوروپا، هەر چەندە تەنیا سەرچاوە نەبوو.

لە سەردەمی ڕۆمادا کۆیلان لە ناو گەلانی سلاڤی دەوری دەریای ڕەش و لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە باکووری ئەوروپاوە دەهێنران. بە هاتنی ساڵی ١٤٠٠ ئەوروپییەکان وازیان لە بەکۆیلەکردنی یەکتر هێنا، بەڵام ئەفریقا، هەروەك لە

چاپتەری شەشەم دا بینیمان بە قۆناخی گواستنەوە لە کۆیلەیەتییەوە بۆ بەندایەتی تێنەپەڕی بەو شێوەیەی لە ئەورووپای چاخەکانی ناوەڕاست دا ڕوویدا. بەر لە سەرەتای سەردەمی مۆدێرن بازرگانییەکی بەگوڕی کۆیلان لە ڕۆژهەلاتی ئەفریقادا هەبوو، ژمارەیەکی زۆری کۆیلان لە ناو بیابانەوە دەگوازرانەوە بۆ نیمچە دوورگەی عەرەبی. جگە لەمە، دەوڵەتە گەورەکانی چاخەکانی ناوەڕاست لە ڕۆژئاوای ئەفریقا، وەك مالی و غانا و سۆنگهای بە خەستی کۆیلانیان لە حکومەت و سوپا و کشتوکاڵ دا بەکارهێناوە و پەیڕەوی مۆدیلی ڕێکخراوەیی دەوڵەتە موسڵمانەکانی باکووری ئەفریقایان دەکرد کە بازرگانیان لەگەڵ دا دەکردن.

ئەوە پەرەسەندنی کۆلۆنییەکانی چاندنگەکانی شەکر بوو لەناوچەی کاریبی دا لەسەرەتای سەدەی حەڤدەیەم دا کە بوەهۆی زیادبوونی بەرچاوی بازرگانی نێودەوڵەتی کۆیلان و زیادبوونی بێوێنەی گرنگیی کۆیلەیەتی لە ناو خودی ئەفریقا دا. لە سەدەی شازدەیەم دا ڕەنگە نزیکەی ٣٠٠,٠٠٠ کۆیلە لە زەریای ئەتڵەسی دا بازرگانییان پێوەکرابێ. ئەوانە زۆربەیان لە ناوەڕاستی ئەفریقاوە هێنرابوون بە بەشداریکردنی خەستی کۆنگۆ و پورتوگالییەکان کە لە لواندای پایتەختی ئەمڕۆی ئەنگۆلا لە باشووری ئەفریقا دا نیشتەجێبوون. لەم ماوەیەدا بازرگانی کۆیلان لە ڕێگەی بیابانەوە تەنانەت گەورەتر بوو، نزیکەی ٥٥٠,٠٠٠ ئەفریقی بەرەو باکوور وەك کۆیلە گوازرانەوە. لە سەدەی حەڤدەیەم دا بارودۆخەکە پێچەوانەبۆوە و نزیکەی ١,٣٥٠,٠٠ ئەفریقی وەك کۆیلە لە بازرگانی ئەتڵەسی دا فروشران و زۆربەیان گوێزرانەوە بۆ ئەمەریکاکان. ژمارەی ئەوانەی لە بازرگانی بیابان دا مامەڵەیان پێوەدەکرا تاڕادەیەك وەك خۆی مایەوە. سەدەی هەژدەیەم زیادبوونێکی بەرچاوی تری بەخۆوە بینی و نزیکەی ٦,٠٠٠,٠٠٠ کۆیلە لە ڕێگەی زەریای ئەتڵەسییەوە و نزیکەی ٧٠٠,٠٠٠ لە ڕێگەی بیابانەوە گوێزرانەوە. بە کۆکردنەوەی ژمارەکان لە ماوە و شوێنە جیاوازەکانی ئەفریقادا، زیاتر لە ١٠,٠٠٠,٠٠٠ ئەفریقی لەو کیشوەرەوە وەك کۆیلە برانەدەرەوە.

نەخشەی (١٥) هەندێك زانیاری دەربارەی ئەندازەی بازرگانی کۆیلان دەخاتەڕوو. بە بەکارهێنانی سنووری ئێستای وولاتان، نەخشەکە مەزەندەی ئاستی کۆیلەیەتی لە نێوان سالانی ١٤٠٠ و ١٩٠٠ وەك ڕێژەی سەدی لە چاو

دانیشتوانی ساڵی ١٤٠٠ ڕووندەکاتەوە. ڕەنگە تێرەکان کۆیلەیەتی زیاتر پیشاندەدەن. بۆ نموونە، لە ئەنگۆلا و بێنین و غانا و تۆگۆ، کۆی کۆکراوەی هەناردەکردنی کۆیلان زیاتر بوە لە ژمارەی دانیشتوانی وولاتەکە لە ساڵی ١٤٠٠ دا.

لەناکاو دەرکەوتنی ئەوروپییەکان بە درێژایی کەنارەکانی ڕۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەفریقا کە پەرۆشی کڕینی کۆیلان بوون کاریگەریی ئاڵوگۆڕکاری لەسەر کۆمەڵگایانی ئەفریقی هەبوو. زۆربەی ئەو کۆیلانەی دەنێران بۆ هەردوو ئەمەریکاکان، دیلی جەنگ بوون و دوای بەدیلگرتنیان ڕەوانەی کەنار دەکران.

### نەخشەی ( ١٥ ): هەناردەکردنی کویلان لە ئەفریقاوە



زۆربوونی شەڕوشۆڕ بەهۆی هاوردەکردنی بڕێکی زۆر چەك و تەقەمەنی، کە ئەوروپییەکان بە کۆیلان دەیانگۆڕینەوە، زیادبوونی گەورەی بەخۆوە بینی. بە هاتنی ساڵی ١٧٣٠ ساڵانە ١٨٠,٠٠٠ تفەنگ تەنیا بە درێژایی کەناری ڕۆژئاوای ئەفریقا هاوردەدەکرا و لە نێوان ساڵی ١٧٥٠ و سەرەتای سەدەی بیستەم دا، بەریتانییەکان بە تەنیا ساڵانە لە نێوان ٢٨٣,٠٠٠ و ٣٩٤,٠٠٠ تفەنگیان فرۆشتوە. لە نێوان ساڵانی ١٧٥٠ و ١٨٠٧ دا بەریتانییەکان ٢٢,٠٠٠ تەن باروتیان فرۆشت کە تێکڕای ساڵانە بریتیبوو لە ٣٨٤,٠٠٠ کیلۆگرام لەگەڵ ٩١,٠٠٠ کیلۆگرام قوڕقوشم. زیاتر بەرەو باشوور بازرگانییەکە بەهەمانشێوە بەهێزبوو. لەسەر کەناری لوانگۆ، لە باکووری پاشایەتی کۆنگۆ، ئەوروپییەکان ساڵانە ٥٠,٠٠٠ تفەنگیان دەفرۆشت.

هەموو ئەم شەڕوشۆڕ و ململانێیانە بەتەنیا نەبوونە هۆی لە دەستدانی ژیانی خەڵك و مەینەتی بۆ مرۆڤ بەڵکو ڕێچکەیەکی تایبەتی پەرەسەندنی دەزگاییشیان لە ئەفریقا دا خستەگەڕ. بەر لە سەرەتای سەردەمی مۆدێرن، کۆمەڵگایانی ئەفریقی لە ڕووی سیاسییەوە خاوەن مەرکەزیەتی کەمتر بوون بە بەراورد لەگەڵ ئەوانەی یوراسیا. زۆربەی قەوارە سیاسییەکان بچووك بوون و زەوی و دەرامەتەکانی تر لە ژێر کۆنترۆڵی سەرۆك هۆزەکان یان پاشا دا بوون. زۆربەیان، هەروەك لە حاڵەتی سۆماڵ دا پیشانمان دا، هیچ جۆرە پێکهاتەیەکی دەسەڵاتی سیاسی پلەبەندییان نەبوو. بازرگانی کۆیلان دوو پرۆسەی دژ بەیەکی خستەگەڕ. یەکەم، زۆربەی قەوارەکان لەسەرەتادا بوونە قەوارەی دەسەڵات زیاتر ڕەها و لەدەوری یەك ئامانج خۆیان ڕێکخست کە ئەویش بریتیبوو لە کردنی خەڵکی تر بە کۆیلە و فرۆشتنیان بە ئەوروپییە کۆیلەدارەکان. دوەم، وەك ئەنجامی، بەڵام بە شێوەیەکی سەیر، دژی پرۆسەی یەکەم، بەرپاکردنی جەنگ و بە کۆیلەکردن لە کۆتایی دا بوونە هۆی لەناوبردنی هەرچی ئاسایش و دەسەڵاتی ڕەوا کە دەوڵەت هەیبوو لە باشووری بیابانی ئەفریقی دا. جگە لە پەیداکردنی کۆیلان لە ڕێگەی جەنگەوە، کۆیلە لە ڕێگەی پەلاماری بچووکیشەوە دەڕفێندران و دەگیران. یاساش بوە ئامرازی بەکۆیلەکردن. بە بێگوێدانە جۆری ئەو تاوانەی ئەنجامدەدرا، سزاکە بریتیبوو لە بەکۆیلەکردن. بازرگانی ئینگلیزی، فرانسیس مۆر لە ساڵی ١٧٣٠ دا کاریگەریی ئاکامەکانی ئەمەی لە سەر کەناری سێنیگامبیای ڕۆژئاوای ئەفریقا تۆمارکردوە:

*(لەو کاتەوە ئەم بازرگانی کۆیلەیە هاتۆتەئاراوە، هەموو سزاکان گۆڕاون بۆ کۆیلەیەتی. ئەم جۆرە سزادانەش سوودێکی هەیە، تاوانەکان بە وردی دەپاڵێون بۆ ئەوەی سوود لە فرۆشتنی تاوانبارەکە وەربگرن. نەك تەنیا کوشتن و دزی و داوێنپیسی لە ڕێگەی فرۆشتنی تاوانبارەکەوە وەك کۆیلە سزادەدرێ، بەڵکو هەموو حاڵەتێکی بچووکیش بە هەمانشێوە سزادەدرێ).*

دەزگاکان تەنانەت دەزگا ئاینییەکانیش بەهۆی ئارەزووی گرتن و فرۆشتنی کۆیلانەوە خوویان خراپبوو. نموونەیەك لەم بارەیەوە بریتییە لە دانای بەناوبانگ لە ئارۆچۆکوا لە ڕۆژهەڵاتی نایجیریا. وا بیردەکرایەوە کە ئەم دانایە نوێنەری خوداوەندێکی مەزن بێ و لە ناوچەکەدا لە لایەن گروپە ئێتنییە سەرەکییەکانی ئەو ناوچەیەوە کە ئایجۆ و ئایبیبیۆ و ئایگبۆ بوون ڕێزی لێدەگیرا. داناکە پەیوەندی پێوەدەکرا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و یەکلاکردنەوەی ناکۆکیەکان. سکاڵاکاران کە دەچوونە ئارۆچۆکوا بۆ بینینی داناکە دەبوایە لە شارەکەوە بەناو دۆڵی ڕووباری کرۆس دا بڕۆشتنایەتە خوارەوە بۆ ئەو شوێنە کە جێگای نیشتەجێبوونی داناکە بوو لە ئەشکەوتێکی بەرزدا کە پێشەکەی بە کەللەسەری مرۆڤ هەڵچنرابوو. قەشەکانی داناکە پێکەوە لەگەڵ کۆیلەداران و بازرگانانی ئارۆ بڕیارەکانی ئەویان جێبەجێدەکرد. زۆرجار ئەو کەسانەش کە لە لایەن داناکەوە"قوتدەدران" بەشدارییان دەکرد، ئەم قوتدانە مانای ئەوەبوو کاتێك ئەوانەی قوتدەدران دەچوونە ناو ئەشکەوتەکەوە، بەناو ڕووبارەکە دا دەبرانە خوارەوە و بەرە و ئەو کەشتییە ئەوروپییانەی چاوەڕێیان دەکردن، کێشدەکران. ئەم پرۆسەیە کە تیایدا هەموو یاسا و نەریتێك پێشێلدەکراو دەشکێنرا بۆ گرتنی کۆیلان، کاریگەریی تێکدەرانەی لەسەر مەرکەزیەتی سیاسی هەبوو، هەرچەندە لە هەندێك جێگادا بوەهۆی سەرهەڵدانی دەوڵەتی بەهێز کە هۆکاری سەرەکی مانەوەیان بریتیبوو لە پەلاماردان و بەکۆیلەکردن. خودی پاشایەتی کۆنگۆ یەکەم دەوڵەتی ئەفریقی بوو کە گۆڕانکاری بەرەو دەوڵەوتی بەکۆیلەکردن بەسەرداهات تا ئەو کاتەی بەهۆی جەنگی ناوخۆوە وێرانکرا. دەوڵەتانی تری کۆیلەکردنی دیارتر لە ڕۆژئاوای ئەفریقا دا دەرکەوتن و لەوانەش دەوڵەتی ئۆیۆ لە نایجیریا و داهۆمی لە بێنین و دواتریش دەوڵەتی ئاسانت لە غانا.

بۆ نموونە. فراوانبوونی دەوڵەتی ئۆیۆ لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەیەم دا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە هەناردەکردنی کۆیلانەوە هەبوو لەسەر

کەنار. دەسەڵاتی دەوڵەت لە ئەنجامی شۆڕشێکی سەربازی دا پەرەیسەند کە بریتیبوو لە هاوردەکردنی ئەسپ لە باکوورەوە و پێکهێنانی هێزێکی سوارەی بەهێز کە توانی سوپا نەیارەکان لەناوبەرێ. لە کاتێك دا ئۆیۆ لای باشوورەوە سنوورەکانی خۆی بەرەو کەنار فراوانکرد، ئەو قەوارانەی لەناوبرد کە ڕێگربوون و بەشێکی زۆری دانیشتوانی ئەو شوێنانەی وەك کۆیلە فرۆشت. لە ماوەی نێوان ساڵی ١٦٩٠ و ساڵی ١٧٤٠ دا، ئۆیۆ مۆنۆپۆلی خۆی بە سەر بەشی ناوەوەی ئەو ناوچەیەدا سەپاند کە بە کەناری کۆیلە ناسرا. وا مەزەندە دەکرێ کە ٪٨٠ بۆ ٪٩٠ی ئەو کۆیلانەی لەسەر کەنارەکە فرۆشران لە ئەنجامی ئەم داگیرکردنانەوە هاتبن، پەیوەندییەکی هاوشێوەی تری سەرسوڕهێنەر لە نێوان جەنگ و کۆیلە دا لە سەدەی هەژدەیەم دا لە سەر کەناری ئاڵتوون، لەو ناوچەیەی غانای ئەمڕۆیە لە ڕۆژئاوادا، دەرکەوت. لە دوای ساڵی ١٧٠٠ دەوڵەتی ئاسانت لەناوخۆدا فراوانبوو بەهەمان ئەو شێوەیەی ئۆیۆ پێشتر فراوان بووبوو. لەماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەیەم دا ئەم فراوانبوونە بوە هۆی بەرپابوونی ئەوەی پێیدەوترێ جەنگەکانی ئاکان، کاتێك ئاسانت دەوڵەتە سەربەخۆکانی یەك لەدوای یەك تێشکاندن. دوا دەوڵەت کە گیامان بوو لەساڵی ١٧٤٧ دا داگیرکرا. زۆربەی هەرە زۆری ئەو ٣٧٥,٠٠٠ کۆیلەیەی هەناردەکران دیل بوون و لەم جەنگانەدا گیرابوون.

دیارترین کاریگەری ئەم چەوساندنەوە گەورەیەی مرۆڤ کاریگەری دیموگرافی بوو. زەحمەتە بە دڵنیاییەوە بزانرێ کە ژمارەی دانیشتوانی ئەفریقا بەر لە سەردەمی نوێ چەند بوە، بەڵام زانایان مەزەندەی جیاوازییان دەربارەی کاریگەری بازرگانی کۆیلە لە سەر دانیشتوان کردوە. مێژوناس پاتریك مانینگ مەزەندەی کردوە کە ژمارەی دانیشتوانی ئەو ناوچانەی ڕۆژئاوا و ڕۆژئاوای ناوەڕاستی ئەفریقا کە سەرچاوەی کۆیلان بوون بۆ هەناردەکردن لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەم دا نزیکەی بیست و دوو تا بیست و پێنج ملیۆن کەس بوە. بە پێی گریمانەیەکی زبر لە ماوەی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم دا گەشەی دانیشتوانی ئەم ناوچانە ساڵانە بە ڕێژەی نیو لە سەدا بوو‌بێ بەبێ بازرگانی کۆیلان، مانینگ مەزەندەیکرد کە ژمارەی دانیشتوانی ئەم ناوچانە لە ساڵی ١٨٥٠ دا دەبوایە بەلایەنیکەمەوە چلوشەش بۆ پەنجاو سێ ملیۆن کەس بوایە. لە ڕاستیدا ژمارەی دانیشتوان لە ساڵی ١٨٥٠ دا یەك لەسەر پێنجی ئەو ژمارەیە بوو.

جیاوازییە گەورەکە تەنیا بەهۆی نزیکەی ئەو هەشت ملیۆن کەسەوە نەبوو کە لە نیوان سالانی ۱۷۰۰ و ۱۸۵۰ وەك کۆیلە لەم ناوچەیەوە هەناردەکران، بەڵکو بەهۆی ئەو ملیۆنان کەسەوە بوو کە لەو جەنگە ناوخۆییە بەردەوامانەدا کوژران کە ئامانجیان بەدیلگرتنی کۆیلان بوو. کۆیلەیەتی و بازرگانی کۆیلە لە ئەفریقا دا پێکهاتەی خێزانی و هاوسەرگیری زیاتر تێکدا و ڕەنگە توانای منداڵ خستنەوەشی کەمکردبێتەوە.

هەر لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەمەوە بزووتنەوەیەکی بەهێز بۆ نەهێشتنی بازرگانی کۆیلان لە بەریتانیا دا تینی پەیداکرد کە لە لایەن ویلیام ویلبێرفۆرس، سەرکردەی کاریزمی، پێشەوایەتیکرا. دوای شکستی یەك لە دوای یەك ئەوانەی لایەنگری نەهێشتنی بازرگانی کۆیلە بوون توانیان پەرلەمانی بەریتانی ڕازیبکەن بۆ بڕیاردان لەسەر یاسایەك بۆ بە نایاساییکردنی بازرگانی کۆیلان. ویلایەتە یەککگرتوەکان ساڵێك دوای ئەوە هەمان هەنگاوی نا. حکومەتی بەریتانی لەوەش زیاتری کرد: چالاکانە هەوڵی جێبەجێکردنی یاساکەی دا بە تەرخانکردنی هێزێکی دەریایی لە زەریای ئەتڵەسی بۆ ڕیشەکێشکردنی بازرگانی کۆیلان. هەرچەندە ماوەیەکی زۆری پێچوو تا ئەم هەنگاوانە کاریگەریی تەواویان هەبێ و تا ساڵی ۱۸۳٤ یش کۆیلەیەتی لە ئیمپراتۆریەتی بەریتانی دا قەدەخەنەکرا، بەڵام ڕۆژەکانی بازرگانی کۆیلان لە ئەتڵەسی دا، کە گەورەترین بەشی ئەو بازرگانییە بوو، بەرەو کەمبوونەوە ڕۆیشتن.

هەرچەندە کۆتاییهێنان بە بازرگانی کۆیلان لە دوای ساڵی ۱۸۰۷ بوە هۆی کەمکردنەوەی داخوازی بۆ کۆیلان لە ئەفریقاوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نەبوو کە کاریگەرییەکانی کۆیلەیەتی لەسەر کۆمەڵگا و دەزگا ئەفریقییەکان بە شێوەیەکی سیحراوی توانەوە. چەندین دەوڵەتی ئەفریقی لە ڕێگەی کۆیلایەتییەوە دامەزرابوون و کۆتاییهێنان بەم بازرگانییە لە لایەن بەریتانییەکانەوە ئەم واقیعەی نەگۆڕی. لەمەش زیاتر، کۆیلەیەتی لە ناو خودی ئەفریقادا زۆر زیاتر تەشەنەیکردبوو. ئەم فاکتەرانە لە کۆتایی دا بوونە هۆی داڕشتنی ڕێچکەی پەرەپێدان لە ئەفریقا دا نەك تەنیا پێش ساڵی ۱۸۰۷ بەڵکو پاش ئەو ساڵەش.

لە بری کۆیلەیەتی "بازرگانی ڕەوا" دەستیپێکرد، ئەمەش دەستەواژەیەك بوو بۆ هەناردەکردنی ئەو کەلوپەلانەی کە پەیوەست نەبوون بە بازرگانی کۆیلانەوە. ئەم کالایەنەش بریتیبوون لە ڕۆنی خورما و دانەوێڵە و پینەت و

دانی فیل و لاستیك و بنێشتی عەرەبی. کاتێك لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی شۆڕشی پیشەسازی دا داهاتی ئەوروپییەکان و باکووری ئەمەریکا زیادیکرد، داخوازی بۆ زۆربەی ئەم بەرهەمانەی ناوچە گەرمەکان بە شێوەیەکی بەرچاو بەرزبۆوە. هەروەك چۆن کۆمەڵگایانی ئەفریقی سوودی دڕندانەیان لەو دەرفەتە ئابوورییانە وەرگرت کە بازرگانی کۆیلان ڕەخساندبوونی، بە هەمانشێوەش لەگەڵ بازرگانی ڕەوا مامەڵەیانکرد. بەڵام ئەوان ئەمەیان لە کەشێکی نالەباردا ئەنجامدا، کەشێك کە تیای دا کۆیلەیەتی ڕێگای ژیان بوو، بەڵام داخوازی دەرەکی بۆ کۆیلان ووشکی کردبوو. ئایا دەبوایە هەموو ئەو کۆیلانە چیان بکردایە لە کاتێك دا نەدەتوانرا بە ئەوروپییەکان بفرۆشرێن؟ وەڵامەکە ئاسان بوو: دەکرا سوودیان لێوەربگیرێ لە ڕێگەی بەزۆر کارپێکردنیانەوە لە ناو ئەفریقادا بۆ ئەوەی کەلوپەلە تازەکانی بازرگانی ڕەوایان بەرهەمبهێنایە.

یەکێك لە نموونە هەرە باش دۆکیومێنتکراوەکان لە ئاسانت، غانای ئەمڕۆدا بوو. بەر لە ساڵی ١٨٠٧، ئیمپراتۆریەتی ئاسانت بە خەستی بەشدار بوو لە گرتن و هەناردەکردنی کۆیلان، بە هێنانیان بۆ کەنار و فرۆشتنیان لە قەڵا گەورەکانی فرۆشتنی کۆیلان لە کەیپ کۆست و ئەلمینا. لە دوای ساڵی ١٨٠٧ ەوە لەگەڵ نەمانی ئەم ڕێگایە، نوخبە سیاسییەکەی ئاسانت ئابووری خۆیان ڕێکخستەوە. بەهەرحاڵ، بەکۆیلەکردن و کۆیلەیەتی کۆتایینەهات، بەڵکو کۆیلان لە چاندنگە گەورەکان دا نیشتەجێکران، لەسەرەتا دا لە دەوری کومەیسی پایتەخت و دواتر لەسەرانسەری ئیمپراتۆریەتەکەدا بڵاوکرانەوە (کە دەکاتە زۆربەی ناوچەکانی ناوەوەی غانا). ئەوان بۆ دەرهێنانی ئاڵتوون و بەرهەمێنانی گوێزی کۆلا بۆ هەناردەکردن خرانەکار و لە هەمانکات دا بڕی گەورەی خۆراکیشیان بەرهەمدەهێنا. ئەوان بەزۆری بۆ گواستنەوەی کەلوپەل وەك باربەر بەکاردەهێنران چونکە ئاسانت ئامرازی چەرخداریان بۆ گواستنەوە بەکارنەدەهێنا. زیاتر بەرەو ڕۆژهەڵات خۆگونجاندنی هاوشێوە ئەنجامدرا. بۆ نموونە، لە داهۆمی، پاشا چاندنگەی گەورەی ڕۆنی خورمای هەبوو لە نزیك میناکانی ویدا و پۆرتۆ نۆڤۆ کە هەموویان پشتیان بە هێزی کاری کۆیلان بەستبوو.

کەواتە هەڵوەشاندنەوەی بازرگانی کۆیلان، لەبری ئەوەی ببێتە هۆی نەمانی کۆیلەیەتی، بوو هۆی بەکارهێنانی کۆیلان بە شێوەیەکی تر، ئەمجارە لە ناو ئەفریقادا بەکارهێنران لە بری ئەوەی لە ئەمەریکاکان دا بەکاربهێنرێن. جگە

لەمە، چەندین لەو دەزگا سیاسییانەی بازرگانی کۆیلان لە ماوەی دە سەدەی پێشتردا دروستیکردبوون نەگۆڕان و شێوازی هەڵسوکەوت بەردەوامبوو. بۆ نموونە، لە نایجیریا لە ساڵانی ١٨٢٠ هکان و ١٨٣٠ کان دا پاشایەتی ئۆیۆ کە لەسەردەمانێك دا پاشایەتییەکی مەزن بوو، هەرەسیهێنا. هۆکاری هەرەسهێنانی ئەم پاشایەتییە بریتیبوو لە جەنگی ناوخۆ و پەیدابوونی دەوڵەتانی ـ شاری یۆروبای وەك ئیلۆرین و ئیبادان کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ خەریکی بازرگانی کۆیلان بوون لەگەڵ باشووردا. لە ساڵانی ١٨٣٠ کان دا پایتەختی ئۆیۆ تاڵانکرا و دوای ئەوەی شارەکانی یۆروبا کەوتنە ململانێ لەگەڵ داهۆمی دا بۆ باڵادەستی ناوچەیی. ئەوان لە بەشی یەکەمی سەدەکەدا زنجیرەیەك جەنگی بەردەوامیان لەگەڵ یەکتردا بەرپاکرد کە ژمارەیەکی گەورەی کۆیلانیان دروستکرد.

شانبەشانی ئەم جەنگانەش ڕفاندن و سزادان لە لایەن داناکانەوە و پەلاماری بچووکتر بەردەوامبوون. ڕفاندن کێشەیەکی هێندە گەورە بوو لە هەندێك ناوچەی نایجیریا دا کە دایکوباوکان نەیاندەهێشت منداڵانیان لەدەرەوە یاریبکەن لە ترسی ئەوەی نەوەك بڕفێنرێن و وەك کۆیلە بفرۆشرێن.

لە ئەنجامدا پێدەچێ کۆیلەیەتی نەك گرێبەستکردن لە ئەفریقا دا لە سەراپای سەدەی نۆزدەیەم دا فراوان بووبێ. هەرچەندە دەسکەوتنی ژمارەی دروست زەحمەتە، ژمارەیەك لەو ئامارانەی ئێستا لەبەردەستدان و لەو سەردەمەدا لە لایەن گەشتیاران و بازرگانانەوە نوسراون، ئەوە دەخەنەڕوو کە لە پاشایەتییەکانی ڕۆژئاوای ئەفریقای ئاسانت و داهۆمی و لە دەوڵەتانی ـ شاری یۆروبا، زۆر زیاتر لە نیوەی دانیشتوانیان کۆیلە بوون. زانیاری دروست تر لە تۆمارەکانی فەڕەنسای کۆلۆنیالی لە باشووری سوودان دەستدەکەوێ. ئەم ناوچەیەش بەشێکی گەورەی ئەفریقای ڕۆژئاوایە و لە سینیگالەوە درێژ دەبێتەوە بۆ مالی و بورکینانا فاسۆ تا دەگاتە نایجەر و چاد. لەم ناوچەیەدا ٣٠٪ دانیشتوان لە ساڵی ١٩٠٠ دا کۆیلە بوون.

هەروەك سەرهەڵدانی بازرگانی ڕەوا، پەیدابوونی کۆلۆنیالیزمی فەرمی دوای هەوڵدان بۆ گەیشتنە ئەفریقا نەیتوانی کۆیلەیەتی لە ئەفەریقادا لە ناوبەرێ. هەرچەندە پاساوی زۆربەی دەسبەسەرداگرتنەکان لە لایەن ئەوروپییەکانەوە بریتیبوو لە بەرەنگاربوونەوە و نەهێشتنی کۆیلەیەتی، بەڵام واقیعەکە جیاواز بوو. لە زۆربەی ناوچەکانی ئەفریقای کۆلۆنیالی دا کۆیلەیەتی تا ماوەیەکی

سەدەی بیستەمیش بەردەوامبوو. بۆ نموونە، لە سیارا لیۆن تەنیا لە ساڵی ١٩٢٨ دا کۆیلەیەتی هەڵوەشایەوە، هەرچەندە فریتاونی پایتەخت لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم دا دامەزرا وەك پەناگایەك بۆ ئەو کۆیلانەی لە هەردوو ئەمەریکاوە دەنێرانەوە. دواتریش بوە بنکەیەکی گرنگ بۆ هێزێکی دژە کۆیلەیەتی بەریتانی و ماڵێکی نوێ بۆ ئەو کۆیلە ئازادکراوانەی لە ناو کەشتی کۆیلان دا ڕزگاردەکران کە لە لایەن هێزی دەریایی بەریتانییەوە دەگیران. تەنانەت لەگەڵ ئەمەش دا کۆیلەیەتی لە سیارا لیۆن بۆ ماوەی ١٣٠ ساڵ بەردەوامبوو. لایبیریا کە دەکەوێتە باشووری سیارا لیۆن، بە هەمانشێوە لە ساڵی ١٨٤٠ دا بۆ کۆیلە ئازاکراوەکانی ئەمەریکا دروستکرابوو. لەگەڵ ئەمەش دا، کۆیلەیەتی لەوێشدا تا ماوەیەکیش لە سەدەی بیستەم دا بەردەوامبوو. تا کاتێکی درەنگی وەك ساڵانی ١٩٦٠ ەکانیش، وا مەزەندە کرا کە یەك لە سەر چواری هێزی کار بە زۆر کاری پێکراوە و لە بارودۆخێکدا ژیاون و کاریانکردوە کە نزیك بوە لە کۆیلەیەتی. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو دەزگا سیاسی و ئابوورییە چەوسێنەرانەی لەسەر بنەمای بازرگانی کۆیلان دامەزرابوون، بەپیشەسازیبوون نەگەیشتە وولاتانی باشووری بیابانی ئەفریقی و لە شوێنی خۆیان چەقیانبەست یان تەنانەت تووشی خاوبوونەوەی ئابووری بوون لە کاتێك دا ناوچەکانی تری جیهان گۆڕانکاری گەورەیان لە ئابوورییەکانی خۆیان دا کرد.

## دامەزراندنی ئابوورییەکی دوو فاق

پارادیمی "ئابووری دوو فاق" لە بنچینەدا لە لایەن سێر ئارسەر لویس لە ساڵی ١٩٥٥ دا پێشنیاز کراو تا ئێستاش شێوەی بیرکردنەوەی زۆربەی زانا کۆمەڵایەتییەکان دەربارەی کێشە ئابوورییەکانی وولاتانی کەم پەرەسندوو دادەڕێژێ. بە پێی بۆچونی لویس، چەندین ئابووری کەم پەرەسەندوو یان ناپەرەسەندوو پێکهاتەی دوو فاقیان هەیە و دابەشکراون بەسەر سێکتەری مۆدێرن و سێکتەری تەقلیدی دا. سێکتەرە مۆدێرنەکە بەشە زیاتر پەرەسەندوەکەی ئابووری دەگرێتەوە و پەیوەندی بە ژیانی شارنشینی و پیشەسازی مۆدێرن و بەکارهێنانی تەکنەلۆجی پێشکەوتوەوە هەیە. سێکتەرە

تەقلیدییەکەش پەیوەندی بە ژیانی لادێ و کشتوکاڵ و دەزگایان و تەکنەلۆجی "دواکەتوو"ەوەوە هەیە. دەزگایانی کشتوکاڵی دواکەوتووی وەك خاوەنداریێتی گشتی زەوی کە مانای نەبوونی مافی موڵکداری تایبەتی زەوی دەگەیەنێ. بە ڕای لویس، هێزی کار لە سێکتەری تەقلیدی دا هێندە ناچوست بەکاردەهێنرا کە دەتوانرا بگوێزرێتەوە بۆ سێکتەری مۆدێرن بەبێ کەمکردنەوەی ئەو بڕەی کە سێکتەری تەقلیدی دەیتوانی بەرهەمیبهێنێ. بۆ چەندین نەوەی ئابووریناسانی پەرەپێدان، بە پشتبەستن بە بۆچوونەکانی لویس، "کێشەی پەرەپێدان" بریتیبوە لە گواستنەوەی خەڵك و دەرامەتەکان لە سێکتەری تەقلیدییەوە بۆ سێکتەری مۆدێرن و پیشەسازی و شارەکان. لە ساڵی ١٩٧٩ دا لویس خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت بۆ کارەکانی لەسەر پەرەپێدانی ئابووری.

بە دڵنیاییەوە لویس و ئابووریناسانی پەرەپێدان، بە پشتبەستن بە کارەکانی ئەو، لە دەستنیشانکردنی ئابووری دوو فاق دا ڕاست بوون. ئەفریقای باشوور یەکێك بوو لە نموونە زەقەکان. ئابووری ئەفەریقای باشوور دابەشبووبوو بەسەر سێکتەری تەقلیدی کە هەژار و دواکەوتوو بوو لەگەڵ سێکتەری مۆدێرن کە چالاك وخۆشگوزەران بوو. تەنانەت ئەمڕۆش ئەو ئابوورییە دوو فاقەی لویس ئاماژەپێیداوە لە هەموو شوێنێکی ئەفەریقای باشووردا بەدیدەکرێ. یەکێك لەو ڕێگا سەرنجڕاکێشانە بۆ ووردبوونەوە لەم بارودۆخە بریتییە لە گەشتێك بە درێژایی سنووری نێوان ویلایەتی کوازولو ناتاڵ کە پێشتر ناتاڵ بوو و ویلایەتی ترانسکای. سنوورەکە شانبەشانی ڕووباری کای درێژدەبێتەوە. لە ڕۆژهەڵاتی ڕووبارەکەوە لە ناتاڵ، خانووی گرانبەها لەسەر ڕووبەری گەورەی کەنارە لماویە دڵڕفێنەکان دەبینی. ناوچەکانی ناوەوەی ویلایەتەکە بە کێڵگەی سەوز و تەڕوبڕی قامیشی شەکر داپۆشراون. ڕێگاکان جوان و سەراپای ناوچەکە نیشانەی خۆشگوزەرانی پێوەدیارە. لە بەرەکەی تری ڕووبارەکەوە، لەوە دەچێ کە سەردەمێکی تر و وولاتێکی تر بێ. بەشی زۆری ناوچەکە کاول و وێران بوە. خاکەکەی سەوز نییە، بەڵکو قاوەیی و بەزۆری بێدارو درەختە. لە بری خانووی نایاب و مۆدێرن کە ئاوی پاك و تەوالێت و هەموو پێویستیە مۆدێرنەکانی تێدابێ، خەڵك لە کوخی کاتی دا دەژین و لەسەر ئاگری کراوە خواردن لێدەنێن. بە دڵنیاییەوە ژیان تەقلیدییە و دوورە لە ژیانی مۆدێرنی ڕۆژهەڵاتی ڕووبارەکە. ئێستا نابێ تووشی

سەرسوڕمان بێت کە ئەم جیاوازییانە پەیوەندییان بە جیاوازییە گەورەکانی نێوان دەزگا ئابوورییەکانی هەردوو بەری ڕووبارەکەوە هەیە.

لە ناتاڵ لە ڕۆژهەڵات دا، مافی موڵکداری تایبەت وسیستەمێکی دادوەری کارامەو بازاڕ و کشتوکاڵی بازرگانی و پیشەسازیمان هەیە. ترانسکای لە ڕۆژئاوادا، تا ئەم دواییانەش خاوەنی موڵکداری بەکۆمەڵی زەوی و سەرۆك خێڵە تەقلیدییە دەسەڵاتدارەکان بوو. ئەگەر لە دووربینی تیۆری ئابووری دوو فاقی لویس تەماشا بکرێ ئەوا جیاوازی نێوان ناتاڵ و ترانسکای کێشەکانی پەرەپێدانی ئەفریقا ڕووندەکاتەوە. لە ڕاستیدا دەتوانین لەوەش زیاتر بڕۆین و تێبینیبکەین کە لە ڕووی مێژوویییەوە هەموو ئەفریقا وەك ترانسکای وابوە، هەژار وخاوەن دەزگایانی ئابووری پێش سەردەمی مۆدێرن و تەکنەلۆجی دواکەوتوو بوون و سەرۆك هۆزەکان فەرمانڕەواییان کردوە. بەگوێرەی ئەم تێڕوانینە، دەبێ پەرەپێدانی ئابووری بریتیبێ لە جەختکردن لەسەر ئەوەی کە لە کۆتایی دا ترانسکای گۆڕانکاری بەسەردا بێ و ببێ بە ناتاڵ.

ئەم تێڕوانینە ڕاستی زۆری تێدایە، بەڵام سەراپای لۆجیکی چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئابووری دوو فاق و پەیوەندی ئەو ئابوورییە بە ئابووری مۆدێرنەوە لەبەرچاوناگرێ. دواکەوتوویی ترانسکای تەنیا پاشماوەی دواکەوتوویی سروشتی ئەفریقا نییە. ئابووری دوو فاقی نێوان ترانسکای و ناتاڵ لە ڕاستیدا زۆر نوێیە و هەر شتێکی تر بێ ئەوا سروشتی نییە. ئەو دواکەوتووییە لە لایەن نوخبە سپیپێستەکەی باشووری ئەفریقاوە دروستکرا بۆ دروستکردنی دەریاچەیەك لە هێزی کاری هەرزان بۆ بزنسەکانیان و کەمکردنەوەی ڕکابەریی لە لایەن ڕەشپێستە ئەفریقییەکانەوە. ئابووری دوو فاق نموونەیەکی تری کەم پەرەسەندنی دروستکراوە، نەك کەم پەرەسەندنێك کە بە شێوەیەکی سروشتی هاتبێتەئاراوە و بە درێژایی سەدەکان مابێتەوە.

باشووری ئەفریقا و بۆتسوانا، هەروەك دواتر دەبینین لە زۆربەی کاریگەرییە خراپەکانی بازرگانی کۆیلان و ئەو جەنگانەی ئەم بازرگانییە بەرپایکردن دوورکەوتنەوە. یەکەم پەیوەندی سەرەکی خەڵکی باشووری ئەفریقا لەگەڵ ئەورووپییەکان دا لەو کاتەدا بوو کە کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانی هۆڵەندی لە ساڵی ١٦٥٢ دا بنکەیەکی لە تەیبڵ بەی کە ئێستا مینای کەیپ تاونە دامەزراند. لەم کاتەدا ژمارەی دانیشتوانی بەشی ڕۆژئاوای باشووری ئەفریقا

کەم بوون و زۆربەیان لە ڕێگەی ڕاو و کۆکردنەوەی خۆراکەوە دەژیان و پێیان دەوترا گەلی خۆی خۆی. زیاتر بەرەو ڕۆژهەلات، لەو شوێنەی کە ئێستا پێیدەوترێ سیسکای و ترانسکای، کۆمەڵگایانی ئەفریقی کە بە شێوەیەکی چڕ نیشتەجێبوون و کشتوکاڵیان دەکرد، دەژیان. ئەوان لەسەرەتادا پەیوەندی پتەویان لەگەڵ کۆلۆنییە نوێکەی هۆڵەندییەکان دا دانەمەزراند و بەشداری بە کۆیلەکردنیان نەکرد. کەنارەکانی باشووری ئەفریقا زۆر دووربوو لە بازاڕەکانی کۆیلە و دانیشتوانی سیسکای و ترانسکای کە بە خۆسا ناسرابوون هێندە لە ناوەوە دەژیان کە سەرنجی کەسیان ڕانەدەکێشا. لە ئەنجامی ئەمەدا، ئەم کۆمەڵگایانە بەر ئەو تەوژمە خراپانە نەکەوتن کە لە ڕۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەفریقایان دا.

دابڕانی ئەم ناوچانە لە سەدەی نۆزدەیەم دا گۆڕانکاری بەسەردا هات. کەش و ژینگەی نەخۆشی ئەفریقای باشوور بەلای ئەوروپییەکانەوە زۆر سەرنجڕاکێش بوو. بۆ نموونە، بە پێچەوانەی ڕۆژئاوای ئەفریقاوە، باشووری ئەفریقا کەشێکی فێنکی هەبوو کە جۆرە نەخۆشیەکانی وەك مەلاریا و زەردەتای تێدا نەبوو کە زۆربەی ناوچەکانی ئەفریقایان کردبوە "قەبرستانی سپیپێستان" و نەیانهێشت ئەوروپییەکان تیایان دا نیشتەجێبن و تەنانەت بنکەی هەمیشەیی دروستبکەن. باشووری ئەفریقا زۆر ئومێدبەخشتر بوو بۆ نیشتەجێبوونی ئەوروپییەکان. بڵاوبوونەوەی ئەوروپییەکان بەرەو ناوەوەی باشووری ئەفریقا دەستیپێکرد ماوەیەکی کەم دوای ئەوەی بەریتانییەکان کەیپ تاونیان لە چنگی هۆڵەندییەکان دەرهێنا لە کاتی جەنگەکانی ناپلیۆن دا. ئەمەش بوە هۆی بەرپابونی زنجیرەیەکی درێژ لە جەنگ لەگەڵ خۆسا دا کاتێك سنوورەکانی نیشتەجێبوون زیاتر بەرەو ناوەوە درێژکرانەوە. کۆچکردن بەرەو ناوچەکانی ناوەوەی باشووری ئەفریقا لە ساڵی ١٨٣٥ دا تین و تاوی زیاتری سەند، کاتێك پاشماوە ئەوروپییەکانی بە ڕەچەڵەك هۆڵەندی کە دواتر بە ئەفریکانەر یان بۆر ناسران، دەستیانکرد بە کۆچە جەماوەرییە بەناوبانگەکەیان کە بە کۆچی مەزن ناسراوە لە کەنار و کەیپ تاونی ژێردەسەڵاتی بەریتانییەکانەوە. ئەفریکانەرەکان دواتر دوو دەوڵەتی سەربەخۆیان دامەزرند لە ناوچەکانی ناوەوەی ئەفریقا دا کە دەوڵەتی ئۆرەنج فری و ترانسڤاڵ بوون.

قۆناخی دواتری پەرەپێدانی باشووری ئەفریقا لەگەڵ دۆزینەوەی یەدەکی

زۆری ئەڵماس لە کیمبێرلی لە ساڵی ١٨٦٧ دا و کانە دەوڵەمەندەکانی ئاڵتوون لە جۆهانسبێرگ لە ساڵی ١٨٨٦ دا دەستپێکرد. ئەم سامانە زۆرە کانزاییە هەر زوو بەریتانییەکانی والێکرد کە دەسەڵاتی خۆیان بۆ هەموو باشووری ئەفریقا درێژبکەنەوە. بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەتی ئۆرەنج فری و ترانسڤاڵ بوە هۆی بەرپابوونی جەنگە بەناوبانگەکانی بۆر لە ساڵانی ١٨٨٠ بۆ ١٨٨١ و ١٨٩٩ بـۆ ١٩٠٢. دوای شکستهێنانی چاوەڕوان نەکراوی ئەفریکانەرەکان، بەریتانییەکان توانیان هەردوو دەوڵەتی ئەفریکانەرەکان لەگەڵ ناوچەی کەیپ و ناتاڵ یەکبخەن و یەکێتی باشووری ئەفریقا لە ساڵی ١٩١٠ دا دابمەزرێنن. جگە لە شەڕی نێوان ئەفریکانەرەکان و بەریتانییەکان، پەرەپێدانی ئابووری کانزایی و فراوانبوونی نیشتەجێبوونی ئەوروپییەکان ئاکامی تری بۆ پەرەپێدانی ناوچەکە لێکەوتەوە. لە هەموویان دیارتر، بوونە هۆی بەرزبوونەوەی داخوازی بۆ خۆراك و بەروبومە کشتوکاڵیەکانی تر و دەرفەتی ئابووری نوێیان بۆ دانیشتوە خۆماڵییە ئەفەریقییەکان لە کشتوکاڵ و بازرگانی دا ڕەخساند.

خۆساکان، لە سیسکای و ترانسکای خێرا بەپیر ئەم دەرفەتە ئابوورییانەوە چوون، هەروەك مێژووناس کۆلین بەندی، تۆماری کردوە. هەر لە ساڵی ١٨٣٢ ەوە و تەناتەت بەر لە برەوسەندنی کانزایی، دینگاری مۆراڤی لە ترانسکای هەستی بە داینەمیکی ئابوورییە نوێیەکەی ئەم ناوچانە و داخوازی ئەفریقییەکان بۆ کاڵا بەکاربەرە نوێکان کرد کە لە ڕێگەی بڵاوبوونەوەی ئەوروپییەکانەوە لەگەڵیان دا ئاشنا بووبوون. ئەو نوسیویەتی *(بۆ بەدەستهێنانی ئەم کاڵایانە، ئەوان هەوڵیان دا ... بە ڕەنجی شانی خۆیان پارە پەیدابکەن و جلوبەگ و خاکەناس و گاسن و عارەبانە و کەلوپەلی تری بەسوود بکڕن)*

وەسفەکەی کۆمسیاری مەدەنی، جۆن هەمینگ بۆ سەردانەکەی بۆ فینگۆلاند لە سیسکای لە ساڵی ١٨٧٦ دا بەهەمانشێوە سەرنجڕاکێشە. ئەو نووسیویەتی کە:

*(تووشی سەرسوڕمان بووم بەو هەموو پێشکەوتنانەی لە لایەن فینگۆییەکانەوە لە ماوەی چەند ساڵێکی کەم دا ئەنجامدرابوو ... دەچوومە هەر شوێنێك کوخ و شوێنی نیشتەجێبونی خشت یان بەردم دەبینی. لە چەندین جێگادا خانووی گەورەی خشت بەرزکرابوونەوە... و درەختی میوە*

*نێژرابوون، لە هەرشوێنێك چەمێكی ئاو دەسبكەوتایە، جۆگەی لێهەڵبەسترابوو، زەوییەكەی تا ئەو شوێنەی ئاوی بگەشتایە كێڵرابوو، لاپاڵی گردەكان و تەنانەت لوتكەی چیاكانیش تا ئەو شوێنەی گاسن كاری بكردایە كێڵرابوون. بڕی ئەو زەوییانەی كێڵرابوون سەرسامیكردم. ئەوە چەندین ساڵە ڕووبەری هێندە گەورەی زەوی كێڵراوم نەبینیوە).*

هەروەك لە ناوچەكانی تری باشووری بیابانی ئەفریقا دا بەكارهێنانی گاسن لە كشتوكاڵ دا نوێ بوو، بەڵام كاتێك ئەو دەرفەتەیان بۆ ڕەخسا جووتیارانی ئەفریقا بەتەواوی ئامادەی بەكارهێنانی ئەو تەكنەلۆجییە بوون. ئەوان لە هەمانكات دا ئامادەبوون پارە لە كڕینی عارەبانەو پرۆژەكانی ئاودێری دا خەرجبكەن.

كاتێك ئابووری كشتوكاڵی پەرەیسەند دەزگا خێڵەكییە چەسپیوەكان بەرەو لاوازی ڕۆیشتن. بەڵگەی زۆر لە بەردەستدان كە گۆڕانكاری لە مافی موڵكداری دا هاتەئاراوە. لە ساڵی ١٨٧٩ دا، دادوەری ئۆمزیمكۆلۆی گریكوالاندی ڕۆژهەڵات لە ترانسكای، سەرنجیدایە (ئارەزووی ڕوو لەزیادی دانیشتوانە خۆماڵییەكە تا ببنە خاوەنی زەوی - ئەوان ٣٨,٠٠٠ ئەیكەر زەوییان كڕیوە) سێ ساڵ دواتر، ئەو نوسیویەتی كە هەشت هەزار جووتیاری ئەفریقی لە ناوچەكەدا نەوەد هەزار ئەیكەر زەوییان كڕیوە و دەستیانكردوە بە كاركردن تیایان دا.

بێگومان ئەفریقا نەگەیشتبوە لێواری شۆڕشی پیشەسازی، بەڵام گۆڕانكاری ڕاستەقینە بەڕێوەبوو. مافی موڵكداری زەوی سەرۆك هۆزەكانی لاوازكرد و توانای بەخشیە پیاوانی نوێ تا زەوی بكڕن و دەوڵەمەند ببن، شتێك كە تەنیا چەند دەیەیەك لەوەبەر بیری لێنەكرابۆوە. ئەمەش دیسانەوە ئەوە ڕووندەكاتەوە كە چۆن لاوازبوونی دەزگا چەوسێنەرەكان و سیستەمە ڕەهاكانی كۆنترۆڵكردن دەتوانن داینەمیزمی ئابووری تازەدامەزراو بهێننەئاراوە. یەكێك لە چیرۆكە سەركەوتوەكان بریتیبوو لە ستیفن سۆنجیكا لە سیسكای، كە جووتیارێكی خۆپێگەیەنەر وخاوەن باكگراوندێكی هەژارانە بوو. لە ووتارێكدا لە ساڵی ١٩١١ دا سۆنجیكا ئاماژەیدا بەوەی كە چۆن كاتێك بۆ یەكەمجار ئارەزوی خۆی بۆ كڕینی پارچە زەوییەك لای باوكی دەربڕیوە، باوكی وەڵامی دابۆوە ( *زەوی بكڕی؟ چۆن دەتوانی زەوی بكڕی؟ ئایا نازانی هەموو زەوییەكان هی*

*خـودان و ئـەویش تـەنیا دەیانداتـە سـەرۆك خێڵـەكان).* كاردانەوەكـەی بـاوكی سـۆنجیكا مایـەی تێگەیـشتن بـوو. بـەڵام سـۆنجیكا وازی نـەهێنا. ئـەو لـە شارۆچكەی كینگ ویلیام كارێكی پەیداكرد و بەم جۆرە باسـی ئـەزموونی خـۆی دەكا:

*(حسابێكی تایبەتم لە بانك كردەوە و بەشـێك لـەو پارەیـەی كۆمـدەكردەوە دەمخستە ناو ئەو حسابەوە... ئەمەش بەردەوامبوو تـا تـوانیم هەشـتا پاوەنـد كۆبكەمەوە... جووتێك گا و نێر و هەوجاڕ و گاسن و كەرەسە كـشتوكاڵییەكانی ترم كڕی ... كێڵگەیەكی بچووكیشم كڕی ... ناتوانم وەك پێویـست ڕاسـپاردەی كـشتوكاڵكردن بكـەم بـۆ هاوڕێكـانم ... پێویـستە ئـەوان شـێوازی نـوێ بـۆ قازانجكردن پەیڕەو بكەن).*

پارچـە زانیارییـەكی یـەكجار گـرنگ كـە پـشتگیریی داینـەمیزمی ئـابووری و خۆشگوزەرانی جووتیارانی ئەفریقا دەكا لەو سەردەمەدا لە نامەیەك دا خراوەتە ڕوو كە لە لایەن دەستەیەكی بڵاوكردنەوەی مەسیحیەتی میسۆدیەوە، دەبڵێـو. جەی دەیڤیس لە ساڵی ١٨٦٩ دا نێراوە. لە نووسینەكەی دا بۆ ئینگلتەرە ئـەو بـە شـادییەوە نوسـیویەتی كـە چلوشـەش پاوەنـدی كاشـی كۆكردبـۆوە بـۆ " سـندوقی هاوكـاری لۆكـە لـە لانكاشـێر". لـەم سـەردەمەدا جووتیـارە خۆشگوزەرانەكانی ئەفریقا پارەیان بەخشیوە بـۆ هاوكـاری كرێكـارانی هـەژاری ئینگلیزی قوماش دروستكردن.

جێگەی سەرسوڕمان نییە كە ئەم داینەمیزمە نابوورییە نوێیە سەرۆك خێڵـە تەقلیدییەكانی دڵخۆشنەكرد، ئەوان، بە پێی پاتێرنێك كە ئێستا لای ئێمـە نـامۆ نییە، ئەمەیان وەك لەدەستدانی سـامان و دەسـەڵاتی خۆیـان بینـی. لـە سـاڵی ١٨٧٩ ماسیۆ پلیس، كاربەدەستی باڵای ترانسكای تێبینیكرد كە ڕووپێوكردنی زەوییەكان بۆ ئەوەی بكرێنە موڵكی تایبەت بەرهەڵستیكرا. ئەو نووسـیویەتی ( *هەندێك لە سەرۆك خێڵەكان ... ناڕازیبوون، بەڵام زۆربەی خەڵك بەوە خۆشـحاڵ بوون ... سەرۆكەكان لایانوابوو كـە تـاپۆكردنی زەوییـەكان لەسـەر جوتیـاران، دەسەڵاتی ئەوان لەناو سەركارەكان دا لەناودەبا)*

سەرۆكەكان بەرهەڵـستی ئەنجامـدانی چاكسازییان كـرد لـە زەوییـەكان دا، چاكسازی وەك هەڵكەندنی جۆگەی ئاودێری یـان دروسـتكردنی پـەرژین. ئـەوان دەركیـان بـەوەكردبوو كـە ئـەم چاكسازییانە تـەنیا پێشەكی بـوون بـۆ مـافی

موڵکداری تایبەتی زەوییەکان و سەرەتای کۆتاییهاتنی ئەوان. چاودێرانی ئەورووپی تەنانەت تێبینی ئەوەیان کرد کە سەرۆك خێڵ و دەسەڵاتدارە تەقلیدییەکانی تری وەك دوکتۆرانی جادوکار هەوڵیان دا هەموو "شێوازێکی ئەورووپی" قەدەخەبکەن، لەوانە دانەوێڵەی نوێ و ئامرازی وەك گاسن و کەلوپەلەکانی بازرگانی. بەڵام تێهەڵکێشکردنی سیسکای و ترانسکای لەگەڵ دەوڵەتی کۆلۆنیالی بەریتانی دا، دەسەڵاتی سەرۆك و دەسەڵاتدارە تەقلیدییەکانی لاوازکرد و بەرەنگاربوونەوەکانیان لەو ئاستەدا نەبوو کە بتوانن داینەمیزمی نوێی ئابووری لە باشووری ئەفریقا دا بوەستێنن. لە ساڵی ١٨٨٤ دا لە فینگۆلاند، چاودێرێکی ئەورووپی سەرنجیدا کە خەڵك:

*(دڵسۆزی خۆیان بەرەو ئێمە گۆڕیوە. سەرۆکەکانیان بوونەتە جۆرێك لە زەویداری خاوەن تاپۆی ... بێدەسەڵاتی سیاسی. چیتر لە حەسوودی سەرۆکەکان یان چەکی کوشندەی ... دوکتۆری جادوکار ناترسن کە هێرشدەکەنە سەر خاوەن گایەلی دەوڵەمەند و ڕاوێژکاری بەتواناو هێنانە ناوەوەی نەریتی نوێ و کشتوکاڵکاری بەهرەدار و بۆ ئەوەی هەموویان بهێنێتە ئاستی هاوشێوەی ئاستی توانای ئەو — ئەندامی هۆزی فینگۆ کە چیتر لەمانە ناترسێ ... پیاوێکی پێشکەوتنخوازە. هێشتا هەر جووتیارێکی ڕەنجدەرە... ئەو خاوەنی عەرەبانە و گاسنەو دێراوەکانی دەکاتەوە بۆ ئاودێری و خاوەنی ڕانە مەڕە).*

تەنانەت کەمێك دەزگایانی کراوە و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی سەرۆك خێڵەکان و سنووردارکردنی دەسەڵاتیان بەس بوون بۆ دەسپێکردنی برەوسەندنی بەهێزی ئابووری ئەفریقا. بەداخەوە، ئەو برەوسەندنە تەمەن کورت بوو، لە نێوان ساڵانی ١٨٩٠ و ١٩١٣ لە ناکاو کۆتاییهات و پێچەوانە بۆوە. لەم ماوەیەدا دوو هێز کاریان لەسەر تێکدانی ئەو خۆشگوزەرانی و داینەمیزمەی لادێکان کرد کە ئەفریقییەکان لە ماوەی پەنجا ساڵی پێشتردا دروستیانکردبوو. یەکەمیان بریتیبوو لە قینەبەرایەتی جووتیارە ئەورووپییەکان کە ڕکابەریی جووتیارە ئەفریقیەکانیان دەکرد. جووتیارە سەرکەوتوەکانی ئەفریقا نرخی ئەو دانەوێڵانەیان هێنایە خوارەوە کە ئەورووپییەکانیش بەرهەمیان دەهێنان. کاردانەوەی ئەورووپییەکان بریتیبوو لە بێبەشکرنی ئەفریقییەکان لە بزنسەکانیان. هێزی دوەم تەنانەت لە هی یەکەم ناپەسەند تر

بوو. ئەورووپییەکان هێزی کاری هەرزانیان دەویست تا لە ئابووری کانزایی برەوسەندوودا کاریان پێبکەن و تەنیا لە ڕێگەی هەژارکردنی ئەفریقییەکانەوە دەیانتوانی ئەمە دابینبکەن. ئەمەشیان بەپێی شێوازێکی تایبەتی لە ماوەی چەندین دەیەدا ئەنجامدا.

لە ساڵی ١٨٩٧ دا شایەتیەکەی جۆرج ئەلبۆ، سەرۆکی ڕێکخراوی کانزاکان لەبەردەم کۆمسیۆنێکی لێکۆڵینەوەدا بەکورتی باسی لۆجیکی هەژارکردنی ئەفریقییەکان دەکا بۆ دەستخستنی هێزی کاری هەرزان. ئەو باسدەکا کە چۆن پێشنیازی کردوە هێزی کار هەرزان بکرێ " تەنیا بە کورەکان بووترێ کە کرێکانیان کەمکراوەتەوە". شایەتیەکەی بەم شێوەیە بەردەوامدەبێ:

*(کۆمسیۆن: گریمان کافرەکان (ئەفرقیە ڕەشپێستەکان) دەگەڕێنەوە بۆ شوێنی بەخێوکردنی ئاژەڵەکانیان، ئایا تۆ لەگەڵ ئەوەدایت داوا لە حکومەت بکرێ بە زۆر کاریان پێبکا؟*

*ئەلبو: بە دڵنیاییەوە... من کارکردن دەکەمە ئیلزامی ... بۆچی دەبێ ڕەشپێستێك ڕێگای پێبدرێ هیچ کارێك نەکات؟ بڕوام وایە کە کافر ناچار بکرێ کار بکا بۆ ئەوەی گوزەرانی خۆی دابینبکا.*

*کۆمسیۆن: ئەگەر پیاوێك بتوانێ بێ کارکردن بژی، چۆن دەتوانی ناچاری بکەی کاربکا؟*

*ئەلبو: کەواتە باجی لێوەرگرە....*

*کۆمسیۆن: کەواتە تۆ نایەڵی کافر ببێتە خاوەن زەوی لە وڵاتەکەدا، بەڵام پێویستە کار بۆ دەوڵەمەندکردنی پیاوی سپیپێست بکا.*

*ئەلبو: پێویستە ئەو بەشی خۆی کاربکا بۆ ئەوەی یارمەتی دراوسێکانی بدا).*

هەردوو ئامانجی نەهێشتنی ڕکابەری لەگەڵ جووتیارانی سپیپێست و دروستکردنی هێزێکی کاری گەورە بە ڕۆژانەیەکی کەم، پێکەوە لە ڕێگەی دەرکردنی یاسای زەوی دانیشتوانی خۆماڵی لە ساڵی ١٩١٣ دا جێبەجێکران. یاساکە، بە لەبەرچاوگرتنی لێکدانەوەکەی لویس دەربارەی ئابووری دوو فاق، باشووری ئەفریقای کردە دوو بەش، بەشێکی مۆدێرنی خۆشگوزەران و بەشێکی تەقلیدی هەژار، بەڵام خۆشگوزەرانی و هەژاری لە لایەن خودی یاساکەوە دروستکران. یاساکە جەختی لە سەر ئەوەکرد کە ٪٨٧ زەوییەکان بدرێنە

ئەوروپییـەکان کـە تـەنیا ٪٢٠ی دانیـشتوانیان پێکـدەهێنا. ٪١٣ ەکـەی کـە دەمایـەوە بدرێتـە ئەفریقییـەکان. بێگومـان یاسـای زەوی چـەندین پێـشینەی هەبوو؛ چونکە پێشتر ئەوروپییەکان ئەفریقییـەکانیان بەرەبـەرە خزانـدبوە نـاو ئـەو شـوێنانەی کـە بـۆ ئـەوان تـەرخانکرابوون و تـا دەهـاتیش ڕووبـەری ئـەم شوێنانە بچووکتر دەبوونەوە. بەڵام ئەوە یاسای ساڵی ١٩١٣ بوو کـە بەتـەواوی بارودۆخەکـەی خـستە چوارچـێوەیەکی دەزگاییـەوە و زەمینـەی خۆشـکرد بـۆ پێکهێنـانی ڕژێمـی ڕەگەزپەرسـتی باشـووری ئـەفریقا بەشـێوەیەك کەمینـە سپیپێستەکە مـافی سیاسـی و ئـابووری هـەبێ و زۆرینـە ڕەشپێستەکەش لـە هەردوو مافەکە بێبەش بن. یاساکە دەسنیشانیکرد کە چەندین جێگـای تایبـەت بـە ڕەشپێـستەکان، لەوانـە سیـسکای و ترانـسکای بکرێنـە نیـشتمان "homeland"ی ئەفریقییـەکان و دواتـریش ئـەم شـوێنانە بـە بانتۆسـتانس ناسـران. ئەمـەش بەشـێکی تـری ناتۆرەکـانی ڕژێمـی ڕەگەزپەرسـت بـوو لـە باشووری ئەفریقا چـونکە ڕژێمەکـە بانگەشـەی ئـەوەی دەکـرد کـە دانیـشتوانی ئەفریقی لە ئەفریقای باشوور دانیشتوانی خۆماڵی ناوچەکە نین، بەڵکو وەچـەی دانیشتوانی بـانتون و نزیکـەی هـەزار سـاڵ لەوەبـەر لـە ڕۆژهـەڵاتی نایجیریـاوە کۆچیانکردبوو. لەبەر ئەوە ئـەوان مـافی خاوەنـدارێتی زیاتریـان - بێگومـان لـە پراکتیس دا کەمتر- لە دانیشتوە ئەوروپییەکان نییە.

نەخشەی (١٦) ئەو برە زەوییە جێگەی گاڵتەیـە پیـشاندەدا کـە لـە ڕێگـەی یاسای زەوی ساڵی ١٩١٣ و یاسا جێگرەوەکەی سـاڵی ١٩٣٦ بـۆ ئەفریقییـەکان تەرخانکرا. لە هەمانکات دا نەخشەکە زانیاری سـاڵی ١٩٧٠ ی تۆمـارکردوە لـە بـارەی ڕادەی تـەرخانکردنی زەوی هاوشـێوەوە کـە لـە کـاتی دامەزرانـدنی ئابوورییەکی تری دوو فاق دا لە زیمبـابۆی ئەنجامـدراو لـە چاپتەری ١٣ باسـی دەکەین.

**نەخشەی ( ١٦ ): بڕی ئەو زەوییانەی بۆ ئەفریقییەکان تەرخانکران لە لایەن ڕژێمە سپیپێستە کەمینەکانی باشووری ئەفریقا و زیمبابۆی**




ئەو یاسانەی لە ساڵی ١٩١٣ دانران بەندی ئەوتۆشیان لە خۆگرتبوو بۆ ڕێگرتن لەو جووتیارە ڕەشپێستانەی، کە بەشێوەی هاوبەش کشتوکاڵیان لەگەڵ سپیپێستەکان دا دەکرد یان زەوییە چۆڵەکانیان بەکاردەهێنا، لە کشتوکاڵکردن لەسەر زەوی سپیپێستەکان بەشێوەی کرێکاری کشتوکاڵی نەبێ. هەورەك وەزیری کاروباری دانیشتوانی خۆماڵی باسیکرد *( کاریگەریی یاساکە بریتیبوو لە ڕاگرتنی هەموو جۆرە ئاڵوێرێك لە داهاتوو دا کە پەیوەندی بە هەموو شتێکەوە هەیە کە سروشتی هاوبەشێتی لە نێوان ئەوروپییەکان و خۆماڵییەکان دەربارەی زەوی یان بەرهەمەکانی زەوی هەبێ. پێویستە هەموو گرێبەستە نوێکان لەگەڵ خۆماڵییەکان دا گرێبەستی خزمەتگوزاری بن. ئەگەر گرێبەستێکی دروست لەم بارەیەوە ئیمزا کرا، ئەوا هیچ شتێك نییە خاوەنکارەکە بوەستێنێ لە پێدانی هەر شتێك جگە لە پارە بە جووتیارە*

*خۆماڵیەکە یان بە پێدانی پارچەیەك زەوی بۆ کێڵان ... بەڵام خۆماڵیەکە ناتوانێ هیچ شتێك بداتە خودانەکە بەرامبەر مافی بەکارهێنانی زەوییەکەی).*

بەلای ئابووریناسانی پەرەپێدان کە لە سالانی ١٩٥٠ کان و ٦٠ ەکان دا سەردانی باشووری ئەفریقایان کردوە، ئەو ماوەیەی کە بابەتی ئەکادیمی پەرەپێدان خەریکی پێگرتن و ئایدیاکانی ئارسەر لویس لە بلاوبوونەوەدا بوون، پێدەچوو کە جیاوازی نێوان شوێنی ڕەشپێستەکان لەگەلّ ئابووری مۆدێرن و خۆشگوزەرانی ئەورووپیە سپیپێستەکان، کوتومت هاوشێوەی ئەوە بێ کە ئابووری دووفاق باسیدەکرد. بەشی ئەورووپای ئابوورییەکە شارنشین و خاوەن پەروەردە بوون و تەکنەلۆجی مۆدێرن یان بەکاردەهێنا. هۆملاندەکان هەژار و گوندنیشن و دواکەوتوو بوون و هێزی کار تیایان دا هیچ بەرهەمداریی نەبوو، خەڵك خاوەنی پەروەردە نەبوون. پێدەچوو ئەمە جەوهەری ئەفریقای بێکات و دواکەوتوو بێ.

ئەو ئابووری دوو فاق نە سروشتی و نە دروستبوونیشی حەتمی بوو. ئەوە لە لایەن کۆلۆنیالیزمی ئەورووپیەوە دروستکرابوو. بەڵی نیشتمانەکان هەژار و لە ڕووی تەکنەلۆجییەوە دواکەوتوو بوون و خاوەن پەروەردە نەبوون، بەلام هەموو ئەمانە ئاکامی سیاسەتی حکومەت بوون کە بە زۆر گەشەکردنی ئابووری ئەفریقای هەڵتەکاند و دەریاچەیەکی هێزی کاری ئەفریقی هەرزان و بێپەروەردەی دروستکرد تا لەو کان و زەوییانەدا کاربکەن کە لە لایەن ئەورووپییەکانەوە کۆنترۆلکرابوون. لە دوای سالّی ١٩١٣ ەوە ژمارەیەکی زۆری ئەفریقییەکان لە سەر زەوییەکانیان دەرکران و لە لایەن سپیپێستەکانەوە دەستیان بەسەردا گیرا و خزێنرانە ناو هۆملاندەکانەوە کە زۆر بچووکتر بوون لەوەی بتوانن هیچ شێوە گوزەرانێکی سەربەخۆی تێدا بەدەستبهێنن. لەبەر ئەوە هەروەك مەبەست بوو، ئەوان ناچاردەکران تا لە ئابووری سپیپێسەکان دا هەولّبدەن بژێوییان پەیدابکەن و هێزی کاری خۆیان بەهەرزان بفرۆشن. کاتێك هاندانی ئابوورییان نەما، ئەو پێشکەوتنانەی لە ماوەی پەنجا سالّی پێشتردا بەدەستیان هێنابوون، هەموویان پێچەوانە بوونەوە. خەڵك وازیان لە جووتکردن بە گاسن هێناو کەوتنەوە کشتوکالّکردن بە پاچەکۆلە. ئەوە ئەگەر کشتوکالّیان هەر بکردایە. لە زۆربەی کاتەکان دا ئەوان وەك هێزی کاری هەرزان لەبەردەست دا بوون، کە هۆملاندەکان وا دروستکرابوون تا ئەو هێزی کارە هەرزانە

دابینبکەن.

تەنیا هاندانە ئابوورییەکان نەبوون کە لەناوبران، بەڵکو ئەو گۆڕانکارییە سیاسییانەی دەستیان بە سەرهەڵدان کردبوو، ئەوانیش پێچەوانەبوونەوە. دەسەلاتی سەرۆك خێڵەکان و فەرمانڕەوا تەقلیدییەکان کە پێشتر لاواز بووبوو، بەهێزکرانەوە، چونکە بەشێك لە پرۆژەی دروستکردنی هێزی کاری هەرزان بریتیبوولە نەهێشتنی موڵکداری تایبەتی زەوی. بۆیە کۆنترۆڵکردنی زەوی لە لایەن سەرۆکەکانەوە جەختی لەسەر کرایەوە. ئەم هەنگاوانە لە ساڵی ۱۹۵۱ دا گەیشتنە لوتکە، کاتێك حکومەت یاسای دەسەلاتدارانی بانتۆی دەرکرد. هەر لە ساڵی ۱۹٤۰ەوە، جی. فینلەی بەدروستی پەنجەی خستە سەر کێشەکە:

*(خاوەندارێتی خێڵەکی بۆ زەوی ئەوە مسۆگەردەکا کە هەرگیز زەوییەکە بەباشی بەکارنەهێنرێ و هەرگیزیش نەبێتە هی دانیشتوانی خۆماڵی. پێویستە هێزی کاری هەرزان شوێنی نەشونماکردنی هەرزانی هەبێ، هەر بۆیە ئەو شوێنە بۆ ئەفریقییەکان دابینکرا لەسەر حسابی خۆیان).*

بێبەشکردنی جووتیارانی ئەفریقی لە زەوییەکانیان بوە هۆی ئەوەی بە کۆمەڵ تووشی هەژاری ببن. ئەو بێبەشکردنە تەنیا بناخەی دەزگایی ئابوورییەکی دواکەوتووی دانەمەزراند، بەڵکو خەڵکی هەژاریشی دروستکرد تا ببنە سەرمایەی ئەو ئابوورییە.

بەڵگە بەردەستەکان پێچەوانەبوونەوەی ئاستی گوزەران پیشاندەدەن لە هۆملاندەکان دا لە دوای دەرچوونی یاسای زەوی دانیشتوانی خۆماڵی لە ساڵی ۱۹۱۳ دا. ترانسکای و سیسکای تووشی لاوازییەکی درێژخایەنی ئابووری بوون. تۆمارەکانی کارکردن لە لایەن کۆمپانیاکانی دەرهێنانی ئالتوون کە لە لایەن مێژووناس فرانسیس ویلسۆن کۆکراوەتەوە، ئەوە پیشاندەدەن کە ئەم لاوازییە سەراپای ئابووری باشووری ئەفریقای گرتبۆوە. دوای دەرکردنی یاسای زەوی دانیشتوانی خۆماڵی و یاساکانی تر، ڕۆژانەی کرێکارانی کان لە نێوان ساڵانی ۱۹۱۱ و ۱۹۲۱ ٪۳۰ کەمیکرد. لە ساڵی ۱۹٦۱ دا، سەرەڕای گەشەکردنێکی جێگیر لە ئابووری باشووری ئەفەریقا دا، ئەم ڕۆژانانە ٪۱۲ کەمتر بوون لەوانەی لە ساڵی ۱۹۱۱ دا دەدران. جێگەی سەرسوڕمان نییە کە باشووری ئەفریقا لەم ماوەیەدا بوە نایەکسانترین وولات لە جیهان دا.

تەنانەت لەم بارودۆخەش دا، ئایا ئەفریقییە ڕەشپێستەکان نەیاندەتوانی

ڕووبکەنە ئابووری مۆدێرنی ئەوروپییەکان و لەوێدا بزنسیان دابمەزراندایە یان بیانخوێندایە و پیشەیەکیان دەستپێبکردایە؟ حکومەت هەموو هەوڵێکی دا کە ئەمە ڕوونەدات. هیچ ئەفرقییەك بواری نەدرایە ببێتە خاوەن زەوی یان بزنسێك دابمەزرێنێ لە بەشە ئەوروپیەکەی ئابووری دا ـ ٨٧٪ ی زەوییەکان. ڕژێمی ڕەگەزپەرست دەیزانی کە ئەفریقییە خوێندەوارەکان ڕکابەریی لەگەڵ سپیپێستەکان دا دەکەن لە بری دابینکردنی هێزی کاری هەرزان بۆ کانەکان وکشتوکاڵی سپیپێستەکان. هەر لە ساڵی ١٩٠٤ ەوە سیستەمێکی قۆرخکردنی کار بۆ ئەوروپییەکان لە ئابووری کانزایی دا خرایەگەڕ. هیچ ئەفریقییەك ڕێگەی پێنەدرا ببێتە دارێژەر و شیکاری کانزا و فەرمانبەری بانك و ئاسنگەرو دروستکاری گیزەر و سافکار و دارێژەری مس و خشت دانەر و لیستەکە تا دەهات درێژتر دەبۆوە تا دەگەیشتە بەکارهێنەری ئامێری تەختەبڕین. لە پڕێکدا، ئەفریقییەکان گرتنە دەستی هەموو کارێکی بەهرەداریان لە کەرتی کانزایی دا لێ قەدەخەکرا. ئەمەش یەکەم نموونەی زیندووی "جیاکردنەوەی ڕەنگ"ی بەناوبانگ بوو کە یەکێك بوو لە چەندین داهێنانی ڕەگەزپەرستانەی ڕژێمی باشووری ئەفریقا. جیاکردنەوەی ڕەنگ لە ساڵی ١٩٢٦ دا درێژکرایەوە بۆ هەموو ئابووری و تا ساڵی ١٩٨٠ بەردەوامبوو. جێگەی سەرسوڕمان نییە کە ئەفریقییە ڕەشپێستەکان خاوەنی پەروەردە نەبوون، دەوڵەتی باشووری ئەفریقا نەك تەنیا ئەو دەرفەتەی نەهێشت کە ئەفریقییەکان بتوانن لە ڕووی ئابوورییەوە سوود لە پەروەردە وەربگرن، بەڵکو وەبەرهێنانیشی لە قوتابخانەکانی ڕەشپێستان دا ڕەتکردەوە و گرنگی بە پەروەردەی ڕەشپێستەکان نەدا. ئەم پۆلیسییە لە ساڵی ١٩٥٠ گەیشتە لوتکە، کاتێك لە ژێر سەرکردایەتی هێنریك ڤێرۆرد، کە یەکێك بوو لە ئەندازیارانی ڕژێمی ڕەگەزپەرستی کە تا ساڵی ١٩٩٤ بەردەوامبوو، حکومەت یاسای پەروەردەی بانتوی دەرکرد. فەلسەفەی پشتەوەی ئەم یاسایە بە ڕوونی لە لایەن خودی ڤێرۆردەوە لە ووتارێك دا لە ساڵی ١٩٥٤خرایەڕوو:

*(پێویستە بانتو ڕێگای پیشانبدرێ تا بتوانێ لە هەموو بوارەکان دا خزمەتی کۆمەڵگاکەی بکا. ئەو جگە لە ئەنجامدانی هەندێك جۆری کرێکاریی، لە ناو کۆمەڵگای ئەوروپی دا جێگای نابێتەوە.... لەبەر ئەوە بانتۆ هیچ سوودێك لە مەشقکردن وەرناگرێ کە ئامانجی ئەوەیە تێکەڵاوی کۆمەڵگای ئەوروپی بێ، لە*

*کاتێك دا ئەو ناتوانێ و ڕێگەی پێنادرێ تێکەڵاو بێ).*

بێگومان جۆری ئەو ئابوورییە دوو فاقەی لە ووتارەکەی ڤێرۆردا باسیکراوە جیاوازە لە تیۆری ئابووری دوو فاقی لویس. لە باشووری ئەفریقا دا ئابووری دوو فاق ئاکامێکی حەتمی پرۆسەی پەرەپێدان نەبوو. ئەو ئابوورییە لە لایەن دەوڵەتەوە دروستکرا. لە باشووری ئەفریقا دا ڕۆشتنی خەڵکی هەژار لە سێکتەرە دواکەوتوەکەوە بۆ سێکتەرە مۆدێرنەکە، لەکاتێك دا ئابووری پەرەیدەسەند، ڕێگەی پێنەدەدرا. بە پێچەوانەوە، سەرکەوتنی سێکتەرە مۆدێرنەکە پشتی بە بوونی سێکتەرە دواکەوتوەکە بەستبوو کە تواناییدایە خاوەنکارە سپیپێستەکان قازانجێکی زۆر بکەن لە ڕێگەی پێدانی ڕۆژانەیەکی زۆر کەمەوە بە کرێکارە بێبەهرە ڕەشپێستەکان. لە باشووری ئەفریقا دا پرۆسەیەك لە ئارادا نەبوو کە بەهۆیەوە کرێکارانی بێبەهرە لە سێکتەرە تەقلیدییەکەدا بەرەبەرە ببنە خاوەن پەروەردە و بەهرەدار بین بەو شێوەیەی بۆچوونەکەی لویس چاوەڕێیدەکرد. لە ڕاستیدا کرێکارە ڕەشپێستەکان بە شێوەیەکی ئەنقەست بە بێبەهرەیی هێڵرانەوە و لەو کارانە دوورخرانەوە کە پێویستیان بە بەهرەی بەرز هەبوو بۆ ئەوەی کرێکارە بەهرەدارە سپیپێستەکان تووشی ڕکابەریی نەبن و ڕەشپێستەکان ڕۆژانەی بەرز وەرنەگرن. لە باشووری ئەفریقا دا لە ڕاستیدا ئەفریقییە ڕەشپێستەکان لەناو ئابوورییە تەقلیدییەکەی هۆملاندەکان دا گیریان خواردبوو. بەڵام ئەمە کێشەی پەرەپێدان نەبوو کە لە ئەنجامی گەشەکردن دا چاك ببێ. هۆمەلاندەکان ئەو شوێنانە بوون کە بوونە هۆی پەرەپێدانی ئابووری سپیپێستان.

ناشبێ جێگای سەرسوڕمان بێ کە ئەو جۆرە پەرەپێدانە ئابوورییەی باشووری ئەفریقای سپیپێست دەیهێنایەئاراوە لە کۆتایی دا سنووردار و پشتی بە دەزگایانی چەوسێنەر بەستبوو کە سپیپێستەکان دروستیان کردبوون بۆ چەوساندنەوەی ڕەشپێستەکان. سپیپێستانی باشووری ئەفریقا خاوەنی مافی موڵکداری بوون و وەبەرهێنانیان لە پەروەردەدا دەکرد و دەیانتوانی ئاڵتون و ئەڵماس دەربهێنن و لە بازاڕی جیهانی دا بە قازانج بیانفرۆشن. بەڵام زیاتر لە ٪۸۰ی دانیشتوانی باشووری ئەفریقا پشتگوێ خرابوون و لە زۆربەی هەرەزۆری چالاکیە ئابوورییە خوازراوەکان بێبەشکرابوون. ڕەشپێستەکان نەیاندەتوانی بەهرەی خۆیان بەکاربهێنن و نەیاندەتوانی ببنە کرێکاری شارەزا و بزنسمان و

ئەندازیار و کارزان یان زانا. دەزگا ئابوورییەکان چەوسێنەر بوون، سپیپێستان لە ڕێگەی چەوساندنەوەی ڕەشپێستان دەوڵەمەندبوون. لە ڕاستی دا سپیپێستانی باشووری ئەفریقا هەمان ئەو ئاستی گوزەرانەیان هەبوو کە دانیشتوانی وولاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا هەیانبوو، لە کاتێك دا ڕەشپێستانی باشووری ئەفریقا تۆزێك لەوانەی وولاتانی تری باشووری بیابانی ئەفریقا دەوڵەمەند تر بوون. ئەم گەشەکردنە ئابوورییە بەبێ تێکدانی بنیاتنەر کە تەنیا سپیپێستەکان سوودیان لێوەرگرت، بە درێژایی ئەو ماوەیەی داهاتی ئاڵتون و ئەڵماس زیادیدەکرد بەردەوامبوو. بەهەرحاڵ، بە هاتنی ١٩٧٠ کان، ئابووری لە گەشەکردن وەستابوو.

دیسانەوە جێگەی سەرسوڕمان نابیت کە ئەو کۆمەڵە دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرانە لەسەر ئەو بناخانە دروستکران کە لە لایەن کۆمەڵە دەزگایەکی سیاسی زۆر چەوسێنەرەوە دامەزران. بەر لە ڕووخانی لەساڵی ١٩٩٤ دا، سیستەمی سیاسی باشووری ئەفریقا هەموو دەسەڵاتێکی خستبوە چنگی سپیپێستەکانەوە و تەنیا ئەوان دەیانتوانی دەنگبدەن و خۆیان بۆ پلەو پایەکان بپاڵێون. سپیپێستان کۆنترۆڵی هێزی پۆلیس و سوپا و هەموو دەزگا سیاسییەکانیان کردبوو. ئەم دەزگایانە لە سایەی باڵادەستی سوپایی دانیشتوە سپیپێستەکان دامەزرابوون. لە کاتی دامەزراندنی یەکێتی باشووری ئەفریقا لە ساڵی ١٩١٠ دا، قەوارە سیاسییەکانی ئەفریکانەرەکانی ئۆرەنج فری و ترانسڤاڵ دەنگدانی ئاشکرای ڕەگەزپەرستانەیان هەبوو، بە تەواوی ڕەشپێستانیان لە بەشداری سیاسی بێبەش کردبوو. ناتاڵ و کەیپ کۆلۆنی دەیانهێشت ڕەشپێستان دەنگ بدەن ئەگەر بڕی پێویست موڵکیان هەبوایە کە نەیان بوو. باری ناتاڵ و کەیپ کۆلۆنی لە ساڵی ١٩١٠ دا وەك خۆیان مانەوە، بەڵام بە هاتنی ١٩٣٠ کان ڕەشپێستان بە ئاشکرا مافی دەنگدانیان لە باشووری ئەفریقا لێوەرگیرا.

ئابووری دوو فاقی باشووری ئەفریقا لە ساڵی ١٩٩٤ دا کۆتاییهات، بەڵام لەبەر ئەو هۆکارانە نا کە سێر ئارسەر لویس دەربارەیان تیۆرییەکی دانابوو. ئەوە ڕێڕەوی سروشتیی پەرەپێدانی ئابووری نەبوو کە کۆتایی بە جیاکاریی ڕەنگ و هۆملاندەکان هێنا. ڕەشپێستانی باشووری ئەفریقا کەوتنە نارەزایی دەربڕین و دژی ئەو ڕژێمە ڕاپەڕین کە دانی بە مافە سەرەتاییەکانیان دا نەنا و

دەســـکەوتەکانی گەشـــەکردنی ئـــابووری لەگـــەڵیان دا بەشـــنەکرد. دوای ڕاپەڕینەکەی ســوێتۆ لــە ســاڵی ١٩٧٦ دا، ناڕەزاییــەکان ڕێکخــراو تــرو بــەهێزتر بوون تا لە کۆتایی دا دەوڵەتە ڕەگەزپەرستەکەیان ڕووخاند. ئەوە هێزدارکردنی ڕەشپێستان بــوو کــە وایلێکــردن خۆیــان ڕێکبخــەن و ڕاپــەڕن تــا لــە ئەنجامــدا کۆتاییان بە ئابووری دوو فاقی باشووری ئەفریقا هێنا بەهــەمان ئــەو شــێوەیەی کە هێزی سیاسی سپیپێستانی باشووری ئەفریقا لە سەرەتادا دروستیکردبوو.

## پەرەپێدان پێچەوانەکرایەوە

نایەکسانی لە جیهان دا ئەمڕۆ بــوونی هەیــە چــونکە لــە مــاوەی ســەدەکانی نۆزدەیەم و بیستەم دا هەندێك نەتەوان توانیان سوود لە شۆڕشی پیشەسازی و ئەو تەکنەلۆجی و شێوازی ڕێکخستنانە وەربگرن کە ئەم شۆڕشە هێنانیەئاراوە، لە کاتێك دا نەتەوانی تر نەیانتوانی ئەمە بکــەن. گۆڕانکــاری تەکنــەلۆجی تــەنیا یەکێکە لە بزوێنەرەکانی خۆشگوزەرانی، بــەڵام ڕەنگــە گرنگترینیــان بــێ. ئــەو وڵاتانـــەی ســـوودیان لـــە تەکنەلۆجییـــە نوێکـــان وەرنـــەگرت، ســـوودیان لـــە بزوێنـــەرەکانی تـــری خۆشـــگوزەرانیش وەرنـــەگرت. هـــەروەك لـــەم چـــاپتەرە و چاپتەری پێشووتردا پیشانمان دا، ئــەم سوودوەرنەگرتنە لەبــەر بــوونی دەزگــا چەوسێنەرەکانیان بوو، ئەمەش یان لە ئاکامی بــەردەوامیی ڕژێمــە ڕەهاکانیــان بــوو یــان لەبــەر ئــەوەی دەوڵــەتانی خــاوەن مەرکەزیــەتیان نــەبوو. بــەڵام لــە هەمانکات دا ئەم چاپتەرە ئەوەشی پیشانداوە کە لە چەندین حاڵــەت دا دەزگــا چەوسێنەرەکان کە بناخەی هەژاریی ئەم نەتەوانەیان داڕشت، ســەپێنران، یــان بەلایەنیکەمــەوە بــەهۆی هــەمان ئــەو پرۆســەیەی تینــی بەخــشیە گەشــەپێدانی ئەوروپا، بەهێزتر کران کە ئەویش فراوانبوونی دەسەڵاتی بازرگانی و کۆلۆنیــاڵی ئــەوروپی بــوو. لــە ڕاســتی دا ئاســتی قــازانجکردنی ئیمپراتۆریەتــە کۆلۆنیالییــە ئەوروپییەکان زۆر جار لەسەر بنەمای تێکدانی قەوارە سەربەخۆکان و ئابوورییە خۆماڵییەکان لە جیهان دا دامەزرابوو، یان هــەر لــە ڕیشەوە پــشتیبەستبوو بــە دروستکردنی دەزگایانی چەوسێنەر، هەروەك لە دوورگەکانی کــاریبی دا ڕوویــدا کە دوای لەناوچوونی تەواوی دانیــشتوە خۆماڵییــەکان، ئەوروپییــەکان کــۆیلانی

ئەفریقییان هاوردەکرد و سیستەمی چاندگەیان دامەزراند.

ئێمە هەرگیز نازانین ئاراستەی دەوڵەتانی - شاری سەربەخۆی وەك ئەوانەی دوورگەکانی باندا و ئاچێ یان بۆرما (میانمار) چۆن دەبوو بەبێ دەستێوەردانە ئەوروپییەکان. ڕەنگە شۆڕشی شکۆداری خۆماڵی تایبەتی خۆیان بەرپابکردایە یان بەهێواشی بەرەو دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوەتر بڕۆشتنایە بە پشتبەستن بە بازرگانی گەشەسەندووی بەهارات و شتوومەکە بەنرخەکانی تر. بەڵام ئەم دەرفەتە بەهۆی فراوانبوونی دەسەڵاتی کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانی هۆڵەندییەوە لە بەینبرا. کۆمپانیاکە هەموو هیوایەکی پەرەپێدانی خۆماڵی لە دوورگەکانی باندا دا نەهێشت لە ڕێگەی ئەنجامدانی قەلاچۆکردنەکەیەوە. هەڕەشەکانی کۆمپانیاکە بوونەهۆی ئەوەی دەوڵەتانی شار لە چەندین ناوچەی تری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا وازبهێنن لە بازرگانی.

چیرۆکی یەکێك لە کۆنترین شارستانی لەئاسیادا کە هیندستانە هاوشێوەیە، هەرچەندە پێچەوانەکردنەوەی پەرەپێدان نەك لە لایەن هۆڵەندییەکانەوە بەڵکو لە لایەن بەریتانییەکانەوە ئەنجامدرا. هیندستان لە سەدەی هەژدەیەم دا گەورەترین بەرهەمهێنەر و هەناردەکاری قوماش بوو لە جیهان دا. خام و مۆزلینی هیندی بازاڕەکانی ئەوروپای داپۆشی و لە هەموو ئاسیا و تەنانەت ئەفەریقای ڕۆژهەڵات دا دەفرۆشرا. بریکاری سەرەکی کە ئەم قوماشانەی دەهێنا بۆ دوورگەکانی بەریتانیا بریتیبوو لە کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانی ئینگلیزی. ئەم کۆمپانیایە لە ساڵی ١٦٠٠، دوو ساڵ بەر لە دامەزراندنی هاوشێوە هۆڵەندییەکەی دامەزرا. کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستانی ئینگلیزی بە درێژایی سەدەی حەڤدەیەم خەریکی سەپاندنی مۆنۆپۆلی خۆی بوو بەسەر ئەم هەناردە بەنرخەوە لە هیندستانەوە. دەبوایە کۆمپانیاکە ڕکابەریی لەگەڵ پورتوگالییەکان و فەڕەنسییەکان دا بکردایە. پورتوگالییەکان بنکەیان لە گۆوا و چیتاگۆنگ و بۆمبای و فەڕەنسییەکانیش بنکەیان لە پۆندیچری و چاندێرناگۆر و یانام وکارەیکاڵ دا هەبوو. لەمەش خراپتر بۆ کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستان بریتیبوو لە شۆڕشی شکۆدار هەروەك لە چاپتەری حەوتەم دا بینیمان. مۆنۆپۆلی کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستان لە لایەن پاشا ستوارتەکانەوە بەخشرا بوو، هەر زوو لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە ئەم مۆنۆپۆلییە ڕووبەڕووی تەحەدا بۆوە و تەنانەت بۆ ماوەی زیاتر لە دە ساڵیش هەڵوەشێنرایەوە. لەدەسدانی دەسەڵات گرنگ بوو هەروەك پێشتر بینیمان،

چونکە بەرهەمهێنەرانی قوماشی ئینگلیزی توانیان پەرلەمان ڕازیبکەن بۆ قەدەخەکردنی هاوردەکردنی خام کە پڕقازانجترین برگەی بازرگانییەکەیان بوو. لە سەدەی هەژدەیەم دا، بە سەرکردایەتی ڕۆبەرت کلایف، کۆمپانیاکە ستراتیژیی خۆی گۆڕی و دەستیکرد بە پەرەپێدانی ئیمپراتۆریەتێکی سەرتاسەری. لەو سەردەمەدا، هیندستان بەسەر چەندین قەوارەی ڕکابەری یەکتردا دابەشببوو، هەرچەندە چەندین لەو قەوارانە هێشتا بەناو لە ژێر کۆنترۆڵی ئیمپراتۆری موگهال دا بوون لە دەلهی. کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستان یەکەمجار پەلی کێشا بۆ بەنگال لە ڕۆژهەڵات دا و لە جەنگەکانی پلاسی لە ساڵی ١٧٥٧ دا و بوخار لە ساڵی ١٧٦٤ دا دەسەڵاتە ناوخۆییەکانی لە ناوبرد. کۆمپانیاکە سامانی ئەو ناوچانەی تاڵانکرد و دەزگا چەوسێنەرەکانی کۆکردنەوەی باجی فەرمانڕەوایانی موگهالی لە هیندستان خستە ژێر ڕکێفی خۆی و تەنانەت بەهێزتریشی کردن. ئەم فرانبوونەی دەسەڵاتی کۆمپانیاکە هاوکات بوو لەگەڵ پوکانەوەی پیشەسازی قوماشی هیندی، کاتێك بازاڕ بۆ ئەم کاڵایانە لە ئینگلتەرە دا نەما. پوکانەوەکە شانبەشانی کەمبوونەوەی شارنشینی و زیادبوونی هەژاریی دەستیپێکرد و ماوەیەکی درێژی پەرەپێدانی پێچەوانەی لە هیندستان دا دەسپێکرد. ماوەیەکی کەم دوای ئەوە، لە بری بەرهەمهێنانی قوماش، هیندییەکان ئەم قوماشانەیان لە بەریتانیا دەکڕی و دەستیانکرد بە چاندنی ئۆپیۆم بۆ کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی هیندستان تا بیانفرۆشن بە چین.

بازرگانی کۆیلان لە زەریای ئەتلەسی دا هەمان پاتێرنی لە ئەفریقادا دووبارە کردەوە، ئەگەر چی ئەفریقا لە بارودۆخێکی کەمتر پەرەسەندوودا بوو لەچاو باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و هیندستان دا. چەندین دەوڵەتانی ئەفریقا بوونە ئامێری جەنگ بۆ گرتن و فرۆشتنی کۆیلان بە ئەورووپییەکان. ناکۆکی نێوان دەوڵەتان و قەوارە سیاسییە جیاوازەکان پەرەیانسەند بۆ جەنگی بەردەوام و دەزگایانی دەوڵەت کە لە زۆربەی حاڵەتەکان دا هێشتا مەرکەزیەتی سیاسی تەوایان بەدەستنەهێنابوو، لە زۆربەی ناوچەکانی ئەفریقادا هەرەسیانهێنا و ڕێگایان خۆشکرد بۆ دەزگایانی چەوسێنەری بەردەوام و دەوڵەتانی شکستخواردووی ئەمڕۆ کە دواتر باسیاندەکەین. لە چەند ناوچەیەکی کەمی ئەفریقا دا کە دووربوون لە بازرگانی کۆیلان، وەك باشووری ئەفریقا، ئەورووپییەکان کۆمەڵە دەزگایەگی جیاوازیان بەسەردا سەپاندن، ئەمجارەیان

ئـەو دەزگایانـە وا دیـزاین کرابـوون تـا دەریاچـەیەکی هێـزی کـاری هــەرزان دروستبکەن بۆ کان و کێڵگەکانیان. دەوڵـەتی باشـووری ئـەفریقا ئابوورییـەکی دوو فاقی دروستکرد و ڕێگەی نەدا بە ٪۸۰ی دانیشتوان بەشدارییکەن لە کـاری بەهرەخواز و کشتوکاڵی بازرگانی و کارزانی دا. هـەموو ئەمانـە تـەنیا شـرۆڤەی ئـەوە ناکـەن کـە بۆچـی بەپیـشەسازیبوون بەسـەر ناوچـەیەکی فراوانـی دنیـادا تێپـەڕی، بـەڵکو پوختـەی ئـەوەش دەخەنـە ڕوو کـە چـۆن لەوانەیـە هەنـدێجار پەرەپێدانی ئابووری لەسـەر کەمپەرەسـەندنی ئـابووری یـان تەنانـەت لـە سـەر دروستکردنی کەمپەرەسەندن لە هەندێك بەشی تری ئابووری ناوخۆ یان جیهانی دا بژی.

## ١٠

# بڵاوبوونەوەی خۆشگوزەرانی

## سەربەرزی لە ناو دزان دا

ئینگلتەرەی سەدەی هەژدەیەم ـ یان گونجاو تر، بەریتانیای مەزن لە دوای یەککگرتنی ئینگلتەرە و سکۆتلەندە و ویڵس لە ساڵی ١٧٠٧ دا ـ تەنیا چارەسەرێکی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ تاوانباران دا هەبوو: لەبەرچاو نەمێنن، لە بیریش دەچنەوە یان بەلایەنیکەمەوە لەبەرچاو نەمێنن، کێشەشیان نامێنێ. ئینگلیزەکان چەندین کەسیان بۆ کۆلۆنییەکانی سزادان گواستەوە. بەر لە جەنگی سەربەخۆیی، تاوانبارانی سزادرا و سزادراوان بە زۆری دەنێران بۆ کۆلۆنییەکانی ئەمەریکا. لە دوای ساڵی ١٨٧٣ ەوە، ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکای سەربەخۆ چیتر ئامادە نەبوو پێشوازی لە سزادراوانی بەریتانی بکا و دەبوایە کاربەدەستانی بەریتانی شوێنێکی تریان بۆ بدۆزنەوە. لە سەرەتادا بیریان لە ڕۆژئاوای ئەفریقا کردەوە، بەڵام کەشی ئەوێ لەگەڵ نەخۆشیە بڵاوەکانی وەك مەلاریا و زەردەتا کە ئەوروپییەکان بەرگرییان لە دژیان نەبوو، هێندە کوشندە بوون کە کاربەدەستان بڕیاریان دا تەنانەت ناردنی سزادراوانیش بۆ "گۆڕستانی سپیپێستان" شیاوی پەسەند کردن نەبوو. ڕێگای دوەمیان بریتیبوو لە ئوستراليا. بەشی ڕۆژهەڵاتی کەنارەکانی ئوستراليا لە ٢٩ نیسانی ساڵی ١٧٧٠ دا لایەن دەریاوانی مەزن کاپتن جەیمس کوك دۆزرابۆوە. کوك لە شوێنێکی قەشەنگ دا دابەزی و ناوینا بۆتانی بەی وەك پێزانین بۆ ئەو هەموو جۆرە ڕوەکە جیاوازانەی لە لایەن ئەو سروشتناسانەوە کە لەگەڵی دا بوون، دۆزرانەوە. ئەم شوێنە بەلای کاربەدەستانی حکومەتی بەریتانییەوە شوێنێکی نموونەیی بوو. کەش مامناوەندی و شوێنەکەش هەتا بڵێی لەبەر چاو و مێشك دووربوو.

گەلەکەشتییەکی پێکهاتوو لە یازدە کەشتی پڕ لە سزادراوان لە ساڵی

١٧٨٨ دا بە فەرماندەیی کاپتن ئارسەر فیلیپ بەرەو بۆتانی بەی کەوتنەڕێ. لە ٢٦ کانونی دوەم دا، کە ئەمڕۆ وەك ڕۆژی سەربەخۆیی ئوستراليا يادی دەکرێتەوە، لە سیدنی کۆڤ بنکەیان دامەزراند کە ناوجەرگەی شاری سیدنی ئەمڕۆیە. ئەو کۆلۆنییەیان ناونا نیو ساوس وێلس. لە ناو یەکێك لە کەشتییەکان دا کە ئەلێگزاندەر بوو، کاپتنەکەی دەنکن سینکلێر بوو، ژن و مێردێکی سزادراو هەبوون کە هێنری و سوزانا کەیبڵ بوون. سوزانا لەبەر دزیکردن سزا درابوو، لەسەرەتادا سزای مەرگی بەسەردا درابوو، بەڵام دواتر ئەم حوکمە گۆڕا بۆ چل ساڵ بەندکردن و گواستنەوەی بۆ کۆلۆنییەکانی ئەمەریکا. ئەم پلانە بە سەربەخۆبوونی ویلایەتە یەکگرتوەکان شکستیهێنا. لەو کاتەدا کە سوزانا لە بەندیخانەی قەڵای نۆریچ دا بوو، کەوتە داوی خۆشەویستی هێنری کە سزادراوێکی تری ناو بەندیخانەکە بوو. لە ساڵی ١٧٨٧ دا سوزانا یەکێك بوو لەوانەی بڕیاری گواستنەوەی درا بۆ کۆلۆنی نوێی سزادراوان لە ئوستراليا لەگەڵ یەکەم گەلەکەشتی کە بۆ ئەوێ دەچوو، بەڵام بڕیاری گواستنەوەی هێنری دەرنەچوو. هێنری و سوزانا کوڕێکی گەنجیان هەبوو کە ئەویش ناوی هێنری بوو. ئەم بڕیارە مانای ئەوە بوو کە ئەم خێزانە دەبوایە لە یەکتر جیابوونایەتەوە. سوزانا گوێزرایەوە بۆ بەندیخانەیەکی بەلەم کە لەسەر کەناری ڕووباری تێمس لەنگەری گرتبوو، بەڵام زانیاری دەربارەی ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە بڵاوبۆوە و بەرگوێی مرۆڤناس (Anthropologist)، لەیدی کادۆگان کەوت. لەیدی کادۆگان هەڵمەتێکی سەرکەوتووی بۆ یەکخستنەوەی خێزانی کەیبڵ دەسپێکرد. بڕیاردرا کە هەردووکیان لەگەڵ هێنری گەنج دا بگوێزرێنەوە بۆ ئوستراليا. لەیدی کادۆگان بیست پاوەندیشی کۆکردەوە بۆ کڕینی کەلوپەلی پێوست بۆ خێزانەکە و دەبوایە بە گەیشتنیان بۆ ئوستراليا پارەکەیان وەربگرتایە. ئەوان لە ناو کەشتی ئەلێگزاندەردا کەوتنەڕێ، بەڵام کاتێك گەیشتنە بۆتانی بەی، کیسەی کەلوپەلەکانیان دیارنەمابوو، یان هەر هیچ نەبێ کاپتن سینکلێر ئەو لافەی لێدەدا.

ئایا دەبوایە خێزانی کەیبڵ چیان بکردایە؟ بە پێی یاسای ئینگلیزی یان بەریتانی ئەوان نەیاندەتوانی شتێکی ئەوتۆ بکەن. هەرچەندە لە ساڵی ١٧٨٧ دا بەریتانیا خاوەنی دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوە بوو، بەڵام ئەم کراوەییە سزادراوانی نەدەگرتەوە کە لە ڕووی پراکتیکیەوە هیچ مافێکیان

نەبوو. نەیاندەتوانی ببنە خاوەن موڵك و بە دڵنیاییەوە نەیاندەتوانی لە دادگادا سکاڵا لەسەر کەس تۆماربکەن. لە راستیدا تەنانەت نەیاندەتوانی لە دادگادا هیچ بەڵگەیەکیش بخەنەڕوو. سینکلێر ئەمەی دەزانی و ڕەنگە هەر خۆی کیسەکەی دزیبوبێ. هەرچەندە ئەو هەرگیز دانیپێدانەنا، بەڵام ئەو لایوابوو کە خێزانی کەیبڵ ناتوانن لە دادگادا سکاڵای لەسەر تۆماربکەن. ئەو بە پێی یاسای بەریتانی ڕاستیدەکرد و لە بەریتانیادا هەموو مەسەلەکە هەر لەوێدا کۆتاییدەهات. بەڵام لە ئوسترالیا دا نا. سکاڵانامەیەك درایە دەیڤید کۆڵینس، کە دادوەری ئەوێ بوو، سکاڵانامەکە بەم شێوەیە نووسرابوو:

*(لە کاتێك دا هێنری کەیبڵ و ژنەکەی، کە دانیشتوانی نوێی ئەم شوێنەن، پێش ئەوەی ئینگلتەرە بەجێبهێڵن کیسەیەکی تایبەتیان لەناو کەشتی گواستنەوەی ئەلێگزاندەری کاپتن دەنکن سنکلێر لەگەڵ خۆیان دا هێنابوو. کیسەکە بریتیبوو لە جلوبەرگ و چەند پارچە کەلوپەلێکی ترکە بۆ بارودۆخی ئێستایان بە کەڵك بوو کە لە لایەن چەندین کەسانی خێرخوازەوە کۆکرابوونەوە و کڕابوون بۆ بەکارهێنانیان لە لایەن هێنری کەیبڵی ناوبراو و ژنەکەی و منداڵەکەی. چەندین داواکاری پێشکەشکراوە بە مەبەستی وەرگرتنەوەی ئەو کیسەیە لە خاوەنی ئەلێکساندەر کە ئێستا لەم مینایەدا لەنگەریگرتوە و هیچ ئەنجامێکی نەبوە. جگە لە وەرگرتنەوەی بەشێکی بچووکی ئەو کیسەیە کە بریتییە لە چەند کتێبێك، باقیەکەی تری کە بەهای زۆر زیاتریان هەیە تا ئێستاش لە ناو کەشتی ناوبراوی ئەلێگزاندەردان، پێدەچی خودانی کەشتییەکە زۆر کەمتەرخەم بێ لە گێڕانەوەی ئەو کەلوپەلانەدا بۆ ئەو خاوەنانەی پێشتر ئاماژەیانپێدرا).*

لەبەر ئەوەی هێنری و سوزانا هەردووکیان نەخوێندەوار بوون نەیانتوانی سکاڵانامەکە ئیمزا بکەن و تەنیا نیشانەی زەربیان لە خوارەوە دانا. ووشەکانی "دانیشتوانی نوێی ئەم شوێنە" دواتر سڕانەوە، بەڵام سکاڵانامەکە زۆر پڕبایەخبوو. کەسێك لای وابوە ئەگەر هێنری و ژنەکەی لە سکاڵانامەکەدا وەك سزادراو وەسفبکرێن ئەوا ئومێدی بەردەوامبوونی سکاڵانامەکە نەبوە. بۆیە پیشنیازکراوە لەبری سزادراو پێیان بووترێ دانیشتوانی نوێ. ڕەنگە ئەمە بۆ دادوەر کۆڵینس زۆر بووبێ و زۆر ڕێی تێدەچێ کە ئەو ئەوکەسە بوبێ ئەو ووشانەی سڕیبێتەوە. کەیزەکە کاری خۆی کرد و کۆڵینس داواکەی

ڕەتنەکردەوە و دادگاییکردنەکەی دەسپێکرد بە ئامادەبوونی دەستەی سوێندخۆران کە هەر هەموویان سەرباز بوون. سینکلێر داوایلێکرا تا لە دادگا ئامادەبێ. هەرچەندە کۆلینس زۆر سەرگەرم نەبوو بۆ داواکە و دەستەی سوێندخۆران لەو سەربازانە پێکهاتبوون کە نێرابوون بۆ ئوسترالیا تا پاسەوانی سزادراوانی وەك خێزانی کەیبڵ بکەن، بەڵام خێزانی کەیبڵ بردیانەوە. سینکلێر ناڕەزایی دەربڕی لەسەر ئەو بنەمایەی کە خێزانی کەیبڵ سزادراو بوون، بەڵام بڕیاری دادگا جێبەجێکراو دەبوایە سینیکلێر پازدە پاوەند بدا.

بۆ گەیشتن بەم بڕیارە دادوەر کۆلین یاسای بەریتانیای بەکارنەهێنا و پشتگوێیخست. ئەمە یەکەم کەیزی مەدەنی بوو لە ئوسترالیا دادگاییبکرێ. یەکەم کەیزی سزایی بە هەمانشێوە لەچاو ئەوانەی ناو بەریتانیا سەیروسەمەرە دەردەکەوت. سزادراوێك تاوانی دزینی نانی سزادراوێکی تری بەسەردا سەپا کە نرخەکەی دوو پێنی بوو. لەو سەردەمەدا کەیزی لەم جۆرە نەدەهاتە دادگا چونکە سزادراوان مافیان نەبوو خاوەنی هیچ شتێك بن. ئوسترالیا بەریتانیا نەبوو، یاساکانیشی کوتومت یاسای بەریتانی نەبوون و زۆری پێنەچوو ئوسترالیا لە ڕووی یاسای مەدەنی و یاسای جەزائی و کۆمەڵێك دەزگای ئابووری و سیاسییەوە خۆی لە بەریتانیا جیاکردەوە.

کۆلۆنی سزادانی نیوو ساوس وێڵس لە سەرەتا دا لە سزادراوان و پاسەوانەکانیان کە زۆربەیان سەرباز بوون پێکهاتبوو. تا ساڵی ١٨٢٠ ەکانیش ژمارەیەکی کەم لە نیشتەجێبوانی ئازاد لە ئوسترالیا دا هەبون و گواستنەوەی سزادراوان هەرچەندە لە نیوو ساوس ویلس لە ساڵی ١٨٤٠ دا وەستا، تا ساڵی ١٨٦٨ لە ڕۆژئاوای ئوسترالیا بەردەوامبوو. دەبوایە سزادراوان "کاری ئیلزامی" ئەنجامبدەن، کە لە بنەڕەت دا ناوێکی تر بوو بۆ کاری بێگاری و پاساوانەکان لەم ڕێگەیەوە پارەیان پەیدادەکرد. لەسەرەتا دا سزادراوان پارەیان نەدەدرایە. تەنیا خۆراکیان وەردەگرت بەرامبەر ئەو کارانەی ئەنجامیان دەدان و ئەوانەشی بەرهەمیان دەهێنان لای پاسەوانەکان گلدەدرانەوە. بەڵام ئەم سیستەمە بەهەمانشێوەی ئەوانەی لە لایەن کۆمپانیای ڤێرجینیا کاریان پێکرا لە جەیمستاون بە باشی کارینەکرد چونکە سزادراوان هاندانیان نەبوو بە جدی کار بکەن یان کاری باش ئەنجامبدەن. ئەوان یان بەر قامچی دەدران یان دووردەخرانەوە بۆ دوورگەی نۆرفۆلك کە ڕووبەرەکەی تەنیا سیازدە میل و لە

دووری زیاترله هەزار میل لە ڕۆژهەڵاتی ئوستوالیاوە لەناو زەریای هێمن دا بـوو. لەبەر ئەوەی نە قامچی لێدان و نە دوورخستنەوە سوودیان نەبوو، ئەڵتێرنەتیڤ بریتیبـوو لـە پێدانی هانـدان. ئەمـەش بـۆ سـەرباز و پاسـەوانەکان ئایدیایـەکی سروشتی نەبوو. سزادراوان سزادراوان بوون و نەدەبوایە هێزی کاری خۆیان یان بەرهەمەکانیان بفرۆشتایە، بەڵام لە ئوستورالیا کەسی تر نەبوو کاربکا. بێگومـان خەڵکـە ڕەسـەنەکە هـەبوو کـە لـە کـاتی دامەزرانـدنی نیـوو سـاوس وێڵـس دا ژمارەیان نزیکەی یەك ملیۆن کـەس دەبـوو، بـەڵام ئـەوان لـە نـاو کیـشوەرێکی گـەورەدا بڵاوبووبوونـەوە و چـڕییان لـە نیـوو سـاوس وێڵـس بـەس نـەبوو بـۆ دامەزراندنی ئابوورییەك کە لەسەر چەوساندنەوەی ئـەوان دامـەزرابێ. ئۆپـشنی ئەمەریکای لاتین لە ئوستورالیادا نەبوو. بۆیە پاساوانەکان ڕێچکەیەکیان گرتەبەر کە لە کۆتایی دا بوە هۆی دامەزراندنی دەزگایانی ئەوتۆ کـە لەوانـەی بـەریتانیا کراوەتر بوون. سزادراوان کۆمەڵێك ئەرکیان پێسپێرا کە ئەنجامیبـدەن و ئەگـەر کاتی زیادیشیان هەبوایە دەیانتوانی کار بۆخۆیان بکەن و ئەوەشـی بەرهـەمیان دەهێنا دەیانتوانی بیفرۆشن.

پاسەوانەکانیش سوودیان لە ئازادی ئـابووری سـزادراوان وەرگـرت. بەرهـەم زیـادیکرد و پاسـەوانەکان مۆنۆپۆلییـان دامەزرانـد تـا کەلوپـەل بـە سـزادراوان بفرۆشن. لە هەمووشیان بەکەڵکتر بریتیبوو لە ڕام. لەم سەردەمەدا نیوو ساوس وێڵس وەك کۆلۆنییەکانی تری بەریتانیا لە لایەن پارێزگارێکەوە بەڕێوەدەبرا کە لە لایەن حکومەتی بەریتانیاوە دیاریـدەکرا. لـە سـاڵی ١٨٠٦ بـەریتانیا، ویلیـام بلای دیاریکرد کە حەڤدە ساڵ لەوەبەر لە ساڵی ١٧٨٩ کـاپتنی ئـێچ ئـێم ئـێس باونتی بوە لە کاتی سەرهەڵدانی"یاخیبوون لەناو بـاونتی" بـەناوبانگ دا. بـلای کەسێکی خاوەن دیسپلینی توندبوو، ئەمەش ئاکارێـك بـوو کـە ڕەنگـە بـەزۆری هۆکاری سەرهەڵدانی یاخیبونەکە بووبێ. شێوەی مامەڵەکردنی نەگۆڕابوو، هـەر زوو ڕووبەڕووی مۆنۆپۆلیکردنی ڕام وەسـتایەوە. ئەمـە بـوە هـۆی سـەرهەڵدانی یاخیبونێکی تر، ئەمجارە لە لایەن ئەوانەی خاوەن مۆنۆپۆلییەکە بـوون و کۆنـە سەربازێك بە ناوی جۆن مەکارسەر سەرکردایەتیکردن. ئەو ڕووداوانەی کە دواتر بە یاخیبوونی ڕام ناسرا جارێکیتر بوونە هۆی ئەوەی یاخیبوەکان بەسـەر بـلای دا زاڵ بن، ئەمجارەیان لە ناو باونتی نا بەڵکو لـە سـەر زەوی. ماکارسـەر بـلای بەند کرد. دواتر حکومەتی بەریتانیا سەربازی زیاتری ڕەوانەکرد تـا ڕووبـەڕووی

یاخیبوونەکە ببنەوە. ماکارسەر گیرا و ڕەوانەی بەریتانیا کرایەوە، بەڵام ماوەیەکی کەم دوای ئەوە ئازاد کراو گەڕایەوە بۆ ئوسترالیا تا ڕۆڵێکی سەرەکی لە سیاسەت و ئابووری کۆلۆنییەکە دا بگێڕێ.

ڕیشەی یاخیبوونی ڕام ئابووری بوو. ستراتیژی پێدانی هاندان بە سزادراوان پارەیەکی زۆری بۆ پیاوانی وەك مەکارسەر پەیدادەکرد کە لەگەڵ گروپی دووەمی کەشتیان لە ساڵی ١٧٩٠ دا وەك سەرباز گەیشتبونە ئوسترالیا. لە ساڵی ١٧٩٦ دا وازی لە سوپا هێنا بۆ ئەوەی خەریکی بزنس بێ. لەو کاتەدا ئەو بووبوە خاوەنی یەکەم مەڕی خۆی و دەرکی بەوە کردبوو کە دەکرا پارەیەکی زۆر لە بەخێوکردنی مەڕ و هەناردەکردنی خوری پەیدابکرێ. لە سیدنی بەرەو ناوەوە چیایانی شین هەبوون کە دواجار لە ساڵی ١٨١٣ دا توانرا ببڕێن و لە بەرەکەی تری چیاکان دا ناوچەیەکی گەورەی کراوەی خاکی پڕ گیا دۆزرایەوە. ئەو شوێنە بەهەشتی مەڕان بوو. هەر زوو مەکارسەر بوە دەوڵەمەندترین پیاو لە ئوسترالیادا. ئەو و هاوڕێ مەڕدارە گەورەکانی وەك سکواتەر ناسران چونکە ئەو زەوییەی ئەوان مەڕەکانیان لەسەر دەلەوەڕاند هی خۆیان نەبوو. زەوییەکە هی حکومەتی بەریتانی بوو، بەڵام لەسەرەتا دا ئەمە کێشەیەکی بچووك بوو. سکواتەرەکان نوخبەی ئوسترالیا بوون، یان گونجاوتر، سکواتۆکراسی بوون.

تەنانەت بە بوونی سکواتۆکراسیش، نیوو ساوس وێڵس هیچ شتێکی لە ڕژێمە ڕەهاکانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا یان کۆلۆنییەکانی باشووری ئەمریکا نەدەچوو. لەوێ بەشێوەی ئیمپراتۆریەتی نەمسا ـ هەنگاریا و ڕوسیا بەندان نەبوون و ژمارەیەکی زۆری خەڵکی خۆماڵی نەبوون تا بچەوسێنرێنەوە بەشێوەی مەکسیك و پیرۆ. لە بری ئەمە نیوو ساوس وێڵس لە زۆر ڕووەوە وەك جەیمستاون و ڤێرجینیا وابوو: نوخبەکە بۆیان دەرکەوت لە بەرژەوەندی خۆیان دا بوو کە دەزگایانی ئابووری ئەوتۆ دابمەزرێنن زۆر زیاتر کراوە بن لەوانەی نەمسا ـ هەنگاریا و ڕوسیا و مەکسیك و پیرۆ. سزادراوان تەنیا هێزی کار بوون و تەنیا ڕێگا بۆ هاندانیان بریتیبوو لە پێدانی پارەی ڕۆژانە بۆ ئەو کارانەی دەیانکرد.

هەر زوو سزادراوان بواریان درایە تا ببنە کارزان و سزادراوانی تر بەکرێبگرن. لەمەش سەرنجڕاکێشتر ئەوە بوو کە ئەوان دوای تەواوکردنی ماوەی حوکمەکەیان زەویشیان درایە و هەموو مافەکانیان بۆ گەڕایەوە. هەندێك

لەو سزادراوانە دەستیان بە خۆدەوڵەمەندکردن کرد، تەنانەت کەسێکی نەخوێندەواری وەك هێنری کەیبڵیش. بە هاتنی ساڵی ١٧٩٨ ئەو بوە خاوەنی ئوتێلێك کە پێیدەوترا زە ڕامپینگ هۆرس و دوکانێکیشی هەبوو. ئەو کەشتییەکی کڕی و دەستیکرد بە بازرگانی پێستی شێری دەریا (Sealskins). لە ساڵی ١٨٠٩ دا بەلایەنیکەمەوە نۆ کێڵگەی ٤٧٠ ئەیکەری و ژمارەیەك دوکان و خانووی لە سیدنی هەبووە.

ململانێی داهاتوو لە نیوو ساوس وێڵس لە نێوان نوخبە و باقی کۆمەڵگادا ڕوویدا کە لە سزادراوان و سزادراوانی پێشتر و خێزانەکانیان پێکهاتبوون. نوخبەکە کە لە لایەن پاسەوانان و سەربازانی پێشتری وەك مەکارسەر سەرکردایەتیان کرا و هەندێك نیشتەجێبوانی ئازادی تێدا بوو کە ترۆقی ئابووری خوری ڕایکێشابوون بۆ کۆلۆنییەکە. زۆربەی موڵکەکان لە چنگی نوخبەدا بوون و سزادراوانی پێشتر و نەوەکانیان ویستیان کۆتایی بە گواستنەوەی سزادراوان بهێنن و لە لایەن دەستەی سوێندخۆرانی هاوشێوەی خۆیان دادگایی بکرێن و بەخۆڕایی زەوییان دەستبکەوێ. نوخبەکە هیچ یەکێك لەمانەی نەدەویست. خەمی سەرەکیان بریتیبوو لە چەسپاندنی مافی تاپۆکردنی ئەو زەوییانەی بە شێوەیەکی کاتی داگیریان کردبوون. بارودۆخەکە دیسانەوەی هاوشێوەی ئەو بارودۆخە بوو کە زیاتر لە دوو سەدە لەوەبەر لە سەرووی ئەمەریکا سەریهەڵدابوو. هەروەك لە چاپتەری یەکەم دا بینیمان، سەرکەوتنەکانی خزمەتکارانی خاوەن گرێبەست دژی کۆمپانیای ڤێرجینیا، خەباتەکانی مەریلاند و کارۆلینای بە دوادا هات. لە نیوو ساوس وێڵس، ڕۆڵی لۆرد بالتیمۆر و سێر ئەنتۆنی ئاشلی کوپەر لە لایەن ماکارسەر و سکواتەرەکانەوە پیادەکران. جارێکیتر حکومەتی بەریتانیا لایەنگری نوخبەکان بوو، هەرچەندە دەشترسان کە ڕەنگەڕۆژێك ماکارسەر و سکواتەرەکان سەربەخۆیی رابگەیەنن.

حکومەتی بەریتانی لە ساڵی ١٨١٩ دا، جۆن بیگی نارد بۆ کۆلۆنییەکە بۆ ئەوەی سەرۆکایەتی کۆمسیۆنێکی لێکۆڵینەوە بکا دەربارەی ڕووداوەکانی ئەوێ. بیگ دەربارەی ئەو مافانەی سزادراوان هەیان بوو تووشی شۆك بوو، سەریسوڕما لە سروشتی کراوەی دەزگا ئابوورییەکانی ئەم کۆلۆنییە کە کۆلۆنییەکی سزادان بوو. ئەو ڕاسپاردەی گۆڕانکاری کرد: سزادراوان چیتر نەدەبوایە ببنە خاوەن زەوی، دەبوایە هیچ کەسێك کرێی ڕۆژانەی سزادراوانی

نەدایە، لێبوردن سنووردار بکرایە و سزادراوانی پێشتر نەدەبوایە زەوییان بدرێتێ و سزادانیش زۆر توندتر بکرایە. بیگ لای وابوو کە سکواتەرەکان ئەریستۆکراسی سروشتی ئوسترالیا بوون و پێشبینی کۆمەڵگایەکی ئۆتۆکراتی کرد کە لە لایەن ئەم نوخبەیەوە کۆنترۆڵ بکرایە. شتەکان بەو شێوەیە نەڕۆیشتن کە بیگ دەیویستن.

لە کاتێك دا بیگ دەیویست کاتژمێرەکە بۆ دواوە بگێڕێتەوە، سزادراوانی پێشتر و کوڕان و کچانیان داوای مافی زیاتریان دەکرد. لە هەمووشی گرنگتر، ئەوان دەیانزانی، هەروەك لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دا، بۆ قایمکردنی مافە ئابووری و سیاسییەکانیان پێویستیان بە دەزگایانی سیاسی هەبوو کە تێکەڵاوی پرۆسەی بڕیاردانیان بکا. ئەوان داوای هەڵبژاردنیان کرد کە بتوانن تیایان دا بە شێوەیەکی یەکسان بەشداربن و داوای دەزگایانی نوێنەرایەتی و ئەنجوومەنی ئەوتۆیان دەکرد کە بتوانن تیایان دا پلەو پایە بەدەستبهێنن.

سزادراوانی پێشتر و کوڕان و کچانیان لە لایەن نووسەر و گەشتیار و ڕۆژنامەنووس ولیام وێنتۆرس سەرکردایەتیان کرا. وێنتۆرس یەکێك بوو لە سەرکردەکانی گەشتی یەکەم بەرەو چیایانی شین کە ناوچەیەکی پرگیای گەورەی لەبەردەم سکواتەرەکان دا کردەوە. شارۆچکەیەك لەسەر ئەم چیایانە تا ئێستاش بە ناوی ئەوەوە ناونراوە. ئەو لایەنگری سزادراوان بوو، ڕەنگە لەبەر باوکی بوبێ کە تۆمەتی جەردەیی لە سەر جادەی خێرای خرابوە پاڵ و دەبوایە بە گواستنەوە بۆ ئوسترالیا ڕازیبوایە بۆ قوتاربوونی لە دادگاییکردن و ئەگەری سزادانی. لەم کاتەدا وینتۆرس داکۆکیکارێکی بەهێز بوو بۆ دەستەبەرکردنی دەزگایانی سیاسی کراوەتر و ئەنجوومەنێکی هەڵبژێراو و دادگاییکردن لە ڕێگەی دەستەی سوێندخۆران بۆ سزادراوانی پێشتر و خێزانەکانیان و کۆتاییهێنان بە گواستنەوە بۆ نیوو ساوس وێڵس. ئەو ڕۆژنامەیەکی دەرکرد بە ناوی ئوسترالی، کە لەوە بە دواوە سەرکردایەتی هێرشەکانی کرد بۆ سەر دەزگایانی سیاسی ئەو کاتە. مەکارسەر چارەی وینتۆرسی نەدەویست و بە دڵنیاییەوە حەزی لەو شتانە نەبوو کە ئەو داوای دەکردن. ئەو لیستی ناوی لایەنگرانی وێنتۆرسی پشکنی و بەم شێوەیە وەسفیکردن:

- *هەر لەو کاتەوە ماتۆتە ئێرە، سزادراوە بە هەڵواسین*
- *چەندین جار لە دوای عارەبانەوە قامچی لێدراوە*
- *جولەکەیەکی لەندەنی*
- *جولەکەیەکی خاوەن باری خواردنەوە کە دواتر مۆڵەتەکەی لێوەرگیراوەتەوە*
- *مەزاتچییەك کە لەبەر ئەوەی بازرگانی بە کۆیلانەوە کردوە گوێزراوەتەوە*
- *زۆرجار لێرە قامچیکاری کراوە*
- *کوڕی دوو سزادراو*
- *ساختەچییەك کە قەرزدارێکی قورس بوە*
- *سەرکێشێکی ئەمەریکی*
- *پارێزەرێك کە خاوەن کەسایەتییەکی نزمە*
- *غەریبێك کە لەم دواییەدا لە دوکانێکی مۆسیقادا شکستیهێناوە*
- *کچی دوو سزادراوی خواستوە*
- *کچێکی سزادراوی هێناوە کە پێشتر دەف لێدەر بوە*

بەرهەڵستی توندی مەکارسەر و سکواتەرەکان نەیتوانی شەپۆلی نارەزاییەکان بوەستێنێ لە ئوسترالیا دا. داخوازی بۆ دەزگایانی نوێنەرایەتی بەهێز نەدەتوانرا کپبکرێ. هەتا ساڵی ١٨٢٣ پارێزگار کەمونزۆر بە تەنیا فەرمانڕەوایی نیوو ساوس وێڵسی کردبوو. لەو ساڵەدا دەسەڵاتەکانی سنووردار کران لە ڕێگەی دامەزراندنی ئەنجوومەنێکەوە کە لە لایەن حکومەتی بەریتانییەوە دەسنیشانکرابوون. لە سەرەتادا دەسنیشانکراوان لە ناو نوخبەی سکواتەر و سزانەدراوانەوە دیاریکرابوون کە مەکارسەر یەکێك بوو لەوانە، بەڵام ئەمە نەیتوانی تا سەر بەردەوامبێ. لە ساڵی ١٨٣١ دا پارێزگار ریچارد بۆرك لەبەردەم گوشاردا چەمایەوە و بۆ یەکەمجار ڕێگەی دا تا سزادراوانی پێشتر بینە ئەندامی دەستەی سوێندخۆران. سزادراوانی پێشتر و لە ڕاستیدا چەندین نیشتەجێبوانی نوێی ئازاد دەیانویست گواستنەوەی سزادراوان لە بەریتانیاوە بۆ ئوسترالیا بوەستێنرێ چونکە لە ناو بازاڕی کاردا بووبوە هۆی ڕکابەری و کرێی ڕۆژانەی کەمکردبۆوە. سکواتەرەکان لایەنگری کرێی کەم بوون، بەڵام

ئەوان دۆڕاندیان. لە ساڵی ١٨٤٠ دا گواستنەوە بۆ نیوو ساوس وێڵس ڕاگیرا و لە ساڵی ١٨٤٢ دا ئەنجوومەنێکی یاسادانان دامەزرا کە دوو لەسەر سێی ئەنجوومەنەکە هەڵدەبژێران و ئەوانی تر دادەنران. سزادراوانی پێشووش دەیانتوانی خۆیان بپاڵێون و دەنگبدەن ئەگەر موڵکی تەواویان هەبوایە کە زۆربەیان هەیانبوو.

لە ساڵانی ١٨٥٠ کان دا، ئوسترالیا مافی دەنگدانی بۆ پیاوانی سپیپێست دەستەبەرکرد. داخوازییەکانی هاوڵاتییان و سزادراوانی پێشتر و خێزانەکانیان زۆر لەوە تێپەڕین کە ویلیام وێنتۆرس یەکەمجار بیریلێکردبۆوە. لە ڕاستیدا لەم کاتەدا ئەو کەوتبوە بەری پارێزگارەکان و سوور بوو لەسەر بوونی ئەنجوومەنێکی یاسادانانی هەڵنەبژێراو. بەڵام بەهەمانشێوەی هەوڵەکانی مەکارسەر لەوەبەر، وێنتۆرس نەیتوانی شەپۆلی بەرەو دەزگایانی سیاسی زیاتر کراوە بوەستێنێ. لە ساڵی ١٨٥٦ دا، ویلایەتی ڤیکتۆریا کە لە ساڵی ١٨٥١ دا لە نیوو ساوس ویلس داتاشرابوو لەگەڵ ویلایەتی تازمانیا بوونە یەکەم جێگا لە جیهان دا بۆ هێنانەئارای دەنگدانی نهێنی کاریگەر لە هەڵبژاردنەکان دا کە کڕینی دەنگ و بەزۆر دەنگدانی وەستاند. ئەمڕۆش بە شێوازی ستانداردی پاراستنی نهێنی لە هەڵبژاردنەکان دا دەڵێن دەنگدانی ئوسترالی.

بارودۆخی سەرەتایی لە سیدنی و نیوو ساوس وێڵس زۆر هاوشێوەی بارودۆخی جەیمستاون و ڤێرجینیا بوون ١٨١ ساڵ لەوەبەر، هەرچەندە نیشتەجێیان لە جەیمستاون زۆربەیان کرێکاری خاوەن گرێبەست بوون نەك سزادراوان. لە هەردوو بارەکەدا بارودۆخی سەرەتایی بواری دامەزراندنی دەزگایانی کۆلۆنیالی چەوسێنەری نەدا. هیچ کام لە کۆلۆنییەکان خاوەنی دانیشتوانی چڕ نەبوون تا بچەوسێنرێنەوە و بە ئاسانی دەستیان نەدەگەیشتە کانزای بەنرخی وەك ئاڵتون و زیو یان زەوی و بەروبومی ئەوتۆیان نەبوو کە ببوایەتە هۆی ئەوەی دامەزراندنی کێڵگەی کشتوکاڵی کۆیلان لە ڕووی ئابوورییەوە شیاوبن. بازرگانی کۆیلان هێشتا لە ساڵانی ١٧٨٠ کان دا چالاك بوو، ئەگەر ئەو بازرگانییە مایەی قازانج بوایە ئەوا نیوو ساوس وێڵس پڕ دەبوو لە کۆیلان. بازرگانییەکە مایەی قازانج نەبوو. هەردوو کۆمپانیای ڤێرجینیا و سەربازەکان و نیشتەجێیانی نوێ کە نیوو ساوس وێڵسیان بەڕێوەدەبرد لەبەردەم گوشاردا چەمینەوە و بەرەبەرە دەزگایانی ئابووری کراوەیان

دامەزراند کە شانبەشانی دەزگایانی سیاسی کراوە پەرەیانسەند. ئەمە لە نیوو ساوس ویڵس دا لە ئەنجامی خەباتێکی کەمتردا هاتەدی بە بەراورد لەگەڵ ئەو خەباتەی لە ڤێرجینیا کرابوو. هەموو ئەو هەوڵانەی دواتر دران بۆ پێچەوانەکردنەوەی ئەم ئاڕاستەیە شکستیانهێنا.

ئوسترالیا، بە هەمانشێوەی ویلایەتە یەککگرتوەکان، ڕێچکەیەکی جیاوازی بەرەو دەزگایانی کراوە گرتەبەر لە چاو ئەو ڕێچکەیەی ئینگلتەرە گرتیەبەر. هەمان ئەو شۆڕشانەی کە ئینگلتەرەی هەژاند لە کاتی جەنگی ناوخۆ دا و دواتریش شۆڕشی شکۆدار دا لە ویلایەتە یەککگرتوەکان یان ئوسترالیادا پێویست نەبوون لەبەر ئەو بارودۆخە جیاوازانەی ئەم وولاتانە تیایان دا دامەزران. هەرچەندە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە دەزگایانی کراوە بەبێ هیچ ململانێیەك دامەزران و لە میانەی ئەم پرۆسەیەدا پێویست بوو ویلایەتە یەککگرتوەکان کۆلۆنیالیزمی بەریتانی وەدەرنێ. لە ئینگلتەرە دا مێژوویەکی درێژی فەرمانڕەوایی ڕەها لەئارادا بوو کە ڕیشەی قوڵی داکوتابوو، پێویستی بە شۆڕشێك هەبوو تا ڕیشەکێشی بکا. لە ویلایەتە یەککگرتوەکان و ئوسترالیا دا شتی وا لە ئارادا نەبوو. هەرچەندە لەوانەیە لۆرد بالتیمۆر لە مێریلاند و جۆن مەکارسەر لە نیو ساوس ویلس هەوڵیان دابێ ڕۆڵی لەو چەشنە ببینن، بەڵام نەیانتوانی دەسەڵاتی خۆیان بەهێزێکی وا بەسەر کۆمەڵگادا بسەپێنن کە ببێتە هۆی ئەوەی پلانەکانیان بەر بگرن. ئەو دەزگا کراوانەی لە ویلایەتە یەککگرتوەکان و ئوستراڵیا دامەزران بونە هۆی ئەوەی کە شۆڕشی پیشەسازی بە خێرایی لەم خاکانەدا بڵاوبێتەوەو دەست بە دەوڵەمەندبوون بکەن. ئەو ڕێچکەیەی ئەم وولاتانە لەسەری ڕۆیشتن لە لایەن کۆلۆنییەکانی وەك کەنەدا و نیوزیلاند گیرایەبەر.

ڕێچکەی تریش بەرەو دەزگایانی کراوە لە ئارادا بوون. ناوچەی گەورەی ئەورووپای ڕۆژئاوا ڕێچکەی سێیەمیان بەرەو دەزگایانی کراوە گرتەبەر لە ژێر کاریگەریی شۆڕشی فەرەنسی دا کە ڕەهایی لە فەرەنسادا لەناوبرد و دواتریش زنجیرەیەك ململانێی لە نێو دوڵەتان دا دروستکرد کە چاکسازی دەزگایی لە ئەورووپای ڕۆژئاوا دا بڵاوکردەوە. ئاکامە ئابوورییەکانی ئەم چاکسازییانە بریتیبوون لە سەرهەڵدانی دەزگایانی کراوە لە زۆربەی وولاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوادا و شۆڕشی پیشەسازی و گەشەکردنی ئابووری.

# شکاندنی بەربەستەکان
# شۆڕشی فەڕەنسی

بۆ ماوەی سێ سەدەی بەر لە ساڵی ١٧٨٩، فەڕەنسا لەلایەن پاشایەتییەکی ڕەهاوە حوکمدەکرا. کۆمەڵگای فەڕەنسی بەسەر سێ بەش دا دابەشبووبوو، کە پێیان دەوترا چین (ئیستەیت) کە بریتیبوون لە ئەریستۆکراتەکان (نۆبڵەکان) کە چینی یەکەم و پیاوانی ئاینی چینی دوەم و هەموو خەڵکی تر چینی سێیەمیان پێکدەهێنا. هەریەك لە چینە جیاوازەکان یاسای جیاوازیان بەسەردا جێبەجێدەکرا و دوو چینی یەکەم مافی ئەوتۆیان هەبوو کە باقی دانیشتوان نەیان بوو. نۆبڵ و پیاوە ئاینییەکان باجیان نەدەدا، لە کاتێك دا دەبوایە هاوڵاتییان چەندین جۆری جیاوازی باجیان بدایە، ئەمەش شتێکی چاوەڕێکراو بوو لە ڕژێمێکی ڕەهای وەك فەڕەنسا دا. لە ڕاستی دا کڵێسە تەنیا چاوپۆشی لێنەکرابوو لە دانی باج، بەڵکو خاوەنی زەویوزارێکی زۆر و دەیتوانی باجی خۆی بەسەر ڕەنجدەران دا بسەپێنێ. بنەماڵەی پاشا و نۆبڵەکان و پیاوانی ئاینی ژیانێکی تێروتەسەل دەژیان لە کاتێك دا زۆربەی چینی سێیەم لە هەژاری تەواودا دەژیان. یاسا جیاوازەکان تەنیا پێگەی بەکەڵکی نەدابوە نۆبڵ و پیاوانی ئاینی، بەڵکو دەسەڵاتی سیاسیشی پێبەخشیبوون.

ژیان لە شارانی فەڕەنسای سەدەی هەژدەیەم دا زەحمەت و ناتەندروستبوو. پیشەکاران لە لایەن سەندیکایانی بەهێزەوە ڕێکخرابوون کە داهاتی باشیان بۆ ئەندامانی سەندیکاکان دەستەبەردەکرد و ڕێگەیان لەوانی تر دەگرت تا بەشداری لەم کارانەدا بکەن یان بزنسی نوێ دابمەزرێنن. ئەوەی پێیدەوترا ڕژێمی کۆن، شانازی بە بەردەوامی و سەقامگیریی خۆیەوە دەکرد. بەشداریکردنی کارزانان و تاکانی بەهرەدار لە کارە نوێکان دا ناسەقامگیریی دروستدەکرد و ڕێگەی پێنەدەدرا. ئەگەر ژیان لە شارەکان دا زەحمەت بووبێ، ئەوا ژیان لە گوندەکان دا خراپتر بوو. هەروەك بینیمان، لەم سەردەمەدا جۆرە ئێکستریمەکانی بەندایەتی، کە خەڵکی بە زەوییەوە گرێدابوو، ناچاریدەکردن کار بۆ لۆردە فیوداڵەکان بکەن و سەرانەیان بدەنێ، دەمێك بوو لە پوکانەوەدا

بوو لە فەرەنسادا. لەگەڵ ئەمەش دا، شوێن گۆڕین لە لایەن ڕەنجدەرانەوە سنووردار و کۆمەڵێك سەرانەی فیوداڵی هەبوون کە دەبوایە ڕەنجدەرانی فەڕەنسی بیاندایە بە پاشا و نۆبڵەکان و کڵێسا.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم پاشخانە، شۆڕشی فەڕەنسی ڕووداوێکی ڕادیکاڵی بوو. لە ٤ی ئابی ساڵی ١٧٨٩ دا ئەنجوومەنی دامەزرێنەری نەتەوەیی، لە ڕێگەی پێشنیازکردنی دەستوورێکی نوێیەوە، سەراپای یاساکانی فەڕەنسای گۆڕی. یەکەم بەندی دەستوورەکە تێدا هاتوە:

*(ئەنجوومەنی نەتەوەیی سەراپای سیستەمی فیوداڵی هەڵدەوەشێنێتەوە. ئەنجوومەن بڕیاردەدا لە ناو ماف و سەرانەکانی ئێستادا، چ فیوداڵی بن یان جۆری تر، هەموو ئەوانەی هەڵقوڵاوی یان نوێنەرایەتی بەندایەتی ڕاستەقینە یان مەعنەوی دەکەن بەبێ قەرەبوکردنەوە هەڵدەوەشێنرێنەوە).*

بەندی نۆیەمی دەستوورەکە بەردەوامبوو:

*(ئیمتیازە ئابوورییەکان، مەعنەوی بن یان ڕاستەقینە لە دانی باج دا بۆ هەمیشە هەڵدەوشێنرێنەوە. باج لە هەموو هاوڵاتییان و لە هەموو موڵکێك وەردەگیرێ بەهەمانشێوە و بە هەمان ڕێگە. پلان دەگیرێتەبەر کە بەهۆیەوە باج بەشێوەیەکی ڕێژەیی لە لایەن هەموانەوە دەدرێ تەنانەت بۆ شەش مانگی دوەمی ئەمساڵیش).*

کەواتە لە پڕێك دا شۆڕشی فەڕەنسا سیستەمی فیوداڵی هەڵوەشاندەوە لەگەڵ هەموو ئەو ئەرك و سەرانانەی ئەم سیستەمە لەخۆی گرتبوون و بە تەواوی بەخشینی نۆبڵ و پیاوانی ئایینی لە دانی باج ڕەتکردەوە. بەڵام لە هەموویان ڕادیکاڵتر و تەنانەت لەو سەردەمەدا بیریشی لێنەدەکرایەوە بریتیبوو لە بەندی یازدەیەم کە تێیدا هاتوە:

*(هەموو هاوڵاتییان بەبێ جیاوازی لە دایکبوونیان، مافیان هەیە بۆ هەموو فەرمانگە و پلەو پایەیەکی بەرز، ئاینی یان مەدەنی یان سەربازی بێ و هیچ پیشەیەك نزمی ناگەیەنێ).*

کەواتە یەکسانی بەرامبەر یاسا بۆ هەموان هاتەئاراوە، نەك تەنیا لە ژیان و بزنسی ڕۆژانەیان دا، بەڵکو لە سیاسەتیشدا. چاکسازییەکانی شۆڕش لە دوای ٤ی ئاب بەردەوامبوون. لە ئەنجامدا ئەم چاکسازییانە دەسەڵاتی کڵێسای هەڵوەشاندەوە بۆ دانانی باجی تایبەت و پیاوانی ئاینی کردە فەرمانبەرانی

دەوڵەت. لەگەڵ لابردنی ڕۆڵە سیاسی و کۆمەڵایەتییە ڕەقەکان دا، کۆسپە سەرەکییەکانی بەردەم چالاکییە ئابوورییەکانیش هەڵگیران. سەندیکاو هەموو سنووردارکردنە پیشەییەکان لابران و مەیدانێکی تەخت تری گەمەیان لە ناو شارەکان دا دامەزراند.

ئەم چاکسازییانە هەنگاوی یەکەم بوون بەرەو کۆتییهێنان بە دەسەڵاتی پاشا ڕەهاکانی فەڕەنسا. چەندین دەیە لە نائارامی و جەنگ دوابەدای ڕاگەیاندنەکەی ٤ی ئاب سەریانهەڵدا، بەڵام هەنگاوێکی دوورکەوتنەوە لە دەزگایانی ڕەهاو چەوسێنەر نرا بەرەو دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوە. ئەم گۆڕانکارییانە چاکسازی تری لە ئابووری و سیاسەت دا بەدوای خۆیدا هێنا و لە کۆتایی دا بوونە هۆی دامەزراندنی کۆماری سێیەم لە ساڵی ١٨٧٠ دا، ئەویش ئەو جۆرە سیستەمی پەرلەمانیەی هێنا بۆ فەڕەنسا کە شۆڕشی شکۆدار لە ئینگلتەرە دا دەستی بە دامەزراندنی کردبوو. شۆڕشی فەڕەنسا توندوتیژی و ئازار و ناسەقامگیری و جەنگی زۆری هێنایەئاراوە، بەڵام سوپاس بۆ ئەو شۆڕشە، فەڕەنسا لە ناو دەزگا چەوسێنەرەکان دا قەتیسی نەخوارد تا گەشەکردنی ئابووری و خۆشگوزەرانی بوەستێنن، هەروەك ڕژیمە ڕەهاکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی وەك نەمسا ـ هەنگاریا و ڕوسیا کردیان.

ئایا چۆن پاشایەتی ڕەهای فەڕەنسا گەیشتە لێواری شۆڕشی ١٧٨٩؟ لە کاتێك دا بینیمان کە چەندین ڕژێمی ڕەها توانیان بۆ ماوەیەکی درێژ بمێننەوە، تەنانەت لە ناوجەرگەی چەقبەستنی ئابووری و گێژاوی کۆمەڵایەتی دا. هەروەك زۆربەی حاڵەتەکانی شۆڕش و گۆڕانکاری ڕادیکالی، کۆبوونەوەی چەند فاکتەرێك ڕێگایان بۆ شۆڕشی فەڕەنسا کردەوە، هەموو ئەمانەش پەیوەندییان بەو ڕاستییەوە هەبوو کە بەریتانیا بە خێرایی دەبوە وولاتێکی پیشەسازی. بێگومان، ڕێچکەکە، وەك هەمیشە، پەیوەست (contingent) بوو، چونکە چەندین تەقەلا لە لایەن پاشایەتییەوە بۆ جێگیرکردنی ڕژیمەکە شکستیهێنا و دەرکەوت شۆڕشەکە لە گۆڕینی دەزگایان لە فەرەنسا و شوێنەکانی تری ئەورووپا سەرکەتوو تر بێ لەوەی زۆرکەس لە ساڵی ١٧٨٩ دا بیریلێکردبۆوە.

چەندین یاساو ئیمتیاز لە فەڕەنسادا پاشماوەی چاخەکانی ناوەڕاست بوون. ئەوانە نەك تەنیا لە بەرژەوەندی چینی یەکەم و دوەم بوون بە بەراورد لەگەڵ زۆربەی دانیشتوان دا، بەڵکو ئیمتیازی هاوتای ئەوانەی پاشایەتیشی بۆ

دابینکردبوون. لویسی چواردەیەم، پاشای ڕۆژ، لە نێوان ساڵانی ١٦٦١ بۆ ١٧١٥ دا، بۆ ماوەی پەنجاو چوار ساڵ فەرمانڕەوایی فەڕەنسای کرد، هەرچەندە ئەو لە ساڵی ١٦٤٣ دا هاتەسەرتەخت کاتێک تەمەنی پێنج ساڵان بوو. ئەو دەسەڵاتی پاشایەتی پتەو کرد و پرۆسەی بەرەو ڕەهایی بەرەو پێشتر برد کە چەندین سەدە بەر لەوە دەستپێکردبوو. چەندین پاشا ڕاوێژیان بەو ئەنجوومەنە دەکرد کە پێیدەوترا ئەنجوومەنی پیاوماقوڵان کە لە ئەریستۆکراتە سەرەکییەکان پێکهاتبوو، لە لایەن تاجەوە دەسنیشاندەکران. هەرچەندە بەزۆری ئەنجوومەنێکی ڕاوێژکاریی بوو، بەڵام جڵەوگیرییەکی شلی دەسەڵاتی پاشاشی کردبوو. هەر لەبەر ئەم هۆیە لویسی چواردەیەم بەبێ کۆبوونەوەی ئەنجوومەنەکە فەرمانڕەواییکرد. لە سایەی دەسەڵاتی ئەم پاشایەدا فەڕەنسا هەندێك گەشەکردنی ئابووری ئەنجامدا ـ بۆ نموونە، لە ڕێگەی بەشداریکردن لە بازرگانی ئەتڵەسی وکۆلۆنیالی دا. وەزیرە داراییە کارامەکەی لویس، ژان باپتیس کۆڵبێرت، لە هەمانکات دا سەرپەرشتی پیشەسازی پشتگیرکراو وکۆنترۆڵکراوی حکومەتی دەکرد، کە جۆرێك بوو لە گەشەکردنی چەوسێنەرانە. ئەم گەشەکردنە سنووردارە بەشێوەی سەرەکی سوودی بە چینی یەکەم و دوەم گەیاند. لویسی چواردەیەم دەیویست کە سیستەمی وەرگرتنی باج لە فەڕەنسادا ڕێکبخا چونکە زۆرجار دەوڵەت کێشەی دابینکردنی پارەی هەبوو بۆ جەنگە یەك لەدوای یەکەکان و سوپا گەورەکەی و خەرجییە زۆرەکانی خۆی و دەستوپێوەندەکانی و کۆشکەکانی. بێتوانایی حکومەت بۆ وەرگرتنی باج تەنانەت لە بچووکترین نۆبلێ، داهاتی حکومەتی بە تەواوی سنووردارکردبوو.

هەرچەندە لەوکاتەدا کە لویسی شازدەیەم لە ساڵی ١٧٧٤ هاتەسەرتەخت گەشەکردنی ئابووری کەم هەبوو، بەڵام گۆڕانکاری گەورە لە کۆمەڵگادا ڕوویدابوو. جگە لەمە، کێشە داراییەکانی پێشتر گۆڕابوون بۆ قەیرانی دارایی و جەنگی حەوت ساڵە لەگەڵ بەریتانیادا لە نێوان ساڵانی ١٧٥٦ و ١٧٦٣، کە تیایان دا فەڕەنسا کەنەدای لەدەست دا، زۆر گران لەسەر فەڕەنسا کەوتن. ژمارەیەك کەسایەتی دیار هەوڵیان دا بودجەی پاشایەتی فەڕەنسا هاوسەنگ بکەن لە ڕێگەی ڕێکخستنەوەی قەرزەکان و زیادکردنی باج. هەندێك لەو کەسایەتییە دیارانە بریتیبوون لە ئان ڕۆبەرت ـ جاك تۆرگۆت کە یەکێك بوو لە بەناوبانگترین ئابووریناسانی ئەو سەردەمە و جاك نێکەر کە لە دوای شۆڕشیش

ڕۆڵی گەورەی گێڕا و چارڵس ئەلێگزاندەر دی کالۆن. بەڵام هیچ یەکێك لەمانە سەرکەتوو نەبون. کالۆن وەك بەشێك لە ستراتیژییەکەی لویسی شازدەیەمی ڕازیکرد کە کۆبوونەوە بە ئەنجوومەنی پیاوماقوڵان بکا. پاشا و ڕاوێژکاران چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە ئەنجوومەن بە چاکسازییەکانی ئەو ڕازیبن، بە هەمان ئەو شێوەیەی کە چارڵسی یەکەم چاوەڕێیدەکرد پەرلەمانی ئینگلیزی ڕازیبێ خەرجییەکانی سوپا بۆ شەڕکردن لەگەڵ سکۆتلەندەدا دابینبکا کاتێك ئەو لە ساڵی ١٦٤٠ دا داوای کۆبوونەوەی پەرلەمانی کرد. ئەنجوومەنەکە هەنگاوێکی چاوەڕێنەکراوی نا و بڕیاری دا کە تەنیا دەزگایەکی نوێنەر، کە ئەنجوومەنی گشتی بوو، دەتوانێ ئەم چاکسازییانە پەسەندبکا.

ئەنجوومەنی گشتی دەزگایەکی زۆر جیاواز بوو لە ئەنجوومەنی پیاوماقوڵان. لە کاتێك دا ئەمەی دوایی لە نۆبڵەکان پێکهاتبوو، بەزۆریش لەلایەن تاجەوە لەناو ئەریستۆکراتە سەرەکییەکان دا دیاریدەکرا، ئەوەی یەکەمیان نوێنەرانی هەرسێ چینەکەی لەخۆ گرتبوو. ئەنجوومەنی گشتی دواجار لە ساڵی ١٦١٤ دا کۆبوبۆوە. کاتێك ئەنجوومەنی گشتی لە ساڵی ١٧٨٩ دا لە ڤێرسای کۆبۆوە، هەر زوو دەرکەوت کە ناگەنە هیچ ڕێکەوتنێك. جیاوازی قووڵ لە نێوانیان دا هەبوو، کاتێك چینی سێیەم ئەمەی بە هەلێك زانی بۆ زیادکردنی دەسەڵاتی سیاسی خۆی و ویستی دەنگی زیاتری لە ناو ئەنجوومەنی گشتی دا هەبێ و نۆبڵەکان و پیاوانی ئاینی بێچەندوچون دژی وەستانەوە. کۆبوونەوەکە لە ٥ مایسی ساڵی ١٧٨٩ دا کۆتاییهات بەبێ هیچ ڕێکەوتنێك جگە لە بڕیاردان لەسەر کۆبوونەوەی دەزگایەکی دەسەڵاتدارتر، کە ئەنجوومەنی نەتەوەیی بوو، بەمەش قەیرانی سیاسی قوڵبۆوە. چینی سێیەم بەتایبەتی بازرگان و بزنسمان و پرۆفیشنەڵ و پیشەکاران کە هەموویان داوای دەسەڵاتی زیاتریان دەکرد، ئەم پەرەسەندنانەیان وەك بەڵگەیەکی زیادبوونی هەیبەتی خۆیان سەیردەکرد. لە ئەنجوومەنی نەتەوەیی دا، ئەوان داوای ڕۆڵی زیاتریان لە بەڕێوەبردنی کۆبوونەوەکان کرد و بەگشتیش داوای مافی زۆرتریان کرد. پاڵپشتی شەقام لە سەراپای وڵات دا بۆ ئەوان لە لایەن ئەو هاوڵاتییانەی بەم پەرەسەندنانە پشتئەستوور بوون بوە هۆی دامەزراندنەوەی ئەنجوومەنەکە لە ٩ی تەمووز دا وەك ئەنجوومەنی نەتەوەیی هاوڵاتییان.

لەم سەروبەندەدا، هەست و هۆشی خەڵك لە وڵات دا، بەتایبەتی لە پاریس

دا، بەرەو ڕادیکالی زیاتر دەچوو. وەك کاردانەوەیەك، ئەو کۆنزەرڤەتیڤانەی لە دەوری لویسی شازدەیەم بوون، لویسیان ڕازیکرد کە وەزیری دارایی ڕیفۆرمخواز، نێکەر، دەربکا. ئەمەش بوە هۆی ڕادیکالتر کردنی شەقام. ئەنجامەکەی بریتیبوو لە پەلاماردانە بەناوبانگەکەی باستیل لە ١٤ تەمووزی ساڵی ١٧٨٩ دا. لەم کاتە بەدواوە، شۆڕش بە گوڕ دەستیپێکرد. نێکەر خرایەوە سەر کارەکەی خۆی و شۆڕشگێڕ مارکۆس لافایێ کرایە بەرپرسی پاسەوانی نەتەوەیی پاریس.

تەنانەت لە پەلاماردانەکەی باستیل گرنگتر، داینەمیکی ناو ئەنجوومەنی نەتەوەیی هاوڵاتییان بوو کە لە ٤ ئابی ساڵی ١٧٨٩ دا، پشت ئەستوور بە متمانەی تازە بەدەستهێنراوی، دەستووری نوێی پەسەندکرد و بەهۆیەوە فیوداڵیزم و ئیمتیازەکانی چینی یەکەم و دووەمی هەڵوەشاندەوە. بەڵام ئەم ڕادیکالیە بوە هۆی دابەشبوونی ئەنجوومەن چونکە چەندین بۆچوونی جیاواز دەربارەی شێوەی دارشتنەوەی کۆمەڵگا لە ئارادا بوون. هەنگاوی یەکەم بریتیبوو لە پێکهێنانی یانەی ناوخۆیی و لە هەمووشیان گرنگتر یانەی ڕادیکاڵی جاکوبی بوو کە دواتر کۆنترۆڵی شۆڕشیکرد. لە هەمانکات دا نۆبڵەکان بە ژمارەی زۆر وولاتیان بەجێدەهێشت کە پێیان دەوترا کۆچکاران. چەندین کەس لەوانە هانی پاشایان دەدا تا لە ئەنجوومەن جیابێتەوە و بۆخۆی یان بە هاوکاری هێزە بیانییەکانی وەك نەمسا کە وولاتی ڕەسەنی شاژن ماری ئەنتۆینێ و ئەو شوێنەی زۆربەی کۆچکاران ڕوویانتێکردبوو، هەڵوێست بنوێنێ. لەکاتێك دا خەڵکێکی زۆری سەر شەقامەکان هەستیان بە هەڕەشە دەکرد دژی ئەو دەسکەوتانەی لە ماوەی دوو ساڵی پێشتردا بەدەستهێنرابوون، ڕادیکاڵیبوون تینوتاوی زیاترسەند. ئەنجوومەنی نەتەوەیی هاوڵاتییان لە ٢٩ ئەیلولی ساڵی ١٧٩١ دا بڕیاری لەسەر دوا شێوازی دەستوور دەرکرد و فەڕەنسای کردە پاشایەتییەکی دەستووری لەگەڵ مافی یەکسان بۆ هەموو پیاوان و نەهێشتنی ئەرك و سەرانەی فیوداڵی و کۆتاییهێنانی هەموو سنووردارکردنێکی بازرگانی کە لە لایەن سەندیکاکانەوە سەپێنرابوون. فەڕەنسا هێشتا هەر پاشایەتی بوو، بەڵام پاشا ڕۆڵی کەمی هەبوو، لە ڕاستیشدا تەنانەت ئازادی خۆشی نەبوو.

بەڵام دواتر داینەمیکی شۆڕش بە شێوەیەك گۆڕانکاری بەسەرداهات کە

شیاوی گەڕانەوە بۆ دواوە نەبوو بەهۆی ئەو جەنگەی لە ساڵی ١٧٩٢ دا بەرپا بوو لە نێوان فەڕەنساو "هاوپەیمانیی یەکەم" بە سەرۆکایەتی نەمسا. جەنگ ئیرادە و ڕادیکالیزمی شۆڕشگێڕانی زیادکرد و لەگەڵ ئەویش دا ئیرادەو ڕادیکالیزمی جەماوەر (ئەوانەی پێیان دەوترا سانز کولۆتس کە مانای "پانتۆڵی کورت" بوو چونکە پارەیان نەبوو ئەو پانتۆڵانە لەپێبکەن کە ئەو کاتە مۆدێل بوو). ئاکامی ئەم پرۆسەیە بریتیبوو لە سەرهەڵدانی ماوەیەك کە بە تێرۆر ناسراوە، بەسەرکردایەتی تاقمێکی جاکوبیەکان کە ڕۆبزپێری و سەینت جەست سەرکردایەتیان دەکرد و ترس و تیرۆر بڵاوبۆوە، دوای ئەوەی لویسی شازدەیەم و ماری ئەنتۆینێ هەڵواسران. ئەمەش نەك تەنیا بوە هۆی هەڵواسینی ژمارەیەك لە ئەریستۆکراتەکان و کەسانی دژەشۆڕش، بەڵکو چەندین کەسایەتی سەرەکی خودی شۆڕشیش لەوانەش سەرکردە ناسراوەکانی وەك بریسۆت و دانتۆن و دیزمۆلینس هەڵواسران.

هەر زوو تێرۆر لە کۆنترۆڵ دەرچوو، تا لە تەمووز ١٧٩٤ دا بە هەڵواسینی سەرکردەکانی خودی تیرۆر لەوانە ڕۆبزپێری و سەینت جەست کۆتاییهات. دوای ئەوە قۆناخێکی سەقامگیریی ڕێژەیی دەسپێکرد، یەکەمجار لە سایەی ئیدارەیەکی تا ڕادەیەك ناشایستەدا لە نێوان ساڵانی ١٧٩٥ و ١٧٩٩ دا و دواتریش بە چڕکردنەوەی زیاتری دەسەڵات لە دەستی ئەنجومەنێکی سێ کەسی دا کە لە دوکۆس و سایس و ناپلیۆن بۆناپارت پێکهاتبوو. هەر لەماوەی ئەو ئیدارەیەدا بوو جەنەڕاڵی لاو ناپلیۆن بۆناپارت لە ڕێگەی سەرکەوتنە سەربازییەکانیەوە ناوبانگی پەیداکردبوو، کاریگەریشی لە دوای ساڵی ١٧٩٩ ەوە زیادیکرد. هەر زوو ئەنجومەنەکە بوە جێگەی فەرمانڕەوایی ناپلیۆن بە تەنیا.

ساڵانی نێوان ١٧٩٩ و کۆتایی دەسەڵاتی ناپلیۆن لە ساڵی ١٨١٥ دا، زنجیرەیەك سەرکەوتنی سەربازی مەزنیان بەخۆوە بینی بۆ فەڕەنسا، لەوانە سەرکەوتنەکان لە ئۆستەرلیتز و جێنا ئۆرستاد و واگرام کە زۆربەی ئەورووپای هێنایەسەرچۆك. ئەم سەرکەوتنانە ڕێگاخۆشکاربوون بۆ ئەوەی ناپلیۆن ئیرادەی خۆی و چاکسازییەکانی و کۆدی یاسایی خۆی بەسەر ناوچەیەکی فراوان دا بسەپێنێ. کەوتنی ناپلیۆن لە دوای دوا شکستهێنانی لە ساڵی ١٨١٥ دا، ماوەیەکی سکگوشین و سنووردارکردنی مافی سیاسی و گەڕانەوەی

پاشایەتی فەڕەنسی بە سەرۆکایەتی لویسی حەڤدەیەم لەگەڵ خۆی دا هێنا. بەڵام هەموو ئەمانە تەنیا سەرهەڵدانی دەزگایانی سیاسی کراوەیان هێواش کردەوە.

ئەو هێزانەی بەهۆی شۆڕشی ١٧٨٩ ەوە هاتنەئاراوە، کۆتاییان بە ڕەهایی فەڕەنسی هێنا و بە شێوەیەکی حەتمی، هەرچەندە بەهێواشی، بوونە هۆی سەرهەڵدانی دەزگایانی کراوە. فەڕەنساو ئەو ناوچانەی تری ئەورووپا کە چاکسازییە شۆڕشگێڕانەکانیان بۆ گوێزرایەوە، بەشدارییان لە پرۆسەی بەپیشەسازیبوون دا کرد کە لە سەدەی نۆزدەیەم دا لە بڵاوبوونەوەدا بوو.

## هەناردەکردنی شۆڕش

لە ساتەکانی بەر لە شۆڕشی فەڕەنسی ساڵی ١٧٨٩ دا، لە هەموو ئەورووپا دا گوشاری زۆر خرابوە سەر جولەکان. بۆ نموونە، لە شاری فەرانکفۆرتی ئەڵمانی دا، ژیان و گوزەرانیان بە پێی ئەو فەرمانانەی لە یاساکان دا دیاریکرابوون و لە چاخەکانی ناوەڕاستەوە مابوونەوە، ڕێکخرابوو. جولەکەکانی فرانکفۆرت لە پێنج سەد خێزان زیاتر نەبوون و پێویست بوو هەموویان لە بەشێکی بچووکی دیوارکراوی شارەکەدا بژیانایە کە پێیدەوترا یودنگاسیٚ، گەڕەکی جولەکان، ئەوان نەیاندەتوانی لە شەوان داو ڕۆژانی یەکشەمەو بۆنەکانی مەسیحیەکان دا گەڕەکەکەیان بەجێبهێڵن.

هەتا بڵێی یودنگاسیٚ قەرەباڵغبوو. چارەکە میلێك درێژ و پانیەکەی لە دوازە پیٚ زیاتر نەبوو، لە هەندێك جێگادا کەمتر بوو لە دە پیٚ. جولەکەکان لە ژێر چەوساندنەوە و چاودێری بەردەوام دا دەژیان. هەموو ساڵێك لە دوو خێزان زیاتر مۆڵەتی چوونە ناو گەڕەکەکەیان نەبوو، زیاتر لە دوازدە کەپڵ بۆیان نەبوو ژیانی هاوسەرێتی پێکبهێنن و دەبوایە تەمەنی هەردوکیان لە سەروو بیست و پێنج ساڵەوە بوایە. جولەکان نەیاندەتوانی کاری کشتوکاڵ بکەن و نەیاندەتوانی بازرگانی بە چەك و بەهارات و شەراب و دانەوێڵەوە بکەن. تا ساڵی ١٧٢٦ دەبوایە پۆشاکی جیاکاری تایبەت لەبەربکەن، کە بریتیبوو لە دوو ئەڵقەی هاوچەقی زەرد بۆ پیاوان و پەچەیەکی خەت خەت بۆ ژنان. هەموو جولەکان دەبوایە جۆرێکی تایبەت باجی خانوویان بدایە.

کاتێك شۆڕشی فەرەنسی تەقییەوە، بزنسمانێکی سەرکەوتووی گەنج، مایەر ئامسچێل ڕۆزچایەڵد لە یودنگاسیّ فرانکفۆرت دا دەژیا. لە سەرەتای ١٧٨٠ دا، ڕۆزچایەڵد وەك سەوداکارێکی شارەزای بواری پارەی کانزایی و کانزاو توحەفیات جێگای خۆی لە فرانکفۆرت دا کردبۆوە، بەڵام بە هەمانشێوەی جولەکەکانی تر ئەو نەیتوانی بزنس لە دەرەوەی گەڕەکی جولەکان بکاتەوە یان تەنانەت لە دەرەوەی ئەو گەڕەکەش دا بژی.

ئەمە هەمووی بەرەو گۆڕان ڕۆیشت. لە ساڵی ١٧٩١ دا ئەنجوومەنی نەتەوەیی فەرەنسا جولەکانی فەرەنسای ئازادکرد. سوپاکانی فەرەنسا کە ئەو کاتە ڕاینلاندیان داگیرکردبوو، جولەکەکانی ئەڵمانیای ڕۆژئاواشیان ئازادکرد. کاریگەری ئەمە لە فرانکفۆرت دا زۆر لەناکاو و تا ڕادەیەکی زۆریش نائەنقەست بوو. لە ساڵی ١٧٩٦ دا فەرەنسا فرانکفۆرتی بۆردومانکرد و لەم پرۆسەیەدا نیوەی یودنگاسیّ وێرانکرد. نزیکەی دوو هەزار جولەکە بێماڵ بوون و دەبوایە بۆ دەرەوەی گەڕەکەکە بگوێزرێنەوە. خێزانی ڕۆزچایەڵد لە ناو ئەو کەسانەدا بوون. کاتێك لەدەرەوەی گەڕەکەکە بوون، لەو ڕێسا جۆراوجۆرانەی کە کارزانی لیّ قەدەخەکردبوون، ڕزگاریان بوو. ئەوان توانیان ئەو هەلە نوێیە بۆ دامەزراندنی بزنس بقۆزنەوە، لەوانە ئیمزاکردنی گرێبەستێك بوو بۆ دابینکردنی دانەوێڵە بۆ سوپای نەمسا، ئەمەش شتێك بوو لەوەبەر ڕێگایان پێنەدەدرا بیکەن.

لە کۆتایی دەیەکەدا، ڕۆزچایەڵد یەکێك بوو لە جولەکە دەوڵەمەندەکانی فرانکفۆرت و بوە بزنسمانێکی باش دامەزراو. دەبوایە ڕزگاربوونی تەواو تا ساڵی ١٨١١ چاوەڕێیبکردایە کە دواجار لە لایەن کارلّ ڤۆن داڵبێرگ خرایەگەڕ، کە لە کاتی ڕێکخستنەوەی ئەڵمانیا لە لایەن ناپلیۆنەوە لە ساڵی ١٨٠٦ دا کرایە دۆقی مەزنی فرانکفۆرت. مایەر ئامسچێل بە کوڕەکەی ووت "تۆ ئێستا هاوڵاتییت"

ئەم پێشهاتانە کۆتایینەهێنا بە خەبات بۆ ئازادی جولەکان، چونکە دوای ئەوەش پێچەوانەبوونەوە لەو پرۆسەیەدا ڕووی دا بەتایبەتی لە کۆنگرەی ڤیەنای ساڵی ١٨١٥ دا، کە بۆ یەکلاییکردنەوەی بارودۆخی سیاسی دوای ناپلیۆن سازکرا. بەڵام بۆ خێزانی ڕۆزچایەڵد گەڕانەوە بۆ گەڕەکی جولەکان نەمابوو. مایەر ئامسچێلّ و کوڕەکانی ماوەیەکی کەم دوای ئەوە بوونە خاوەنی

گەورەترین بانك لە ئەورووپای سەدەی نۆزدەیەم دا و لقیان لە فرانکفۆرت و لەندەن و پاریس و ناپۆلی و ڤیەنادا کردەوە.

ئەمەش رووداوێکی دابڕاو نەبوو. یەکەمجار سوپا شۆڕشگێڕەکانی فەڕەنسا و دواتریش ناپلیۆن چەندین ناوچەی فراوانی ئەورووپای داگیرکرد. ئەو دەزگایانەی لە ئارادا بوون لە هەموو ئەو ناوچانەی داگیریاندەکردن بە زۆری پاشماوەی چاخەکانی ناوەڕاست بوون و دەسەڵاتی پاشایان ومیران و نۆبڵانیان بەهێزکردبوو. بازرگانی ناو شاران و دەرەوەی شارانیان سنووردارکردبوو. بەندایەتی و فیودالیزم لە زۆربەی ئەم ناوچانەدا جێگەی بایەخی زیاتر بوون لە چاو فەڕەنسادا. لە ئەورووپای رۆژهەڵات دا، لەوانە پروسیا و بەشی هەنگاریای ئیمپرانۆریەتی نەمسا ـ هەنگاریا، بەندان بە زەوییەکانەوە بەسترابوونەوە. لە رۆژئاوا دا ئەم جۆرە بەندایەتییە توندە لە ئارادا نەمابوو، بەڵام رەنجدەران خرابوونە ژێر باری چەندین جۆرە باج و کرێ و کارکردنی بێگارییەوە لە لایەن لۆردە فیوداڵەکانەوە. بۆ نموونە، لە قەوارەی ناساوـ یوسینجن دا رەنجدەران خرابوونە ژێرباری ٢٣٠ شێوەی جیاوازی پارەدان و کرێ و خزمەتگوزارییەوە. یەکێك لەو باجانە بریتیبوو لەو پارەیەی کە دەبوایە دوای کوشتنەوەی ئاژەڵ بدرایە و پێیدەوترا باجی یەك لەسەر دەی خوێن و لە هەمانکات باجی یەك لەسەر دەی هەنگ و مێویش هەبوون. ئەگەر موڵکێك بفرۆشرایە یان بکڕایە، ئەوا دەبوایە پارە بدرایەتە لۆردەکە. ئەوسەندیکایانەی هەموو جۆرە چالاکییەکی ئابوورییان لە ناو شارەکان دا رێکخستبوو، لەم ناوچانەدا بەهێزتر بوون لەچاو فەڕەنسادا. لە شارەکانی رۆژئاوای کۆلۆن و ئاخن بەکارهێنانی ئامێرەکانی چنین و رستنی لۆکە لە لایەن سەندیکاکانەوە رێگریان لێکرا. چەندین شار، هەر لە بێرن لە سویسرا، تا فلۆرەنس لە ئیتالیا، لە لایەن چەند خێزانێکەوە کۆنترۆڵکرابوون.

سەرکردەکانی شۆڕشی فەڕەنسا و دواتریش ناپلیۆن شۆڕشیان بۆ ئەم ناوچانە گواستەوە و رەهاییان لەناوبرد و پەیوەندییەکانی فیوداڵی زەوییان کۆتاییپێهێنا و سەندیکاکانیان هەڵوەشاندەوەو یەکسانییان لەبەردەم یاسادا سەپاند ـ کە گرنگترین لایەنی سەروەریی یاسایە و لە چاپتەری داهاتوودا بە درێژی باسیدەکەین. لەبەر ئەوە شۆڕشی فەڕەنسا نەك تەنیا فەڕەنسا، بەڵکو زۆربەی ناوچەکانی تری ئەورووپای ئامادەکرد بۆ دەزگایانی کراوە و ئەو گەشە

ئابوورییەی ئەم دەزگایانە هێنایانەئاراوە.

هەروەك بینینمان، چەندین هێزی ئەورووپی، كە ئەم پەرەسەندنانەی فەڕەنسا تۆقاندبوونی، لە دەوری نەمسا كۆبوونەوە و لە ساڵی ۱۷۹۲ دا پەلاماری فەڕەنسایان دا، بە بیانووی ئازادكردنی لویس پاشای شازدەیەم، بەڵام لە راستیدا بۆ لەناوبردنی شۆڕشی فەڕەنسا بوو. چاوەڕوانییەكان بە جۆرێك بوون كە ئەو سوپا كاتییانەی لە لایەن شۆڕشگێڕانەوە خرابوونە بەرەكانی جەنگەوە هەر زوو تێكدەشكێنرێن، بەڵام دوای هەندێك شكستی سەرەتایی، سوپاكانی كۆماری نوێی فەڕەنسا سەركەوتوو بوون لە جەنگێك دا كە لەسەرەتادا تەنیا جەنگێكی بەرگری بوو. چەندین كێشەی ڕێكخراوەیی لە فەڕەنسادا هەبوون كە دەبوایە چارەسەربكرانایە، بەڵام فەڕەنسییەكان لە بواری چەندین نوێكاری سەرەكی دا لەپێش وڵاتانی ترەوە بوون. خزمەتی سەربازی ناچاریی كە لە ساڵی ۱۷۹۳ دا هێنرایەئاراوە، دەرفەتی دایە فەڕەنسییەكان تا سوپای گەورە ئامادەبكەن و پێشكەوتنە سەربازییەكان پەرەپێبدەن كە لە باڵادەستی تەواو نزیكیان بكاتەوە، تەنانەت پێش ئەوەی بەهرە بەناوبانگە سەربازییەكانی ناپلیۆن بێنە مەیدانەوە.

سەركەوتنە سەربازییە سەرەتاییەكان هانی سەركردەكانی كۆماری دا تا سنوورەكانی فەڕەنسا فراوانبكەن و چاویشیان خستە سەر دامەزراندنی ناوچەیەكی بەربەست لە نێوان كۆمارە نوێیەكەو پاشایەتییە دژەكانی پروسیا و نەمسا. هەر زوو فەڕەنسییەكان هۆڵەندای نەمسا و پارێزگا یەكگرتوەكانیان داگیركرد بەتایبەتی بەلجیكا و هۆڵەندای ئەمڕۆ. فەڕەنسا زۆربەی ناوچەكانی سویسرای ئەمڕۆیان داگیركرد. لەم سێ شوێنەدا فەڕەنسا لەماوەی ۱۷۹۰ كان دا دەسەڵاتی بەهێزی هەبوو.

لە سەرەتادا ململانێی توند لەسەر ئەڵمانیا هەبوو، بەڵام لە ساڵی ۱۷۹۵ دا، فەڕەنسا بە تەواوی كۆنترۆڵی راینلاندی كردبوو، كە بەشی ڕۆژئاوای ئەڵمانیایە و دەكەوێتە كەناری ڕۆژئاوای ڕووباری ڕاین. پروسیەكان بە پێی پەیمانی باسیل ناچاركران مل بۆ ئەم ڕاستیە بدەن. لە نێوان ساڵانی ۱۷۹۵ و ۱۸۰۲، ڕاینلاند لە بندەستی فەڕەنسا دا بوو، بەڵام ناوچەكانی تری ئەڵمانیا لە دەرەوەی دەسەڵاتی فەڕەنسییەكان دا مانەوە. لە ساڵی ۱۸۰۲ دا ڕاینلاند بە فەرمی تێهەڵكێشی فەڕەنسا كرا.

## نەخشەی (١٧): ئیمپراتۆریەتی ناپلیۆن




ئیتالیـا لـە مـاوەی نیـوەی دووەمـی سـاڵانی ١٧٩٠ ەکـان دا وەك مەیـدانی سەرەکی جەنگ مایەوە و نەمساش وەك بەرهەڵستکار. ساڤۆی لە سـاڵی ١٧٩٢ دا لایـەن فەڕەنـساوە داگیرکـراو خرایـە سـەر فەڕەنـسا و بارودۆخەکـە بـە چەقبەستوویی مایەوە تا داگیرکردنەکەی ناپلیۆن لـە نیسانی سـاڵی ١٧٩٦ دا. لە سەرەتای ساڵی ١٧٩٧ دا لە میانەی یەکەم هەڵمەتی سەرەکی لە ئـەورووپادا، ناپلیۆن نزیکەی هەموو باکووری ئیتالیای داگیرکرد جگە لە ڤێنس کە لـە لایـەن نەمساوییەکانەوە داگیرکرا. پەیمانی کامپۆ فۆرمیۆ کـە لـە سـاڵی ١٧٩٧ لەگـەڵ نەمسا مۆرکرا، جەنگی هاوپەیمانیی یەکەمی کۆتاییپێهێنا و دانی بـە ژمارەیـەك کۆمـاری بـاکووری ئیتالیـادا نـا کـە لـە لایـەن فەڕەنـساوە کۆنترۆڵکرابـوون. بەهـەرحاڵ، فەڕەنـسییەکان تەنانـەت دوای ئـەم پەیمانـەش بـەردەوامبوون لـە فراوانکردنی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ئیتالیادا و دەوڵەتەکانی پاپایی داگیرکـرد و لە ئازاری ساڵی ١٧٩٨ دا کۆماری ڕۆمایان دامەزراند. لە کانونی دووەمی ١٧٩٩

دا ناپۆلی داگیرکرا و کۆماری پارسنۆپیا دامەزرێنرا. جگە لە ڤێنس، کە لە بندەستی نەمسادا مایەوە، فەرەنسییەکان کۆنترۆڵی هەموو نیمچە دورگەی ئیتالیایان کرد چ بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ هەروەك لە حاڵەتی ساڤۆی دا یان لە ڕێگەی ئەو دەوڵەتانەی دایانمەزراندن، وەك کۆمارەکانی سیزئەلپاین و لیگۆریا و ڕۆما وپارسنۆپیا.

لە جەنگی هاوپەیمانیی دوەم دا لە نێوان سالآنی ١٧٩٨ و ١٨٠١ دا سەرکەوتن و شکستی زیاتر ڕوویاندا، بەلآم لە کۆتایی دا فەرەنسییەکان بە شێوەیەکی سەرەکی بالآدەستی خۆیان پاراست. سوپا شۆڕشگێڕەکانی فەرەنسا هەر زوو دەستیان بە ئەنجامدانی پرۆسەیەکی چاکسازی ڕادیکالی کرد لەو ناوچانەی داگیریان کردبوون و پاشماوەکانی بەندایەتی و پەیوەندییە فیوداڵییەکانی زەوی یان هەڵوەشاندەوە و یەکسانییان بەرامبەر یاسا سەپاند. پێگە و دەسەلآتی تایبەت لە پیاوانی ئاینی سەندرایەوە و سەندیکای ناوچە شارییەکان وەلاخران یان بەلایەنیکەمەوە زۆر لاواز بوون. ئەمە هەر زوو لە هۆڵەندای نەمسادا دوای داگیرکردنی لە لایەن فەرەنساوە لە ساڵی ١٧٩٥ دا جێبەجێکرا و بەهەمانشێوەش لە پارێزگا یەکگرتوەکان دا کە فەرەنسییەکان کۆماری باتاڤیایان تیادا دامەزراند و دەزگایانی سیاسی زۆر هاوشێوەی ئەوانەی فەرەنسایان تێدا دروستکرد. لە سویسراش باردۆخەکە هاوشێوەبوو، سەندیکاکان، سەرەڕای لۆردە فیوداڵەکان و کلیسا، تێکشکێنران و ئیمتیازە فیوداڵییەکان لابران و سەندیکاکان هەڵوەشێنرانەوە و دەستیان بەسەردا گیرا.

ئەوەی لە لایەن سوپا شۆڕشگێڕەکانی فەرەنساوە دەستپێکرا، بە شێوەیەك لە شێوەکان لە لایەن ناپلیۆنەوە بەردەوامی پێدرا. ناپلیۆن زۆر ئارەزوویدەکرد کە کۆنترۆڵی توندی ئەو ناوچانە بکا کە داگیریدەکردن. ئەمەش هەندێجار لە ڕێگەی ئەنجامدانی ڕێکەوتن بوو لەگەڵ نوخبە ناوخۆییەکان یان دانانی ئەندامانی خێزانەکەی خۆی یان کەسانی نزیکی وەك بەرپرسی ئەو شوێنانە، هەروەك لە کاتی دەسەلآتە کورتخایەنەکەی دا ڕووی دا لە ئیسپانیا و پۆلۆنیا. بەلآم ناپلیۆن ویستی ڕاستەقینەشی بۆ بەردەوامی و قوڵکردنەوەی چاکسازییەکانی شۆڕش هەبوو. لە هەمووی گرنگتر، ئەو یاسای ڕۆما و ئایدیاکانی یەکسانی بەرامبەر یاسا لە سیستەمێکی یاسایی دا ڕێکخست و دواتر بە سیستەمی ناپلیۆن ناسرا. ناپلیۆن وەك مەزنترین میراتی خۆی دەیڕوانیە ئەم سیستەمە و ویستی لە هەموو ئەو ناوچانەدا بیسەپێنێ کە داگیریکردن.

بێگومـان ئـەو چاکسازییانەی لـە لایـەن شۆڕشـی فەڕەنـسا و ناپلیۆنـەوە سەپێنران، وەنەبێ شیاوی گێڕانەوە بۆ دواوە نەبووبن. لە هەندێ جێگادا، وەك هانۆڤـەر لـە ئـەڵمانیا، ماوەیـەکی کـەم دوای نـەمانی نـاپلیۆن نوخبـە کۆنـەکان دانرانەوە و زۆربەی ئـەو دەسـکەوتانەی فەڕەنـسییەکان بەدەسـتیان هێنـابوون لەناوچـوون. بـەڵام لـە چـەندین جێگـای تـر دا، فیـودالیزم و سـەندیکاکان و نۆبڵەکان بە شێوەیەکی هەمیشەیی لەناوبران یان لاوازکران. بۆ نموونە، تەنانەت دوای ئـەوەی فەڕەنـسیەکانیش ڕۆیـشتن، لـە چـەندین حاڵـەت دا کاریگـەریی سیستەمە یاساییەکەی ناپلیۆن هەر مایەوە.

بە شێوەیەکی گشتی سوپاکانی فەڕەنسا مەینەتییەکی زۆریان لە ئەورووپادا دروستکرد، بـەڵام ئـەوان بارودۆخەکـەیان بـە شـێوەیەکی ڕادیکـاڵی گـۆڕی. لـە زۆربەی ئەورووپادا ئەوەی لەناوچوون بریتیبوون لە پەیوەندییـە فیودالییـەکان و دەسـەڵاتی سـەندیکاکان و کـۆنترۆڵی ڕەهـای پاشـایان ومـیران و دەسـتگرتنی پیـاوانی ئـاینی بەسـەر دەسـەڵاتی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و سیاسـی دا و هەڵتەکاندنی بناخـەی ڕژێمـی کـۆن کـە بەشـێوەی نایەکسان و لەسـەر بنـەمای پێگەی لە دایکبوون مامەڵەی لەگەڵ خـەڵك دا دەکـرد. ئـەم گۆڕانکارییانـە ئـەو جۆرە دەزگـا ئابوورییـە کراوانـەیان دروسـتکرد کـە دواتـر بـواری ڕەخـساند تـا بەپیشەسازیبوون لەو شوێنانەدا ڕەگ داکوتێ. بـە هـاتنی ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەیەم بەپیشەسازیبوون لە نزیکەی هەموو ئەو جێگایانەی لە ژێـر کـۆنترۆڵی فەڕەنسادا بوون بەخێرایی لـە بڵاوبونـەوەدا بـوو، لـە کاتێـك دا جێگـایـانی وەك نەمسا- هەنگاریا و ڕوسیا کە فەڕەنسا داگیری نەکردن و پۆڵۆنیا و ئیسپانیا کـە داگیرکردنیان لەلایەن فەڕەنساوە کاتی و سـنووردار بـوو، بـە زۆری لـە شـوێنی خۆیان چەقیانبەست.

## گەڕان بە دوای مۆدێرنێتی دا

لە پایزی سـاڵی ١٨٦٧ دا، ئۆکۆبـۆ تۆشیمیـچی، کـە کاربەدەسـتێکی بـاڵای ناوچەی دەسەڵاتی ساتسومای فیودالی یابانی بوو، لە ئیـدۆی پایتەختـەوە کـە تۆکیۆی ئەمڕۆیـە گەشـتیکرد بـۆ شـاری یاماگوچـی. لـە ١٤ تـشرینی یەکـەم دا لەگەڵ سەرکردەکانی ناوچـەی دەسەڵاتی چۆوشـۆ کۆبـۆوە. ئـەو پێـشنیازێکی ساکاری هەبوو: ئەوان هێزەکانیان یەکبخەن و سوپاکانیان بەرەو ئیدۆ بخەنەڕێ

و بنەماڵەی شۆگەن، فەرمانڕەوای یابان لەناوبەرن. ئۆکۆبۆ تۆشیمیچی بەر لەوە سەرکردەکانی ناوچەی دەسەلاتی تۆسا و ئاکای ڕازیکردبوو. کاتێک سەرکردەکانی چۆوشۆی بەهێزیش ڕازیبوون، هاوپەیمانی نهێنی ساتچۆ پێکهێنرا.

لە ساڵی ١٨٦٨ دا یابان لە ڕووی ئابوورییەوە وڵاتێکی دواکەوتوو بوو. لە ساڵی ١٦٠٠ ەوە لە لایەن بنەماڵەی تۆکۆگاوا کۆنترۆڵکرابوو کە فەرمانڕەواکانیان لە ساڵی ١٦٠٣ دا ناونیشانی شۆگەن (فەرماندە)یان لە خۆیان نابوو. ئیمپراتۆری یابان کەنارخرابوو، تەنیا ڕۆڵی تەشریفاتی بۆ مابۆوە. شۆگەنەکانی تۆکۆگاوا ئەندامانی باڵادەستی چینێکی لۆردی فیوداڵی بوون کە فەرمانڕەوایەتی ناوچەکانی ژێردەسەلاتی خۆیان دەکرد و باجیان لێوەردەگرتن، یەکێك لەو ناوچانەش ناوچەی دەسەلاتی ساتسوما بوو کە لە لایەن بنەماڵەی شیمازو فەرمانڕەواییدەکرا. ئەم لۆردانە بە هاوکاری سامۆرایی بەناوبانگ کە سەربازانی بەکرێگیراو بوون، کۆمەڵگایەکیان بەڕێوەدەبرد کە هاوشێوەی کۆمەڵگایانی ئەورووپای چاخەکانی ناوەڕاست و خاوەن کاتەگۆری پیشەیی توند و سنووردارکردنی بازرگانی و باجێکی زۆر لە سەر جووتیاران بوو. شۆگەن لە ئیدۆ وە فەرمانڕەواییدەکرد و لەوێدا مۆنۆپۆلی و کۆنترۆڵی بازرگانی دەرەکی کردبوو، هاتنی بیانیانی بۆ ناو وڵات قەدەخەکردبوو. دەزگایانی سیاسی و ئابووری چەوسێنەر بوون و یابان وڵاتێکی هەژار بوو.

لەگەڵ ئەمەش دا باڵادەستی شۆگەن سەرتاسەری نەبوو. هەرچەندە بنەماڵەی تۆکۆگاوا لە ساڵی ١٦٠٠ دا لە وڵات دا دەسەلاتیان گرتەدەست، نەیانتوانی کۆنترۆڵی هەموو لایەك بکەن. لە باشووری وڵاتەکەدا، ناوچەی ساتسوما بە شێوەیەکی نیمچە سەربەخۆ مایەوە و تەنانەت ڕێگایان پێدرا بە شێوەیەکی سەربەخۆ لەگەڵ جیهانی دەرەوە دا لە ڕێگەی دوورگەکانی ڕیۆکیۆ بازرگانیبکەن. لە کۆگۆشیمای پایتەختی ساتسوما دا بوو کە ئۆکوبۆ تۆشیمیچی لە ساڵی ١٨٣٠ دا لە دایك بووبوو. وەك کوڕی سامۆراییەك، ئەویش بوە سامۆرای. هەر زوو بەهرەکانی لە لایەن شیمازو ناریاکیرای لۆردی ساتسوما دەرکیپێکرا و لە کاری دەوڵەت دا بایەخیپێدا. لەو دەمەدا، شیمازو ناریاکیرا پلانێکی پێکەوەنابوو بۆ بەکارهێنانی سوپای ساتسوما بۆ لەناوبردنی شۆگەن. ئەو دەیویست پەرە بە بازرگانی بدا لەگەڵ ئاسیا و ئەورووپادا و دەزگا ئابوورییە

فیودالییە کۆنەکان هەڵبوەشێنرێنەوە و دەوڵەتێکی مۆدێرن لە یابان دا دابمەزرێنێ. پلانەکەی، بەهۆی مردنیەوە لە ساڵی ١٨٥٨ دا، سەرینەگرت. جێگرەوەکەی، شیمازو هیسامیتسۆ، بەلایەنیکەمەوە لەسەرەتادا، دوودڵ بوو.

ئۆکوبۆ تۆشیمیچی تا دەهات زیاتر دەگەیشتە ئەو بڕوایەی کە یابان پێویستی بە لەناوبردنی شۆگەنی فیودالی بوو، لە کۆتایی دا شیمازو هیسامیتسۆی بە ئەنجامدانی ئەم کارە ڕازیکرد. بۆ ئەوەی پشتگیری بۆ دۆزەکەیان بەدەستبهێنن، ئەم نیازەیان لە ناو نارەزایی لەسەر پشگوێخستنی ئیمپراتۆردا پێچایەوە. ئەو پەیمانەی ئۆکوبۆ تۆشیمیچی لەگەڵ دەسەلاتی تۆسا دا ئیمزای کردبوو، جەختی لەسەر ئەوە کردبوو کە ( ناکرێ وولاتێك دوو پاشای هەبێ وماڵێك دوو سەرۆك خێزانی هەبێ. حکومەت دەبێ لە لایەن فەرمانڕەوایەکەوە بەڕێوەببرێ). نیازی ڕاستەقینە گەڕانەوەی ئیمپراتۆر نەبوو بۆ سەر دەسەلات، بەڵکو بریتیبوو لە گۆڕینی تەواوەتی دەزگایانی سیاسی و ئابووری. یەکێك لەوانەی لە لایەن تۆساوە پەیمانەکەی ئیمزا کردبوو بریتیبوو لە ساکامۆتۆ ڕیۆما. کاتێك ساتسۆما و چۆشو خەریکی ئامادەکردنی سوپاکانیان بوون، ساکامۆتۆ ڕیۆما پلانێکی هەشت خاڵەی خستە بەردەم شۆگەن و بۆ دوورکەوتنەوە لە جەنگی ناوخۆ داوای دەستلەکارکێشانەوەی لێکرد. پلانەکە ڕادیکاڵ بوو، هەرچەندە بەندی یەکەمی پلانەکە داوایکرد کە (پێویستە دەسەلاتی سیاسی وولات بگەڕێنرێتەوە بۆ ئیمپراتۆریەت و هەموو بڕیارەکان لە لایەن ئیمپراتۆرەوە دەربکرێن)، بەلام ئەم پلانە زۆر زیاتر لە تەنیا گەڕانەوەی ئیمپراتۆری لەخۆگرتبوو. بەندی ٢ و٣ و ٤ و ٥ داوایکرد:

٢. پێویستە دوو ئەنجوومەنی یاسادانان، ئەنجوومەنێکی نوێنەران و ئەنجوومەنێکی پیران دابمەزرێن و پێویستە هەموو کارەکانی حکومەت لە بەر ڕۆشنایی ڕای گشتی دا ئەنجامبدرێن.

٣. پێویستە پیاوانی خاوەن توانا لە ناو لۆردەکان و نۆبڵەکان و خەڵکی گشتی دا وەك ڕاوێژکاران دابمەزرێنرێن و پێویستە فەرمانگە تەقلیدییەکانی ڕابووردوو کە ئامانجی خۆیان لە دەستداوە هەڵبوەشێنرێنەوە.

٤. پێویستە کاروباری دەرەوە بە پێی ڕێسا گونجاوەکان بەڕێوەببرێ و لەبەر ڕۆشنایی ڕای گشتی دا دابڕێژرێن.

٥. پێویستە یاسا و ڕیساکانی سەردەمی پێشوو وەلابخرێن و یاسای دروست و نویێ هەڵببژێررێن.

شۆگەن یۆشینۆبو ڕازیبوو دەستلەکار بکێشێتەوە و لە ٣ کانونی دوەمی ساڵی ١٨٦٨ دا گەڕانەوەی مەیجی ڕاگەیەنرا و ئیمپراتۆر کۆمێل و مانگێك دواتر، دوای مردنی ئەو، مەیجی کوڕی هێنرانەوە سەر دەسەلآت. هەرچەندە هێزەکانی ساتسوما و چۆشو، ئیدۆ و کیۆتۆی پایتەختی ئیمپراتۆریەتیان داگیرکردبوو، بەلآم ئەوان لەوە دەترسان کە تۆکۆگاواکان هەوڵی بەدەستهێنانەوەی دەسەلآت بدەن و حوکمی شۆگەنی دابمەزرێننەوە. ئۆکوبۆ تۆشیمیچی ویستی تۆکۆگاواکان بە یەکجاری لەناوببرێن. ئەو ئیمپراتۆری ڕازیکرد کە ناوچەی دەسەلآتی تۆکوگاوا هەڵبوەشێنێتەوە و دەستبگرێ بەسەر خاکەکەیان دا. لە ٢٧ کانونی دوەم دا شۆگەنی پێشووتر، یۆشینۆبو، هێرشیکردە سەر هێزەکانی ساتسۆما و چۆشو و جەنگی ناوخۆ دەستیپێکرد. جەنگەکە تا هاوین درێژەیکێشا و لە ئەنجامدا تۆکوگاواکان لەناوبران.

دوابەدوای گەڕانەوەی مەیجی، پرۆسەیەکی چاکسازی ئاڵوگۆڕکاری دەزگایی لە یابان دا دەستیپێکرد. لە ساڵی ١٨٦٩ دا فیودالیزم هەڵوەشێنرایەوە و ئەو سێسەد ناوچانەی بە کرێ درابوونە فیودالەکان درانەوە بەحکومەت و کرانە پارێزگا و خرانە ژێر کۆنترۆڵی پارێزگار کە لە لایەن حکومەتەوە دیاریکران. وەرگرتنی باج کرایە مەرکەزی و دەوڵەتێکی مۆدێرنی بیروکراتی جێگای دەوڵەتە کۆنە فیودالییەکەی گرتەوە. لە ساڵی ١٨٦٩ دا یەکسانی هەموو چینە کۆمەلآیەتییەکان بەرامبەر یاسا ڕاگەیەنرا و تەگەرەی بەردەم کۆچی ناوخۆیی و بازرگانی هەڵگیران. چینی سامۆرای هەڵوەشێنرایەوە، هەرچەندە ئەمە بەبێ دامرکاندنەوەی هەندێك یاخیبوون ئەنجامنەدرا. مافی مۆڵکداری زەوی تاکەکەس خرایەگەڕ و خەڵك سەربەستکران لە بەشداری و ئەنجامدانی هەموو جۆرە بازرگانییەك. دەوڵەت بە قورسی کەوتە دروستکردنی ژێرخان. بە پێچەوانەی هەڵوێستی ڕژێمە ڕەهاکان بەرامبەر ڕێگای ئاسنین، لە ساڵی ١٨٦٩ حکومەتی یابان هێڵێکی شەمەنەفەری هەڵمی لە نێوان تۆکیۆ و ئۆساکا دا دروستکرد و یەکەم ڕێگای ئاسنینی لە نێوان تۆکیۆ و یۆکۆهاما دا دروستکرد. حکومەت دەستیکرد بە پەرەپێدانی پیشەسازی. ئۆکوبۆ تۆشیمیچی وەك وەزیری دارایی سەرپەرشتی سەرەتای هەوڵە بەردەوامەکانی بەپیشەسازیبوونی

کرد. لۆردی ناوچەی ساتسوما لەم بوارەدا پیشەوا بوو. ئەو کارگەی کەلوپەلی گڵێنە و تۆپ و بەنی خوری دروستکرد و دەستیکرد بە هاوردەکردنی ئامێری دروستکردنی قوماش لە ئینگلتەرە و بۆ دروستکردنی یەکەم کارگەی ڕستنی مۆدێرن لە یابان دا لە ساڵی ١٨٦١ دا. هەر ئەو دوو شوێنی مۆدێرنی دروستکردنی کەشتی دامەزراند. بە هاتنی ساڵی ١٨٩٠ یابان یەکەم وولاتی ئاسیایی بوو کە دەستوورێکی نوسراوی پەسندکرد و پاشایەتیەکی دەستووریی شانبەشانی پەرلەمانێکی هەڵبژێراو کە دایەت بوو لەگەڵ سیستەمی دادوەریی سەربەخۆی دامەزراند. ئەم گۆڕانکارییانە فاکتەری یەکلاکار بوون کە توانایان بەخشییە یابان تا سوودمەندی سەرەکی شۆڕشی پیشەسازی بێ لە ئاسیادا.

لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەم دا چین و یابان دوو نەتەوەی هەژار بوون و لە بندەستی ڕژێمانی ڕەها دا شەکەت بووبوون. ڕژێمە ڕەهاکەی چین بۆ چەندین سەدە بە گومانەوە سەیری گۆڕانکاری دەکرد. هەرچەندە چەندین لێکچوون لە نێوان یابان و چین دا هەبوو، شۆگەنەکانی تۆکۆگاوا لە ماوەی سەدەی حەڤدەیەم دا بازرگانی دەرەوەیان قەدەغەکردبوو، بەهەمانشێوەی ئیمپراتۆرەکانی چین کە لەوەبەر کردبوویان و دژی گۆڕانکاری ئابووری وسیاسی بوون، بەلام لە هەمانکات دا جیاوازی سیاسی بەرچاو لە نێوانیان دا هەبوو. چین ئیمپراتۆریەتێکی بیروکراسی خاوەن مەرکەزیەت و لە لایەن ئیمپراتۆرێکی ڕەهاوە حوکمدەکرا. بێگومان جڵەوگیری لەسەر دەسەلاتی ئیمپراتۆر هەبوو، لە هەمووشیان گرنگتر بریتیبوو لە هەڕەشەی یاخیبوون. لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٨٥٠ و ١٨٦٤ سەراپای باشووری چین بەهۆی یاخیبوونی تایپینگ وێرانکرا کە لە ئەنجامدا ملیۆنان کەس بەهۆی ململانێکەوە، یان لە برسان دا، لەناوچوون. بەلام بەرهەڵستیکردنی ئیمپراتۆر نەخرابوە چوارچێوەی دەزگاییەوە.

پێکهاتەی دەزگایانی سیاسی یابان جیاواز بوو. هەرچەندە شۆگەنەکان ئیمپراتۆریان کەنارخستبوو، بەلام هەروەك بینیمان، دەسەلاتی تۆکوگاوا ڕەها نەبوو، ناوچەی دەسەلاتی هاوشێوەی ساتسوما، سەربەخۆیی خۆی پاراست و تەنانەت توانای ئەنجامدانی بازرگانی دەرەکی لە لایەن خۆیانەوە هەبوو.

هەروەك فەڕەنسا، ئاکامێکی گرنگی شۆڕشی پیشەسازی بەریتانی بۆ چین و یابان بریتیبوو لە لاوازیی سەربازی. چین لە لایەن هێزی دەریایی بەریتانییەوە

له میانەی جەنگی یەکەمی ئۆپیۆم دا لە نێوان ساڵانی ١٨٣٩ و ١٨٤٢ ڕسوا کرا و هەمان هەڕەشەش بۆ سەر یابان بوە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر، کاتێك کەشتییە جەنگیەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان بە فەرماندەیی کۆمۆدۆر ماسیو پێری لە ساڵی ١٨٥٣ دا چوونە ناو کەنداوی ئیدۆ. ڕاستی ئەوەی کە دواکەوتنی ئابووری دواکەوتنی سەربازی دروستکردبوو یەکێك بوو لە پاڵنەرەکانی پشت پلانەکەی شیمازو ناریاکیرا بۆ نەهێشتنی شۆگەنی و وەگەڕخستنی ئەو گۆڕانکارییانەی لە ئەنجامدا بوونە هۆی گێڕانەوەی مەیجی. سەرکردەکانی ناوچەی ژێردەسەڵاتی ساتسوما دەرکیان کردبوو کە گەشەکردنی ئابووری ـ ڕەنگە تەنانەت مانەوەی یابان ـ تەنیا لە ڕێگەی چاکسازی دەزگاییەوە دێتەدی. شۆگەن دژی ئەمە بوو چونکە دەسەڵاتەکەی بەسترابۆوە بەو کۆمەڵە دەزگایانەی لە ئارادا بوون. بۆ ئەنجامدانی چاکسازی، دەبوایە شۆگەن لە فەرمانڕەوایی لابرایە و هەر واش بوو. بارودۆخەکەی چین هاوشێوە بوو، بەڵام بوونی دەزگایانی سیاسی جیاواز لە سەرەتادا کاری لابردنی ئیمپراتۆری زۆر زەحمەت تر کرد، ئەمەش تەنیا لە ساڵی ١٩١١ ئەنجامدرا. لە بری ئەنجامدانی ڕیفۆرم لە دەزگاکان دا، چینیەکان هەوڵیاندا خۆیان بهێننە هاوتای توانای سەربازی بەریتانیاوە لە ڕێگەی هاوردەکردنی چەکی نوێ. یابانیەکان پیشەسازی چەك دروستکردنی خۆیان دامەزراند.

وەك ئاکامی ئەم جیاوازییە سەرەتاییانە، هەریەك لەم دوو وڵاتە بە شێوەیەکی جیاواز بە پیر تەحەداکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە چوون و یابان و چین بە شێوەیەکی دراماتیکی لە کاتی ئەو وەرچەرخانە مێژووییەی شۆڕشی پیشەسازی دروستیکرد، لە یەکتر دوورکەوتنەوە. لە کاتێك دا دەزگاکانی یابان ئاڵوگۆریان بەسەردا دەهات و ئابووری کەوتبوە سەر ڕێچکەیەکی گەشەکردنی خێرا، لە چین دا ئەو هێزانەی هەوڵی گۆڕانکاری دەزگاییان دەدا وەك پێویست بەهێز نەبوون و دەزگایانی چەوسێنەر بێپسانەوە بەردەوامبوون تا سورێکی خراپتریان خوارد لە کاتی شۆڕشی کۆمیۆنیستی ماو دا لە ساڵی ١٩٤٩ دا.

# ڕیشەکانی نا یەکسانی لە جیهان دا

ئەم چاپتەرە و سێ چاپتەرەکەی پێشووتر چیرۆکی سەرهەڵدانی دەزگایانی سیاسی وئابووری کراوەیان گێڕایەوە لە بەریتانیا دا تا ڕێگای ڕوودانی شۆڕشی پیشەسازی خۆش بکەن و باسی ئەوەشیانکرد کە بۆچی هەندێك وولاتی دیاریکراو سوودیان لە شۆڕشی پیشەسازی وەرگرت و کەوتنە سەر ڕێچکەی گەشەکردن، لە کاتێك دا ئەوانی تر ئەمەیان نەکرد و لە ڕاستیدا تەنانەت بە شێوەیەکی بەردەوام ڕەتیانکردەوە دەستبکەن بەپیشەسازیبوون. ئەگەر وولاتێك دەستی بە پیشەسازیبوون کردبێ یان نا، بەزۆری پەیوەندی بە دەزگاکانییەوە هەبوو. ویلایەتە یەکگرتوەکان کە بە ئاڵوگۆڕێکی هاوشێوەی شۆڕشی شکۆداری ئینگلتەرەدا تێپەڕی، بە هاتنی کۆتایی سەدەی هەژدەیەم مۆدیلی تایبەت بەخۆی لە دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوە پەرەپێدا بوو. هەر بۆیە بوە یەکەم نەتەوە کەڵك لەو تەکنەلۆجییە نوێیانە وەربگرێ کە لە دوورگەکانی بەریتانیاوە هاتن و هەر زووش پێش بەریتانیا کەوتەوە و بوە پێشەنگی بەپیشەسازیبوون و گۆڕانکاری تەکنەلۆجی. ئوستراليا ڕێچکەیەکی هاوشێوەی بەرەو دەزگایانی کراوە گرتەبەر، هەرچەندە کەمێك دواتر و کەمتر بەرچاو بوو. هاوڵاتییانی ئوستراليا بەهەمانشێوەی ئەوانەی ئینگلتەرە و ویلایەتە یەکگرتوەکان، پێویست بوو شەڕ بۆ بەدەستهێنانی دەزگایانی کراوە بکەن. کاتێك ئەم دەزگایانە هاتنەئاراوە، ئوستراليا دەستی بە پرۆسەی گەشەکردنی ئابووری خۆی کرد. ئوستراليا و ویلایەتە یەکگرتوەکان توانیان ببنە وولاتانی پیشەسازی و بە خێرایی گەشەبکەن چونکە دەزگا کراوە ڕێژەییەکانیان ڕێگر نەبوون لەبەردەم تەکنەلۆجی نوێ و نوێکاری دا، یان تێکدانی بنیاتنەر دا.

لە زۆربەی کۆلۆنییە ئەورووپییەکانی تردا بەم شێوەیە نەبوو. داینەمیکی ئەوان زۆر پێچەوانەی داینەمیکی ناو ئوستراليا و ویلایەتە یەکگرتوەکان بوون. نەبوونی دانیشتوانی خۆماڵی یان دەرامەتێك کە زەوتبکرێ، بوونە هۆی ئەوەی کە بەکۆلۆنیکردن لە ئوستراليا و ویلایەتە یەکگرتوەکان دا مەسەلەیەکی تەواو جیاواز بێ، هەرچەندە پێویست بوو هاوڵاتییانی ئەم وولاتانەش شەڕی سەخت بکەن بۆ بەدەستهێنانی مافە سیاسییەکانیان و دەزگایانی کراوە. لە مۆلۆکاس و چەندین جێگای تری ئاسیا دا کە ئەورووپییەکان کردنیاننە کۆلۆنی، لە کاریبی

و باشووری ئەمەریکا دا، هاوڵاتییان هەلی کەمیان لەبەردەم دا بوو بۆ بردنەوەی ئەم شەڕە. لەم جێگایانەدا، کۆلۆنیستە ئەوروپییەکان شێوازێکی نوێی دەزگایانی چەوسێنەریان بەسەر خەڵك دا سەپاند، یان دەستیانگرت بەسەر هەر جۆرە دەزگایەکی چەوسێنەر کە دەیاندۆزیەوە، بۆ ئەوەی بتوانن دەرامەتە بەنرخەکان زەوتبکەن هەر لە بەهارات و شەکرەوە تا دەگەیشتە زیو و ئاڵتوون. لە چەندین لەم جێگایانەدا کۆمەڵە گۆڕانکارییەکی دەزگایی ئەوتۆیان خستەگەڕ کە سەرهەڵدانی دەزگایانی کراوەیان زۆر ئەستەمکرد. لە هەندێك لەم جێگایانەدا، بە ئاشکرا، هەرچی چەکەرەی پیشەسازی یان دەزگایانی ئابووری کراوە هەبوون لەناویانبردن. زۆربەی ئەم شوێنانە لە بارودۆخێکی ئەوتۆدا نەبوون کە بتوانن لە سەدەی هەژدەیەم و تەنانەت لە سەدەی بیستەمیش دا سوود لە بەپیشەسازیبون وەربگرن.

داینەمیکی ناو وڵاتانی تری ئەوروپاش زۆر جیاواز بوون لەوانەی لە ئوستراليا و ویلایەتە یەکگرتوەکان دا هەبوون. کاتێك شۆڕشی پیشەسازی لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم دا لە بەریتانیادا تاویدەسەند، زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا لە لایەن ڕژێمانی ڕەهاوە فەرمانڕەواییدەکران و لە لایەن پاشا و ئەریستۆکراتەکانەوە کۆنترۆڵکرابوون کە سەرچاوەی سەرەکی داهاتیان زەویوزارەکانیان یان ئیمتیازە بازرگانییەکانیان بوون کە بەهۆی ڕێگرتن لە بەشداربوونی خەڵکی تر لەو بازرگانیانەدا دەستیانکەوتبوو. ئەو تێکدانە بنیاتنەرەی کە پرۆسەی بەپیشەسازیبوون لەگەڵ خۆی دا دەیهێنا، دەبوە پوکانەوەی قازانجە بازرگانییەکانی سەرکردەکان و دەرامەت و هێزی کاری لە زەوییەکانیان دووردەخستەوە. ئەریستۆکراتەکان دەبوونە دۆڕاوی ئابووری پرۆسەی بەپیشەسازیبوون. لەوەش گرنگتر، ئەوان دەشبوونە دۆڕاوی سیاسی، چونکە پرۆسەی بەپیشەسازیبوون بێگومان ناسەقامگیری دروستدەکرد و تەحەدای سیاسی، بەرامبەر مۆنۆپۆلیکردنی دەسەڵاتی سیاسی لە لایەن ئەوانەوە، دەهێنایەئاراوە.

گواستنەوەی دەزگایی لە بەریتانیا و شۆڕشی پیشەسازی لەو وڵاتەدا، دەرفەت و تەحەدای نوێی بۆ دەوڵەتانی ئەوروپی دروستکرد. هەرچەندە ڕەهایی لە ئەوروپای ڕۆژئاوادا هەبوو، بەڵام ناوچەکە هاوبەش بوو لە زۆرێك لەو لێکترازانە دەزگاییانەی لە هەزارەی پێشتردا کاریان لە بەریتانیا کردبوو. بەڵام بارودۆخەکە لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و چین دا زۆر

جیاواز بوو. ئەم جیاوازییانە گرنگ بوون بۆ بڵاوبوونەوەی بەپیشەسازیبوون. بەهەمانشێوەی مردنی ڕەش و پەیدابوونی بازرگانی ئەتڵەسی، ئەو وەرچەرخانە مێژووییەی بەهۆی بەپیشەسازیبوون هاتەئاراوە ئەو ململانێیە هەمیشە ئامادەیەی ناو چەندین نەتەوەی ئەورووپی کە لەسەر دەزگاکان هەبوو، توندکردەوە. فاکتەرێکی سەرەکی شۆڕشی فەرەنسای ساڵی ١٧٨٩ بوو. کۆتاییهاتنی ڕەهایی لە فەرەنسادا ڕێگای بۆ دەزگایانی کراوە کردەوە و لە ئاکامدا فەرەنسا دەستیکردبە بەپیشەسازیبوون و گەشەکردنی خێرای ئابووری. لە ڕاستیدا شۆڕشی فەرەنسی لەوەش زیاتریکرد. شۆڕشەکەی خۆی، لە ڕێگەی داگیرکردن و بەزۆر ڕیفۆرمکردنی دەزگایانی چەوسێنەری چەندین وولاتانی دراوسێ، هەناردەکرد بۆ دەرەوە. بەم جۆرە فەرەنسا ڕێگای بۆ بەپیشەسازیبوون کردەوە نەك تەنیا لە فەرەنسادا، بەڵکو لە بەلجیکا و هۆڵەندا و سویسرا و هەندێك بەشی ئەڵمانیا و ئیتالیا دا. زیاتر بەرەو ڕۆژهەڵات، کاردانەوەکە هاوشێوەی کاردانەوەی دوای مردنی ڕەش بوو، لەبری تێشکان، فیودالیزم خەستبۆوە. نەمسا - هەنگاریا و ڕوسیا و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ڕووی ئابوورییەوە دواتر کەوتن، بەڵام پاشایەتییە ڕەهاکانیان توانیان تا یەکەم جەنگی جیهانی بمێننەوە.

لە شوێنەکانی تری جیهان دا، ڕەهایی هێندەی ئەورووپای ڕۆژهەڵات توانای مانەوەی هەبوو. ئەمەش بەتایبەتی لە چین دا ڕاست بوو، کە ماوەی گواستنەوەی مینگ - کینگ بوە هۆی سەرهەڵدانی دەوڵەتێك کە پابەندبوو بە دروستکردنی کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵی جێگیر و ناحەز بە بازرگانی نێودەوڵەتی. بەڵام لە هەمانکات دا جیاوازی دەزگایی لە ئاسیادا هەبوو کە کاریگەرییان هەبوو. ئەگەر چین بەهەمانشێوەی ئەورووپای ڕۆژهەڵات بە پیر شۆڕشی پیشەسازییەوە چووبێ، ئەوا یابان بە هەمانشێوەی ئەورووپای ڕۆژئاوا بە پیر ئەم شۆڕشەوە چوو. هەروەك لە فەرەنسا دا، شۆڕشێك بەرپاکرا بۆ گۆڕینی سیستەمەکە، ئەمجارە شۆڕشێك بوو لە لایەن لۆردەکانی ساتسۆما و چۆشۆ و تۆسۆ و ئاکای سەرکردایەتیکرا کە لە نەریتی خۆیان هەڵگەڕانەوە. ئەم لۆردانە شۆگەنیان لە ناوبرد و مەیجی یان گێڕایەوە و یابانیان خستە سەر ڕێچکەی چاکسازی دەزگایی و گەشەکردنی ئابووری.

ئێمە بینیمان کە ڕەهایی لە ئەسیوپیای دابڕاودا بەرگەیگرت. لە شوێنەکانی تری کیشوەرەکەدا، هەمان ئەو هێزەی بازرگانی نێودەوڵەتی کە هاوکاری

ئەنجامدانی ئاڵوگۆڕی کرد لە دەزگاکانی ئینگلتەرەدا لە سەدەی حەڤدەیەم دا، ناوچەی فراوانی ڕۆژئاوا و ناوەڕاستی ئەفریقای لە ڕێگای بازرگانی کۆیلانەوە خزاندە ناو دەزگایانی یەکجار چەوسێنەرەوە. ئەمەش لە هەندێك جێگا دا کۆمەڵگاکانی هەڵتەکاندن و لە جێگایانی تردا بوە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتانی چەوسێنەری کۆیلان.

ئەو داینەمیکیە دەزگاییانەی باسمانکردن، لە کۆتایی دا بڕیاردەر بوون لەسەر ئەوەی کام وولاتانە سوودیان لەو دەرفەتە سەرەکییانە وەرگرت کە لە سەدەی نۆزدەیەم بەدواوە هاتنەئاراوە و کام وولاتانە لەوەدا شکستیانهێنا. ڕیشەکانی نایەکسانی جیهانی کە ئەمڕۆ دەیبینین، لەم لێکجیابوونەوەیەوە سەرچاوەیانگرتوە. جگە لە چەند حاڵەتێك، وولاتانی دەوڵەمەندی ئەمڕۆ ئەو وولاتانەن کە دەستیان بە پرۆسەی بەپیشەسازیبوون و گۆڕانکاری تەکنەلۆجی کرد کە لە سەدەی هەژدەیەمەوە دەستیپێکرد و وولاتانی هەژاریش ئەو وولاتانەن کە دەستیان بەم پرۆسەیە نەکرد.

# ۱۱

# بازنەی بەختەوەری
## (The Virtuous Circle)

## یاسای ڕەشپێستان

قەڵای وینزەر، کە کەوتۆتە ڕۆژئاوای لەندەن، یەکێکە لە شوێنە مەزنەکانی نیشتەجێبوونی خێزانی پاشایەتی ئینگلتەرە. لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەم دا، قەڵاکە بە دارستانێکی گەورە دەورە درابوو کە پڕبوو لە ئاسک، هەرچەندە ئێستا زۆر کەم لەم دارستانە ماوەتەوە. یەکێك لە پاسەوانەکانی دارستانەکە لە ساڵی ۱۷۲۲ دا، ڕاهیبێکی باپتیستی بوو کە تووشی کێشەیەکی قورس بوو. ئەو لە یاداشتی ڕۆژانەی خۆی دا لە ۲۷ ی حوزەیران دا نووسیویەتی:

*(ڕەشپێستەکان شەو هاتن و سێ فیشەکیان پێوەنام، دوو لە گوللەکان بەر پەنجەرەکەم کەوتن و منیش ڕازیبووم لە ۳۰ مانگ دا لە کراوسرۆن ٥ گینی یان بدەمێ).*

لە تۆمارێکی تری یاداشتەکانی دا ڕاهیبەکە ئاماژەیداوە ( *مێرشێکی لە ناکاوی نوێ، یەکێك کە خۆی گۆڕیبوو، بە پەیامێکی تێکدەرانەوە پەیدابوو)*

ئایا ئەم ڕەشپێستە نامۆیانە کێبوون هەڕەشەیان دەکرد و تەقەیان لە ڕاهیب دەکرد و داوای پارەیان دەکرد؟ ڕەشپێستەکان کۆمەڵێك پیاوی ناوچەکە بوون کە دەموچاوی خۆیان "ڕەشکردبوو" تا لە شەودا نەناسرێنەوە. ئەوان لەم سەردەمەدا بە فراوانی لە باشووری ئینگلتەرەدا بڵاوبوونەوە و کەوتنە کوشتنی ئاسك و ئاژەڵانی تر و سووتاندنی شارای خەلەو کادانەکان و تێکدانی پەرژین و گۆمی ماسی. بە تێڕوانینێکی ڕوکەشانە، ئەم کارانە کاری یاساشکێنی ڕووت بوون، بەڵام وانەبوو. ڕاوی قاچاخی ئاسك لەو زەوییانەدا کە موڵکی پاشا یان ئەندامانی تری چینی ئەریستۆکراسی بوون، زۆر لە مێژبوو ئەنجامدەدرا. لە کاتی جەنگی ناوخۆی ساڵانی ۱٦٤۰ کان دا، سەراپای ئاسکەکانی قەڵای وینزەر

کوڕان. له دوای ئاوەدانکردنەوەی قەڵاو دارستانەکە لە ساڵی ١٦٦٠ دا، کاتێك چارڵسی دوەم هاتەسەرتەخت، دارستانەکە پڕکرایەوە لە ئاسك. ڕەشپێستەکان لەو زەوییانەدا ڕاویان نەدەکرد تەنیا بۆ خواردنی گۆشت، ئەوان خەریکی تێکدانی سەرکێشانە بوون. ئایا بە چ مەبەستێك ئەمەیان دەکرد؟

کۆڵەکەیەکی گرنگی شۆڕشی شکۆداری ساڵی ١٦٨٨ بریتیبوو لە سروشتی پلورەلیستی ئەو بەرژەوەندییانەی لە ناو پەرلەمان دا نوێنەرایەتییان دەکرا. هیچ یەکێك لە بازرگان و خاوەن پیشەسازی و زەویدارەکان یان ئەریستۆکراتەکان کە لە لەگەڵ ویلیام ئۆف ئۆرەنج دا و دواتریش لەگەڵ پاشاکانی هانۆڤەر دا، کە جێگەی شازن ئانیان لە ساڵی ١٧١٤ دا گرتەوە، هاوپەیمان بوون، هێندە بەهێز نەبوون کە بتوانن خۆاستەکانی خۆیان بەتەنیا بسەپێنن.

هەوڵەکان بۆ گێڕانەوەی پاشایەتی ستوارت لە زۆربەی ماوەکانی سەدەی هەژدەیەم دا بەردەوامبوون. لە دوای مردنی جەیمسی دوەم لە ساڵی ١٧٠١ دا، کوڕەکەی، جەیمس فرانسیس ئێدوارد ستوارت، " تەختخوازی کۆن" لە لایەن فەڕەنساو ئیسپانیا و پاپا و لایەنگرانی پاشایەتی ستوارتەکان لە ئینگلتەرە و سکۆتلەندە کە پێیان دەوترا جاکوبیەکان، وەك میراتگری یاسایی تاجی ئینگلتەرە دانی پێدانرا. لە ساڵی ١٧٠٨ دا تەختخوازی کۆن هەوڵی دا بە هاوکاری سوپای فەڕەنسی تەختی پاشایەتی وەربگرێتەوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. لە دەیەکانی دواتردا چەندین ڕاپەڕینی جاکوبیەکان بەرپاکران، لەوانە ڕاپەرینە سەرەکییەکانی ساڵانی ١٧١٥ و ١٧١٩. لە ساڵانی ١٧٤٥ و ١٧٤٦ دا کوڕی تەختخوازی کۆن، چارڵس ئێدوارد ستوارت "تەختخوازی نوێ" هەوڵی بەدەستهێنانەوەی تەختی پاشایەتی دا، بەڵام هێزەکانی لەلایەن سوپای بەریتانیاوە تێشکێنران.

حیزبی سیاسی ویگ کە لە ساڵانی ١٦٧٠ کان دا دامەزرا بۆ نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندییە بازرگانی و ئابوورییەکان، سەرەکیترین ڕێکخراو بوو لە پشت شۆڕشی شکۆدارەوە و ئەندامانی ویگ هەر لە ساڵی ١٧١٤ ەوە بۆ ساڵی ١٧٦٠ کۆنترۆڵی پەرلەمانیان کرد. کاتێك دەسەڵاتیان گرتەدەست، ئەوانیش ویستیان پێگە نوێکەی خۆیان بۆ پێشێلکردنی مافی خەڵکی تر بەکاربهێنن و ببنە خاوەنی کێکەکە و لە هەمانکاتیشدا هەر بۆخۆیان بیخۆن.

ئەوان جیاوازییان لەگەڵ پاشا ستوارتەکان دا نەبوو، بەڵام دەسەڵاتیان زۆر کەمتر بوو لەوەی ببنە دەسەڵاتێکی ڕەها. دەسەڵاتیان جڵەوگیریدەکرا، لە لایەکەوە، لە لایەن گروپە ڕکابەرەکانی ناو پەرلەمان، بەتایبەتی لە لایەن حیزبی تۆرییەوە کە بۆ بەربەرەکانی حیزبی ویگ دامەزرابوو، لە لایەکی ترەوە، لە لایەن ئەو دەزگایانەی کە خودی ویگەکان خەباتیان بۆ دامەزراندنیان کردبوو بۆ بەهێزکردنی پەرلەمان و ڕێگرتن لە سەرهەڵدانی ڕەهاییەکی نوێ و گەڕانەوەی ستوارتەکان. سروشتی پلورەلیستی ئەو کۆمەڵگایەی دوای شۆڕشی شکۆدار هاتەئاراوە، مانای ئەوە بوو کە دانیشتوان بە گشتی، تەنانەت ئەوانەشی کە لە پەرلەمان دا نوێنەرایەتییان نەدەکرا، هێزدار کرابوون و "ڕەشکردن"ەکەش کوتومت کاردانەوەی خەڵکی ئاسایی بوو بەرامبەر ئەوەی کە گوایە ویگەکان کەڵکی خراپیان لە پێگەکەیان وەردەگرت.

مەسەلەی ویلیام کادۆگان، جەنەراڵێکی سەرکەوتووی جەنگی جیابوونەوەی ئیسپانیا لە نێوان ساڵانی ١٧٠١ و ١٧١٤ دا و دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکانی جاکوبیەکان، پێشێلکردنی مافەکانی خەڵکی ئاسایی لە لایەن ویگەکانەوە کە بوە هۆی سەرهەڵدانی "ڕەشکردن"، ڕوونده‌کاتەوە. جۆرجی یەکەم لە ساڵی ١٧١٦ دا کادۆگانی کردە بارۆن و دواتریش لە ساڵی ١٧١٨ دا کردییە ئێرڵ. ئەو لە هەمانکات دا، ئەندامێکی کاریگەری ئەنجوومەنی لۆرداتی پێسپێراوی تەخت بوو کە سەرپەرشتی کاروبارە گرنگەکانی دەوڵەتی دەکرد و بە وەکالەت فەرماندەی گشتیش بوو. ئەو موڵکێکی گەورەی لە کاڤێرشام کڕی کە نزیکەی هەزار ئەیکەر دەبوو، بیست میل لە ڕۆژئاوای وینزەر دووربوو. لەوێدا خانویەکی گەورەی دروستکرد و باخچەی ڕازاندەوە و پارکێکی ٢٤٠ ئەیکەری پڕ لە ئاسکی دروستکرد. ئەم موڵکە لە ڕێگەی پێشێلکرنی مافی ئەوانەی لە دەوری کۆشکەکە دەژیان، فراوانکرا. خەڵك دەرکران و مافی لە مێژینەیان بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵ و کۆکردنەوەی چیلکە و داری سووتاندن هەڵوەشێنرایەوە. کادۆگان، ڕووبەڕووی تووڕەیی ڕەشپێستەکان بۆوە. لە ١ کانونی دوەمی ساڵی ١٧٢٢ و دیسانەوە لە تەمووز هەمان ساڵ دا پارکەکە لە لایەن ڕەشپێستانی ڕێکخراو و چەکدارەوە هێرشکرایە سەری. لە یەکەم هێرش دا شازدە ئاسك کوژران. ئێرل کادۆگان بە تەنیا نەبوو. کۆشکی چەندین کەسانی زەویدار و سیاسی بەرچاو لە لایەن ڕەشپێستەکانەوە هێرشکرایە سەریان.

حکومەتی ویگ بەرامبەر بەمە دەستەوسان نەوەستا. لە مانگی مایسی ١٧٢٣ دا، پەرلەمان یاسای ڕەشپێستانی دەرکرد و یاساکە پەنجا تاوانی نوێی هێنایەئاراوە کە سزاکانیان هەڵواسین بوو. یاسای ڕەشپێستان نەک تەنیا هەلگرتنی چەکی کردە تاوان بەڵکو ڕەشکردنی دەموچاویش. لە ڕاستیدا یاساکە هێندەی پێنەچوو هەموارکرایەوە و سزای ڕەشکردنی دەموچاویشی کردە هەڵواسین. نوخبەکانی ویگ بە خۆشحاڵییەوەکەوتنە جێبەجێکردنی یاساکە. ڕاهیبە باپتیستەکە تۆڕێکی سیخوڕیی لە دارستانی وینزەر پێکەوەنا بۆ ئاشکراکردنی ناسنامەی ڕەشپێستەکان. زۆری پێنەچوو چەندین کەس گیران. دەبوایە گواستنەوە لە گرتنەوە بۆ هەڵواسین مەسەلەیەکی ڕاستوڕەوان بوایە چونکە یاسای ڕەشپێستان خرابوە بواری جێبەجێکردنەوە و ویگەکان لە پەرلەمان دا باڵادەست بوون و پەرلەمانیش بەرپرسی وولات بوو، ڕەشپێستەکانیش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی هەندێك لە ویگە دەسەڵاتدارەکان ڕەفتاریاندەکرد. تەنانەت سێر ڕۆبەرت ۆڵپۆڵ کە وەزیری دەرەوە و دواتریش سەرۆك وەزیران و ـ وەك کادۆگان، ئەندامێکی کاریگەری ئەنجوومەنی لۆرداتی پێسپێراوی تەخت بوو ـ بەشدار بوو. سێر ڕۆبەرت بەرژەوەندی لە پارکی ڕیچمۆند لە باشووری ڕۆژئاوای لەندەن دا هەبوو، کە لە ئەنجامی بەکارهێنانی زەوی گشتییەوە لە لایەن چارڵسی یەکەمەوە دروستکرابوو. ئەم پارکەش مافی لەوەڕاندنی ئاژەڵان و ڕاوکردنی کەروێشك و کۆکردنەوەی داری سووتاندنی لە لایەن دانیشتوانی ناوچەکەوە پێشێلکردبوو. پێدەچوو کە کۆتاییهێنان بەم مافانە بە خاوی جێبەجێدەکرا و لەوەڕاندن و ڕاوکردن بەردەوامبوون تا ئەو کاتەی ۆڵپۆل کارێکی وایکرد کوڕەکەی ببێتە پارێزەری پارکەکە. لەم کاتەدا، پارکەکە بەڕووی خەڵکدا داخرا و دیوارێکی نوێ دروستکرا و تەڵەی گرتنی پیاوان دانران. ۆڵپۆل حەزی لە ڕاوە ئاسك بوو، ئەو کوخێکی لە هۆگتۆن لە ناو پارکەکەدا بۆخۆی دروستکرد. نارەزایی ڕەشپێستەکانی ناوچەکە کڵپەیسەند.

لە ١٠ تشرینی دوەمی ساڵی ١٧٢٤ دا، کەسێکی ناوچەی دەرەوەی پارکەکە، جۆن هەنتریج، تۆمەتبارکرا بە یارمەتیدانی دزانی ئاسك وحەشاردانی ڕەشپێستە ناسراوەکان، سزای هەردوو تاوانەکە هەڵواسین بوو. فەرمانی لێپێچینەوە لە هەنتریج ڕاستەوخۆ لەسەرەوە هاتبوو کە لە لایەن ئەنجوومەنی

لۆرداتی پێسپێراوی تەخت دەرچووبوو کە ۆڵپۆل و کادۆگان کۆنترۆڵیان کردبوو. ۆڵپۆل تا ئەو ئاستەش دەستیخستە ناو کێشەکەوە کە هەوڵیدا بۆخۆی بەڵگەی گوناهباریی هەنتریج لە سیخوڕێك وەربگرێ کە ڕیچارد بلاکبێرن بوو. دەبوایە سزادانی تۆمەتبارەکە ئەنجامێکی چاوەڕوانکراو بوایە، بەڵام وانەبوو. دوای دادگاییکردنێکی هەشت یان نۆ سەعاتی، دەستەی سوێندخۆران گەیشتنە ئەو بڕوایەی هەنتریج بێتاوانە، بەشێك لە بڕیارەکەیان لە سەر بنەمای یەکنەگرتنەوەی ئەو شێوازە بوو بەڵگەکانی پێکۆکرابۆوە.

هەموو ڕەشپێستەکان یان ئەوانەی هاوسۆزی ئەوان بوون هێندەی هەنتریج بەختیان نەبوو. هەرچەندە هەندێکی تر لەو تۆمەتبارانە ئازادکران یان سزاکانیان کەمکرانەوە، بەڵام چەندین کەس لەوانە هەڵواسران یان ڕەوانەی کۆڵۆنی سزادان کران کە ئەو کاتە باکووری ئەمەریکا بوو. یاساکە تا ساڵی ١٨٢٤ لە جێگەی خۆی مایەوە و لەو ساڵەدا هەڵوەشێندرایەوە. لەگەڵ ئەمەش دا، سەرکەوتنەکەی هەنتریج گرنگە. دەستەی سوێندخۆران لەو کەسانە پێکنەهاتبوو کە هاوشانی هەنتریج بوون، بەڵکو لە خاوەن زەوییە گەورەکان و نۆبڵەکان پێکهاتبوو کە دەبوایە هاوسۆزی ۆڵپۆل بوونایە. بەڵام ئەمە چیتر سەدەی حەڤدەیەم نەبوو کە دادگای ستار چێمبەر بە فەرمانی پاشایانی ستوارتەکان دەجوڵایەوە و وەك ئامرازێکی ئاشکرای سەرکوتکردنی بەرهەڵستکارانیان کاریدەکرد و پاشاکان بە ئارەزووی خۆیان ئەو دادوەرانەیان لادەبرد کە بە دڵی ئەوان بڕیارەکانیان دەرنەکردایە. دەبوایە ئیتر ویگەکانیش ملکەچی سەروەریی یاسا بوونایە، ئەو پرینسیپەی کە نابێ یاسا بە شێوەیەکی ئینتیقائی و هەڕەمەکی بەکاربهێنرێ و هیچ کەسێکیش لە سەروو یاساوە نییە.

ئەو ڕووداوانەی پەیوەندییان بە یاسای ڕەشپێستانەوە هەبوو ئەوە پیشاندەدەن کە شۆڕشی شکۆدار سەروەریی یاسای دامەزراند و ئەمەش لە ئینگلتەرە و بەریتانیادا بەهێزتر بوو، نوخبەکان زیاتر لەوەی کە بەخەیاڵیان دا دەهات لە ڕێگەی یاساوە جڵەوگیریکران. سەروەریی یاسا و لە ڕێگەی یاساوە حوکمکردن هەمان شت نین. هەرچەندە ویگەکان دەیانتوانی یاسای بێبەزەیی و سەرکوتکار دەربکەن بۆ نەهێشتنی ئەو کۆسپانەی لە لایەن خەڵکی ئاساییەوە دەخرانە بەردەمیان، بەڵام ئەوان ناچار بوون بە جڵەوگیری زیاتر ڕازیبن لەبەر سەروەریی یاسا. یاساکەی ئەوان ئەو مافانەی پێشێلکرد کە شۆڕشی شکۆدار و

گۆڕانکاری له دەزگایانی سیاسی دا که له ئەنجامی شۆڕشەکەدا هاتنەئاراوە، بۆ هەموو کەسێکیان دابینکردبوو، له ڕێگەی نەهێشتنی مافی " خودایی" پاشاکان و نوخبه خاوەن ئیمتیازەکانەوە. سەروەریی یاسا مانای ئەوە بوو کە نوخبەو ئەوانەشی نوخبه نەبوون وەکو یەك بەرهەڵستی جێبەجێکردنی دەکەن.

سەروەریی یاسا چەمکێکی زۆر سەیرە کاتێك لە ڕوانگەیەکی مێژووییەوە بیریلێدەکەیتەوە. بۆچی دەبێ یاساکان بە شێوەیەکی یەکسان بەسەر هەموو کەسێك دا جێبەجێبکرێن؟ ئەگەر پاشا و ئەریستۆکراسی دەسەڵاتی سیاسییان هەبێ و خەڵکی تر ئەو دەسەڵاتەیان نەبێ، شتێکی سروشتییە کە هەرشتێك بۆ پاشا و ئەریستۆکراسی گەمەی دادپەروەرانە بێ، پێویستە بۆ خەڵکی تر مایەی قەدەخەکردن و سزادان بێ. لە راستیدا سەروەریی یاسا لە سایەی دەزگایانی سیاسی ڕەهادا ناشێ جێبەجێبکرێ. سەروەریی یاسا دروستکراوی دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی و ئەو هاوپەیمانییە فراوانەیە کە پشتگیری ئەم جۆرە پلورەلیزمە دەکا. تەنیا لەو کاتەدا، کە کەسان و گروپانی زۆر ڕۆڵیان لە وەرگرتنی بڕیاردا دەبێ و ئەو دەسەڵاتە سیاسییەیان دەبێ کە لەسەر مێزی بڕیاردان جێگەیەکیان بەربکەوێ، ئەو ئایدیایەی کە دەبێ هەموان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە مامەڵەیان لەگەڵ دا بکرێ، مانایەکی دەبێ. لە سەرەتای سەدەی هەژدەیەم دا بەریتانیا بەرەو ئەوە دەچوو کا تا ئاستێکی باش پلورەلیستی بێ و نوخبەکانی ویگیش ئەوەیان بۆدەرکەوت، کە هەروەك لە بیرۆکەی سەروەریی یاسادا هاتوە، یاساو دەزگاکان ئەوانیش جڵەوگیردەکەن.

بەڵام ئایا بۆچی ویگەکان و پەرلەمانتاران بەو جڵەوگیرییانە ڕازیبوون؟ بۆچی ئەوان باڵادەستی خۆیان لە پەرلەمان و دەوڵەت دا بەکارنەهێنا بۆ جێبەجێکردنی یاسای ڕەشپێستان بێسازشکردن و بڕیارەکانی دادگاکانیان هەڵنەوەشاندەوە، کاتێك بڕیارەکانیان بە پێی خواستەکانی ئەوان نەبوون؟ وەڵامەکە زۆر شت دەربارەی سروشتی شۆڕشی شکۆدار دەخاتەڕوو ـ بۆچی ئەم شۆڕشە ڕەهایی کۆنی نەگۆڕییەوە بە شێوازێکی نوێی ڕەهایی ـ هۆکاری ئەوە بریتیبوو لە پەیوەندی نێوان پلورەلیزم و سەروەریی یاسا و داینەمیکی بازنەی بەختەوەری. هەروەك لە چاپتەری حەوتەم دا بینیمان، شۆڕشی شکۆدار لادانی نوخبەیەك نەبوو لە لایەن نوخبەیەکی ترەوە، بەڵکو بریتیبوو لە

شۆڕشێك دژی ڕەهایی لە لایەن هاوپەیمانییەکی فراوانی پێکهاتوو لـە نـۆبلاّن و بازرگانان و پیشەکاران و گروپەکانی ویگ و تۆرییەکان. سەرهەڵدانی دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی ئاکامی ئـەم شۆڕشـە بـوون. سـەروەریی یاسـاش وەك بەرهەمێکی لاوەکی ئەم پرۆسەیە هاتەئاراوە. بە بـوونی چـەندین لایـەن لەسـەر مێزی هاوبەشیکردن لە دەسەلاّت دا، سروشتی بوو کە یاسـاو جڵـەوگیری هـەبێ کە بەسەر هەموان دا جێبەجێبکرێن، نەوەك لایەنێك دەستبکا بـە پێکـەوەنانی دەسەلاّتی زۆر و لە کۆتایی دا بناخەکانی پلورەلیزم هەڵتەکێنێ. بۆیە بیرۆکـەی دانـانی سـنوور و جڵـەوگیری بـۆ دەسـەلاّتی فـەرمانڕەوایان، کـە جەوهـەری سەروەریی یاسایە، بەشێك بـوو لـە لـۆجیکی پلـورەلیزم کـە لـە منداڵدانی ئـەو هاوپەیمانییە فراوانـەدا دروسـتبوو کـە هێـزی ئۆپۆزیۆسـۆنی بەرامبـەر ڕەهـایی ستوارتەکان دروستکردبوو.

لەبەر ڕۆشنایی ئەمـەدا، دەبـێ جێگـەی سەرسـورمان نـەبێ کـە پرینـسیپی سـەروەریی یاسـا و بیرۆکـەی پاشـاکان مـافی خوداییـان نـەبوو، ئـارگومێنتی سەرەکی بوون دژی ڕەهایی سـتوارتەکان. هـەورەك مێژوونـاسی بـەریتانی ئـی. پی. تۆمسۆن باسیکردوە، لە خەباتی دژی پاشا ستوارتەکان دا،

*(هەوڵێکی لەڕادەبەدەر درا ... بۆ پیشاندانی وێنەی چینێکی دەسـەلاّت کـە بۆخۆی بەرپرسیار بوو بەرامبەر سـەروەریی یاسـا و ڕەوایـی خـۆی بەنـدبوو بـە یەکـسانی وگـشتگیریی ئـەو فۆرمـە یاسـاییانەوە. فـەرمانڕەواکان، بـە ویـستی خۆیان یـان پێـچەوانەی ئـەو ویـستە دیلـی بانگەشـەکانی خۆیـان بـوون، ئـەوان گەمـەی بەدەسـتهێنانی دەسـەلاّتیان بـە پێـی ئـەو ڕێـسایانە ئەنجامـدا کـە لـە بەرژەوەندی خۆیان بوو، چیتر نەشیاندەتوانی ئەو ڕێسایانە بشکێنن چونکە بـە شکاندنی ئەو ڕێسایانە سەراپای گەمەکەیان دەدۆڕاند).*

لەدەستچوونی گەمەکـە سیـستەمەکەی لەقـدەکرد و ڕێگـای بـۆ ڕەهـایی لـە لایـەن گروپێکـی هاوپەیمانییـە فراوانەکـە دەکـردەوە یـان تەنانـەت مەترسـی گەڕانەوەی ستوارتەکانی دروستدەکرد. بە ووتەی تۆمسۆن، ئەوەی ڕێگر بوو لە بەردەم پەرلەمان دا بۆ دروستکردنی ڕەهاییەکی نوێ ئەوە بوو کە،

*(بـە نـەمانی یاسـا، ڕەنگـە ئیمتیازەکـانی پاشـایەتی ... موڵـك و ژیانیـان داگیربکەنەوە)*

لەوەش زیاتر،

*(سەروەریی یاسا لە ناو سروشتی خودی ئەو سیستەمەدا بوو کە ئەوان ( ئەو ئەریستۆکرات و بازرگانانەی هتد ... دژی تاج خەباتیان کردبوو) بۆ بەرگریکردن لە خۆیان هەڵیانبژاردبوو، نەدەکرا تەنیا بۆ سوودی تایبەتی چینەکەی خۆیان بەکاریانبهێنایە. یاسا بە هەموو فۆرم و نەریتەکەیەوە، پرینسیپەکانی یەکسانی و گشتگیری لە خۆ گرتبوو کە... دەبوایە بەسەر هەموو جۆر و پلەیەکی پیاوان دا جێبەجێبکرایە).*

کاتێک جێگەی خۆی کردەوە، سەروەریی یاسا نەک تەنیا ڕەهایی دوورخستەوە، بەڵکو جۆرە بازنەیەکی بەختەوەرەی هێنایەئاراوە. ئەگەر یاساکان بەسەر هەموو کەسێك دا بەشێوەیەکی یەکسان جێبەجێبکرانایە، ئەوا هیچ تاکە کەسێك یان گروپێك، تەنانەت کادۆگان و ۆڵپۆلیش نەیاندەتوانی لە سەروو یاساوە بن و خەڵکی ئاسایی کە بە دەستدرێژیکردن بۆ سەر موڵکی تایبەتی تۆمەتبار کران، مافی دادگاییکردنی دادپەروەرانەیان هەبوو.

بینیمان کە چۆن دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوە سەرهەڵدەدەن، بەڵام ئایا بۆچی ئەو دەزگایانە بە درێژایی کات بەردەوامدەبن؟ مێژووی یاسای ڕەشپێستان وسنووردارىی جێبەجێکردنی یاساکە، بازنەی بەختەوەری ڕووندەکەنەوە. بازنەی بەختەوەری پرۆسەیەکی بەهێزی فیدباکی پۆزەتیڤە کە دەبێتە هۆی خۆڕاگری دەزگایانی کراوە بەرامبەر هەوڵەکانی لەناوبردنیان و لە ڕاستی دا ئەو هێزانەش دەخاتەگەڕ کە دەبنەهۆی کرانەوەی گەورەتری دەزگاکان.

لۆجیکی بازنەی بەختەوەری لەو ڕاستیەوە سەرچاوەدەگرێ کە دەزگایانی کراوە لەسەر بنەمای جڵەوگیری پیادەکردنی دەسەڵات و دابەشکردنی پلورەلیستانەی دەسەڵاتی سیاسی لە ناو کۆمەڵگادا دامەزراون کە ئەوانیش لە ناو سەروەریی یاسادا ڕەگیان داکوتاوە. توانای گروپێکی ناو هاوپەیمانییە فراوانەکە بۆ سەپاندنی خواستی خۆی بەسەر ئەوانی تردا بەبێ هیچ جڵەوگیرییەك، تەنانەت ئەگەر ئەو ئەوانی تره هاوڵاتی ئاسایش بن، وەك هەنتریج، هەڕەشە لە خودی ئەو باڵانسە دەکا. ئەگەر سەروەریی یاسا لە حاڵەتی ئەو ڕەنجدەرانەی دژی ئەو نوخبانەی دەستدرێژییان کردبوە سەر زەوییەکانیان، وەلابخرایە، ئایا چی لە ئارادا بوو تا گەرەنتی ئەوە بکا کە جارێکیتر وەلاناخرێتەوە؟ ئەگەر جارێکیتر سەروەریی یاسا وەلابخرایەتەوە،

ئایا چی ڕێگەی لە تاج و ئەریستۆکراسی دەگرت تا هەموو ئەو دەسکەوتانە وەربگرنەوە کە بازرگانان و بزنسمانان و زەویداران لە ماوەی سەدەو نیوێك دا بەدەستیانهێنابوو؟ لەڕاستی دا ئەگەر جارێکیتر ئەو سەروەرییە وەلابخرایە، ئەوا سەراپای پرۆژەی پلورەلیزم هەرەسیدەهێنا، چونکە کۆمەڵە بەرژەوەندییەکی تەسك لە سەر حسابی هاوپەیمانییە فراوانەکە کۆنترۆڵی دەگرتەدەست. سیستەمی سیاسی خۆی تووشی ئەم مەترسیە نەکرد. ئەمەش کارێکی وایکرد کە پلورەلیزم و فەرمانڕەوایی یاسا سیمای بەردەوامی دەزگایانی سیاسی بەریتانی بن. ئێمە دەبینین، کاتێك پلورەلیزم و حوکمی یاسا چەسپان، داواکاری هاتەئاراوە بۆ پلورەلیزمی زیاتر و بەشداری زیاتر لە پرۆسە سیاسییەکەدا.

بازنەی بەختەوەری تەنیا لە لۆجیکی پلورەلیزم و سەروەریی یاساوە نەهاتوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی دەزگایانی سیاسی کراوە هاوکاری دەزگایانی ئابووری کراوە دەکەن. ئەمەش دەبێتە هۆی دابەشبوونی یەکسانتری داهاتەکان و هێزدارکردنی کۆمەڵانی فراوانی کۆمەڵگا و دەبێتە هۆی ئەوەی کە گۆڕەپانی گەمەی سیاسی تەنانەت تەخت تر بێ. ئەمەش دەبێتە هۆی سنوردارکردنی ئەو دەسکەوتانەی یەکێك لە ڕێگەی زەوتکردنی دەسەڵاتی سیاسییەوە بەدەستیاندینێ و هاندانی دامەزراندنەوەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر کەمدەکاتەوە. ئەم فاکتەرانە گرنگ بوون لە سەرهەڵدانی دەزگایانی سیاسی دیموکراسی ڕاستەقینە لە بەریتانیادا.

لە هەمانکات دا پلورەلیزم سیستەمێکی کراوەتر دروستدەکا و بواری پەرەسەندنی میدیای سەربەخۆ دەڕەخسێنێ، ئەمەش کاری ئەو گروپانە ئاسانتر دەکا کە بەرژەوەندییان لە بەردەوامیی دەزگایانی کراوەدایە تا ئاگاداری ئەو هەڕەشانە بن دژی ئەو دەزگایانە دەکرێن و خۆیان باشتر دژی ئەو هەڕەشانە ڕێکبخەن. زۆر گرنگ بوو کە دەوڵەتی ئینگلیزی لە دوای ساڵی ١٦٨٨ ەوە چاودێری لەسەر میدیا وەستاند. میدیا ڕۆڵی هاوشێوەی گرنگی گێڕا لە هێزدارکردنی کۆمەڵانی خەڵك و بەردەوامبوونی بازنەی بەختەوەری و پەرەپێدانی دەزگایی ویلایەتە یەکگرتوەکان، هەروەك لەم چاپتەرەدا دەبینین.

لە کاتێك دا بازنەی بەختەوەری مەیلی بەردەوامبوون لای دەزگایانی کراوە دروستدەکا، ئەم بەردەوامبوونە مسۆگەر نییەو پێچەوانەبوونەوەشی مەحاڵ

نییە. لە بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتوەکان دا دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوە ڕووبەڕووی چەندین تەحەدا بوونەوە. لە ساڵی ١٧٤٥ دا، تەختخوازی لاو بە سوپاکەیەوە هەموو ئەو ماوەیەی بڕی تا گەیشتە داربی، کە تەنیا سەد میل لە لەندەنەوە دوورە، بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەزگا سیاسییانەی لە کاتی شۆڕشی شکۆداردا پێکەوەنرابوون، بەڵام ئەو شکستیهێنا. گرنگتریش لەو تەحەدایانەی لە دەرەوە دەکران، ئەو تەحەدایانە بوون لە ناوەوە ددهاتن کە دیسانەوە لەوانە بوون دەزگا کراوەکان لە ناوبەرن. هەروەك لە میانەی کوشتارەکەی پیتەرلۆ لە ساڵی ١٨١٩ لە مانچێستەر، بینیمان و هەروەك دواتر بە درێژی زیاتر دەبینین، نوخبە سیاسییەکانی بەریتانیا بڕیان لە بەکارهێنانی سەرکوتکردن کردەوە بۆ دوورکەوتنەوە لە کردنەوەی زیاتری سیستەمی سیاسی، بەڵام لە سەر لێوارەکە گەڕانەوە. بە هەمانشێوە، دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا ڕووبەڕووی تەحەدای جدی بوونەوە کە لەوانە بوو سەربکەون، بەڵام شکستیان هێنا. بێگومان شتێکی حەتمی نەبوو کە دەبوایە ئەم تەحەدایانە شکستیان بهێنایە. سەرنەکەوتنی ئەم تەحەدایانە تەنیا بە هۆی بارنەی بەختەوەریەوە نەبوو بەڵکو بەهۆی پەیوەست (Contingent)ی ڕێچکەی مێژووشەوە بوو کە دەزگایانی کراوەی بەریتانی و ویلایەتە یەکگرتوەکان مانەوە و بە تێپەڕبوونی کات بەهێزتر بوون.

## کاروانی هێواشی دیموکراسی

بەرەنگاربوونەوەی یاسای ڕەشپێستان ئەوەی بۆ خەڵکی ئاسایی دەرخست کە ئەوان مافی زیاتریان هەیە لەوەی پێشتر دەرکیان پێکردبوو. ئەوان دەیانتوانی بەرگری لە مافە تەقلیدی و بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی خۆیان بکەن لە دادگاکان و پەرلەمان دا و لە ڕێگەی تکانامە و لۆبیکردنەوە. بەڵام ئەم پلورەلیزمە هێشتا دیموکراسی کاریگەری نەهێنابوەئاراوە. زۆربەی پیاوان نەیاندەتوانی دەنگبدەن و ئافرەتانیش هەر دەنگیاننەدەدا و چەندین نایەکسانی لە بونیادی دیموکراسی دا هەبوو. ئەمانە هەموو گۆڕانکارییان بەسەرداهات. بارنەی بەختەوەری دەزگا کراوەکان نەك تەنیا پارێزگاری لەو

دەسکەوتانە دەکا کە بەدەستهێنراون، بەڵکو دەرگا دەکاتەوە بۆ کرانەوەی زیاتر. گرەوەکە لەسەر نوخبە بەریتانییەکانی سەدەی هەژدەیەم بوو بۆ هێشتنەوەی دەسەڵاتی سیاسی خۆیان بەبێ تەحەدای جدی. ئەم نوخبەیە دەسەڵاتیان گرتبوەدەست لە ڕێگەی تەحەداکردنی مافی خودایی پاشایان و کردنەوەی دەرگا بۆ بەشداریکردنی خەڵك لە سیاسەت دا، بەڵام ئەوان ئەو کاتە ئەم مافەیان تەنیا بۆ کەمینەیەکی بچووك بەڕەوا بینی. بە تێپەڕبوونی کات تا دەهات خەڵکی زیاتر داوای مافی بەشداریکردنیان دەکرد لە پرۆسەی سیاسی دا و لە ساڵانی بەرەو ساڵی ١٨٣١ توانیان ئەمە بەدەستبهێنن.

لە سێ دەیەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم دا بەریتانیا نائارامی کۆمەڵایەتی زیاتری بەخۆوەبینی، کە زیاتر وەڵامدانەوە بوو بۆ نایەکسانی ئابووری و لە ئەنجامی داواکارییەکانی جەماوەری بێبەش لە مافی دەنگدان بۆ نوێنەرایەتی سیاسی زیاتر سەریانهەڵدا. ئاشوبەکانی لودییەکان لە ساڵانی ١٨١١ـ١٨١٦ دا ڕوویاندا، کە کرێکاران، دژی بەکارهێنانی ئەو تەکنەلۆجییە نوێیانە کە لایانوابوو دەبنەهۆی کەمکردنەوەی ڕۆژانەکانیان، شەڕیانکرد. دوابەدوای ئەم ئاشووبانە، ئاشووبەکانی سپا فیلْدی ساڵی ١٨١٦ لە لەندەن و کوشتارەکەی پیتەرلۆی ساڵی ١٨١٩ لە مانچێستەر سەریانهەڵدا، کە بە ئاشکرا داوای مافی سیاسیان تێدا کرا. لە ئاشووبەکانی ساڵی ١٨٣٠ دا، کرێکارانی کشتوکاڵی دژی دابەزینی ئاستی گوزەران ناڕەزاییان دەربڕی، سەرەڕای دەربڕینی ناڕەزایی بەرامبەر خستنەگەڕی تەکنەلۆجی نوێ. لەم دەمەدا، لە پاریس شۆڕشی تەمووز ساڵی ١٨٣٠ تەقییەوە. سازانێك لە نێوان نوخبەکان دا دەستیکرد بە پێکهاتن دەربارەی ئەوەی کە ناڕەزاییەکان بەرەو خاڵی کوڵان دەڕۆیشتن و تەنیا ڕێگەیەك بۆ خاوکردنەوەی نائارامییە کۆمەڵایەتییەکان و ڕێگرتن لە شۆڕش بریتیبوو لە جێبەجێکردنی داخوازی جەماوەر و ئەنجامدانی چاکسازی پەرلەمانی.

کەواتە جێگەی سەرسوڕمان نەبوو کە هەڵبژاردنی ساڵی ١٨٣١ بە زۆری دەربارەی تەنیا مەسەلەیەك بوو: چاکسازی سیاسی. ویگەکان، نزیکەی سەد ساڵ دوای سێر ڕۆبەرت وَلْپۆل، بەدەنگەوەهاتنیان بۆ داخوازییەکانی پیاوی ئاسایی زۆر زیادیکرد و هەڵمەتیان بۆ فراوانکردنی مافی دەنگدان بەرپاکرد. بەڵام ئەمە مانای تەنیا زیادبوونێکی کەمی ژمارەی دەنگدەران بوو. دەنگدانی

گشتی، تەنانەت تەنیا بۆ پیاوانیش لەسەر مێزەکە نەبوو. ویگەکان هەڵبژاردنەکەیان بردەوە و سەرکردەکەیان، ئێرڵ گرەی، بوە سەرۆك وەزیران. ئێرڵ گرەی کەسێکی ڕادیکاڵ نەبوو- زۆر لێوەی دووربوو. ئەو و ویگەکان هەوڵی چاکسازییان دا نەك لەبەر ئەوەی بڕوایان بەوە هەبوو دەنگدانی فروانتر دادپەروەرانە بوو یان لەبەر ئەوەی ویستیان خەڵك لە دەسەڵات دا بەشدار بکەن. دیموکراسی بەریتانی لە لایەن نوخبەکانەوە نەدرا، بەڵکو بە زۆری لە لایەن جەماوەرەوە سەندرا کە هێزدار کرابوون لە ڕێگەی ئەو پرۆسە سیاسییانەوە لە ئینگلتەرە و ناوچەکانی تری بەریتانیا دا لە ماوەی چەندین سەدەی ڕابووردودا لە ئارادا بوون. ئەوان پشتئەستوور بوون بە هۆی ئەو گۆڕانکارییانەی لە سروشتی دەزگایانی سیاسی دا ڕوویاندابوو کە شۆڕشی شکۆدار هێنانیەئاراوە. چاکسازییەکان ئەنجامدران چونکە نوخبەکە لای وابوو کە چاکسازی تەنیا ڕێگەیە بۆ بەردەوامی حوکمەکەیان، هەڵبەت بە شێوەیەکی نەرمتر. ئێرل گرەی، بۆ پشتگیری چاکسازی لە ووتارە بەناوبانگەکەی دا بۆ پەرلەمان، بە ڕوونی ووتی:

*(هیچ کەسێك هێندەی من دژی پەرلەمانی ساڵانە و دەنگدانی گشتی و دەنگدان لە ڕێگەی سندوقی دەنگدانەوە نییە. ئامانجی من لایەنگری نییە بۆئەمانە، بەڵکو کۆتاییهێنانە بەو هیواو پرۆژانە... پرینسیپی چاکسازییەکانم بریتییە لە ڕێگرتن لە پێویستی بەرپاکردنی شۆرش... چاکسازییە بۆ هێشتنەوە نەك بۆ لەناوبردن).*

جەماوەر دەنگیان نەدەویست تەنیا لە پێناوی دەنگ دا. بەڵکو بۆ ئەوەیان دەویست تا کورسییەکیان لەسەر مێزەکە هەبێ و بتوانن بەرگری لە بەرژەوەندییەکانیان بکەن. ئەمەش بەهۆی بزووتنەوەی دەستوورییەکانەوە باشتر هەستپێکرا، کە لە دوای ساڵی ١٨٣٨ ەوە سەرکردایەتی هەڵمەتی بەدەستهێنانی دەنگدانی گشتی کرد. ناوەکەی لە دەستووری خەڵکەوە وەرگیرابوو کە ئەویش بۆ لێکچوون لەگەڵ ماگنا کارتا بەکارهێنرا. جەی. ئاڕ. ستێفنس کە یەکێك بوو لە دەستوورییەکان، ڕوونیکردەوە کە بۆچی دەنگدانی گشتی و مافی دەنگدان بۆ هەموو جەماوەر بۆ جەماوەر گرنگ بوو:

*(مەسەلەی دەنگدانی گشتی... بریتییە لە مەسەلەی چەقۆ و چەتاڵ، مەسەلەی نان و پەنیر... مەبەستم لە دەنگدانی گشتی ئەوەیە کە هەموو*

*پیاوێکی ئیشکار لە وڵات دا مافی لەبەرکردنی پاڵتۆیەکی باشی هەبێ، شەپقەیەکی باش لەسەر بکا، سەربانێکی باشی هەبێ تا خێزانەکەی لە ژێری دا بحەوێتەوە، ژەمە خواردنێکی باش لەسەر مێزەکەی بێ).*

ستێفنس باش تێگەیشتبوو کە مافی دەنگدانی گشتی پتەوترین شێوازی هێزدارکردنی جەماوەری بەریتانی بوو کە دەبوە هۆی مسۆگەرکردنی پاڵتۆیەك و شەپقەیەك و بانێك و ژەمە خواردنێکی باش بۆ پیاوی ئیشکار.

لە کۆتایی دا ئێرل گرەی سەرکەوتوو بوو لە تێپەڕاندنی یەکەم یاسای ڕیفۆرم و خاوکردنەوەی شەپۆلەکانی شۆڕشگێری بێئەوەی هیچ هەنگاوێکی گەورە بنێ بەرەو دەنگدانی گشتی جەماوەری. ڕیفۆرمەکانی ساڵی ۱۸۳۲ کەم بوون و مافی دەنگدانیان تەنیا دوو هێندە کرد و لە ٪۸ وە کردیانە ٪۱٦ی دانیشتوانی پیاوی پێگەیشتوو (کە بریتیبوو لە ٪۲ بۆ ٪٤ی هەموو دانیشتوان). یاساکە سیستەمی شارەوانییە ڕزیوەکانیشی لابرد و نوێنەرایەتی سەربەخۆی دایە شارە پیشەسازییەکانی وەك مانچێستەر و لیدز و شەفیلد. بەڵام ئەم یاسایە چەندین مەسەلەی بە چارەسەرنەکراوی هێشتەوە. بۆیە ماوەیەکی کەم دوای ئەوە داخوازی زیاتر بۆ مافی زیاتری دەنگدان و نائارامی کۆمەڵایەتی زیاتر سەریانهەڵدا. بۆ بەدەنگەوەهاتنی ئەمانە، ڕیفۆرمی زیاتر ئەنجامدران.

ئایا بۆچی نوخبەکانی بەریتانیا ملیاندا بۆ داخوازییەکان؟ ئایا بۆچی ئێرل گرەی لایوابوو کە ڕیفۆمی کەم - لە ڕاستی دا زۆر کەم – تەنیا ڕێگە بوو بۆ هێشتنەوەی سیستەمەکە؟ ئایا بۆچی ئەوان لە نێوان دوو بەڵاکەدا، ڕیفۆم و شۆڕش پەنایان بۆ بەڵای ڕیفۆم برد لە بری ئەوەی درێژە بەدەسەڵاتی خۆیان بدەن بەبێ ئەنجامدانی هیچ جۆرە ڕیفۆرمێك؟ ئایا نەیاندەتوانی ئەوە بکەن کە داگیرکارە ئیسپانییەکان لە باشووری ئەمەریکا و پاشاکانی نەمسا - هەنگاریا و ڕوسیا لە چەندین دەیەی دواتر دا کردیان کاتێك داخوازی بۆ ڕیفۆم گەیشتە ئەو وڵاتانە؟ ئایا نەیاندەتوانی ئەوە بکەن کە بەریتانییەکان بۆخۆیان لە کاریبی و هیندستان کردبوویان؟ کە ئەویش بەکارهێنانی هێز بوو بۆ دامرکاندنەوەی داخوازییەکان؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە لە ناو بازنەی بەختەوەرییەوە سەرچاوەدەگرن. ئەو گۆڕانکارییە ئابووری و سیاسییانەی کە تا ئەو کاتە لە بەریتانیادا ئەنجامدرابوون، بوونە هۆی ئەوەی کە بەکارهێنانی هێز بۆ سەرکوتکردنی ئەو داخوازییانە لای نوخبەکان پەسەند نەبێ و تا دەهاتیش

شیاوی ئەنجامدان نەبوو. هەروەك ئی پی تۆمسۆن نوسیویەتی:

*(کاتێك خەباتەکانی ساڵانی ۱۷۹۰-۱۸۳۲، ئاماژەیدا بەوەی ئەم هاوسەنگییە گۆڕاوە، فەرمانڕەوایانی ئینگلتەرە ڕووبەڕووی چەند ئەلتێرنەتیڤی مەترسیدار بوونەوە. ئەوان یان دەبوایە وازیان لە سەروەریی یاسا بهێنایە و سترەکچەرە تۆکمە دەستوورییەکەی خۆیان هەڵبوەشاندایەتەوە و پێچەوانەی بانگەشەکانی خۆیان لە ڕێگەی هێزەوە حوکیانبکردایە، یان دەبوایە ملیانبدایە بۆ یاساکانی خۆیان و وازیانبهێنایە لە باڵادەستی خۆیان ... ئەوان هەنگاوی وەستێنەریان نا بە ئاڕاستەی یەکەم، بەڵام لە کۆتایی دا لە بری لەناوبردنی نێوبانگی خۆیان و لە بری ئەوەی ڕەوایی دەستووریی ۱۵۰ ساڵە ڕەتبکەنەوە، ئەوان خۆیاندا بەدەست یاساوە).*

بە واتایەکی تر، هەمان ئەو هێزانەی بوونە هۆی ئەوەی نوخبەی بەریتانی نەیانەوێ کۆشکی سەروەریی یاسا بڕوخێنن لە کاتی یاسای ڕەشپێستان دا، بووشنە هۆی ئەوەی نوخبەکە لە سەرکوتکردن و فەرمانڕەواییکردن لە ڕێگەی هێزەوە دووربکەونەوە کە دیسانەوە سەقامگیریی سەراپای سیستەمەکەی دەخستە مەترسیەوە. ئەگەر پێشێلکردنی دەستوور بە جێبەجێکردنی یاسای ڕەشپێستان دەبوە هۆی لاوازکردنی ئەو سیستەمەی کە بازرگانان و بزنسمانان و نۆبڵەکان لە کاتی شۆڕشی شکۆداردا دیانمەزراندبوو، ئەوا دامەزراندنی دیکتاتۆریەتێکی سەرکوتکار لە ساڵی ۱۸۳۲ دا بە تەواوی سیستەمەکەی لەناودەبرد. لەڕاستی دا ڕێکخەرانی نارەزاییەکان بۆ ڕیفۆرمی پەرلەمانی زۆرباش ئاگاداری گرنگی سەروەریی یاسا و هێزە ڕەمزیەکەی بوون بۆ دەزگایانی سیاسی بەریتانی لەم سەردەمەدا و هەمان ئەو بانگەشانەیان بەکارهێنا کە بۆ سەروەریی یاسا دەکرا، بۆ جەختکردنە سەر گرنگی سەروەریی یاسا. یەکێك لەو ڕێکخراوانەی هەوڵی ڕیفۆرمی پەرلەمانی دا بریتیبوو لە یانەی هەمدن کە بە ناوی ئەو ئەندام پەرلەمانەوە ناونرابوو یەکەمجار بەرەنگاری چارلسی یەکەم بوبۆوە لەسەر باجی کەشتی، کە ڕووداوێکی گرنگ بوو، بوە هۆی سەهەڵدانی یەکەم ڕاپەڕینی سەرەکی دژی ڕەهایی ستوراتەکان، هەروەك لە چاپتەری حەوتەم دا بینیمان.

لە هەمانکات داینەمیکی فیدباکی پۆزەتیف لە نێوان دەزگایانی ئابووری کراوە و دەزگایانی سیاسی کراوەدا لە ئارادابوو کە بوە هۆی ئەوەی گرتنەبەری

ئـەم جـۆرە ڕەفتـارە خـوازراو بـێ. دەزگایـانی ئـابووری کـراوە بوونـە هـۆی سەرهەڵدانی بازاڕی کراوە و کـاراکردنی تـەرخانکردنی باشـتری دەرامەتـەکان و هاندانی زیاتر بۆ بەدەستهێنانی پەروەردەو بەهرەکان و زیادکردنی نوێکاری لـە تەکنـەلۆجی دا. لـە سـاڵی ١٨٣١ دا هـەموو ئـەم هێزانـە لـە کـاردا بـوون. دامرکاندنـەوەی داخوازییـە میللییـەکان و ئەنجامـدانی کۆدێتـا دژی دەزگایـانی سیاسـی کـراوە هـەموو ئـەم دەسـکەوتانەی لـەناودەبرد و ئـەو نوخبانـەی دژی دیموکراتیزەکردنی زیاتر و کرانەوەی زیاتر بوون ڕەنگە خۆیان لـە نـاو ئەوانـەدا بدۆزیایەتەوە کە لە ئەنجامی ئەم وێرانکاریەدا سامانەکەیان لە کیسدەچوو.

ڕویـەکی تـری ئـەم فیدباکـە پۆززەتیڤـە ئەوەیـە کـە لـە سـایەی دەزگایـانی ئابووری و سیاسی کراوەدا، کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات هێندە بایەخدار نەبوو. لـە نەمسا ـ هەنگاریا و لـە ڕوسـیا دا هـەروەك لـە چاپتەری هەشـتەم دا بینیمـان، بازرگانان و ئەریستۆکراتەکان لە ئەنجامی بەپیشەسازیبوون و ڕیفۆرم دا زیانیان زۆر بەردەکەوت. بە پێچەوانەوە لە بەریتانیادا لە سەرەتای سـەدەی نۆزدەیـەم دا، سوپاس بۆ پەرەسەندنی دەزگایانی ئابووری کراوە، ئـەو زیانـە بـەو ڕادەیـە نەبوو. بەندە نەبوو، بە شێوەیەکی ڕێـژەیی کـارکردنی بـەزۆر لـە بـازاڕی کـاردا کـەمتر بـوو، مۆنۆپـۆڵی پـارێزراو بـەهۆی کۆسـپەکانی بـەردەم بەشـداربوونەوە کەمتر بوون. دەستگرتن بە سەر کورسی دەسەڵات دا بـۆ نوخبـەکانی بـەریتانیا بایەخی کەمتر بوو.

لـــۆجیکی بازنـــەی بەختـــەوەری ئەوەشـــی دەگەیانـــد کـــە هـــەنگاوی سەرکوتکارانەی لەو جۆرە شیاوی جێبەجێکردن نەبن، دیسانەوە لەبەر فیدباکی پۆزەتیڤ لە نێوان دەزگایانی ئـابووری و سیاسـی کـراوەدا. بـوونی دەزگایـانی ئابووری کراوە دەبێتە هۆی دابەشکردنی یەکسانتری دەرامەتـەکان بـە بـەراورد لەگەڵ دەزگایـانی چەوسـێنەردا. بـەم شـێوەیە، ئـەو دەزگایانـە هاوڵاتییـان بـە گشتی هێـزدار دەکـەن و مەیـدانی تـەخت تـری گەمـە دروسـتدەکەن، تەنانـەت کاتێك دێتە سەر شەڕیش لە پێنـاوی دەسـەڵات دا. ئەمـەش کـاری نوخبەیـەکی بچووك بۆ تێشکاندنی جـەماوەر بـە بـەراوورد لەگـەڵ ملـدان بـۆ جێبـەجێکردنی داخوازییـەکانیان، زەحمـەت تـر دەکـا، یـان بەلایەنیکەمـەوە بـۆ هەنـدێك لـە نوخبـەکان. دەزگایـانی کـراوەی بـەریتانی پێـشتر شۆڕشـی پیـشەسازییان بەرپاکردبوو، شارنشینی لە بەریتانیادا زیادیکردبوو. بەکارهێنانی سەرکوتکردن

دژی گرووپە خەڵکێکی شارنشین و چڕبۆوە و نیمچەڕێکخراو و هێزدار، زۆر زەحمەت تر دەبوو لە سەرکوتکردنی ڕەنجدەران و بەندانی پشتبەستوو بە خەڵکانی تر.

کەواتە بازنەی بەختەوەری لە ساڵی ١٨٣٢ دا، یەکەم یاسای ڕیفۆرمی بۆ بەریتانیا هێنا. بەڵام ئەمە تەنیا سەرەتا بوو. هێشتا ڕێگایەکی درێژ لەبەردەم دا بوو بۆ گەیشتن بە دیموکراسی ڕاستەقینە، چونکە نوخبەکان لە ساڵی ١٨٣٢ دا تەنیا ئەوەیان بۆ خەڵك دابینکرد کە ناچار بوون بیکەن و زیاتر لەوەیان نەکرد. مەسەلەی ڕیفۆمی پەرلەمانی کەوتە ئەستۆی بزووتنەوەی دەستووریی، کە چارتەری گەل لە ساڵی ١٨٣٨ ئەم بەندانەی لەخۆ گرتبوو:

- *دەنگدان بۆ هەموو کەسێك کە تەمەنی بیستویەك ساڵ بێ و لە ڕووی ئەقڵیەوە کێشەی نەبێ و بەهۆی ئەنجامدانی تاوانەوە سزا نەدرابێ.*
- *دەنگدان – دەنگدەر لە کاتی دەنگدان دا بپارێزرێ*
- *نەهێشتنی مەرجی موڵکداری بۆ ئەندامانی پەرلەمان، بەمەش بوار بدرێتە بازنەکانی هەڵبژاردن بۆ هەڵبژاردنی ئەو پیاوەی دەیانەوێ، دەوڵەمەند بێ یان هەژار*
- *پێدانی موچە بە ئەندامانی پەرلەمان، بەمەش بوار بدرێتە پیاوێکی بازرگان وپیاوێکی ئیشکار یان هەر کەسێکی تر تا خزمەتی بازنەی هەڵبژاردنی خۆی بکا، کاتێك لە ئیشەکەی دووردەخرێتەوە، بۆ ئەوەی بایەخ بە بەرژەوەندییەکانی وڵات بدا*
- *بازنەی دەنگدانی یەکسان.، دەستەبەرکردنی هەمان ژمارەی نوێنەرایەتیکردن بۆ هەمان ژمارەی دەنگدەران، لە جیاتی ئەوەی بوار بدرێتە بازنە بچووکەکان دەنگەکانی بازنە گەورەکان داپۆشن*
- *پەرلەمانی ساڵانە، بەمەش بە کاریگەرترین شێوەکونترۆڵی بەرتیل و ترساندن بە هەڕەشەکردن دەکرێ. چونکە لەوانەیە بتوانرێ بازنەیەکی دەنگدان هەر حەوت ساڵ جارێك بکڕێ (تەنانەت بە بوونی دەنگدانی نهێنیش)، بەڵام هیچ جزدانێك ناتوانێ بازنەیەکی دەنگدان هەر دوازدە مانگ جارێك بکڕێ ( لە سیستەمی دەنگدانی گشتی دا) و کاتێکیش ئەندامی پەرلەمان تەنیا بۆ ساڵێك هەڵدەبژێررێ، ئەوا ناتوانێ ئەندامی بازنەی هەڵبژاردنەکەی بەم شێوەیەی ئێستا پشتگوی بخا و ناپاکی لێبکا.*

مەبەستیان لە "دەنگدان" دەنگدانی نهێنی و کۆتاییهێنانی دەنگدانی کراوە بوو. کە ڕێگاخۆشکاربوو بۆ کڕینی دەنگ و ناچارکردنی دەنگدەران لە کاتی دەنگدان دا.

بزووتنەوەی دەستووریی زنجیرەیەك خۆپیشاندانی جەماوەری ئەنجامدا و لە هەموو ئەم ماوەیەشدا پەرلەمان خەریکی گفتوگۆکردن بوو لەسەر ئەنجامدانی ڕیفۆرمی زیاتر. هەرچەندە دەستوورییەکان لە دوای ساڵی ١٨٤٨ بڵاوەیان لێکرد، بەڵام لە لایەن یەکێتی نەتەوەیی ڕیفۆرم کە لە ساڵی ١٨٦٤ و ڕێکخراوی ڕیفۆرم کە لە ساڵی ١٨٦٥دا دامەزران، جێگەیان گیرایەوە. لە تەمووزی ساڵی ١٨٦٦ دا ئاشووبی گەورە لە لایەن لایەنگرانی ڕیفۆرم لە هاید پارك جارێکیتر مەسەلەی چاکسازیی کردەوە بە پێشینەی ئەجێندای سیاسی. ئەم گوشارە لە کاتی دوەم یاسای ڕیفۆرمی ساڵی ١٨٦٧ دا بەرهەمەکەی دەرکەوت کە ژمارەی گشتی دەنگدەرانی کردە دووهێندە و چینی کرێکاران بوونە زۆرینە لە بازنە شارنشینەکانی هەڵبژاردن دا. ماوەیەکی کەم دوای ئەوە دەنگدانی نهێنی هاتەئاراوە و هەوڵدرا ڕەفتاری گەندەڵی کاتی هەڵبژاردنەکان لە شێوەی "وێرکردن" دا ( کە بریتیبوو لە کڕینی دەنگ و بەرامبەر ئەوە دەنگدەر وێردەکرا بە پێدانی پارە و خواردن یان ئەلکهول) نەهێڵرێ. ژمارەی دەنگدەران لە ئەنجامی سێیەم یاسای ڕیفۆرمی ساڵی ١٨٨٤ دا دوو هێندەی لێهات کاتیك ٪٦٠ پیاوان بوونە خاوەن مافی دەنگدان. دوای یەکەم جەنگی جیهانی، یاسای نوێنەرایەتی گەل کە لە ساڵی ١٩١٨ دا دەرچوو، مافی دەنگدانی بەخشیە هەموو پیاوێکی تەمەن سەروو بیست و یەك ساڵی و هەموو ئافرەتێکی سەروو تەمەن سی ساڵی کە باجدەر بوون یان شوویان بە پیاوێکی باجدەر کردبوو. لە کۆتایی دا لە ساڵی ١٩٢٨ هەموو ئافرەتان بوونە خاوەن دەنگ بە هەمانشێوەی پیاو. بڕیارەکانی ساڵی ١٩١٨ لە کاتی جەنگ دا دانوستاندنی لە سەر کرا و ڕەنگدەرەوەی ئەو سازشە بوون کە لە نێوان حکومەت و چینی کرێکاران دا، کە پێویست بوون بۆ شەڕکردن و بەرهەمهێنانی کەرەسەکانی جەنگ، ئەنجامدرا. لەوانەیە حکومەت ڕادیکالیزمی شۆڕشی ڕوسیاشی لەبەرچاو گرتبێ.

هاوتەریب لەگەڵ پەرەپێدانی کەمکەمی دەزگایانی سیاسی زیاتر کراوە، هەنگاو بەرەو دەزگایانی ئابووری تەنانەت زیاتر کراوەش دا دەستپێکرد. ئاکامێکی سەرەکی یەکەم یاسای ڕیفۆرم بریتیبوو لە هەڵوەشاندنەوەی

یاساکانی گەنمەشامی لە ساڵی ١٨٤٦ دا. هەورەك لە چاپتەری حەوتەم دا بینیمان، یاساکانی گەنمەشامی هاوردەکردنی خەلە و دەونەویڵەیان قەدەخەکرد و نرخەکانی بەرزکردنەوە و قازانجی گەورەی بۆ زەویدارە گەورەکان دەستەبەر کرد. پەرلەمانتارانی نویٚ لە مانچێستەر و بێرمەنگهام، گەنمەشامی هەرزان و کرێی ڕۆژانەی کەمیان دەویست. ئەوان بردیانەوە و بەرژەوەندی زەویدارەکان تووشی شکستی گەورە بوو.

گۆڕانکاری لە سیستەمی دەنگدان و لایەنەکانی تری دەزگایانی سیاسی کە لە ماوەی سەدەی نۆزدەیەم دا ئەنجامدران، ڕیفۆمی تریان بە دوادا هات. لە ساڵی ١٨٧١ گلادستۆن کە سەرۆك وەزیرانێکی سەر بە حیزبی لیبراڵ بوو، کەرتی خزمەتگوزاری گشتی لەبەردەم چاودێریی گشتی دا کردەوە و کردیە کەرتێکی مێرۆکراتیك کە بە پێی توانا کاری تێدادەکرا، بەمەش بەردەوامیدا بە مەرکەزیەتی سیاسی و دامەزراندنی دەزگایانی دەوڵەت کە لە سەردەمی تیۆدۆرەکانەوە دەستیپێکردبوو. حکومەتانی لیبراڵ و تۆری لەم ماوەیەدا ژمارەیەکی زۆر یاسای بازاڕی کاریان دەرکرد. بۆ نموونە، یاسای خودان و خزمەتکار، کە بواری دابوە خاوەن کاران بۆ بەکارهێنانی یاسا بۆ کەمکردنەوەی جوڵەی کرێکارانیان، هەڵوەشێنرایەوە، بەمەش سروشتی پەیوەندی نێوان کرێکار و خاوەنکار بۆ بەرژەوەندی کرێکاران گۆڕانکاری تێداکرا. لە ماوەی ساڵانی ١٩٠٦-١٩١٤. حیزبی لیبراڵ بەسەرکردایەتی ئێچ ئێچ ئاسکیوز و دەیڤید لۆید جۆرج، کەوتنە بەکارهێنانی دەوڵەت بۆ دابینکردنی خزمەتگوزاری گشتی زیاتر، لەوانە دڵنیایی تەندروستی و دڵنیایی بێکاریی و خانەنشینی حکومی و لایەنی کەمی کرێی ڕۆژانە و پابەندبوون بە وەرگرتنی باج کە لەسەر بنەمای دابەشکردنەوە دامەزرابیٚ. لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکارییە لە سیاسەتی نەختینەدا، باج وەك ڕێژەی بەرهەمی نەتەوەیی لە ماوەی دوا سیٚ دەیەی سەدەی نۆزدەیەم دا دوو هێندە زیادیکرد و دواتریش جارێکیتر لە سیٚ دەیەی سەرەتای سەدەی بیستەم دا بوە دوو هێندە. سیستەمی باج کرایە سیستەمێکی زیاتر "پێشکەتوو"، بە شێوەیەك کەسانی دەوڵەمەند قورسایی زیاتریان کەوتە سەرشان.

سیستەمی پەروەردە، کە پێشتر یان بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ نوخبەکان و لە لایەن تایەفە ئاینیەکانەوە بەڕێوەدەبرا، یان خەڵکی هەژار دەبوایە پارەیان

بدایە، زیاتر لەبەردەم جەماوەردا کرایەوە. یاسای پەروەردەی ساڵی ١٨٧٠ بۆ یەکەمجار دابینکردنی پەروەردەی گشتی بە شێوەیەکی سیستەماتیك خستە سەر شانی حکومەت. پەروەردە لە ساڵی ١٨٩١ کرایە خۆڕایی. تەمەنی بەجێهێشتنی قوتابخانە لە ساڵی ١٨٩٣ دا کرا بە یازدە ساڵ و لە ساڵی ١٨٩٩ دا زیادکرا بۆ دوازدە ساڵ و هاوکاری تایبەت بۆ خێزانانی کەمدەرامەت ڕێکخرا. لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکارییانەدا، ڕێژەی تەمەن دە ساڵان کە دەچوونە قوتابخانە، کە لە ساڵی ١٨٧٠ دا ٪٤٠ بوو، لە ساڵی ١٩٠٠ دا بووە ٪١٠٠. لە کۆتایی دا یاسای پەروەردەی ساڵی ١٩٠٢ بوە هۆی زیادکردنی هاوکاری دارایی زۆر بۆ قوتابخانەکان و قوتابخانەی گرامەری هێنایەئاراوە، کە دواتر بوە بناخەی پەروەردەی ناوەندی لە بەریتانیادا.

لە راستیدا، نموونەکەی بەریتانیا، کە پیشاندانی بازنەی بەختەوەری دەزگایانی کراوەیە، نموونەی "بازنەی بەختەوەری کەمکەم" ڕووندەکاتەوە. بە دڵنیاییەوە گۆڕانکارییە سیاسییەکان بە ئاڕاستەی دەزگایانی سیاسی زیاتر کراوە بوون و ئەنجامی داخوازییەکانی جەماوەر بوون کە بووبوونە خاوەن هێزی زیاتر، بەڵام لە هەمانکات دا، گۆڕانکارییەکان کەمکەم بوون. هەر دەیە و هەنگاوێکی تر بەرەو دیموکراسی دەنرا، هەندێجار بچووکتر و هەندێجاریش گەورەتر لەوەی پێشتر. ململانێ لەسەر هەریەك لەو هەنگاوانە لە ئارادا بوو، ئاکامی هەریەك لەو هەنگاوانە پەیوەست بوون. بەڵام بازنەی بەختەوەری هێزی ئەوتۆی دروستکرد کە سوودەکانی چنگ گیرکردنی لەدەسەڵات کەمکردەوە. لە هەمانکات دا، تینوتاوی دایە سەروەریی یاسا و بەکارهێنانی هێزی زەحمەت تر کرد دژی ئەوانەی کە داوای هەمان ئەو شتانەیان دەکرد کە ئەو نوخبانە بۆخۆیان لەوەبەر داوایان لە پاشاکانی ستوارتەکان کردبوو. ئەگەری خلیسکانی ئەم ململانێیە بۆ شۆڕشی سەرتاسەری کەمبۆوە و زیاتر بەرەو ئەوەچوو کە ململانێکان بە کرانەوەی زیاتری دەزگاکان چارەسەربکرێن. فەزیلەیەکی مەزن لەم گۆڕانکارییە کەمکەمەدا هەیە. هەڕەشەی بۆ نوخبەکان کەمترە لەچاو هەڕەشەی لەناوبردنی سەراپای سیستەمەکە. هەریەك لە هەنگاوەکان بچووکن و ملدان بۆ داخوازی بچووك زیاتر دەچێتە ئەقڵەوە لە جیاتی ئەوەی ڕووبەڕووبونەوەی گەورە دروستبکرێ. ئەمەش تاڕادەیەك شرۆڤەی ئەوە دەکا کە چۆن یاسای گەنمەشامی بەبێ ڕوودانی ململانێی گەورەتر هەڵوەشێنرایەوە.

بە هاتنی ساڵی ١٨٤٦، خاوەن زەوییەکان چیتر لە پێگەیەك دا نەبوون کە بتوانن دانانی یاساکان لە ناو پەرلەمان دا کۆنترۆڵبکەن. ئەمەش ئەنجامی یەکەم یاسای ڕیفۆرم بوو. ئەگەر لە ساڵی ١٨٣٢ دا، فراوانکردنی ژمارەی دەنگدەران و ریفۆرمی شارەوانییە ڕزیوەکان و هەڵوەشاندنەوەی یاسای گەنمەشامی پێکەوە بخرانایە سەر مێزەکە، ئەوا خاوەن زەوییەکان بەرگری زیاتریان دەکرد. ئەو ڕاستیەی کە یەکەمجار ڕیفۆرمی سیاسی سنوردار خرایە سەر مێزەکە و داخوازی هەڵوەشاندنەوەی یاسای گەنمەشامی دواتر خرایەڕوو، ململانێکەی خاوکردەوە.

لە هەمانکات دا، گۆڕانکاری کەمکەم، ڕێگەی گرت لە سەرکێشیکردنەکان بەرەو ئاڕاستەی نادیار. لەناوبردنی سیستەمەکە لە ڕێگەی توندوتیژییەوە مانای ئەوەیە کە شتێکی تەواو نوێ لە جێگەی ئەوەی لابراوە بنیاتبنرێ. ئەمەش ئەوە بوو کە لە کاتی شۆڕشی فەڕەنسادا ڕوویدا، کاتێك ئەزموونی یەکەم لەگەڵ دیموکراسی دا بوە هۆی تیرۆر و ڕەشەکوژی و دواتر دوو جار گەڕانەوە بەرەو پاشایەتی، پێش ئەوەی لە کۆتایی دا و لە ساڵی ١٨٧٠ دا ببێتە هۆی دامەزراندنی سێیەم کۆماری فەڕەنسی. هەمان حاڵەت لە شۆڕشی ڕووسی دا سەریهەڵدا، کە خواستی کەسانێکی زۆر بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی یەکسانتر لە سیستەمەکەی ئیمپراتۆریەتی ڕوسیا، بوە هۆی دامەزراندنی دیکتاتۆریەتی تاکە حیزب کە زۆر توندوتیژ تر و خوێناوی تر و دڕندانە تر بوو لەو سیستەمەی جێگەیگرتەوە. گۆڕانکاری کەمکەم لەم کۆمەڵگایانەدا زەحمەت بوو لەبەر ئەوەی خاوەن پلورەلیزم نەبوون و یەکجار چەوسێنەر بوون. ئەوە پلورەلیزمی دوای شۆڕشی شکۆدار و سەروەریی یاسا بوو کە ئەم شۆڕشە هێنایەئاراوە، کارێکی وایانکرد کە گۆڕانکاری کەمکەم لە بەریتانیادا خوازراو و شیاوی جێبەجێکردن بێ.

شرۆڤەکاری کۆنزێرڤەتیڤی ئینگلیزی، ئێدمۆند بێرك، کە بەردەوام دژی شۆڕشی فەڕەنسی بوو، لە ساڵی ١٧٩٠ دا نووسی، (دەبێ پیاو بە وریاییەکی یەکجار زۆرەوە سەرکێشی تێکدانی سترەکچەرێك بکا کە بە درێژایی کات بەهەموو ئەندازەیەکی گونجاو وەڵامی خواستە گشتیەکانی کۆمەڵگای دابێتەوە، یان هەوڵی سەرلەنوێ دروستکردنەوەی ئەو سترەکچەرە بدا بێئەوەی مۆدێل و پاتێرنێکی ئەوتۆی لەبەرچاودا بێ کە سوودەکەی پەسەند کرابێ)

تێگەیشتنی بێرک بۆ وێنە گەورەکە هەڵە بوو. شۆڕشی فەڕەنسی سترەکچەرێکی ڕزیوی گۆڕی و ڕێگای بۆ دەزگایانی کراوە کردەوە، نەک تەنیا لە فەڕەنسادا، بەڵکو لە زۆربەی ئەوروپای ڕۆژئاوادا. بەڵام وورياییەکەی بێرک لە پێکانی نیشانەکەدا بەتەواوی هەڵە نەبوو. پرۆسەی ڕیفۆمی سیاسی بەریتانی بەشێوەی کەمکەم، کە لە ساڵی ١٦٨٨ دا دەستیپێکردو، سی ساڵ دوای مردنی بێرک هەنگاوەکانی خێراتر بوون، کاریگەر تر بوو چونکە سروشتە کەمکەمیەکەی هێزی زیاتری دایە و کارێکی وایکرد بەرەنگاربوونەوەی زەحمەت تر بێ و لە کۆتاییشدا زیاتر بەرگەبگرێ.

## لێدانی ترەستەکان

ڕیشەی دەزگایانی کراوە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خەباتەی لە ڤێرجینیا و مێریلاند و کارۆلینا لەسەردەمی کۆلۆنیاڵی دا ئەنجامدرا. ئەم دەزگایانە بەهۆی دەستووری ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە، کە سیستەمی جڵەوگیری و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی لەخۆگرتبوو، بەهێزکران. بەڵام دەستوورەکە کۆتایی بە پەرەپێدانی دەزگایانی کراوە نەهێنا. هەروەك لە بەریتانیادا، ئەو دەزگایانە لە ڕێگەی پرۆسەی فیدباکی پۆزەتیڤ کە لەسەر بنەمای بازنەی بەختەوەری دامەزرابوون، بەهێزکران.

بە هاتنی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم، هەموو پیاوانی سپیپێست، جگە لە ئافرەتان و ڕەشپێستان دەیانتوانی لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا دەنگبدەن. دەزگا ئابوورییەکان بوونە دەزگایانی زیاتر کراوە ــ بۆ نموونە، بە دەرکردنی یاسای زەوی نیشتەکاران لە ساڵی ١٨٦٢ دا، کە زەوی دەرەوەی سنووری نشینگەکانی لەبەردەم هەموو نیشتەکاران دا کردەوە لە بری ئەوەی تەنیا بۆ نوخبە سیاسییەکان تەرخانبکرێن. بەڵام هەروەك لە بەریتانیادا، بەگژداچوونەوەی دەزگا کراوەکان بە تەواوی کۆتایینەهات. کۆتاییهاتنی جەنگی ناوخۆی ویلایەتە یەکگرتوەکان، پرۆسەیەکی خێرای گەشەکردنی ئابووری لە باکووردا خستەگەڕ. کاتێك ڕێگای ئاسنین و پیشەسازی و بازرگانی تەشەنەیان کرد، ژمارەیەکی کەمی خەڵك پارەیەکی زۆریان دەستکەوت.

بەهێزبوونی ئەم خەڵکە کەمە بەهۆی سەرکەوتنەکانیانەوە، بوە هۆی ئەوەی ئەم پیاوانە و کۆمپاکانیان، تا دەهات بێویژدان تر دەبوون. ئەوانە پێیان دەوترا بارۆنە دزەکان لەبەر شێوازی دڵڕەقانەیان لە بزنس دا کە ئامانجیان چڕکردنەوەی مۆنۆپۆلییەکانیان و ڕێگرتن بوو لە ڕکابەرەکانیان تا بێنە ناو بازاڕەکەوە یان بە پێی هەلومەرجی یەکسان بزنس بکەن. یەکێك لە بێبەزەییترینی ئەم جۆرە کەسانە بریتیبوو لەکۆرنێلیەس ڤاندەربیلت، کە لە ووتەیەکی بەناوبانگی دا ووتی ( بۆچی گوێ بدەمە یاسا؟ ئایا خاوەن دەسەڵات نیم؟).

یەکێکی تر لەو بارۆنانە بریتیبوو لە دی ڕۆکفیلەر کە لە ساڵی ١٨٧٠ کۆمپانیای ستاندەرد ئۆیلی دامەزراند. ئەو هەر زوو ڕکابەرەکانی خۆی لە کلیڤلاند دەرپەڕاند و هەوڵی مۆنۆپۆلیکردنی گواستنەوەو فرۆشتنی نەوت و بەرهەمە نەوتیەکانی دا. بە هاتنی ساڵی ١٨٨٢ ئەو مۆنۆپۆلییەکی زەبەلاحی درووستکردبوو، کە ئەمڕۆ بە ترەست ناودەبرێ. بە هاتنی ساڵی ١٨٩٠ کۆمپانیای ستاندەرد ئۆیل کۆنترۆڵی ٨٨٪ نەوتی پاڵێوراوی ویلایەتە یەکگرتوەکانی کرد و ڕۆکفێلەر لە ساڵی ١٩١٦ دا بوە یەکەم ملیاردەری جیهان. فلیمە کارتۆنییەکانی ئەم ڕۆژگارە ستاندەر ئۆیل لە شێوەی ئۆکتۆپەسێك دا دەردەخەن کە نەك تەنیا خۆی لە دەوری پیشەسازی نەوت ئاڵاندبوو، بەڵکو خۆی ئاڵاندبوە کاپیتۆڵ هیل (مەڵبەندی کۆنگرێسی ئەمەریکی)ەوە.

کەسێکی تر کە نێوبانگی لەم بوارەدا خراپبوو، بریتیبوو لە جۆن پیرپۆنت مۆرگان، دامەزرێنەری بانکی ئەم سەردەمەی جەی پی مۆرگان، کە دواتر و دوای چەندین دەیە و یەکگرتن لەگەڵ چەندین بانکی تر دا بوە جەی پی مۆرگان چەیز. ئەو و ئەندرو کارنیج پێکەوە لە ساڵی ١٩٠١ دا کۆمپانیای ئاسنی ویلایەتە یەکگرتوەکانیان دامەزراند کە یەکەم کۆمپانیا بوو سەرمایەکەی لە یەك ملیارد دۆلار زیاتر بوو، بە گشتیش گەورەترین کۆمپانیای ئاسن بوو لە جیهان دا. لە ساڵانی ١٨٩٠ ەکان دا ترەستی گەورە لە هەموو سێکتەرێکی ئابووری دا سەریانهەڵدا و چەندین لەمانە کۆنترۆڵی زیاتر لە ٧٠٪ بازاڕیان کردبوو لە سێکتەرەکانی خۆیان دا. لەمانەش چەندین کۆمپانیای ناسراوی وەك دوو پونت و ئیستمان کۆداك و هارڤێستەری نێودەوڵەتی. لە ڕووی مێژووییەوە، ویلایەتە یەکگرتوەکان، بەلایەنی کەمەوە بەشی باکوور و ناوەڕاستی ڕۆژئاوا، بە

شێوەیەکی ڕێژەیی خاوەن بازاری ئەوتۆ بوون کە بواری ڕکابەریی تێیاندا زیاتر بوو، زیاتریش ئیگالیتاری بوون لەچاو بەشەکانی تری وولاتەکەدا، بەتایبەتی باشووری وولات. بەلام لەم ماوەیەدا مۆنۆپۆلی جێگەی ڕکابەریی گرتەوە و نایەکسانی لە دابەشبوونی سامان دا بەخێرایی زیادیکرد.

سیستەمی سیاسی پلورەلیستی ویلایەتە یەکگرتوەکان بەشێکی فراوانی کۆمەلگای، هێزدارکرد و ئەو توانایەی دانیّ دژی ئەم جۆرە پێشێلکاریانە بوەستنەوە. ئەوانەی قوربانیی ڕەفتارە قۆرخکارییەکانی بارۆنە دزەکان بوون، یان ئەوانەی کەوتبوونە بن کۆنترۆلی بێویژدانانەی پیشەسازییەکانی ئەم بارۆنانە، دەستیانکرد بە خۆڕێکخستن لە دژیان. ئەوان بزووتنەوەی جەماوەری و دواتریش بزووتنەی پێشکەوتنخوازیان دامەزراند.

بزووتنەوە جەماوەرییەکە دوای قەیرانێکی دووروودرێژی زەویوزار هاتەئاراوە کە هەر لە سالانی ١٨٦٠ ەکان بەدواوە ناوچەی ناوەڕاستی خۆرئاوای گرتبۆوە. کۆمەلەی هەرەوەزی نەتەوەیی هاوکارانی کشتوکالّ کە بە گرەینجەرەکان ناسرابوون لە سالّی ١٨٦٧ دا دامەزرا و کەوتە ڕێکخستنی جووتیاران دژی ڕەفتاری نادادپەروەرانە و جیاکارانەی ئەنجامدانی بزنس. لە سالانی ١٨٧٣ و ١٨٧٤ دا، گرەینجەرەکان کۆنترۆلی یازدە ئەنجوومەنی یاسادانانی ویلایەتەکانی ناوەڕاستی ڕۆژئاوایان کرد و بێزاری خەلّك بوە هۆی دامەزراندنی حیزبی گەل لە سالّی ١٨٩٢ دا و لە هەلّبژاردنی سەرۆکایەتی سالّی ١٨٩٢ دا ٪٨,٥ دەنگەکانی بەدەستهێنا. لەو دوو هەلّبژاردنەدا کە دواتر ئەنجامدران، لایەنگرانی بزووتنەوەی جەماوەری لە بەدەستهێنانی دەنگەکان دا کەوتنە دوای حیزبی دیموکراسی بەسەرۆکایەتی ویلیام جێنینگز برایان کە چەندین داخوازی ئەوانی کردنە هی خۆی. ناڕەزایی خەلّکی ئاسایی بەرامبەر بلاوبوونەوەی ترستەکان تۆکمەتر بوو بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو کاریگەرییەی کە ڕۆکفێلەر و بارۆنە دزەکانی تر خستبویانە سەر سیاسەتی نەتەوەیی.

ئەم بزووتنەوە سیاسییانە وورده وورده کاریانکردە سەر هەلّوێستە سیاسەکان و دواتریش یاساکان، بەتایبەتی کاریانکردە سەر ڕۆلّی دەولّەت لە دانانی پەیڕەوی مۆنۆپۆلییەکان دا. یەکەم یاسای گرنگ بریتیبوو لە یاسای بازرگانی نێوان ویلایەتەکان لە سالّی ١٨٨٧ دا، کە بوە هۆی دامەزراندنی کۆمسیۆنی بازرگانی نێوان ویلایەتەکان و دەستکردن بە دانانی ڕێوشوێنی

یاسایی بۆ پیشەسازی لە سەر ئاستی فیدراڵی. هەر زوو دوای ئەمە یاسای دژە ترەستی شێرمان لە ساڵی ١٨٩٠ دا دەرکرا. یاسای شێرمان کە تا ئێستاش بەشێکی سەرەکی پەیڕەوی دژە ترەستە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا، بوە بنەمای ئەو هێرشانەی کرانە سەر ترەستەکانی بارۆنە دزەکان. لێپێچینەوەی سەرەکی بەرامبەر ترەستەکان دوای هەڵبژاردنی ئەو سەرۆکانە هات کە بەڵێنی چاکسازی و سنووردارکردنی دەسەڵاتی بارۆنە دزەکانیان دابوو: تیۆدۆر ڕۆزفەڵت ١٩٠١ـ ١٩٠٩، ویلیام تافت ١٩٠٩ـ ١٩١٣ و ودرۆ ویلسۆن ١٩١٣ـ١٩٢١.

هێزێکی سیاسی سەرەکی لە پشت هەوڵەکانی دژە ترەست و دانانی پەیڕەوی فێدراڵی بۆ پیشەسازی دیسانەوە دەنگی جووتیاران بوو. هەوڵە سەرەتاییەکان لە لایەن تاکتاکی ویلایەتەکانەوە لە ساڵانی ١٨٧٠ کان دا بۆ دانانی ڕیسای ڕێگای ئاسنین لە لایەن ڕێکخراوانی جووتیارانەوە دران. لە راستیدا نزیکەی هەموو ئەو پەنجا و نۆ تکانامانەی درانە کۆنگرێس و پەیوەندییان بە ترەستەکانەوە هەبوو، بەر لە کارپێکردنی یاسای شێرمان لە ویلایەتە کشتوکاڵییەکانەوە هاتبوون و لە لایەن ڕێکخراوانی وەك یەکێتی جووتیاران و هاوپەیمانی جووتیاران و ڕێکخراوی بەرژەوەندی هاوبەشی جووتیاران و پارێزەرانی بەخێوکردنی ئاژەڵان پێشکەشکرابوون. جووتیاران هەستیانکرد بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە لە بەگژداچوونەوەی ڕەفتارە قۆرخکارییەکانی پیشەسازی دا.

لە ناو خۆڵەمێشی بزووتنەوە جەماوەرییەکان دا، کە دوای ئەوەی بە هەموو قورساییەکی خۆیانەوە پشتگیریی دیموکراتەکانیان کرد بەتەواوی لاواز بوون، پێشکەوتنخوازەکان سەریانهەڵدا، کە بزووتنەوەیەکی ڕیفۆرمی هەمەچەشنە بوون و بایەخیان بە زۆربەی ئەو مەسەلانە دەدا کە پێشتر بزووتنەوە جەماوەرییەکان بایەخیان پێدابوون. بزووتنەوەی پێشکەوتنخوازان لە سەرەتادا لە دەوری کەسایەتی تێدی ڕۆزفەڵت کۆبوونەوە کە جێگری سەرۆك ویلیام ماکینلی و دوای کوشتنی ماکینلی لە ساڵی ١٩٠١ دا جێگەی ئەوی گرتەوە. پێش ئەوەی ڕۆزفەڵت بەرزبێتەوە بۆ ئاستی بەرپرسیارێتی نەتەوەیی، ئەو پارێزگارێکی سەرسەختی ویلایەتی نیۆرك بوو، تەقەلای بێوچانی دا بۆ نەهێشتنی گەندەڵی سیاسی و "سیاسەتی ئامێر". لە یەکەم ووتاری دا بۆ کۆنگرێس، ڕۆزفەڵت ڕووبەڕووی ترەستەکان بۆوە. ئەو پێیوابوو کە

خۆشگوزەرانی ویلایەتە یەکگرتوەکان لەسەر بنەمای ئابووری بازاڕ و داهێنانی بزنسمانان دامەزرابوو، بەڵام لە هەمانکات دا،

*(شەیتانی ڕاستەقینە و مەترسیدار لە ئارادایە... و ... باوەڕێکی بڵاو لە مێشکی گەلی ئەمەریکا دا دروستبوە کە ئەو کۆمپانیا گەورانەی بە ترەست ناسراون، لە هەندێك سیفات و ئارەزوویان دا زیان بە خۆشگوزەرانی گشتی دەگەیەنن. ئەمە نە لە حەسوودی وچروکیەوە سەرچاوەی گرتوەو نە لە شانازینەکردن بەو دەسکەوتە گرنگانەوە کە ئەم وڵاتەی خستۆتە ڕیزی پێشەوەی ئەو نەتەوانەی تێدەکۆشن بۆ باڵادەستی بازرگانی، سەرچاوەی گرتوە. ئەمە پەیوەندی نییە بە نەبوونی تێگەیشتنی هۆشیارانە بۆ پێویستی مامەڵەکردن لەگەڵ بارودۆخی گۆڕاوی بازرگانی بە شێوازی نوێ، یان دەرکنەکردن بەو ڕاستییەی کە یەکخستنی سەرمایە بۆ بەدەستهێنانی شتی گەورە پێویستە کاتێك پێشکەوتنی جیهانی ئەوە دەخوازێ کە شتی مەزن ئەنجامبدرێن. ئەو باوەڕە لەسەر بنەمای باوەڕێکی دڵسۆزانە دامەزراوە کە لایوایە یەکخستن وچڕکردنەوەی سەرمایە، پێویستە قەدەخەنەکرێن بەڵکو سەرپەرشتیبکرێن و لە چوارچێوەی سنووری گونجاودا کۆنترۆڵبکرێن. بە تێگەیشتنی من ئەم باوەڕە ڕاستە).*

ئەو بەردەوامبوو (*پێویستە، ئەوانەی ئامانجیان پاکردنەوەی سیاسەتە لە توندوتیژی، بە هەمان ئەندازەش ئامانجیان پاکردنەوەی جیهانی بزنس بێ لە تاوانەکان*) دەرەنجامەکەی ئەوە بوو کە

*(لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندی خەڵك دا، پێویستە ویلایەتە یەکگرتوەکان، بەبێ دەسوەردانە ناو دەسەڵاتی ویلایەتەکان لەو بوارەدا، دەسەڵاتی چاودێری و دانانی پەیڕەو بۆ هەموو ئەو کۆمپانیا گەورانەی کە لە نێوان ویلایەتەکان دا بزنس ئەنجامدەدەن، بگرێتە ئەستۆی خۆی. ئەمە بەتایبەتی ڕاستە کاتێك کۆمپانیاکە بەشێك لە سامانەکەی لە ئەنجامی بوونی توخمێك یان ئارەزوویەکی مۆنۆپۆلیانەی بزنسەکەی دا دەستدەکەوێ).*

ڕۆزفەڵت پێشنیازیکرد کۆنگریس ئاژانسێکی فیدراڵی دابمەزرێنێ کە دەسەڵاتی ئەوەی هەبێ لە کاروباری کۆمپانیا گەورەکان بکۆڵێتەوە و ئەگەر پێویستیکرد ئەوا دەکرێ لە ڕێگەی هەموارکردنەوەی دەستوور ئەم ئاژانسە دابمەزرێنێ. بە هاتنی ساڵی ١٩٠٢ ڕۆزفەڵت یاسای شێرمانی بەکارهێنا بۆ

لـەتكردنی كۆمپانیـای نـۆرزرەن سـێكیوریتی و ئەمـەش كاریگـەریی بـۆ سـەر بەرژەوەندییـەكانی جـەی پـی مۆرگـان هـەبوو. دواتـر، سـكاڵا دژی دو پۆنـت و كۆمپانیای توتنی ئەمەریكی و كۆمپانیای ستاندارد ئۆیڵ تۆماركرا. رۆزڤـەڵت لـە رێگەی دەركردنی یاسای هێپبێرن لە ساڵی ١٩٠٦ دا، دەسەڵاتەكانی كۆمسیۆنی بازرگـانی نێـوان ویلایەتـەكانی بـەهێزكرد، بەتایبـەتی ئـەو یاسـایە بواریدایـە كۆمـسیۆنەكە تـا حـساباتی دارایـی كۆمپانیاكـانی رێگـای ئاسـنین بپـشكنێ و دەسەڵاتی خۆی بۆ بواری تـر درێژبكاتـەوە. جێگرەوەكـەی رۆزڤـەڵت كـەویلیام تافت بـوو، تەنانـەت لێبڕاوانـە تـر كەوتـە دادگـاییكردنی ترەسـتەكان. بـاڵاترین ئاسـتێكیش كـە هەوڵـەكانی ئـەو گەیـشتنێ بریتیبـوو لـە لـەتكردنی كۆمپانیـای ستاندارد ئۆیڵ لە ساڵی ١٩١١ دا. تافت، هەروەها، چاكسازی تـری خـستەگەڕ، وەك هێنانـــەئارای بـــاجی داهـــاتی فیـــدراڵی، كـــە دوای بڕیـــاردان لەســـەر هەمواركردنەوەی دەستوور لە ساڵی ١٩١٣ دا كارپێكرا.

چاكسازییەكانی بزووتنەوە پێشكەوتنخوازەكان لە كـاتی هەڵبـژاردنی وودرۆ ویڵسۆن لە ساڵی ١٩١٢ دا گەیشتنە لوتكە. ویڵسۆن لە كتێبەكـەی سـاڵی ١٩١٣ ەی دا (ئازادی نوێ)، نووسـی *( ئەگـەر مۆنۆپـۆڵی بـەردەوامبێ، ئـەوا هەمیـشە مۆنۆپـۆڵی لەسـەر تـەختی حكومـەت دادەنیـشێ. چـاوەڕێ ناكـەم مۆنۆپـۆڵی بۆخۆی سنوور بۆخۆی دابنێ. ئەگەر پیاوانی هێندە گەورە لـەم وڵاتـەدا هـەبن كە بتـوانن ببنـە خـاوەنی حكومـەتی ویلایەتـە یـەكگرتوەكانی ئەمـەریكا، ئـەوا دەبنە خاوەنی)*

ویڵسۆن توانای خۆی خستەكار بۆ دەركردنی یاسای كلەیتۆنی دژە ترەست لە سـاڵی ١٩١٤ و بەمـەش یاسـای شـێرمانی بـەهێزكرد و كۆمـسیۆنی بازرگـانی فیدراڵی دامەزراند كە یاسای كلەیتۆنی جێبەجێكرد. جگە لەمە، لەبەر ڕۆشـنایی لێكۆڵینەوەكەی كۆمیتـەی پوجـۆ كـە ئەنـدامی كـۆنگریس و نوێنـەری لویزیانـا، ئارسن پوجۆ سەرۆكایەتیكرد و لێكۆڵینەوەی دەربارەی "ترەسـتی پـارە" كـرد كە پەلهاویشتنی مۆنۆپۆلی بوو بۆ نـاو كـەرتی دارایـی، ویڵـسۆن دەسـتیكرد بـە زیـادكردنی دانـانی رێـسا بـۆ كـەرتی دارایـی. لـە سـاڵی ١٩١٣ دا ئـەو بـۆردی ئیحتیـاتی فیـدراڵی دامەزرانـد كـە كارەكـەی بریتیبـوو لـە رێكخـستنی چـالاكیە مۆنۆپۆلیستیەكان لە كەرتی دارایی دا.

پەیدابوونی بارۆنـە دزەكـان و ترەسـتە قۆرخكارەكـان لـە كۆتـایی سـەدەی

نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم دا، هەروەك لە چاپتەری سێیەم دا جەختمان لەسەر کرد، ئەوە دەردەخا کە بوونی بازاڕەکان بە تەنیا گەرەنتی نین بۆ سەرهەڵدانی دەزگایانی کراوە. دەشێ بازاڕەکان لە لایەن چەند کۆمپانیایەکی کەمەوە کۆنترۆڵ بکرێن و نرخی یەکجار گران دابنێن و ببنە ڕێگر لەبەردەم هاتنە ناوەوەی ڕکابەری بەتواناتر و تەکنەلۆجی نوێ. بازاڕ، گەر بۆخۆی سەرپشك بکرێ، ئەوا کراوە نابێ و بەرەبەرە لە لایەن ئەوانەی لە ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە دەسەڵاتی زیاتریان هەیە کۆنترۆڵدەکرێ. دەزگایانی ئابووری کراوە تەنیا پێویستیان بە بازاڕ نییە، بەڵکو پێویستیان بە بازاڕی کراوە هەیە کە مەیدانی تەختی گەمەکردن و دەرفەتی ئابووری بۆ زۆربەی دانیشتوان دەستەبەر دەکا. مۆنۆپۆلی بڵاو کە لە لایەن دەسەڵاتی سیاسی نوخبەوە پشتگیری بکرێ، پێچەوانەی ئەمەیە. بەڵام کاردانەوە بەرامبەر ترەستە خاوەن مۆنۆپۆلییەکان ئەوەش ڕووندەکاتەوە کە کاتێك دەزگایانی سیاسی کراوە دەبن، ئەوا هێزی پارسەنگ دژی هەوڵەکانی دوورکەوتنەوە لە بازاڕی کراوە دروستدەکەن. ئەمەش بازنەی بەختەوەری یە لە ئەنجامدانی کاری خۆی دا. دەزگایانی ئابووری کراوە ئەو بناخەیە دەڕەخسێنن کە دەزگایانی سیاسی کراوە لەسەریان گەشەدەکەن، لە کاتێك دا دەزگایانی سیاسی کراوە ڕێگە لە لادان لە دەزگایانی ئابووری کراوە دەگرن. لێدانی ترەستەکان لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا، بە پێچەوانەی ئەوەی لە مەکسیك بینیمان، ئەم ڕوکارەی بازنەی بەختەوەری ڕووندەکاتەوە. لە کاتێك دا لە مەکسیك دا دەزگایەکی سیاسی نییە ڕێگە لە مۆنۆپۆلیەکەی کارلۆس سەلیم بگرێ، لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا یاساکانی شێرمان و کلەیتۆن لە ماوەی سەدەی ڕابووردودا چەندین جار بەکارهێنران بۆ ڕێگرتن لە ترەسەتەکان و مۆنۆپۆلییەکان و کارتێلەکان و بۆ پێداگری لەسەر هێشتنەوەی بازاڕەکان بە کراوەیی.

ئەزموونی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دا جەخت لەسەر ڕۆڵی گرنگی میدیای ئازاد دەکا لە هێزدارکردنی کۆمەڵانی فراوانی خەڵك و لەو ڕێگەیەشەوە هێزدارکردنی بازنەی بەختەوەری. ڕۆزڤەڵت لە ساڵی ١٩٠٦ دەستەواژەی ڕسواکار (muckraker) ی بەکارهێنا. ئەم دەستەواژەیە لە پیاوی مەکراکەر بەدەستی کارێکتەری ئەدەبی ناو کتێبی

(بەرەوپێشچوونی خواناس)ی نووسەر، بونیان وەرگیراوە، بۆ وەسفکردنی ئەوەی بە ڕۆژنامەگەریی پەلەمشکار(Intrusive Journalism) ناسراوە. ئەم دەستەواژەیە بوە ڕەمزی ئەو ڕۆژنامەنوسانەی، کە بە شێوەیەکی پەلەمەش، بەلام لە هەمانکات دا کاریگەر، زیادەڕەوییەکانی بارۆنە دزەکان و گەندەڵییەکانی ناو سیاسەتی ئاشکرا دەکرد لەسەر ئاستی ویلایەت و ئاستی فیدراڵی دا. ڕەنگە بەناوبانگترین مەکراکەر بریتیبووبێ لە ئایدا تاربیل، کە کتێبەکەی ساڵی ١٩٠٤، مێژووی کۆمپانیای ستاندارد ئۆیل، ڕۆڵی گەورەی بینی لە جولاندنی ڕای گشتی دژی ڕۆکفێلەر و بەرژەوەندی پەیوەندار بە بزنسەکەیەوە کە بوە هۆی لەتکردنی کۆمپانیای ستاندارد ئۆیل لە ساڵی ١٩١١ دا. مەکراکەرێکی تر بریتیبوو لە پارێزەر و نووسەر لویس براندیس کە دواتر لە لایەن سەرۆك ویلسۆنەوە کرایە سەرۆکی دادگای باڵا. براندیس، لە کتێبەکەی دا، (چۆن بانکەکان پارەی خەڵکی تر بەکاردەهێنن)، زنجیرەیەك ڕیسوایی دارایی ئاشکراکرد. براندیس لە ناو کۆمیتەی پوجۆ دا کاریگەری گەورەی هەبوو. گەورە سەرمایەداری بواری ڕۆژنامەگەریی، ویلیام ڕاندۆلف هێرست وەك مەکراکەر ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو. بڵاوکردنەوەی زنجیرە ووتارێکی دەیڤید گرایام فیلیپ بە ناوی "ناپاکی ئەنجوومەنی سەنات" لە گۆڤارەکەی دا، کە ناوی (زە کۆزمۆپۆلیتان) بوو لە ساڵی ١٩٠٦ دا، ئەو هەڵمەتەی بەهێزکرد کە بۆ هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆی ئەنجوومەنی سەنات ئەنجامدەدرا و ئەمەش ڕیفۆرمێکی تری پێشکەوتنخواز بوو کە لەگەڵ حەڤدەیەمین هەموارکردنەوەی دەستووری ویلایەتە یەککگرتوەکان دا لە ساڵی ١٩١٣ دا جێبەجێکرا.

مەکراکەرەکان ڕۆڵی سەرەکیان بینی لە ناچارکردنی سیاسییەکان دا بۆ هەڵوێست وەرگرتن لە دژی ترەستەکان. بارۆنە دزەکان ڕقیان لە مەکراکەرەکان بوو، بەلام دەزگا سیاسییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان کارێکی وایانکرد کە ئەستەم بوو ئەوان بتوانن لەناویان بەرن یان بێدەنگیان بکەن. دەزگا سیاسییە کراوەکان بواری گەشەکردنی میدیای ئازاد دەڕەخسێنن و میدیای ئازادیش بە دەوری خۆی دەبێتە هۆی ئەوەی هەڕەشەکان لە دژی دەزگایانی ئابووری و سیاسی کراوە ئاشکرا بکرێن و بەرەنگاری بکرێن. بە پێچەوانەوە، ئەم جۆرە ئازادیە لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر یان دەزگایانی ڕەها یان دەزگایانی دیکتاتۆری دا ئەستەمە، چونکە ئەو دەزگایانە هاوکاری ڕژێمە

چەوسێنەرەکان دەکەن بۆ ڕێگرتن لە دروستبوونی ئۆپۆزیۆسۆنی ڕاستەقینە. ئەو زانیارییانەی میدیای ئازاد خستیە بەردەم خەڵك لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دا لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا ڕۆڵی گەورەی بینی. بەبێ ئەم زانیارییانە جەماوەری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ڕادەی ڕاستەقینەی دەسەڵات و پێشێلکارییەکانی بارۆنە دزەکانیان نەدەزانی و دژی ترەستەکانیان خۆیان ڕێکنەدەخست.

## ڕێکخستنەوەی دادگا

فرانکلین دی ڕۆزفەڵت، کاندیدی حیزبی دیموکرات و ئامۆزای تیدی ڕۆزفەڵت لە ساڵی ١٩٣٢ دا لە گەرمەی ڕۆچوونی ئابووری مەزن ( Great Depression) دا بوە سەرۆکی ئەمەریکا. ئەو بە ماندەیتێکی جەماوەرییەوە دەسەڵاتی گرتەدەست بۆ جێبەجێکردنی زنجیرە سیاسەتێك بۆ بەرەنگاربوونەوەی ڕۆچوونی ئابووری مەزن. لە کاتی ئاهەنگی سوێندخواردنەکەی دا لە سەرەتای ساڵی ١٩٣٣ دا یەك لەسەر چواری هێزی کار لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا بێکار بوون و چەندین کەس کەوتبوونە ناو گێژاوی هەژارییەوە. بەرهەمی پیشەسازی لەو کاتەوە کە ڕۆچوونەکە دەستیپێکردبوو لە ساڵی ١٩٢٩ دا زیاتر لە نیوە دابەزیبوو، وەبەرهێنان هەرەسیهێنابوو. ئەو پۆلیسییانەی ڕۆزفەڵت پێشنیازیکردبوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی بارودۆخەکە هەموو پێکەوە پێیان دەوترا نیو دیەڵ. ڕۆزفەڵت سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنا بە هێنانی ٪٥٧ ی دەنگی جەماوەر و حیزبی دیموکرات بوە زۆرینەی ناو هەردوو ئەنجوومەنەکانی کۆنگرێس و سەنات، بە ڕێژەیەکی وا کە تێپەڕاندنی یاسای نیو دیەڵی ئاسانکردبوو. لەگەڵ ئەمەش دا، هەندێك لە بەشەکانی یاساکە ڕووبەڕووی کێشەی دەستووری بوونەوە و خرانە بەردەم دادگای باڵا، کە لەوێدا ئەو دەسەڵاتەی هەڵبژاردن دابویە ڕۆزفەڵت کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبوو.

یەکێك لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی نیودیەڵ بریتیبوو لە یاسای بوژانەوەی پیشەسازی نەتەوەیی. بەشی یەکەمی یاساکە گرنگی بە بوژانەوەی

پیــشەسازی دا. ســەرۆك رۆزڤــەڵت و تیمەکــەی لــەو بڕوایــەدا بــوون کــە سنووردارکردنی ڕکابەریی پیشەسازی و پێدانی مافی زیاتر بـە کرێکـاران بـۆ پێکهێنـانی سـەندیکای کرێکـاران و ڕێکخـستنی سـتانداردەکانی کـارکردن، گرنگ بوون بۆ هەوڵـەکانی بوژانـەوەی پیـشەسازی. بەشـی دوەمـی یاسـاکە فەرمانگەی ژێرخانی گشتی دامەزراند، کە هەندێك لە پرۆژەکانی فەرمانگەکە بریتیبوون لە وێستگەی ڕێگای ئاسنینی شەقامی سیازدەیەم لە فیلادیلفیـا و پردی ترایبۆرۆ و بەنداوی مەزنی کوولی و ڕێگـای خێـرای دەرەوە کـە ناوچـە ســەرەکییەکانی رۆژئــاوای وەك فلۆریــدای بــە ناوجەرگــەی وڵاتــەوە دەبەســتەوە. ســەرۆك رۆزڤــەڵت لــە ١٦ حــوزەیرانی ١٩٣٣ دا یاســاکەی ئیمزاکرد و یاسای بوژانەوەی پیشەسازی نەتەوەیی کەوتە کـار. بەهـەرحاڵ، یاساکە هەر زوو لـە دادگاکـان دا ڕووبـەڕووی تەحـەدا بـۆوە. لـە ٢٧ مایـسی ساڵی ١٩٣٥ دا، دادگـای بـاڵا بـە تێکـڕای دەنگـی ئەنـدامانی بڕیـاری دا کـە بەشی یەکەمی یاساکە نادەستووری بوو. بڕیارەکەیان بـە تونـدی ئاماژەیـدا بەوەی کە *(ڕەنگە بارودۆخی نائاسایی پێویستی بە چارەسەری نائاسایی هەبێ، بەڵام ... بارودۆخی نائاسایی دەسەڵاتی دەستووریی دروستناکەن یان فراوانیان ناکەن)*

بـەر لـەوەی دادگـا بڕیـاری خـۆی بـدا، ڕۆزڤـەڵت دەسـتی کردبـوو بـە جێبەجێکردنی هـەنگاوی دوەمـی ئەجێنداکـەی و ئیمـزای یاسـای پاراسـتنی کۆمەڵایـەتی کردبـوو، کـە دەوڵـەتی خۆشـگوزەرانی مـۆدێرنی لـە ویلایەتـە یەککگرتوەکان دا خستەگەڕ کە بریتیبوو لـە موچـەی خانەنـشینی و موچـەی بێکاری و هاوکاری ئەو خێزانانەی منداڵی خوار تەمەن هەژدە ساڵیان هـەبوو لەگەڵ هەندێك هاوکاری تەندروستی گشتی و هاوکـاری بـۆ کەسـانی خـاوەن پێداویستی تایبـەت. ئـەو یاسـای نەتـەوەیی پەیوەندییـەکانی کرێکارانیـشی ئیمزاکـرد کـە هێـزی زیـاتری دایـە مافـەکانی کرێکـاران بـۆ دامەزرانـدنی سـەندیکاکان و گفتوگـۆی بەکۆمـەڵ دەربـارەی کرێکانیـان و ئەنجامـدانی مـانگرتن دژی خاوەنکارەکانیـان. ئـەم هەنگاوانـەش ڕووبـەڕووی تەحـەدا بوونەوە لە دادگای باڵادا. کاتێك دادگا خەریکی ئەم کێشانە بـوو، ڕۆزڤـەڵت بۆ جاری دوەم لە ساڵی ١٩٣٦ دا بە ماندەیتێکی بـەهێزەوە هەڵبژێرایـەوە و ٦١٪ دەنگی جەماوەری دەنگدەرانی هێنا.

لە کاتێك دا نێوبانگی لە بەرزترین ئاست دا بوو، ڕۆزڤەڵت نیازی نەبوو بیەڵێ دادگا بەشێکی تری ئەجێندای پۆلیسیەکانی بە لاڕێدا بەرێ. ئەو پلانەکانی خۆی لە یەکێك لە ووتارە ڕادیۆییەکانی (فایەرسایدچاتس)ی خۆی دا خستەڕوو کە بە شێوەیەکی زیندی لە ڕادیۆوە لە ۹ ئازاری ساڵی ۱۹۳۷ دا بڵاوکرایەوە. ئەو دەستیکرد بە ووتارەکەی بە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە لە خولی یەکەمی سەرۆکایەتیەکەی دا بەشی زۆری پۆلسییە پێویستەکانی بە زەحمەت لە دادگای باڵا قوتاریان بوو. ئەو بەردەوامبوو:

*(ئەو ئێوارەیەی مانگی ئازاری چوار ساڵ لەمەوبەرم بیردەکەوێتەوە کاتێك ووتاری یەکەمم لە ڕادیۆوە پێشکەشکردن. ئێمە ئەو کاتە لە ناوەڕاستی تەنگژەیەکی بانکی گەورەدا بووین. هەر زوو دوای ئەوە بە ڕەزامەندی کۆنگرێس داوامان لەنەتەوە کرد کە هەموو ئاڵتوون و دۆلارەکانیان بدەنە حکومەتی ویلایەتە یەکگرتوەکان. بوژانەوەکەی ئەمڕۆ دەیسلەمێنێ ئەو پۆلیسییە چەند ڕاست بوو. بەڵام کاتێك نزیکەی دوو ساڵ دواتر، ئەو مەسەلەیە خرایە بەردەم دادگای باڵا، دەستووری بوونی پۆلیسییەکە تەنیا بە پێنج دەنگ بەرامبەر بە چوار دەنگ ساخکرایەوە. گۆڕینی تەنیا یەك دەنگ هەموو هەوڵەکانی ئەم نەتەوە مەزنەی دەگێڕایەوە بۆ پاشاگەردانییەکی بێهیوا. چوار دادوەر بڕیاریان دا کە ماف لە سایەی گرێبەستی تایبەت دا بۆ چەسپاندنی شتێکی بێبایەخ پیرۆزتر بوو لە ئامانجە سەرەکییەکانی دەستوور بۆ دامەزراندنی نەتەوەیەکی خۆڕاگر. بێگومان نابێ جارێکیتر ئەم ڕیسکە بکەینەوە).* ڕۆزڤەڵت لە سەر قسەکانی بەردەوامبوو:

*(پێنجشەمەی ڕابوردوو وەسفی شێوازی حکومەتی ئەمەریکیم کرد وەك تیمێکی پێکهاتوو لە سێ ئەسپ کە لە لایەن دەستوورەوە دراوەتە گەلی ئەمەریکا بۆ کێڵانی کێلگەکەیان. سێ ئەسپەکە بێگومان بریتین لە سێ لقەکەی حکومەت: کۆنگرێس و دەسەڵاتی جێبەجێکردن و دادگاکان. دوان لە ئەسپەکان پێکەوە گاسنەکە ڕادەکێشن بەڵام سێیەمیان ئەوە ناکا).*

دواتر، ڕۆزڤەڵت ئاماژەیدا بەوەی کە دەستووری ئەمەریکا ئەو مافەی نەداوەتە دادگای باڵا تا ڕووبەڕووی دەستووری بوونی یاساکان ببێتەوە و دادگای باڵا ئەم ڕۆڵەی لە ساڵی ۱۸۰۳ دا خستۆتە ئەستۆی خۆی. لەو

سەردەمەدا، دادوەر بوشۆرد واشنتۆن بڕیاری دا کە پێویستە دادگای باڵا *(پشتگیری شیاویی یاسایەك بکا تا ئەو کاتەی پێشێلکردنی دەستوور بەهۆی ئەو یاسایەوە بەبێ هیشتنەوەی هیچ گومانێکی گونجاو دەسەلمێنرێ)*، دواتر ڕۆزڤەڵت ووتی:

*(لە ماوەی چوار ساڵی ڕابوردوودا ڕێسای سوودوەرگرتن لە هەموو گومانێکی گونجاو بەرامبەر یاساکان خراوەتە لاوە. دادگا وەك دەزگایەکی دادوەری کارینەکردوە، بەڵکو وەك دەزگایەکی دانانی پۆلیسی کاریکردوە).*

ڕۆزڤەڵت ڕایگەیاند کە ئەو ماندەیتی لە لایەن دەنگدەرانەوە پێدراوە تا ئەم بارودۆخە بگۆڕێ و *(دوای بیرکردنەوە لەوەی چ جۆرە چاکسازییەك پێشنیاز بکرێ، تەنیا ڕێگا، کە بە ڕوونی ڕێگایەکی دەستووری بوو،... بریتیبوو لەوەی خوێنی نوێ بکرێتە ناو هەموو دادگاکانمانەوە).* ئەو پێداگری لەسەر ئەوە کرد کە دادوەرانی دادگای باڵا هیلاکن و ئەو بارەی لەسەر شانیانە بۆ دادوەرانی بەتەمەن زۆر قورس بوو. واش ڕێکەوت کە ئەو جۆرە دادوەرانە ئەوانە بوون یاساکانی ئەویان ڕەتکردبۆوە. ئەو دواتر پێشنیازیکرد کە دەبێ هەموو دادوەرەکان لە تەمەنی حەفتا ساڵی دا ناچاری خانەنشینی بکرێن و دەرفەتیشی پێبدرێ کە ئەو بۆخۆی تا شەش دادوەر لە دادوەرانی دادگای باڵا دەسنیشانبکا. ئەم پلانە کە ڕۆزڤەڵت وەك پرۆژە یاسای ڕێکخستنەوەی دادوەری خستیە ڕوو، بەس بوو بۆ لادانی ئەو دادوەرانەی کە پێشتر لە لایەن ئیدارە زیاتر پارێزگارەکانەوە دانرابوون و هەر ئەوانیش بوون بە توندی دژی نیو دیەڵ بوون.

هەرچەندە ڕۆزڤەڵت زیرەکانە هەوڵیدا پشتگیریی جەماوەر بۆ هەنگاوەکەی پەیدابکا، بەڵام ڕاپرسییەکان دەریانخست کە تەنیا ٪٤٠ دانیشتوان پشتگیری پلانەکەیان کرد. لویس براندیس ئەو کاتە بووبوە دادوەری دادگای باڵا. هەرچەندە براندیس هاوسۆز بوو لەگەڵ زۆربەی ئەو یاسایانەی ڕۆزڤەڵت پێشنیازی کردبوون، بەڵام ئەو دژی هەوڵەکانی سەرۆك بۆ کزکردنی دەسەڵاتی دادگای باڵا و بانگەشەکانی سەرۆك کە گوایە دادوەرەکان هیلاك بوون قسەیکرد. حیزبی دیموکراتی ڕۆزڤەڵت خاوەنی زۆرینەی گەورە بوو لە هەردوو ئەنجوومەنەکەی کۆنگرێس دا، بەڵام ئەنجوومەنی نوێنەران کەمورزۆر دژی پرۆژە یاساکەی ڕۆزڤەڵت وەستا. دواتر

ڕۆزڤەڵت هەوڵەکانی خۆی لەگەڵ ئەنجوومەنی سەنات دا خستەکار. پرۆژە یاساکە ڕەوانەی لیژنەی دادوەری سەنات کرا و ئەوانیش کۆبوونەوەیەکی پڕ مشتومڕیان لەسەر کرد و ڕای جیاوازی لەبارەی پرۆژەکەوە تاوتوێکرد. لە کۆتایی دا ناردیانەوە بۆ هۆڵی سەنات لەگەڵ ڕاپۆرتێکی نیگەتیف دا کە پرۆژە یاساکە ( ناپێویست و بێسوود و وازهێنانێکی زەقە لە پرینسیپی دەستوور.. و هیچ پێشینە و پاساوێکی نییە) سەنات بە زۆرینەی دەنگی ٧٠ بەرامبەر ٢٠ بڕیاری ناردنەوەی پرۆژە یاساکەی دا بۆ لیژنەکە تا سەرلەنوێ دابڕێژرێتەوە. هەموو توخمەکانی "ڕێکخستنەوەی دادگا" دەرهێنران. ڕۆزڤەڵت نەیتوانی ئەو سنوورانەی دادگای باڵا بۆ دەسەڵاتەکەی دانابوو، لابەرێ. هەرچەندە دەسەڵاتەکانی ڕۆزڤەڵت سنووردار کران، بەڵام سازان ئەنجامدرا و یاسای پاراستنی کۆمەڵایەتی و یاسای نەتەوەیی پەیوەندییەکانی کرێکاران لە لایەن دادگاوە بە دەستووری ناسران.

گرنگتر لە چارەنووسی ئەم دوو یاسایە، وانەی سەرەکی بوو لەم ڕووداوە. دەزگایانی سیاسی کراوە نەك تەنیا چاودێری لادانی سەرەکی لە دەزگایانی ئابووری کراوە دەکەن، بەڵکو بەرەنگاری هەوڵەکانی لاوازکردنی بەردەوامیی خۆشیان دەبنەوە. لە بەرژەوەندی کۆنگرێسی دیموکراسی و سەنات بوو کە دادگا ڕێکبخەنەوە و پێداگر بن لەسەر ئەوەی کە هەموو یاساکانی نیودیەڵ تێدەپەڕن، بەڵام بە هەمان ئەو شێوەیەی نوخبە سیاسییەکانی بەریتانیا لەسەرەتای سەدەی هەژدەیەم دا دەیانزانی کە هەڵپەساردنی سەروەریی یاسا هەموو ئەو دەسکەوتانە دەخاتە مەرتسییەوە کە لە پاشایەتییان سەندبوو، ئەندامانی کۆنگرێس و سەناتیش دەیانزانی ئەگەر سەرۆك سەربەخۆیی دادوەری لاواز بکا، ئەوا ئەمە دەبوە هۆی لاوزابوونی باڵانسی دەسەڵات لە سیستەمەکەدا، ئەو باڵانسەی لە دەسەڵاتی سەرۆکەکان پاراستبوونی و بەردەوامیی دابوو بە دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی.

ڕەنگە ڕۆزڤەڵت لە داهاتوو دا بڕیاریبدایە کەبەدەستهێنانی زۆرینەی پەرلەمانی بۆ تێپەڕاندنی یاساکان سازان و کاتێکی زۆریان دەویست و لە بری ئەوە ئەو دەیوست لە ڕێگەی مەرسوومەوە حوکمبکا و ئەمەش بە تەواوی پلورەلیزم و سیستەمی سیاسی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکای

لە ناودەبرد. بە دڵنیاییەوە کۆنگرێس ئەمەی پەسەند نەدەکرد، بەڵام دواتر ڕۆزڤەڵت پەنای بۆ خەڵك دەبرد و بەو بیانوەی کۆنگرێس کۆسپ لەبەردەم ڕێگاکانی بەرەنگاربوونەوەی ڕۆچوونی ئابووری دادەنێ، ئەو دەیتوانی پۆلیس بەکاربهێنێ بۆ داخستنی کۆنگرێس. شیاوی ڕوودان نەبوو؟. ئەمەش کوتومت ئەوە بوو کە لە پیرۆ و ڤەنزەوێلا لە ساڵانی ١٩٩٠ ەکان دا ڕوویدا. هەردوو سەرۆك، فیوجیمۆری و شاڤێز پەنایانبردە بەر ماندێتە جەماوەرییەکەیان بۆ داخستنی کۆنگرێسە ناهاوکارەکان و دواتریش دەستووری وڵاتەکانیان نووسیەوە بۆ بەهێزکردنی لەڕادەبەدەری دەسەڵاتەکانی سەرۆك. هەر ترس لەم خزینە لە لایەن ئەوانەی لەسایەی دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی دا لە دەسەڵات دا هاوبەش بوون، بوو کە وڵپۆڵی ڕاگرت لە دەستخستنە ناو کاری دادگاکانەوە لە ساڵانی ١٧٢٠ کان دا و هەر ئەوەش بوو کە کۆنگرێسی ئەمەریکای ڕاگرت لە پشتگیری پلانەکەی ڕۆزڤەڵت بۆ ڕێکخستنەوەی دادگا. ڕۆزڤەڵت ڕووبەڕووی هێزی بازنەی بەختەوەری بۆوە.

بەڵام ئەم لۆجیکە هەمیشە کاری خۆی ناکا، بەتایبەتی لەو کۆمەڵگایانەدا کە ڕەنگە هەندێك سیمای کرانەوەیان هەبێ، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی چەوسێنەرن. ئێمە پێشتر ئەم داینەمیکەمان لە ڕۆم و ڤێنس دا بینی. ڕوونکردنەوەیەکی تر لە بەراوردکردنی هەوڵە سەرنەکەوتوەکانی ڕۆزڤەڵت بۆ ڕێکخستنەوەی دادگا لەگەڵ هەوڵی هاوشێوە لە ئەرجەنتین دا سەرچاوەدەگرێ کە لە وێدا هەمان ململانێ لە چوارچێوەی دەزگایانی ئابووری و سیاسی چەوسێنەری باڵادەست دا ئەنجامدرا.

لە ساڵی ١٨٥٣ دا دەستووری ئەرجەنتین دادگای باڵای دامەزراند کە ئەرکی هاوشێوەی ئەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکای هەبوو. بڕیارێك لە ساڵی ١٨٨٧ دا ڕێگەیدا بە دادگای باڵای ئەرجەنتین کە هەمان ئەو ڕۆڵەی دادگای ویلایەتە یەکگرتوەکان بگرێتەئەستۆ لە بڕیاردان لەسەر دەستووری بوونی هەندێك یاسای دیاریکراو. لە ڕووی تیۆرییەوە، دادگای باڵا دەیتوانی وەك یەکێك لە توخمە گرنگەکانی دەزگایانی سیاسی کراوەی ئەرجەنتین گەشەبکا، بەڵام باقی سیستەمە سیاسی و ئابوورییەکە بەشێوەیەکی چەوسێنەر مانەوە و نە هێزدارکردنی بەشی فراوانی کۆمەڵگا و

نـه پلـورەلیزم لـه ئەرجـەنتین دا سـەریانهەڵنەدا. هـەروەك لـه ویلایەتـه یەکگرتوەکـان دا، ڕۆڵـی دەسـتووریی دادگـای بـاڵا لـه ئەرجـەنتینیش دا ڕووبـەڕووی تەحـەدا بـۆوە. لـه سـاڵی ١٩٤٦ دا جـوان دۆمینگـۆ پێـرۆن بـه شێوەیەکی دیموکراسی وەك سەرۆکی ئەرجـەنتین هەڵبـژێررا. پـیرۆن پێشتر کۆلۆنێل و دوای کۆدێتای سەربازیی سـاڵی ١٩٤٣ لەسـەر ئاسـتی نەتـەوەیی دەرکـەوت و بـوە وەزیـری کـار. لـەم پۆسـتەی دا هاوپەیمانییـەکی سیاسـی لەگـەڵ سـەندیکای کرێکـاران و بزووتنـەوەی کرێکـاری دا پێکهێنـا کـه بـۆ گەیشتنە کورسی سەرۆکایەتی گرنگ بوو.

ماوەیـەکی کـەم دوای سـەرکەوتنی پـیرۆن، لایـەنگرانی لـه ئەنجوومـەنی نوێنەران دا پیشنیازی دوورخستنەوەی چوار لە پێنج دادوەرەکەی دادگایان کرد. چەندین تۆمەت خرابوە پاڵ دادگا. یەکێك لـه تۆمەتـەکان بریتیبـوو لـه پەسەندکردنی نادەستوورییانەی دوو ڕژێمـی سـەربازیی لـه سـاڵانی ١٩٣٠ و ١٩٤٣ دا، ڕەنگـه سـەیر بـێ، چـونکە پـیرۆن بۆخـۆی ڕۆڵـی سـەرەکی لـه کۆدێتاکەی دوەمیـان دا بینـی. یـەکێکی تـر لـه تۆمەتـەکان پەیوەنـدی بـەو یاسـایانەوە هـەبوو کـه دادگـا ڕەتیکردبوونـەوە بەهـەمان ئـەو شـێوەیەی هاوتاکـەی لـه ویلایەتـه یـەکگرتوەکان دا کردبـووی. بەتایبـەتی بـەر لـه هەڵبـژاردنی پـیرۆن وەك سـەرۆك، دادگـا بڕیاریـدابوو کـه بـۆردی نەتـەوەیی پەیوەندی کرێکاران کە پیرۆن پێشنیازیکردبوو نادەستووری بوو. بەهـەمان ئـەو شـێوەیەی ڕۆزفـەڵت لـه هەڵمـەتی هەڵبژاردنەکـەی سـاڵی ١٩٣٦ دا بـه قورسی ڕەخنەی لە دادگای بـاڵا گـرت، پیرۆنـیش لـه هەڵمـەتی هەڵبـژاردنی ساڵی ١٩٤٦ دا هـەمان شـتی کـرد. نـۆ مـانگ دوای دەسـپێکردنی پرۆسـەی دوورخستنەوەی دادوەرەکان، ئەنجوومەنی نوێنـەران سـێ لـه دادوەرەکـانی دوورخـستەوە و چـوارەمیش بـەر لـه بڕیارەکـه دەسـتی لـه پۆسـتەکەی کێشابۆوە. ئەنجوومەنی سەنات بڕیارەکەی پەسەندکرد و دواتر پیرۆن چـوار دادوەری نوێی دامەزراند. لاوازکردنی دادگا بوە هـۆی ئـازادکردنی پـیرۆن لـه کۆتوپێوەندە سیاسییەکانی سـەری. ئـەو دەیتـوانی بـەبێ بـوونی چـاودێری دەسەڵات بەکاربهێنێ بە هەمان ئەو شێوەیەی ڕژێمە سـەربازیەکانی پـێش و پاش سەرۆکایەتیەکەی کردیـان. بـۆ نموونـه، دادوەرە تـازە دامـەزراوەکانی پـیرۆن، بڕیاریـان دا کـه تاوانبـارکردنی ڕیکـاردۆ بـاڵبین، سـەرۆکی حیزبـی

ڕادیکاڵ کە حیزبی ئۆپۆزیۆسۆنی سەرەکی بوو، بە بێڕێزی نواندن بەرامبەر پیرۆن، دەستوورییە. پیرۆن توانی وەك دیکتاتۆرێك حوکمبکا.

لە کاتێك دا پێرۆن سەرکەوتوانە دادگای ڕێکخستەوە، ئیتر لە ئەرجەنتین دا بۆ هەموو سەرۆکێکی نوێ بوە نەریت کە بۆخۆی دادوەرانی دادگای باڵا دیاریبکا. بەم جۆرە دەزگایەکی سیاسی کە لەوانە بوو هەندێك سنوور بۆ دەسەڵاتی لایەنی جێبەجێکار دابنێ لە ئارادا نەما. ڕژێمەکەی پێرۆن لە ڕێگەی کۆدێتایەکی ترەوە لەساڵی ١٩٥٥ دا لەسەر کار لابرا و زنجیرەیەکی دووردرێژی گواستنەوە لە حوکمی سەربازییەوە بۆ حوکمی مەدەنی دەستپێکرد. هەردوو ڕژێمە سەربازی و مەدەنییەکان دادوەرانی خۆیان دیاریدەکرد، بەڵام دیاریکردنی دادوەرانی دادگای باڵا لە ئەرجەنتین چالاکییەك نەبوو کە تەنیا لە کاتی گواستنەوە لە نێوان حوکمی سەربازی و مەدەنی دا ئەنجامدەدرا. لە ساڵی ١٩٩٠ دا لە کۆتایی دا ئەرجەنتین گواستنەوەی لە نێوان حکومەتانی هەڵبژێراو بە شێوەیەکی دیموکراسی بەخۆوە بینی ـ حکومەتێکی دیموکراسی دوای یەکێکی تری دیموکراسی هات. لەگەڵ ئەمەش دا، هێندەی پەیوەندی بە دادگای باڵاوە هەبوو، ئیتر حکومەتانی دیموکراسی زۆر جیاوازتر لە حکومەتانی سەربازی ڕەفتاریان نەدەکرد. ئەو سەرۆکەی حوکمی گرتەدەست بریتیبوو لە کارلۆس سۆوڵ مێنم کە سەر بە حیزبەکەی پیرۆن بوو. دادگای باڵای ئەو کاتە دوای گواستنەوە بۆ دیموکراسی لە ساڵی ١٩٨٣ دا لە لایەن سەرۆك ڕاوڵ ئەلفۆنسین کە سەر بە حیزبی ڕادیکاڵ بوو دامەزرابوون. لەبەر ئەوەی ئەمە گواستنەوەیەکی دیموکراسی بوو، هیچ هۆکارێك نەبوو بۆ مێنم دادگای خۆی دابمەزرێنێ، بەڵام لە کاتی ئامادەکارییەکانی هەڵبژاردن دا، مێنم ڕەنگی ڕاستەقینەی خۆی دەرخست. ئەو بەردەوام، هەرچەندە ناسەرکەوتوانە، هەوڵی دا ئەندامانی دادگا هانبدا (تەنانەت چاوترسێنیان بکا) تا دەستبکێشنەوە لە کارەکانیان. ئەو پۆستی باڵوێزی دایە دادوەر کارلۆس فەیت، بەڵام ڕەتیکردەوە و فەیت لە ڕێگەی ناردنی کۆپییەکی کتێبەکەیەوە "یاسا و ڕەوشتبەرزی" وەڵامی دایەوە و تێبینیەکیشی لەسەر نووسی (ئاگادار بە من ئەمەم نووسیوە). بێ گوێدانە ئەمە، دوای سێ مانگ لە دەستبەکاربوونی، مێنم پرۆژە یاسایەکی نارد بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران بۆ

فراوانکردنی دادگا له پێنج ئەندامەوە بۆ نۆ ئەندام. یەکێك لە پاساوەکان هەمان ئەو پاساوە بوو کە ڕۆزڤەڵت لە ساڵی ١٩٣٧ دا بەکاری هێنابوو: باری سەر شانی دادگا قورسە. پرۆژە یاساکە هەر زوو لە ئەنجوومەنی سەنات و نوێنەران دا دەنگی لەسەر درا و ئەمەش دەرفەتیدایە مێنم تا چوار دادوەری نوێ دیاریبکا. ئەو بوە خاوەنی زۆرینە لە ناو دادگادا.

سەرکەوتنی مێنم بەسەر دادگای باڵا دا هەمان داینەمیکی سەرەولێژبوونەوەی خستەگەڕ کە پێشتر باسمانکرد. هەنگاوی داهاتووی بریتیبوو لە نوسینەوەی دەستوور بۆ لابردنی دیاریکردنی ماوەی سەرۆکایەتی بۆ ئەوەی جارێکیتر خۆی بۆ پۆستی سەرۆك کاندیدبکاتەوە. دوای ئەوەی هەڵبژێرایەوە، مێنم هەوڵی دا جارێکیتر دەستوور بنووسێتەوە، بەڵام نەك لە لایەن دەزگایانی سیاسی ئەرجەنتینەوە ڕێگەی لێگیرا، بەڵکو لە لایەن کۆتلەکانی ناو حیزبەکەی خۆیەوە کە دژی زاڵبوونی تاکە کەسی وەستانەوە.

هەر لە کاتی سەربەخۆییەوە، ئەرجەنتین تووشی خراپترین لەو کێشە دەزگاییانە بوو کە ئەمەریکای لاتینی گرتبۆوە. ئەرجەنتین لە ناو بازنەی ناهەمواری دا نەك بەختەوەری دا گیریخواردبوو. لە ئەنجامی ئەمەدا، پەرەسەندنێکی پۆزەتیڤی وەك ئەو هەنگاوانەی نران بەرەو دامەزراندنی دادگای باڵای سەربەخۆ هەرگیز خۆیان قایمنەکرد. بە بوونی پلورەلیزم هیچ گروپێك نایەوێ یان ناوێرێ دەسەڵاتی گروپێکی تر لەناوبەرێ لە ترسی ئەوەی نەوەك دواتر دەسەڵاتەکەی خۆشی ڕووبەڕووی تەحەدا ببێتەوە. لە هەمانکات دا، دابەشبوونی فراوانی دەسەڵات ئەم لەناوبردنە زەحمەتدەکا. دەشێ دادگای باڵا دەسەڵاتی هەبێ ئەگەر لە لایەن کۆمەڵێکی فراوانی کۆمەڵگاوە پشتگیری بکرێ، بیانەوێ هەموو ئەو هەوڵانە پووچەڵبکەنەوە کە دەیانەوێ سەربەخۆیی دادگا کەمبکەنەوە. ئەمەش ئەو حاڵەتە بوو لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا ڕوویدا نەك لە ئەرجەنتین. یاسادانەرانی ئەرجەنتین ئامادەبوون دادگا لاواز بکەن ئەگەرچی لەو بڕوایەشا بوون کە ئەمە پێگەی خۆشیان لەقدەکا. یەکێك لە هۆکارەکان ئەوەیە کە لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا نەهێشتنی دادگای باڵا دەسکەوتی زۆر دەستەبەر دەکا و قازانجەکان ئەوە دەهێنن لە پێناویان دا ڕیسکبکرێ.

# فیدباکی پۆزەتیڤ و بازنەی بەختەوەری

دەزگایانی ئابووری و سیاسی کراوە هەر لە خۆیانەوە سەرهەڵنادەن. ئەوانە زۆرجار ئاکامی ململانێی گەورەی نێوان ئەو نوخبانەن کە ڕێگرن لەبەردەم گەشەکردنی ئابووری و گۆڕانکاری سیاسی و ئەوانەی دەیانەوێ دەسەڵاتی ئابووری و سیاسی نوخبە دەسەڵاتدارەکە سنوورداربکەن. دەزگایانی کراوە لە کاتی وەرچەرخانە مێژووییەکان دا سەرهەڵدەدەن، وەك ئەوەی لە کاتی شۆڕشی شکۆداری ئینگلتەرە و دامەزراندنی کۆلۆنییەکەی جەیمستاون لە باکووری ئەمەریکا دا ڕوویاندا، کاتێك زنجیرەیەك فاکتەر هێزی ئەوانەی لە دەسەڵاتدان لاوازدەکەن و دەبنە هۆی بەهێزکردنی بەرهەڵستکارانی ئەوانەی خاوەن دەسەڵاتن و هاندان دروستدەکەن بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی پلورەلیستی. ئەنجامی ململانێی سیاسی هەرگیز ڕوون نییە، تەنانەت ئەگەر ئێمە دوای ڕووداوەکان ئاکامی چەندین ڕووداوی مێژوویی وەك حەتمی ببینین، ڕێچکەی مێژوو پەیوەستە. بەهەرحاڵ، کاتێك دەزگایانی ئابووری و سیاسی کراوە سەرهەڵدەدەن، هەوڵی دروستکردنی بازنەی بەختەوەری دەدەن کە پرۆسەی فیدباکی پۆزەتیڤە و دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەرفەتی مانەوەی دەزگاکان و تەنانەت فراوانبوونیشیان زیاتر بێ.

بازنەی بەختەوەری لە ڕێگەی چەندین میکانیزمەوە کاردەکا. یەکەم، لۆجیکی دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی دەبێتە هۆی ئەوەی کە زەوتکردنی دەسەڵات لە لایەن دیکتاتۆرێکەوە یان تاقمێکی ناو حکومەتەوە یان تەنانەت سەرۆکێکی نیاز پاکەوە زۆر زەحمەت تر بێ، هەروەك فرانکلین ڕۆزڤەڵت بۆی دەرکەوت کاتێك هەوڵی دا چاودێری سەر دەسەڵاتەکەی لابەرێ کە لە لایەن دادگای باڵاوە لەسەری دانرابوو، یان وەك سێر ڕۆبەرت وڵپۆڵ بۆی دەرکەوت کاتێك هەوڵیدا یاسای ڕەشپێستان بە شێوەیەکی ڕەمەکی جێبەجێبکا. لە هەردوو حاڵەتەکەدا چڕکردنەوەی دەسەڵات لە چنگی تاکە کەسێك یان گروپێکی بچووك دا دەبوەهۆی لەقکردنی

بناخــەکانی دەزگایــانی سیاســی پلورەلیــستی. پێوانــەی ڕاســتەقینەی پلــورەلیزم بریتییــە لــە توانــای خــودی پلــورەلیزم لــە بەرەنگاربوونــەوەی تەقەلای لەم شێوەیە. پلورەلیزم سەروەریی یاسـا لـەخۆدەگریٚ، پرینسیپی ئەوەی کە پێویستە یاسا بە شێوەیەکی یەکسان بەسـەر هـەموو کەسـێك دا جێبەجێبکریٚ، ئەمەش شتێکە لە سایەی پاشایەتی ڕەهادا ئەستەمە. بـەڵام سەروەریی یاسا بەدەوری خۆی ئەوە دەگەیەنیٚ کە ناکریٚ یاساکان لە لایەن گروپێکەوە بەکاربهێنرێن بۆ پێشێلکردنی مـافی گروپێکی تـر. جگـە لەمـە، پرینــسیپی ســەروەریی یاســا دەرگــای بەشــداریکردنی زیــاتر لــە پرۆســەی سیاسی و کرانەوەی زیاتر دەکاتەوە کاتێك بە هێزێکی زۆرەوە ئـەو ئایدیایـە دەخاتە ڕوو کە پێویـستە خـەڵك نـەك تـەنیا لەبـەردەم یاسـادا یەکسان بـن بەڵکو لە ناو سیستەمە سیاسییەکەش دا یەکسان بن. ئەمەش یەکێك بوولەو پرینسیپانەی کە وایکرد بۆ سیستەمی سیاسی بەریتانی زەحمەت بیٚ ڕێگری لەو داواکارییە بەهێزانە بکا بۆ دیموکراسـی زیـاتر لـە سەرتاسـەری سـەدەی نۆزدەیەم دا و ئەمەش ڕێگای کردەوە بۆ فراوانکردنی دەنگدان بۆ هەموان.

دوەم، هەروەك چەندین جار لەمـەوپێش بینیومانـە، دەزگایـانی سیاسـی کراوە پشتگیری دەزگایانی ئابووری کراوە دەکـەن و لـە لایـەن ئەوانیـشەوە پــشتگیریدەکرێن. ئەمــەش میکــانیزمێکی تــری بازنــەی بەختــەوەرەی دروستدەکا. دەزگایانی ئابووری کراوە پەیوەندییە زۆر خراپـەکانی ئـابووری چەوسێنەر لە شێوەی کۆیلەیەتی و بەندایەتی دا هەڵدەوشێننەوە ۆ بایـەخی مۆنۆپۆلییــەکان کەمدەکەنــەوە و ئابوورییــەکی داینــەمیك دروســتدەکەن، هەموو ئەمانەش ئەو سوودە ئابوورییانـە کەمدەکەنـەوە، بەلایـەنی کەمـەوە لەمەودایـەکی کـورت دا، کـە یـەکێك لـە ڕێگـەی زەوتکردنـی دەسـەڵاتی سیاسـییەوە دەسـتیدەکەویٚ. لەبـەر ئـەوەی لـە سـەدەی هەژدەیـەم دا دەزگایـانی ئـابووری لـە بـەریتانیادا بەشـێوەیەکی ڕێـژەیی کـراوە بـوون، نوخبەکان دەسکەوتیان بە چنگ گیرکردنیان لە دەسەڵات کەمتر دەبـوو، لـە ڕاستیشدا زیانیان زۆرتر دەبوو بە بـەکارهێنانی سـەرکوتکردنی بـەربڵاو دژی ئەوانــەی داوای دیموکراســی زیاتریــان دەکــرد. ئــەم ســیمایەی بازنــەی بەختــەوەری کــارێکی وایکــرد کــە کــاروانی بەرەبــەرەی دیموکراســی لــە بــەریتانیای ســەدەی نۆزدەیــەم دا کــەمتر هەڕەشــە لــە نوخبــەکان بکــا و

دەرفـەتی سەرکەوتنیـشی زیـاتر بـێ. ئەمـە پێـچەوانەی بـارودۆخی ڕژێمـە ڕەهاکانی وەك نەمسا ـ هـەنگاریا و ئیمپراتۆریـەتی ڕوسـیا بـوو، کـە دەزگا ئابوورییەکان تیایـان دا زۆرتـر چەوسـێنەر بـوون و لـە ئـەنجامی ئەمـەش دا داواکارییـەکان بـۆ کرانـەوەی سیاسـی زیـاتر لـە سـەدەی نۆزدەیـەم دا بـە سەرکوتکردن وەڵامدرانەوە، چونکە نوخبەکان بە بەشداریکردنی خەڵکی تـر لە دەسەڵات دا زیانی گەورەیان دەکرد.

لە کۆتایی دا، دەزگایانی سیاسی کراوە بواری گەشەکردنی میدیای ئازاد دەدەن و میـدیای ئـازادیش زۆرجـار زانیـاری دەربـارەی هەڕەشـەکانی سـەر دەزگایانی کراوە دەخاتـە ڕوو و وەسـتانەوە دژی ئـەو هەڕەشـانە مـۆبیلیزە دەکا، هەورەك لە دوا چارەکی سەدەی هەژدەیەم و یەکەم چارەکی سەدەی بیـستەم دا کـردی کاتێـك باڵادەسـتی زیـاتری بارۆنـە دزەکـان هەڕەشـەیان لەجەوهـەری دەزگایـانی ئـابووری کـراوە کـرد لـە ویلایەتـە یـەکگرتوەکانی ئەمەریکادا.

هەرچەندە ئاکامی ئەو ململانێیانەی هەمیشە لە ئـارادان، بەردەوامـدەبن لەوەی پەیوەست بن، لـە میانـەی ئـەم میکانیزمانـەوە بازنـەی بەختـەوەری ویـستێکی بـەهێز دروسـتدەکا بـۆ ئـەوەی دەزگایـانی کـراوە بـەردەوامبن و بەرەنگاری تەحەداکان ببنەوە و فراوان بن هەروەك لـە بـەریتانیا و ویلایەتـە یـەکگرتوەکان دا ڕوویـدا. بەداخـەوە، هـەورەك لـە چـاپتەری داهـاتوو دا دەبینین دەزگایانی چەوسـێنەریش هێـزی گـەورەی هاوتـا بـۆ بـەردەوامییان دروستدەکەن کە ئەویش پرۆسەی بازنەی ناهەمووارییە.

# ١٢

# بازنەی ناهەمواری
# (The Vicious Circle)

## چیتر ناتوانیت بە شەمەنەفەر برۆیت بۆ (بۆ)

هەموو وڵاتی سیارا لیۆنی ڕۆژئاوای ئەفریقا لە ساڵی ١٨٩٦ دا بوە کۆڵۆنی بەریتانیا. فریتاونی پایتەختی سیارا لیۆن لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم دا وەك شوێنی نیشتەجێبوونی ئەو کۆیلانەی دەنێرانەوە و ئازاددەکران، دروستکرابوو. کاتێك سیارا لیۆن بوە کۆڵۆنی بەریتانیا، ناوچەکانی ناوەوەی سیارا لیۆن هێشتا لە چەندین پاشایەتی بچووکی ئەفریقی پێکهاتبوون. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم دا، بەریتانییەکان بەرەبەرە دەسەڵاتی خۆیان بۆ ناوچەکانی ناوەوە درێژکردەوە لە ڕێگەی بەستنی زنجیرەیەکی درێژ لە پەیمان لەگەڵ فەرمانڕەوا ئەفریقییەکان دا. لە ٣١ ئابی ساڵی ١٨٩٦ دا بەریتانییەکان لە ڕێگەی ئەم پەیمانانەوە کۆڵۆنییەکەیان وەك ناوچەیەکی پارێزراو لە لایەن بەریتانیاوە ڕاگەیاند. بەریتانییەکان فەرمانڕەوایانی گرنگیان دۆزییەوە و ناونیشانی نوێیان پێبەخشین کە سەرۆك هۆزی مەزن بوو. بۆ نموونە، لە ڕۆژهەڵاتی سیارا لیۆن دا، لە ناوچەی دەرهێنانی ئەڵماسی ئەمڕۆی کۆنۆ دا، سولۆکۆ دەژیا کە پاشایەکی جەنگاوەری گرنگ بوو. سۆلۆکۆ پاشا کرایە سەرۆك هۆزی مەزن سۆلۆکۆ و ناوچەی ساندۆر وەك یەکەیەکی کارگێڕیی لە سیارا لیۆنی پارێزراودا دروستکرا.

هەرچەندە پاشایانی وەك سولۆکۆ پەیمانیان لەگەڵ فەرمانڕەوای بەریتانیادا ئیمزا کردبوو، ئەوان نەیانزانیبوو کە ئەم پەیمانانە وەك بەڵێن لێکدەدرێنەوە بۆ دامەزراندنی کۆڵۆنییەك. کاتێك بەریتانییەکان ویستیان باجی کۆخ بسەپێنن ـ باجێکی پێنج شلینگی لەسەر هەموو خانویەك ـ سەرۆك هۆزەکان ڕاپەڕین و جەنگی ناوخۆ دەستیپێکرد کە بە یاخیبوونی باجی کۆخ ناسرا. لە سەرەتادا لە

باکوورەوە دەستیپێکرد، بەڵام لە باشووردا لە هەموو ناوچەکانی تر بەهێزتر و زیاتریشی خایاند بەتایبەتی لە مێندیلاند کە گروپی ئێتنی مێندی لە ناوچەکەدا باڵادەست بوون. یاخیبوونەکەی باجی کوخ هەر زوو سەرکوتکرا، بەڵام هۆشداری دایە بەریتانییەکان دەربارەی تەحەداکانی کۆنترۆڵکردنی ناوجەرگەی سیارا لیۆن. بەریتانییەکان پێشتر دەستیانکردبوو بە دروستکردنی ڕێگایەکی ئاسنین لە فریتاونەوە بۆ بەشەکانی ناوەوەی سیارا لیۆن. کاری ئەنجامدانی پرۆژەکە لە ئازاری ساڵی ١٨٩٦ دا دەستیپێکرد و ڕێگاکە لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٨٩٨ دا و لە گەرمەی یاخیبوونی باجی کوخ دا گەیشتە شارۆچکەی سۆنگۆ. لە تۆمارەکانی پەرلەمانی بەریتانیادا لە ساڵی ١٩٠٤ دا هاتوە کە:

*(لە حاڵەتی ڕێگای ئاسنینی سیارا لیۆن دا، یاخیبوونەکەی دانیشتوانی خۆماڵی کە لە شوباتی ساڵی ١٨٩٨ دا دەستیپێکرد، بوە هۆی وەستانی تەواوی کارەکان و بڵاوەپێکردنی فەرمانبەران بۆ ماوەیەکی زۆر. یاخیبوەکان پەلاماری ڕێگا ئاسنینەکەیان دا و لە ئەنجامدا پێویست بوو هەموو فەرمانبەرەکان بکێشرێنەوە بۆ فریتاون. ڕۆتیفەنك، کە ئێستا دەکەوێتە سەر ڕێگاکە و ٥٥ میل لە فریتاونەوە دوورە، بەتەواوی لە ژێردەستی یاخیبوەکان دا بوو).*

لە ڕاستیدا، ڕۆتیفەنك لە ساڵی ١٨٩٤ دا لەسەر ڕێگای ئاسنینی پلان بۆدانراودا نەبوو. ڕێڕەوی ڕێگاکە دوای سەرهەڵدانی یاخیبوونەکە گۆڕا و لەبری ئەوەی بەرەو باکووری ڕۆژهەڵات بڕوات، بەرەو باشوور ڕۆیشت لە ڕێگەی ڕۆتیفەنك و لەوێشەوە بەرەو بۆ تا مێندیلاند. بەریتانییەکان ویستیان ڕێگای خێرا بۆ مێندیلاند، ناوجەرگەی یاخیبوونەکە و ناوچە نائارامەکانی تری ناوەوە دروستبکەن بۆ سوووەرگرتن لێی ئەگەر یاخیبوونی تر لەو ناوچانەدا بەرپا بوو.

کاتێك سیارا لیۆن لە ساڵی ١٩٦١ دا سەربەخۆ بوو، بەریتانییەکان دەسەڵاتیان ڕادەستی سێر میلتۆن مارگای و حیزبی گەلی سیارا لیۆن (SLPP) کرد کە ئەو سەرۆکایەتی دەکرد و بە زۆری لە ناوچەکانی باشوور، بەتایبەتی مێندیلاند و ڕۆژهەڵات دا لایەنگرانی هەبوو. دوای سێر مێلتۆن، سێر ئەلبێرت مارگای برای لە ساڵی ١٩٦٤ دا بوە سەرۆك وەزیران. لە ساڵی ١٩٦٧ دا حیزبی (SLPP) بە زۆرینەیەکی کەم هەڵبژاردنەکەی بە ئۆپۆزیۆسۆن، حزبی کۆنگرێسی هەموو گەل (APC)، دۆڕاند کە سیاکا ستیڤنس سەرۆکایەتی

دەکرد. ستیڤنس سەر بە لیمبا بوو لە باکوور و بەشی زۆری لایەنگرانی (APC) لە ناو گروپە ئێتنیەکانی باکووردا بوون کە بریتیبوون لە لیمبا و تێمنی و لۆکۆ.

هەرچەندە ڕێگا ئاسنینەکە بەرەو باشوور لە سەرەتادا لە لایەن بەریتانییەکانەوە بۆ ئەوە دروستکرا تا فەرمانڕەوایی سیارا لیۆن بکەن، بەڵام بە هاتنی ساڵی ١٩٦٧، ڕۆڵی ڕێگاکە بوە ڕۆڵێکی ئابووری بۆ گواستنەوەی بەشی زۆری هەناردەکانی وولات لە قاوە و کۆکا و ئەڵماس. ئەو جووتیارانەی قاوە و کۆکایان دەڕواند مێندی بوون و ڕێگاکەش پەنجەرەی مێندیلاند بوو بەرەو جیهان. مێندیلاند بە زۆری لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٦٧ دەنگیدا بۆ ئەلبێرت مارگای. ستیڤنس زیاتر ئارەزووی هێشتنەوەی دەسەڵاتەکەی دەکرد لەوەی بایەخ بە هەناردەکانی ناوچەی مێندیلاند بدا. پاساوەکەی ساکار بوو: هەرچییەك بۆ مێندی باشبوو ئەوا بۆ (SLPP) باش و بۆ ستیڤنس خراپبوو. ئەو ڕێگا ئاسنینەکەی بۆ مێندیلاند هەڵوەشاندەوە و هێڵ و فارغۆنەکانی فرۆشت بۆ ئەوەی تا دەکرا گۆڕانکارییەکە پێچەوانە نەکرایەتەوە. ئێستا ئەگەر لە فریتاونەوە بەرەو ڕۆژهەڵات بە ئۆتۆمبیل گەشت بکەیت، ئەوا بە تەنیشت وێستگەکانی هەیستینگس و واتەرلۆدا تێدەپەڕی. چیتر شەمەنەفەر ناڕوات بەرەو بۆ. بێگومان ڕەفتارە نائاساییەکانی ستیڤنس هەندێك لە چالاکترین سێکتەری ئابووری سیارا لیۆنی هەڵتەکاند. هەروەك زۆربەی سەرکردە ئەفریقییەکانی دوای سەربەخۆیی، کاتێك مەسەلە هاتەسەر هەڵبژاردن لە نێوان قایمکردنی دەسەڵاتی خۆی و گەشەی ئابووری دا، ستیڤنس قایمکردنی دەسەڵاتەکەی هەڵبژارد و هەرگیزیش ئاوڕی بۆ دواوە نەدایەوە. ئەمڕۆ ناتوانی چیتر سواری شەمەنەفەر ببیت بەرەو بۆ، چونکە بە هەمانشێوەی قەیسەر نیکۆلاسی یەکەم، کە لەوە ترسا ڕێگای ئاسنین شۆڕش بۆ ڕوسیا بگوێزێتەوە، ستیڤنسیش لەو باوەڕەدا بوو کە ڕێگای ئاسنین بەرهەڵستکارەکانی بەهێزدەکا. بە هەمانشێوەی چەندین فەرمانڕەوای تر کە کۆنترۆڵی دەزگایانی چەوسێنەریان کردوە، ئەو لەو تەحەدایانە ترسا کە ڕووبەڕووی دەسەڵاتی سیاسی دەبوونەوە و ئامادەبوو گەشەی ئابووری بکاتە قوربانی دوورخستنەوەی ئەو تەحەدایانە.

لە تێڕوانینی سەرەتایی دا ستراتیژییەکەی ستیڤنس پێچەوانەی ئەوەی بەریتانییەکان بوو، بەڵام لە ڕاستیدا، بەردەوامییەکی زۆر لە نێوان حوکمی بەریتانییەکان و ڕژێمەکەی ستیڤنس دا هەبوو کە لۆجیکی بازنەی ناهەمواری

ڕووندەکاتەوە. ستیڤنس لە ڕێگەی دەرکێشانی دەرامەت لە گەلەکەی، حوکمی سیارا لیۆنی کرد بە بەکارهێنانی ڕێگای هاوشێوەی ئەو ڕێگایانەی بەریتانییەکان بەکاریانهێنا. ئەو لە ساڵی ١٩٨٥ دا هێشتا لە دەسەڵات دا بوو، نەك لەبەر ئەوەی ئەو لە لایەن جەماوەرەوە هەڵبژێرابوو، بەڵکو لەبەر ئەوەی دوای ساڵی ١٩٦٧ ئەو دیکتاتۆریەتێکی ڕەفتار توندوتیژی دامەزراند و کەوتە کوشتن و ڕاوەدونانی بەرهەڵستکارە سیاسییەکانی، بەتایبەتی ئەندامانی (SLPP). ئەو لە ساڵی ١٩٧١ دا خۆی کردە سەرۆك کۆمار و دوای ساڵی ١٩٧٨ سیارا لیۆن بوە خاوەنی تەنیا یەك حیزبی سیاسی کە (APC) ستیڤنس بوو. بەم شێوەیە ستیڤنس سەرکەوتوانە دەسەڵاتی خۆی قایمکرد، ئەگەرچی نرخی ئەوە هەژارکردنی زۆربەی ناوچەکانی ناوەوەی وڵات بوو.

لە ماوەی کۆلۆنیالی دا بەریتانییەکان سیستەمی فەرمانڕەوایی ناڕاستەوخۆیان بەکارهێنا بۆ بەڕێوەبردنی سیارا لیۆن، بەهەمان ئەو شێوەیەی لەگەڵ زۆربەی کۆلۆنییە ئەفریقییەکانیان دا کردیان. بناخەی ئەم سیستەمە سەرۆك خێڵە مەزنەکان بوون کە باجیان کۆدەکردەوە و دادوەرییان دەکرد و ئاسایشیان دەپاراست. بەریتانییەکان مامەڵەیان لە کەڵ جووتیارانی قاوە و کۆکادا دەکرد نەك لە ڕێگەی دابڕینیان، بەڵکو لەڕێگەی ناچارکردنیان بە فرۆشتنی بەرهەمەکانیان بە بۆردی فرشتن کە لە لایەن فەرمانگەی کۆلۆنیالییەوە، گوایە بۆ یارمەتیدانی جووتیاران، دامەزرابوو. نرخی بەروبومە کشتوکاڵییەکان بە دریژایی کات هەڵچوون و داچوونی زۆری بەخۆوە دەبینی. نرخی کۆکا ڕەنگە ساڵێك بەرز بوایە، بەڵام ساڵي دواتر نزم دەبۆوە. بەپێی ئەم هەڵچوون و داچوونە داهاتی جووتیارانیش بەرز و نزم دەبۆوە. پاساوی بۆردی فرۆشتن ئەوەبوو کە ئەوان نەك جووتیاران بەرگەی هەڵچوون و داچوونی نرخەکان دەگرن. کاتێك نرخە جیهانییەکان نزم بوون ئەوان بە پێچەوانەوە ڕەفتاریان دەکرد. ئەمە لە ڕووی پرینسیپەوە پێدەچوو بیرۆکەیەکی باش بێ، بەڵام ڕاستییەکە تەواو جیاواز بوو. بۆردی فرۆشتنی بەرهەمەکان لە سیارا لیۆن لە ساڵی ١٩٤٩ دا دامەزرا. بێگومان بۆردەکە سەرچاوەیەکی داهاتی پێویست بوو تا کارەکانی ئەنجامبدا. ڕێگەیەکی سروشتی پەیداکردنی ئەم داهاتە بریتیبوو لە پێدانی پارە بە جووتیاران نەختێك کەمتر لەوەی لە ساڵێکی باش یان خراپ دا دەبوایە وەریانبگرتایە. ئەم پارەیە بەکاردەهێنرا بۆ دابینکردنی

خەرجی فەرمانبەران و خەرجییە کارگێرییەکان. هەر زوو نەختە کەمەکە بوە زۆر کەم. دەوڵەتی کۆلۆنیالی بۆردی فرۆشتنی بەکاردەهێنا وەك ڕێگەیەك بۆ وەرگرتنی باجی زۆر لە جوتیارەکان.

زۆرکەس چاوەڕێیدەکرد ڕەفتارە خراپەکانی سەردەمی کۆلۆنیالی لە ئەفریقای باشووری بیابان دا دوای سەربەخۆیی نەمێنن و بەکارهێنانی بۆردەکانی فرۆشتن بۆ وەرگرتنی باجی لە ڕادەبەدەر لە جووتیاران بوەستێنرێ، بەڵام هیچ یەکێك لەمانە ڕوویاننەدا. لە ڕاستیدا چەوساندنەوەی جووتیاران لە ڕێگەی بەکارهێنانی بۆردەکانی فرۆشتنەوە زۆر خراپتر بوو. لە ناوەڕاستی ساڵانی ١٩٦٠ کان دا، جووتیارانی بەرهەمێنەری ناوکی خورمای ڕۆن تەنیا لە ٪٥٦ی نرخی جیهانییان لە بۆردەکانی فرۆشتن وەردەگرت: جووتیارانی کۆکا ٪٤٨ و جووتیارانی قاوە ٪٤٩. لەو کاتەی ستیڤنس لە ساڵی ١٩٨٥ دا وازی لە دەسەڵات هێنا و بواری دایە ئەو جێگرەوەیەی کە بۆخۆی دەسنیشانی کردبوو، جۆزیف مۆمۆ، تا ببێتە سەرۆك، ئەم ژمارانە بووبوونە ٪٣٧ و ٪١٩ و ٪٢٧ بەپێی ڕیزبەندی سەرەوە. ئەمە چەندە جێگەی بەزەیی بێ، هێشتا باشتر بوو لەوەی جووتیاران لەسەردەمی ستیڤنس دا وەریان دەگرت کە زۆرجار لە ٪١٠ کەمتر بوو. ٪٩٠ی داهاتی جووتیارەکان لە لایەن حکومەتەکەی ستیڤنسەوە لە جووتیاران دەستێنرا، نەك بۆ دابینکردنی خزمەتگوزاری گشتی وەك ڕێگاوبان یان پەروەردە، بەڵکو بۆ دەوڵەمەندکردنی خۆی و دەستوپێوەندەکانی و بۆ کڕینی پشتگیریی سیاسی.

وەك بەشێك لە حوکمی ناڕاستەوخۆ، بەریتانییەکان ڕازیبوون کە سەرۆك خێڵی مەزن تا لە ژیان دا بوایە لە پێگەکەی خۆی دا بمایاتەوە. بۆ ئەوەی یەکێك بۆی هەبوایە ببێتە سەرۆك دەبوایە ئەندامی "بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوا"ی دیار بوایە. ناسنامەی بنەماڵە فەرمانڕەواکان بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانکاری بەسەردا هات، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دا لەسەر بنەمای بنەچەی پاشاکان لە ناوچەیەکی دیاریکراو و ئیمزاکردنی پەیمان لە لایەن خێزانە نوخبەکانەوە لەگەڵ بەریتانییەکان دا، دامەزرابوو. سەرۆکەکان هەڵدەبژێرران بەڵام هەڵبژاردنەکە بە شێوەیەکی دیموکراسی نەبوو. ناوەندێك کە پێیدەوترا دەسەڵاتی خێڵەکی کە ئەندامانی لە سەرۆکە پایە کەمترەکانی گوندەکان بوون یان لە لایەن سەرۆکە مەزنەکانەوە یان سەرۆکی گوندەکان یان

دەسەڵاتی بەریتانییەوە دادەنران، بڕیاریـان دەدا کـێ دەبـوە سـەرۆکی مـەزن. ڕەنگە کەسێك لەو بڕوایەدا بێ کە ئەم دەزگا کۆلۆنیاڵییانـە دوای سـەربەخۆیی هەڵوەشـێنرانەوە یـان بەلایـەنی کەمـەوە ڕیفرۆرمیـان تێـداکرا، بـەلام هـەورەك بۆردەکانی فرۆشتن، ئەمە ڕوویندا و بەبێ هـیچ گۆڕانکارییـەك بـەردەوامبوون. ئەمڕۆش سەرۆکە مەزنەکان بەرپرسن لە کۆکۆدنەوەی باج. چیتر باج باجی کوخ نییە، بەلام پەیوەندییەکی نزیکی هەیە کە بریتییە لە باجی هەڵبژاردن و لەوانـە دەسەندرا کە مافی دەنگدانیان لـە هەڵبژردنـەکان دا هـەبوو. لـە سـاڵی ۲۰۰۵ دا دەسـەڵاتی خێڵـەکی لـە سـاندۆر سـەرۆك خێڵێکـی مـەزنی هەڵبـژارد. لـەو هەڵبژاردنـەدا تـەنیا کاندیـدی بنەماڵـەی فـەرمانڕەوای فاسـولوکۆ، کـە تـەنیا بنەماڵـەی فـەرمانڕەوا بـوون لـە ناوچـەکەدا، توانیـان خۆیـان بپـاڵێون. ئـەوەی سەرکەوتنی بەدەستهێنا بریتیبوو لە شێکو فاسولوکۆ کە کوڕە زازای سولوکۆ پاشا بوو.

هەڵسوکەوتی بۆردەکانی فرۆشتن و سیستەمی تەقلیدی خاوەنـداریێتی زەوی زۆر بەباشی شرۆڤەی ئەوە دەکەن کە بۆچی بەرهەمی کشتوکاڵی لە سیارا لیۆن و زۆربـەی ناوچـەکانی باشـووری بیابـانی ئـەفریقا دا ئەوەنـدە نزمـە. زانـای سیاسەت ڕۆبەرت بەیتس لە ساڵانی ۱۹۸۰ کان دا کەوتە لێکۆڵینەوە لە هۆکاری ئەوەی کە بۆچی کشتوکاڵ هێندە بەرهەمکزە لە ئەفریقادا، هەرچەندە بـە پێـی ئـابووری نـاو کتێبـەکان دەبوایـە کـشتوکاڵ داینـەمیکترین سـێکتەری ئـابووری بوایە. ئەو گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ئەمە هیچ پەیوەندی بە جوگرافیـا یـان ئـەو فاکتەرانەوە نییە کە لـە چـاپتەری دوەم دا باسـکران کـە گوایـە بوونەتـە هـۆی ئەوەی بەرهەمی کشتوکاڵی نزم بێ، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە سیاسەتی دانانی نـرخ لـە لایـەن بۆردەکـانی فرۆشـتنەوە هـەموو هانـدانێکی بـۆ وەبـەرهێنان و بەکارهێنانی پەیین یان پاراستنی زەوی لەناوبردبوو.

هۆکاری ئەوەی کە سیاسەتەکانی بۆردەکانی فرۆشتن ئەوەنـدە نـامۆ بـوون بە بەرژەوەندییەکانی ناوچە گوندنشینەکان ئەوە بـوو کـە ئـەم بەرژەوەندییانـە هیچ دەسەڵاتێکی سیاسییان لە پشت نەبوو. سیاسـەتەکانی نـرخ دانـان لەگـەڵ فاکتەرەکانی تـردا کاریـان لەیـەك کـردو بوونـە هـۆی ئـەوەی مـاوەی مانـەوەی جووتیـاران لـە سـەر زەوییـەکانیان جـێگیر نـەبێ و ئەمـەش بـوە هـۆی زیـاتر لاوازکردنی هاندانەکان بۆ وەبەرهێنان. لە سیارا لیۆن، سەرۆکە مەزنەکان تـەنیا

یاسا و ئاسایش و خزمەتگوزاری دادوەری و کۆکۆدنەوەی باج دابیناکەن، بەڵکو ئەوان "پارێزەرانی زەوی"شن. هەرچەندە خێزانەکان و هۆزەکان و بنەماڵە فەرمانڕەواکان مافی بەکارهێنانی زەوی و مافی تەقلیدییان بەسەر زەوییەکانەوە هەیە، لە کۆتایی دا دوا بڕیار لای سەرۆکەکانە کە کێ لە کوێ کشتوکاڵ دەکا. مافەکانی مۆڵکداریت بۆ زەوی تەنیا ئەو کاتە جێگیرە کە کەسێکی نزیکی سەرۆک بیت و ڕەنگە دەبێ لە هەمان بنەماڵەی فەرمانڕەوا بیت. زەوی ناکرێ بکڕدرێ و بفرۆشرێ یان وەك بارمتە لە بری قەرزێك دابنرێ ئەگەر لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی خێڵ دا لە دایك بوبیت، ناتوانیت هیچ ڕوەکێکی وەك قاوە و کۆکا یان دارخورما بڕوێنی لەترسی ئەوەی لەوانەیە ئەمە مافی موڵکداری ئەمری واقیعت بداتێ.

جیاوازی نێوان ئەو دەزگا چەوسێنەرانەی لە لایەن بەریتانییەکانەوە لە سیارا لیۆن دامەزران لەگەڵ ئەو دەزگا کراوانەی لە کۆلۆنییەکانی تری وەك ئوستڕالیا دا دامەزران، لە ڕێگەی بەڕێوەبردنی دەرامەتە کانزاییەکانەوە ڕووندەکرێتەوە. ئەڵماس لە کۆنتۆی ڕۆژهەڵاتی سیارا لیۆن دا لە ساڵی ۱۹۳۰ دا دۆزرایەوە. ئەڵماسەکان لەو جۆرە بوون کە لە بنی ڕووبارەکان دا نیشتبوون، بەو واتایەی لە کانی قووڵ دا نەبوون. بۆیە ڕێگەی سەرەکی دەرهێنانیان بریتیبوو لە بەکارهێنانی تەشت و بێژنگی تایبەتی بۆ دەرهێنان و بێژانەوەی لیتەی ناو ڕووبارەکان. هەندێك لە زانا کۆمەڵایەتییەکان ئەم شێوازەی دەرهێنانی ئەڵماس بە "ئەڵماسی دیموکراسی" ناودەبەن چونکە دەرەفەتیان دەدایە خەڵکێکی زۆر تا لە دەرهێنانی ئەڵماس دا بەشدار بن و بەمەش دەرفەتی کراوەیان دەخستە بەردەم خەڵك. لە سیارا لیۆن بەو شێوەیە نەبوو. بەریتانییەکان بە خۆشییەوە سروشتی دیموکراسییانەی دەرهێنانی ئەڵماسیان پشتگوێخست و مۆنۆپۆلییەکیان بۆ هەموو وڵات دامەزراند و ناویان نا ترەستی هەڵبژاردنی سیارا لیۆن و دایانە دی بیرس کە کۆمپانیایەکی گەورەی دەرهێنانی ئەڵماس بوو لە باشووری ئەفریقادا. دی بیرس لە ساڵی ۱۹۳٦ دا مافی ئەوەی پێدرا کە هێزێکی تایبەتی پاراستنی ئەڵماس پێکبهێنێ، کە سوپایەکی تایبەت بوو، بوە سوپایەکی گەورەتر لەوەی حکومەتی کۆلۆنیاڵی لە سیارا لیۆن دا. لەگەڵ ئەمەش دا، بوونی ئەڵماس لە ناوچەیەکی فراوان دا کارێکی وایکرد کە پاراستنی بارودۆخەکە زەحمەت بێ. بە هاتنی ساڵانی ۱۹۵۰

کـان، هێـزی پاراسـتنی ئـەڵماس نەیـدەتوانی کـۆنترۆڵی هـەزاران دەرهێنـەری نایاسایی ئەڵماس بکا کـە بـوە سەرچاوەیەکی گـەورەی ململانـێ و ئـاژاوە. لـە ساڵی ١٩٥٥ دا حکومەتی بەریتانی هەندێك لـە شـوێنەکانی ئەڵماسـی لەبـەردەم دەرهێنـەرانی مۆڵەتپێـدراو لـەدەرەوەی ترەسـتی هەڵبـژاردنی سـیارا لیـۆن دا کردەوە، هەرچەندە کۆمپانیاکە ناوچە دەوڵەمەندەکانی ئەڵماسی لـە یـەنگیما و کۆیدو و تۆنگۆ لە ژێردەستی خۆی دا هێشتەوە. بارودۆخەکە دوای سەربەخۆیی خراپتر بـوو. سیاکا سـتیڤنس لـە سـاڵی ١٩٧٠ دا ترەسـتی هەڵبـژاردنی سـیارا لیۆنی خۆماڵیکرد و کۆمپانیای نەتەوەیی بۆ دەرهێنانی ئـەڵماس (سـیارا لیـۆنی سـنووردار) دامەزرانـد کـە تیـای دا حکومـەت، واتـا سـتیڤنس لـە ٥١٪ پـشکی هـەبوو. ئەمـەش قۆنـاخی سـەرەتایی پلانەکـەی سـتیڤنس بـوو بـۆ دەسـتگرتن بەسەر دەرهێنانی ئەڵماس لە وڵات دا.

لە ئوسترالیای سەدەی نۆزدەیەم دا، ئـاڵتوون بـوو نـەك ئـەڵماس لـە سـاڵی ١٨٥١ دا لە نیو ساوس وێڵس و ویلایەتی تازە دامەزراوی ڤیکتۆریادا دۆزرایـەوە و سەرنجی هەموانی ڕاکێشا. بەهەمانشێوەی ئەڵماسی سیارا لیۆن، ئاڵتونەکەش لــە لیتــەی بنــی ڕووبارەکــان دا بــوو. دەبوایــە بڕیارێــك لــەبارەی شــێوازی دەرهێنانەکەیەوە بدرایـە. هەنـدێك کـەس، وەك جـەیمس مەکارسـەر کـە کـوڕی جۆن مەکارسـەری سـەرکردەی ناسـراوی سکواتەرەکان بـوو، هـەروەك پێـشتر باسمانکرد، پێشنیازیکرد کە دەوری ئـەو ناوچـانەی ئـاڵتوونی تێـدابوو پـەرژین بکرێ و هەڕاجبکرێن. ئـەوان شـێوازێکی ئوسـترالی ترەسـتی هەڵبـژاردنی سـیارا لیۆنیان دەویست. کەسانێکی زۆریش دەیانویست ناوچەکانی ئەڵماس کراوە بـن بۆ هـەموو کـەس. مۆدێلـە کراوەکـە بردیـەوە و لـەبری دامەزرانـدنی مۆنۆپـۆلی، حکومەتی ئوسترالی بواریدایە هەموو ئەو کەسانەی ئابوونـەی سـاڵانەی مۆڵـەتی دەرهێنـانی ئەڵماسـییان دەدا بـۆ ئـەڵماس بگـەڕێن و دەربهێـنن. هـەر زوو دەرهێنـەران، کـە بـەم سەرکێـشانە دەوتـرا، بوونـە هێزێکـی بەدەسـەڵات لـە سیاسەتی ئوسترالیادا، بەتایبـەتی لـە ڤیکتۆریـادا. ئەوانـە ڕۆڵـی گـەورەیان لـە پێشخستنی ئەجێندای دەنگدانی گشتی و دەنگدانی نهێنی دا بینی.

ئێمە تا ئێستا دوو کاریگەریی کوشندەی بڵاوبوونـەوەی حـوکمی کۆلۆنیـاڵی ئەورووپیمان لە ئەفریقادا بینیوە: هێنانەئارای بازرگانی کۆیلان لـە ڕێـی زەریـای ئەتڵەسییەوە، کە هانی پەرەپێدانی دەزگا ئـابووری و سیاسـییەکانی ئـەفریقای

دا به ئاڕاستەیەکی چەوسێنەرانە و بەکارهێنانی یاسا و دەزگایانی کۆلۆنیالّی بۆ لەناوبردنی کشتوکاڵی بازرگانی ئەفریقی کە لەوانەبوو بتوانێ لەگەڵ ئەورووپییەکان دا ڕکابەریی بکردایە. بێگومان کۆیلەیەتی لە سیارا لیۆن دا هێزێك بوو. لە کاتی بەکۆلۆنیکردنی سیارا لیۆن دا حکومەتێکی ناوەندی بەهێز لە ناوچەکانی ناوەوەدا نەبوو، بەڵکو تەنیا چەندین پاشایەتی بچووك و لە ناو یەکدا ناکۆك دا هەبوون کە بەردەوام پەلاماری یەکتریان دەدا و پیاو و ئافرەتانی یەکتریان بەدیلدەگرت. کۆیلەیەتی پەتایەکی بڵاو بوو، کە نزیکەی ٥٠٪ دانیشتوان وەك کۆیلە کاریاندەکرد. ژینگەی نەخۆشی بووە هۆی ئەوەی کە نیشتەجێبوونی فراوانی سپیپێستەکان لە سیارا لیۆن دا نەشیاو بێ، بەو شێوەیەی لە باشووری ئەفریقا دا شیاو بوو. بۆیە کەسانی سپیپێستی ئەوتۆ نەبوون لەگەڵ ئەفریقییەکان دا ڕکابەریی بکەن. نەبوونی ئابوورییەکی پشت بەستوو بە دەرهێنانی کانزاکان بەو ئەندازەیەی لە جۆهانسبێرگ دا هەبوو، مانای ئەوە بوو کە جگە لە نەبوونی داخوازی بۆ کرێکارانی ئەفریقی لە لایەن کێڵگەکانی سپیپێستەکانەوە، هیچ هاندانێکیش نەبوو تا دەزگایانی بازاڕی کاری چەوسێنەر دروستبکەن بەو شێوەیەی لە باشووری ئەفریقای ڕەگەزپەرست دا هەبوو. بەڵام میکانیزمی تریش لە کاردا بوون. جووتیارانی کۆکا و قاوەی سیارا لیۆن لەگەڵ سپیپێستەکان دا ڕکابەرییان نەکرد، هەرچەندە داهاتەکانیان لە ڕێگەی مۆنۆپۆلّی حکومەتەوە کە بۆردی فرۆشتن بوو لێزەوتدەکرا. سیارا لیۆن لە هەمانکات دا گیرۆدەی حوکمی ناڕاستەخۆ بوو. لە چەندین ناوچەی ئەفریقادا کە دەسەڵاتدارانی بەریتانی ویستیان بەشێوەی ناڕاستەوخۆ حوکمیان بکەن، تووشی گەلانی وابوون کە سیستەمێکی دەسەڵاتی مەرکەزییان نەبوو تا بتوانن بیخەنە ژێردەستی خۆیانەوە. بۆ نموونە، لە ڕۆژهەڵاتی نایجیریادا، گەلانی ئیگبۆ سەرۆکیان نەبوو کاتێك بەریتانییەکان لە سەدەی نۆزدەیەم دا تووشیان بوون. دواتر بەریتانییەکان سەرۆکەکانیان دانا. لە سیارا لیۆن دا، بەریتانییەکان حوکمی ناڕاستەوخۆیان لەسەر بناخەی دەزگایانی خۆماڵی کە ئەو کاتە لە ئارادابوون و سیستەمەکانی دەسەڵاتی ئەو کاتە دامەزراند.

لەگەڵ ئەوەش دا، بە بێگوێدانە باکگراوندە مێژووییەکەی ئەو کەسانەی لە ساڵی ١٨٩٦ دا وەك سەرۆك خێڵی مەزن دانران، حوکمی ناڕاستەوخۆ و ئەو دەسەڵاتەی درایە سەرۆکە مەزنەکان، بە تەواوی سیاسەتی ئەو کاتەی سیارا

لیۆنی گۆڕی. یەکێك لەو گۆڕانکارییانە بریتیبوو لە جیاکاری کۆمەڵایەتی ـ بنەماڵە فەرمانڕەواکان ـ کە لەوەبەر بوونیان نەبوو. ئەریستۆکراسیەکی پلەبەندیی جێگەی باروودۆخێکی گرتەوە کە پێشتر خاو تر بوو، سەرۆك خێڵەکان پێویستیان بە پشتگیری جەماوەر هەبوو. لە جێگەی ئەمە سیستەمێکی ڕەق دروستبوو کە سەرۆکەکان تا لە ژیان دا بوون لە پایەکەی خۆیان دا دەمانەوە و ملکەچی پارێزەرەکانیان بوون لە فریتاون یان بەریتانیا و زۆر کەمتر بەرامبەر بەو خەڵکەی حوکمیاندەکردن بەرپرسیاربوون.

بەریتانییەکان ئامادەبوون کە دەزگاکان لە ڕێگەی تریشەوە تێکبدەن، بۆ نموونە، بە لابردنی سەرۆك خێڵە ڕەواکان و دانانی ئەوانەی زیاتر هاوکاری بەریتانییەکانیان دەکرد لە جێگایان. لە راستیدا بنەماڵەی مارگای کە یەکەم، دوو سەرۆك وەزیرانی دوای سەربەخۆیی سیارا لیۆنیان تێداهەلکەوت، لە بنەماڵەیەکی نزمی سەرۆکایەتی خێڵی بانتا هاتبون، لەبەر ئەوەی لە کاتی یاخیبوونی باجی کوخ دا لایەنگری بەریتانییەکانیان کرد دژی سەرۆك خێڵ نیاما کە فەرمانڕەواییدەکرد. نیاما لە دەسەلات دوورخرایەوە و بنەماڵەی مارگای بوونە سەرۆك خێڵ و تا ساڵی ١٩١٠ لەو پێگەیەدا مانەوە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە بریتییە لە ڕادەی بەردەوامی لە نێوان سیارا لیۆنی سەردەمی کۆلۆنیالی و سیارا لیۆنی سەردەمی سەربەخۆیی. بەریتانییەکان بۆردی فرۆشتنیان دامەزراند بۆ وەرگرتنی باج لە جووتیاران. حکومەتەکانی دوای سەربەخۆیی باجیان تەنانەت بە ڕێژەی زیاتر لە جووتیاران وەرگرت. بەریتانییەکان لە ڕێگەی سەرۆکە مەزنەکانەوە سیستەمی بەڕێوەبردنی ناڕاستەوخۆیان دامەزراند. ئەو حکومەتانەی دوای سەربەخۆیی هاتن ئەم دەزگا کۆلۆنیالییەیان هەڵنەوەشاندەوە، بەڵکو بەکاریانهێنا بۆ بەڕێوەبردنی ناوچە گوندنشینەکانیش. بەریتانییەکان مۆنۆپۆڵی ئەلماسیان دروستکرد و هەوڵی دوورخستنەوەی دەرهێنەرە ئەفریقیەکانیان دا. حکومەتەکانی دوای سەربەخۆیی هەمان شتیان کرد. ڕاستە کە بەریتانییەکان لایانوابوو کە دروستکردنی ڕێگای ئاسنین شێوازێکی باش بوو بۆ فەرمانڕەواییکردنی مێندیلاند، لە کاتێك دا سیاکا ستیڤنس پێچەوانەی ئەمە بیریکردەوە. بەریتانییەکان متمانەیان بە سوپاکەیان هەبوو، دەیانزانی کە دەتوانن ئەم سوپایە بنێرن بۆ مێندیلاند هەر کاتێك یاخی بوون بەرپا بوایە. ستیڤنس

نەیتوانی ئەمە بکا. بەهەمانشێوەی چەندین نەتەوەی تری ئەفریقی، سوپایەکی بەهێز دەبوە هەڕەشە بۆ سەر حوکمی ستیڤنس. هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو ئەو سوپای لغاوکرد و پارچەیکرد و توندوتیژی بەتایبەتکرد لەڕێگەی دامەزراندنی یەکەکانی میلیشیاوە کە تەنیا وەلائیان بۆ ئەو هەبوو. لە ئەنجامی ئەم پرۆسەیەشدا ئەو لاوازبوونی ئەو دەسەڵاتە کەمەی خێراتر کرد کە دەوڵەت لە سیارا لیۆن دا هەیبوو. لە جیاتی سوپا، یەکەمجار یەکەی ئاسایشی ناوخۆ(ISU)ی دروستکرد، کە گەلی ستەمدیدەی سیارا لیۆن ناویان نابوو " I Shoot U" واتە " تەقەت لێدەکەم" و دواتر بەشی ئاسایشی تایبەت (SSD) دامەزرا کە خەڵك ناویان نا "Siaka Stevens's Dogs " واتە "سەگەکانی سیاکا ستیڤنس" لە کۆتایی دا نەبوونی سوپایەك کە پشتگیری ڕژێمەکە بکا بوە هۆکاری تێشکاندنی خودی ڕژێمەکە. تەنیا گروپێکی پێکهاتوو لە سی سەرباز بە سەرکردایەتی کاپتن ڤەلەنتاین ستراسەر، لە ٢٩ نیسانی ساڵی ١٩٩٢ دا ڕژێمەکەی APC یان لە سەر دەسەڵات لابرد.

دەشێ پەرەپێدانی سیارا لیۆن یان نەبوونی ئەو پەرەپێدانە وەك ئاکامی بازنەی ناهەمواری لێکبدرێتەوە. یەکەمجار دەسەڵاتدارانی بەریتانی دەزگایانی چەوسێنەریان دامەزراند و سیاسییە ئەفریقییەکانی دوای سەربەخۆیی زۆر ئامادە بوون کوتەکەکە بگرنەدەست. ئەم پاتێرنەش لە هەموو وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا دا هاوشێوە بوو. هیوای هاوشێوە بۆ غانا و کینیا و زامبیا و چەندین وڵاتانی تری ئەفریقی لە ئارادا بوو. لەگەڵ ئەمەش لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا، دەزگایانی چەوسێنەر دروستکرانەوە لەسەر ئەو پاتێرنەی بە پێی بازنەی ناهەمواری پێشبینیدەکرا و بە تێپەڕبوونی کات زیاتر دڕندە بوون. بۆ نموونە، لە هەمووئەو وڵاتانەدا بۆردەکانی فرۆشتن و حوکمی ناڕاستەوخۆ کە دروستکراوی دەستی بەریتانییەکان بوون هێڵرانەوە.

هۆکاری سروشتی لە ئارادایە بۆ ئەم بازنە ناهەموارییە. دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر بەرهەمدەهێنن کە دەبنە هۆی دەوڵەمەندبوونی ژمارەیەکی کەم لەسەر حسابی ژمارەیەکی زۆری خەڵك. ئەوانەی سوود لە دەزگایانی چەوسێنەر وەردەگرن، سامانیان هەیە بۆ دامەزراندنی سوپای تایبەت و هێزی میلیشیا و کڕینی دادوەران و تەزویرکردنی هەڵبژاردنەکان بۆ ئەوەی لە دەسەڵات دا بمێننەوە. ئەوان هەموو

بەرژەوەندییەکیان هەیە لە بەرگریکردن لە سیستەمەکە. بۆیە دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر زەمینەی بەردەوامی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر دەرەخسێنن چونکە دەسەڵات چاودێری ناکرێ و سامانی ئابووری لەگەڵ خۆی دا دەهێنێ.

دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر هیچ چاودێرییەك لەسەر خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات دانانێن. ئایا دەسەڵات گەندەڵی دروستدەکا، جێگای مشتومڕە، بەڵام لۆرد ئەکتۆن بە دڵنیاییەوە ڕاست بوو کاتێك ووتی دەسەڵاتی ڕەها بێگومان گەندەڵی دروستدەکا. لە چاپتەری پێشوودا بینیمان تەنانەت کاتێك سەرۆك فرانکلین ڕۆزڤەڵت ویستی دەسەڵاتەکانی سەرۆکایەتی بە شێوەیەك بەکاربهێنێ کە ئەو لای وابوو سوودی کۆمەڵگای تیادا دەبێ ئەگەر لە لایەن دادگای باڵاوە جڵەوگیرینەکرێ، دەزگا سیاسییە کراوەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان نەیانهێشت جڵەوگیرییەکانی سەر دەسەڵاتەکەی بخاتەلاوە. لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا، چاودێرییەکی کەم بەسەر پیادەکردنی دەسەڵاتەوە هەیە، ئەو دەسەڵاتە چەندە زۆردار و لادەر بێ. لە ساڵی ١٩٨٠ دا، سام بانگۆرا، کە ئەو کاتە سەرۆکی بانکی ناوەندی سیارا لیۆن بوو، ڕەخنەی لە سیاسەتەکانی سیاکا ستیڤنس گرت بەوەی کە دەبوونە هۆی بەهەدەردانی زۆر. ئەو هەر زوو دوای ئەوە کوژرا و لە سەر بانی باڵاخانەی بانکی ناوەندی فڕێدرایە سەر شەقامی سیاکا ستیڤنس. دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر بازنەی ناهەمواری دروستدەکەن چونکە هیچ هێڵێکی بەرگری ناهێڵنەوە بەرامبەر ئەوانەی دەیانەوێ دەسەڵاتی دەوڵەت بەشێوەی ناڕەواو خراپ بەکاربهێنن.

میکانیزمێکی تری بازنەی ناهەمواری ئەوەیە کە دەزگایانی چەوسێنەر، بە دروستکردنی دەسەڵاتی بێ جڵەوگیری و نایەکسانی زۆری داهات، دەسکەوتەکانی گەمەی سیاسی زیاتر دەکەن، چونکە ئەوەی کۆنترۆڵی دەوڵەت بکا دەبێتە سوودمەندی ئەم دەسەڵاتە زۆرەو ئەو سامانەی ئەم دەسەڵاتە دەیهێنێتەئاراوە. دەزگایانی چەوسێنەر هاندان بۆ شەڕ و ململانێی ناوخۆیی دروستدەکەن بۆ کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات و سوودەکانی ئەو دەسەڵاتە. ئەمەش داینەمیکێك بوو لە سەردەمی دەوڵەتانی شاری مایا و ڕۆمای کۆن دا کاریگەری هەبوو. لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا، جێگەی سەرسوڕمان نییە کە ئەو دەزگا چەوسێنەرانەی چەندین دەوڵەتانی ئەفریقی بە میرات لە سەردەمی

کۆلۆنیالّییەوە بۆیان مایەوە تۆوی ململانێیان بۆ دەسەلاّت گرتنەدەست و جەنگە ناوخۆییەکانیان چاند. ئەم ململانێیانە زۆر جیاواز بوون لە جەنگی ناوخۆی ئینگلتەرە و شۆڕشی شکۆدار. ئەو جەنگانە بۆ ئەوە بەرپا نەکران تا دەزگایانی سیاسی بگۆڕن و جلّەوگیری بخەنە سەر پیادەکردنی دەسەلاّت یان پلورەلیزم دابمەزرێنن، بە لّکو بۆ دەسەلاّت گرتنەدەست و دەولّەمەندکردنی گروپێك بوو لەسەر حسابی ئەوانی تر. لە ئەنگۆلا و بروندی و چاد و کەناری ئایڤەری و کۆماری دیموکراسی کۆنگۆ و ئەسیوپیا و لایبیریا و مۆزەمبیق و نایجیریا و کۆماری کۆنگۆ برازاڤیل و ڕواندا و سۆمالّ و سودان و ئۆگەندا و بێگومان لە سیارا لیۆن، هەروەك بە درێژی لە چاپتەری داهاتوودا باسیدەکەین، ئەم ململانێیانە گۆڕان بۆ جەنگی خوێناوی ناوخۆ و بوونە هۆی داڕوخانی ئابووری و دەردەسەری بێوێنەی مرۆڤەکان، سەرەڕای شکستهێنانی ئەو دەولّەتانە.

## لە ئینکۆمایندا وە بۆ دەستگرتن بەسەر زەوی دا

لە ١٤ کانونی دوەمی ١٩٩٣ دا، ڕامیرۆ دی لیۆن کارپیۆ وەك سەرۆك کۆماری گواتیمالا سوێندی یاسایی خوارد و ڕیچارد ئەیتکنهێد کاستیلۆی کردە وەزیری دارایی و ڕیکاردۆ کاستیلۆ سینیبالّدی کردە وەزیری پەرەپێدان. ئەم سێ پیاوە هەندێك شتی هاوبەشیان لە نێوان دا بوو: هەرسێکیان وەچەی ڕاستەوخۆی داگیرکارە ئیسپانییەکان بوون کە لە سەرەتای سەدەی شازدەیەم دا هاتبوونە گواتیمالا. دی لیۆن لە بنەچەیەکی ناسراو بوو کە جوان دی لیۆن کاردۆنا بوو، لە کاتێك دا کاستیلۆکان بە خزمایەتی دەگەیشتنەوە بە بێرنالّ دیاز دیل کاستیلۆ، ئەو پیاوەی کە یەکێك لە بەناوبانگترین گێڕانەوەی شایەتحالّی لەسەر داگیرکردنی مەکسیك نووسی. بەرامبەر بەو خزمەتەی پێشکەشیکردبوو بە هێرمان کۆرتیس، دیاز دیل کاستیلۆ کرایە پارێزگاری سانتیاگۆ دی لۆس کابالیرۆس کە ئەمڕۆ شاری ئەنتیگوای گواتیمالایە. کاستیلۆ دی لیۆن بنەمالّەی فەرمانڕەواییان شانبەشانی داگیرکارەکانی تری وەك پێدرۆ دی ئەلڤارادۆ لە گواتیمالا دا دامەزراند. کۆمەلّناسی گواتیمالا، مارتا کاسۆوەس

ئارزوو، گروپێکی بیست و دوو خێزانی دەستنیشانکرد لە گواتیمالا دا کە لە ڕێگەی هاوسەرگیرییەوە پەیوەندییان لەگەڵ بیست و شەش خێزانی تری دەرەوەی ئەو گروپە دا هەبوە. لێکۆڵینەوە جینیۆلۆجی و سیاسییەکان دەریانخستوە کە ئەم خێزانانە لە ساڵی ١٥٣١ ەوە کۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری گواتیمالایان کردوە. پێناسەیەکی تەنانەت فراوانتر دەربارەی ئەوەی کام خێزانانە بەشێك بوون لەم نوخبەیە دەریخستوە کە ئەمانە لە ساڵی ١٩٩٠ دا تەنیا ١٪ ی دانیشتوانیان پێکهێناوە.

لە سیارا لیۆن و لە زۆربەی ناوچەکانی باشووری بیابانی ئەفریقادا، بازنەی ناهەمواری لەو دەزگا چەوسێنەرانەدا خۆی دەرخست کە لە لایەن هێزە کۆلۆنیاڵییەکانەوە دامەزران و لە لایەن سەرکردەکانی دوای سەربەخۆیی کۆنترۆڵکران. لە گواتیمالا دا، هەروەك لە چەندین وڵاتی تری ئەمەریکای ناوەڕاست دا، شێوازێکی ساکار تر و دیارتری بازنەی ناهەمواری دەبینین: ئەوانەی خاوەنی دەسەڵاتی سیاسی و ئابوورین دەزگاکان بە شێوەیەك پێکدەهێنن تا بەردەوامیی دەسەڵاتیان مسۆگەربکەن و لەمەش دا سەرکەوتوو بوون. ئەم جۆرەی بازنەی ناهەمواری دەبێتە هۆی بەردەوامی دەزگایانی چەوسێنەر و بەردەوامی هەمان ئەو نوخبانە لە دەسەڵات دا و درێژەپێدانی دواکەوتن.

لە کاتی داگیرکردنی دا، گواتیمالا دانیشتوانێکی چڕی هەبوو کە نزیکەی دوو ملیۆن مایا دەبوون. نەخۆشی و چەوساندنەوە، وەك شوێنەکانی تری ئەمەریکاکان، کاری خراپی خۆیان کردە سەر دانیشتوان و تا ساڵانی ١٩٢٠ کانیش ژمارەی دانیشتوان نەگەیشتەوە ئەم ئاستە.

هەروەك ناوچەکانی تری ئیمپراتۆریەتی ئیسپانی، خەڵکە خۆماڵییەکە لە شێوەی ئینکۆمایندا دەبەخشرانە داگیرکارەکان. هەروەك لە میانەی بەکۆلۆنیکردنی مەکسیك و پیرۆ دا بینیمان، ئینکۆمایندا سیستەمێکی کارپێکردنی زۆرەملێ بوو کە دواتر لە لایەن دەزگایانی کاری بێگارەوە جێگەیگیرایەوە، بەتایبەتی لە لایەن ڕیپارتیمینتۆ، کە پێشی دەوترا ماندامیانتۆ لە گواتیمالا. ئەو نوخبەیەی پێکهاتبوو لە وەچەکانی داگیرکارەکان و هەندێك لە خەڵکە خۆماڵییەکە، نەك تەنیا سوودیان لە سیستەمی کاری زۆرەملێ وەردەگرت، بەڵکو کۆنترۆڵ ومۆنۆپۆلی بازرگانیشیان کردبوو لە ڕێگەی ئەو

سـەندیکا بازرگانییــەی کــە پێیــدەوترا کۆنــسۆلادۆ دی کۆمێرســیۆ. زۆربــەی دانیشتوانی گواتیمالا لە شاخەکان دا و دوور لـە کەنارەکانـەوە دەژیـان. نرخـی بەرزی گواستنەوە، ئاستی ئابووری هەناردەکردنی کەمکردبۆوە و لە سـەرەتادا زەوی زۆر بــەنرخ نــەبوو. بەشــی زۆری زەوییــەکان لــە ژێردەســتی خەڵکــە خۆماڵییەکەدا بوون کە خاوەن زەوی گشتی زۆر بوون و پێیـدەوترا ئیجدۆس. ئەو زەوییانەی دەمانەوە کەسی تێدا نەدەژیا و هی حکومـەت بـوون. پارەیـەی زۆر لــە کــۆنترۆڵکردن و بــاجکردنی بازرگــانی دا بــوو، نــەك لــە کــۆنترۆڵکردنی زەوی دا.

بەهەمانشێوەی مەکسیك، نوخبـەکانی گواتیمـالا بـە چـاوی ناحـەز سـەیری دەستوورەکەی کادیز یان دەکرد کـە هـانی دان تـا سـەربەخۆیی رابگەیـەنن بـە هەمان ئەو شێوەیەی نوخبـەکانی مەکسیك کردیـان. دوای یـەکگرتنێکی کـورت لەگەڵ مەکسیك و فیدراسیۆنی ئەمەریکای ناوەڕاست، نوخبە کۆلۆنیاڵییەکان لە سایەی دیکتاتۆریەتی ڕافێڵ کارێرا لە ساڵی ١٨٣٩ ەوە تا ساڵی ١٨٧١ حـوکمی گواتیمالایـان کـرد. بەدرێـژایی ئـەم ماوەیـە، وەچـەی داگیرکارەکـان و نوخبـە خۆماڵییەکە دەزگا چەوسێنەرەکانی سەردەمی کۆلۆنیالییـان تـا ڕادەیـەکی زۆر بێدەسکاری هێشتەوە. تەنانەت ڕێکخراوی کۆنـسۆلادۆ بـە هـاتنی سـەربەخۆیی گۆڕنکاری بەسەردا نەهات. هەرچەندە ئەمە دەزگایـەکی پاشـایەتی بـوو، بـەبێ کێشە لە سایەی حکومەتێکی کۆماری دا بەردەوامبوو.

کەواتە سەربەخۆیی تەنیا کۆدێتایـەك بـوو لـە لایـەن ئـەو نوخبـە لۆکاڵیـەی پێشتر هەبوون، بە هەمانشێوەی مەکسیك، ئەو نوخبەیە، بـە هێـشتنەوەی ئـەو دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرانەی سوودیان زۆر لێوەرگرتن، درێژەیان بە حوکمی خۆیان دا. بە شـێوەیەکی سـەیر، لـەم ماوەیـەدا کۆنسۆلادۆ وەك بەرپرسـیاری پەرەپێــدانی ئــابووری وڵات مایــەوە. بــەڵام هــەروەك ســەردەمی پــێش سەربەخۆیی، کۆنسۆلادۆ بەرژەوەندی خۆی نەك بەرژەوەنـدی وڵاتـی لا گـرنگ بوو. بەشێك لە ئەرکەکانی بریتیبـوون لـە پەرەپێـدانی ژێرخـان وەك میناکـان و ڕێگاوبان، بەڵام بە هەمانشێوەی نەمسا- هەنگاریا و ڕوسیا و سیارا لیۆن، ئەمـە زۆرجــار هەڕەشــە بــوو لــە ڕێگــەی تێکــدانی بنیاتنــەرەوە و دەبـوە هـۆی دروستکردنی ناسەقامگیری بۆ سیستەمەکە. لەبەر ئەوە، پەرەپێـدانی ژێرخـان، لە بـری ئـەوەی جێبـەجێبکرێ، زۆرجـار تووشـی بەرەنگاربوونـەوە دەبـوو. بـۆ

نموونە، پەرەپێدانی مینایەك لە كەناری سوچیتێپێكویز هاوسنووری زەریای هێمن یەكێك بوو لە پرۆژەكان. لەو كاتەدا مینایانی گونجاو لەسەر كەناری كاریبی بوون و ئەمانەش لە بن كۆنترۆڵی كۆنسۆلادۆ دا بوون. كۆنسۆلادۆ لە بەری زەریای هێمن دا هیچی نەكرد، چونكە بوونی مینایەك لەو ناوچەیەدا دەبوە هۆی كردنەوەی دەروازەیەكی زۆر ئاسانتر بۆ گوستنەوەی كەلوپەل لە شارۆچكە شاخاوییەكانی مازاتێنانگۆ و كۆێزالتێنانگۆ و بوونی دەروازەیەكی وا بۆ ناردنەدەرەوەی كەلوپەل دەبوە هۆی لاوازكردنی مۆنۆپۆڵی كۆنسۆلادۆ بەسەر بازرگانی دەرەوە دا. هەمان لۆجیك بۆ ڕێگاوبانیش بەكارهێنرا، كە دیسانەوە كۆنسۆلادۆ لەم بوارەشدا بەرپرسیارێتی هەموو وولاتی لە ئەستۆدا بوو. هەروەك پێشبینیدەكرێ، كۆنسۆلادۆ نەیهێشت ئەو ڕێگایانە دروستبكرێن كە دەبوونە هۆی بەهێزكردنی گروپە ڕكابەرەكانی یان لاوازكردنی مۆنۆپۆلییەكەی. گوشار بۆ دروستكردنی ئەو ڕیگایانە دیسانەوە لە ڕۆژئاوای گواتیمالاو و كۆێزالتێنانگۆ لە ناوچەی لۆس ئەلتۆس دەستپێیكرد. بەلام ئەگەر ڕێگای نێوان لۆس ئەلتۆس و سوچیتێپێكویز چاكبكرایە، ئەوا دەبوە هۆی دروستكردنی چینێكی بازرگان كە دەبوونە ڕكابەری بازرگانەكانی كۆنسۆلادۆ لە پایتەخت. ڕێگاكە لە لایەن كۆنسۆلادۆوە ڕەزامەندی لەسەر نەدرا.

لە ئەنجامی ئەم باڵادەستییەی نوخبە دا، گواتیمالا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم دا بە دواكەوتوویی هێڵرایەوە لە كاتێك دا ناوچەكانی تری جیهان لە گۆڕانكاری خێرادا بوون. بەلام ئەم گۆڕانكارییانە لە ئاكام دا گواتیمالاشی گرتەوە. نرخی گواستنەوە لە دابەزین دا بوو بەهۆی نوێكارییە تەكنەلۆجییەكانی وەك شەمەندەفەری هەڵمی و ڕێگای ئاسنین و جۆری نوێی كەشتی زۆر خێراتر. جگە لەمەش، بەرزبوونەوەی داهاتی خەڵك لە ئەورووپای ڕۆژئاوا و باكووری ئەمەریكا دا داخوازی زۆریان بۆ ئەو جۆرە بەرهەمانە دروستكرد كە وولاتێكی وەك گواتیمالا دەیانتوانی بەرهەمیانبهێنن.

لە سەرەتای سەدەكەدا، هەندێك چویت و كۆباڵت كە هەردووكیان ڕەنگی سروشتین، بۆ هەناردە بەرهەمهێنران، بەلام دەرفەتی قازانجكردنی زۆر لەبەرهەمهێنانی قاوەدا بوو. گواتیمالا زەوییەكی زۆری هەبوو كە بۆ بەرهەمهێنانی قاوە بەسوودبوو، چاندنی ئەم زەوییانە بەبێ هاوكاری كۆنسۆلادۆ تەشەنەیكرد. كاتێك نرخی جیهانی قاوە بەرز بۆوە و بازرگانی نێودەوڵەتی

فراوان بوو، دەکرا قازانجێکی زۆر لە هەناردەکردنی قاوەدا بەدەستبهێنرێ، بۆیە نوخبەکەی گواتیمالا کەوتە گرنگیدان بە قاوە. لە ساڵی ١٨٧١ دا ڕژێمە درێژخایەنەکەی دیکتاتۆر کارێرا لە کۆتایی دا لە لایەن گروپێکەوە کە ناوی خۆیان نابوو لیبراڵەکان، بەناوی ئەو بزووتنەوە جیهانیەوە کە ئەو ناوەیان هەبوو، ڕوخێنرا. واتای لیبراڵیزم بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانکاری بەسەردا هاتوە. لە سەدەی نۆزدەیەم دا لە ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئەوروپادا، هاوشێوەی ئەوە بوو کە ئەمڕۆ پێیدەوترێ لیبێرتاریانیزم و داوای سەربەستی تاك و حکومەتی سنووردار و بازرگانی ئازادیان دەکرد. شتەکان لە گواتیمالا دا کەمێك جیاواز کاریانکرد. لیبراڵەکانی گواتیمالا کە لەسەرەتادا لە لایەن میگوێل گارسیا گرانادۆز و دوای ساڵی ١٨٧٣ یش لە لایەن جەستۆ ڕۆفینۆ باریۆس، سەرکردایەتیکران، بەگشتی پیاوانی نوێی خاوەن ئایدیاڵی لیبراڵی نەبوون. بە زۆری، هەمان ئەو بنەماڵانە لە دەسەڵات دا مانەوە. ئەوانە دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەکانیان هێشتەوە و ڕێکخستنەوەیەکی گەورەی ئابوورییان ئەنجامدا بۆ سوود وەرگرتن لە قاوە. هەر ئەوان لە ساڵی ١٨٧١ دا کۆنسۆلادۆیان هەڵوەشاندەوە، بەڵام بارودۆخی ئابووریش گۆڕانکاری بەسەردا هاتبوو. ئامانجی سەرەکی دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکان بوە بەرهەمهێنان و هەناردەکردنی قاوە.

بەرهەمهێنانی قاوە زەوی و کرێکاری دەویست. بۆ بەدەستهێنانی زەوی بۆ کێڵگەکانی قاوە، لیبراڵەکان کەوتنە بەتایبەتکردنی زەوی کە لە ڕاستیدا بریتیبوو لە دەستگرتن بەسەر زەوی دا تا بتوانن لەو ڕێگەیەوە ئەو زەوییانە زەوتبکەن کە پێشتر موڵکی گشتی یان هی حکومەت بوون. هەرچەندە هەوڵەکانیان ڕووبەڕووی بەرەنگاربوونەوەی توندبوو، بەڵام بە بوونی دەزگا سیاسییە یەکجار چەوسێنەرەکان و چڕبوونەوەی دەسەڵات لە گواتیمالادا، لە کۆتایی دا نوخبەکان سەرکەوتوو بوون. لە نێوان ساڵانی ١٨٧١ و ١٨٨٣ دا نزیکەی یەك ملیۆن ئەیکەر زەوی کە زۆربەیان زەوی گشتی خەڵکە خۆماڵییەکە و زەوی نزیك سنوورەکان بوون کەوتنە ژێردەستی نوخبەکان و تەنیا دوای ئەوە بەرهەمهێنانی قاوە بەخێرایی پەرەیسەند. ئامانج دامەزراندنی چاندنگەی گەورە بوو. زەوییە بەتایبەتکراوەکان لە ڕێگەی مەزاتەوە درانە ئەندامانی نوخبە تەقلیدییەکە یان کەسانی نزیك ئەوان. دواتر دەسەڵاتی دەوڵەتە

لیبراڵەکە بۆ ئەنجامدانی کاری بێگاری بە خەڵك، بەکارهێنرا بۆ هاوکاریکردنی خاوەن زەوییە گەورەکان تا بتوانن کرێکار پەیدابکەن لە ڕێگەی پەیڕەوکردن و توندکردنی چەندین سیستەمی جیاوازی کاری زۆرەملێ. لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٧٦ دا، سەرۆك باریۆس نووسراوی بۆ هەموو پارێزگارەکانی گواتیمالا نارد کە تیایدا هاتبوو:

*(لەبەر ئەوەی وڵات ڕووبەری زۆری زەوی هەیە کە دەبێ لە ڕێگەی چاندنیانەوە سوودیان لێوەربگیرێ بە بەکارهێنانی ئەو کرێکارە زۆرانەی کە ئەمڕۆ لە دەرەوەی بزووتنەوەی پەرەپێدانی توخمە بەرهەمدارەکانی نەتەوەدا ماونەتەوە، پێویستە لەسەرتان هەموو هاوکارییەك پێشکەشبکەن لە پێناوی هەناردەکردنی کشتوکاڵ دا:*

1. *پێویستە لە شارۆچکە هیندییەکانی سنووری ئیداریتان، ئەو ژمارە کرێکارەی خاوەن کێڵگەکانی پارێزگەکەتان داوایدەکەن و پێویستیانە دابینبکەن، ئەگەر ئەوەی ئەیانەوێ پەنجا یان سەد کرێکار بێ)*

ڕیپارتیمایینتۆ، ناچارکردنی کرێکاران بە کاری زۆرەملێ، لە دوای سەربەخۆیی هەڵنەوشێنرایەوە، بەڵکو ڕادە و ماوەی کارکردن زیادکرا و لە ساڵی ١٨٧٧ لە ڕێگەی مەرسومی ژمارە ١٧٧ ەوە بە دەزگاییکرا. فەرمانەکە دیاریکردبوو کە خاوەن کارەکان دەتوانن داوا لە حکومەت بکەن و دەبێ حکومەتیش تا شەست کرێکار بۆ ماوەی پازدە ڕۆژ، ئەگەر شوێنی کارەکە لە هەمان پارێزگا و، بۆ ماوەی سی ڕۆژ ئەگەر شوێنی کار لە دەرەوەی پارێزگاکە بوو، بۆ ئەو خاوەن کارانە دابینبکا. دەکرا داواکە لەسەر داوای خاوەنکارەکە نوێ بکرایەتەوە. ئەم کرێکارانە بە زۆر پەلکێشدەکران بۆ کارکردن ئەگەر لە ڕێگەی دەفتەری تۆماری کاری خۆیانەوە پیشانیاننەدایە کە ئەو خزمەتەیان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك ئەنجامداوە. هەموو کرێکارانی لادێکان دەبوایە دەفتەری کاریان هەبوایە کە پێیدەوترا لیبرێتا، کە زانیاری ووردی تێدابوو دەربارەی ئەوانەی کاریان بۆ کردون و هەر قەرزێکیش لەسەریان بوایە. گەلێك کرێکارانی لادێکان قەرزداری خاوەن کارەکانیان بوون و کرێکاری قەرزداریش نەیدەتوانی بەبێ ڕەزامەندی خاوەن کارەکەی شوێنی کارەکەی بەجێبهێشتایە. بەپێی مەرسومی ژمارە ١٧٧، تەنیا ڕێگا بۆ دەربازبوون لە پەلکێشکردن بۆ ڕیپارتیماینتۆ بریتیبوو لەوەی کە قەرزداری خاوەنکارێك بوویتایە. کرێکاران

گیریان خواردبوو. سەرەڕای ئەم یاسایانە، چەندین یاسا دەرکران بۆ ئەوەی هەرکەسێك نەیسەلماندایە کە کاری هەیە یەکسەر پەلکێشی ڕیپارتیمایندۆ یان جۆرەکانی تری کاری زۆرەملێی دروستکردنی ڕێگاوبان بکرایە، یان ناچار دەکرا لە کێڵگەیەك دا کاربکا. هەورەك لە باشووری ئەفریقای سەدەی نۆزدەیەم و بیستەم دا، لە دوای ساڵی ١٨٧١ ەوە سیاسەتەکانی زەوی بۆ لاوازکردنی ئابووری خۆژێنی دانیشتوانە خۆماڵییەکە وا دیزاینکران تا خەڵك ناچاربکەن بە کرێیەکی کەم کاربکەن. ڕیپارتیمایندۆ تا ساڵانی ١٩٢٠ کان و سیستەمی لیبرێتا و هەموو یاساکانی خۆدزینەوە تا ساڵی ١٩٤٥ بەردەوامبوون، کاتێك گواتیمالا بۆ یەکەمجار و بۆ ماوەیەکی کورت بۆنی خونچەی دیموکراسی کرد.

بە هەمانشێوەی پێش ساڵی ١٨٧١، نوخبەی گواتیمالا لە ڕێگەی پیاوانی بەهێزی سەربازییەوە حوکمیانکرد. ئەوان دوای ئەوەی ترۆقی قاوە دەستپێکرد لە سەر ئەم ڕێبازەی خۆیان هەر بەردەوامبوون. جۆرج ئۆبیکۆ، سەرۆك کۆمار لە نێوان ساڵانی ١٩٣١ و ١٩٤٤، زۆرترین ماوە حوکمیکرد. ئۆبیکو هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٣١ ی بەبێ ڕکابەر بردەوە چونکە کەس هێندە نەفام نەبوو تا ڕکابەریی بکا. بە هەمانشێوەی کۆنسۆلادۆ، ئەو ئەنجامدانی ئەو شتانەی پەسەندنەکرد کە تێکدانی بنیاتنەریان دەهێنایەئاراوە و هەڕەشەیان لە دەسەڵاتی سیاسی خۆی و دەسکەوتەکانی خۆی و نوخبەکە دەکرد. بۆیە ئەو دژایەتی پیشەسازی کرد لەبەر هەمان ئەو هۆیەی فرانسیسی یەکەم لە نەمسا ـ هەنگاریا و نیکۆلاسی یەکەم لە ڕوسیا دژایەتییانکرد: کرێکارانی پیشەسازی کێشەیان دروستدەکرد. لە یاسایەك دا کە لە خۆبەزلزانینی سەرکوتکارانە دا بێوێنە بوو، ئۆبیکۆ ووشەکانی وەکو ئۆبریرۆس (کرێکاران) و سیندیکاتۆس (سەندیکای کرێکاران) و ییولگاس (مانگرتن)ی قەدەخەکرد. دەکرا بەهۆی بەکارهێنانی هەریەك لەو وشانەوە ڕاپێچی بەندیخانە بکرایتایە. هەرچەندە ئۆبیکۆ بەهێز بوو، بەڵام سەری پەتەکە بەدەست نوخبەکانەوە بوو. لە ساڵی ١٩٤٤ دا ئۆپۆزیۆسۆن بەرامبەر ڕژێمەکەی دەستپێکرد کە لە لایەن خوێندکارانی زانکۆوە سەرکردایەتیکرا و دەستیانکرد بە ڕێکخستنی خۆپیشاندان. نارەزایی جەماوەری زیادیکرد و لە ٤ حوزەیران دا ٣١١ کەس کە چەندین لەوانە لە نوخبەکان بوون یاداشتی دی لۆس ٣١١ یان ئیمزاکرد، کە نامەیەکی کراوەی ڕەتکردنەوەی ڕژێمەکە بوو. ئۆبیکۆ لە ١ی تەمووز دا

دەستیلەکارکێشایەوە. هەرچەندە ڕژێمێکی دیموکراسی لە ساڵی ١٩٤٥ دا جێگەیگرتەوە، بەڵام ئەم ڕژێمە لەڕێگەی کۆدێتایەکەوە لە ساڵی ١٩٥٤ دا ڕوخێنرا و بوە هۆی جەنگێکی ناوخۆی کوشندە. گواتیمالا تەنیا دوای ساڵی ١٩٨٦ جارێکیتر بوەوە وولاتێکی دیموکراسی.

دگیرکارە ئیسپانییەکان بە دانانی سیستەمی سیاسی و ئابووری چەوسێنەر تووشی ئازاری ویژدانی نەبوون. هەر لەبەر ئەمە بوو کە لەو ڕێگە دوورەوە هاتبوون بۆ جیهانی نوێ، بەڵام نیازیان لە دامەزراندنی زۆربەی ئەو دەزگایانەی ئەوان دایانمەزراندن، مانەوەیان بوو بۆ ماوەیەکی کاتی. بۆ نموونە، ئینکۆمایندا بەخشینی مافی کاتی بوو بۆ بەکارهێنانی کرێکاران. ئەوان پلانێکی تۆکمەیان نەبوو دەربارەی پێکەوەنانی سیستەمێك کە بۆ ماوەی چوار سەد ساڵی تر بەردەوامبوو. لە راستیدا ئەو دەزگایانەی ئەوان دایانمەزراندن گۆڕانکاری گرنگیان بەسەرداهات، بەڵام یەك شت نەگۆڕا: سروشتی چەوسێنەرانەی دەزگاکان کە ئەنجامی بازنەی ناهەمواری بوون. شێوەی چەوسانەوەکە گۆڕا، بەڵام سروشتی چەوسێنەرانەی دەزگاکان و ناسنامەی نوخبەکە گۆڕانکارییان بەسەردا نەهات. لە گواتیمالا، ئینکۆمایندا و ڕیپارتیمایندۆ و مۆنۆپۆلیکردنی بازرگانی ڕێگەی بۆ لیبرێتا و زەوتکردنی زەوی خۆشکرد. بەڵام زۆینەی مایای دانیشتوانی خۆماڵی وەك کرێکارانی کرێ کەم بەردەوامبوون لە کارکردن بە پەروەردەیەکی کەم و بێماف و بێخزمەتگوزاری گشتی بوون.

لە گواتیمالا، هەروەك لە زۆربەی شوێنەکانی تری ئەمەریکای ناوەڕاست دا، پاتێرنێکی ئاشنای بازنەی ناهەمواری لە ئارادا بوو: دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر پشتگیری دەزگایانی ئابووری چەوسێنەریان کرد کە ئەمانیش بە دەوری خۆیان بناخەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر و بەردەوامی دەسەڵاتی هەمان نوخبەیان چەسپاند.

## لە کۆیلایەتییەوە بۆ جیم کرۆ

لە گواتیمالا دا دەزگایانی چەوسێنەر لە سەردەمی کۆلۆنیاڵییەوە تا سەردەمی مۆدێرن بە مانەوەی هەمان نوخبە بەردەوامبوون. هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی لە دەزگاکان دا کران بریتیبوون لە گونجاندنیان لەگەڵ

بـارودۆخی نـویێ دا، هـەروەك لـە حالّـەتی داگیرکردنـی زەوی دا لـە لایـەن نوخبەکانەوە ڕوویدا کاتێك ترۆقی قـاوە هانیـدان ئـەم کـارە بکـەن. دەزگایـانی باشووری ویلایەتە یەکگرتوەکان بەهەمانشێوە چەوسێنەر بوون تا کاتی جەنگی نـاوخۆ. ئـابووری و سیاسـەت لـە لایـەن نوخبـەکانی باشـوورەوە دەستیبەسەرداگیرابوو، خاوەن چاندنگە گەورەکان خاوەنی زەوی زۆر و کۆیلان بـوون. کـۆیلان نـە مـافی سیاسـی و نـە مـافی ئابووریـیان هـەبوو، لـە راسـتیدا خاوەنی چەند مافێکی زۆر کەم بوون. دەزگایانی سیاسی و ئابووری چەوسێنەر لە باشووردا بوونە هۆی ئەوەی کـە بـە هـاتنی ناوەڕاستی سـەدەی نۆزدەیـەم، باشـوور بـە شـێوەیەکی بەرچـاو لـە بـاکوور هـەژارتر بـێ. باشـوور خـاوەن پیشەسازی نەبوو، وەبەرهێنانی کەمی لە ژێرخـان دا کـرد. لـە سـاڵی ١٨٦٠ دا، بەرهەمی گشتی پیشەسازی کەمتر بوو لەوەی پێنسلڤانیا و نیۆرك و ماساشوتز. تەنیا ٪٩ دانیشتوانی باشوور لە ناوچە شارییەکان دا دەژیان، بە بەراورد لەگەڵ ٪٣٥ لە باکووری ڕۆژهەلات دا.

چڕی ڕێگای ئاسنین ( درێـژی ڕێگـای ئاسـنین بـە میـل دابەشـبکریێ بەسـەر ڕووبەر دا)، لە باکوور سێ هێندەی ویلایەتەکانی باشوور بـوو. ڕێـژەی ژمـارەی میلەکانی کەناڵەکان هاوشێوە بوو.

نەخشەی (١٨) ئەندازەی کۆیلەیەتی پیـشاندەدا لـە ڕێگـەی دانـانی ڕێـژەی دانیشتوان کە لە ساڵی ١٨٤٠ دا لە قـەزاکانی ویلایەتـە یـەکگرتوەکان دا کۆیلـە بوون. دیارە کۆیلەیەتی لە باشـوور دا زیـاتر بـوە و هەنـدێك لـە قـەزاکانی سـەر ڕووبـاری میسیـسیپی تـا ڕێـژەی ٪٩٥ی دانیـشتوانیان کۆیلـە بـوون. نەخـشەی (١٩) ئاکامەکانی ئەمە ڕووندەکاتەوە کە ئەویش ڕێژەی هێزی کارە کە لە ساڵی ١٨٨٠ دا لـە پیـشەسازی دا کاریـان کـردوە. هەرچـەندە ئـەم ڕێژانـە بـە ستانداردەکانی سەدەی بیستەم بەرز نەبوون، بەڵام جیاوازی بەرچاو لـە نێـوان باکوور و باشووردا هەبوو. لە زۆربەی ناوچەکانی باکووری ڕۆژهەلات، زیـاتر لـە ٪١٠ هێـزی کـار لـە پیـشەسازی دا کاریانـدەکرد. بـە پێـچەوانەوە، لـە زۆربـەی ناوچەکانی باشوور دا، بەتایبەتی ئەو ناوچانەی ژمارەیەکی زۆری کـۆیلانی تێـدا بوو، ڕێژەکە سفر بوو.

## نەخشەی ( ١٨ ): کۆیلەیەتی لە قەزاکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان دا لە ساڵی ١٨٤٠ دا



## نەخشەی (١٩): ڕێژەی کارکردن لە پیشەکان دا لە قەزاکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان دا لە ساڵی ١٨٨٠ دا




باشوور، تەنانەت لەو سێکتەرانەش دا کە تیایان دا پسپۆر بوون، نوێکار نەبوون: لە ساڵی ١٨٣٧ تا ساڵی ١٨٥٩ ژمارەی مافی داهێنانان کە لە ساڵێك دا دەرچوون بۆ ئەنجامدانی نوێکاری و پەیوەندییان بە گەنم و گەنمەشامی هەبوو، تێکڕا دە بۆ گەنم و دوازدە مافی داهێنانیش بۆ گەنمەشامی بوون، تەنیا یەك مافی داهێنان لە ساڵێك دا بۆ لۆکە دەرچوو کە گرنگترین ڕوەك بوو لە باشووردا. هیچ ئاماژەیەك لە ئارادا نەبوو کە بەپیشەسازیبوون و گەشەکردنی ئابووری لە ماوەیەکی نزیك دا دەستپێدەکا. بەڵام شکستهێنانی باشوور لە

جەنگی ناوخۆدا چاکسازی بنەڕەتی ئابووری و سیاسی بەدوادا هات. کۆیلەیەتی هەڵوەشێنرایەوە و بواردرایە پیاوانی ڕەشپێست دەنگبدەن.

دەبوایە ئەم گۆرانکارییە گەورانە ڕێگای بۆ ئاڵوگۆڕی ڕیشەیی لە دەزگا چەوسێنەرەکانی باشووردا بکردایەتەوە بەرەو دەزگایانی کراوە و باشووریان بخستایەتە سەر ڕێگای خۆشگوزەرانی ئابووری. بەڵام لە خۆدەرخستنێکی تری بازنەی ناهەمواری دا، ئەمانە هیچیان ڕوویاننەدا. بەردەوامی دەزگایانی چەوسێنەر، ئەمجارەیان لە شێوەی جیم کرۆ نەك کۆیلەیەتی، لە باشوور دا سەریهەڵدا. دەستەواژەی جیم کرۆ، کە گوایە لە "جیم کرۆ باز بدە" وە هاتبێ کە ساتیرێکی سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمە دەربارەی ڕەشپێستەکان و پیاوانی سپیپێست بە ڕوخساری ڕەشکراوەوە ڕۆڵەکەیان دەبینی، بوە ئاماژەیەك بۆ زنجیرەیەك لە یاساکانی جیاکاری کە لە دوای ساڵی ١٨٦٥ ەوە لە باشووردا خرانەگەڕ. ئەم یاسایانە بۆ نزیکەی سەدەیەکی تر بەردەوامبوون، تا سەرهەڵدانی پشێویەکی گەورەی تر کە بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان بوو. لەو ماوەیەدا دوورخستنەوەی ڕەشپێستان لە دەسەڵات و چەوساندنەوەیان بەردەوامبوو. کشتوکاڵ لە جۆری دروستکردنی چاندنگەی گەورە دا کە پشتی بە کرێکارانی کرێ نزم و خاوەن پەروەردەی کەم دەبەست، بەردەوامبوو، داهاتەکانی دانیشتوانی باشوور لە چاو تیکڕای داهاتی دانیشتوانی باکووردا کەمبۆوە. بازنەی ناهەمواری دەزگا چەوسێنەرەکان بەهێزتر بوو لەوەی کەسانێکی زۆر لەو سەردەمەدا چاوەڕێیان دەکرد.

هۆکاری ئەوەی کە خلیسکانی سیاسی و ئابووری باشوور گۆڕانکاری بەسەردا نەهات، هەرچەندە کۆیلەیەتی هەڵوەشێنرایەوە و پیاوانی ڕەشپێست مافی دەنگدانیان درایە، ئەوە بوو کە دەسەڵاتی سیاسی و سەربەخۆیی ئابووری ڕەشپێستەکان لاواز بوو. خاوەن چاندنگەکانی باشوور جەنگەکەیان دۆڕاند، بەڵام ئاشتییان بردەوە. ئەوان هێشتا لە ڕووی ڕێکخستنەوە تۆکمە و خاوەن زەوی بوون. لە کاتی جەنگ دا، ئەو کۆیلانەی لە ئەنجامی هەڵوەشاندنەوەی کۆیلەیەتی دا ئازاد کرابوون بەڵێنی ئەوەیان پێدرا کە چل ئەیکەر زەوی و هێسترێکیان بدرێتێ و تەنانەت لە کاتی هەڵمەتە سەربازییە بەناوبانگەکانی جەنەراڵ ویلیەم شێرمان دا هەندێك لەو کۆیلانە وەریانگرت. بەڵام لە ساڵی ١٨٦٥ دا سەرۆك ئەندرو جۆنسۆن فەرمانەکانی شێرمانی ڕەتکردەوە و ئاواتی دابەشکردنەوەی زەوی نەهاتەدی. لە گفتوگۆیەکی

کۆنگرێس دا لەسەر ئەم مەسەلەیە، ئەندامی کۆنگرێس، جۆرج واشینتۆن جولیان ووتی ( ئایا یاسایەکی کۆنگرێس بۆ هەڵوەشاندنەوەی کۆیلەیەتی چ نرخێکی دەبێ ... ئەگەر بنەمای کۆنی کشتوکاڵی دەسەڵاتی ئەریستۆکراسی وەك خۆی بمێنێتەوە؟). ئەمەش سەرەتای "ڕزگارکردن"ی باشووری کۆن و بەردەوامیی نوخبە زەویدارە کۆنەکانی باشوور بوو.

کۆمەڵناس، جۆنەسەن واینەر، لێکوڵینەوەیکرد لەسەر مانەوەی نوخبە خاوەن چاندنگەکانی پێنج قەزای پشتێنی ڕەش کە وولاتی سەرەکی بەرهەمهێنانی لۆکە بوون لە باشووری ئەلەباما. لە ڕێگەی سەرژمێرییەکانی ویلایەتە یەککگرتوەکانەوە، شوێنپێی ئەو خێزانانەی هەڵگرت کە بایی ١٠,٠٠٠ دۆلار موڵکیان هەبوو، ئەو بۆیدەرکەوت کە لە ٢٣٦ بنەماڵەی نوخبەی خاوەن چاندنگە کە لە ساڵی ١٨٥٠ دا هەبوون، ١٠١ لەوانە لە ساڵی ١٨٧٠ دا پێگەکەی خۆیان پاراست. ئەم ڕێژەی بەردەوامییە زۆر هاوشێوەی ڕێژەی بەردەوامی پێش جەنگی ناوخۆ بوو: لە ٢٣٦ دەوڵەمەندترین بنەماڵەی خاوەن چاندنگە لە ساڵی ١٨٥٠دا، تەنیا ١١٠ بنەماڵە دە ساڵ دواتر بە دەوڵەمەندی مانەوە. لەو ٢٥ خاوەن چاندنگەیەی کە خاوەنی زۆرترین زەوی بوون لە ساڵی ١٨٧٠ دا، ١٨ (٧٢٪) بنەماڵە لەوانە لە ساڵی ١٨٦٠ دا لە ناو بنەماڵە نوخبەکان دا بوون و ١٦ لەوانە لە ناو بنەماڵە نوخبەکانی ساڵی ١٨٥٠ دا بوون. لە کاتێك دا زیاتر لە ٦٠٠,٠٠٠ کەس لە جەنگی ناوخۆدا کوژران، نوخبە خاوەن چاندنگەکان چەند کەسێکیان لێکوژرا. یاساکە، کە لەلایەن چێنەرەکان و بۆ ئەوان دانرابوو، ئەو خاوەن کۆیلانەی کە بیست کۆیلەیان هەبوو لە خزمەتی سەربازی بەخشی. لە کاتێك دا بە سەدان کەس کوژران بۆ هێشتنەوەی ئابووری چاندنگەکانی باشوور، چەندین کۆیلەداری گەورە و کوڕەکانیان لە دەرەوەی جەنگەکە دا مانەوە و بەم شێوەیە توانیان بەردەوامیبدەن بە ئابووری چاندن.

دوای کۆتایی جەنگ، نوخبە خاوەن چاندنگەکان کە کۆنترۆڵی زەوییان کردبوو، توانیان کۆنترۆڵی خۆیان بەسەر هێزی کاردا بسەپێننەوە. هەرچەندە دەزگای ئابووری کۆیلەیەتی هەڵوەشێنرانەوە، بەڵگەکان ڕێچکەیەکی ڕوونی بەردەوامیی سیستەمی ئابووری باشوور ڕوندەکەنەوە کە لەسەر بنەمای کشتوکاڵی چاندنگەیی پشتبەستوو بە کرێکاری هەرزان دامەزرابوو. ئەو سیستەمە ئابوورییە لە ڕێگەی کەناڵی جۆراوجۆرەوە درێژەپێدرا، لەوانە کۆنترۆڵکردنی سیاسەتی لۆکاڵی و ئەنجامدانی توندوتیژیی. لە ئەنجامی ئەمەدا،

هەروەك باسكاری ئەمەریكی ئەفریقی، دەبلیو ئی بی دوو بۆیز، دەڵێ، باشوور بوە (كامپێكی چەكدار بۆ تۆقاندنی خەڵكی ڕەشپێست).

لە ساڵی ١٨٦٥ دا ئەنجوومەنی یاسادانانی ویلایەتی ئەلەباما كۆدی ڕەشپێستانی دەركرد، كە هەنگاوێكی گەورە بوو بەرەو چەوساندنەوەی كرێكارانی ڕەشپێست. بە هەمانشێوەی مەرسومی ژمارە ١٧٧ لە گواتیمالا، كۆدی ڕەشپێستانی ئەلەباما یاسای خۆدزینەوە و یاسایەك دژی "فریودان"ی كرێكارانی لە خۆ گرتبوو. ئەمەش بۆ ڕێگرتن لە جوڵەی كرێكاران و كەمكردنەوەی ڕكابەریی دانرا لە بازاڕی كاردا و كۆدەكە جەختكردن بوو لەسەر ئەوەی كە خاوەن چاندنگەكانی باشوور هەمیشە دەرپاچەیەكی كرێكاری كرێ كەم و مسۆگەریان لەبەر دەست دا بێ.

دوای جەنگی ناوخۆ، ئەو ماوەیەی پێیدەوترا ماوەی ئاوەدانكردنەوە و لە ساڵی ١٨٦٥ ەوە تا ساڵی ١٨٧٧ی خایاند، سیاسییەكانی باكوور، بەهاوكاری سوپای فیدراڵی، هەندێك گۆڕانكاری كۆمەڵایەتییان لە باشووردا هێنایەئاراوە، بەڵام بەرەنگاربوونەوەی سیستەماتیكی لە لایەن نوخبەكانی باشوور بە بیانووی هاوكاریكردنی ئەوانەی پێیان دەوترا ڕزگاركاران كە هەوڵی ڕزگاركردنی باشووریان دەدا، سیستەمە كۆنەكەی دروستكردەوە. لە هەڵبژاردنی سەرۆكایەتی ساڵی ١٨٧٧ دا، ڕوزەرفۆرد هەیس پێویستی بە هاوكاری باشوور بوو لە كۆلێجی دەنگدەران دا. ئەم كۆلێجە كە تا ئەمڕۆش بەكاردەهێنرێ و لە لایەن دەستووری ویلایەتە یەككگرتوەكانەوە دانراوە، ڕۆڵی سەرەكی لە هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆی سەرۆك دا دەبینی. دەنگی هاوڵاتییان بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ سەرۆك هەڵنابژێرن، بەڵكو لە جیاتی ئەوە ئەوانە هەڵدەبژێرن كە ڕاستەوخۆ سەرۆك لە كۆلێجی دەنگدەران دا هەڵدەبژێرن. بەرامبەر بە هاوكاری هەیس لە كۆلێجی دەنگدەران دا، باشوورییەكان داوایانكرد كە سوپای فیدراڵی لە باشوور بكشێتەوە و ناوچەكە بۆخۆی خۆیبەڕێوەبەرێ. هەیس ڕازیبوو. بە هاوكاری باشوورییەكان هەیس بوە سەرۆك و سوپای لە باشوور كێشایەوە. ماوەی دوای ساڵی ١٨٧٧ بوە سەردەمی سەرهەڵدانەوەی نوخبە خاوەن چاندنگەكەی پێش جەنگی ناوخۆ. ڕزگاركردنی باشوور بوە هۆی دانانی باجی نوێ و تاقیكردنەوەی خوێندەواری بۆ دەنگدان كە بەشێوەیەكی سیستەماتیكی ڕەشپێستەكان و زۆرجاریش دانیشتوانە سپیپێستە هەژارەكەی لە دەنگدان بێبەشدەكرد. ئەم هەوڵانە سەركەوتوو بوون و سیستەمی یەك حیزبییان

دروستکرد کە حیزبی دیموکرات بوو، بەشی زۆری دەسەڵاتەکانیش کەوتنە دەستی نوخبە خاوەن چاندنگەکانەوە.

یاساکانی جیم کرۆ بوونە هۆی دروستکردنی قوتابخانەی جیاواز و بەتایبەتی ئاست نزم. بۆ نموونە، ئەلەباما لە ساڵی ١٩٠١ دا دەستوورەکەی دەسکاریکرد بۆ ئەوەی ئەمە بچەسپێنێ. جێگەی داخە کە تەنانەت ئەمڕۆش برگەی ٢٥٦ ی دەستووری ئەلەباما، هەرچەندە چیتر جێبەجێناکرێ، دەڵێ:

- *ئەرکی ئەنجوومەنی یاسادانانە سیستەمی خوێندنی گشتی و دابەشکردنی بودجەی قوتابخانە گشتییەکان و قوتابخانەی جیاواز بۆ منداڵانی سپیپێست و ڕەشپێست دابمەزرێنێ و پەرەیانپێبدا.*
- *پێویستە ئەنجوومەنی یاسادانان سیستەمێکی لیبراڵی قوتابخانەی گشتی دابمەزرێنێ و ڕێکیبخا و پەرەیپێبدا لە سەراپای ویلایەتەکەدا بۆ منداڵانی تەمەن نێوان حەوت ساڵ و بیست و یەك ساڵ. بودجەی قوتابخانە گشتییەکان بۆ هەموو قەزاکان دیاریدەکرێ بە پێی ڕێژەی ئەو قوتابییانەی لە تەمەنی ئامادەپێدراودان و بە شێوەیەکیش بەسەر قوتابخانەکانی گەڕەك و شارۆچکەکان دا دابەشدەکرێ کە، تا ئەو ئەندازەیەی لە ڕووی پڕاکتیکەوە دەگونجێ، ماوەی خوێندنی یەکسان لە قوتابخانەکانی ئەو گەڕەك و قەزایانەدا برەخسێنی. پێویستە قوتابخانەی جیا بۆ منداڵانی سپیپێست و ڕەشپێست دروستبکرێ و نابێ ڕێگابدرێ کە هیچ منداڵێکی ئەم دوو ڕەگەزە بچنە قوتابخانەی ڕەگەزەکەی ترەوە.*

هەموارکردنەوەیەك بۆ لادانی برگەی ٢٥٦ ی دەستوور لە ساڵی ٢٠٠٤ دا بە زۆرینەیەکی کەم شکستیهێنا.

بێبەشکردن لە مافی دەنگدان و یاساکانی خۆدزینەوەی وەك کۆدی ڕەشپێستانی ئەلەباما و یاسا جۆراجۆرەکانی جیم کرۆ و ڕەفتارەکانی کو کلۆکس کلان، زۆرجار لە لایەن نوخبەکەوە پشتگیریدەکران و پارەیان بۆ دابین دەکرا. ئەمانە باشووری دوای جەنگی ناوخۆیان کردە کۆمەڵگایەکی ڕەگەزپەرست و ڕەشپێستان و سپیپێستان ژیانی جاوازیان تێدا بەسەردەبرد. هەروەك لە باشووری ئەفریقا دا، ئامانجی ئەم یاساو ڕەفتارانە بریتیبوو لە کۆنترۆڵکردنی دانیشتوانە ڕەشپێستەکە و هێزی کاری ئەوان.

سیاسییەکانی باشوور لە واشنتۆن هەوڵیاندا بەردەوامیی دەزگا چەوسێنەرەکانی باشوور مسۆگەربکەن. بۆ نموونە، هەوڵیاندا نەیەڵن هیچ

پرۆژەیەکی فیدراڵی یان پرۆژەکانی خزمەتگوزاری گشتی کە دەبوە هۆی لاوازکردنی کۆنترۆڵی نوخبەکەی باشوور بەسەر هێزی کاری ڕەشپێستانەوە پەسەندبکرێ. لە ئەنجامدا، باشوور وەك کۆمەڵگایەکی گوندنشینی گەورەی خاوەن پەروەردەی کەم و تەکنەلۆجی دواکەوتوو، پێینایە سەدەی بیستەمەوە، کە تا ئەو کاتەش پشتیان دەبەست بە کاری دەستی و هێزی هێستر بەبێ بەکارهینانی ئامرازی میکانیکی. هەرچەندە ڕێژەی خەڵك لە ناوچە شارنشینەکان دا زیادیکرد، بەڵام ئەم زیادکردنە زۆر کەمتر بوو لەوەی باکوور. لە ساڵی ١٩٠٠ دا، بۆ نموونە، ١٣,٥٪ دانیشتوانی باشوور لە ناوچە شارنشینەکان دا دەژیان، بە بەراورد لەگەڵ ٦٠٪ لە باکووردا.

بە شێوەیەکی گشتی، دەزگایانی چەوسێنەر لە باشووری ویلایەتە یەککگرتوەکاندا کە لەسەر بنەمای دەسەڵاتی نوخبەی موڵکدار و کشتوکاڵی چاندنگەیی و کرێی نزم و کرێکارانی پەروەردە کەم دامەزرابوو، تا ماوەیەکی زۆری سەدەی بیستەمیش بەردەوامبوون. ئەم دەزگایانە تەنیا لە دوای دوەم جەنگی جیهانی دەستیان بە داڕمان کرد و دواتریش بە شێوەیەکی بنەڕەتی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان بناخەی سیاسی سیستەمەکەی هەڵتەکاند. تەنیا دوای لەناوچوونی ئەم دەزگایانە لە ساڵانی ١٩٥٠ کان و ٦٠ کان بوو کە باشوور دەستیکرد بە گەیشتنەوەی خێرا بە باکوور.

باشووری ویلایەتە یەککگرتوەکان، دیوێکی تری بەرگەگرتری بازنەی ناهەمواری پیشاندەدا. هەروەك لە گواتیمالا دا، نوخبە چێنەرەکانی باشوور لە دەسەڵات دا مانەوە و دەزگا ئابووری و سیاسییەکانیان بە شێوەیەك دامەزراند کە بەردەوامیی دەسەڵاتی خۆیان مسۆگەربکەن. بەڵام جیاواز لە گواتیمالا، ئەو نوخبەیە دوای شکسهێنانیان لە جەنگی ناوخۆدا، تووشی تەحەدای گەورە بوونەوە کە کۆیلەیەتی هەڵوەشاندەوە و وەدەرنانی تەواوەتی دەستووریی ڕەشپێستەکانی لە بەشداری سیاسی دا پێچەوانەکردەوە. بەڵام زیاتر لە ڕێگەیەك هەیە بۆ کەوڵکردنی پشیلەکە: تا ئەو کاتەی نوخبە چێنەرەکان کۆنترۆڵی زەویوزارە زۆرەکەی خۆیان کرد و خاوەن ڕێکخستنی تۆکمە بوون، دەیانتوانی کۆمەڵە دەزگایەکی نوێی جیم کرۆ دابمەزرێنن لە جیاتی کۆیلەیەتی بۆ هێنانەدی هەمان ئامانج. دەرکەوت کە بازنەی ناهەمواری بەهێزتر بوو لەوەی کە چەندین کەس، لەوانە ئەبراهام لینکۆڵن، بیریانلێکردبۆوە. بازنەی ناهەمواری پشت بە دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەکان دەبەستێ بۆ دامەزراندنی دەزگا

ئابوورییە چەوسێنەرەکان و ئەمانیش بە دەوری خۆیان پشتگیری دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەکان دەکەن چونکە دەسەلات و سامانی ئابووری دەسەلاتی سیاسی دەکڕن. کاتێك چل ئەیکەر و هێسترێك لەسەر مێزەکە نەما، دەسەلاتی ئابووری نوخبە خاوەن چاندنگەکانی باشوور بەبێ گۆڕانکاری مایەوە. جێگەی سەر سوڕمان نییە و بەداخەوە کاریگەری ئەمەش لەسەر دانیشتوانی ڕەشپێستی باشوور و پەرەسەندنی ئابووری باشوور وەك یەك بوو.

## یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکی

فەرمانڕەوایی بنەماڵەیی نەوەی سلێمان لە ئەسیوپیادا بەردەوامبوو تا لە سالی ١٩٧٤ دا لە ئەنجامی کۆدێتایەکی سەربازییەوە ڕووخێنرا. کۆدێتاکە لە لایەن درێگ سەرکردایەتیکرا، کە گروپێکی ئەفسەرانی مارکسی ناو سوپا بوون. ئەو ڕژێمەی درێگ لە سەر دەسەلات لایبرد، پێدەچوو لە یەکێك لە سەدەکانی رابووردودا بەستبێتی. ئیمپراتۆر هەیلا سیلاسی ڕۆژەکەی بە هاتن بۆ دەرباری ئیمپۆاتۆری لە کۆشکی مەزن دەستپێدەکرد، کە لە لایەن ئیمپراتۆر مینیلیکی دوەمەوە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم دا دروستکرابوو. لە دەرەوەی کۆشك دا کۆمەلێك لە کەسایەتییە گەورەکان کە چاوەڕێی گەیشتنی ئیمپرتۆریان دەکرد بە کڕنوشبردن و بە پەرۆشەوە هەولی ڕاکێشانی سەرنجی ئیمپراتۆریان دەدا. ئیمپراتۆر لە هۆلی پێشوازی دا و لەسەر تەختی ئیمپراتۆری دادەنیشت و خەلکی دەبینی. (سیلاسی پیاوێکی کورتەبالا بوو، بۆ ئەوەی قاچەکانی لە هەوادا هەلنەواسرێن، ئەرکی هەلگری سەرینی تایبەتی بوو بۆ هەر شوێنێك دەچوو لەگەلیدا بێ بۆ ئەوەی سەرینێکی گونجاو بخاتە ژێر پێکانییەوە. هەلگری سەرین پەنجاو دوو سەرینی هەبوو بۆ ئەوەی ئامادەیی بۆ هەموو بارودۆخێك هەبێ.) سیلاسی فەرمانڕەوایی کۆمەلێك دەزگایانی یەکجار چەوسێنەری دەکرد و وولاتی وەك مولکی تایبەتی خۆی بەڕێوەدەبرد و چاکە و هاوکاری بۆ بەدەسهێنانی دلسۆزی دەبەخشییەوە و بێبەزەییانە سزای ئەوانەی دەدا دلسۆز نەبونایە. پەرەپێدانێکی ئابووری ئەوتۆ نەبوو کە شایانی باس بێ لە ئەسیوپیادا لە سایەی فەرمانڕەوایی ئەو بنەمالەیەی بنەچەی خۆیان دەگەڕاندەوە بۆ سلێمان.

لە سەرەتادا، درێگ لە ١٠٨ نوێنەری یەکە سەربازییە جیاوازەکان لە ناوچە

جیاوازەکانی وولات پێکهاتبوو. نوێنەری فەیلەقی سێ لە پارێزگای هەرار ڕائدێك بوو بە ناوی مێنگیستۆ هەیلی ماریەم. هەرچەندە لە ڕاگەیاندنی یەکەمیان دا لە ٤ تەمووز سالّی ١٩٧٤ دا، ئەفسەرانی درێگ دلّسۆزی خۆیان بۆ ئیمپراتۆر ڕاگەیاند، بەلاّم هەر زوو دەستیانکرد بە گرتنی ئەندامانی حکومەت، بەمەش ویستیان ئاستی بەرهەلّستکاری بۆ ئەم هەنگاوەیان تاقیبکەنەوە. کاتێك زیاتر لەوە دلّنیابوون کە پشتگیری بۆ ڕژێمەکەی سیلاسی بۆش بوو، کەوتنە گیانی خودی ئیمپراتۆر و لە ١٢ی ئەیلولدا دەسگیریان کرد. دوای ئەوە کوشتن دەستپێکرد. چەندین سیاسی دەستڕۆیشتووی ڕژێمی کۆن کوژران. لە کانونی یەکەم دا درێگ ڕایگەیاند کە ئەسیوپیا دەولّەتێکی سۆشیالیستییە. سیلاسی لە ٢٧ ئابی ١٩٧٥ دا مرد و ڕەنگە کوژرابێ. لە سالّی ١٩٧٥ دا درێگ دەستیانکرد بە خۆمالّیکردنی مولّك و زەوی لەوانە هەموو زەوی شارنشین و گوندنشین و بەشی هەرە زۆری مۆلّکی تایبەت. هەلّسوکەوتە ئەسۆریتاریەکانی ڕژێم بوە هۆی سەرهەلّدانی ئۆپۆزیۆسۆن لە هەموو وولات دا. بەشی زۆری ئەسیوپیا لە کاتی فراوانکردنی دەسەلاّتی کۆلۆنیالی ئەورووپی دا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم دا بەهۆی سیاسەتەکانی ئیمپراتۆر مینیلیکی دوەم، بەراوەی جەنگی ئەدۆوا، پێکەوەنرابوو، کە لەمەوپێش باسکرا. بەشێك لەم ناوچانەش بریتیبوون لە ئەریتریا و تیگرەی لە باکوور و ئۆگادن لە ڕۆژهەلاّت. بزووتنەوە سەربەخۆییەکان بەرامبەر ڕژێمە دڕندانەکەی درێگ لە ئەریتریا و تیگرەی سەریهەلّدا، لە کاتێك دا سوپای سۆمالّ ناوچەی ئۆگادینی ـ زمان سۆمالّی ـ داگیرکرد. درێگ بۆخۆی دەستیکرد بە پەرتبوون و بەسەر چەند تاقمێك دا دابەشبوو. دەرکەوت ڕائد مێنگیستۆ لە هەموان دڕندە ترو زیرەك تر بوو. تا ناوەڕاستی سالّی ١٩٧٧ هەموو بەرهەلّستکارەکانی لە ناوبرد و بە تەواوی ڕژێمەکەی خستە بندەستی خۆی کە تەنیا لە ڕێگەی ڕەوانەکردنی چەك و سوپایەکی زۆرەوە لە لایەن یەکێتی سۆڤیەت و کوباوە لە تشرینی دوەمی ئەو سالّەدا لە ڕوخان ڕزگاری بوو.

لە سالّی ١٩٧٨ ڕژێم ئاهەنگێکی نەتەوەیی ڕێکخست بۆ یادکردنەوەی چوارەم سالّەی لەناوبردنی هەیلا سیلاسی. لەم کاتەدا مێنگیستۆ سەرکردەی بێبەرامبەری درێگ بوو. بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی و ئەو شوێنەی کە لێیەوە حوکمی ئەسیوپیای دەکرد، کۆشکی مەزنی سیلاسی هەلّبژارد کە لە دوای هەلّوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتەکەوە بە چۆلّی مابۆوە. لە ئاهەنگەکەدا،

ئەو لەسەر کورسییەکی ئاڵتوونی دانیشت، بەهەمانشێوەی ئیمپراتۆرەکانی سەردەمی کۆن و لەوێوە تەماشای نمایشەکەی دەکرد. کارە فەرمییەکان جارێکیتر لە کۆشکی مەزن دا رێکدەخرا و مێنگیستۆش لە سەر تەختە کۆنەکەی هەیلا سیلاسی دادەنیشت. مێنگیستۆ کەوتە ئەوەی کە خۆی بە ئیمپراتۆر تیودۆرس بەراوردبکا، ئەو ئیمپراتۆرەی سەرلەنوی فەرمانڕەوایی بنەماڵەیی سلێمانی، دوای ماوەیەك لە لاوازبوونیان، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم دا دامەزراندبۆوە.

یەکێك لە وەزیرەکانی مێنگیستۆ کە داویت وۆڵد گیۆرگیس بوو لە یاداشتەکانیدا نووسیویەتی:

*(لە سەرەتای شۆڕش دا هەر هەموومان بە توندی هەموو ئەو شتانەمان ڕەتکردەوە کە پەیوەندییان بە ڕابوردووەوە هەبوو. چیتر ئۆتۆمبێلمان بەکارنەدەهێنا یان قاتمان لەبەر نەدەکرد، بەستنی بۆینباخ تاوان بوو. هەر شتێك وای بنوانایە دەوڵەمەندیت یان بۆرجوازیت، هەر شتێك نیشانەی خۆشگوزەرانی و ناسادەیی بوایە، وەك بەشێك لە سەردەمی کۆن لێکدەدرایەوە. دواتر، لە دەوری ساڵی ١٩٧٨ دا هەموو ئەوانە بەرەو گۆڕان ڕۆیشتن. بەرەبەرە مەتێریالیزم بوە جێگەی پەسەنکردن و دواتریش بوە پێویستی. جلوبەرگی دیزاینکراو لە باشترین بەرگدروەکانی ئەورووپاوە بوە جلی ڕەسمی هەموو کاربەدەستە باڵاکانی حکومەت و ئەندامانی ئەنجوومەنی سەربازی. ئێمە باشترینی هەموو شتێکمان هەبوو: باشترین ماڵ، باشترین ئۆتۆمبێل، باشترین ویسکی و شەمپانیا و خواردن. بە تەواوەتی پێچەوانەکردنەوەی ئایدیاڵەکانی شۆڕش بوو).*

گیۆرگیس بە ڕوونی تۆماریکردوە کە چۆن مێنگیستۆ گۆڕا، کاتێك بوە فەرمانڕەوای تاکوتەنیا:

*(مێنگیستۆی ڕاستەقینە خۆی دەرخست: تۆڵەسێن، دڵڕەق و ئەسۆریتاریان. زۆرێك لە ئێمە کە دەمانتوانی قسەی لەگەڵ دا بکەین کاتێك دەستەکانمان لە گیرفانماندا بوون، بەو مانایەی کە ئەو یەکێك بوو لە ئێمە، ئیتر دەبوایە بە ڕێکی لەبەر دەمیدا بوەستاینایە و بە وریاییەوە ڕێزمان بنواندایە لە کاتی ئامادەبوونیدا. لە کاتی قسەکردن لەگەڵیدا، پێشتر هەمیشە شێوازی "تۆ"، ئەنتی مان بەکاردەهێنا، ئیتر ناچار بووین شێوازی ڕەسمی تر "ئێوە"، ئێرستۆ بەکاربهێنین. ئەو گواستیەوە بۆ ئۆفیسێکی گەورەتر و کەشخەتر لەناو*

*کۆشکەکەی مینیلیك دا ... وا بڕیار بوو شۆڕشی یەکسانیمان هەبوایە، بەڵام ئەو بوە ئیمپراتۆرێکی نوێ).*

ڕێچکەی بازنەی ناهەمواری کە لە کاتی گواستنەوەی دەسەڵات لە نێوان هەیلا سیلاسی و مینگیستۆ، یان لە نێوان حکومەتی کۆلۆنیالی بەریتانی لە سیارا لیۆن و سیاکا ستیڤنس دا دەرکەوت، هێندە ئێکستریم و لە هەندێك ئاست دا هێندە سەیرە کە شایانی ناوێکی تایبەتە. هەروەك لەمەوپێش لە چاپتەری چوارەم دا باسمانکرد، کۆمەڵناسی ئەڵمانی ڕۆبەرت میشێلس ناوی نا یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکی. لۆجیکی ناوەوەی ئۆلیگارکی و لە ڕاستیشدا هی هەموو ڕێکخراوە هەرەمییەکان، هەروەك میشێلس باسیکردوە ئەوەیە، کە ئەوان خۆیان بەرهەمدەهێننەوە نەك تەنیا کاتێك هەمان گروپ لە دەسەڵاتدایە، بەڵکو تەنانەت کاتێکیش گروپێکی تەواو نوێ دەسەڵات دەگرێتەدەست. ئەوەی ڕەنگە میشێلس چاوەڕێی نەکردبێ دەنگدانەوەی بۆچوونەکەی کارڵ مارکس بوو کە دەڵێ مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە ـ یەکەمجار وەك تراژیدیا و دوەمجاریش وەك گاڵتەجاڕی.

نەك تەنیا چەندین سەرکردەی ئەفریقی دوای سەربەخۆیی چوونەوە هەمان شوێنی نیشتەجێبوون و پەنایانبردە بەر هەمان تۆڕەکانی لایەنگرانی کڕاو بە پارە و هەمان ڕێگایان بۆ خراپ سوودوەرگرتن لە بازاڕەکان بەکارهێنا و دەرامەتی خەڵکیان زەوتکرد بەو شێوەیەی ڕژێمە کۆلۆنیاڵ و ئیمپراتۆرەکانی ئەوان جێگەیان گرتنەوە، کردبوویان، بەڵکو شتەکانیان خراپترکرد. لە ڕاستیدا گاڵتەجاڕی بوو کە ستیڤنسی لە ڕادەبەدەر دژە کۆلۆنیالی کەوتە کۆنترۆڵکردنی هەمان ئەو خەڵکەی بەریتانییەکان هەوڵی کۆنترۆڵکردنیان دابوون کە مێندی بوون و پشتی بە هەمان ئەو سەرۆك هۆزانە بەست کە بەریتانییەکان هێزداریان کردبوون و دواتریش بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچەکانیان بەکاریهێنان و ئابووری بە هەمان ئەو شێوەیە بەڕێوەبرد و کێڵگەکانی زەوتکرد لە ڕێگەی هەمان ئەو بۆردانەی فرۆشتن و کۆنترۆڵی ئەڵماسی کرد لە سایەی هەمانشێوە مۆنۆپۆڵی دا. بە ڕاستی گاڵتەجاڕی بوو، بەڕاستی گاڵتەجارییەکی یەکجار خەماوی بوو، لۆرەنت کابیلا، کە سوپایەکی دژی دیکتاتۆریەتی مۆبۆتو کۆکردەوە و بەڵێنیدا خەڵك ئازادبکا و کۆتایی بە گەندەڵی و چەوساندنەوە ماڵوێرانکارەکەی زائیری مۆبۆتو بهێنێ، دواتر ڕژێمێك دابمەزرێنێ کە بە هەمانشێوە گەندەڵ و ڕەنگە ماڵوێرانکار تریش بووبێ. بێگومان جێگەی گاڵتەجاری بوو کە هەوڵیدا لاسایی

کەسایەتی مۆبۆتۆ بکاتەوە و لە لایەن دۆمینیک ساکۆمبی ئینۆنگۆ پاڵپشتی بکرێ، کە پێشتر وەزیری زانیاری مۆبۆتۆ بوو. جێگەی گاڵتەجاڕی بوو کە خودی ڕژێمەکەی مۆبۆتۆش لەسەر ئەو شێوازەی چەوساندنەوەی جەماوەر دابمەزرێ کە زیاتر لە سەدەیەک لەوەبەر لیۆپۆڵد پاشای فری ستەیتی کۆنگۆ پەیڕەوی کردبوو. بەڕاستی جێگەی گاڵتەجاڕی بوو کە ئەفسەرێکی مارکسیستی وەک مینگیستۆ لە کۆشکێک دا بژی و وەک ئیمپراتۆر سەیری خۆی بکا و خۆی و دەستوپێوەندەکانی دەوڵەمەند بکا، بەهەمان ئەو شێوەیەی هەیلا سیلاسی و ئیمپراتۆرەکانی تری پێش خۆی کردبوویان.

هەمووی گاڵتەجاڕی بوو، بەڵام لە هەمانکات دا لە تراژیدیای یەکەم تراژیدی تر بوو، نەک تەنیا لەبەر ئەو ئاواتانەی لەباربران. ستیڤنس و کابیلا، وەک چەندین فەرمانڕەوای تری ئەفریقا، لە پێشدا کەوتنە کوشتنی بەرهەڵستکارەکانیان و دواتریش هاوڵاتییە بێتاوانەکانیان. سیاسەتەکانی مینگیستۆ و درێگ برسێتی یەک لە دوای یەکیان بۆ زەوییە بەپیتەکانی ئەسیوپیا هێنا. مێژوو خۆی دووبارە دەکردەوە بەڵام لە شێوازێکی زۆر شێواو تردا. ئەوە بڵاوبوونەوەی برسێتی بوو لە پارێزگای ۆلۆ لە ساڵی ۱۹۷۳ دا، ئەو برسێتیەی هەیلا سیلاسی کەمتەرخەمی بەرامبەر نواند، کە ڕۆڵی گەورەی لە بەهێزکردنی بەرهەڵستکاریی بۆ ڕژێمەکەی بینی. سیلاسی بەرامبەر بەو برسێتیە تەنیا کەمتەرخەم بوو، بەڵام مینگیستۆ وەک ئامرازێکی سیاسی لاوازکردنی بەرهەڵستکارانی دەیڕوانیە بڵاوبوونەوەی برسێتی. مێژوو تەنیا جێگەی گاڵتە و تراژیدیا نەبوو، بەڵکو بەرامبەر هاوڵاتییانی ئەسیوپیا و زۆربەی ناوچەکانی باشووری بیابانی ئەفریقا دڵڕەقبوو.

جەوهەری یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکی، ئەم دیوە تایبەتەی بازنەی ناهەمواری، ئەوەیە کە سەرکردە تازەکان سەرکردە کۆنەکان لە سەر حوکم لادەبەن و بەڵێنی گۆڕانکاری ڕیشەیی دەدەن، بەڵام هیچ شتێک جگە لەوەی کۆن ناهێننەئاراوە. لە هەندێک ئاست دا تێگەیشتن لە یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکی لە شێوازەکانی تری بازنەی ناهەمواری زەحمەت ترە. لۆجیکێکی ڕوون بۆ بەردەوامی دەزگایانی چەوسێنەر لە باشووری ویلایەتە یەکگرتوەکان و گواتیمالادا هەیە. هەمان ئەو گروپانە، بۆ چەندین سەدە، بەردەوامبوون لە دەستگرتن بەسەر ئابووری و سیاسەت دا لەو وڵاتانەدا. تەنانەت کاتێکیش تەحەدا کران، بەو شێوەی خاوەن چاندنگەکانی باشووری ویلایەتە

یــەکگرتوەکان لــە دوای جــەنگی نــاوخۆ بــەرەورووی تەحــەدا بوونــەوە، دەسەڵاتەکەیان گۆڕانکاری بەسەردا نەهات و توانیان ئەو دەزگا چەوسێنەرانە بهێڵنــەوە و دەزگایــانی هاوشــێوە دروســتبکەنەوە کــە دیــسانەوە ســوودیان لێوەرگرتن. بەڵام ئایا چۆن لەوانە تێبگەین کە بە ناوی گۆڕانکاری بنەڕەتییەوە دەسەڵات دەگرنەدەست، بەڵام هەمان ئەو سیستەمە دروستدەکەنەوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە، جارێکیتر، ئەوە دەردەخا کە بازنەی ناهەمواری لەوە بەهێزترە کە یەکەمجار دەردەکەوێ.

چارەنووسی هەموو گۆڕانکارییە ڕیشەییەکان شکستخواردن نییە. شۆڕشــی شکۆدار گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی بوو، بوە هۆی بەرپاکردنی گرنگترین شۆڕشــی سیاسی لە دوو هەزارەی ڕابوردوودا. شۆڕشــی فەرەنــسا تەنانــەت ڕیشەیی تــر بوو، سەرەڕای بەرپابوونی ئاژاوە و توندوتیژی زۆر و هاتنە سەرتەختی ناپلیۆن بۆناپارت، بەڵام ڕژێمە کۆنەکەی دروستنەکردوە.

سێ فاکتەر، بە پلەی یەکەم، ڕێخۆشکار بــوون بــۆ ســەرهەڵدانی دەزگایــانی زیاتر کراوە لە دوای شۆڕشی شکۆدار و شۆڕشی فەرەنسی. یەکەمیان بریتیبــوو لە بوونی بازرگانان و بزنسمانانی نوێ کە حەزیاندەکرد جڵەو بۆ هێزی تێکــدانی بنیاتنەر، کە بۆخۆیان لێی سوودمەندبوون، شۆڕ بکەن. ئەم پیاوانــە ئەنــدامانی ســـــەرەکی هاوپەیمانییـــــە شۆڕشـــــگێرەکان بـــــوون و حـــــەزیان نـــــەدەکرد دروستبوونەوەی کۆمەڵێکی تر لە دەزگایــانی چەوسێنــەر ببیــنن کــە دیــسانەوە لەسەر لاشەی ئەوان بژین.

دوەمیان بریتیبوو لە سروشتی ئــەو هاوپەیمانییــە فراوانــەی کــە لــە هــەردوو حاڵەتەکەدا پێکهاتبوو. بۆ نموونە، شۆڕشی شکۆدار کۆدیتایەك نەبوو لــە لایــەن گروپێکــی بــچووکی خــاوەن بەرژەوەنــدی تەســکەوە، بــەڵکو بریتیبــوو لــە بزووتنەوەیەك کە لە لایەن بازرگانــان و کەســانی خــاوەن پیــشەسازی و نۆبــڵ و گروپە سیاسییە هەمەجۆرەکانەوە پشتگیریدەکرا. هــەمان شــتیش بــۆ شۆڕشــی فەرەنسا ڕاست بوو.

فاکتەری ســێیەم بریتیبــوو لــە مێــژووی دەزگا سیاســییەکانی ئینگلتــەرە و فەرەنــسا. ئەوانــە باکگراونــدی پەرەپێــدانی ڕژێمــانی نــوێی زیــاتر کراوەیــان ڕەخساند. لە هەردوو وڵاتەکەدا نەریتی پەرلەمان و هاوبەشیکردن لە دەسەڵات دا لە ئارادا بوون کە دەگەڕانەوە بۆ ماگنــا کارتــا لــە ئینگلتــەرە و ئەنجوومــەنی پیاومــاقوڵان لــە فەرەنــسادا. جگــە لەمانــەش، هــەردوو شۆڕشــەکە لــە گەرمــەی

پرۆسەیەکدا بەرپاکران کە بووبوە هۆی لاوازکردنی دەسەڵاتی ڕەهای ڕژێمەکان، یان ئەوانەی نیازی دامەزراندنی ڕژێمی ڕەهایان هەبوو. لە هەردوو حاڵەتەکەدا، ئەو دەزگا سیاسییانەی کە لە ئارادا بوون کاری کۆمەڵێك فەرمانڕەوای نوێ یان گروپێکی بچووکیان زەحمەتکرد تا دەوڵەت بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و سامانی ئابووری هەڵلوشن و دەسەڵاتی سیاسی درێژخایەن و بێچاودێری دابمەزرێنن. لە دوای شۆڕشی فەڕەنسی، گروپێکی بچووك بە سەرکردایەتی ڕۆبسپێری و سەینت جەست، دەسەڵاتی خۆیان سەپاند کە ئاکامی ماڵوێرانکاری لێکەوتەوە. بەڵام ئەمە کاتی بوو، ڕێڕەوەکەشی بە ئاراستەی دەزگایانی زیاتر کراوەدا نەگۆڕی. هەموو ئەمانە پێچەوانەی بارودۆخی ئەو کۆمەڵگایانە بوون کە مێژوویەکی درێژی دەزگایانی ئابووری و سیاسی چەوسێنەریان هەبوو، لەگەڵ نەبوونی هیچ چاودێرییەك بەسەر دەسەڵاتی فەرمانڕەواکانیانەوە. لەم کۆمەڵگایانە دا بازرگانان و بزنسمانانی نوێی بەهێز نەبوون کە پشتگیری بەرەنگاربوونەی ئەو ڕژێمانە بکەن کە لە سەر حوکم بوون تا ڕادەیەك بۆ جێگیرکردنی دەزگایانی ئابووری کراوەتر و هاوپەیمانی فراوان لە ئارادا نەبوو تا دەسەڵاتی هەریەك لە ئەندامەکانی خۆی جڵەوگیربکا و دەزگایانی سیاسی ئەوتۆ نەبوون تا ڕێگربن لەبەردەم ئەو فەرمانڕەوا نوێیانەدا کە حەزیان لە زەوتکردن و خراپ بکارهێنانی دەسەڵات بوو.

لە ئەنجامدا، لە سیارا لیۆن و ئەسیوپیا و کۆنگۆ، بەرەنگاربوونەوەی بازنەی ناهەمواری زۆر زەحمەت تر بوو، هەوڵدان بەرەو دەزگایانی کراوە زەحمەت تر بوو بکەوێتەگەڕ. لە هەمانکات دا لەو کۆمەڵگایانەدا دەزگایانی تەقلیدی یان مێژوویی نەبوون کە چاودێری دەسەڵاتی ئەوانە بکەن دەوڵەتیان دەخستە بن کۆنترۆڵی خۆیانەوە. ئەم جۆرە دەزگایانە لە هەندێك ناوچەی ئەفریقادا هەبوون و هەندێکیشیان وەك ئەوانەی بۆتسوانا، تەنانەت لە سەردەمی کۆلۆنیالی دا قوتاریان بوو. بەڵام ئەم دەزگایانە لە مێژووی سیارا لیۆن دا کەمتر کاریگەر بوون و ئەوانەشی کە هەبوون لە ڕێگەی حوکمی ناڕاستەوخۆوە پێچرانەوە. هەمان شت بۆ کۆلۆنییەکانی تری بەریتانیا لە ئەفریقادا، وەك کینیا و نایجیریا، ڕاست بوو. ئەو دەزگایانە لە پاشایەتی ڕەهای ئەسیوپیادا هەرگیز بوونیان نەبوو. لە کۆنگۆدا، دەزگا خۆماڵییەکان لە لایەن حوکمی کۆلۆنیالی بەلچیکاو سیاسەتە ئۆتۆکراتیەکانی مۆبۆتۆ وە لغاو کرابوون. لە هەموو ئەم کۆمەڵگایانەدا بازرگان و بزنسمان و کارزانی نوێ نەبوون کە

هاوکاری ڕژێمە نوێکان بکەن و داوای مافی موڵکداری جێگیر و کۆتاییهێنـان بـە دەزگایـانی چەوسـێنەری کـۆن بکـەن. لـە راسـتیدا، دەزگایـانی ئـابووری چەوسێنەری سەردەمی کۆلۆنیالی بوونە هۆی ئەوەی کە بـزنس و کـارزانی هـەر بوونیان نەبێ.

کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لەو بڕوایـەدا بـوو کـە سـەربەخۆیی ئەفـەریقای دوای کۆلۆنیالی دەبێتە هۆی گەشـەپێدانی ئـابووری لـە ڕێگـەی پرۆسـەی پلانـدانانی دەوڵەت و بایەخدان بە کەرتی تایبەت. بەڵام کەرتی تایبەت بوونی نەبوو. جگـە لە ناوچە گوندنشینەکان کە ئەوانیش نوێنەرایەتییان لە ناو حکومەتە نوێکان دا نەبوو، بەمـەش ئـەوان بوونـە نێچیری یەکـەمی ئـەو حکومەتانـە. لەهەمووشـی گـرنگتر ئـەوە بـوو کـە لـە هـەموو ئـەم حاڵەتانـەدا سـوودێکی یـەکجار زۆر لـە دەسـەڵات گرتنەدەسـتدا هـەبوو. ئـەم سـوودانەش بێویـژدانترین پیـاوانی وەك ستیڤنسی ڕاکیشا کە حەزیان لە مۆنۆپۆلیکردنی ئەو دەسـەڵاتە بـوو. هـەر ئـەم سـوودانە خـراپترین ڕەفتـاری ئـەوانی بەرجەسـتەکرد کاتێـك دەسـەڵاتیان گرتەدەست. هیچ شتێك نەبوو کە بازنە ناهەمارییەکە بشکێنێ.

## فیدباکی نێگەتیڤ و بازنەی ناهەمواری

نەتـەوانی دەوڵەمەنـد، دەوڵەمەنـدن چـونکە توانیویانـە لـە قۆناخێـك لـە قۆناخـەکانی سـێ سـەد سـاڵی ڕابـوردودا دەزگایـانی کـراوە دابمـەزرێنن. ئـەم دەزگایانەش لە ڕێگەی پرۆسەی بازنەی بەختەوەرییەوە بەردەوامییان پێدراوە. تەنانەت ئەگەر ئـەم دەزگایانـە لـە سـەرەتادا بـە شـێوەیەکی سـنووردار کـراوە بـووبن و هەنـدێجاریش لـەرزۆك بـووبن، ئـەو داینەمیکـەیان هێنایـەئاراوە کـە پرۆسەی فیدباکی پۆزەتیڤی دروستکرد و بەرەبەرە ڕادەی کراوەییان زیادیکرد. ئینگلتـەرە لـە دوای شۆڕشـی شـکۆداری سـاڵی ١٦٨٨ نـەبوە وڵاتێکـی دیموکراسی. زۆر لێـوەی دووربـوو، تـەنیا بەشـێکی کـەمی دانیـشتوان خـاوەن نوێنەرایەتی فەرمی بوون، بـەڵام ئـەوەی گـرنگ بـوو ئـەوە بـوو کـە ئینگلتـەرە وڵاتێکی پلورەلیستی بـوو. کاتێـك پلـورەلیزم چەسـپا، ویـستی دەزگاکـان بـۆ بوونە دەزگایانی زیاتر کراوە بە تێپەڕبوونی کـات دروسـتبوو، هەرچـەندە ئەمـە پرۆسەیەکی سەخت و جێگەی دڵنیایی نەبوو.

لەمەدا، ئینگلتەرە نموونەی بازنەی بەختەوەرەی بوو. دەزگایانی سیاسی کراوە جڵەوگیری دروستدەکەن بەرامبەر پیادەکردن و زەوتکردنی دەسەڵات. ئەو دەزگایانە، دەبنە هۆی دامەزراندنی دەزگایانی ئابووری کراوە، کە ئەوانیش بەدەوری خۆیان دەبنە هۆی ڕەخساندنی دەرفەتی زیاتر بۆ بەردەوامیی دەزگایانی سیاسی کراوە.

لە سایەی دەزگایانی ئابووری کراوەدا، سامان لە دەستی گروپێکی بچووک دا چڕ نابێتەوە تا هێزی ئابووری خۆیان بۆ زیادکردنی دەسەڵاتی سیاسی خۆیان بەشێوەیەکی نابەرامبەر بەکاربهێنن. جگە لەمە، لە سایەی دەزگایانی ئابووری کراوەدا، دەسکەوتی سنووردارتر لە دەسەڵات گرتنەدەست دا بەدەستدەهێنرێ و بەمەش هاندانی لاواز تر دروستدەکا بۆ هەموو گروپ و تاکە دەسەڵاتخوازەکان بۆ کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت.

یەکگرتنی کۆمەڵێك فاکتەر لە کاتی وەرچەرخانی مێژوویی دا، لەوانەش کارلەیەککردن لە نێوان ئەو دەزگایانەی لەئارادان و ئەو دەرفەت و تەحەدایانەی وەرچەرخانە مێژووییەکە لەگەڵ خۆی دا دەیانهێنێ، بەگشتی بەرپرسە لە دەسپێکردنی دەزگایانی کراوە، هەورەك حاڵەتی ئینگلتەرە پیشانیدەدا. بەڵام کاتێك ئەم دەزگا کراوانە دادەمەزرێن، ئیتر پێویستیان بە یەکگرتنی هەمان ئەو فاکتەرانە نابێ بۆ مانەوەیان. بازنەی بەختەوەری توانای بەردەوامیی دەزگاکان دەرەخسێنێ و زۆرجاریش تەنانەت داینەمیکی بردنی کۆمەڵگا بەرەو کرانەوەی زیاتر دەهێنێتەئاراوە.

کاتێك بازنەی بەختەوەری دەبێتە هۆی بەردەوامی دەزگایانی کراوە، بازنەی ناهەمواری هێزی گەورە دروستدەکا بۆ بەردامیی دەزگایانی چەوسێنەر. مێژوو چارەنووس نییە و شکاندنی بازنەکانی ناهەمواریش ئەستەم نییە، هەروەك لە چاپتەری ١٤ دەبینین. بەڵام دەزگایانی چەوسێنەر بەرگەگرن و پرۆسەیەکی بەهێزی فیدباکی نێگەتیڤ دروستدەکەن و دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر پێکدەهێنن، کە ئەوانیش بە دەوری خۆیان بناخەی بەردەوامیی دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەکان دادەمەزرێنن. ئەمەمان زۆر بەڕوونی لە حاڵەتی گواتیمالادا بینی، کاتێك هەمان نوخبە دەسەڵاتی گرتەدەست، یەکەمجار لە سایەی حوکمی کۆلۆنیاڵی و دواتریش لە گواتیمالای سەربەخۆدا بۆ ماوەی زیاتر لە چوار سەدە. دەزگایانی چەوسێنەر نوخبەکە دەوڵەمەند دەکەن و سامانی نوخبەکەش بناخەی بەردەوامیی

باڵادەستییان دروستدەكا.

هــەمان پرۆســەی بازنــەی ناهــەمواری لــە بــەردەوامیی ئــابووری چــێنەری باشووری ویلایەتە یەكگرتوەكان دا بــە ڕوونــی لــە ئــارادا بــوو جگــە لــەوەی كــە حاڵــەتی باشــووری ئەمــەریكا بەرگــەگرتنی زۆری بازنــەی ناهــەمواری بەرامبــەر تەحەداكان ڕووندەكاتەوە. چێنەرانی باشوور، دوای شكستهێنانیان لــە جــەنگی نــاوخۆدا، كــۆنترۆڵی فــەرمییان بەســەر دەزگایــانی ئــابووری و سیاسییەوە لــە دەســت دا. كۆیلەیــەتی كــە بناخــەی ئــابووری چــاندن بــوو، هەڵوەشــێنرایەوە و ڕەشپێستان مافی سیاسی و ئابووری یەكسانیان پێدرا. لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا، جەنگی ناوخۆ دەسەڵاتی سیاسی و بناخــەی ئــابووری نوخبــە چــێنەرەكەی لەناونەبرد و توانیان سیستەمەكە بە ڕووخسارێكی ترەوە دروستبكەنەوە بــەڵام لەژێر كۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسی نــاوخۆیی خۆیــان دا و بــۆ هێنانــەدی هــەمان ئامانج: دەستەبەركردنی كرێكارانی كرێ نزم بۆ كێڵگەكانیان.

ئــەم شــێوازەی بازنــەی ناهــەمواری، كــە تیایــدا دەزگایــانی چەوســێنەر بەردەوامــدەبن لەبەرئــەوەی ئــەو نوخبەیــەی كۆنترۆڵیــان دەكــا و ســوودیان لێــوەردەگرێ بەردەوامــدەبن، تــەنیا شــێوازی بازنــەی ناهــەمواری نییــە. لــە سەرەتادا فیداباكێكی سەیرتر، بــەڵام نــەك كــەمتر ڕاســتەقینە و بــە دڕاندایــەتی كــەمترەوە، پەرەســەندنی دەزگایــانی سیاســی و ئــابووری چــەندین نەتــەوەیان داڕشــت و ئەمــەش لــە ڕێگــەی ئــەزموونی زۆربــەی وڵاتــانی باشــووری بیابــانی ئــەفریقی ڕووندەبێتــەوە، بەتایبــەتی ســیارا لیــۆن و ئەســیوپیا. شــێوازێك كــە كۆمەڵناس ڕۆبەرت میشێلس بە یاسای ئاسنینی ئۆلیگاركی ناویبردوە، لــە ســەر تەخت لابردنی ڕژیمێك كە دەستیگرتوە بەسەر دەزگایانی چەوسێنەردا، مژدەی گەیشتنی كۆمەڵە خودانێكی تر دەدا بۆ دەستگرتن بەسەر هــەمان ئــەو كۆمەڵــە دەزگا چەوسێنەرانە دا.

تێگەیشتنی لۆجیكی ئەم جۆرە بازنە ناهەمواریــیە بــە گەڕانــەوە بــۆ دواوە، ئاســانە: دەزگایــانی سیاســی چەوســێنەر جڵــەوگیری كــەم دەخەنــە ســەر پیادەكردنی دەسەڵات. بــەو مانایــەی كــە دەزگایــانی وا نــین كــە جڵــەوگیری لــە بــەكارهێنان و پێــشێلكردنی دەســەڵات بكــەن لــە لایــەن ئەوانــەوە كــە دیكتاتۆرەكانی پێشتر لە سەر دەسەڵات لادەبەن و دەستدەگرن بەسەر دەوڵەت دا. دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر ئەوە دەگەیــەنن كــە لــە ڕێگــەی دەســتگرتن بەسەر دەسەڵات دا دەكرێ ســوود و ســامانێكی زۆر بەدەســتبهێنرێ و مــوڵكی

خەڵکی تر زەوتبکرێ و مۆنۆپۆلیەکان دابمەزرێنرێن.

بێگومان یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکی یاسایەکی ڕاستەقینە نییە بە هەمانشێوەیەی یاساکانی فیزیا و ئەو یاسایە ڕێچکەیەکی حەتمی دیاریناکا، هەروەك شۆڕشی شکۆدار لە ئینگلتەرەدا و گەڕانەوەی مەیجی لە یابان دەریدەخەن.

فاکتەری سەرەکی لە ناو ئەم ئەڵقانەدا. کە بوە هۆی وەرچەرخانی گەورە بەرەو دەزگایانی کراوە، بریتیبوو لە هێزدارکردنی هاوپەیمانییەکی فراوان کە توانی بەرامبەر ڕەهایی بوەستێتەوە و جێگەی دەزگا ڕەهاکان بە دەزگایانی زیاتر کراوە و پلورەلیستی بگرێتەوە. شۆڕش لە لایەن هاوپەیمانییەکی فراوانەوە سەرهەڵدانی دەزگایانی سیاسی پلورەلیستی ئاسانتر دەکا. لە سیارا لیۆن و ئەسیوپیا خۆکەوتنی یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکی تەنیا لەبەر ئەوە نەبوو کە ئەو دەزگایانەی لەو وولاتانەدا هەبوون زۆر چەوسێنەر بوون، بەڵکو لەبەر ئەوەش بوو کە بزووتنەوە سەربەخۆییخوازەکەی سیارا لیۆن و کۆدێتاکەی درێگ لە ئەسیوپیا، شۆڕش نەبوون لە لایەن هاوپەیمانی فراوانەوە سەرکردایەتیکرابن، بەڵکو ئەوانە لە لایەن کەسان وگروپانی تەوتۆوە سەرکردایەتیکران کە بەدوای بەدەستهێنانی دەسەڵات دا بوون بۆ ئەوەی بۆخۆیان چەوساندنەوە ئەنجامبدەن.

لەگەڵ ئەمەش دا دیوێکی تری تێکدەرتری بازنەی ناهەمواری هەیە کە لە ڕێگەی گفتوگۆکانمان دەربارەی دەوڵەتانی ـ شاری مایا لە چاپتەری پێنجەم دا ئاماژەپێدرا، کاتێك دەزگایانی چەوسێنەر نایەکسانی گەورە لە کۆمەڵگادا دروستدەکەن و سامانێکی زۆر و دەسەڵاتێکی بێچاودێری بۆ ئەوانەی لە دەسەڵاتدان دەرەخسێنن، چەندین ئارەزوو دێنەئاراوە بۆ کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت و دەزگاکان. دەزگایانی چەوسێنەر تەنیا ڕێگا خۆشکار نابن بۆ ڕژێمی دواتر کە تەنانەت چەوسێنەر تر بێ، بەڵکو ململانێ ناوخۆییەکان و جەنگی ناوخۆی بەردەوامیش دروستدەکەن. ئەم جەنگە ناوخۆییانەش داماوی مرۆیی زیاتر دروستدەکەن و تەنانەت ئەو مەرکەزیەتە کەمەی دەوڵەتیش لە ناودەبەن کە ئەو کۆمەڵگایانە بەدەستیانهێناوە. بەمەش، زۆرجار، پرۆسەی شۆڕبوونەوە بۆ پچڕانی شیرازەی یاسا و شکستهێنانی دەوڵەت و ئاژاوەی سیاسی دەستپێدەکا کە هەموو هیواکان بۆ خۆشگوزەرانی ئابووری لەناودەبات، هەروەك چاپتەری داهاتوو ڕوونیدەکاتەوە.

# ١٣

# بۆچی نەتەوان ئەمڕۆ شکستدەهێنن؟

## چۆن لۆتۆ لە زیمبابۆی دا دەبەیتەوە

کانونی دوەمی ساڵی ٢٠٠٠ بوو لە هەراری پایتەختی زیمبابۆی. سەرۆکی بۆنەکان فالۆت چاواوا بەرپرسی ڕاکێشانی بلیتی براوەی لۆتۆی نەتەوەیی بوو کە لە لایەن بانکێکی نیوە حکومی کە زیمبانك بوو ڕێکخرابوو. هەموو ئەو بەشداربوانەی بانك کە لە کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٩ دا پێنج هەزار دۆلاری زیمبابۆی، یان زیاتریان لە حسابی بانك دا هەبوو، لە لۆتۆکەدا بەشداربوون. کاتێك چاواوا بلیتەکەی ڕاکێشا، ئەو قسەی بۆ نەکرا. هەروەك ڕوونکردنەوەی فەرمی زیمبانك ئاماژەی بۆ کرد: *(سەرۆکی بۆنەکان، فالۆت چاواوا، بە زەحمەت بڕوای بە چاوەکانی کرد کاتێك بینی ئەو بلیتەی ڕاکێشرا و، بایی ١٠٠,٠٠٠ دۆلاری زیمبابۆی بوو، ناوی جەنابی ئار جی مۆگابی لەسەر نووسرابوو)*

سەرۆك ڕۆبەرت مۆگابی، بە زۆر بێ یان خوایش، ساڵی ١٩٨٠ وە حوکمی زیمبابۆی کردوە و حوکمەکەشی زیاتر بە مستێکی ئاسنینەوە بوە، لۆتۆکەی بردبۆوە کە سەد هەزار دۆلاری زیمبابۆی بوو کە پێنج هێندەی داهاتی ساڵانەی تاکی وڵاتەکە بوو. زیمبانك ڕایگەیاند کە ناوی بەڕێز مۆگابی لەناو ناوی هەزاران بەشداربووی ڕێگەپێدراو دا ڕاکێشراوە. چ پیاوێکی خاوەن بەختە! پێویست بە ووتن ناکا کە ئەو لە ڕاستیدا پێویستی بەو پارەیە نەبوو. مۆگابی لەو دواییانەدا مووچەی خۆی و ئەندامانی کابینەکەی ٢٠٠٪ زیاد کردبوو.

بلیتی لۆتۆکە تەنیا ئاماژەیەکی تر بوو بۆ دەزگا چەوسێنەرەکانی زیمبابۆی. دەشێ ئەمە پێی بووتریت گەندەڵی، بەڵام نیشانەی داهێزرانی دەزگایی بوو لە زیمبابۆی دا. ڕاستی ئەوەی کە مۆگابی دەیتوانی تەنانەت لۆتۆش بباتەوە ئەگەر بیویستایە ئەوە دەردەخا کە تا چ ئاستێك کۆنترۆڵی

بەسەر کاروبارەکان دا هەبوو لە زیمبابۆی دا و تروسکەیەکی پیشانی دنیا دا دەربارەی ئاستی دەزگا چەوسێنەرەکانی ئەو وڵاتە.

دیارترین هۆکاری ئەوەی کە بۆچی ئەمڕۆ نەتەوان شکستدەهێنن ئەوەیە کە ئەو نەتەوانە دەزگایانی چەوسێنەریان هەیە. زیمبابۆی، لە سایەی ڕژێمەکەی مۆگابی دا بە ڕوونی ئاکامە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی ئەمە دەردەخا. هەرچەندە ئامارە نەتەوەییەکان لە زیمبابۆی دا زۆر جێگەی متمانە نین، بەڵام باشترین مەزەندە ئەوەیە کە لە ساڵی ٢٠٠٨ دا، داهاتی تاك لە زیمبابۆی دا نزیکەی نیوەی داهاتی تاك بوو لە ساڵی ١٩٨٠ دا کە وڵاتەکە سەربەخۆیی وەرگرت. ئەمە چەند سەرنجڕاکێش بێ، لە ڕاستیدا هێشتا ئاماژە نییە بۆ تێکچوونی ئاستی گوزەران لە زیمبابۆی دا. دەوڵەت هەرەسیهێناوە و کەمورزۆر وازیهێناوە لە دابینکردنی خزمەتگوزارییە گشتییە بنەڕەتییەکان. لە ساڵانی ٢٠٠٨ ـ ٢٠٠٩ دا تێکچوونی سیستەمی تەندروستی بوە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کۆلێرا لە سەرتاسەری وڵات دا. تا ١٠ کانونی دووەمی ساڵی ٢٠١٠، ٩٨,٧٤١ حاڵەتی تووشبون بەو نەخۆشیە و ٤,٢٩٣ مردن هەبوو. ئەمەش ئەم بڵاوبوونەوەیەی کردە کوشندەترین بڵاوبوونەوەی کۆلێرا لە ماوەی پازدە ساڵی پێشردا لە ئەفریقادا. هەر لەو دەمەدا، بێکاری بەکۆمەڵ گەیشتە ئاستێکی بێوێنە. لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٩ دا فەرمانگەی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ هەماهەنگی کارە مرۆییەکان، ڕایگەیاند کە ئاستی بێکاری گەیشتبوە ٪٩٤.

ڕیشەی چەندین دەزگایانی ئابووری و سیاسی لە زیمبابۆی دا، بە هەمانشێوەی بەشی زۆری وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقی، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی کۆلۆنیالی. لە ساڵی ١٨٩٠، سێسل ڕۆدیس، کە کۆمپانیایەکی بەریتانی بوو لە باشووری ئەفەریقا دا، هێزێکی سەربازی نارد بۆ پاشایەتی ندێبلی ئەو کاتە، لە ناوچەی ماتابێل لاند و ماشۆنا لاندی دراوسێ. چەکە باڵادەستەکانیان هەر زوو بەرگری ئەفریقیەکانی تێکشکاند و بە هاتنی ساڵی ١٩٠١، کۆلۆنی ڕۆدیسیای باشوور، کە بە ناوی ڕۆدیس ناونرا، لەو ناوچەیەی کە ئەمڕۆ زیمبابۆیە، دامەزرێنرا. ئیتر ناوچەکە بوە مولکی تایبەتی کۆمپانیا بەریتانییەکەی باشووری ئەفریقا. ڕودیس بەتەمابوو لەو ناوچەیەدا پارە لەڕێگەی دەرهێنانی کانزا بەنرخەکانەوە پەیدابکا، بەڵام سەرکێشییەکان نەکەوتنە بواری جێبەجێکردنەوە. کێڵگە بەپیتەکانی وڵاتەکە بوە هۆی

ڕاکێشانی سەرنجی سپیپێستەکان بۆ کۆچکردن بۆ کۆلۆنییەکە. ئەم نیشتەکارانە زوو بەشی زۆری زەوییەکانیان بۆخۆیان تەرخانکرد. لە ساڵی ١٩٢٣ دا، ئەوان خۆیان لە حوکمی کۆمپانیا بەریتانییەکەی باشووری ئەفریقا ڕزگارکرد و حکومەتی بەریتانیایان ڕازیکرد کە مافی بەڕێوەبردنی حکومەتی خۆیان بداتێ. ئەوەی دواتر ڕوویدا، زۆر هاوشێوەی ئەوە بوو کە دەوری دەیەیەك پێشتر لە باشووری ئەفریقادا ڕوویدابوو. یاسای زەوی دانیشتوانی خۆماڵی ساڵی ١٩١٣ لە باشووری ئەفریقادا ئابوورییەکی دوو فاقی دروستکرد. ڕۆدیسیا یاسای زۆر هاوشێوەی ئەو یاسایەی دەرکرد و پشت ئەستوور بە مۆدێلەکەی باشووری ئەفریقا، هەر زوو دوای ساڵی ١٩٢٣ دەوڵەتێکی تەنیا سپیپێستانی ڕەگەزپەرست دامەزرێنرا.

کاتێك ئیمپراتۆریەتە کۆلۆنییەکانی ئەوروپا لە کۆتایی ١٩٥٠ کان و سەرەتای ١٩٦٠ کان دا ڕمان، نوخبە سپیپێستەکەی ڕۆدیسیا بە سەرکردایەتی ئیان سمیس، کە تەنیا ٪٥ ی دانیشتوان بوون، سەربەخۆیی خۆی لە بەریتانیا لە ساڵی ١٩٦٥ دا ڕاگەیاند. ژمارەیەکی کەم لە ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان دانیان بە سەربەخۆیی ڕۆدیسیادا نا و نەتەوە یەکگرتوەکان گەمارۆی سیاسی و ئابووری خستە سەر ڕۆدیسیا. هاوڵاتییە ڕەشپێستەکان جەنگێکی پارتیزانیان لە وڵاتە دراوسێکانی وەك مۆزەمبیق و زامبیاوە دەسپێکرد. گوشارە نێونەتەوەییەکان و یاخیبوون لە لایەن دوو گروپی سەرەکییەوە، زانو(ZANU)ی مۆگابی (یەکێتی نەتەوەیی زیمبابۆی ئەفریقی) و زاپۆ (ZAPU) (یەکێتی گەلی زیمبابۆی ئەفریقی) بە سەرکردایەتی جۆشوا نکۆمۆ، بوونە هۆی کۆتاییهێنان بە حوکمی سپیپێستەکان. دەوڵەتی زیمبابۆی لە ساڵی ١٩٨٠ دا دامەزرا.

دوای سەربەخۆیی، مۆگابی بە خێرایی کۆنترۆڵی شەخسی خۆی سەپاند. ئەو، یان لە ڕێگەی زەبروزەنگەوە بەرهەڵستکارانی خۆی لەناوبرد یان ڕایکێشان بەرەو لای خۆی. خراپترین کاری زەبرزەنگ لە ماتابیل لاند ڕوویدا، ناوجەرگەی لایەنگرانی (ZAPU)، کە تیایدا تا بیست هەزار کەس لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠ دا کوژران. لە ساڵی ١٩٨٧ دا زانۆ و زاپۆ یەکیانگرت و PF-ZANU پێکهێنرا و جۆشوا نکۆمۆ لە سیاسەت دوورخرایەوە. مۆگابی توانی ئەو دەستوورەی، وەك بەشێك لە دانوستاندنەکانی سەربەخۆیی بۆ مابۆوە، سەرلەنوێ داڕێژێتەوە و

خـۆی بکاتـە سـەرۆك (ئـەو وەك سـەرۆك وەزیـران دەسـتیپێکرد) و لیـستی دەنگـدەرانی سپیپێـستان کـە بەشـێك بـوو لـە ڕێکەوتنامـەی سـەربەخۆبوونی زیمبـابۆی هەڵبوەشـێنێتەوە و لـە کۆتاییـشدا لـە سـاڵی ١٩٩٠ بـە تـەواوی ئەنجوومەنی سەناتی هەڵوەشاندەوە و لە ئەنجوومەنی یاسادانان دا پێگەی وای دروستکرد کە بۆخۆی بتوانێ پاڵێوراویـان بـۆ دابنـێ. ئاکامەکـەی، دەوڵـەتێکی یەك حیزبی ئەمری واقیع بوو بەسەرۆکایەتی مۆگابی.

دوای سەربەخۆیی، کۆمەڵێك دەزگای ئابووری چەوسێنەر کە لە لایەن ڕژێمە سپیپێـستەکەوە دامـەزرابوون، کەوتنـە بندەسـتی مۆگـابی. لـە نـاو ئـەم دەزگایانەش دا چەندین ڕێسا هەبوون دەربارەی نرخ و بازرگانی نێودەوڵـەتی و ئەو پیشەسازییانەی لە لایەن دەوڵەتەوە بەڕێوەدەبران و بـۆردە ناچارییەکانی فرۆشتنی بەروبومە کشتوکاڵییەکان. دامەزراندن لە لایەن دەوڵەتەوە بـە زوویـی فراوان بوو، کارەکانیش دەدرانە لایـەنگرانی ZANU ـPF. ڕێکخستنی تونـدی ئابووری لە لایەن حکومەتەوە لە بەرژەوەنـدی نوخبـەکانی ZANU ـPF بـوو، چونکە بوە هۆی زەحمەتکردنی سەرهەڵدانی چینێکی سـەربەخۆی بزنـسمانانی ئەفریقی، کە ڕەنگە دواتر تەحـەدای مۆنۆپـۆلی سیاسـی حکومـەتیان بکردایـە. ئەمەش زۆر هاشێوەی بارودۆخەکەی غانای ساڵی ١٩٦٠ بـوو کـە لـە چاپتەری دوەم دا بینیمان. بێگومان بە شێوەیەکی سەیر ئەم کارە تەنیا سپیپێـستەکانی وەك چینی سەرەکی بزنس هێشتەوە. لـەم ماوەیـەدا هێـزی سـەرەکی ئـابووری سپیپێـستان، بەتایبـەتی سـێکتەری بەرهەمـداری بـەرزی هـەناردەکردنی کشتوکاڵی، دەستیلێنەدرا. بەڵام ئەمـە تـا ئـەو کاتـە بـەردەوامبوو کـە مۆگـابی پشتگیریی جەماوەری کەمبۆوە.

مۆدێلی ڕێکخستن و دەستوەردانە بازاڕ بەرەبەرە توانای بەردەوامیی خۆیان لە دەست دا و پرۆسەیەکی گۆڕانکاریی دەزگایی بە هاوکـاری بـانکی جیهـانی و سـندوقی دراوی نێودەوڵـەتی (IMF) لـە سـاڵی ١٩٩١ دا، دوای قـەیرانێکی سەختی نەختینەی دارایی، دستیپێکرد. خراپبوونی باری ئابووری لە کۆتـایی دا بـوە هـۆی سـەرهەڵدانی ئۆپۆزیۆسـۆنی جـدی بـۆ حـوکمی تـاك حیزبـی ZANU-PF، کە ئـەویش بزووتنـەوەی گۆڕانکـاری دیموکراسـی (MDC) بـوو. هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەی ساڵی ١٩٩٥ زۆر دووربوو لە ڕکابەرییەوە. ZANU ـPF، ٨١٪ ی دەنگەکان و ١١٨ کورسی لە کۆی ١٢٠ کورسی، بردەوە. پـەنجاو

پێنج لەو ئەندامانەی پەرلەمان بەبێ بەرهەڵستبوونەوە هەڵبـژێران. هەڵبـژاردنی سـەرۆکایەتی سـاڵێك دوای ئـەوە، تەناتـەت نیـشانەی زیـاتری نـاڕێکی و تـەزویرکردنی دەرخست. مۆگـابی ٪۹۳ی دەنگـەکانی بەدەسـتهێنا، بـەڵام دوو ڕکابەرەکـەی، ئابیـل مۆزۆریـوا و نـدابانینگی سـیزۆل پـێش دەسـپێکردنی هەڵبـژاردن پـاڵاوتنی خۆیـان کێشابۆوە و حکومـەتیان بـەوە تۆمـەتبارکرد کـە پەیڕەوی دەنگدانی بەزۆر و تەزویری کردوە.

دوای سـاڵی ۲۰۰۰، سـەرەڕای هـەموو ئـەو گەندەڵیانـەش، دەسـەڵاتی PF_ZANU بەرەو لاوازی ڕۆیشت. لـە هەڵبـژاردنی ئـەو سـاڵە دا تـەنیا ٪٤۹ ی دەنگەکانی جەماوەر و ٦۳ کورسی بەدەستهێنا. هـەموو کورسـیەکان لـە لایـەن MDC کێبڕکێیان لەسەر کرا و هەموو کورسیەکانی هەراری پایتەختی بردەوە. لـە هەڵبـژاردنی سـەرۆکایەتی سـاڵی ۲۰۰۲ دا، مۆگـابی تـەنیا ٪٥٦ دەنگـەکانی بەدەستهێنا. هەردوو هەڵبژاردنەکان لە بەرژەوەندی FP_ZANU تـەواو بـوون، تـەنیا لەبـەر بـەکارهێنانی زەبـروزەنگ و تۆقانـدن شانبەشـانی تـەزویرکردن لـە هەڵبژاردنەکان دا.

کاردانەوەی مۆگابی بۆ لاوازبوونی کۆنترۆڵی سیاسی بریتیبوو لە زیـادکردنی سەرکوتکردن و بەکارهێنانی سیاسەتەکانی حکومەت بۆ کڕینی پـشتگیری. ئـەو هێرشێکی بەربڵاوی کردە سەر خـاوەن زەوییـە سپیپێـستەکان. هـەر لـە سـاڵی ۲۰۰۰ ەوە کەوتـە هانـدان و پـشتگیریکردنی زنجیرەیـەك کـاری داگیرکـردن و زەوتکردن. ئەم کارانەش زۆرجـار لـە لایـەن ڕێکخـراوان و گروپـانی جـەنگاوەرە دێرینەکانەوە سەرکردایەتیدەکران، کە گوایە ئـەم ڕێکخراوانـە لـە جـەنگاوەرانی کۆنی جەنگی سەربەخۆیی پێکهاتبوون. بەشێك لەو زەوییـە زەوتکراوانـە درانـە ئـەم گروپانـە، بـەڵام زۆربـەیان کەوتنـە دەسـت نوخبـەکانی FP__ZANU. ناسەقامگیری مافی موڵکداری کە لـە لایـەن مۆگـابی و FP_ZANU خرایـەکار، بـوە هـۆی دارمـانی بەرهـەمی کـشتوکاڵی و بەرهەمـداریی. کاتێـك ئـابووری هەرەسیهێنا، تەنیا شتێك کە مابۆوە بریتیبـوو لـە چاپکردنی پـارە بـۆ کڕینـی پشتگیری، ئەمەش بوە هۆی هەڵاوسانی بەرز. لە کانونی دوەمی سـاڵی ۲۰۰۹ دا بـەکارهێنانی پـارەی تـری وەك ڕانـدی باشـووری ئـەفریقا بـە یاسـایی کـرا و بـەکارهێنانی دۆلاری زیمبـابۆی بەتـەواوی وەسـتا، کـە بـوە پارچـە کاغـەزێکی بێبەها.

ئەوەی لە دوای ساڵی ١٩٨٠ دا لە زیمبابۆی دا ڕوویدا، هاوشێوەی شوێنەکانی تری باشووری بیابانی ئەفریقا بوو لە دوای سەربەخۆیی. زیمبابۆی لە ساڵی ١٩٨٠ دا کۆمەڵێك دەزگایانی ئابووری و سیاسی یەکجار چەوسێنەری بە میرات بۆ مابۆوە. ئەم دەزگایانە بۆ ماوەی پازدە ساڵ بە بێگۆڕانکاری مانەوە. لە کاتێك دا هەڵبژاردنەکان دەکران، دەزگا سیاسییەکان هەموو شتێك بوون بەڵام کراوە نەبوون. دەزگا ئابوورییەکان هەندێك گۆڕانکارییان بەسەردا هات، بۆ نموونە، چیتر جیاکاری ڕەگەزپەرستانە دژی ڕەشپێستەکان لە ئارادا نەبوو، بەڵام بە گشتی دەزگاکان بە چەوسێنەری مانەوە، تەنیا جیاوازی ئەوەبوو، لە جیاتی ئەوەی ئیان سمیس و سپیپێستەکان چەوسانەوەکە ئەنجامبدەن، ڕۆبەرت مۆگابی و نوخبەکان گیرفانەکانی خۆیان پڕدەکرد. بە تێپەڕبوونی کات دەزگاکان بوونە دەزگایانی تەنانەت زیاتر چەوسێنەر و داهاتەکان لە زیمبابۆی دا هەرەسیانهێنا. شکستە ئابووری و سیاسییەکان لە زیمبابۆی دا خۆدەرخستنێکی تری یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکییە ــ لەم حاڵەتەدا، ڕژێمە چەوسێنەر و سەرکوتکارەکەی ئیان سمیس لە لایەن ڕژێمە چەوسێنەر و گەندەڵ و سەرکوتکارەکەی ڕۆبەرت مۆگابییەوە جێگەیگیرایەوە. بردنەوەی ساختەی لۆتۆ لە ساڵی ٢٠٠٠ دا لە لایەن مۆگابییەوە تەنیا مشتی ناو خەروارێك بوو، خەروارێکی پڕ لە گەندەڵی و کەڵەکەبوو بە درێژایی مێژوو.

نەتەوان ئەمڕۆ شکستدەهێنن، چونکە دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکانیان ئەو هاندانە بۆ خەڵك دروستناکەن کە بۆ پاشەکەوتکردن و وەبەرهێنان و نوێکاری پێویستە. دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر پشتگیری ئەم دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرانە دەکەن لە ڕێگەی پتەوکردنی دەسەڵاتی ئەوانەی سوود لەم چەوساندنەوەیە وەردەگرن. دەزگایانی سیاسی و ئابووری چەوسێنەر، هەرچەندە وردەکاریەکانیان بە پێی بارودۆخە جیاوازەکان دەگۆڕێن، بەڵام هەمیشە هۆکاری سەرەکی ئەم شکسهێنانەن. لە چەندین حاڵەت دا، بۆ نموونە، هەورەك لە حاڵەتی ئەرجەنتین و کۆلۆمبیا و میسر دەیبینین، ئەم شکستهێنانە شێوازی نەبوونی چالاکی ئابووری پێویست لەخۆدەگرن، چونکە سیاسییەکان سەرگەرمی دەرکێشانی دەرامەت و لەبەینبردنی هەر چالاکییەکی سەربەخۆی ئابوورین کە هەڕەشە لە خۆیان و نوخبە ئابوورییەکە بکا. لە هەندێك حاڵەتی ئێکستریمدا، هەورەك لە زیمبابۆی و سیارا لیۆن دا، کە دواتر باسیدەکەین،

دەزگا چەوسێنەرەکان ڕێگا خۆشکاری شکستهێنانی تەواوی دەوڵەتن، تەنیا یاسا و ئاسایش لەناونابەن، بەڵکو دەبنە هۆی لەناوبردنی تەنانەت سادەترین هاندانی ئابووری. ئەنجامەکەش بریتییە لە چەقبەستنی ئابووری ـ هەروەك مێژووی نوێی ئەنگۆلا و کامیرۆن و چاد و کۆماری دیموکراسی کۆنگۆ و هایتی و لایبیریا و نیپاڵ و سیارا لیۆن و سودان و زیمبابۆی پیشانیدەدەن ـ جەنگی ناوخۆ و ئاوارەیی بەکۆمەڵ و برسێتی و نەخۆشی بوونە هۆی ئەوەی گەلێك لەم وڵاتانە ئەمرۆ لە ساڵانی ١٩٦٠ کان هەژارتر بن.

## جەنگی منداڵان

لە ٢٣ ئازاری ساڵی ١٩٩١ دا، گروپێك پیاوی چەکدار بەسەرکردایەتی فۆدەی سانکۆ، سنووریان بڕی لە لایبیریاوە بۆ سیارا لیۆن و هێرشیانکردە سەر شارۆچکەی کەیلاهەن لە سنبا کە شارۆچکەیەکی سەر سنووری باشووری وڵات بوو. سانکۆ، کە پێشتر عەریف بوو لە سوپای سیارا لیۆن دا، دوای بەشداریکردنی لە کۆدێتایەکی سەرنەکەوتوو دا دژی حکومەتەکەی سیاکا ستیڤنس، لە ساڵی ١٩٧١ دا خرابوە بەندیخانەوە. دوای ئەوەی ئازادکرا، لە لیبیا گیرسایەوە و لەوێدا چوە کامپێکی مەشقپیکردن کە دیکتاتۆری لیبیا موعەمەر قەزافی بۆ مەشقپێکردنی شۆڕشگێڕانی ئەفریقا دایمەزراندبوو. لەو کامپەدا بە چارڵس تەیلەر گەیشت، کە خەریکی پیلان بوو بۆ لادانی حکومەتی لایبیریا. کاتێك تەیلەر لایبیریای لە ئێوارەی کریستمەسی ساڵی ١٩٨٩ دا، داگیرکرد، سانکۆی لەگەڵدا بوو. لەگەڵ گروپێك لە پیاوانی تەیلەر کە زۆربەیان خەڵکی لایبیریا و هاوڵاتی بۆرکینا فاسۆ بوون، سانکۆ سیارا لیۆنی داگیرکرد. ئەوان ناوی خۆیان نابوو RUF، (بەرەی یککگرتووی شۆڕشگێڕان) و ڕایانگەیاند کە ئەوان هاتوون بۆ لەناوبردنی حکومەتی گەندەڵ و زۆرداری APC.

هەروەك لە چاپتەری پێشتردا بینیمان، سیاکا ستیڤنس و گۆنگرێسی هەموو گەل APC، دەستیگرت بەسەر دەزگایانی چەوسێنەری کۆلۆنیاڵی دا لە سیارا لیۆن بە هەمان ئەوشێوەیەی مۆگابی و PF_ZANU لە زیمبابۆی دا کردیان. کاتێك لە ساڵی ١٩٨٥ دا ستیڤنس تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بوو، جۆزیف

مۆمۆی لە شوێنی خۆی دانا، ئابووری وولات لە ڕمان دا بوو. ستیڤنس، زۆرجار بە گاڵتە ئەو پەندەی نەدەهێنایەوە کە دەڵی (مانگا لەو شوێنەدا دەلەوەڕێ کە لێی دەبەسترێتەوە)، ئەو شوێنەی ستیڤنس لێی خواردبوو، مامۆ کەوتە لوشدانی. ڕێگاکان وێران بوون و قوتابخانەکان هەڵوەشانەوە. تەلەفزیۆنی نەتەوەیی لە ساڵی ١٩٨٧ دا لە پەخش وەستا، کاتێك وەزیری زانیاری ترانزمیتەرەکەی فرۆشت و لە ساڵی ١٩٨٩ دا تاوەرێکی ڕادیۆ کە سیگناڵی ڕادیۆیی بۆ دەرەوەی فریتاون دەگواستەوە ڕوخا و بەمەش گواستنەوە بۆ دەرەوەی پایتەخت وەستا. شیکردنەوەیەك کە لە ڕۆژنامەیەکی فریتاونی پایتەخت دا لە ساڵی ١٩٩٥ دا بڵاوکرایەوە، ڕاستیەکەی زۆرباش پێکابوو:

*(لە کۆتایی فەرمانڕەوایی مۆمۆ دا، ئەو وازی لە پێدانی موچەی فەرمانبەرانی کەرتی گشتی و مامۆستایان و تەنانەت سەرۆك خێڵە مەزنەکانیش هێنابوو. حکومەتی مەرکەزی هەرەسیهێنابوو، بێگومان دواتر ڕووبەڕووی سنور بەزاندن بووینەوە "یاخیبوان" و هەموو جۆرە چەکێك لە سنووری لایبیریا وە ڕژانە وولاتەوە. NPRC یان یاخیبوەکان و سۆبڵس (ئەو سەربازانەی بوونە یاخیبوو)، هەموویان بوونە سەرچاوەی ئەو ئاژاوەیەی چاوەڕێدەکرێ، کاتێك حکومەت لە ئارادا نامێنێ. هیچ یەکێك لەمانە هۆکاری کێشەکانی ئێمە نین، بەڵکو ئەوانە نیشانەی ئەو کێشانەن).*

هەرەسهێنانی دەوڵەت لە سایەی حوکمی مۆمۆدا، کە ئەنجامی ئەو بازنە ناهەمواربیە بوو لە لایەن دەزگا چەوسێنەرەکانی سەردەمی ستیڤنس دا بەری بۆ بەرەلا کرا، مانای ئەوە بووکە هیچ شتێك نەبوو لە ساڵی ١٩٩١ دا هاتنی RUF لەو دیوسنوورەوە ڕاگرێ و دەوڵەت ئەو توانایەی نەبوو بەرەنگاری بێتەوە. پێش ئەوە ستیڤنس سوپای لێغاوکردبوو چونکە لەوە ترسا لەسەر تەختی لابەن. بۆیە ئاسان بوو بۆ گروپێکی بچووکی پیاوانی چەکدار لە زۆربەی ناوچەکانی وولات دا ئاژاوە دروستبکەن. ئەو گروپە تەنانەت مانیفیستۆیەکیان هەبوو کە پێیدەوترا "نەخشەڕێگای دیموکراسی" و بە ووتەی ڕۆشنبیری ڕەشپێست، فرانز فانۆن، دەستیپێدەکرد" *پێویستە هەموو نەوەیەك، لە ناو ناڕوونی ڕێژەییدا، پەیامەکەی خۆی بدۆزێتەوە و ئەو پەیامە جێبەجێبکا یان ناپاکی بەرامبەر بکا"* برگەی "ئایا ئێمە شەڕ بۆچی دەکەین؟" بەم شێوەیە دەسپێدەکا:

*(ئێمە لە شەڕکردن بەردەوامدەبین چونکە ماندووبووین لەوەی قوربانی بەردەوامی هەژاری و سەرشۆڕی مرۆیی سەپێنراوی دەوڵەتەت بین، کە بەهۆی فەرمانڕەوایی ئۆتۆکراتی و عەسکەرتاریەتی چەندین ساڵەوە بۆمان ماوەتەوە. بەڵام، ئێمە دان بەخۆمان دا دەگرین و بە پشوویەکی درێژەوە بەردەوامدەبین لە چاوەڕیکردن لە جێژوانی ئاشتی دا ـ کە لەوێدا هەمووکمان براوەدەبین. ئێمە پابەندین بە ئاشتییەوە، بە هەر شێوەیەك پێویست بێ، بەڵام ئەوەی پێوەی پابەندین ئەوەیە کە ببینە قوربانی ئاشتی. ئێمە دەزانین دۆزەکەمان دادپەروارانەیە و لە خەباتەکەمان دا بۆ دامەزراندنی سیارا لیۆنێکی نوێ، خودا هەمیشە لە پشتمان دەبێ).*

هەرچەندە ڕەنگە سانکۆ و سەرکردەکانی تری RUF بە ناڕەزایی سیاسی دەستیانپێکردبێ و ڕەنگە ناڕەزایی خەڵك کە لە سایەی دەزگا چەوسێنەرەکانی APC دا تووشی نەهامەتی بوون، وایلێکردبن لە سەرەتادا پەیوەندی بە بزووتنەوەکەوە بکەن، بەڵام بارودۆخەکە هەر زوو گۆڕا و لە کۆنترۆڵ دەرچوو. پەیامەکەی RUF وڵاتی تووشی مەینەتی کرد، هەروەك دانپێدانانی گەنجێکی خەڵکی جیۆم، لە باشووری سیارا لیۆن دا، دەریدەخات:

*(ئەوان هەندێك لە ئێمەیان کۆکردەوە... دوان لە هاوڕێکانی ئێمەیان جیاکردەوە و کوشتیانن. باوکی ئەمانە سەرۆك هۆز بوون و پۆستاڵ و کەلوپەلی سەربازی لە ماڵەکانیان دا بوو. ئەوان گوللەبارانکران تەنیا لەبەر ئەوەی تاوانبارکران بەوەی سەربازان دەشارنەوە. سەرۆك هۆزەکانیش بەم شێوەیە کوژران ـ بە تۆمەتی ئەوەی بەشێك بوون لە حکومەت. ئەوان کەسێکی تریان دیاریکرد تا ببێتە سەرۆك هۆز. ئەوان هێشتا هەر دەیانووت کە هاتوون ئێمە لە چنگی APC ڕزگاربکەن. دوای ماوەیەك ئەوان خەڵکیان جیانەدەکردەوە بۆ کوشتن، تەنیا خەڵکیان گوللەباراندەکرد).*

لە یەکەمساڵی داگیرکردنەکەدا، هەموو ئەو ڕەگە ڕۆشنبیرییەی RUF، کە ڕەنگە هەیبووبێ، بە تەواوی لە بندەرهێنران. سانکۆ، هەموو ئەوانەی لەناوبرد کە ڕەخنەیان لەو کوشتارە بەردەوامە دەگرت. هەر زوو ژمارەی ئەوانەی خۆویستانە پەیوەندییان بە RUF دەکرد ڕووی لە کزی کرد. لە جیاتی ئەمە، ئەوان دەستیانکرد بە ڕاپێچکردنی زۆرەملێ، بەتایبەتی ڕاپێچکردنی منداڵان. لە ڕاستیدا هەموو لایەنەکان، لەوانە سوپا، ئەمەیان دەکرد. ئەگەر جەنگی ناوخۆی

سیارا لیۆن جەنگ بوویێ بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگایەکی باشتر ئەوا لە کۆتایی دا بوە جەنگی منداڵان. ململانێکە بە کوشتار و پێشێلکردنی بڵاوی مافەکانی مرۆڤ خەستر بۆوە، لەوانە ئەتکردنی بەکۆمەڵی ئافرەتان و بڕینی قاچ و گوێکان. کاتێك RUF دەستیدەگرت بەسەر ناوچەکان دا، ئەوا لە ڕووی ئابووریشەوە دەکەوتنە چەوساندنەوەی خەڵك. ئەمەش لە ناوچەکانی دەرهێنانی ئەڵماس دا ئاشکرا تر دەکرا کە بەزۆر خەڵکیان پەلکێشدەکرد بۆ دەرهێنانی ئەڵماس، بەڵام لە شوێنەکانی تریش دا بڵاوبوو.

RUF، لە ئەنجامدانی کاری دڕندایەتی و کوشتار و کارپێکردنی زۆرەملێ دا تەنیا نەبوو. حکومەتیش هەمان ئەم کارانەی ئەنجامدەدا. هەرەسهێنانی یاسا و ئاسایش بە جۆرێك بوو کە زەحمەت بوو بۆ خەڵك جیاوازی لە نێوان سەرباز و یاخیبوودا بکەن. دیسپلینی سەربازی بەتەواوی لەناوچوو. تا ئەو کاتەی جەنگەکە لە ساڵی ٢٠٠١ دا کۆتاییهات، ڕەنگە هەشتا هەزار کەس کوژرابن و هەموو وڵاتەکەش کاولبوو. ڕێگا و خانوو بیناکان بەتەواوی خاپوورکران. ئەمڕۆ، ئەگەر بچیتە کۆیدۆ، کە ناوچەیەکی سەرەکی بەرهەمهێنانی ئەڵماسە لە ڕۆژهەڵات دا، چەندین ڕیز خانووی سووتاو دەبینی کە هێشتا جێگەی گوللەیان پێوەدیارە.

لە ساڵی ١٩٩١ دا، دەوڵەتی سیارا لیۆن بەتەواوی شکستیهێنا. بیر لەوە بکەرەوە کە شیام پاشا لە بوشۆنگ دەستیپێکرد: ئەو دەزگایانی چەوسێنەری دامەزراند تا دەسەڵاتی خۆی بەهێز بکا و دەستبگرێ بەسەر ئەو بەرهەمانە دا کە هەموو کۆمەڵگاکە بەرهەمیدەهێنان. بەڵام تەنانەت بوونی دەزگایانی چەوسێنەر و چڕکردنەوەی دەسەڵاتی مەرکەزی لە دەستی ئەودا، هێشتا لە بارودۆخێك باشتر بوو کە هیچ یاساو ئاسایش و دەسەڵاتێکی مەرکەزی یان مافی موڵکداری نەبوو، ئەمەش بارودۆخی کۆمەڵگای لیلی بوو لە ڕۆخەکەی تری ڕووباری کاسەی. ئەم جۆرە نەبوونەی ئاسایش و دەسەڵاتی مەرکەزی چارەنووسی چەندین نەتەوەی ئەفریقی بوە لە دەیەکانی ئەم دواییانەدا. بەشێك لە هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پرۆسەی مەرکەزیەتی سیاسی لە ڕووی مێژووییەوە لە زۆربەی وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقی دا دواکەوت، بەڵام بەشێکی تری هۆکارەکە ئەوەبوو کە بازنەی ناهەمواری دەزگایانی چەوسێنەر هەموو ئەو مەرکەزیەتەی دەوڵەتیش کە لە ئارادا بوو،

پێچەوانەکردەوە، ئەمەش ڕێگای خۆشکرد بۆ شکستهێنانی دەوڵەت.

سیارا لیۆن لە ماوەی دە ساڵ جەنگی خوێناوی ناوخۆدا، لە ساڵی ١٩٩١ بۆ ساڵی ٢٠٠١، حاڵەتێکی نموونەیی دەوڵەتی شکستخواردوو بوو. سیارا لیۆن وەك هەر وولاتێکی ترکە دەزگایانی چەوسێنەر شێواندبوونی دەستپێکرد، هەڵبەتە جۆرە دەزگایانێکی دڕندە و ناکارامە. وولاتان دەبنە دەوڵەتانی شکستخواردوو نەك لەبەر جوگرافیا یان کەڵتوورەکەیان، بەڵکو لەبەر میراتی دەزگایانی چەوسێنەر، کە دەسەلات و سامان لە چنگی ئەوانەدا چڕدەکاتەوە کە کۆنترۆڵی دەوڵەتیان کردوە و ئەمەش ڕێگای نائارامی و دووبەرەکی و جەنگی ناوخۆ دەکاتەوە. دەزگایانی چەوسێنەر بەشێوەیەکی ڕاستەخۆش دەبنە هۆی شکستهێنانی بەرەبەرەی دەوڵەت بەهۆی پشتگوێخستنی وەبەرهێنان لە زۆربەی خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکان دا. ئەمەش کوتومت ئەوەبوو لە سیارا لیۆن دا ڕوویدا.

دەزگایانی چەوسێنەر کە دەبنە هۆی هەژارکردن و زەوتکردنی موڵکی خەڵك و ڕێگا لە پەرەپێدانی ئابووری دەگرن، لە ئەفریقا و ئاسیا و باشووری ئەمەریکادا زۆرن. چارڵس تەیلەر هاوکاری بەرپابوونی جەنگی ناوخۆی سیارا لیۆنی کرد و لە هەمانکاتیش دا دەسپێشخەری نانەوەی ململانێیەکی دڕاندانەشی لە لایبیریا دا کرد، کە بوە هۆی شکسهێنانی دەوڵەت لەو وولاتەش دا. پاتێرنی دەزگایانی چەوسێنەر کە هەرەسدەهێنن و دەبنە هۆی جەنگی ناوخۆ و شکتسهێنانی دەوڵەت لە شوێنەکانی تری ئەفریقاش دا ڕوویداوە، بۆنموونە، لە ئەنگۆلا و کەناری ئایڤەری و کۆماری دیموکراسی کۆنگۆ و مۆزەمبیق و کۆماری کۆنگۆ و سۆماڵ و سودان و ئۆگەندا. چەوساندنەوە ڕێگای ململانێ خۆشدەکا، بەشێوەی ئەو ململانێیەی کە دەزگا یەکجار چەوسێنەرەکانی دەوڵەتی شاری مایا نزیکەی هەزار ساڵ لەمەوبەر دروستیانکرد. ململانێ شکستهێنانی دەوڵەتی لێدەکەوێتەوە. کەواتە هۆکارێکی تری ئەوەی کە نەتەوانی ئەمڕۆ شکستدەهێنن ئەوەیە کە دەوڵەتەکانیان شکستدەهێنن. ئەمەش بە دەوری خۆی ئاکامی حوکمی چەندین دەیەیە لە سایەی دەزگایانی ئابووری و سیاسی چەوسێنەردا.

# ئایا دەوڵەت کێیە؟

حاڵەتەکانی زیمبابۆی و سۆماڵ و سیارا لیۆن، تەنانەت ئەگەر حاڵەتی نموونەیی وڵاتانی هەژاری ئەفریقی و تەنانەت هەندیك وڵاتی ئاسیاش بن، پێدەچن حاڵەتی ئێکستریم بن. ئایا بەڕاست وڵاتانی ئەمەریکای لاتین دەوڵەتانی شکستخواردوویان نییە؟ ئایا بەڕاست سەرۆکەکانیان هێندە ڕۆهەڵماڵراو نین تا لۆتۆ ببەنەوە؟

لە کۆلۆمبیا، چیاکانی ئەندی بەرەبەرە لە باکوورەوە لەگەڵ دەشتێکی گەورەی کەنار زەریا دا یەکدەگرنەوە کە سنووری لەگەڵ زەریای کاریبی دایە. لە کۆلۆمبیا بەم دەشتە دەڵێن "وڵاتی گەرم" کە جیاوازە لەگەڵ جیهانی ئەندی کە "وڵاتی سارد"ە. لە ماوەی پەنجا ساڵی ڕابوردودا، لە لایەن بەشێکی زۆر لە زانایانی بواری سیاسەت و حکومەتانەوە، کۆلۆمبیا وەك وڵاتێکی دیموکراسی دانراوە. ویلایەتە یەکگرتوەکان خۆشحاڵە کە دانوستاندنی بازرگانی ئازاد لەگەڵ ئەو وڵاتەدا ئەنجامبدا و هەموو جۆرە هاوکارییەك، بەتایبەتی هاوکاری سەربازی، بڕژێنێتە ئەو وڵاتەوە. دوای حکومەتێکی سەربازی تەمەن کورت، کە لە ساڵی ١٩٥٨ دا کۆتاییهات، هەڵبژاردن بە شێوەیەکی بەردەوام ئەنجامدراوە، هەرچەندە تا ساڵی ١٩٧٤ هاوپەیمانییەك دەسەلاتی سیاسی و سەرۆکایەتی وڵاتی بەشێوەی نۆرە لە نێوان هەردوو حیزبە سیاسییە تەقلیدییەکەدا دابەشکردبوو کە کۆنزێرڤەتیف و لیبراڵەکان بوون. ئەم هاوپەیمانییە، بەرەی نەتەوەیی، لە لایەن گەلی کۆلۆمبیاوە لە ڕێگەی ڕاپرسییەوە ڕەزامەندی لەسەر درا و هەموو ئەمانە پێدەچن دیموکراسی بن.

سەرەڕای ئەوەی کە کۆلۆمبیا مێژوویەکی درێژی لە ئەنجامدانی هەڵبژاردنە دیموکراسییەکان دا هەیە، بەلام دەزگایانی کراوەی نییە. لە بری ئەمە، مێژووی ئەم وڵاتە بەهۆی پێشێلکردنی ئازادییە مەدەنییەکان و لە سێدارەدان لە دەرەوەی یاسا و زەبرزەنگ دژی کەسانی سیڤیل و جەنگی ناوخۆ، لکەدار بوە. ئەمەش ئەو ئاکامانە نین کە لە دیموکراسی چاوەڕێدەکرێن. جەنگی ناوخۆ لە کۆلۆمبیا جیاوازە لەوەی سیارا لیۆن. لە سیارا لیۆن دا دەوڵەت و کۆمەلگا

هەرەسیانهێنا و ئاژاوە باڵادەست بوو، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا ئەوەی کۆلۆمبیاش جەنگی ناوخۆیە و جەنگێکە کە قوربانییانی زۆر زیاتری لێکەوتۆتەوە. حوکمە سەربازییەکەی ساڵانی ١٩٥٠ کان، تاڕادەیەك لە ئەنجامی ئەو جەنگە ناوخۆییەدا سەریهەڵدا کە بە ئیسپانی پێیان دەوت لا ڤایەلۆنسیا، یان زەبرو زەنگ. لەو کاتەوە جۆری جیاوازی گروپانی یاخیبوو، کە زۆربەیان شۆڕشگێرانی کۆمیۆنیستین، لادێکانانیان تەنیوەتەوە و خەریکی ڕفاندن و کوشتنن. بۆ دوورکەوتنەوە لە ڕفاندن و کوشتن لە ناوچە گوندنشینەکانی کۆلۆمبیادا، دەبێ ڤاکیونا بدەیت کە مانای کوتانە، واتا بۆ ئەوەی نەکوژرێیت یان نەڕفێنرێیت دەبێ خۆت دژی کوشن و ڕفاندن بکوتیت و هەموو مانگێك پارە بدەیتە هەندێك گروپی چەتەی چەکدار.

هەموو گروپە چەکدارەکان لە کۆلۆمبیادا کۆمیۆنیست نین. لە ساڵی ١٩٨١ دا ئەندامانی گروپی سەرەکی پارتیزانەکانی کۆلۆمبیا FARC (هێزە چەکدارە شۆڕشگێڕەکانی کۆلۆمبیا)، جوتیارێکی بەرهەمهێنانی شیریان ڕفاند کە ناوی جیسەس کاستانۆ بوو، لە شارۆچکەیەکی بچووك کە پێیدەوترا ئەمالفی لە وڵاتی گەرم لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەنتیۆکویا دەژیا. بەرامبەر ئازادکردنی ئەم جووتیارە، FARC داوای بڕێك پارەیان کرد کە دەیکردە ٧,٥٠٠ دۆلار، ئەمەش لە ناوچە گوندنشینەکانی کۆلۆمبیادا بڕێکی کەم نەبوو. خێزانەکەی ئەم بڕە پارەیان پەیداکرد لە ڕێگەی ڕەهنکردنی کێڵگەکەیانەوە، بەڵام تەرمی باوکیان دۆزیەوە کە بە زنجیر بە درەختێکەوە بەسترابۆوە. ئەمە بەس بوو بۆ سێ لە کوڕەکانی کاستانۆ کە کارلۆس و فیدڵ و ڤایسنت بوون. ئەوانیش گروپێکی میلیشیایان پێکهێنا و ناویان نا لۆس تانگەرۆس بۆ کوشتنی ئەندامانی FARC تا تۆڵەی کوشتنی باوکیان بکەنەوە. براکان لە ڕێکخستن دا باش بوون و هەر زوو گروپەکەیان گەورە بوو، کەوتنە دۆزینەوەی زەمینەیەکی بەرژەوەندی هاوبەش لەگەڵ گروپانی میلیشیای لەو چەشنەدا کە لە ئەنجامی دۆزی هاوشێوەدا دروستبووبوون. کۆلۆمبییەکان، لە گەلێك ناوچەدا بەدەست گروپە چەپڕەوەکانەوە دەیانناڵاند و گروپە میلیشیا ڕاستڕەوەکان بۆ بەرهەڵستکردنی ئەوان دروستبوون. میلیشیاکان لە لایەن موڵکدارەکانەوە بەکاردەهێنران تا بەرامبەر پارتیزانەکان بەرگری لە خۆیان بکەن، بەڵام ئەم میلیشیانە خەریکی قاچاخچێتی مادە هۆشبەرەکان و ڕووتکردنەوە و ڕفاندن و کوشتنی هاوڵاتییان

بوون.

له ساڵی ١٩٩٧ دا، میلیشیاکان به سەرکردایەتی سێ کوڕەکەی کاستانۆ، توانیان ڕێکخراوێکی نەتەوەیی میلیشیاکان دروستبکەن بە ناوی هێزە خۆپارێزە یەکگرتوەکانی کۆلۆمبیا AUC. ئەم ڕێکخراوە لە زۆربەی ناوچەکانی وڵات دا بڵاوبوونەوە، بەتایبەتی لە ناو وڵاتی گەرم دا لە پارێزگاکانی کۆردۆبا و سوکری و ماگادەلینا و سێزار. بە هاتنی ساڵی ٢٠٠١، ژمارەی چەکدارەکانی AUC گەیشتە نزیکەی سی هەزار کەس و بەسەر بلۆکی جیاوازدا دابەشکران. لە کۆردۆبا، بلۆکی میلیشیای کاتانومبۆ لە لایەن سەلڤاتۆر مانکیوسۆ سەرکردایەتیکرا. لە کاتێک دا دەسەڵاتەکەی بەردەوامبوو لە گەشەکردن، AUC بڕیارێکی ستراتیژی دا بۆ بەشداریکردن لە سیاسەت دا. میلیشیا و سیاسییەکان کەوتنە مەرایکردن بۆ یەکتری. چەند سەرکردەیەکی AUC کۆبوونەوەیەکیان لەگەڵ سیاسییە ناودارەکان دا ئەنجامدا لە شارۆچکەی سانتا فێ دی ڕالیتۆ لە کۆردۆبا. بەلاغێکی هاوبەش، هاوپەیمانییەك، کە داوای "دامەزراندنەوەی وڵات"ی دەکرد، دەرکرا و لە لایەن ئەندامە سەرکردەکانی AUC ەوە ئیمزا کرا کە بریتیبوون لە "جۆرج ٤٠" کە (نازناوی ڕۆدریگۆ تۆڤار پوپۆ بوو) و ئەدۆلفۆ پاز (نازناوی دیاگۆ فێرناندۆ "دۆن بێرنا" موریلۆ) و دیاگۆ ڤێسینۆ (ناوی ڕاستەقینەی: ئێدوارد کۆبۆ تێلیز) و سیاسییەکانی وەك سەنەتۆری نەتەوەیی ویلیم مۆنتیس و میگیۆڵ دی لا ئیسپریلا. لەم دەمەدا AUC ناوچەیەکی گەورەی کۆلۆمبیای بەڕێوەدەبرد و ئاسان بوو ڕێکیبخەن کێ لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٢ دا بۆ ئەندامێتی کۆنگرێس و سەنات هەڵدەبژێررێ. بۆ نموونە، لە شارەوانی سان ئۆنۆفری لە سوکری، هەڵبژرادن لە لایەن سەرکردەی میلیشیا، کادینا (زنجیر)ەوە ڕێکخرابوو. شایەتحاڵێك ئەوەی ڕوویدا بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە:

*(ئەو لۆرییانەی لە لایەن کادیناوە نێرابوون، چوونە ناوچەکانی دەوروبەری وەك کۆرگیمینتۆس و ناوچە گوندنشینەکانی سان ئۆنۆفری و خەڵکیان کۆکردەوە. بە پێی قسەی هەندێك لە دانیشتوان ... بۆ هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٢ سەدان ڕەنجدەر برانە کۆرگیمینتۆس پلان پاریجۆ بۆ ئەوەی دەموچاوی ئەو پاڵێوراوانە ببینن کە دەبوایە لە هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەدا دەنگیان بۆ بدانایە: جەیرۆ مێرلانۆ بۆ سەنات و مۆریلێ بێنیتۆ ڕێبۆلۆ بۆ کۆنگرێس.*

*کادینا ناوی ئەندامانی ئەنجوومەنی شارەوانی خستە تورەکەیەکەوە و دوو ناوی دەرهێنا و ووتی کە ئەوان و کەسانی تریش کە ناویان بە گۆترە دەردەهێنرێن دەکوژرێن ئەگەر مۆریل نەیباتەوە).*

پێدەچێ هەڕەشەکە کاری خۆی کردبێ: هەریەك لەو دوو پالێوراوە چل هەزار دەنگی هێنا لە هەموو سوکری دا. هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە کە سەرۆکی شارەوانی ئۆنۆفری پەیمانی سانتا فێ دی ڕالیتۆی لەگەڵ دا ئیمزاکردن. ڕەنگە یەك لە سەر سێی ئەندامانی کۆنگرێس و سەنات بەهۆی پشتگیری میلیشیاکانەوە لە ساڵی ٢٠٠٢ دا هەڵبژێرابن. نەخشەی (٢٠) کە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی میلیشیاکان دەردەخا، ئەوە پیشاندەدا دەسەڵاتیان چەند بەربڵاو بوو. سەلڤاتۆر مانکیوسۆ بۆخۆی چاوپێکەوتنێکی لەم شێوەیەی خوارەوە ئەنجامدا:

*(٣٥٪ ئەندامانی کۆنگرێس لەو ناوچانەدا هەڵبژێران کە ویلایەتی گروپانی خۆپارێزی تێدابوو، لەو ویلایەتانەدا ئێمە باجمان کۆدەکردەوە و دادپەروەریمان دەچەسپاند و کۆنترۆڵی خاك و سەربازی ناوچەکەمان لە بندەست دا بوو. هەموو ئەو کەسانەی دەیانویست بەشدارییکەن لە سیاسەت دا دەبوایە بهاتنایە و لەگەڵ ئەو نوێنەرایەتییە سیاسییانەی لەو ناوچانەدا هەمانبوون، ڕێکبکەون).*

زەحمەت نییە کاریگەریی ئەم ئەندازەیەی کۆنترۆڵی سیاسی و کۆمەڵگایی میلیشاکان لەسەر دەزگایانی ئابووری و سیاسەتی گشتی تێبگەین. فراوانبوونی دەسەڵاتی AUC بە ڕێگەی ئاشتی نەهاتەئاراوە. ئەم گروپە نەك هەر تەنیا دژی FARC شەڕیکرد، بەڵکو خەڵکی مەدەنی بێتاوانیشیان کوشت و بە سەدان هەزار کەسیان تۆقاند و ئاوارەکرد. بە پێی سەنتەری چاودێری ئاوارانی ناوخۆ (IDMC)ی کاونسڵی پەنابەرانی نەرویجی، لە سەرەتای ساڵی ٢٠١٠ دا نزیکەی ١٠٪ی دانیشتوانی کۆڵۆمبیا کە دەیکردە ٤,٥ ملیۆن کەس، ئاوارەی ناوخۆ بوون. میلیشیاکان هەروەك مانکیوسۆ ئاماژەیپێداوە، دەستیان بەسەر حکومەت و هەموو کارەکانی دا گرت، جگە لە کۆکردنەوەی باج کە زەوتکردن بوو بۆ گیرفانی خۆیان. پەیمانێکی نائاسایی لە نێوان سەرکردەی میلیشیا مارتن لیانۆس (ناوی ڕاستەقینە: هێکتەر جێرمان بویتراگۆ) و سەرۆك شارەوانییەکانی تۆرامینا و ئەگوازول و ڤیلانۆئیڤا و مۆنتێری و ساباناالارگا لە

پارێزگای کاسانارى لە ڕۆژهەڵاتى کۆلۆمبیا، ئەم خاڵانە لە خۆدەگرێ کە دەبوایە سەرۆك شارەوانییەکان بە فەرمانى "میلیشیاى ڕەنجدەرانى کاسانارى" جێبەجێیان بکردنایە:

١. ٥٠٪ بودجەى شارەوانییەکان لە لایەن میلیشیاى ڕەنجدەرانى کاسانارى بەڕێوەبرێ.
٢. ١٠٪ هەموو گرێبەستێکى شارەوانى پێویستە بدرێتە میلیشیاى ڕەنجدەرانى کاسانارى.
٣. یارمەتى ئیلزامى بۆ هەموو ئەو کۆبوونەوانەى لە لایەن میلیشیاى ڕەنجدەرانى کاسانارى ڕێکدەخرێن.
٤. دانانى میلیشیاى ڕەنجدەرانى کاسانارى لە هەموو پرۆژەیەکى ژێرخان دا
٥. چوونە ناو ئەو حیزبە نوێیەى لە لایەن میلیشیاى ڕەنجدەرانى کاسانارى دادەمەزرێ.
٦. سەرۆك شارەوانییەکان پرۆگرامى بەڕێوەبردنى ناوچەکانیان جێبەجێدەکەن.

کاسانارى ناوچەیەکى هەژار نەبوو. بە پێچەوانەوە، داهاتى تاك لەو ناوچەیە دا لە داهاتى تاکى هەموو ناوچەکانى ترى کۆلۆمبیا بەرزتر بوو، چونکە ناوچەکە خاوەنى نەوتێکى زۆر بوو، ئەمەش ئەو جۆرە دەرامەتەیە کە میلیشیاکان ڕادەکێشێ. لە ڕاستیدا کاتێك میلیشیاکان دەسەڵاتیان گرتەدەست، زەوتکردنى سیستەماتیکى موڵك لە لایەن ئەوانەوە خەست بۆوە و ماکیوسۆ بۆخۆى بایى ٢٥ ملیۆن دۆلار زەوى لە ناوچە گوندنشینەکان و شارنشینەکان کۆکردەوە. مەزندەى ئەو زەوییانەى لە کۆلۆمبیا دا لە لایەن میلیشیاکانەوە زەوتکرا دەگاتە ١٠٪ هەموو زەوییەکانى ناوچە گوندنشینەکان.

کۆلۆمبیا حاڵەتى دەوڵەتێکى شکستخواردوو نییە کە خەریك بێ هەرەسبهێنێ، بەڵام کۆلۆمبیا دەوڵەتێکە خاوەن مەرکەزیەتى پێویست نییە و زۆر دوورە لەوەى دەسەڵاتى تەواوى بەسەر هەموو خاکەکەى دا هەبێ. هەرچەندە دەوڵەت دەتوانێ ئاسایش و خزمەتگوزارى بۆ ناوچەى گەورەى شارنشینى وەك بۆگۆتا و بارانکیولا دابینبکا، بەڵام ناوچەى فراوانى تر هەیە لە وڵات دا کە دەوڵەت خزمەتگوزارى کەم دابیندەکا و هیچ یاسا و ئاسایشى تێدا نییە. لە جیاتى ئەمە گروپان و کەسانى ئەڵتەرنەتیڤى دەوڵەت، وەك ماکیوسۆ

کۆنترۆڵی سیاسەت و دەرامەتەکان دەکەن. لە هەندێك ناوچەی وولات دا دەزگایانی ئابووری بە شێوەیەکی زۆر باش کار دەکەن و ئاستی بەرزی سەرمایەی مرۆیی و کارزانی هەیە، بەڵام لە ناوچەکانی تردا دەزگاکان یەکجار چەوسێنەرن و تەنانەت ناتوانن کەمترین ئەندازەی دەسەڵاتی دەوڵەت بچەسپێنن.

**نەخشەی (٢٠): بوونی میلیشیاکان لە کۆلۆمبیا دا، ١٩٩٧-٢٠٠٥**



ڕەنگە تێگەیشتنی ئەوە زەحمەت بێ کە چۆن بارودۆخێکی لەم چەشنە بۆ چەندین دەیە، تەنانەت چەندین سەدە، دەتوانێ بەردەوامی بەخۆی بدا. بەڵام لە راستیدا، بارودۆخی لەم چەشنە لۆجیکی خۆی هەیە، وەك جۆرێك لە جۆرەکانی بازنەی ناهەمواری. زەبروزەنگ و نەبوونی دەزگایانی دەوڵەتی خاوەن مەرکەزیەتی لەم جۆرە پەیوەندییەکی ڕەمزی دروستدەکەن و سیاسییەکان ئەو بەشانەی کۆمەڵگا بەڕێوەدەبەن کە دەکرێ بەڕێوەببرێن. پەیوەندییە ڕەمزیەکە دروستدەبێ لەبەرئەوەی سیاسییەکانی حکومەتی نەتەوەیی ئاژاوەی ناوچە دوورەدەستەکان دەقۆزنەوە، لە کاتێك دا گروپە میلیشیاکان لە لایەن حکومەتی نەتەوەییەوە وازیان لێدەهێنرێ چی دەکەن بیکەن.

ئەم پاتێرنە، بەتایبەتی لە ساڵانی ٢٠٠٠ کان دا دیار و بەرچاو بوو. لە ساڵی ٢٠٠٢ دا ئەلڤارۆ یورایب هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بردەوە. یورایب شتێکی هاوبەشی لەگەڵ برایانی کاستانۆدا هەبوو، باوکی لە لایەن FARC ەوە کوژرابوو. یورایب هەڵمەتی هەڵبژاردنی لەسەر بنەمای ڕەتکردنەوەی هەوڵەکانی حکومەتی پێشوو دەسپێکرد کە هەوڵی چارەسەری ئاشتیانەی دابوو لەگەڵ FARC. لە ساڵی ٢٠٠٢ دا ڕێژەی دەنگەکانی لەو ناوچەنەدا کە میلیشیاکانی لێبوو ٣٪ زیاتر بوو لە ناوچەکانی تر. لە ساڵی ٢٠٠٦ دا کە هەڵبژێرایەوە، ڕێژەی دەنگەکانی ١١٪ لەو ناوچانەدا زیاتر بوو کە ناوچەی میلیشیاکان بوون. ئەگەر مانکیوسۆ و هاوبەشەکانی تری توانیبێتیان دەنگ بۆ هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێس و سەنات پەیدابکەن، ئەوا توانیویانە هەمان شت لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیشدا بکەن بەتایبەتی بۆ سەرۆکێك کە بۆچوونەکانی لە بۆچوونەکانی ئەوانەوە زۆر نزیك و چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرا کە لەگەڵیان دا نەرم بێ. هەروەك جەیرۆ ئەنگاریتا، جێگری سالڤاتۆر ماکیوسۆ و سەرکردەی پێشووتری بلۆکەکانی AUC لە سنۆ و سان جۆرج، لە ئەیلولی ساڵی ٢٠٠٥ دا ڕایگەیاند کە جێگەی شانازی یە ئەو کاربکا لە پێناوی "هەڵبژاردنەوەی باشترین سەرۆك تا ئێستا هەمانبوە"

دوای ئەوەی هەڵدەبژێران، سەنەتەر و کۆنگرێسمانە لایەنگرەکانی میلیشیاکان بەو شێوەیە دەنگیان دەدا کە یورایب دەیویست، بەتایبەتی گۆڕینی دەستوور بۆ ئەوەی بتوانێ لە ساڵی ٢٠٠٦ دا هەڵبژێرێتەوە، چونکە لە

کاتی هەڵبژاردنی یەکەمی دا لە ساڵی ٢٠٠٢ دا نەیدەتوانی ئەمە بکا. بەرامبەر بەمە، سەرۆك یورایب یاسایەکی زۆر نەرمی دەرکرد کە بواری دایە میلیشیاکان تا بڵاوەی لێبکەن. بڵاوەکردنی میلیشیاکان مانای کۆتاییهاتنی کاری میلیشیایی نەبوو، بەڵکو تەنیا بریتیبوو لە بەدەزگاییکردنیان لە ناوچەیەکی فراوانی کۆلۆمبیا و دەوڵەتی کۆلۆمبیادا، لەو شوێنانەی کە میلیشیاکان لەوەبەر دەستیان بەسەردا گرتبوون و ڕێگەیان پێدرا لە بندەستیان دا بمێننەوە.

لە کۆلۆمبیا دا چەندین لایەنی دەزگایانی ئابووری و سیاسی بە تێپەڕبوونی کات زیاتر کرانەوە، بەڵام هەندێك توخمی سەرەکی بە چەوسێنەر ماونەتەوە. یاخیبوون و ناجێگیریی مافی موڵکداری لە ناوچەی فراوانی وولات دا تەشەنەیان سەندوە و ئەمەش ئاکامی نەبوونی کۆنترۆڵی دەوڵەتی نەتەوەییە لە چەندین ناوچەی وولات و شێوازی تایبەتی نەبوونی مەرکەزیەتی دەوڵەتە لە کۆلۆمبیادا. بەڵام ئەم بارودۆخە ئاکامێکی حەتمی نییە. بارودۆخەکە بۆخۆی ئەنجامی ئەو داینەمیکانەن کە ئاوێنەی بازنەی ناهەموارین: دەزگایانی سیاسی لە کۆلۆمبیادا هاندان بۆ سیاسییەکان دروستناکەن تا خزمەتگوزاری گشتی ویاسا وئاسایش لە زۆربەی ناوچەکانی وولات دا دابینبکەن و جڵەوگیری پێویست بۆ ئەو سیاسییانە ناڕەخسێنن تا ڕێگەی مامەڵەی ئاشکرا و نهێنییان لەگەڵ میلیشیا و چەتەکان دا لێبگرن.

## ئێل کۆراڵیتۆ

ئەرجەنتین لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠١ دا لە گەرمەی تەنگژەیەکی ئابووری دا بوو. بۆ ماوەی سێ ساڵ، داهاتەکان دادەبەزین و بێکاری بەرزدەبۆوە و وولات بڕێکی زۆری قەرزی نێودەوڵەتی کەوتبوە سەر. ئەو سیاسەتانەی بوونە هۆی ئەمانە، لە ساڵی ١٩٨٩ دا، لە لایەن حکومەتی کارلۆس منێم پەیڕەوکرابوون بۆ وەستاندنی هەڵاوسانی بەرز و جێگیرکردنی ئابووری. بۆ ماوەیەك ئەو سیاسەتانە سەرکەتوو بوون.

لە ساڵی ١٩٩١ دا منێم، پیسۆی ئەرجەنتینی بەستەوە بە دۆلاری ئەمەریکیەوە. بە پێی یاسا یەك پیسۆ بەرامبەر یەك دۆلار بوو. دەبوایە گۆڕانکاری لەم ڕێژەی گۆڕینەوەیەدا نەکرایە. کۆتایی چیرۆك. باشە، تا

ڕادەیەك. بۆ ئەوەی بڕوا بە خەڵك بکرێ کە حکومەت بەڕاستی پابەندی یاسا بوو، خەڵکیان ڕازیکرد تا حسابی بانك بە دۆلار بکەنەوە و دەیانتوانی دۆلار لە بازاڕەکانی بۆینس ئایرسی پایتەخت دا بەکاربهێنن و لە هەموو شوێنەکانی شارەکەدا دەیانتوانی دۆلار لە مەکینەکانی دەرهێنانی پارە بە کاش دەربهێنن. ڕەنگە ئەم هەنگاوە هاوکاری سەقامگیرکردنی ئابووری کردبێ، بەڵام یەك لایەنی خراپی هەبوو کە بریتیبوو لەوەی هەناردەکردنەکانی ئەرجەنتینی زۆر گران و هاوردەکردنەکانی زۆر هەرزان کردن. هەناردەکردن وەستا و هاوردەکردن جۆشیسەند. تەنیا ڕێگەیەك بۆ دابینکردنی پارەی هاوردەکردن بریتیبوو لە قەرزکردن. ئەمەش بارودۆخێکی دروستکرد کە بەردەوامبوونی زەحمەت بوو. کاتێك نیگەرانی خەڵك بەرامبەر هێشتنەوەی نرخی پیسۆ بەرامبەر دۆلار بە شێوەیەکی بەردەوام، زیادیکرد، کەوتنە دانانی زۆربەی ساماناکەیان لە حسابی بانکیان دا بە دۆلار. خەڵك لایانوابوو ئەگەر حکومەت یاساکەی وەلاخست و بەهای پیسۆی کەمکردەوە، ئەوا حسابەکەیان بە دۆلار کێشەی نابێ، باشە؟ ئەوان ڕاست بوون کە بەرامبەر پیسۆ نیگەران بن، بەڵام بەرامبەر دۆلارەکانیان زۆر گەشبین بوون.

لە ١ کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠١ دا، حکومەت هەموو حسابە بانکیەکانی سڕکرد، لە سەرەتادا بۆ نەوەد ڕۆژ. دەبوایە حەفتانە تەنیا بڕێکی کەم پارەی کاش لە حسابی بانکی دەربهێنرایە. لە سەرەتادا ئەم بڕە ٢٥٠ پیسۆ بوو کە تا ئەو کاتەش دەیکردە ٢٥٠ دۆلار. دواتر ئەم بڕە کرایە ٣٠٠ پیسۆ، بەڵام دەبوایە تەنیا لە حسابی بانکی پیسۆ دەربهێنرایە. کەس بۆی نەبوو پارە لە حسابی بانکی دۆلار دەربهێنێ، ئەگەر ڕازینەبوایە دۆلارەکانی بگۆڕیایەتەوە بۆ پیسۆ. کەس ئامادە نەبوو ئەمە بکا. ئەرجەنتینییەکان ئەم بارودۆخەیان ناونا ئێل کۆرالیتۆ، "کۆرالیتۆ - پەرچەی بچکۆلەی ئاژەڵان": ئەوانەی پارەیان لە حسابی پاشەکەوتکردنی بانك دا دانابوو، وەك گایەل خرانە پەرچەیەکەوە، بێئەوەی دەرەتانی دەرچوونیان هەبێ. لە مانگی کانونی دوەم دا بەستنەوەی پیسۆ بە دۆلارەوە هەڵوەشێنرایەوە و ئەمجارە لە بری ئەوەی بەهای یەك پیسۆ بەرامبەر یەك دۆلار بێ، بەهای چوار پیسۆ بوە بەرامبەر یەك دۆلار. دەبوایە ئەمە فریادڕەسی ئەوانە بوایە کە بڕیان لە دانانی پاشەکەوتەکانیان کردبۆوە لە حسابی دۆلار. بەڵام بەو شێوەیە نەبوو چونکە حکومەت هەموو ئەو

پاشەکەوتانەی لە حسابی بانکی دۆلاردا بوون بەزۆر گۆڕییەوە بۆ پیسۆ، بەڵام بە پێی ڕێژەی گۆڕینەوەی کۆنی یەك پیسۆ بەرامبەر یەك دۆلار. کەسێك کە ۱۰۰۰ دۆلاری لە حسابی دۆلاردا پاشەکەوتکردبوو، لە پڕێکدا پاشەکەوتەکەی بوە ۲۵۰ دۆلار. حکومەت سێ لەسەر چواری پاشەکەوتی خەڵکی بۆخۆی زەوتکرد.

بە لای ئابووریناسانەوە، ئەرجەنتین وڵاتێکی سەرلێتێکدەرە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی تا چ ڕادەیەك تێگەیشتن لە ئەرجەنتین زەحمەت بوو، براوەی خەڵاتی نۆبل، ئابووریناس سایمۆن کوزنێتس، جارێك وتی کە چوار جۆرە وڵات هەن: پەرەسەندوو، پەرەسێن، یابان و ئەرجەنتین. بیرکردنەوەی کوزنێتس بەو شێوەیە بوو، چونکە لە دەوروبەری یەکەم جەنگی جیهانی دا، ئەرجەنتین یەکێك بوو لە وڵاتە دەوڵەمەندەکانی جیهان. دواتر تووشی لاوازبوونی ڕێژەیی بوو بە بەراورد لەگەڵ وڵاتە دەوڵەمەندەکانی تری ئەوروپای ڕۆژئاوا و باکووری ئەمەریکا و لە ساڵانی ۱۹۷۰ کان و ۱۹۸۰ کان بەتەواوی لاواز بوو. ئەگەر سەیری دیوی دەرەوە بکەین، ئەوا دەبینین ئەدای ئەرجەنتین جێگەی سەرسامیە، بەڵام کاتێك لە دووربینی دەزگایانی کراوە و چەوسێنەرەوە سەیردەکەین، هۆکارەکانی لاوازبوونی ئەرجەنتین باشتر ڕووندەبێتەوە.

ڕاستە کە بەر لە ساڵی ١٩١٤، ئەرجەنتین نزیکەی پەنجا ساڵ گەشەکردنی ئابووری بەخۆوە بینی، بەڵام ئەمە حاڵەتێکی کلاسیکی گەشەکردن بوو لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا. دواتر ئەرجەنتین لە لایەن نوخبەیەکی بچوکەوە حوکمکرا کە بە قورسی لەو بەروبومە کشتوکاڵیانەدا وەبەرهێنانیانکرد کە هەناردەدەکران بۆ دەرەوە. ئابووری، بەهۆی هەناردەکردنی گۆشتی گا و پێستە و دەنەوێڵە وە گەشەیکرد، لە کاتێك دا پێویستیە جیهانییەکان ترۆقی بە نرخی ئەم کەلوپەلانە کرد. بە هەمانشێوەی گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا، ئەو گەشەکردنە تێکدانی بنیاتنەری دروستنەکرد و نوێکاری نەهێنایەئاراوە و ئەم گەشەکردنە توانای بەردەوامیی نەبوو، لە دەوروبەری یەکەم جەنگی جیهانی دا، ناسەقامگیریی بەردەوامی سیاسی و یاخیبوونی چەکداری نوخبەکانی ئەرجەنتینی ناچارکرد سیستەمە سیاسییەکە فراوان بکەن، بەڵام ئەمە بوە هۆی وەگەڕکەوتنی ئەو هێزانەی ئەوان

نەیاندەتوانی کۆنترۆڵیان بکەن و لە ساڵی ١٩٣٠ دا یەکەم کودێتای سەربازی ئەنجامدرا. لە نێوان ئەو ساڵە و ساڵی ١٩٨٣، ئەرجەنتین لە نێوان دیکتاتۆریەت و دیموکراسی دا ئەمبەر و ئەوبەری کرد و لە نێوان جۆرەها دەزگایانی چەوسێنەردا قەتیسی خوارد. چەوسانەوەی بەکۆمەڵ لە سایەی حوکمی سەربازی دا ئەنجامدرا کە لە ساڵی ١٩٧٠کان دا گەیشتە ئەوپەڕی و بەلایەنیکەمەوە نۆ هەزار کەس و ڕەنگە بەشێوەی نایاسایی زۆر لەوە زیاتر لە سێدارە درابن. سەدان هەزار کەس خرانە بەندیخانە و ئەشکەنجەدران.

لە کاتی حوکمی مەدەنی دا هەڵبژاردن هەبوو، جۆرە دیموکارسییەك، بەڵام ئەم سیستەمە سیاسییە زۆر دووربوو لە سیستەمێکی کراوە. لە کاتی دەسەڵات پەیداکردنی پیرۆن لە ساڵانی ١٩٤٠ کانەوە، ئەرجەنتینی دیموکراسی لە لایەن ئەو حزبەی ئەو دایمەزراند، پارتیدۆ جەستیشیالیستا کە پێیدەوترا حیزبی پیرۆنیست، کۆنترۆڵکرا. پێرۆنیستەکان هەڵبژاردنەکانیان دەبردەوە سوپاس بۆ ئامێرێکی سیاسی زەبەلاح کە سەرکەوتنی بەدەستدەهێنا لە ڕێگەی کڕینی دەنگ و هاوکاری لایەنگران و بەشداریکردن لە گەندەڵی دا، لەوانە گرێبەستە حکومییەکان و دامەزراندن بەرامبەر پشتگیری سیاسی. بە دیوێك لە دیوەکان دا ئەمە دیموکراسی بوو، بەڵام دیموکراسییەکی پلورەلیستی نەبوو. دەسەڵات بە خەستی لە چنگی حیزبی پیرۆنیست دا کۆبوبۆوە، کە جڵەوگیری کەم خرابوە سەر ئەوشتانەی دەیکرد، بەلایەنیکەمەوە لەو ماوەیەدا کە سوپا نەیدەویست لە دەسەڵات دووریخاتەوە. هەورەك پێشتر بینیمان، ئەگەر دادگای باڵا ڕووبەڕووی پۆلیسییەك ببوایەتەوە ئەوا قوڕ بەسەر داداگای باڵادا دەکرا.

لە ساڵانی ١٩٤٠ کان دا، پیرۆن بزووتنەوەی کرێکارانی وەك پاڵپشتی سیاسی بەکارهێنا، بەڵام کاتێك ئەم بزووتنەوەیە لە ساڵانی ٧٠ و ٨٠ کان دا بەهۆی سەرکوتکردنە سەربازییەکانەوە لاوازکرا، حیزبەکەی پیرۆن بایاندایە سەر کڕینی دەنگ لە خەڵکی تر. پۆلیسییە ئابووری و دەزگاکان وا دیزاینکرابوون تا داهات بۆ لایەنگرانی ئەو حیزبە دابینبکەن، نەك بۆ دەستەبەرکردنی مەیدانێکی تەختی گەمەکردن. کاتێك سەرۆك منێم ڕووبەڕووی سنووردارکردنی ماوەی سەرۆکایەتی بۆوە و ئەمەش دەبوە هۆی ئەوەی کە نەتوانێ لە ساڵی ١٩٩٠ دا هەڵبژێرێتەوە، هیچ شتێك لە مەسەلەکە نەگۆڕا: ئەو توانی بە ئاسانی دەستوور سەرلەنوێ دابڕێژێتەوە و لە سنووردارکردنی ماوەی سەرۆکایەتی ڕزگاری بێ. هەروەك ئێل کۆرالیتۆ پیشانیدەدا، هەرچەندە

ئەرجەنتین هەڵبژاردنی هەیە و حکومەتی هەڵبژێراوی لە لایەن جەماوەرەوە هەیە، بەڵام حکومەت بە ئاسانی دەتوانێ مافی موڵکداری بخاتە لاوە و سامانی هاوڵاتییانی خۆی بێلێپێچینەوە زەوتبکا. چاودێرییەکی کەم بەسەر سەرۆکەکانی ئەرجەنتین و نوخبە سیاسییەکانەوە هەیە و بە دڵنیاییەوە پلورەلیزم نییە.

ئەوەی کوزنێتسی سەرسامکردبوو لەگەڵ چەندین کەسی تر کە سەردانی بۆینس ئایرس دەکەن ئەوەیە کە ئەو شارە زۆر جیاوازە لە لیما و شاری گواتیمالا و شاری مەکسیکۆ. خەڵکی خۆماڵی تێدا نابینی و ئەوەی کۆیلەکانی پێشووی تێدا نابینی. بەزۆری ئەو تەلارسازی و بینا مەزنانە دەبینی کە لە سەردەمی بێلی دا دروستکراون، کە ساڵانی گەشەکردن بوو لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا. بەڵام لە بۆینس ئایرس دا تەنیا بەشێك لە ئەرجەنتین دەبینی. بۆ نموونە، منێم بۆخۆی خەڵکی بۆینس ئایرس نەبوو. ئەو لە ئەنیلاکۆ لە دایك بوو لە پارێزگای ڕیۆیا لە ناوچە شاخاوییە دوورەکانی باکووری ڕۆژئاوای بۆینس ئایرس و سێ خول پارێزگاری ئەو پارێزگایە بوە. لەو کاتەدا کە ئەمەریکاکان لە لایەن ئیسپانییەکانەوە داگیرکران، ئەم بەشەی ئەرجەنتین ناوچەیەکی دوورە دەستی ئیمپراتۆریەتی ئینکا بوو، خاوەن دانیشتوانی چڕی خۆماڵی بوو نەخشەی (١). ئیسپانییەکان لێرەدا ئینکۆمایندایان دروستکرد و ئابوورییەکی یەکجار چەوسێنەریان بنیاتنا کە پشتی بە بەرهەمهێنانی بەروبومی خۆراکی و بەخێوکردنی هێستر بەستبوو بۆ کرێکارانی کانەکانی پۆتۆسی لە باکوور. لە راستیدا، لا ڕیۆخا زۆر زیاتر هاوشێوەی ناوچەی پۆتۆسی بوو لە پیرو و بۆلیڤیا وەك لەوەی لە بۆینس ئایرس بچێ. لە سەدەی نۆزدەیەم دا، لا ریۆیا لۆردی جەنگی بەناوبانگ فاکاندۆ کیورۆگای تێدا پەیدابوو، کە حوکمی ناوچەکەی کرد بە بێگوێدانە یاسا و پیاوەکانی پەلاماری بۆینس ئایرس یان دا. چیرۆکی پەرەپێدانی دەزگایانی سیاسی ئەرجەنتین، چیرۆکێکە دەربارەی چۆنیەتی ڕێکەوتنی پارێزگاکانی ناوەوەی وەك لا ریۆخا لەگەڵ بۆینس ئایرس دا. ئەم ڕێکەوتنانە بریتیبوون لە هودنە: لۆردی جەنگی لا ریۆخا ڕازیبوو واز لە بۆینس ئایرس بهێنێ بۆ ئەوەی خەریکی پەیداکردنی پارە بێ. بەرامبەر بەمە نوخبەکانی بۆینس ئایرس وازیانهێنا لە ئەنجامدانی چاکسازی لە دەزگاکانی ناوچەکانی ناوەوەدا. کەواتە لە سەرەتادا ئەرجەنتین وادەردەکەوێ کە لەگەڵ پیرۆ و بۆلیڤیا دنیایەك جیاوازییان هەبێ، بەڵام لە

راسـتیدا، کاتێـك بولوڤـارده جوانـه‌کانی بـۆینس ئـایرس بەجێـدەهێڵی، هێنـده جیاواز نین. هۆکاری ئەوەی کە ئەرجـەنتین ڕێـچکەی دەزگـایی زۆر هاوشـێوەی وولاتانی چەوسـێنەری تـری ئەمـەریکای لاتینـی گرتەبـەر ئەوەیـە کـە ویـست و سیاسەتەکانی ناوچەکانی ناوەوە خزێنرانە ناو دەزگایانی ئەو وولاتەوە.

ئەوەی کە هەڵبژاردنەکان دەزگایـانی ئـابووری و سیاسـی کراوەیـان لەگـەڵ خۆیان دا نەهێنا، حاڵەتێکی نموونەییە لە ئەمەریکای لاتین دا. لـە کۆلۆمبیـادا، میلیشیاکان دەتوانن بە ساختە یـەك لـە سـەر سـێی کورسـییەکانی هەڵبژاردنـە نەتەوەییـەکان ببنـەوە. لـە ڤـەنزەوێلای ئـەمڕۆدا، بەهەمانـشێوەی ئەرجـەنتین حکومەتەکـەی هیۆگـۆ شـافێز کـە بـە شـێوەیەکی دیموکراسـی هەڵبـژێراوە، هێرشدەکاتە سەر بەرهەڵستکارانی و لـە کارەکـانی کـەرتی گشتی دەریانـدەکا وئەو ڕۆژنامانە دادەخات کە سەروتارەکانیانی بەدڵ نییە و موڵك زەوتدەکا. لە هەموو ئەو شتانەی دەیانکات، شافێز، لە چاو سێر ڕۆبەرت وۆلپۆڵ لە بەریتانیای ساڵانی ۱۷۲۰ ەکان دا، خاوەن دەسەڵاتی زۆر زیاترە و جڵەوگیری کەمتر لەسەر دەسەڵاتەکەی هەیە، کاتێك وۆلپۆڵ نەیتوانی بە پێی یاسـای ڕەشپێـستان سـزای جـۆن هـەنتریج بـدا. هـەنتریج لـە ڤـەنزەویلا و ئەرجـەنتینی ئـەمڕۆدا دەرفـەتی دادگاییکردنێکی دادپەروەرانەی زۆر کەمتر بوو.

لە کاتێك دا ئەو دیموکراسییەی لە ئەمەریکای لاتین دا لە سەرهەڵداندایە لـە ڕووی پرینـسیپەوە دژی حـوکمی نوخبەیـە و لـە بانگەشـە و ڕەفتـاردا هـەوڵی دابەشکردنەوەی ماف و دەرفەتەکان دەدا دوور لە، بەلایـەنی کەمـەوە، بەشـێك لە نوخبە، ڕەگەکانی بە قایمی لە ناو ڕژێمـانی چەوسـێنەردا داکوتـاوە، لـە دوو ڕوانگەوە: یەکەم، ئەو نایەکسانییەی بـۆ مـاوەی چـەندین سـەدەیە لـە سـایەی ڕژێمانی چەوسێنەردا بەردەوامە، وا لە دەنگدەران دەکـا لـەو وولاتانـەی بـەرەو دیموکراسی هەنگاودەنێن دەنگبدەن بەو سیاسییانەی کە پۆلیـسی تونـدڕەویان هەیە. ئەوە لەبەر ئەوە نییە کە دانیشتوانی ئەرجەنتین نەفامن و لەو بڕوایـەدان کە جوان پیرۆن یان سیاسـییە نوێترەکـانی حیزبـی پیرۆنیـستی وەك مێـنم یـان کیرچنەرەکان بەرژەوەندی خۆیان نـاوێ و بایـەخ بـە بەرژەوەندییـەکانی ئـەوان دەدەن، یان خەڵکی ڤەنزەویلا ڕزگاری خۆیان لە شافێزدا دەبیننـەوە. لـە بـری ئەمـە، زۆرینـەی ڤـەنزەویلی و ئەرجەنتینیـەکان ئـەوە دەزانـن کـە هـەموو سیاسـییەکانی حیزبـەکانی تـر نـەیانتوانیوە گـوێ لـە دەنگیـان بگـرن و خزمەتگوزارییـە هـەرە بنەڕەتییـەکانی وەك ڕێگاوبـان و پـەروەردەیان بـۆ

دابینبکەن و بیانپارێزن لە چەوساندنەوە لە لایەن نوخبە ناوخۆییەکانەوە. هەر لەبەر ئەمەیە ئەمڕۆ خەڵکێکی زۆری ڤەنزەوێلا پشتگیری سیاسەتەکانی شافێز دەکەن تەنانەت ئەگەر ئەم سیاسەتانە بشبنە مایەی گەندەڵی و بەفیڕۆدان، بە هەمان ئەو شێوەیەی گەلێك لە ئەرجەنتینییەکان پشتگیری سیاسەتەکانی پیرۆنیان کرد لە ساڵانی ١٩٤٠ کان و ١٩٧٠ کان دا. دوەم، دیسانەوە ئەوە دەزگایانی چەوسێنەرن دەبنە هۆی ئەوەی سیاسەت ئەوەندە جێگەی بایەخ و هێندە لە بەرژەوەندی پیاوانی بەهێزی وە پیرۆن و شافێز دا بێ لەبری سیستەمێکی کاریگەری حیزبیی کە ئەڵتێرنەتیڤی گونجاو بهێنێتەکایەوە. پیرۆن و شافێز و دەیان کەسی تر لەپیاوانی بەهێز لە ئەمەریکای لاتین دا، تەنیا ڕوویەکی تری یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکین و هەورەك ناوەکەش پێشنیازدەکا ڕیشەکانی ئەم یاسای ئاسنینە لە ژێر ئەو ڕژێمانەوە داکوتراون کە لە لایەن نوخبەکانەوە کۆنترۆڵکراون.

## ڕەهایی نوێ

لە تشرینی دوەمی ساڵی ٢٠٠٩ دا، حکومەتی کۆریای باکوور، دەستیکرد بەوەی ئابووریناسان پێیدەڵێن ریفۆرمی دراو. شالاوی کاریگەریی هەڵاوسان، زۆرجار هۆکاری ئەنجامدانی ئەم جۆرە ڕیفۆرمانەن. لە فەرەنسادا، لە کانونی دوەمی ساڵی ١٩٦٠ دا، ڕیفۆرمێکی دراو فرانکێکی نوێی خستەکار کە دەیکردە ١٠٠ فرانکی کارپێکراو. فرانکە کۆنەکان بەردەوامبوون لە کارپێکردن و تەنانەت خەڵك بە فرانکە کۆنەکە تاووتوێی نرخەکانیان دەکرد تا ئەو کاتەی گۆڕانکاری بۆ فرانکە نوێکە بەرەبەرە جێگەی خۆی کردەوە. لە کۆتایی دا، کارپێکردنی یاسایی بە فرانکە کۆنەکان لە ساڵی ٢٠٠٢ دا ڕاگیرا، کاتێك فەرەنسا کەوتە بەکارهێنانی یۆرۆ. ڕیفۆرمەکانی کۆریای باکوور گەر ڕووکەش سەیریانبکەین پێدەچوو هاوشێوەی ئەوەی فەرەنسا بووبێ. بە هەمانشێوەی فەرەنسا لە ساڵی ١٩٦٠ دا، حکومەتی کۆریای باکوور بڕیاریدا دوو سفر لە سەر پارەکەی لابەرێ. سەد وّنی کۆن، کە پارەی کۆریای باکوورە، دەیکردە یەك وّنی نوێ. هاوڵاتییان ڕێگەیان پێدرا تا پارە کۆنەکەیان بگۆڕنەوە بۆ پارە چاپکراوە نوێکە، هەرچەندە دەبوایە ئەمە لەماوەی یەك حەفتەدا لەبری چلو دوو ساڵ،

هەورەك لە فەرەنسادا كرا، ئەنجامبدرایە. دواتر فێڵەكە خرایەكار. حكومەت رایگەیاند كە كەس ناتوانێ لە ١٠٠,٠٠٠ ۆن زیاتر بگۆڕێتەوە، هەرچەندە دواتر ئەم بڕە بوە ٥٠٠,٠٠٠ ۆن. سەد هەزار ۆن لە بازاڕی ڕەش دا دەیكردە چل دۆلاری ئەمەریكی. لە چاوتروكانێكدا حكومەت بەشێكی زۆری سامانی تایبەتی هاولاتییانی كۆریای باكووری لەبەینبرد: ئێمە نازانین ئەم بڕە بەتەواوی چەندبوو، بەلام ڕەنگە زۆر تر بووبێ لەو پارەیەی لە لایەن حكومەتی ئەرجەنتینەوە لە ساڵی ٢٠٠٢ زەوتكرا.

حكومەتی كۆریای باكوور حكومەتێكی دیكتاتۆری كۆمیۆنیستە و دژی موڵكداری تایبەت و بازاڕە، بەلام كۆنترۆڵكردنی بازاڕی ڕەش كارێكی زەحمەتە و بازاڕی ڕەشیش بە كاش مامەڵەدەكا. بێگومان بڕێكی زۆر پارەی بیانی دەستاودەست دەكا بەتایبەتی پارەی چینی، بەلام زۆربەی مامەڵەكان بە ۆن دەكرێن. ریفۆرمی دراو بۆ ئەوە ئەنجامدرا تا سزای ئەوانە بدا كە ئەم بازاڕانەیان بەكاردەهێنا و ووردتریش بۆ ئەوەی ئەو كەسانە هێندە دەوڵەمەند یان دەسەلاتدار نەبن تا هەرەشە لە ڕژێمەكە بكەن. هێشتنەوەیان بە هەژاری سەلامەت تر بوو بۆ ڕژێم. بازاڕە ڕەشەكان هەموو چیرۆكەكە نین. خەڵك لە كۆریای باكوور پاشەكەوتەكانیان بە دراوی ۆنیش لە بانكەكان دا دادەنێن كە ژمارەیان كەم و هەموویان بانكی حكومەتن. لە ئەنجامدا، حكومەت ریفۆمی دراوی بەكارهێنا بۆ زەوتكردنی پاشەكەوتەكانی خەڵك.

هەرچەندە حكومەت دەڵێ بازاڕ خراپە، بەلام نوخبەكانی كۆریای باكوور حەز لەو شتانە دەكەن بازاڕەكان بۆیان بەرهەدەهێنن. سەركردە كیم یۆڵ ئیلّ، كۆشكێكی حەوت نهۆمی هەیە بۆ ڕابواردن و باڕ و ئامێری كاریۆكی و سینەمایەكی بچووكی تێدایە. نهۆمی زەمینی مەلەوانگەیەكی گەورەی هەیە لەگەڵ ئامێری دروستكردنی شەپۆل كە كیم حەز دەكا بۆ تەختەی خلیسكانی سەر ئاو كە ماتۆڕێكی پێوەیە بەكاریبهێنێ. كاتێك ویلایەتە یەككگرتوەكان لە ساڵی ٢٠٠٦ دا ئابلۆقەی خستە سەر كۆریای باكوور، دەیزانی لە كوێ دا لە ڕژێمەكە بدا كە ئازاری پێبگەیەنێ. ویلایەتە یەككگرتوەكان هەناردەكردنی زیاتر لە شەش بڕگەی كەلوپەلی خۆشگوزەرانی بۆ كۆریای باكوور نایاساییكرد، لەوانە یۆت و سكوتەری سەر ئاو و ئۆتۆمبێلی پێشبڕكێ و ماتۆڕ و دی ڤی دی پلەیەر و تەلەفزیۆنی شاشە گەورەتر لە بیست و نۆ ئینج. چیتر هەناردەكردنی ملپێچی

ئاوریشم و پاندانی دیزاینکراو و فەروو و جانتای چەرم بۆ کۆریای باکوور نەما. ئەمانەش ئەو کەلوپەلانە بوون کە کیم و نوخبەکانی حیزبی کۆمیۆنیست مەراقی کۆکردنەوەیان بوو. باسکارێك بڕی فرۆشتنەکانی کۆمپانیای هێنەسی فەڕەنسی بەکارهێنا بۆ مەزەندەکردنی بودجەی ساڵانەی کیم بۆ کڕینی کۆنیاك، پێش ئابلۆقەکە. ئەو بودجەیە گەیشتبوە نزیکەی ٨٠٠,٠٠٠ دۆلاری ئەمەریکی.

تێگەیشتن لە بارودۆخی هەژارترین ناوچەکانی جیهان لە کۆتایی سەدەی بیستەم دا ئەستەمە بەبێ تێگەیشتن لە سیستەمی ڕەهایی نوێی سەدەی بیستەم: کۆمیۆنیزم، دیدی مارکس، سیستەمێك بوو بۆ هێنانەئارای خۆشگوزەرانی لە چوارچێوەی بارودۆخێکی مرۆڤانەتر و دوور لە نایەکسانییەوە. لینین و حیزبە کۆمیۆنیستەکەی لەژێر کاریگەری مارکس دا بوون، بەڵام پراکتیزەکردنی ئەو دیدە زۆر جیاواز بوو لە تیۆرییەکە. شۆڕشی بۆڵشەڤیکی ساڵی ١٩١٧، ڕووداوێکی خوێناوی بوو، هیچ ڕوویەکی مرۆڤانەی نەبوو. یەکسانی بەشێك نەبوو لە هاوکێشەکە، چونکە یەکەم شت کە لینین و دەستوپێوەندەکانی کردیان بریتیبوو لە دروستکردنی نوخبەیەکی نوێ، کە بۆخۆیان بوون، لە لوتکەی حیزبە بۆڵشەڤیکیەکەدا. بەم کارەیان نەك تەنیا توخمە نا کۆمیۆنیستەکانیان کوشت و کەسانی دژی خۆیان لەناوبردن، بەڵکو ئەو کۆمیۆنیستانەشیان کوشت و لەناوبرد کە هەڕەشە بوون بۆ سەر دەسەڵاتەکەیان. بەڵام تراژیدیای ڕاستەقینە دواتر سەریهەڵدا: یەکەمجار لە کاتی جەنگی ناوخۆدا و دواتر لە کاتی دامەزراندنی کێڵگە هەرەوەزییەکانی سەردەمی ستالین دا، کە بوە هۆی کوشتنی نزیکەی چل ملیۆن کەس. کۆمیۆنیزمی ڕوسیا دڕندە و سەرکوتکار و خوێناوی بوو، بەڵام دەگمەن نەبوو. ئاکامە ئابووری و ئازارە مرۆییەکان بە تەواوی هاوشێوەی ئەوە بوون لە شوێنانی تریش ئەنجامدران ـ بۆ نموونە، لە کەمبۆدیا لە ساڵانی ١٩٧٠ کان دا لە سایەی حوکمی خومێر ڕوج و لە چین و لە کۆریای باکووردا. لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا کۆمیۆنیزم دیکتاتۆریەتی دڕندە و پێشێلکردنی فراوانی مافی مرۆڤی هێنایەئاراوە. لە پشت ئەم مەینەتی و کوشتارەوە، ڕژێمە کۆمیۆنیستەکان هەموویان جۆری جیاوازی دەزگایانی چەوسێنەریان دامەزراند. دەزگا ئابوورییەکان بە بوون یان نەبوونی بازاڕەکان وا دیزاین کران تا دەرامەتەکان لە خەڵك دەرکێشن و لە ڕێگەی مافی موڵکداری نەخوازراوەوە، ئەوان لە بری

خۆشـگوزەرانی هـەژارییان دروسـتکرد. لـە حاڵـەتی سـۆڤیەت دا، هـەروەك لـە چاپتەری پێنجەم دا بینیمان، سیستەمی کۆمیۆنیستی لە سەرەتادا گەشەیەکی خێرای ئەنجامدا، بەڵام دواتر خاو بۆوە و لە ئەنجامدا چەقیبەست. ئاکامەکان لە چین دا لە سایەی حوکمی ماودا و لە کەمبۆدیا لە سایەی حوکمی خـومێر ڕوج و لە کۆریای باکوور دا، وێرانکار تر بوون و دەزگا ئابوورییە کۆمیۆنیستەکانی ئەم وڵاتانە بوونە هۆی دارمانی ئابووری و بڵاوبوونەوەی برسێتی.

دەزگـا ئابوورییـە کۆمیۆنیـستەکانیش لـە لایـەن دەزگایـانی سیاسـی چەوسـینەرەوە پـشتگیریکران کـە هـەموو دەسـەڵاتەکانیان لـە چـنگی حیزبـە کۆمیۆنیـستەکان دا چـڕکردبۆوە و هـیچ جڵەوگیرییـەکیان نەخـستبوە سـەر پیـادەکردنی ئـەم دەسـەڵاتە. هەرچـەندە ئەمانـە لـە ڕوخـساردا دەزگایـانی چەوسێنەری جیـاواز بـوون، بـەڵام لـە ڕووی کاریگەرییانـەوە لەسـەر گـوزەرانی خەڵك هاوشێوەی دەزگایانی چەوسێنەری زیمبابۆی و سیارا لیۆن بوون.

## پاشای پەموو

لۆکـە(پـەمو) نزیکـەی ٪٤٥ی هـەناردەکانی ئۆزبەکـستان پێکـدەهێنێ و بەمـەش، لـەو کاتـەوە وڵاتەکـە دوای هەڵوەشـاندنەوەی یـەکێتی سـۆڤیەت لـە ساڵی ١٩٩١ دا سەربەخۆیی بەدەستهێنا، بۆتە گرنگترین بەروبومی کـشتوکاڵی. لـە سـەردەمی سـۆڤیەتی کۆمیۆنیـست دا هـەموو زەوییـە کـشتوکاڵییەکان لـە ئۆزبەکستان دا لە ژێردەستی ٢،٠٤٨ کێڵگەی دەوڵەتی دا بوون. ئەم کێڵگانە لە دوای سـاڵی ١٩٩١دا هەڵوەشـێنرانەوە و زەوییـەکان دابەشـکران. بـەڵام ئەمـە مانای ئەوە نـەبوو کـە جووتیـاران دەیـانتوانی سـەربەخۆ کاربکـەن. لۆکە، بـۆ یەکەم سەرۆك و، تـا ئێستاش تـەنیا سـەرۆکی حکومـەتی نـوێی ئۆزبەکـستان، ئیسماعیل کەریمۆڤ، بایەخی لە ڕادەبەدەری هەبوو. لە بری ئـەوەی جووتیـاران لە کارەکانیـان دا سـەربەخۆ بـن، ڕێنمـایی دەرکـرا کـە بـۆ دیـاریکردنی ئـەوەی جووتیاران دەیانچاند و بە چەندیشی بفرۆشن. لۆکە هەناردەیەکی پڕبایـەخبوو، بەڵام جووتیاران تەنیا بەشێکی کەمی نرخی جیهانی فرۆشتنی لۆکەیان دەدرایە و باقیەکەی هەمووی بۆ حکومەت بوو. کـەس بـەو نرخـە ئامـادە نـەبوو پـەموو

بـچێنێ، بۆیـە حکومـەت بـەزۆر ئەمـەی پێکـردن. ئێـستا هـەموو جووتیارێـك پێویستە ٪٣٥ی زەوییەکەی تـەرخانبکا بـۆ پـەموو. ئەمـەش چـەندین کێشەی دروستکرد، کێشەی ئامێرەکـان یـەکێك بـوو لەوانـە. لـە کـاتی سـەربەخۆبوونی ئۆزبەکـستان دا، نزیکـەی ٪٤٠ بـەروبومی پـەموو بـە هـۆی کۆمباینـەوە دروێنەدەکرا. دوای ساڵی ١٩٩١، بە لەبەرچاوگرتنی ئـەو هاندانانـەی ڕژیمەکـەی کەریمۆڤ بۆ جووتیارانی دەستەبەرکرد، جێگەی سەرسورمان نییە جووتیارەکان ئامادەنەبوون ئەم ئامێرانـە بکـڕن یـان بیانپـارێزن. کـاتی کـەریمۆڤ دەرکـی بـە کێشەکە کرد، چارەسەرێکی دۆزییەوە، لە راسـتیدا چارەسـەرێکی هـەرزانتر لـە بەکارهێنانی کۆمباین: بەکارهێنانی منداڵانی قوتابخانە.

کـەلوەکانی پـەمو لـە سـەرەتای ئـەیلول دا پێدەگـەن و ئامـادە دەبـن بـۆ لێکردنـەوە، لـە هـەمان ئەوکاتـەی منـداڵان دەگەڕێنـەوە قوتابخانـە. کـەریمۆڤ فەرمانیدەرکرد بۆ هەموو پارێزگارەکان بۆ دیـاریکردنی بـڕی ئـەو پـەموەی کـە هەریـەك لـە قوتابخانـەکان دەبوایـە بیاندروایەتـەوە. لـە سـەرەتای ئـەیلول دا قوتابخانـەکان خاڵیـدەکرێن لـە ٢,٧ ملیـۆن قوتـابی (ژمـارەی سـاڵی ٢٠٠٦). مامۆستاکان دەبنە پەیداکارانی کرێکار. گوڵناز کـە دایکـی دوو لـەم منداڵانەیـە، بەم شێوەیە باسیدەکا:

*(لە سـەرەتای هـەموو ساڵێکی خوێنـدن دا، کـە دەکاتـە دەوری سـەرەتای ئـەیلول، وانـە ووتنـەوە لـە پۆلـەکان دا ڕادەگـیرێ و لـە بـڕی خوێنـدن منـداڵان دەنێرێن بۆ دروێنەی پەموو. کـەس داوای ڕەزامەنـدی دایکیوباوکـان ناکـا. ئـەو منداڵانە پشووی کۆتایی حەفتەیان نییە (لە کـاتی وەرزی دروێنـەی پـەموو دا). ئەگەر منداڵێك لە بـەر هـەر هۆیـەك بـێ لـە ماڵـەوە مایـەوە، مامۆستاکەی یـان چاودێری پۆلەکەی دێتە ماڵەوە و سەرزەنشتی دایکیوباوکەکەی دەکەن. ئـەوان پلانێك بـۆ هەریـەك لـەو منداڵانـە دادەنـێن کـە بریتییـە لـە دروێنـەی ٢٠ تـا ٦٠ کیلۆگرام پەموو لە هەر ڕۆژێك دا، بـە پێـی تەمـەنی منداڵەکـە. ئەگـەر منـداڵێك نەیتوانی ئـەم پلانـە جێبـەجێبکا، ئـەوا بـەیانی ڕۆژی دواتـر، لەبـەردەم هـەموو پۆلەکەدا سەزەنشتدەکرێ).*

دروێنـەی پـەموو دوو مـانگ دەخایـەنێ. منـداڵانی لادێکـان بـەختیان هەیـە چونکە ئەوان دەنێرێنە ئەو کێڵگانەی لە ماڵەکانیانەوە نزیکن و دەتوانن بـە پـێ یان بە پاس بگەنە شوێنی کارەکانیان. ئەو منداڵانەی لە دوورەوە دێـن یـان لـە

ناوچە شارییەکانەوە دێن، دەبێ لە شوێنی هەڵگرتنی کەلوپەل وکۆگاکان دا لەگەڵ ئامێر و ئاژەڵەکان دا بنوون. هیچ تەوالێت و چێشتخانەیەك لەو شوێنانەدا نییە. دەبێ منداڵان خواردنی ژەمی نیوەڕۆی خۆیان لەگەڵ خۆیان دا بهێنن.

سوودمەندی سەرەکی ئەم هەموو کارە زۆرەملێیانە، نوخبە سیاسییەکەن بە سەرکردایەتی سەرۆك کەریمۆڤ، پاشای ئەمری واقیعی هەموو پەمووی ئۆزبەکستان. گوایە قوتابیەکان پارەیان دەدرێتێ بەرامبەر کارەکانیان، بەڵام تەنیا گوایە. لە ساڵی ٢٠٠٦ دا، کاتێك نرخی جیهانی پەموو بریتیبوو لە ١,٤٠ دۆلاری ئەمەریکی بۆ یەك کیلۆ پەموو، منداڵەکان تەنیا ٠,٠٣ دۆلاریان پێدەدرا بۆ ئەو برەی دەبوایە ڕۆژانە بیاندروویاتەوە کە بیست تا شەست کیلۆ بوو. ڕەنگە ئێستا ٧٥٪ بەروبومەکانی پەموو لە لایەن منداڵانەوە لێبکرێتەوە. لە بەهاردا، قوتابخانە بە زۆر دادەخرێ بۆ پاچەکۆڵە و بژارکردن و شەتڵ ڕواندن.

ئایا چۆن ئاکامەکە بەمە گەیشت؟ ئۆزبەکستان، وەك کۆمارە سۆشیالیستەکانی تری سۆڤیەت، دەبوایە دوای هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت سەربەخۆیی خۆی بەدەستبهێنایە و ئابووری بازاڕ و دیموکراسی پەرەپێبدایە. هەروەك لە چەندین کۆماری تری سۆڤیەت دا ئەمە ئەوە نەبوو کە ڕوویدا. سەرۆك کەریمۆڤ، کە پیشەی سیاسی خۆی لە ناو حیزبی کۆمیۆنیستی یەکێتی سۆڤیەتی کۆن دا دەسپێکرد، لە کاتێکی گونجاودا گەیشتە پۆستی سکرتێری یەکەمی ئۆزبەکستان لە ساڵی ١٩٨٩ دا، لەو دەمەدا کە دیواری بەرلین دەڕوخێنرا، توانی خۆی وەك کەسێکی ناسیۆنالیست دابڕێژێتەوە. بە هاوکاری گرنگی هێزە ئەمنییەکان، لە ساڵی ١٩٩١ دا یەکەم هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە ئۆزبەکستان دا بردەوە. دوای دەسەڵات گرتنەدەست کەوتە گیانی حیزبە ئۆپۆزیۆسۆنە سەربەخۆکان. بەرهەڵستکاران یان خرانە بەندیخانەوە یان ئاوارەی دەرەوە بوون. میدیای ئازاد لە ئۆزبەکستان دا نییە و ڕێکخراوانی ناحکومی ڕێگەیان پێنادرێ. سەرکوتکردنی چڕ لە ساڵی ٢٠٠٥ دا گەیشتە لوتکە، کاتێك ٧٥٠ و ڕەنگە زیاتریش لە خۆپیشاندەران لە لایەن پۆلیس و سوپاوە لە ئەندیجۆن کوژران.

بە سوودوەرگرتن لە دەسەڵاتی بەسەر هێزە ئەمنییەکان و کۆنترۆڵکردنی تەواوی میدیا، کەریمۆڤ یەکەمجار ماوەی سەرۆکایەتییەکەی لە ڕێگەی

ڕاپرسییەکەوە بۆ پێنج ساڵ درێژکردەوە دواتریش لە ساڵی ٢٠٠٠ بۆ ماوەی حەوت ساڵی تر هەڵبژێرایەوە و ٪٩١,٢ دەنگەکانی بەدەستهێنا. تاکە ڕکابەرەکەی ڕایگەیاند کە ئەویش دەنگیداوە بە کەریمۆڤ. لە هەڵبژاردنەوەی ساڵی ٢٠٠٧ دا، کە بە گشتی وەك هەڵبژاردنێکی ساختە درایەقەڵەم، کەریمۆڤ ٪٨٨ دەنگەکانی بەدەستهێنا. هەڵبژاردنەکان لە ئۆزبەکستان دا هاوشێوەی ئەو هەڵبژاردنانەن کە جۆزیف ستالین لە سەردەمی هەڕەتی یەکێتی سۆڤیەت دا ڕێکیدەخستن. یەکێك لەو هەڵبژاردنانە لە ساڵی ١٩٣٧ دا ئەنجامدرا و لە لایەن پەیامنێری نیویۆرك تایمز، هارۆڵد دێنی، ڕومالکرا کە ووتارێکی وەرگێڕاوی پراڤدای ڕۆژنامەی حیزبی کۆمیۆنیستی بەکارهێنا لە ڕومالکردنەکەدا. ووتارەکەی پراڤدا بە مەبەستی پیشاندانی شادی و بێئۆقرەیی کاتی هەڵبژاردنەکانی یەکێتی سۆڤیەت نووسرابوو.

*(نیوەشەو هات. دوازدەی کانونی یەکەم، ڕۆژی یەکەم هەڵبژاردنی گشتی، یەکسان و ڕاستەوخۆ بۆ ئەنجومەنی باڵای سۆڤیەت، کۆتاییهات. ئەنجامی دەنگدانەکە خەریکە ڕادەگەیەنرێ.*

*کۆمسیۆن بە تەنیا لە ژوورەکەی دا ماوەتەوە. بێدەنگە و گڵۆپەکان بە شکۆوە شەوقدەدەنەوە. لە گەرمەی گوێگرتن و چاوەڕوانی دا سەرۆکی کۆمسیۆن هەموو کارە فەرمییەکان تەواودەکا بەر لە بژاردنی فۆڕمەکان ـ بەپێی لیست ووردبینیدەکا چەند کەس مافی دەنگدانیان هەبوە و چەند کەس دەنگیداوە ـ و ئەنجامەکەش سەد لە سەدە، سەد لە سەد! چ هەڵبژاردنێك و لە چ ووڵاتێك دا و بۆ چ پاڵێوراوێك بە پیرەوەچونی سەد لە سەد هەیە؟*

*کاری سەرەکی ئێستا دەستپێدەکا. سەرۆك بە شادییەوە مۆری سەر سندوقەکان دەپشکنێ. دوای ئەویش ئەندامانی کۆمسیۆنیش دەیانپشکنن. مۆرەکان دەسکارینەکراون و لێدەکرێنەوە.. سندوقەکان دەکرێنەوە.*

*بێدەنگییە. ئەوان، چاودێران و ڕاپەڕێنەرانی هەڵبژاردن بە جدی و گوێڕایەڵییەوە دادەنیشن.*

*ئێستاش کاتی کردنەوەی زەرفەکانە. سێ ئەندامی کۆمسیۆن مقەست دەگرنەدەست، سەرۆك هەڵدەستێ. ئەوانەی دەنگەکان تۆماردەکەن، پەڕاوەکانیان ئامادەیە. یەکەم زەرف دەکرێتەوە. هەموو چاوەکان دەڕواننە ئەو زەرفە. سەرۆك دوو فۆرم دەردەهێنێ ـ سپی (بۆ پاڵێوراوی سۆڤیەتی*

*یەکێتیەکە) و شین (بۆ سۆڤیەتی نەتەوەکان) و بە دەنگی بەرز و بە ڕوونی دەخوێنێتەوە "هاوڕێ ستالین"*

*یەکسەر بێدەنگیەکە دەشکێنرێ. هەر هەموو ئەوانەی لە ژوورەکەدان ڕاستدەبنەوە و بە شادی و بە لێزمە دەکەونە چەپڵەلێدان بۆ یەکەم فۆرمی دەنگدانی یەکەم هەڵبژاردنی گشتی نهێنی لە سایەی دەستووری ستالینی دا- فۆرمێك کە ناوی دامەزرێنەری دەستوورەکەی لەسەر تۆمارکراوە).*

ئەم مەزاجە، چاوەڕوانیی کاتی هەڵبژاردنەوەی کەریمۆڤ دێنێتە بەرچاو، کە وەك قوتابییەکی گوێڕایەڵی ستالین دەردەکەوێ ئەوەندەی پەیوەندی بە سەرکوتکردن و کۆنترۆڵی سیاسییەوە هەبێ و پێدەچی جۆرە هەڵبژاردنێك ئەنجامبدا کە لەگەڵ ئەوانەی ستالین دا لەسوریالیزم دا ڕکابەربن.

لە سایەی کەریمۆڤ دا ئۆزبەکستان بۆتە وڵاتێکی خاوەن دەزگایانی سیاسی و ئابووری یەکجار چەوسێنەر. هەژاریشە. ڕەنگە یەك لەسەر سێی دانیشتوان لە هەژاری دا بژین و تێکڕای داهاتی ساڵانە نزیکەی ١٠٠٠ دۆلاری ئەمەریکییە. هەموو نیشاندەرەکانی پەرەپێدان خراپ نین. بە پێی داتای بانکی جیهانی، تۆماری چوونە قوتابخانە ١٠٠٪ ... باشە، بەڵام ڕەنگە تەنیا لە وەرزی دروێنەی پەمووەدا نەبێ. خوێندەواری لە ئاستێکی بەرزدایە، هەرچەندە جگە لە کۆنترۆڵکردنی هەموو میدیا، ڕژێم کتێبەکان قەدەخەدەکا و چاودێری ئینتەرنێت دەکا. لە کاتێك دا زۆربەی خەڵك ڕۆژانە تەنیا چەند سێنتێکی کەمیان پێدەدرێ بۆ چنینی پەموو، خێزانەکەی کەریمۆڤ و کادیرە کۆمیۆنیستە کۆنەکان کە دوای ساڵی ١٩٨٩ وەك نوخبەی نوێی ئابووری و سیاسی ئۆزبەکستان خۆیان ڕێکخستەوە، یەکجار دەوڵەمەندبوون.

بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی خێزانی کەریمۆڤ لە لایەن گۆڵنۆرای کچی کەریمۆڤەوە بەڕێوەدەبرێن کە چاوەڕێدەکرێ وەك سەرۆك جێگەی باوکی بگرێتەوە. لە وڵاتێکی هێندە ناشەفاف و نهێنیپارێز دا، کەس نازانێ بنەماڵەی کەریمۆڤ کۆنترۆڵی چی دەکەن و چەند پارەیان دەستدەکەوێ، بەڵام ئەزموونی کۆمپانیای ئینتەرسپانی ئەمەریکی ئەوە دەردەخا کە لە ماوەی بیست ساڵی ڕابووردودا چی لە ئابووری ئۆزبەك دا ڕوویداوە. پەموو تەنیا بەروبومی کشتوکاڵی نییە، هەندێك ناوچەی وڵات شوێنی نموونەیین بۆ بۆ چاندنی چا. بۆیە ئینتەرسپان بڕیاریدا لەو بوارەدا وەبەرهێنان بکا. تا ساڵی ٢٠٠٥،

ئینتەرسپان بوە خاوەنی ٣٠٪ بازاڕی ناوخۆی چا، بەلاّم دواتر تووشی کێشە بوو. گوڵنۆرا ئەو بڕوایەی لا دروستبوو کە پیشەسازی چا لە ڕووی ئابوورییەوە داهاتوویەکی باشی دەبێ. هەر زوو دوای ئەوە فەرمانبەرانی ناوخۆیی ئینتەرسپان تووشی گرتن و لێدان و ئەشکەنجەدان بوون. مەحاڵ بوو لەو کەشەدا بەردەوامی بە کارەکان بدرێ و لە ئابی ساڵی ٢٠٠٦ دا کۆمپانیاکە ئۆزبەکستانی بەجێهێشت. هەموو ئەو کەلوپەل و ئامێر و موڵکانەی هی کۆمپانیاکە بوون لە لایەن پارێزەرانی بەرژەندییەکانی بنەماڵەی کەریمۆڤ لە بواری بازرگانی چا دا دەستیان بەسەردا گیرا و ئەو بنەماڵەیە بوونە خاوەنی ٦٧٪ی بازاڕی چا، لە کاتێك دا دوو ساڵ لەوەبەر خاوەنی تەنیا ٢٪ ی بازاڕەکە بوون.

لە زۆر ڕووەوە، ئۆزبەکستان وەك پاشماوەیەکی ڕابوردوو، سەردەمێکی لە بیرکراو وایە. وولاتێکە لە ژێر حوکمی ڕەهای تەنیا خێزانێك و دەستوپێوەندەکانی دەوریان و ئابوورییەکی پشتبەستوو بە کاری زۆرەملێ - لە راستیدا کاری زۆرەملێ بە منداڵان، دا دەناڵێنێ. ئەمە بەشێکە لە مۆزایکی ئەو کۆمەڵگایانەی لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا شکستدەهێنن و بەداخەوە لێکچوونی زۆری هەیە لەگەڵ کۆمارە سۆشیالیستەکانی پێشووی سۆڤیەت دا، هەر لە ئەرمینیا وە تا ئازربایجان و کیرگستان و تاجیکستان و ئەوەمان بیردەخاتەوە کە تەنانەت لە سەدەی بیست و یەکەمیش دا دەزگایانی ئابووری و سیاسی چەوسێنەر دەتوانن شێوازی دڕندانەی بێشەرم پەیڕەوبکەن.

## هێشتنەوەی مەیدانی گەمە بە لێژی

ساڵانی نەوەدەکان سەردەمی چاکسازی بوو لە میسردا. لەو کاتەوە کە کۆدێتایەکی سەربازی، پاشایەتی لە ساڵی ١٩٥٤ دا لەسەر دەسەلاّت لابرد، میسر وەك کۆمەڵگایەکی نیمچە سۆشیالیستی بەڕێوەبرابوو کە حکومەت ڕۆڵی ناوەندی هەبوو لە بەڕێوەبردنی ئابووری دا. چەندین کەرتی ئابووری لە لایەن کۆمپانیاکانی دەوڵەتەوە کۆنترۆڵکرابوون. بە تێپەڕبوونی کات بانگەشەی سۆشیالیزم کاڵبۆوە و بازاڕەکان کرانەوە و کەرتی تایبەت پەرەیسەند، بەلاّم

ئەمانە بازاڕی کراوە نەبوون، بەڵکو بازاڕێك بوون لە لایەن دەوڵەت و ژمارەیەکی کەم لە بزنسمانانی لایەنگری حیزبی نیشتمانی دیموکراسی (NDP)یەوە کۆنترۆڵکرابوون، ئەو حیزبە سیاسییەی لە لایەن سەرۆك ئەنوەر سادات لە ساڵی ۱۹۷۸ دا دامەزرا. لە سەردەمی حکومەتەکەی موبارەك دا تا دەهات بزنسمانەکان زیاتر تێکەڵی حیزب دەبوون و حیزبیش زیاتر تێکەڵی ئەوان دەبوو. موبارەك کە لە ساڵی ۱۹۸۱ دا دوای تیرۆرکردنی ئەنوەر سادات بوە سەرۆك، لەگەڵ (NDP) حوکمیکرد تا لە ڕێگەی نارەزایی جەماوەر و سوپاوە لە شوباتی ساڵی ۲۰۱۱ دا لە دەسەڵات دوورخرایەوە، هەورەك لە پێشەکییەکەدا باسمانکرد.

کەسانی سەرەکی خاوەن بزنس لە پۆستی گەورەی حکومەت دا و لەو بوارانەدا کە پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیان دا هەبوو، دامەزران. ڕەشید محەمەد ڕەشید سەرۆکی پێشووی یونیلیڤەر ئەمیت AMET_ (African، Middle East and Turkey ) بوە وەزیری پیشەسازی و بازرگانی دەرەوە، موحەمەد زوهەیر وەحید جرانە، خاوەن و بەڕێوەبەری جێبەجێکاری یەکێك لە گەورەترین کۆمپانیاکانی میسر، بوە وەزیری گەشتوگوزار، ئەمین ئەحمەد موحەمەد عوسمان ئەبازا، دامەزرێنەری کۆمپانیای بازرگانی پەموو، گەورەترین کۆمپانیای هەناردەکردنی پەموو لە میسردا، بوە وەزیری کشتوکاڵ.

لە چەندین کەرتی ئابووری دا، بزنسمانەکان حکومەتیان ڕازیکرد بۆ سنووردارکردنی بەشداریکردن لەو کەرتانەدا لە ڕێگەی ڕێنمایی دەوڵەتەوە. لەم کەرتانەش کەرتی میدیا و ئاسن و پۆلا و پیشەسازی ئۆتۆمبێل و خواردنەوە کهولییەکان و چیمەنتۆ. هەریەك لەم کەرتانە لە چەند دەستێکی کەم دا چڕکرابۆوە لەگەڵ دانانی کۆسپ لەبەردەم هاتن ناوەوە بە مەبەستی پاراستنی ئەو بزنسمان و کۆمپانیایانەی خاوەن پەیوەندی سیاسی بوون. بزنسمانە گەورەکانی نزیکی ڕژێم، وەك ئەحمەد عیز (ئاسن و پۆلا) بنەماڵەی سوێرس (مەلتیمیدیا و خواردنەوە کهولییەکان و گواستنەوە تێلیکۆمیونیکەیشن) و موحەمەد نەسیر (خواردنەوە کهولییەکان و تێلیکۆمیونیکەیشن)، نەك تەنیا لە لایەن دەوڵەتەوە پارێزران، بەڵکو گرێبەست و قەرزی گەورەی بانکیان پێدرا بەبێ دانانی هیچ بارمتەیەك لە بەرامبەر قەرزەکانیان دا. ئەحمەد عیز سەرۆکی

کۆمپانیای پۆڵای عیز، گەورەترین کۆمپانیای پیشەسازی پۆڵا لە وڵات دا و بەرهەمهێنەری ٪٧٠ پۆڵای میسر و لە هەمانکات دا ئەندامێکی پایەبەرزی حیزبی (NDP) و سەرۆکی کۆمیتەی پلاندانان و بودجەی ئەنجوومەنی گەل و هاوکارێکی نزیکی جەمال موبارەك، یەکێك لە کورەکانی سەرۆك موبارەك، بوو.

ئامانجی چاکسازییە ئابوورییەکانی ساڵانی نەوەدەکان کە لە لایەن دەزگا داراییە نێودەوڵەتی و ئابووریناسەکانەوە پێشنیازکرا، بریتیبوو لە کردنەوەی بازاڕەکان و کەمکردنەوەی ڕۆڵی دەوڵەت لە ئابووری دا. کۆڵەکەیەکی سەرەکی ئەم جۆرە چاکسازییانە لە هەموو شوێنێك دا بریتییە لە بەتایبەتکردنی ئەو موڵکوماڵەی حکومەت خاوەنیانە. بەتایبەتکردن لە مەکسیك دا لە جیاتی زیادکردنی ڕکابەریی، مۆنۆپۆڵی دەوڵەتی گۆڕی بۆ مۆنۆپۆڵی تایبەت و لەم پرۆسەیەشدا ئەو بزنسمانانە دەوڵەمەندبوون کە خاوەن پەیوەندی سیاسی بوون، وەك کارلۆس سلیم. کوتومت هەمانشت لە میسر ڕوویدا. کەسانی خاوەن بزنسی نزیکی ڕژێم توانییان بە قورسی کاربکەنە سەر جێبەجێکردنی پرۆگرامی بەتایبەتکردن بۆ ئەوەی لە بەرژەوەندی نوخبە دەوڵەمەندەکەی بزنس کە لە میسر پێیان دەڵێن (حوتەکان) ئەنجامبدرێ. لەو کاتەوە بەتایبەتکردن دەستیپێکرد، ئابووری وڵات لە لایەن سی و دوو لەو حووتانەوە کۆنترۆڵکرا.

یەکێك لەو حووتانە ئەحمەد زەیات بوو، سەرۆکی گرووپی کۆمپانیاکانی لوکسۆر. لە ساڵی ١٩٩٦ دا حکومەت بڕیاریدا کۆمپانیای خواردنەوە کهولییەکانی ئەلئەهرام (ABC) بەتایبەت بکا کە خاوەن مۆنۆپۆڵی دروستکردنی بیرە بوو لە میسر. ئۆفەرێك لە لایەن کۆنسۆرتیۆمێکی کۆمپانیای بواری دارایی میسر پێشکەشکرا بە سەرۆکایەتی فەرید سەعد کە وەبەرهێنەرێکی بواری خانووبەرە بوو، لەگەڵ یەکەم کۆمپانیای ڤێنچەر کاپیتاڵی میسری کە لە ساڵی ١٩٩٥ دا لە میسر دامەزرابوو. فوئاد سوڵتان، وەزیری پێشووی گەشتوگوزار و موحەمەد نەسیر و موحەمەد ڕەجەب، کە بزنسمانێکی تری نوخبە بوو، لە کۆنسۆرتیۆمەکەدا بەشدار بوون. ئەم گرووپە خاوەن پەیوەندی بەهێز بوون، بەڵام پەیوەندییەکەیان بە ڕادەی پێویست بەهێز نەبوو. ئۆفەرەکەیان کە بڕی ٤٠٠ ملیۆن پاوەندی میسری بوو بە بیانووی ئەوەی زۆر نزم بوو، ڕەتکرایەوە. زەیات پەیوەندی بەهێزتری هەبوو. ئەو پارەی پێویستی

بـۆ کڕینــی (ABC) نــەبوو، بۆیــە ڕێگایــەکی زیرەکانــەی هاوشــێوەی ئــەوەی کارلۆس سلیمی دۆزییەوە. پشکەکانی ABC بۆ یەکەمجار لە بۆرسەی لەنـدەن دا خرانەڕوو بۆ فرۆشتن و گروپی لوکسۆر ٧٤,٩٪ ی پشکەکانی کڕی بـە نرخـی ٦٨,٥ پاوەندی میسری بۆ هەر پشکێك. سێ مانگ دواتـر پـشکەکان کرانـە دوو کەرتەوە و گروپی لوکسۆر تـوانی هـەموویان بـە نرخـی ٥٢,٥ پاوەنـد بـۆ هـەر پشکێك بفرۆشی، بەمـەش ٣٦٪ قـازانجی دەسـتکەوت و زەیـات تـوانی مانگێـك دواتر بەم قازانجە پارەی کڕینـی ABC بدا کـە ٢٣١ ملیـۆن پاوەنـد بـوو. لـەو کاتەدا، ABC سـالانە نزیکـەی ٤١,٣ ملیـۆن پاوەنـدی میـسری قازانجدەکرد و یەدەکی کاشی کۆمپانیاکە بریتیبوو لە ٩٣ ملیۆن پاوەندی میسری. زۆر هەرزان دەســتیکەوت. لــە ســالّی ١٩٩٩ ABC تــازە بەتایبــەتکراو مۆنۆپۆلّییەکــەی فراوانکـرد لــە بــیرەوە بـۆ شــەراب لــە ڕێگــەی کڕینــی کۆمپانیــای نیـشتمانی بەتایبەتکراوی خاوەن مۆنۆپۆلی لە بـواری شـەراب دا کـە کۆمپانیـای جنـاکلیس بوو. جناکلیس کۆمپانیایەکی زۆر قازانجهێنەر بوو، بەهۆی ئـەو گومرگـە زۆرەی کە ٣,٠٠٠٪ بوو خرابوە سەر شەرابی هاوردەکراو قازانجی زۆری دەکرد و ئەوەی دەیفرۆشــت ٧٠٪ی قــازانجبوو. لــە ســالّی ٢٠٠٢ دا مۆنۆپۆلییەکــە جــارێکیتر دەستاودەستیکرد، کاتێك زەیـات ABC فرۆشت بـە هاینـەکن بـە ١,٣ ملیـارد پاوەندی میسری. لە سەدا پێنج سەدو شەست و سـێ قـازانج لـە مـاوەی پێـنج سالّ دا.

موحەمەد نەسـیر هەمیشە لەبـەری دۆڕاوان نـەبوو. لـە سـالّی ١٩٩٣ دا ئـەو کۆمپانیای ئەلنەسری بوتـلّ پرکردنـەوەی کـڕی کـە مـافی مۆنۆپـۆلی هـەبوو بـۆ پڕکردنەوە و فرۆشتنی کۆکا کۆلا لە میـسر. پەیوەنـدی نەسـیر لەگـەلّ وەزیـری کەرتی بزنسی گشتی ئەو کاتەدا عاتف عابـد ڕیگـای بـۆ خۆشـکرد کڕینەکـە بـە ڕکابەرییەکی کەمەوە ئەنجامبدا. دوای دوو سالّ نەسیر کۆمپانیاکەی فرۆشت بە سـێ ئەوەنـدەی نرخـی کڕینەکـە. نموونەیـەکی تـر بریتیبـوو لـە هەولّـدان بـۆ ڕاکێـشانی کـەرتی تایبـەت بـۆ نـاو پیـشەسازی سینەمای دەولّـەت. دیـسانەوە پەیوەندییە سیاسییەکان بوونە هۆی ئەوەی تەنیا دوو بنەمالّە ڕێگایان پێبـدرێ ئۆفـەر پێـشکەشبکەن و سـینەماکان ئیـشپێبکەن ــ یـەکێك لەمانـە بنەمالّـەی سوێرس بوو.

میسر ئەمڕۆ نەتەوەیەکی هـەژارە ــ هێنـدەی ئـەو وولاتانـە هـەژار نییـە کـە

دەکەونە باشووری بیابانی ئەفریقی یەوە، بەڵام تا ئێستاش وڵاتێکە کە ٪٤٠ دانیشتوانی زۆر هەژارن و لەسەر کەمتر لە دوو دۆلار لە رۆژێک دا دەژین.
سەیرە، هەروەك پێشووتر بینیمان، میسری سەدەی نۆزدەیەم شوێنی هەوڵێکی لە سەرەتادا سەرکەوتوو بوو بۆ گۆڕانکاری دەزگایی و نوێکردنەوەی ئابووری لە سەردەمی موحەمەد عەلی دا کە توانی ماوەیەك گەشەکردنی ئابووری لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا بهێنێتەئاراوە پێش ئەوەی بخرێتە سەر ئیمپراتۆریەتی بەریتانی. لە سەردەمی کۆلۆنیالی بەریتانی دا کۆمەڵێك دەزگایانی چەوسێنەر سەریانهەڵدا و لە لایەن سوپاوە دوای ساڵی ١٩٥٤ بەردەوامییان پێدرا. هەندێك گەشەکردنی ئابووری و وەبەرهێنان لە پەروەردەدا کرا، بەڵام زۆرینەی دانیشتوان دەرفەتی ئابووری کەمیان هەبوو، لە کاتێك دا نوخبە تازەکە دەیانتوانی سوود لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ حکومەت دا وەربگرن.

ئەم دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرانە دیسانەوە لە لایەن دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر پشتگیریکران. سەرۆك موبارەك پلانیدانا بۆ دامەزراندنی حوکمی بنەماڵەیی و جەمالی کوڕی هێنایەپێش تا جێگەی بگرێتەوە. پلانەکەی بەهۆی دارمانی رژێمە چەوسێنەرەکەی لە سەرەتای ساڵی ٢٠١١ دا شکستیهێنا لە ئەنجامی نارەزایی و خۆپیشاندانی فراوانی خەڵك لەکاتی، ئەوەی پێیدەوترێ بەهاری عەرەبی دا. لەو ماوەیەدا کە ناسر سەرۆك بوو، هەندێك شێوازی کراوەی دەزگایانی ئابووری هەبوون و دەوڵەت سیستەمی پەروەردەی کردەوە و هەندێك دەرفەتی رەخساند کە رژێمەکەی پێشووی فاروق پاشا نەیکردبوو. بەڵام ئەمە نموونەیەکی لێکدانی ناجێگیری دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر بوو لەگەڵ کرانەوەی دەزگایانی ئابووری دا.

ئاکامی حەتمی کە لە سەردەمی موبارەك دا سەریهەڵدا بریتیبوو لەوەی کە دەزگا ئابوورییەکان بوونە دەزگایانی چەوسێنەر تر کە ئەمەش رەنگدانەوەی دابەشکردنی دەسەڵات بوو لە ناو کۆمەڵگادا. لە هەندێك رووەوە بەهاری عەرەبی کاردانەوە بوو بەرامبەر بەمە. ئەمەش نەك تەنیا لە میسر بەڵکو بۆ تونسیش راستە. سیَ دەیە لە گەشەکردنی ئابووری لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا پیچەوانە بۆوە کاتێك بن عەلی و بنەماڵەکەی دەستیانکرد بە بەکارهێنانی زیاتری ئابووری بۆ بەرژەوەندی خۆیان.

# بۆچی نەتەوان شکستدەهێنن؟

نەتەوان لـە ڕووی ئابوورییـەوە شکستدەهێنن بـەهۆی دەزگایـانی ئـابووری چەوسێنەرەوە. ئەم دەزگایانە وولآتانی هەزار بە هـەژاری دەهێڵنـەوە و نایـەڵن ئـەو وولآتانـە بکەونـە سـەر ڕێگـای گەشـەکردنی ئـابووری. ئەمـە لـە ئـەفریقای ئەمڕۆدا ڕاستە، لە هەندێك جێگای وەك زیمبابۆی و سیارا لیۆن، لـە ئەمـەریکای باشوور لـە وولآتـانی وەك کۆلۆمبیـا و ئەرجـەنتین، لـە ئاسـیا لـە وولآتـانی وەك بـاکووی کۆریـا و ئۆزبەکـستان، لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت لـە وولآتـانی وەك میسریش هەر وایە. جیاوازی بەرچاو لەنێوان ئەم وولآتانەدا هەیە. هەندێکیان لە ناوچـەی مـەداری گەرمـدان و هەنـدێك لـە ناوچـە فێنکەکانـدان و هەنـدێك لـەم وولآتانە کۆلۆنی بەریتانیا بوون و ئەوانی تر کۆلۆنی یابـان و ئیـسپانیا و ڕوسـیا بوون. ئەم وولآتانە زمان و کەلتوور و مێژووی زۆر جیاوازیـان هەیـە. لـە هـەموو ئـەم حاڵەتانـەدا بناخـەی ئـەم دەزگایانـە بریتییـە لـە نوخبەیـەك کـە دەزگـا ئابوورییەکان بەشێوەیەك دیزاین دەکەن بـۆ ئـەوەی خۆیـان دەوڵەمەندبکـەن و درێـژە بەدەسـەڵاتیان بـدەن لەسـەر حـسابی زۆربـەی هـەرە زۆری خـەڵکی نـاو کۆمەڵگا. مێژوو و پێکهاتەی کۆمەڵایـەتی وولآتـەکان دەبنـە هـۆی جیـاوازی لـە سروشتی نوخبەکە و ووردەکارییەکانی دەزگا چەوسێنەرەکان دا، بەڵام هۆکاری ئەوەی کە بۆچی ئەم دەزگا چەوسێنەرانە بەردەوامدەبن هەمیشە پەیوەندی بە بازنەی ناهەمواریەوە هەیە و کاریگـەری ئـەم دەزگایانـە لـە ڕووی هـەژارکردنی هاوڵاتییانیانەوە هەمیشە هاوشێوەیە ـ تەنانەت ئەگەر خەسـتی ئەوکاریگەرییـە جیاوازی هەبێ.

بۆ نموونە، لە زیمبابۆی دا، نوخبەکە پێکهاتوە لە ڕۆبەرت مۆگابی و کرۆکـی ZANU - PF، کـە لـە ڕیـزی پێـشەوەی خـەباتی دژە کۆلۆنیـاڵی دا بـوون لـە ساڵانی ١٩٧٠ کان دا. لە باکووری کۆریا، ئەو نوخبەیـە بریتییـە لـە تاقمێك لـە دەوری کیم یۆنگ ئێڵ و حیزبی کۆمیۆنیست. لە ئۆزبەکستان بریتییە لە سەرۆك ئیـسماعیل کـەریمۆڤ و بنەماڵەکـەی و دەسـتوپێوەندەکانی سـەردەمی یـەکێتی سۆڤیەت. بێگومـان ئـەم گروپانـە زۆر لـە یـەکتر جیـاوازن و ئـەم جیاوازییانـە، لەگەڵ ئەو سیاسەت و ئابوورییانەی ئەمانە حوکمیدەکەن، مانای ئەوەیە کە ئەو شێوازە تایبەتەی دەزگا ئابوورییەکان پەیڕەویدەکەن جیاوازدەبێ. بۆ نموونـە،

لەبەر ئەوەی کۆریای باکوور لە ڕێگەی شۆڕشێکی کۆمیۆنیستییەوە دامەزرا، حوکمی یەك حیزبی، حیزبی کۆمیۆنیست وەك مۆدێلی سیاسی پەیڕەودەکا. هەرچەندە مۆگابی بانگهێشتی سوپای کۆریای باکووری کرد بۆ زیمبابۆی لە سالآنی ۱۹۸۰ کان دا بۆ قەلاچۆکردنی نەیارەکانی لە ماتابیل لاند، ئەم شێوە مۆدێلە بۆ دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر لە زیمبابۆی دا شیاو نییە. لە جیاتی ئەمە، لەبەرئەوەی لە ئەنجامی خەباتی دژە کۆلۆنیالی دا دەسەلاتی گرتەدەست، دەبێ مۆگابی حوکمەکەی لە دووتوێی هەڵبژاردنەکان دا بپێچێتەوە، هەرچەندە توانی بۆ ماوەیەك دەوڵەتی تاك حیزبی لە ژێر پەردەی دەستووردا پێکبهێنێ.

بە پێچەوانەوە، کۆلۆمبیا مێژوویەکی درێژی لە ئەنجامدانی هەڵبژاردن دا هەیە کە لە ڕووی مێژووییەوە دروستبوە بۆ بەشکردنی دەسەلات لە نێوان حیزبی لیبرالْ و کۆنزێرڤەتیڤ دا دوای سەربەخۆبوون لە ئیسپانیا. تەنیا سروشتی نوخبەکان جیاواز نین، بەڵکو ژمارەشیان جیاوازە. لە ئۆزبەکستان، کەریمۆڤ توانی دەستبگرێ بەسەر پاشماوەکانی یەکێتی سۆڤیەت دا کە ئامرازی بەهێزی دایە بۆ سەرکوتکردن و کوشتنی نوخبە ئەڵتێرنەتیڤەکان. لە کۆلۆمبیا، نەبوونی دەسەلاتی حکومەتی ناوەندی لە هەندێك ناوچەی وولآت دا بە شێوەیەکی سروشتی بوە هۆی دروستبوونی نوخبەیەکی زۆر پەرتەوازە تر – لە ڕاستیدا، ئەم پەرتەوازەییە بە ئەندازەیەکە کە هەندێجار یەکتر دەکوژن. لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا و سەرەڕای بوونی ئەم نوخبە و دەزگا سیاسییە جیاوازانە، ئەم دەزگایانە زۆرجار دەتوانن دەسەلاتی ئەو نوخبەیە بەهێز بکەن و بەرهەمیبهێننەوە کە دروستیکردوون. بەلآم هەندێجار ئەو ناکۆکییە ناوخۆییەی ئەم دەزگایانە دروستیدەکەن دەبنەهۆی ڕوخانی دەوڵەت، هەورەك لە سیارا لیۆن دا ڕوویدا.

هەروەك مێژووی جیاواز و پێکهاتەی کۆمەلایەتی جیاواز دەبنە هۆی ئەوەی کە ناسنامەی نوخبەکان و ووردەکارییەکانی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر جیاواز بن، بە هەمانشێوە ووردەکارییەکانی دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر کە نوخبەکان دروستیاندەکەن جیاوازن. لە کۆریای باکوور دا، ئامرازەکانی چەوسانەوە لە جانتا کۆمیۆنیستیەکە دا بە میرات مابوونەوە: هەڵوەشاندنەوەی موڵکداری تایبەت و بەڕێوەبردنی کێڵگەکان و پیشەسازی لە لایەن دەوڵەتەوە.

لــە میـسر، بارودۆخەکــە زۆر هاوشــێوە بــوو لــە ســایەی ئــەو ڕژێمــە سۆشیالیستییە ناسراوەی لە لایەن ناسرەوە دوای سـاڵی ١٩٥٢ دامـەزرا. ناسـر لایەنگری یەکێتی سۆڤیەت بـوو لـە جـەنگی ساردا و وەبەرهێنانـە بیانییـەکانی وەك کەنالی سویس کە هی بەریتانیا بوو زەوتکرد و بەشی هەرە زۆری ئـابووری وڵاتی خۆماڵیکرد. بەهەرحاڵ، بارووخەکە لە میسری ساڵانی ١٩٥٠ کان و ١٩٦٠ کان دا زۆر جیاواز بوو لە بارودۆخی کۆریای باکوور لە ساڵانی ١٩٤٠ کان دا. زۆر ئاسـانتر بـوو بـۆ کۆریـای بـاکوور ئابووریـیـەکی شـێوە کۆمیۆنیـستی ڕادیکـاڵ دابمەزرێنن، چـونکە توانیـان موڵکومـاڵی کـۆنی یابـان لـە کۆریـادا زەوتبکـەن و لەسەر بنەمای مۆدێلی ئابووری شۆڕشی چین ئابووری خۆیان دابمەزرێنن.

بـە پێـچەوانەوە، شۆڕشـی میـسر زیـاتر کۆدێتایـەك بـوو لـە لایـەن گروپێـك لەئەفسەرانی سەربازییەوە. کاتێك میسر لە جـەنگی سـاردا سـەنگەری گـۆڕی و بـوە لایـەنگری ڕۆژئـاوا، تـا ڕادەیـەك ئاسـان و لـە هەمانکاتیـشدا دەرفـەتێکی هەلپەرستانە بوو بۆ سوپای میسر بۆ ئەوەی خۆی لە ئابوورییەکی فەرمانـدەیی ناوەندییـەوە بگـۆڕێ بـۆ کاپیتـالیزمێکی دەسـکەلای خـۆی وەك ڕێگایـەك بـۆ چەوساندنەوە. تەنانـەت بـەم شـێوەیەش، ئـەدای ئـابووری باشـتری میـسر بـە بـەراوورد لەگـەڵ کۆریـای بـاکوور دا ئـەنجامی سروشـتی دەزگایـانی کـەمتر چەوسێنەرانەی میسر بوو. یەکێك لەوانە بە نـەبوونی کـۆنترۆڵی ڕەقـی شـێوەی حیزبی کۆمیۆنیستی کۆریای باکوور، پێویست بوو ڕژێمی میسر دانیشتوانەکەی بە شێوەیەك ڕازیکا کە ڕژێمی کۆریای باکوور ئەوە ناکا. هۆکارێکی تر ئەوە بوو کە تەنانەت کاپیتالیزمی دەسکەلا هەندێك هاندان بۆ وەبـەرهێنان دروسـتدەکا، بەلایەنیکەمەوە لە لایەن ئەوانەوە کە دۆستی ڕژێمەکەن، لـە کۆریـای بـاکوور دا بوونی نەبوو.

هەرچەندە ئەم ووردەکارییانە هـەموویان گـرنگن و جێگـەی بایـەخن، بـەڵام وانە گرنگەکان لـە وێنـە گەورەکەدایـە، کـە ئـەوە دەردەخـەن لـە هەریـەك لـەم حاڵەتانەدا، دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر دەزگایانی ئـابووری چەوسـێنەریان دروستکردوە و سامان ودەسەڵاتیان گواستۆتەوە بۆ نوخبە.

خەستی چەوساندنەوە لەم وڵاتە جیاوازانـەدا بێگومـان لـە وڵاتێکـەوە بـۆ یەکێکی تر دەگۆڕێ و ئاکامی گرنگی بۆ خۆشـگوزەرانی هەیـە. بـۆ نموونـە، لـە ئەرجەنتین، دەستوور و هەڵبژاردنە دیموکراسییەکان وەك پێویست کارناکەن بۆ

برەوپێـــدانی پلـــورەلیزم، بـــەڵام لەوانـــەی کۆلۆمبیـــا باشـــتر کاردەکـــەن. بەلایەنیکەمەوە لە ئەرجەنتین دا دەوڵەت مۆنۆپۆڵی زەبروزەنگی کردوە. تا رادەیەک وەک ئاکامێکی ئەمە داهاتی تاک لە ئەرجەنتین دوو هێندەی داهاتی تاکە لە کۆلۆمبیا. دەزگا سیاسییەکانی هەردوو وڵاتەکە کاری زۆر باشتر دەکەن بۆ جڵەوگیری نوخبەکان بە بەراورد لەگەڵ زیمبابۆی و سیارا لیۆن دا و لە ئەنجامی ئەمەش دا زیمبابۆی و سیارا لیۆن زۆر هەژارترن لە ئەرجەنتین و کۆلۆمبیا.

بارنـەی ناهەمواری ئـەوەش دەگەیـەنێ کـە تەنانـەت کاتێـک دەزگایـانی چەوسێنەر دەبنە هۆی شکستهێنانی دەوڵەت، هەورەک سیارا لیۆن و زیمبابۆی، ئەمە بەشێوەیەکی یەکلاکار کۆتایی بە حوکمی ئەو دەزگایانە ناهێنێ. پێشتر بینیمـان کـە جـەنگی نـاوخۆ و شـۆڕش، کـە ڕەنگـە لـە کـاتی وەرچـەرخانە مێژووییـەکان دا ڕوو بـدەن، مـەرج نییـە گۆڕانکـاری دەزگـایی لەگـەڵ خۆیـان دا بهێنن. ڕووداوەکان لە سیارا لیۆن لەو کاتەوە کە جەنگی ناوخۆ لـە سـاڵی ٢٠٠٢ دا کۆتاییهاتوە بەزیندوویی ئەم ئەگەرە ڕووندەکەنەوە.

لە ساڵی ٢٠٠٧ دا، لە هەڵبژاردنێکی دیموکراسی دا، حیزبە کۆنەکـەی سـیاکا ستیڤنس، APC، دەسەڵاتی گرتەوەدەست. هەرچەندە ئێرنیست بەی کۆرۆمـا، ئەو پیاوەی هەڵبژاردنـە سـەرۆکایەتییەکەی بردەوە، هیچ پەیوەندییـەکی بـە حکومەتـە کۆنـەکانی APC نـەبوو، بـەڵام زۆربـەی ئەنـدامانی کابینەکـەی پەیوەندییان هەبوو. دوو لـە کوڕەکـانی سـتیڤنس، بۆکـاری و جـەنگۆ تەنانـەت کرانە باڵوێز لە ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئەڵمانیا. لە جەوهەردا ئەمە شـێوازێکی زیـاتر نـاجێگیری ئەوەیـە لـە کۆلۆمبیـا دا بینیمـان. لـە کۆلۆمبیـا نـەبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت لە زۆربەی ناوچەکانی وڵات دا بە درێژایی کات بەردەوامبوو چونکە بەرژەوەندی بەشێك لە نوخبە سیاسییەکانی حکومـەتی ناوەنـد ئـەوەی دەخواست کە ئەو بارودۆخە بەردەوامبێ، بـەڵام کرۆکـی دەزگـا دەوڵەتییـەکان ئەوەندە بەهێزبوون کە نەیەڵن ئەم ناسەقامگیرییە بگوڕێ بـۆ ئـاژاوەی تـەواو. لە سیارا لیۆن، لە لایەکەوە لەبـەر سروشـتی زیـاتر چەوسـێنەرانەی دەزگایـانی ئابووری و لـە لایـەکی تـرەوە لەبـەر مێـژووی دەزگایـانی یـەکجار چەوسـێنەری وڵاتەکە، کۆمەڵگا تەنیا لە ڕووی ئابوورییەوە تووشی کێشە نەبوو، بـەڵکو لـە نێـوان ئـاژاوەی تـەواو و سـەقامگیریی کەمـدا ئەمبەروئەوبـەری دەکـرد. لەگـەڵ

ئەمــەش دا کاریگــەری درێژخایــەن هــەمان شــتن: دەوڵــەت وون و دەزگاکــان چەوسێنەرن.

لە هەمووئەم حاڵەتانەدا، مێژوویـەکی دووردوورێـژی دەزگایـانی چەوسـێنەر، بەلایەنیکەمەوە هەر لە سـەدەی نۆزدەیەمـەوە، لـە ئـارادا بـوون. هەریـەك لـەم وولآتانە لە بازنەی ناهەمواری دا گیریخواردوە. لە کۆلۆمبیـا و ئەرجـەنتین، ئـەو دەزگـا چەوسـێنەرانە لـە نـاو دەزگایـانی سـەردەمی کۆلۆنیـاڵی ئیـسپانی دا ریشەیان داکوتاوە. ئەوانەی زیمبابۆی و سیارا لیۆن دەگەڕێنەوە بۆ سـەردەمی ڕژیمە کۆلۆنیالییەکانی دەسکردی بەریتانیا کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیـەم دا دامەزران. لە سیارا لیۆن، بـە نـەبوونی نیشتەکارانی سپیپێست، ئـەم ڕژێمانـە لەسەر سترەکچەری چەوسێنەری دەسەلآتی سیاسی پێش سەردەمی کۆلۆنیـالی دروستبوون و لەسـەردەمی کۆلۆنیـالی دا خەسـت تریـان کردنـەوە. خـودی ئـەم سترەکـچەرانەش ئـەنجامی بازنـەی ناهـەمواری دووردرێـژ بـوون کـە نـەبوونی مەرکەزییەتی سیاسی و کاریگەری تێکدەرانـەی بازرگـانی کـۆیلان سیمای ئـەو دەزگایانە بوون. لە زیمبابۆی دا زیاتر بریتیبوو لە دروسـتکردنی شـێوازی نـوێی دەزگایـانی چەوسـێنەر، چـونکە کۆمپانیـای بـەریتانی ئـەفریقای باشـوور ئابوورییـەکی دووفـاقی دامەزرانـد. ئۆزبەکـستان تـوانی دەسـتبگرێ بەسـەر دەزگایـانی چەوسـێنەری یـەکێتی سـۆڤیەت و تـوانی بەهەمانـشێوەی میـسر دەسکارییان بکا بۆ کاپیتالیزمی دەسکەلا. دەزگا چەوسێنەرەکانی سۆڤیەتیش بۆخۆیان لـە زۆر ڕوەوە بریتیبـوون لـە بـەردەوامی ئەوانـەی ڕژێمـی قەیسەری، دیسانەوە لە سەر پاتێرنێك کە لە ناو یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکی دا چەسپیبوو. کاتێك ئەم جۆرە جیاوازانەی بازنەی ناهەمواری لە ناوچـە جیاوازەکـانی جیهـان دا لە ماوەی ٢٥٠ ساڵی ڕابوردوودا کاری خۆیان کرد، نا یەکسانی لـە جیهـان دا سەریهەڵداو بەردوام بوو.

چارەسەری شکستە ئابووری و سیاسـییەکانی نەتـەوانی ئـەمڕۆ بریتییـە لـە گۆڕینی دەزگا چەوسێنەرەکانیان بۆ دەزگایانی کراوە. بازنەی ناهەمواری ئەوە دەگەیەنێ کە ئەمـە ئاسـان نییـە، بـەلآم ئەسـتەمیش نییـە و یاسـای ئاسـنینی ئۆلیگارکی حەتمی نییە. یان هەندێك توخمی کراوەی ناو دەزگـا کۆنـەکان، یـان بوونی هاوپەیمانی فراوان کە سەرکردایەتی خەبات دژی ئەو ڕژیمانەی لە ئارادان بکەن، یـان تـەنیا سروشـتی پەیوەسـتیی مێـژوو، دەتـوانێ بازنـەی ناهـەمواری

تێبشکێنیێ. هەروەك جەنگی ناوخۆ لە سیارا لیۆن دا، شۆڕشی شکۆدار لە ساڵی ١٦٨٨ دا، خەبات بوو لە پێناوی دەسەڵات دا، بەڵام خەباتێکی تـەواو سروشـت جیاواز بوو لە جەنگی ناوخۆی سیارا لیۆن. ڕێگەی تێدەچێ کە هەندێك لەوانەی ناو پەرلەمان هەوڵی لابردنی جەیمسی دوەمیان دا لە گەرمەی شۆڕشی شـکۆدار دا وا بیریان لە خۆیان کردبێتەوە کە ڕۆڵـی فـەرمانڕەوایانی نـوێی ڕەهـا ببیـنن، بەو شێوەیەی ئۆلیڤەر کرۆموێل دوای جەنگی ناوخۆی ئینگلتەرە کـردی، بـەڵام ڕاستی ئەوەی کە پەرلەمان لەو سەردەمەدا بەهێز و لە هاوپەیمانییەکی فراوانی نێوان بەرژەوەندییـە ئابوورییـە جیاوازەکـان و ڕاوبۆچـونی جیـاواز پێکهـاتبوو، کارێکی وایکرد ئەگەری کاریگەریی یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکی لە سـاڵی ١٦٨٨ دا کەمتر بێ و ڕاستی ئەوەی کە بـەخت یـاوەری پەرلـەمان بـوو دژی جەیمـسی دوەم، یارمەتی پەرلەمانی دا. لە چـاپتەری داهـاتوودا، نموونـەی تـری وڵاتـان دەبینین کە توانییان ئاڵوگۆڕ لەدەزگایانی خۆیان دا بکەن بۆ دەزگایانی باشتر، تەنانەت دوای مێژوویەکی درێژی دەزگایانی چەوسێنەر.

١٤

# شکاندنی قاڵبەکە
# (Breaking the Mold)

## سێ سەرۆك هۆزی ئەفریقی

لە ٦ی ئەیلولی ساڵی ١٨٩٥ دا، کەشتی تانتالۆن کاسڵ، لە پلیمۆسی کەناری باشووری ئینگلتەرە لەنگەریگرت. سێ سەرۆك هۆزی ئەفریقی، خاما لە نگواتۆ، باسۆن لە نگواکێتسی و سیبێل لە کوێنا هاتنەخوار و سواری شەمەنەفەری کاتژمێر ٨:١٠ بوون بەرەو وێستگەی پادینگتۆن لە لەندەن. سێ سەرۆك هۆزەکە بە ئەرکێك هاتبوون بۆ لەندەن: بۆ ڕزگارکردنی ویلایەتەکانی خۆیان لەگەڵ پێنج ویلایەتی تری تسوانا لە دەستی سیسیل ڕۆدیس. نگواتۆ و نگواکێتسی و کوێنا سێ ویلایەتی ئەو هەشت ویلایەتە بوون کە ئەو کاتە بە بێچۆنالاند ناسرابوون و دوای سەربەخۆیی لە ساڵی ١٩٦٠ دا بوە بۆتسوانا.

هۆزەکان بە درێژایی زۆربەی سەدەی نۆزدەیەم خەریکی بازرگانی بوون لەگەڵ ئەورووپییەکان دا. لە ساڵانی ١٨٤٠ کان دا پەیامبەری ئاینی سکۆتلەندی بەناوبانگ، دەیڤید لیڤینگستۆن لە ناوچەی بێچۆنالاند گەشتی زۆری ئەنجامدابوو، سێچیلی پاشای کوێنای وەرگێڕابوە سەر ئاینی مەسیحی. یەکەم وەرگێرانی ئینجیل بۆ زمانێکی ئەفریقی بە سێتسوانا ئەنجامدرا کە زمانی تسوانا بوو. لە ساڵی ١٨٨٥ دا بەریتانیا ڕایگەیاند کە بێچۆنالاند پارێزراوێکی بەریتانییە. تسوانا بە ڕێکەوتنامەکە ڕازیبوو چونکە لایانوابوو ئەم ڕێکەوتنامەیە لە داگیرکردنێکی تری ئەورووپی دەیانپارێزی بەتایبەتی لە لایەن (بۆر)ەکانەوە کە هەر لە کاتی کۆڕەوی مەزنەوە لە ساڵی ١٨٣٥ ەوە لەگەڵیان دا لە پێکدادان دا بوون. کۆڕەوی مەزن بریتیبوو لە کۆچی هەزاران بۆر بەرەو ناوچەکانی ناوەوە بۆ خۆ قوتارکردن لە کۆلۆنیالیزمی بەریتانی. لە لایەکی ترەوە، بەریتانییەکان ویستیان ناوچەکە بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە بۆ ڕێگرتن لە

فراوانبـــوونی دەســـەڵاتی بۆرەکـــان و ئەگـــەری تەشـــەنەکردنی دەســـەڵاتی ئەڵمانییەکان کە ناوچـەی باشـووری ڕۆژئـاوای ئەفـەریقا کـە دەکاتـە نامیبیـای ئەمڕۆیان داگیرکردبوو. بەریتانییەکان لەو بڕوایـەدا نـەبوون کـە بـەکۆلۆنیکردنی تەواو سوودی دەبیّ. کۆمسیاری باڵا، ڕەی، هەڵوێستەکانی بەریتانیای بـەڕوونی لـە سـاڵی ١٨٨٥ دا خـستەڕوو: ( *ئێمـە بەرژەوەنـدیمان لـەو وڵاتـەدا نییـە کـە دەکەوێتـە بـاکووری مۆلـۆپ (ناوچـەی پـارێزراوی بێـچۆنالاند)، جگـە لـە بەکارهێنانی وەك ڕێگایەك بۆ ناوچەکانی ناوەوە، بۆیە ڕەنگە ئێمە لـە ئێـستادا گرنگیبدەین بەوەی نەیەڵین ئەو بەشەی ناوچە پارێزراوەکە لە لایەن چـەتە یـان هێزە بیانییەکانەوە داگیربکریّ کە لە ڕووی ئیداری و نیشتەجێکردنەوە نـاتوانن کارێکی ئەوتۆ ئەنجامبدەن)*

بارودۆخەکە بۆ بۆتسوانا لە ساڵی ١٨٨٩ دا گۆڕانکاری بەسـەرداهات کاتێك کۆمپانیـای بـەریتانی ئـەفریقای باشـووری سێـسیل ڕۆدیـس لـە ئـەفریقای باشـوورەوە دەسـتیکرد بـە پەلهاویـشتن بـەرەو بـاکوور و بڕێکـی زۆری زەوی زەوتکرد کە دواتر بوونە باکوور و باشووری ڕۆدیسیا و ئێستا بریتین لە زامبیا و زیمبابۆی. بە هاتنی ساڵی ١٨٩٥، ساڵی هاتنی سیّ سەرۆك هۆزەکە بۆ لەندەن، ڕۆدیس چاوی بڕیبوە ئەو ناوچانەی کەوتبوونە باشووری خۆرئاوای ڕۆدیسیا کە بێچۆنالاند بوو. سەرۆك هۆزەکـان دەیـانزانی تـەنیا کارەسـات و داگیرکـردن لـە بـەردەم ئـەو ناوچـانەدا بـوو ئەگـەر بکەوتنایەتـە ژێـر کـۆنترۆڵی ڕۆدیـسەوە. هەرچەندە ئەستەم بوو بـۆ ئـەوان لـە ڕووی سـەربازییەوە ڕۆدیـس تێبـشکێنن، بـەڵام سـووربوون لەسـەر ڕووبەڕووبونـەوەی ڕۆدیـس بـە هـەر شـێوەیەك بیانتوانیایە. ئەوان بڕیاریان دا لە نێوان دوو بەڵاکەدا ئـەو بەڵایـە هەڵبـژێرن کـە زیانی لەویتر کەمتر بـوو: کـۆنترۆڵی زیـاتر لـە لایـەن بەریتانییەکانـەوە لـە بـری داگیرکردنیان لە لایـەن ڕۆدیـسەوە. بـە هاوکـاری کۆمـەڵگای پەیامبـەری ئـاینی مەسیحی لەندەن، ئەوان گەشتیانکرد بۆ لەندەن تـا شـاژن ڤیکتۆریـا و جۆزیـف چەمبەرلن کە ئەو کاتە وەزیـری کۆلۆنیـاڵی بـوو، ڕازیبکـەن تـا زیـاتر کـۆنترۆڵی بێچۆنالاند بکەن و لە ڕۆدیس بیانپارێزن.

لە ١١ ی ئەیلولی ساڵی ١٨٩٥ دا، یەکەم کۆبوونەوەیان لەگـەڵ چـەمبەرلن دا ئەنجامدا. یەکەمجار سێبڵ و دواتر باسـۆین و لـە کۆتـایی دا خامـا قسەیانکرد. چـەمبەرلن ڕایگەیانـد کـە ئـەو سـەپاندنی کـۆنترۆڵی بـەریتانیا بـۆ پاراسـتنی

هۆزەکان لە دەستی ڕۆدیسٚ لەبەرچاودەگرێ. لەو بەینەدا، هۆزەکان کەوتنە گەشتێك لەسەرانسەری وولاٚت دا بۆ قسەکردن بۆ خەڵك تا پشتگیریی جەماوەری بۆ داخوازییەکانیان بەدەستبهێنن. ئەوان سەردانی وینزۆر و ڕێدینگ لە نزیك لەندەن و ساوسامپتۆن لە سەر کەناری باشوور و لێستەر و بێرمەنگهام و مەڵبەندی پشتگیری سیاسی چەمبەرلن کە میدلاند بوو کرد و قسەیان بۆ خەڵك کرد. ئەوان چوونە باکوور بۆ شارە پیشەسازییەکانی یۆرکشێر و شێفیلد و لیدز و هالیفاکس و برادفۆرد و لە ڕۆژئاوادا چوون بۆ بریستۆڵ و دواتر بۆ مانچێستەر و لیڤەرپوڵ.

لەو کاتەدا، لە باشووری ئەفریقا، سێسیلٚ ڕۆدیس خەریکی ئامادەسازی بوو بۆ ئەوەی کە دواتر بوە پەلامارە کارەساتاوییەکەی جەیمسۆن کە بریتیبوولە هێرشێکی سەربازی بۆ سەر کۆماری بۆر لە ترانسڤاڵ، سەرەڕای نارەزایی توندی چەمبەرلن. ڕەنگە ئەم ڕووداوانە بووبنە هۆی ئەوەی چەمبەرلن زیاتر هاوسۆز بێ لەگەڵ سەرۆك هۆزەکان دا. لە ٦ تشرینی دوەم دا سەرۆك هۆزەکان جارێکیتر لەگەڵ چەمبەرلن لە لەندەن کۆبوونەوە. ئەوان لە ڕێگەی وەرگێڕەوە قسەیانکرد:

*(چەمبەرلن: من دەربارەی خاکی سەرۆك هۆزەکان و ڕێگای ئاسنینەکە قسەدەکەم و دەربارەی ئەو یاسایەی کە لە ناوچەکانی سەرۆك هۆزەکان دا جێبەجێدەکرێ قسەدەکەم ... ئێستا با سەیری نەخشەکە بکەین ... ئێمە ئەو زەوییانە دەبەین کە بۆ ڕێگا ئاسنینەکە پێویستمانن و لەوە زیاترمان ناوێ.*

*خاما: من دەڵێم، ئەگەر بەڕێزچەمبەرلن بۆخۆی ئەو زەوییانە دەبا ئەوا ڕازیدەبم.*

*چەمبەرلن: باشە پێی بڵێ کە من بۆ خۆم ڕێگا ئاسنینەکە دروستدەکەم لە ژێر چاودێری کەسێك دا کە ڕەوانەی دەکەم و تەنیا ئەوەندەش زەوی دەبەم کە پێویستمە و ئەگەر ئەو زەوییانەی دەیانبەم بەهایەکیان هەبێ ئەوا سەرۆك هۆزەکان قەرەبوودەکرێنەوە.*

*خاما: حەز دەکەم بزانم چۆن (واتا لە کوێوە) ڕێگا ئاسنینەکە دەڕوات.*

*چەمبەرلن: ڕێگاکە بەناو خاکی ئەودا دەڕوات، بەڵام شورای بۆ دەکرێ و هیچ زەوییەك نابەین.*

*خاما: لەو باوەڕەدام کە تۆ ئەم کارە بە شێوەیەك دەکەی وەك ئەوەی من*

*بۆ خۆمی بکەم و لەو بارەیەوە بە شێوەیەکی دادپەروەرانە مامەڵەم لەگەڵ دا دەکەی.*

*چەمبەرلن: ئاگام لە بەرژەوەندییەکانتان دەبێ).*

ڕۆژی دواتر، ئێدوارد فێرفیلد، لە ئۆفیسی کۆلۆنیالی، بە شێوەیەکی وورد تر ڕێکەوتنەکەی چەمبەرلنی ڕوونکردەوە:

*(هەریەك لە سێ سەرۆك هۆزەکە، خاما و سێبیل و باسۆین، وولاتی خۆیان دەبێ و بەشێوەی ئێستا تیایدا دەژین لە ژێر پارێزگاری شاژن دا. شاژن کاربەدەستێك دەسنیشاندەکا تا لایان بمینێتەوە. سەرۆك هۆزەکان فەرمانڕەوایی گەلەکانی خۆیان دەکەن هەر بەو شێوەیەی ئێستا دەیکەن).*

کاردانەوەی ڕۆدیس بەرامبەر بەوەی لە لایەن سێ سەرۆك هۆزی ئەفریقیەوە پاشقولی لێگیراوە پێشبینیکراو بوو. ئەو بروسکەیەکی نارد بۆ یەکێك لە کارمەندەکانی خۆی کە تیایدا هاتبوو، *( دژی ئەوەم لە لایەن سێ کەسی خۆماڵی دوو ڕووەوە بکوترێم)*

لە ڕاستیدا سەرۆك هۆزەکان شتی بەنرخیان هەبوو کە لە چنگی ڕۆدیس پاراستبوویان و دواتریش لە فەرمانڕەوایی ناڕاستەوخۆی بەریتانیا پاراستیان. بە هاتنی سەدەی نۆزدەیەم، دەوڵەتەکانی تسوانا کۆمەڵێك دەزگایانی سیاسی بنەڕەتییان پەرەپێدا. ئەمانەش بریتیبوون لە ئەندازەیەکی نائاسایی، بەپێی ستانداردەکانی باشووری بیابانی ئەفریقی، لە مەرکەزیەتی سیاسی و شێوازی بڕیاردانی بەکۆمەڵ کە دەشێ تەنانەت وەك شێوازێکی نوێ و سەرەتایی پلورەلیزم سەیربکرێ. هەروەك چۆن ماگنا کارتا بوە هۆی بەشدارییپێکردنی بارۆنەکان لە پرۆسەی بڕیاردانی سیاسی دا و هەندێك سنووری بۆ ڕەفتارەکانی پاشایەتی ئینگلتەرە دانا، دەزگا سیاسییەکانی تسواناش، بەتایبەتی کگۆتلا، بوەهۆی هاندانی بەشداری سیاسی و جڵەوگیری بۆ سەرۆك هۆزەکان دانا. مرۆڤناسی ئەفریقای باشوور، ئیسحاق شاپرا باسیکردوە کە چۆن کگۆتلا کاریدەکرد:

*(هەموو بابەتە پەیوەندارەکان بە پۆلیسییەوە لە کۆتایی دا لە لایەن ئەنجوومەنی گشتی پیاوانەوە لە کگۆتلای سەرۆك هۆز (شوێنی ئەنجوومەن) دا یەکلاییدەکرێنەوە. ئەم جۆرە کۆبوونەوانە زوو زوو ڕێکدەخرێن ... لەناو ئەو بابەتانەی باسدەکرێن ... ناکۆکییەکانی ناو هۆز و کێشەکانی نێوان سەرۆك هۆز*

*و خزمەکانی و دانانی باجی نوێ و ئەنجامدانی پڕۆژەی خزمەتگوزاری گشتی و دەرکردنی مەرسومی نوێ لە لایەن سەرۆك هۆزەوە.... شتێکی غەریب نییە کە ئەنجوومەنی هۆز ویستەکانی سەرۆك هۆز ڕەتبکاتەوە. لەبەر ئەوەی هەموو کەس بۆی هەیە قسەبکا، ئەم کۆبوونەوانە دەبنەهۆی ئەوەی سەرۆك هەستەکانی خەڵك بە گشتی تێبگات و دەرفەتیش بداتە خەڵك تا سکاڵاکانیان بخەنەڕوو. ئەگەر بۆنەکە پێویست بکا ئەوا ڕەنگە سەرۆك و ڕاوێژکارەکانی بە توندی سەرزەنشتبکرێن چونکە خەڵك ناترسن بەکراوەیی و ڕاشکاوانە قسەبکەن).*

سەرۆکایەتی هۆز لە تسوانا بە تەواوی بۆماوەیی نەبوو، بەڵکو کراوە بوو بۆ هەر پیاوێك توانا و بەهرەی بەرچاوی هەبوایە. مرۆڤناس جۆن کامارۆف بە ووردی لێکوڵینەوەی لەسەر دەوڵەتێکی تری تسوانا کرد کە ڕۆڵۆنگ بوو. ئەو پیشانیدا هەرچەندە بەشێوەیەکی ڕووکەش تسوانا ڕێسای ڕوونی هەبوو پیشانیدەدا کە چۆن سەرۆکایەتی بە میرات دەگوێزرایەوە، لە پراکتیس دا ئەم ڕێسایانە بە شێوەیەك لێکدەدرانەوە کە فەرمانڕەوایانی خراپ دووربخەنەوە و پاڵێوراوانی بەهرەدار ببنە سەرۆك هۆز. ئەو ڕوونیکردەوە کە بەدەستهێنانی سەرۆکایەتی هۆز بەهۆی لێهاتووییەوە بوو، بەڵام دواتر بەلێکدانەوەی مەنتیقی وایلێدەکرا کە ڕکابەری سەرکەوتوو وەك جێنشینی ڕەوا دەرکەوێ.

هەوڵەکانی سەرۆك هۆزەکانی تسوانا، دوای سەردانەکەیان بۆ لەندەن بۆ هێشتنەوەی سەربەخۆیی خۆیان لە بەریتانیا و پاراستنی دەزگا خۆماڵییەکانیان، بەردەوامبوون. ئەوان ملیاندا بۆ دروستکردنی ڕێگای ئاسنین لە بوچۆنالاند، بەڵام دەسوەردانی بەریتانیایان سنووردارکرد لە لایەنەکانی تری ژیانی ئابووری و سیاسییان دا. ئەوان دژی دروستکردنی ڕێگای ئاسنین نەبوون، بێگومان لەبەر هەمان ئەو هۆیانە نا کە پاشایاتییەکانی نەمسا ـ هەنگاریا و ڕوسیا ڕێگەیان لە دروستکردنی ڕێگای ئاسنین گرت. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە ڕێگای ئاسنین وەك سیاسەتەکانی تری بەریتانیا، نابێتە هۆی پەرەپێدانی بێچۆنالاند ئەگەر لە ژێر کۆنترۆڵی کۆلۆنیالی دا بوایە. ئەزموونی سەرەتایی کوێ مازیر، سەرۆکی بۆتسواناى سەربەخۆ لە ساڵی ١٩٨٠ بۆ ١٩٨٨، شرۆڤەی دەکا بۆچی. مازیر جووتیارێکی بازرگان بوو لە ساڵانی ١٩٥٠ کان دا و تەکنیکی نوێی چاندنی گەنمەشامی پەرەپێدا و کڕیارێکی لە ئاشی ڤرایبێرگ دۆزییەوە کە

کۆمپانیایەکی باشووری ئەفریقی بوو لەو دیوی سنوورەوە. ئەو سەردانی بەرپرسی وێستگەی شەمەنەفەری لە لۆباتسی بێچۆنالاند کرد و داوایلێکرد دوو فارغۆنی شەمەنەفەری بەکرێ بداتێ بۆ گواستنەوەی بەروبومەکەی بۆ ڤایبێرگ. بەرپرسی وێستگەکە ڕەتیکردەوە. دواتر هاورێیەکی سپیپێستی پەیداکرد تا بکەوێتە بەینەوە. بەرپرسی وێستگەکە بە نابەدڵییەوە ڕازیبوو، بەڵام داوای چوار هێندەی ئەو پارەیەی لە مازیر کرد کە لە سپیپێستێکی داوادەکرد، مازیر وازیهێنا و گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە *( ئەوە ڕەفتاری سپیپێستەکان بوو نەک تەنیا یاساکان کە نەیدەهێشت ئەفریقییەکان ببنە خاوەنی زەوی یان مۆڵەتی بازرگانییان هەبێ و ئەمەش ڕێگر بوو لەبەردەم ڕەشپێستەکان دا کە کاری بازرگانی لە بێچۆنالاند پەرەپێبدەن)*

بە گشتی، سەرۆك هۆزەکان و گەلی تسوانا بەختیان هەبوو. سەرەڕای هەموو کۆسپەکان، ئەوان سەرکەوتوو بوون لە ڕێگرتن لە ڕۆدیس تا ناوچەکە بخاتە بندەستی خۆیەوە. لە بەرئەوەی بێچۆنالاند بایەخێکی کەمی بۆ بەریتانیا هەبوو، دامەزراندنی حوکمی ناڕاستەوخۆ لەو ناوچەیەدا ئەو جۆرە بازنە ناهەموارییەی دروستنەکرد کە لە سیارا لیۆن دا ڕۆڵی هەبوو. ئەوان خۆیان لەو جۆرە فراوانبوونە کۆلۆنیالّییە بەدوورگرت کە لە ناوچەکانی ناوەوەی ئەفریقای باشوور دا ڕوویدا و ئەم فراوانبوونەش لە باشووری ئەفریقا ئەو ناوچانەی کردە دەریاچەی کرێکارانی هەرزان بۆ خاوەن کان و جووتیارە سپیپێستەکان. قۆناخە سەرەتاییەکانی پرۆسەی کۆلۆنیکردن وەرچەرخانی مێژوویین بۆ زۆربەی کۆمەڵگاکان، کاتی گرنگن کە تیایدا ڕووداوەکان ئاکامی درێژخایەنی گرنگیان دەبێ بۆ پەرەپێدانی ئابووری و سیاسی ئەو کۆمەڵگایانە. هەروەك لە چاپتەری نۆیەم دا باسمانکرد، زۆربەی کۆمەڵگاکان لە وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا دا، بە هەمانشێوەی ئەوانەی ئەمەریکای باشوور و باشووری ئاسیا، دامەزراندن یان خەستبوونەوەی دەزگایانی چەوسێنەریان بەخۆوەبینی لە سەردەمی کۆلۆنیکردن دا. لە بری ئەمە، تسوانا خۆی لە حوکمی ناڕاستەوخۆی توند و چارەنووسی زۆر خراپتر، ئەگەر ڕۆدیس ناوچەکانی ئەوانی داگیربکردایە، پاراست. ئەمەش بە هەرحاڵ، تەنیا بەختێکی کوێر نەبوو. ئەمە جارێکیتر ئەنجامی کارلێکردن بوو لە نێوان ئەو دەزگایانەی هەبوون و وەرچەرخانی مێژوویی کە کۆلۆنیالیزم هێنایەئاراوە. سێ سەرۆك هۆزەکە

بۆخۆیان بەختی خۆیان دروستکرد لە ڕێگەی دەسپێشخەری گەشتکردنیان بۆ لەندەن و توانیان ئەمە بکەن، چونکە خاوەن ئاستێکی نائاسایی دەسەڵاتبوون بەبەراوورد لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانی تری وڵاتانی نیمچە بیابانی ئەفریقی دا بەهۆی ئەو مەرکەزیەتە سیاسییەی هۆزەکانی تسوانا بەدەستیانهێنابوو. ڕەنگە لەبەر ئەوەش بووبێ کە ئەوان ئەندازەیەکی نائاسایی ڕەواییان هەبوو بەهۆی ئەو پلورەلیزمە کەمەی لە ناو دەزگا خێڵەکییەکانیان دا سەریهەڵدا.

وەرچەرخانێکی تری مێژوویی لە کۆتایی سەردەمی کۆلۆنیالیزم دا گرنگی زیاتری هەبوو بۆ سەرکەوتنی بۆتسوانا و ئەو توانایەی دایە تا دەزگایانی کراوە پەرەپێبدا. لەو دەمەدا کە بێچۆنالاند لە ژێر ناوی بۆتسوانا لە ساڵی ١٩٦٦ دا سەربەخۆ بوو، سەرکەوتنە بەختئامێزەکەی هەر سێ سەرۆك هۆز، سێبیل و باسۆن و خاما ڕابووردویەکی دووربوون. لە ساڵانی بەر لە سەربەخۆیی دا بەریتانییەکان وەبەرهێنانی کەمیان لە بێچۆنالاند کرد. لە کاتی سەربەخۆبوون دا بۆتسوانا یەکێك بوو لە وڵاتە هەژارەکانی جیهان: تەنیا درێژی دوازدە کیلۆمەتر ڕێگای قیرتاوی هەبوو، بیست و دوو هاوڵاتی دەرچووی زانکۆ بوون و سەد کەس خوێندنی ناوەندییان تەواوکردبوو. لە سەروو هەمووشیانەوە، بۆتسوانا تاڕادەیەکی زۆر بەتەواوی لە لایەن ڕژێمە سپیپێستەکانی ئەفریقای باشوور و نامیبیا و ڕۆدیسیا دەورەدرابوو، هەموو ئەم وڵاتانەش دژی ئەو وڵاتە ئەفریقییە سەربەخۆیانە بوون کە لە لایەن ڕەشپێستانەوە حوکمدەکران. کەسانێکی کەم لەو بڕوایەدا بوون ئەم وڵاتە سەرکەوتن بەدەستدەهێنێ. لە گەڵ ئەمەش دا، لە چلوپێنج ساڵی دواتردا بۆتسوانا بوە یەکێك لەو وڵاتانەی جیهان کە خێراترین گەشەی ئەنجامدا. ئەمڕۆ بۆتسوانا لە ناو وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقی دا بەرزترین داهاتی تاکی هەیە و لە هەمان ئاستی وڵاتە سەرکەوتوەکانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتی وەك ئیستۆنیا و هەنگاریا و سەرکەوتوترین وڵاتی ئەمەریکای لاتینی وەك کۆستا ریکا دایە.

ئایا چۆن بۆتسوانا قاڵبەکەی شکاند؟ ئەمەی لە ڕێگای پەرەپێدانی خێرای دەزگایانی کراوەی ئابووری و سیاسی لە دوای سەربەخۆیی ئەنجامدا. لەو کاتەوە بۆتسوانا وڵاتێکی دیموکرات بوە و هەڵبژاردنی بەردەوام و ڕکابەرئامێزی ئەنجامداوە و هەرگیز دووچاری جەنگی ناوخۆ و دەسوەردانی سەربازی نەبوە. حکومەت دەزگایانی ئابووری ئەوتۆی دامەزراند کە مافی

موڵکداری دەپارێزن و سەقامگیری ماکرۆئابووری دەستەبەردەکەن و هانی پەرەپێدانی ئابووری بازاڕی کراوە دەدەن. بەڵام بێگومان، پرسیارە گەورەکە ئەوەیە، ئایا چۆن بۆتسوانا توانی دیموکراسییەکی سەقامگیر و دەزگایانی پلورەلیستی دابمەزرێنێ و چۆن دەزگایاتی ئابووری کراوەی هەڵبژارد، لە کاتێك دا زۆربەی وڵاتە ئەفریقییەکانی تر بە پێچەوانەوە کاریانکرد؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەمە پێویستە تێبگەین چۆن وەرچەرخانی مێژوویی، ئەمجارەیان بریتیبوو لە کۆتاییهاتنی حوکمی کۆلۆنیالی، لەگەڵ ئەو دەزگایانەی بۆتسوانادا کە ئەو کاتە لە ئارادا بوون، کاریان لە یەکترکرد.

لە زۆربەی وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقی دا، بۆ نموونە، لە سیارا لیۆن و زیمبابۆی دا، سەربەخۆیی دەرفەتێك بوو لە دەستدرا و دوای سەربەخۆیی هەمان ئەو دەزگا چەوسێنەرانە دروستکرانەوە کە لە سەردەمی کۆلۆنیالی دا هەبوون. قۆناخە سەرەتاییەکانی سەربەخۆیی لە بۆتسوانا زۆر جیاواز کەوتنەکار، دیسانەوە لەبەر بوونی ئەو باکگراوەندەی دەزگا مێژووییەکانی بۆتسوانا دروستیانکردبوو. لەمەدا بۆتسوانا لە زۆر ڕووەوە هاوشێوەی ئینگلتەرە بوو لەسەروبەندی شۆڕشی شکۆداردا. ئینگلتەرە لە سەردەمی تیۆدۆرەکان دا مەرکەزیەتی سیاسی خێرای بەدەستهێنابوو، خاوەنی ماگنا کارتا و نەریتی پەرلەمانی بوو کە بەلایەنی کەمەوە خواستی جڵەوگیرکردنی دەسەڵاتی پاشاکانی هەبوو و ئەندازەیەك لە پلورەلیزمی هێنابوەئاراوە. بۆتسواناش ئەندازەیەك لە مەرکەزیەتی دەوڵەت و دەزگایانی خێڵەکی پلورەلیستی هەبوو کە لە سەردەمی کۆلۆنیالی دا نەفەوتابوون. ئینگلتەرە هاوپەیمانییەکی فراوانی تازە دروستبووی هەبوو کە لە بازرگانانی ئەتڵەسی و خاوەن پیشەسازی و ئەو زەویدارە گەورانە پێکهاتبوو کە خولیای بازرگانییان هەبوو. هەموو ئەمانەش لایەنگری جێبەجێکردنی تەواوی مافی موڵکداری بوون. بۆتسوانا هاوپەیمانییەکی هەبوو، کە لایەنگری مافی ڕێکاری جێگیر بوون، کە بریتیبوو لە سەرۆك هۆزەکانی تسوانا و ئەو نوخبەیە کە خاوەن سامانی سەرەکی ئابووری بوون و ئەویش گایەل بوو. هەرچەندە خاوەنداریێتی زەوی گشتی بوو، بەڵام گایەل موڵکی تایبەت بوو لە ویلایەتەکانی تسوانادا و نوخبەکانیش بەهەمانشێوە لایەنگری جێبەجێکردنی تەواوی مافی موڵکداری بوون. بێگومان هەموو ئەمانە نکۆڵی لە ڕێچکەی پەیوەستی مێژوو ناکەن.

شتەکان زۆر جیاواز دەبوون لە ئینگلتەرەدا ئەگەر سەرکردەکانی پەرلەمان و پاشای نوێ هەوڵی ئەوەیان بدایە کە شۆڕشی شکۆدار بۆ زەوتکردنی دەسەڵات بەکاربهێنن. بەهەمانشێوە شتەکان زۆر جیاواز دەبوون لە بۆتسوانا، بەتایبەتی ئەگەر هێندە خاوەن بەخت نەبوونایە بەوەی سەرکردەی وەك سێرتسی خاما یان کویێ مازیریان هەبوو کە بڕیاریان دا لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە ڕکابەریی بۆ دەسەڵات گرتنەدەستبکەن لە جیاتی ئەوەی سیستەمی هەڵبژاردن تێکبدەن، هەروەك چەندین سەرکردەی دوای سەربەخۆیی لە وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقی دا کردیان.

لە کاتی سەربەخۆیی دا، تسوانا خاوەن مێژووی دەزگایانی ئەوتۆ بوو کە سەرۆکایەتی هۆزی سنووردار و ئەندازەیەك لە بەرپرسیاریێتی سەرۆك هۆزەکانی بەرامبەر خەڵك لەخۆگرتبوو. بێگومان تسوانا تەنیا نەبوو لە ئەفریقا دا کە خاوەن دەزگایانی لەم جۆرە بوو، بەڵام لەوەدا تەنیا بوو کە ئەم دەزگایانە لەسەردەمی کۆلۆنیالی دا مانەوە و نەفەوتان. حوکمی بەریتانییەکان بوونێکی ئەوتۆی نەبوو. بێچۆنالاند لە، ماکینگ، لە ئەفریقای باشوورەوە بەڕێوەدەبرا و تەنیا لە ماوەی ئامادەکاری دا بۆ سەربەخۆیی لە ساڵانی ١٩٦٠ کان دا پلانی دروستکردنی گابۆرۆنی پایتەخت دەستپێکرد. پایتەخت و دامەزراوە نوێکانی ناوی وا دروستنەکران تا دەزگا خۆماڵییەکان بسڕنەوە، بەڵکو سوودیان لەو دەزگایانە وەرگرت و کاتێك گابۆرۆن دروستکرا، ککۆتلای نوێ شانبەشانی دروستکران.

سەربەخۆیی ڕووداوێکی تا ڕادەیەك ئارام بوو. هەوڵی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لە لایەن حیزبی دیموکراتی بۆتسوانا (BDP)ەوە سەرکردایەتیکرا کە لە ساڵی ١٩٦٠ لە لایەن کویێ مازیر و سێرتیسی خاما دامەزرا. خاما کوڕەزای خاما پاشای سێیەم بوو، ناوی سێرتسی مانای " ئەو قوڕەی دەبێتە هۆی پێکەوەلکان". دەرکەوت ئەمەش ناوێك بوو زۆر لە جێگەی خۆیدا بوو. خاما سەرۆك هۆزی نگواتۆ بوو، زۆربەی سەرۆك هۆز و نوخبەکانی بۆتسوانا هاتنە ڕیزی حیزبی دیموکراتی بۆتسواناوە. لەبەر ئەوەی بەریتانییەکان گرنگییەکی ئەوتۆیان بە کۆلۆنییەکە نەدابوو، بۆتسوانا بۆردی فرۆشتنی نەبوو. هەر زوو BDP لە ساڵی ١٩٦٧ دا بۆردێکیان دامەزراند کە کۆمسیۆنی گۆشتی بۆتسوانا بوو. لەبری ئەوەی موڵك و ماڵی خاوەن کێڵگە گەورەکان و خاوەن

گایەلەکان زەوتبکا، کۆمسیۆنی گۆشت رۆڵی ناوەندی گێڕا لە پەرەپێدانی ئابووری گایەل بەخێوکردن دا. کۆمسیۆن بەربەستیدانا لەبەردەم بڵاوبوونەوەی نەخۆشی قاچ و دەم دا و برەویدا بە هەناردەکردن، کە هەردووکیان هاوکاری پەرەپێدانی ئابووری دەکەن و پشتگیریی بۆ دەزگایانی ئابووری کراوە زیاد دەکەن.

هەرچەندە لە سەرەتادا گەشەکردن لە بۆتسوانا پشتیبەست بە هەناردەکردنی گۆشت، بەڵام بارودۆخەکە دوای دۆزینەوەی ئەڵماس بە شێوەیەکی بنەڕەتی گۆڕا. بەڕێوەبردنی سامانە سروشتییەکان لە بۆتسوانا دیسانەوە جیاوازی بەرچاوی هەبوو لەگەڵ نەتەوەکانی تری ئەفریقا دا. لە سەردەمی کۆلۆنیالی دا سەرۆک هۆزەکانی تسوانا هەوڵیان دابوو رێگەبگرن لە گەڕان بە دوای کانزاکان دا لە بێچۆنالاند چونکە دەیانزانی ئەگەر ئەورووپییەکان کانزا یان بەردە بەنرخەکانیان بدۆزیایەتەوە، ئەوا ئۆتۆنۆمیەکەیان کۆتاییپێدەهات. یەکەم دۆزینەوەی گەورەی ئەڵماس لە ناو خاکی نگواتۆ دا بوو کە نیشتمانی تەقلیدی سێرتسی خاما بوو. خاما پێشنیازی گۆڕینی یاسای کرد بە شێوەیەك مافی خاوەندارێتی هەموو کانزاکانی ژێرزەوی بدرێتە نەتەوە نەك هۆز. ئەمەش بوە هۆی ئەوەی کە سامانی ئەڵماس نەبێتە هۆی دروستکردنی نایەکسانی گەورە لە بۆتسوانا. لە هەمانکات دا هێزی زیاتری دایە پرۆسەی مەرکەزیەتی دەوڵەت چونکە توانرا داهاتەکانی ئەڵماس بۆ دروستکردنی بیرۆکراسیەتی دەوڵەت و پتەوکردنی ژێرخان و وەبەرهێنان لە پەروەردەدا بەکاربهێنرێ. لە سیارا لیۆن و چەندین وولاتانی تری باشووری بیابانی ئەفریقی دا، ئەڵماس ململانێی لە نێوان گروپە جیاوازەکان دا دروستکرد و هاوکار بوو لە بەردەوامی جەنگە ناوخۆییەکان دا و ناونیشانی ئەڵماسی خوێنی وەرگرت بەهۆی ئەو کوشتارەوە کە لە رێگەی ئەو جەنگانەی بەرپاکران لە پێناوی کۆنترۆڵکردنیان دا، ئەنجامدرا. لە بۆتسوانا داهاتەکانی ئەڵماس بۆ خێروخۆشی نەتەوە خرانەگەڕ.

گۆڕانکاری لە مافەکانی خاوەندارێتی کانزاکانی ژێرزەوی دا تاکە سیاسەتی دامەزراندنی دەوڵەت نەبوو کە حکومەتەکەی سێرتسی خاما خستیەگەڕ. لە کۆتایی دا، یاسای سەرۆکایەتی هۆزی ساڵی ١٩٦٥ کە لە لایەن ئەنجوومەنی یاسادانانەوە بەر لە سەربەخۆیی دەرکرا و یاسای هەموارکردنەوەی یاسای

سەرۆکایەتی هۆز لە ساڵی ١٩٧٠ دا بەردەوامی دا بە پرۆسەی مەرکەزیەتی سیاسی و جەختکردنەوە بوو لەسەر دەسەڵاتی دەوڵەت و سەرۆکی هەڵبژێراو لە ڕێگەی سەندنەوەی مافی پێدانی زەوی لە لایەن سەرۆك هۆزەکان و لە سەرکارلابردنی سەرۆك هۆزەکان لە کاتی پێویست دا. ڕوپەکی تری مەرکەزیەتی سیاسی بریتیبوو لە زیاتر یەکخستنەوەی وولات، بۆ نموونە، بە دەرکردنی یاسا بۆ پێداگرتن لەسەر ئەوەی کە زمانی خوێندنی قوتابخانەکان تەنیا سێتسوانا و ئینگلیزی دەبێ. ئەمڕۆ بۆتسوانا وەك وولاتێکی هاوچەشن دەردەکەوێ بەبێ دابەشبوونی ئێتنی و زمانی کە سیمای چەندین نەتەوەی تری ئەفریقایە. ئەمەش ئاکامی ئەو سیاسەتە بوو کە دەبوایە تەنیا زمانی ئینگلیزی و تاکە زمانێکی نەتەوەیی کە سێتسوانا بوو لە قوتابخانەکان دا بخوێنرێ بۆ کەمکردنەوەی ناکۆکی لە نێوان هۆز و گروپە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگادا. دوا سەرژمێری کە پرسیاری دەربارەی ئێتنیك تێدا بوو ئەو سەرژمێرییە بوو لە ساڵی ١٩٤٦ دا ئەنجامدرا کە فرەئێتنی بەرچاوی لە بۆتسوانا پیشاندا. لە کۆمەڵگای نگواتۆ دا، بۆ نموونە، تەنیا ٪٢٠ ی دانیشتوان خۆیان وەك نگواتۆی پاك تۆمارکرد، هەرچەندە هۆزانی تری تسوانا لەوێدا هەبوون، چەندین گروپی تر هەبوون کە ئێتنیکی تسوانا نەبوون و زمانی یەکەمیان سێتسوانا نەبوو. ئەم فرەچەشنییە بەرچاوە لە ڕێگەی سیاسەتەکانی حکومەتی دوای سەربەخۆیی و بەهۆی دەزگا کراوە ڕێژەییەکانی هۆزەکانی تسواناوە ڕێکخرا، بەهەمان ئەو شێوەیەی فرەچەشنی لە بەریتانیا دا، بۆ نموونە، لە نێوان ئینگلیزەکان و وێلسییەکان دا لە لایەن دەوڵەتی بەریتانییەوە ڕێکخرا. دەوڵەتی بۆتسواناش هەمان شتی کرد. لە کاتی سەربەخۆییەوە سەرژمێرییەکان لە بۆتسوانا هەرگیز دەربارەی فرەچەشنی ئێتنیکی نەیانپرسیوە چونکە لە بۆتسوانا دا هەموو کەسێك تسوانایە.

بۆتسوانا ڕێژەی بەرزی گەشەکردنی لە دوای سەربەخۆیی بەدەستهێنا چونکە سێرتسی خاما و کوێ مازیر و حیزبی دیموکراتی بۆتسوانا، سەرکردایەتی بۆتسوانایان کرد بەرەو دەزگایانی ئابووری و سیاسی کراوە. کاتێك ئەڵماس لە ساڵانی ١٩٧٠ کان دا بەرهەمهێنرا، نەبوە هۆی بەرپابوونی جەنگی ناوخۆ، بەڵکو بناخەیەکی پتەوەی دارایی بۆ حکومەت دارشت و ئەم داهاتەی بۆ وەبەرهێنان لە خزمەتگوزارییە گشتییەکان دا بەکارهێنا. هاندانی

زۆر کـەمتر لـە ئـارادابوون بـۆ ڕووبەڕووبونـەوە یـان ڕوخانـدنی حکومـەت و کـۆنترۆڵکردنی دەوڵـەت. دەزگایـانی سیاسـی کـراوە سـەقامگیری سیاسـییان هێنایەئاراوە و پشتگیری دەزگایانی ئابووری کراوەیان کرد. بـە پێـی پاتێرنێك کە لە بازنەی بەختەوەری لە چاپتەری یازدەیەم دا باسکرا، دەزگایانی ئابووری کراوە توانای گەشەکردن و مانەوەی دەزگایانی سیاسی کراوەیان زیادکرد.

بۆتسوانا قاڵبەکەی شکاند چونکە توانی سوود لە وەرچەرخانێکی مێژوویی، کـە ئـەویش سـەربەخۆیی دوای کۆلۆنیـالی بـوو، وەربگـرێ و دەزگایـانی کـراوە دابمەزرێنێ. حیزبی دیموکراتی بۆتسوانا و نوخبـە تەقلیدییـەکان، لەوانـە خامـا بۆخۆی، هەوڵیاننەدا ڕژێمێکی دیکتاتۆری پێکبهێنن یان دەزگایـانی چەوسـێنەر دابمـەزرێنن کـە لەوانـەبوو لەسـەر حسابی کۆمـەڵگا دەوڵەمەنـدی بکردنایـە. جـارێکیتر، ئەمـە ئاکـامی کـار لەیـەککردنی وەرچـەرخانێکی مێـژوویی و ئـەو دەزگایانە بوون لـە ئـارادا بـوون. هـەروەك بینیمـان بـە شـێوەیەکی جیـاواز لـە نزیکـەی هـەموو شـوێنەکانی تـری باشـووری بیابـانی ئـەفریقی دا، بۆتـسوانا دەزگایـانی خێڵـەکی وای هـەبوو کـە ئەندازەیـەك لـە دەسـەڵاتی سیاسـییان دروستکردبوو، سەرەڕای ئەوەی سیمای گرنگی پلورەلیستیان تێدا بـوو. جگـە لەمـە، وڵاتەکـە کۆمەڵـە نوخبەیـەکی ئـابووری هـەبوو کـە بۆخۆیـان زۆر سوودمەندبوون لە مافی موڵکداری جێگیر.

ڕێـچکەی پەیوەسـتی مێـژوو کـە گرنگـی کـەمتری نییـە، لـە بەرژەوەنـدی بۆتسوانا کاریکرد. بۆتسوانا بەتایبەتی لەوەدا بەختی هەبوو کە سێرتسی خامـا و کویێ مازیر، سیاکا ستیڤنس و ڕۆبەرت مۆگابی نەبوون. ئـەو دوو سـەرکردەیە بە جدی و ڕاستگۆیی کاریانکرد بۆ دامەزراندنی دەزگایانی کراوە لەسەر بناخەی دەزگـا خێڵەکیـەکانی تـسوانا. هـەموو ئەمانـە بوونـە هـۆی ئـەوەی دەرفـەتی سەرکەوتنی بۆتسوانا لە گرتنەبەری ڕێگای بەرەو دەزگایانی کراوە زیاتر بێ، لە کاتێك دا زۆربـەی وڵاتـانی تـری باشـووری بیابـانی ئـەفریقی تەنانـەت هـەوڵی گرتنەبەری ئەم ڕێگایەیان نەدا، یان هەر لەسەرەتاوە شکستیانهێنا.

# کۆتایی چەوساندنەوەی باشوور

ڕۆژی ١ ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٥ بوو، فەرمانی دەسگیرکردنەکە لە شاری مۆنتگۆمێری لە ئەلەباما، کاتی ئەنجامدانی یاسا شکاندنەکەی دیاریکردبوو کە کاتژمێر ٦:٠٦ ی ئێوارە بوو. جەیمس بلەیك، شۆفیرێکی پاس، تووشی کێشەیەك بوو، ئەو پۆلیسی ئاگادارکرد و هەردوو ئەفسەری پۆلیس، دەی، لەگەڵ میکسۆن گەیشتنە شوێنی ڕووداوەکە. ئەوان لە ڕاپۆرتەکەی خۆیان دا ئەمەیان تۆمارکرد:

*(ئێمە ئاگادارکراین و لە کاتی گەیشتنمان بۆ شوێنی ڕووداوەکە شۆفێری پاسەکە ووتی ئافرەتێکی ڕەشپێست لە شوێنی دانیشتنی سپیپێستەکان دا دانیشتوە و جێگەکەی ناگۆڕێ. ئێمەش.. ئەومان بینی. شۆفێری پاسەکە فەرمانی گرتنی ئەوی دەرکرد. ڕۆزا پارکس بە پێی چاپتەری ٦ برگەی ١١ ی کۆدی شاری مۆنتگۆمێری تۆمەتبارکرا).*

یاساشکێنییەکەی ڕۆزا پارکس بریتیبوو لە دانیشتن لەو بەشەی پاسی کلیڤلاند ئەڤێنیو کە بۆ سپیپێستەکان تەرخانکرابوو، ئەمەش بە پێی یاساکانی جیم کرۆی ئەلەباما تاوان بوو. پارکس سزادرا بە دانی دە دۆلار سەرەڕای خەرجییەکانی دادگا کە چوار دۆلار بوو. ڕۆزا پارکس کەسێکی ئاسایی نەبوو. ئەو سکرتێری ڕێکخراوی نیشتمانی پێشخستنی هاوڵاتییانی ڕەشپێست بوو (NAACP) کە ماوەیەکی زۆر بوو تێدەکۆشا بۆ گۆڕینی دەزگاکانی باشووری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا. گرتنەکەی پارکس بزوتنەوەیەکی جەماوەری دروستکرد بۆ بایکۆتی بەکارهێنانی پاسەکانی مۆنتگۆمێری کە لە لایەن مارتین لۆسەر کینگ (جەی ئاڕ) ڕێکخرا. بە هاتنی ٣ی کانونی یەکەم کینگ و سەرکردە ڕەشپێستەکانی تر بایکۆتێکی ڕێکخراویان ڕێکخست و هەموو ڕەشپێستەکانیان ڕازیکرد کە هیچ پاسێکی مۆنتگۆمێری بەکارنەهێنن. بایکۆتەکە سەرکەوتوو بوو، تا ٢٠ کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٦ بەردەوامبوو. ئەمەش پرۆسەیەکی خستەگەڕ کە بە بڕیاری دادگای باڵای ویلایەتە یەکگرتوەکان کۆتایی پێهات کە بریتیبوو لەوەی ئەو یاسایانەی شوێنی دانیشتن لە ناو پاسەکان دا لە ئەلەباماو مۆنتگۆمێری جیادەکردەوە نا دەستووری بوون.

بایکۆتی پاسی مۆنتگۆمێری ساتێکی گرنگ بوو لە بزووتنەی مافە مەدەنییەکان لە باشووری ویلایەتە یەکگرتوەکان دا. ئەم بزووتنەوەیە بەشێك بوو لە زنجیرەیەك ڕووداو و گۆڕانکاری کە لە کۆتایی دا ڕێچکەکەی لە باشووردا شکاند و بوە هۆی ئەنجامدانی گۆڕانکاری بنەڕەتی لە دەزگاکان دا. هەروەك لە چاپتەری ١٢ بینیمان، دوای جەنگی ناوخۆ، نوخبە خاوەن زەوییەکانی باشوور توانیبوویان دەزگا ئابووری و سیاسەتە چەوسێنەرەکان دروستبکەنەوە کە بەر لە جەنگی ناوخۆ لە باشووردا باڵادەست بوون. هەرچەندە ووردەکارییەکانی ئەم دەزگایانە گۆڕانکارییان بەسەرداهات - بۆ نموونە، کۆیلەیەتی چیتر نەدەکرا بەردەوامی پێبدرێ ـ بەڵام کاریگەرییە نیگەتیڤەکانی ئەم دەزگایانە لەسەر هاندانی ئابووری و خۆشگوزەرانی لە باشووردا هەمان شت بوون. باشوور بە شێوەیەکی بەرچاو لە شوێنەکانی تری ویلایەتە یەکگرتوەکان هەژار تر بوو.

لە ساڵانی ١٩٥٠ کانەوە، دەزگایانی باشوور کەوتنە خۆ بۆ ئەوەی ناوچەکە بخەنە سەر ڕێچکەیەکی گەشەکردنی زۆر خێراتر. جۆری ئەو دەزگا چەوسێنەرانەی لە کۆتایی دا لە باشووری ویلایەتە یەکگرتوەکان لەناوبران، جیاواز بوون لە دەزگایانی کۆلۆنیالی پێش سەربەخۆیی لە بۆتسوانا. جۆری ئەو وەرچەرخانە مێژووییەش کە پرۆسەی ڕۆچوونی ئەو دەزگایانەی خستەگەڕ، دیسانەوە جیاواز بوو، بەڵام چەندین خاڵی هاوبەشیان لە نێوان دا هەبوو. هەر لە ساڵانی ١٩٤٠ کانەوە، ئەوانەی قورسایی جیاکاری ڕەگەزی و دەزگا چەوسێنەرەکانی باشووریان کەوتە سەرشان، کە کەسانی وەك ڕۆزا پارکس بوون، کەوتنە ئەوەی کە لە خەباتیان دا دژی ئەو دەزگایانە خۆیان باشتر ڕێکبخەن. لە هەمانکات دا، دادگای باڵای ویلایەتە یەکگرتوەکان و حکومەتی فیدراڵی لە کۆتایی دا کەوتنە ئەوەی بە شێوەیەکی سیستەماتیکی دەزگا چەوسێنەرەکانی باشوور ڕیفۆرمبکەن. بۆیە فاکتەری سەرەکی دروستکردنی وەرچەرخانی مێژوویی بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە باشووردا بریتیبوو لە هێزدارکردنی ڕەشپێستە ئەمەریکییەکان لە باشوور و کۆتاییهاتنی باڵادەستی بێتەحەدای نوخبەکانی باشوور.

دەزگا سیاسییەکانی باشوور، بەر لە جەنگی ناوخۆ و دوای جەنگیش، لۆجیکێکی ڕوونی ئابوورییان هەبوو کە زۆر جیاوازی نەبوو لە لۆجیکەکەی ڕژێمی ڕەگەزپەرستی ئەفریقای باشوور: ئەویش بریتیبوو لە مسۆگەرکردنی

هێزی کاری هەرزان بۆ چاندنگەکانیان. بەڵام بە هاتنی ساڵانی ١٩٥٠ کان ئەم لۆجیکە کەمتر ناچارکار بوو. یەکێك لە هۆکارەکانی ئەمە بریتیبوو لەوەی لێشاوێکی گەورەی کۆچکردنی ڕەشپێستەکان لە باشوورەوە بەرەو دەرەوە دەستیپێکردبوو، ئەمەش بەهۆی ڕۆچوونی ئابووری مەزن و دوەم جەنگی جیهانی·بوو. لە ساڵانی ١٩٤٠ کان و ١٩٥٠ کان دا ئەم کۆچکردنە گەیشتە سەد هەزار کەس لە ساڵێك دا. هەر لەو دەمەدا نوێکارییە تەکنەلۆجییەکان لە کشتوکاڵ دا، هەرچەندە بەهێواشی خرانەگەڕ، پشتبەستنی خاوەن چاندنگەکانی بە هێزی کاری هەرزان کەمکردەوە. بەشی زۆری هێزی کار لە چاندنگەکان دا بۆ چنینی پەموو بەکاردەهێنرا. لە ساڵی ١٩٥٠ دا نزیکەی هەموو پەمووی باشوور بە دەست لێدەکرایەوە. بەڵام بە ئامێرکردنی چنینی پەموو داخوازی بۆ ئەم جۆرە کارە کەمکردەوە. بە هاتنی ساڵی ١٩٦٠، لە ویلایەتە سەرەکییەکانی ئەلەباما و لویزیانا و میسیسیپی نزیکەی نیوەی بەرهەمهێنانی پەموو لە ڕێگەی ئامێرەوە ئەنجامدەدرا. لە کاتێکدا کە زەحمەت تر بوو ڕەشپێستەکان لە باشوور دا بهێڵرێنەوە، ئەوان وایان لێهات کە وازلێهێنانیان لە لایەن خاوەن چاندنگەکان ئەستەم نەبوو. بۆیە هۆکاری کەمتر هەبوون بۆ نوخبەکان بۆ شەڕکردن لەسەر هێشتنەوەی دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرە کۆنەکان. ئەمە مانای ئەوە نەبوو کە ئەوان ئارەزوومەندانە گۆڕینی دەزگاکانیان دا پەسەند کرد. لە بری ئەمە، ململانێیەکی درێژخایەن دەستیپێکرد. هاوپەیمانییەکی نائاسایی لە نێوان ڕەشپێستەکانی باشوور و دەزگا کراوە فیدراڵییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان دا هێزێکی توانایداری دروستکرد دوور لە چەوسانەوەی باشوور بەرەو مافی سیاسی و مەدەنی یەکسان بۆ ڕەشپێستەکانی باشوور کە لە کۆتایی دا کۆسپی گەورەی بەردەم گەشەکردنی ئابووری باشووری ویلایەتە یەکگرتوەکانی لەناوبرد.

گرنگترین پاڵنەر بۆ گۆڕانکاری لە بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکانەوە سەرچاوەیانگرت. ئەوە هێزدارکردنی ڕەشپێستەکانی باشوور بوو کە پێشڕەوی ئەم گۆڕنکارییە بوو، هەروەك لە مۆنتگۆمێری، لە ڕێگەی ڕووبەڕووبوونەوەی دەزگا چەوسێنەرەکانی دەووبەریان و لە ڕێگەی داواکردنی مافەکانیان و ناڕەزایی دەربڕین لە ڕێگەی خۆسازدانیان بۆ بەدەستهێنانی ئەو مافانە. بەڵام ئەوان لەم هەوڵانەیان دا تەنیا نەبوون چونکە باشووری ویلایەتە یەکگرتوەکان

وولاتێکی جیا نەبوو، نوخبەکانی باشوور دەستیان کراوە نەبوو بەو شێوەیەی نوخبەکانی گواتیمالا هەیانبوو، بۆ نموونە. وەك بەشێك لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، هەمان دەستوور و یاسا فیدراڵییەکان بە سەر باشووریش دا جێبەجێدەکران. داواکاری بۆ گۆڕانکاری بنەڕەتی لە باشووردا دواجار پشتگیری ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندن و یاسادانان و دادگای باڵای بەدەستهێنا تاڕادەیەك لەبەر ئەوەی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان توانی دەنگی خۆی بگەیەنێتە دەرەوەی باشوور و بەمەش توانی پشتگیری حکومەتی فیدراڵی بەدەستبهێنێ.

هەوڵەکانی فیدراڵی بۆ گۆڕینی دەزگاکان لە باشووردا بە بڕیاری دادگای باڵا لە ساڵی ١٩٤٤ دا دەستیپێکرد لە ڕێگەی بڕیاری ئەوەی کە هەڵبژاردنە سەرەتاییەکان کە تەنیا دانیشتوانە سپیپێستەکە دەیانتوانی خۆیان بپاڵێون، نایاسایی بوو. هەروەك بینیمان ڕەشپێستەکان لە ساڵانی ١٨٩٠ کان دا لەبەر دانانی مەرجی دانی باجی خانوبەرە و تاقیکردنەوەی خوێندەواری مافی دەنگدانیان نەبوو. ئەم تاقیکردنەوانە بە شێوەیەکی ڕۆتینی خراپ بەکاردەهێنران بۆ جیاکاری ڕەگەزی دژی ڕەشپێستان، لە کاتێك دا دەرفەت دەدرایە سپیپێستانی نەخوێندەوار و هەژار دەنگبدەن. لە نموونەیەکی بەناوبانگ دا لە ساڵانی ١٩٦٠کان لە لویزیانا دەنگدەرێکی سپیپێست بە خوێندەوار دانرا کاتێك وەڵامی پرسیارێکی دەربارەی دەستووری ویلایەتەکە بەم شێوەیە دایەوە "FRDUM FOOF SPETGH". بڕیاری دادگای باڵا لە ساڵی ١٩٤٤ دا دەسپێژێك بوو لە شەڕێکی درێژخایەن دا بۆ کردنەوەی سیستەمی سیاسی لەبەردەم ڕەشپێستان دا. دادگا دەرکی بەوە کردبوو کە کەمکردنەوەی کۆنترۆڵی سپیپێستان بەسەر حیزبە سیاسییەکانەوە چ گرنگیەکی هەبوو.

ئەو بڕیارە، دادگاییکردنەکەی براون و بۆردی پەروەردەی بە دوادا هات لە ساڵی ١٩٥٤ دا، کە تیایدا دادگای باڵا بڕیاری دا جیاکردنەوەی ڕەشپێستان لە سپیپێستان لە قوتابخانە و شوێنە گشتیەکانی تردا کە لە لایەن ویلایەتەوە سەپێنرا بوو، نادەستووری بوو. لە ساڵی ١٩٦٢ دا دادگا کۆڵەکەیەکی تری باڵادەستی نوخبە سپیپێستەکانی ڕوخاند: دابەشکردنی نایەکسانی نوێنەرایەتی لە ئەنجوومەنی یاسادانان دا. کاتێك نوێنەرایەتی لە دەسەڵاتی یاسادانان دا

بەشێوەی نایەکسان دابەشدەکرێ ـ هەروەك لە " شارەوانییە ڕزیوەکان" ی ئینگلتەرە بەر لە یەکەم یاسای ڕیفۆرم ـ هەندێك ناوچە یان دەڤەر نوێنەرایەتییەکی زیاتریان دەبێ لەوەی کە پێوستە بە گوێرەی ژمارەی دانیشتوانیان هەیانبێ. نوێنەرایەتی نایەکسان لە باشوور مانای ئەوەبوو ناوچە گوندنشینەکان، ناوجەرگەی نوخبە وەرزێرەکەی باشوور، خاوەن نوێنەرایەتی زۆر زیاتر بوون بە بەراورد لەگەڵ ناوچە شارییەکان دا. دادگای باڵا لە ساڵی ١٩٦٢ دا لە کاتی داوای بەیکەر و کار، بە بڕیارێك کۆتایی بەمە هێنا و ستانداردی " یەك کەس یەك دەنگ"ی هێنایەئاراوە.

هەموو بڕیارەکانی دادگای باڵا شتێکی ئەوتۆیان نەدەگەیاند ئەگەر جێبەجێنەکرانایە. لە ڕاستیدا بڕیاری یاسادانەرانی فیدراڵی لە ساڵانی ١٨٩٠ کان دا بۆ پێدانی مافی دەنگدان بە ڕەشپێستانی باشوور جێبەجێنەکرا چونکە جێبەجێکارانی لۆکاڵیی یاسا لە ژێر کۆنترۆڵی نوخبەکانی باشوور و حیزبی دیموکرات دا بوون و حکومەتی فیدراڵی ڕازیبوو مل بۆ ئەم بارودۆخە بدا. بەڵام کاتێك ڕەشپێستان کەوتنە ڕاپەرین دژی نوخبەکانی باشوور، ئەم قەڵایە بۆ جیم کرۆ هەرەسیهێنا و حیزبی دیموکرات کە لە لایەن کەسانێکەوە کە خەڵکی باشوور نەبوون سەرکردایەتیدەکرا، دژی جیاکاری ڕەگەزی وەستانەوە. دیموکراتە باشوورییەکان کە لەگەڵ ئەمەدا نەبوون و لە ژێر دروشمی مافی ویلایەتەکان بەناوی حیزبی دیموکراتەوە خۆیان ڕێکخستەوە و لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ساڵی ١٩٤٨ دا بەشداری هەڵبژاردنیان کرد. پاڵێوراوەکەیان، سترۆم سێرمۆند لە چوار ویلایەت دا بردیەوە و لە کۆلێجی دەنگدان دا ٣٩ دەنگی بەدەستهێنا. بەڵام ئەمە زۆر دووربوو لە دەسەڵاتی حیزبی دیموکراتی یەکگرتوو لە سەر ئاستی سیاسەتەکانی نیشتمانی دا و دەستگرتن بەسەر ئەو حیزبە دا لە لایەن نوخبەکانی باشوورەوە. هەڵمەتی هەڵبژاردنی سترۆن سێرمۆند تەرکیزی خستبوە سەر تەحەداکردنی توانای حکومەتی فیدراڵی بۆ دەستوەردان لە دەزگایانی باشوور. ئەو هەڵوێستی خۆی بە ڕوونی خستەڕوو ( *خاتوونان و ئاغایان، ئەمەوێ پێتان بڵێم کە سوپا لەشکری پێویستی نییە بۆ ناچارکردنی دانیشتوانی باشوور تا واز لە جیاکاری ڕەگەزی بهێنن و ڕەگەزی ڕەشپێست بهێننە ناو شانۆ و مەلەوانگە و ماڵ و کڵێساکانمانەوە)*

دەرکەوت ئەو هەڵە بوو. بڕیارەکانی دادگای باڵا مانای ئەوەبوو کە

ئامرازەکانی پەروەردە، جیاکاری ڕەگەزیی تیانەمێنێ، لەوانە زانکۆی میسیسیپی لە ئۆکسفۆرد. لە ساڵی ١٩٦٢ دا، دوای شەڕێکی یاسایی درێژ، دادگاکانی فیدراڵی بڕیاریان دا کە جەیمس مێریدس، کە گەنجێکی ڕەشپێستی هەڵکەوتووی هێزی ئاسمانی بوو، ڕێگەی پێبدرێ لە زانکۆی "ئۆلی میس" بخوێنێ. بەرەنگاربوونەوەی جێبەجێکردنی ئەم بڕیارە لە لایەن ئەوانەوە ڕێکخرا کە پێیان دەواترا ئەنجوومەنەکانی هاوڵاتییان و یەکەم ئەنجوومەنی لەم جۆرە لە ساڵی ١٩٥٤ لە ئینديانۆلای میسیسیپی دامەزرابوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەهێشتنی جیاکاری ڕەگەزی لە باشوور. حاکمی ویلایەتەکە، ڕۆز بارنێ، بە ئاشکرا لەسەر تەلەفزیۆن لە ١٣ ئەیلولدا فەرمانی دادگای بۆ نەهێشتنی جیاکاری ڕەتکردەوە. ئەو ڕایگەیاند کە زانکۆکانی ویلایەتەکە دادەخرێن بەر لەوەی هەڵوەشاندنەوەی جیاکاری پەسەندبکەن. دوای دانوستاندنێکی زۆر لە نێوان بارنێ و سەرۆك جۆن کەنەدی و وەزیری داد ڕۆبەرت کەنەدی لە واشنتۆن، حکومەتی فیدراڵی لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێزەوە بڕیارەکەی جێبەجێکرد. ڕۆژێك دیاریکرا بۆ هێنانی مێریدس بۆ ئۆکسفۆرد لە لایەن پۆلیسی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە. ئەو سپیپێستانەی بڕوایان بە باڵادەستی خۆیان هەبوو کەوتنە خۆڕێکخستن. لە ٣٠ ئەیلولدا، ڕۆژێك بەر لەوەی مێریدس بگاتە زانکۆکە، پۆلیسی ویلایەتە یەکگرتوەکان چوونە ناو زانکۆوە و دەورەی باڵاخانەی کارگێڕی یان دا. گروپێکی نزیکەی ٢,٥٠٠ کەسی کۆبوونەوە بۆ دەربڕینی ناڕەزایی و هەر زوو ئاژاوە دەستپێکرد. پۆلیسەکان گازی فرمێسك هێنەریان بەکارهێنا بۆ بڵاوەپێکردنی ئاژاوەگێڕان، بەڵام هەر زوو ڕووبەڕووی تەقە بوونەوە. لە کاتژمێر ١٠ ی شەوی ئەو شەوەدا، لەشکری فیدراڵی هاتنە ناو شارەکەوە بۆ گێڕانەوەی ئاسایش. زۆری پێنەچوو ٢٠,٠٠٠ سەرباز و ١١,٠٠٠ پاسەوانی نیشتمانی هاتنە ناو ئۆکسفۆردەوە. ٣٠٠ کەس دەسگیرکران. مێریدس بڕیاری دا لە ناو زانکۆدا بمێنێتەوە، کە لە لایەن پۆلیسی ویلایەتە یەکگرتوەکان و ٣٠٠ سەربازەوە پارێزگاری لێکرا بەرامبەر هەڕەشەکانی کوشتنی. لە کۆتایی دا ئەو زانکۆی تەواوکرد.

یاسا فیدراڵییەکان کۆڵەکەی پرۆسەی ڕیفۆرمی دەزگایی بوون لە باشووردا. لە کاتی دەرکردنی یەکەم یاسای مافە مەدەنییەکان دا لە ساڵی ١٩٥٧ دا، سترۆم سێرمۆند کە ئەو کاتە سێنەتەر بوو، بە بێوەستان بۆ ماوەی بیست

چوار کاتـژمێر و هـەژدە خولـەك قـسەیکرد بـۆ ڕێگـرتن یـان بەلایەنیکەمـەوە دواخـستنی دەرچـوونی یاسـاکە. لـە کـاتی قـسەکردنەکەی دا هـەموو شـتێکی خوێندەوە، هەر لە بەلاغی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی تا چەندین کتێبـی جیـاوازی تەلەفۆن. بەڵام هیچ سوودێکی نەبوو. یاسـای سـاڵی ١٩٥٧ ڕێخۆشـکار بـوو بـۆ دەرچوونی یاسای مافە مەدەنییەکانی ساڵی ١٩٦٤ کە هەموو یاسا و پراکتیـسە جیاکارییە ڕەگەزییەکانی ویلایەتەکانی کردە نایاسایی. یاسای مـافی دەنگـدانی سـاڵی ١٩٦٥، ڕایگەیانـد کـە تاقیکردنـەوەی خوێنـدەواری بـاجی خانوبـەرە و شـێوازەکانی تـری بێبـەریکردنی ڕەشپێـستانی باشـوور لـە مـافی دەنگـدان، نایاسـایی بـوون. ئـەو یاسـایە چـاودێرییەکی زۆر زیـاتری فیـدراڵی خـستە سـەر هەڵبژاردنەکان لە ویلایەتەکان دا.

کاریگەریی هەموو ئەو ڕووداوانە بریتیبوو لە گۆڕانکاری گرنگ لە دەزگایـانی ئـابووری و یاسـایی لـە باشـوور دا. بـۆ نموونـە، لـە میسیـسیپی تـەنیا ٥٪ دانیشتوانی ڕەشپێست کە مافی دەنگدانیان هەبوو لە ساڵی ١٩٦٠ دا دەنگیاندا. بە هاتنی ساڵی ١٩٧٠، ئەم ژمارەیە بەرزبۆوە بۆ ٥٠٪. لە ئەلـەباما و باشـووری کارۆلینا، لە ١٠٪ ەوە لە ساڵی ١٩٦٠ دا بـەرزبۆوە بـۆ ٥٠٪ لـە سـاڵی ١٩٧٠ دا. ئەم پاتێرنانە سروشتی هەڵبژاردنەکانی لە ئاستی ناوخۆ و نەتەوەیی دا گۆڕی. لەمەش گرنگتر، پشتگیری سیاسی لە لایەن حیزبی دیموکراتی باڵادەستەوە بـۆ دەزگا چەوسێنەرەکان کە جیاکارییان دژی ڕەشپێستەکان دەکرد نـەما. ئـیتر ڕێگا کراوە بوو بۆ کۆمەڵێك گۆڕانکاری لە دەزگایانی ئابووری دا. پێش ڕیفۆرمـە دەزگاییەکانی ساڵانی ١٩٦٠ کان، ڕەشپێستان نزیکەی بە تـەواوی لـە کـارکردن لـە کارگـەکانی قومـاش دا دوورخرابوونـەوە. لـە سـاڵی ١٩٦٠ دا تـەنیا ٥٪ کارمەندانی کارگەکانی قوماش لە باشووردا ڕەشپێست بـوون. یاسـاکانی مافـە مەدەنییەکان ئەم جیاکارییەیان وەستاند. بە هـاتنی سـاڵی ١٩٧٠ ئـەم ڕێژەیـە بـەرزبۆوە بـۆ ١٥٪ و لـە سـاڵی ١٩٩٠ دا ڕێژەکـە بریتیبـوو لـە ٢٥٪. جیاکـاریی ئابووری دژی ڕەشپێستان بەرەو کەمبوونەوە چوو، دەرفەتـەکانی خوێنـدن بـۆ ڕەشپێستان بـە شـێوەیەکی بەرچاو ڕووی لـە باشـبوون کـرد و بـازاڕی کـاری باشوور بوە بـازاڕێکی زیـاتر ڕکابـەر. لەگـەڵ سـەرهەڵدانی دەزگـا کراوەکـان دا بەرەوپێشچوونی خێرای ئـابووری هاتـەئاراوە لـە باشـووردا. لـە سـاڵی ١٩٤٠ دا ویلایەتـەکانی باشـوور تـەنیا ٥٠٪ی ئاسـتی داهـاتی تـاکی ویلایەتـە

یەکگرتوەکانیان هەبوو. ئەمە لە کۆتایی ١٩٤٠ کان و لە ١٩٥٠ کان دا بەرەو گۆڕان چوو. بە هاتنی ساڵی ١٩٩٠ بۆشاییەکە نەما.

هەروەك لە بۆتسوانا، کلیلی گۆڕانکاری لە باشووری ویلایەتە یەکگرتوەکان دا بریتیبوو لە پەرەپێدانی دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوە. ئەمەش شانبەشانی ناڕەزایی ڕوو لە زیادی ڕەشپێستان هات کە بەدەست دەزگایانی چەوسێنەری باشوورەوە دەیاننالاند و ڕۆچوونی حوکمی تاك حیزبی کە حیزبی دیموکرات بوو لە باشووردا. جارێکیتر ئەو دەزگایانەی لە ئارادابوون ڕێگای گۆڕانکارییەکانیان خۆشکرد. لەم بارەدا زۆر گرنگ بوو کە دەزگایانی باشوور کەوتبوونە ناو دەزگایانی کراوەی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە و ئەمەش ئەو بوارەی دروستکرد کە ڕەشپێستانی باشوور لە کۆتایی دا حکومەت و دەزگایانی فیدراڵی مۆبیلیزە بکەن بەرەو دۆزەکەی خۆیان. هەموو پرۆسەکەش ئاسانتر کرا بەهۆی ئەو ڕاستییەوە کە، کۆچکردنی بەلێشاوی ڕەشپێستەکان لە باشوور و بە ئامێرکردنی بەرهەمێنانی لۆکە، بارودۆخە ئابوورییەکەی بە شێوەیەك گۆڕیبوو کە نوخبەکانی باشوور کەمتر ویستی بەگژداچوونەوەیان تێدا مابوو.

## لە دایکبوونەوەی چین

حیزبی کۆمیۆنیست بە سەرکردایەتی ماو تسیتۆنگ لە کۆتایی دا لە ساڵی ١٩٤٩ دا ناسیۆنالیستەکانی لەسەر حوکم لابرد کە چیانگ کای شێك سەرکردایەتیدەکردن. کۆماری گەلی چین لە ١ ی تشرینی یەکەم دا دامەزرا. ئەو دەزگا سیاسی و ئابوورییانەی دوای ساڵی ١٩٤٩ دروستکران یەکجار چەوسێنەر بوون. لە ڕووی سیاسییەوە، دەزگاکان دیکتاتۆریەتی حیزبی کۆمیۆنیستیان بەرجەستەکرد. لەو کاتەوە هیچ ڕێکخراوێکی تری سیاسی لە چین ڕێگەی پێنەدراوە. تا مردنی لە ساڵی ١٩٧٦ دا، ماو بەتەواوی دەستی بەسەر حیزبی کۆمیۆنیست وحکومەت دا گرتبوو. شانبەشانی ئەم دەزگا ئەسۆریتاری و چەوسێنەرانە دەزگایانی ئابووری یەکجار چەوسێنەر سەریانهەڵدا. ماو، هەر زوو هەموو زەوییەکانی کردە موڵکی دەوڵەت و هەموو جۆرە مافێکی موڵکداری لە چاوترکانێك دا هەڵوەشاندەوە. ئەو خاوەن زەوی و هەموو ئەوانەی لای وابوو دژی ڕژێمن، لە سێدارە دا. ئابووری بازاڕ بە شێوەیەکی بنەڕەتی

هەڵوەشێنرایەوە. دانیشتوانی ناوچە گوندنشینەکان بەرەبەرە لە ناو کێڵگە هەرەوەزییەکان دا کۆکرانەوە. پارە و کرێی ڕۆژانە گۆڕان بۆ "خاڵی کارکردن" کە دەتوانرا بگۆڕێنەوە بە کەلوپەل. پاسپۆرتی ناوخۆیی لە ساڵی ١٩٥٦ دا هێنرایەئاراوە و گەشتکردن بەبێ مۆڵەتی گونجاو قەدەخەکرا بۆ زیادکردنی کۆنترۆڵی سیاسی و ئابووری. بە هەمانشێوە هەموو پیشەسازییەکان کرانە موڵکی دەوڵەت. ماو، هەوڵێکی تموحاوی دەسپێکرد بۆ گرنگیدان بە پەرەپێدانی خێرای پیشەسازی لە ڕێگەی بەکارهێنانی پلانە پێنج ساڵییەکانەوە کە لەسەر مۆدێلی پلانەکانی سۆڤیەت داڕێژرابوون.

بە هەمانشێوەی هەموو دەزگا چەوسێنەرەکان، ڕژێمەکەی ماو هەوڵیدەدا دەرامەتەکانی ئەو وڵاتە گەورەیەی کەوتە ژێردەستییەوە، بخاتە بندەستی خۆیەوە. هەورەك حکومەتی سیارا لیۆن لە ڕێگەی بۆردی فرۆشتن کردی، حیزبی کۆمیۆنیستی چینیش فرۆشتنی بەروبومەکانی وەك برنج و دانەوێڵەی قۆرخکرد و ئەمەی بەکاردەهێنا بۆ باج وەرگرتنی زۆر لە جووتیاران. بە کۆتاییهاتنی دوەم پلانی پێنج ساڵە، هەوڵەکان بۆ بە پیشەسازیبوون لە دوای ساڵی ١٩٥٨ ەوە گۆڕان بەرەو ( تەکانی گەورە بۆ پێشەوە) ی نێوزڕاو. ماو ڕایگەیاند کە بەرهەمی پۆڵا لە ماوەی ساڵێك دا دەبێتە دوو هێندە بە پشتبەستن بە کورەی بچووکی "لاکۆڵان". ئەو بانگەشەیکرد لە ماوەی پازدە ساڵ دا چین بە ئاستی بەرهەمهێنانی بەریتانیا دەگاتەوە. تەنیا کێشە ئەوەبوو کە هیچ ڕێگایەکی گونجاو نەبوو بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە. بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی پلانەکە، دەبوایە ئاسنی سکراپ پەیدابکرایە و خەڵك مەنجەڵ و تاوە و تەنانەت ئامرازە کشتوکاڵییەکانی وەك پاچەکۆڵە و گاسنەکانیان بتوانایەتەوە. کرێکاران لە بری ئەوەی گرنگی بە کێڵگەکانیان بدەن خەریکی دروستکردنی پۆڵا بوون لە ڕێگەی لەناوبردنی گاسنەکانیان و بەمەش لەناوبردنی توانای داهاتوویان بۆ تێرکردنی خۆیان و وڵاتەکەیان. ئەنجامەکەش بریتیبوو نە برسێتیەکی کارەساتاوی لە ناوچە گوندنشینەکانی چین دا. هەرچەندە کاریگەریی سیاسەتەکانی ماو بە بەراورد لەگەڵ کاریگەریی ووشکەساڵی لە هەمان ماوەدا جێگەی مشتومڕی باسکارانە، بەڵام کەس گومانی لە ڕۆڵی ناوەندی تەکانی گەورە بۆ پێشەوە نییە لە مردنی بیست تا چل ملیۆن کەس دا. بە تەواوی نازانین چەند کەس مردن، چونکە چین بە سەرۆکایەتی

ماو، ژمارەی مردوەکانی نەبژاردوە کە ئەو دڕندایەتییانە تۆماربکەن. داهاتی تاك بە بڕی یەك لەسەر چوار کەمیکرد.

ئەنجامێکی تەکانی گەورە بۆ پێشەوە ئەوەبوو کە ئەندامێکی باڵای حیزبی کۆمیۆنیست، دێنگ سیاوپینگ، کە جەنەراڵێکی سەرکەوتووی سەردەمی شۆڕش و سەرکردەی هەڵمەتی "دژە ڕاستڕەوان" بوو کە بوە هۆی کوشتنی چەندین "دوژمنانی شۆڕش"، هەڵوێستی خۆی گۆڕی. لە کۆنفرانسێك دا لە ساڵی ١٩٦١ دا لە گوانگزۆ لە باشووری چین، دۆنگ لای وابوو ( کێشە نییە پشیلە ڕەش بێ یان سپی بێ، ئەگەر مشك بگرێ ئەوا پشیلەیەکی باشە). کێشە نییە پۆلیسییەکان کۆمیۆنیستی بن یان نا، چین پێویستی بەو پۆلیسییانەیە کە هانی بەرهەمهێنان دەدەن تا بتوانێ خەڵکەکەی تێربکا.

لەگەڵ ئەمەش دا هەر زوو دێنگ تووشی ئازار کرا بەهۆی دەربڕینی هەڵوێستێکی پراکتیکیەوە. لە ١٦ مایسی ساڵی ١٩٦٦، ماو ڕایگەیاند کە شۆڕش لەبەردەم هەڕەشەدایە لە لایەن بەرژەوەندی "بۆرجوازییەکان" کە بنکۆڵی کۆمەڵگای کۆمیۆنیستی چین دەکەن و هەوڵی دامەزراندنەوەی کاپیتالیزم دەدەن. لە بەرامبەر ئەمەدا ئەو شۆڕشی مەزنی کەلتووری پرۆلیتاریای ڕاگەیاند کە بە شۆڕشی کەلتووری ناودەبرێ. شۆڕشی کەلتووری لە شازدە خاڵ پێکهاتبوو. یەکەم خاڵ بەم شێوەیە دەستپێکرد:

*(هەرچەندە بۆرجوازییەت لە سەر حوکم لابرا، بەڵام هێشتا هەوڵدەدا ئایدیا و کەلتوور و نەریت و ئاکارە کۆنەکان بەکاربهێنێ بۆ گەندەڵکردنی جەماوەر و مێشك تێکدانیان و هەوڵدەدا ڕێگە خۆشبکا بۆ گەڕانەوەی خۆی. پێویستە پرۆلیتاریا بە پێچەوانەی ئەمەوە کاربکا: پێویستە ڕووبەڕوو بەرپەرچی هەموو تەحەداکانی بۆرجوازی بداتەوە لە مەیدانی ئایدۆلۆجی دا و ئایدیا و کەلتوور ونەریت وئاکارە نوێکانی پرۆلیتاریا بەکاربهێنێ بۆ گۆڕینی شێوەی بیرکردنەوەی هەموو کۆمەڵگا. لە ئێستادا ئامانجمان بریتییە لە خەباتکردن دژی ئەو کەساتەی لە پێگەی دەسەڵاتدان و ڕێگەی سەرمایەدارییان گرتۆتەبەر، ئامانجمان ڕەخنەگرتن و بەرپەرچدانەوەی دەسەڵاتە ئەکادیمییەکانی بۆرجوازی کۆنەپەرست و ئایدۆلۆجی بۆرجوازی و هەموو چینە چەوسێنەرەکان و گۆڕینی پەروەردە و ئەدەب و هونەر و هەموو بەشەکانی تری سەرخانە کە لەگەڵ بنەماکانی ئابووری سۆشیالیستی دا یەکناگرنەوە، لە پێناوی قایمکردن و*

*پەرەپێدانی سیستەمی سۆشیالیستی دا ).*

هەر زوو شۆڕشی کەلتووری بەهەمانشێوەی تەکانی گەورە بۆ پێشەوە، کەوتە لەناوبردنی ئابووری و ژیانی چەندین کەس. چەندین یەکەی پاسەوانانی سوور لە سەرتاسەری وولآت دا پێکهێنران: ئەندامانی گەنج و سەرگەرمی حیزبی کۆمیۆنیست کە فێری سەرکوتکردنی بەهەڵستکارانی ڕژێم بوون. چەندین کەس کوژران یان گیران یان تووشی دوورخستنەوە بوون لە ناوخۆدا. ماو، بۆخۆی بە ڕەقی وەڵامی نیگەرانییەکانی دایەوە بەرامبەر ئاستی زەبروزەنگیەکان و ڕایگەیاند *(ئەم پیاوە، هیتلەر، تەنانەت دڕەندەتر بوو، تا زیاتر دڕندەبێت باشترە، ئایا ئێوەش بەو شێوەیە بیرناکەنەوە؟ تا خەڵك زیاتر بکوژی، زیاتر شۆڕشگێڕ دەبێت).*

دێنگ، کە بۆخۆی بە سەرمایەداری ژمارە دوو ناودەبرا، لە ساڵی ١٩٦٧ دا خرایە بەندیخانەوە و دواتر لە ساڵی ١٩٦٩ دا دوورخرایەوە بۆ پارێزگای جیانگسی بۆ کارکردن لە کارگەیەکی دروستکردنی تراکتۆر دا لە ناوچەیەکی گوندنشین دا. دواتر لە ساڵی ١٩٧٤ دا هێنرایەوە و ماو لە لایەن سەرۆك وەزیران زۆ ئینالی ڕازیکرا تا بکرێتە جێگری یەکەمی سەرۆك وەزیران. لە ساڵی ١٩٧٥ دا دێنگ سەرپەرشتی داڕشتنی سێ دۆکیومێنتی حیزبی کرد کە ئەگەر پەیرەو بکرانایە ئاڕاستەیەکی نوێیان دەهێنایەئاراوە. دۆکیومێنتەکان داوای ژیاندنەوەی خوێندنی باڵا و گەڕانەوە بۆ هاندانی مادییان کرد لە پیشەسازی و کشتوکاڵ و لابردنی "چەپڕەوەکان" لە حیزب دا. لە کاتێك دا تەندروستی ماو بەرەو خراپی دەچوو، دەسەڵات زیاتر لە چنگی ئەو ژمارە کەمەی چەپڕەوەکان دا چڕدەبۆوە کە دێنگ سیاوپینگ ویستی لە دەسەڵات دووریان بخاتەوە. ژنەکەی ماو، جیانگ کینگ و سێ کەس لە هاوکارە نزیکەکانی کە پێکەوە پێیان دەوترا تاقمە چوار کەسییەکە، لایەنگرانی بەهێزی شۆڕشی کەلتووری و سەرکوتکردنەکان بوون کە لە ئەنجامی ئەم شۆڕشەدا ئەنجامدران. ئەوان ویستیان بەردەوامبن و ئەم نەخشە ڕێگایە بەکاربهێنن بۆ بەڕێوەبردنی وولآت لە ژێر دیکتاتۆریەتی حیزبی کۆمیۆنیست دا. لە ٥ی نیسان دا ئاهەنگێڕانێك بۆ ڕێزلێنان لە ژیانی زو ئینالی لە مەیدانی تیانامین دا گۆڕا بۆ دەربڕینی ناڕەزایی بەرامبەر حکومەت. تاقمی چوار کەسی لۆمەی دێنگیان کرد بۆ خۆپیشاندانەکان و جارێکیتر هەموو پێگەکانی لێسەندرایەوە و دەرکرا. لە جیاتی ئەوەی بتوانێ

چەپڕەوەکان دەربکا، دێنگ بۆخۆی لە لایەن چەپڕەوەکانەوە دەرکرا. لە دوای مردنی ژۆ ئینالی، ماو، هوا گوفینگی وەك سەرۆك وەزیران بە وەکالەت دیاریکرد لە جیاتی دێنگ. لەو ماوەیەدا کە بۆشایی دەسەلات لە سالی ١٩٧٦ دا دروستبوو، هوا توانی دەسەلاتی شەخسی خۆی زۆر زیادبکا.

لە ئەیلول دا وەرچارخانێکی مێژوویی ڕوویدا. ماو مرد. حیزبی کۆمیۆنیستی چین لە ژێر کۆنترۆلی ماودا بووبوون و تەکانی گەورە بۆ پێشەوە و شۆڕشی کەلتووری بە زۆری بە دەسپێشخەری ئەو کرابوون. بە ڕۆیشتنی ماو بۆشاییەکی ڕاستەقینە لە دەسەلات دا دروستبوو کە بوە هۆی ململانیێ لە نێوان ئەوانەی دید و باوەڕی جیاوازیان هەبوو دەربارەی ئاکامەکانی گۆڕانکاری. تاقمی چوارکەسی ویستیان بەردەوامبن لەسەر سیاسەتەکانی شۆڕشی کەلتووری وەك تەنیا ڕێگایەك بۆ قایمکردنی دەسەلاتی خۆیان و هی حیزبی کۆمیۆنیست. هوا گوفینگ ویستی واز لە شۆڕشی کەلتووری بهێنێ، بەلام نەیدەتوانی خۆی زۆر لەو شۆڕشە دووربخاتەوە چونکە بەرزبوونەوەی خۆی لە ناو حیزب دا بەهۆی کاریگەرییەکانی ئەم شۆڕشەوە بوو. لە جیاتی ئەمە ئەو کەوتە لایەنگیری بۆ گەڕانەوە بۆ شێوازێکی زیاتر هاوسەنگی دیدی ماو کە لە " دوو هەرچی " دا هەروەك ڕۆژانەی خەلك کە ڕۆژنامەی حیزبی کۆمیۆنیستی چین بوو لە سالی ١٩٧٧ دا ئاماژەپێدا. هوا ڕایگەیاند ( ئێمە بێلێبڕان هەرچی ئەو پۆلیسیانەی ماو بڕیاری لەسەر داون دەیانهێلینەوە و بێدوودلی هەرچی فەرمانێك لە لایەن ماوەوە دروچوبێ پەیڕەویدەکەین)

دێنگ سیاوپینگ نەیوست ڕژێمی کۆمیۆنیستی هەلبوەشێتەوە و جێگەکەی بە بازاڕی کراوە بگیرێتەوە بەهەمانشێوەی هوا. ئەویش بەشێك بو لەو گروپە خەلکەی بەهۆی شۆڕشی کۆمیۆنیستیەوە هاتبونە سەر دەسەلات، بەلام ئەو و لایەنگرانی لەو بڕوایەدا بوون کە دەکرا بڕێکی باش لە گەشەکردنی ئابووری ئەنجامبدرێ بێئەوەی کۆنترۆلی سیاسییان بخەنە مەترسییەوە: ئەوان مۆدێلێکی گەشەکردنیان هەبوو لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا کە هەڕەشەی لە دەسەلاتیان نەدەکرد چونکە دانیشتوانی چین پێویستی یەکجار زۆریان هەبوو بە باشبوونی ئاستی ژیانیان و لەبەر ئەوەش کە هەموو ئۆپۆزیۆسۆنێکی واتادار بەرامبەر حیزبی کۆمیۆنیست لە سەردەمی ماو و شۆڕشی کەلتووری دا لەناوبرابوون. بۆ بەدەستهێنانی ئەمە، ئەوان حەزیانکرد

نەك تـەنیا شۆڕشـی کـەلتووری ڕەتبکەنـەوە بـەڵکو بەشـێکی زۆری پاشمـاوەی دەزگایی ماو ڕەتبکەنەوە. ئەوان تێگەیشتن کە گەشەکردنی ئـابووری تـەنیا بـە هـەنگاونانی گـرنگ بـەرەو دەزگایـانی ئـابووری کـراوە ئەنجامـدەدرێ. بۆیـە ویستیان چاکسازی لە ئابووری دا بکەن و پـشتگیری هێزەکانی بـازاڕ و هانـدان بکەن. ویستیشیان ڕادەی خاوەنداریێتی تایبـەت فـراوان بکـەن و ڕۆڵـی حیزبـی کۆمیۆنیست لـە نـاو کۆمـەڵگا و ئیـدارە دا کەمبکەنـەوە و واز لـە چـەمکی وەك خەباتی چینایەتی بهێنن. گروپەکەی دێنگ کراوە بوون بـۆ وەبـەرهێنانی بیـانی وبازرگـانی نێودەوڵـەتی و حـەزیانکرد سیاسـەتێکی کـاراتر بگرنـە بـەر بـۆ تێکەڵاوبوون لەگەڵ ئابووری جیهانی دا. لەگەڵ هەموو ئەمانەش دا، سنوور دانرا و دروسـتکردنی دەزگایـانی کـراوەی ڕاسـتەقینە و کەمکردنـەوەی بەرچـاوی دەسەڵاتی حیزبی کۆمیۆنیست لەسەر ئابووری، تەنانەت لە ناو بژاردەکانیش دا نەبوون.

خاڵی وەرچەرخان بۆ چین بریتیبوو لە دەسەڵاتی هوا گۆفینگ و ویستی ئەو بۆ بەکارهێنانی ئەم دەسەڵاتە دژی تاقمی چوار کەسی. لـە مـاوەی یـەك مـانگ دوای مردنـی مـاو، هـوا کودێتایـەکی دژی تـاقمی چـوار کەسـی ئەنجامـدا و هـەموویانی دەسـگیرکرد. دواتـر لـە ی ۱۹۷۷ دا دێنگـی خـستەوە شـوێنەکەی خۆی. هیچ شتێك دەربارەی ئەم ئاڕاستەیەی ڕووداوەکان و هەنگاوە گرنگەکانی دواتر حەتمی نەبوون کە بوونە هۆی ئەوەی هوا بۆخۆی لە ڕووی سیاسییەوە لە لایەن دێنگ سیاوپینگ وەلابنرێ. دێنگ بواری ڕەخنەی جەماوەری لە شۆڕشـی کەڵتووری ڕەخـساند و دەسـتیکرد بـە پڕکردنـەوەی پێگـە سـەرەکییەکانی نـاو حیزبی کۆمیۆنیست لـە هـەموو ئاستەکان دا بـە کەسـانێك کـە وەك خـۆی لـەو ماوەیەدا تووشی ئازار بووبوون. هوا نەیدەتوانی حاشـا لـە شۆڕشـی کـەلتووری بکا و ئەمەش لاوازیکرد. هوا، بە بەراورد لەگەڵ ئەوانی تـردا، تـازە هـاتبوە نـاو ناوەندی دەسەڵات و خاوەنی ئەو تۆڕە لـە پەیوەنـدی و تێکەڵاوییـە نافەرمییـە نـەبوو کـە دێـنگ لـە مـاوەی چـەندین سـاڵ دا دروسـتیکردبوو. لـە زنجیرەیـەك ووتاردا، دێنگ دەستیکرد بـە ڕەخنـەگرتن لـە سیاسـەتەکانی هـوا. لـە ئـەیلولی ساڵی ۱۹۷۸ دا، ئەو بە ئاشکرا هێرشیکردە سەر "دوو هەرچییەکە" و ئاماژەیدا کە لە بری ئەوەی بهێڵرێ هەرچییەك مـاو ووتبـووی سیاسـەتەکان دیاریبکـەن، ڕێگای دروست بریتییە لە "دۆزینەوەی ڕاستیەکان لە ناو واقیع دا".

دێنگ زیرەکانە دەستیکرد بە کارکرنە سەر هوا لە ڕێگەی فشاری خەڵکەوە و ئەمەش بە بەهێزترین شێوە لە بزووتنەوەی دیموکراسی دیواردا ڕەنگیدایەوە لە ساڵی ١٩٧٨ دا، کە تیایدا خەڵك سکاڵاکانی خۆیان دەربارەی وولات لەسەر دیوارێك لە بەیژینگ هەڵواسی. لە تەمووز ١٩٧٨ دا یەکێك لە لایەنگرانی دێنگ، هو کیۆمو، هەندێك پرینسیپی بنەڕەتی بۆ ڕیفۆرمی ئابووری خستەڕوو. لەو ڕیفۆرمانە، بیرۆکەی ئەوەی کە کۆمپانیاکان بواری دەسپێشخەری زیاتر و دەسەڵاتیان پێبدرێ تا بڕیاری خۆیان دەربارەی بەرهەمهێنان بدەن. ڕێگە بدرێتە نرخ تا داخوازی و خستنەڕوو پێکەوە ببەستنەوە لە بری ئەوەی نرخەکان لە لایەن حکومەتەوە دیاریبکرێن و ڕێکخستنی ئابووری لە ڕێگەی یاسا و ڕێساکانەوە بە شێوەیەکی گشتی کەمبکرێتەوە. ئەمانە پێشنیازی ڕادیکاڵانە بوون، بەڵام لە کاتێك دا کران کە کاریگەری دێنگ ڕوو لە زیادی بوو. لە تشرینی دوەم و کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٨ دا، پلێنۆمی سێیەمی یازدەیەمین کۆمیتەی ناوەندی حیزب بڕیاری لەسەر بەرەوپێشچوونێکی گرنگ دا. سەرەڕای ناڕەزایی هوا، بڕیاردرا کە لەو کاتە بەدواوە جەختکردنی حیزب لەسەر خەباتی چینایەتی نابێ، بەڵکو لەسەر نوێکردنەوەی ئابووری دەبێ. پلێنۆم هەندێك تاقیکردنەوەی کاتی ڕاگەیاند لە ڕێگەی گەلاڵەکردنی "سیستەمی بەرپرسیارێتی خێزان" لە هەندێك پارێزگادا، کە هەوڵدانێك بوو بۆ کەنارخستنی کشتوکاڵی هەرەوەزی و خستنەگەری هاندانی ئابووری لە کشتوکاڵ دا. لە ساڵی دواتردا، کۆمیتەی ناوەندی دانینا بە بایەخی بیرۆکەی " دۆزینەوەی ڕاستییەکان لەناو واقیع دا" و ڕایگەیاند کە شۆڕشی کەلتووری کارەساتێکی گەورە بوو بۆ گەلی چین. لە هەموو ئەم ماوەیەدا، دێنگ خەریکی چەسپاندنی لایەنگرانی خۆی بوو لە پێگە گرنگەکانی حیزب و سوپا و حکومەت دا. هەرچەندە ئەو دەبوایە بە هێواشی دژی لایەنگرانی هوا لە ناو کۆمیتەی ناوەندی دا ڕەفتاربکا، بەڵام ئەو بناخەی هاوتەریبی دەسەڵاتی هوای دامەزراند. لە ساڵی ١٩٨٠ دا هوا ناچارکرا واز لە سەرۆکایەتی وەزیران بهێنێ و لە لایەن جاو زیانگ جێگەیگیرایەوە. لە ساڵی ١٩٨٢ دا هوا لە کۆمیتەی ناوەندی دوورخرایەوە، بەڵام دێنگ لەوێدا نەوەستا. لە کۆنگرەی دوازدەیەمی حیزب لە ساڵی ١٩٨٢ دا و دواتر لە کۆنفرانسی نەتەوەیی حیزب لە ساڵی ١٩٨٥ دا، ئەو توانی گۆڕانکاری تەواو لە سەرکردایەتی حیزب و کادیرە باڵاکان دا بکا.

ئەوانەی هاتن کەسانی گەنجتر و خاوەن مێشکی ریفۆرم بوون. ئەگەر یەکێك ساڵی ١٩٨٠ بەراوورد بکا لەگەڵ ساڵی ١٩٨٥ دا، ئەوا لە ساڵی ١٩٨٥ دا بیست و یەك لە بیست و شەش ئەندامەکەی مەکتەبی سیاسی و هەشت لە یازدە ئەندامەکەی سکرتاریەتی حیزبی کۆمیۆنیست و دە لە هەژدە جێگرەکەی سەرۆك وەزیران گۆڕابوون.

کاتێك دێنگ و ریفۆمخوازەکان شۆڕشە سیاسییەکەیان گەیاندە ئەنجام و کۆنترۆڵی دەوڵەتیان کرد، دەستیانکرد بە ئەنجامدانی زنجیرەیەکی تری گۆڕانکاری لە دەزگا ئابوورییەکان دا. ئەوان لە کشتوکاڵەوە دەستیانپێکرد: بە هاتنی ساڵی ١٩٨٣، دوابەدوای بیرۆکەکانی هۆ کیاومۆ، سیستەمی بەرپرسیارێتی خێزان کە هاندانی ئابووری خستبوە بەردەم جووتیاران، بە شێوەیەکی سەرتاسەری پەیڕەوکرا. لە ساڵی ١٩٨٥ دا کڕینی ئیلزامی دانەوێڵە لە لایەن دەوڵەتەوە وازیلێهێنرا و بە سیستەمێکی گرێبەستی زیاتر خۆویستانە جێگەیگیرایەوە. کۆنترۆڵی ئیداری لەسەر نرخی کشتوکاڵ بە شێوەیەکی بەرچاو لە ساڵی ١٩٨٥ دا کەمکرایەوە. لە ئابووری شارنشین دا، کۆمپانیا دەوڵەتییەکان ئۆتۆنۆمی زیاتریان درایە و چواردە "شاری کراوە" دەسنیشانکران و ڕێگەیان پێدرا وەبەرهێنانی بیانی ڕاکێشن.

ئابووری گوندنشین یەکەمجار دەستیکرد بە گەشەکردن. خستنەگەڕی هاندان بوە هۆی زیادبوونی زۆری بەرهەمداریی کشتوکاڵی. بە هاتنی ساڵی ١٩٨٤ بەرهەمی دانەوێڵە یەك لە سەر سێ زیاتر بوو لەوەی ساڵی ١٩٧٨، هەرچەندە ژمارەیەکی کەمتر خەڵك خەریکی کشتوکاڵ بوون. ژمارەیەکی زۆری خەڵك لە پیشەسازییە نوێکانی ناوچە گوندنیشنەکان دا کاریان پەیداکرد کە پێیان دەوترا بازرگانی شارۆچکەکان. ئەمانە لە دوای ساڵی ١٩٧٩ ەوە ڕێگەیان پێدرا لە دەرەوەی پلانی پیشەسازی دەوڵەتی گەشەبکەن، کاتێك ڕەزامەندی درا کە کۆمپانیا نوێکان بۆیان هەبوو ڕکابەری لەگەڵ کۆمپانیا دەوڵەتییەکان دا بکەن. بەرەبەرە هاندانی ئابووریش هێنرایە ناو سێکتەری پیشەسازییەوە بەتایبەتی بۆ ناو پیشەسازییەکانی لە لایەن دەوڵەتەوە بەڕێوەدەبران، هەرچەندە لەم قۆناخەدا ئاماژەیەك نەبوو بۆ بەتایبەتکردن کە دەبوو تا ناوەڕاستی ١٩٩٠ کان چاوەڕێبکا.

لە دایکبوونەوەی چین، لەگەڵ دوورکەوتنەوەی گرنگ لە یەکێك لە

چەوسێنەرترین کۆمەڵە دەزگایانی ئابووری دا بەرەو دەزگایانی کراوەتر، هاتە کایەوە. هاندانی بازاڕ لە کشتوکاڵ و پیشەسازی دا و دواتریش وەبەرهێنانی بیانی و تەکنەلۆجی، چینی خستە سەر ڕێڕەوی گەشەکردنی ئابووری خێرا. هەروەك لە چاپتەری داهاتوو دا زیاتر باسیدەکەین، ئەمە گەشەکردن بوو لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا، هەرچەندە ئەو دەزگایانە هێندەی ئەوانەی سەردەمی شۆڕشی کەلتووری سەرکوتکار نەبوون و تەنانەت ئەگەر دەزگا ئابوورییەکانیش بوونە دەزگایانی نیمچە کراوە. هەموو ئەمانە نابێ لە ئەندازەی ڕادیکالانەی گۆڕانکارییەکان لەدەزگایانی ئابووری چین کەمبکەنەوە. چین قاڵبەکەی شکاند، ئەگەر چی ئاڵوگۆڕی لە دەزگا سیاسییەکانی دا نەکرد. هەروەك لە بۆتسوانا و باشووری ویلایەتە یەکگرتووەکان دا، گۆڕانکارییە گەورەکان لە کاتی سەرهەڵدانی وەرچەرخانێکی مێژوویی دا ئەنجامدران ـ لە حاڵەتی چین دا، دوای مردنی ماو سەریانهەڵدا. ئەم گۆڕانکارییانە هەروەها پەیوەست بوون، لەڕاستی دا زۆریش پەیوەست، لە کاتێك دا هیچ شتێك دەربارەی ئەوەی تاقمە چوارکەسیەکە ململانێیەکەیان لەسەر دەسەلات بدۆڕێنن حەتمی نەبوو، ئەگەریش نەیاندۆراندایە، چین ئەو گەشەکردنە ئابوورییە بەردەوامەی بەخۆوە نەدەبینی کە لە ماوەی سی ساڵی ڕابوردودا ئەنجامیداوە. ئەو مەینەتی و ئازارە مرۆییانەی کە تەکانی گەورە بۆ پێشەوەو شۆڕشی کەلتووری هێنایانەئاراوە، داخوازی پێویستیان بۆ گۆڕانکاری دروستکرد کە بوە هۆی ئەوەی دێنگ سیاوپینگ و هاوپەیمانەکانی بتوانن خەباتە سیاسییەکە ببنەوە.

بۆتسوانا و چین و باشووری ویلایەتە یەکگرتووەکان، بە هەمانشێوەی شۆڕشی شکۆدار لە ئینگلتەرە دا و شۆڕشی فەرەنسی و گێرانەوەی مەیجی لە یابان، ڕوونکردنەوەی زیندوون کە مێژوو چارەنووس نییە. سەرەڕای بوونی بازنەی ناهەمواری، دەشێ دەزگایانی چەوسێنەر بە دەزگایانی کراوە جێگەیان بگیرێتەوە. بەڵام ئەمە نە ئۆتۆماتیك و نە ئاسانیشە. یەکگرتنی فاکتەرەکان، بەتایبەتی وەرچەرخانی مێژوویی، شانبەشانی هاوپەیمانییەکی فراوان لە نێوان ئەوانەی هەوڵی ریفۆرم دەدەن یان دەزگایانی لەبار کە لە ئارادان، پێویستن بۆ نەتەوەیەك تا تەکان بەرەو دەزگایانی کراوە بدا. جگە لەمانە هەندێك بەخت بایەخی گەورەی هەیە چونکە مێژوو هەمیشە بە شێوەیەکی پەیوەست هەنگاو دەنێ.

# ١٥

# تێگەیشتن لە خۆشگوزەرانی و هەژاری

## بنچینە مێژووییەکان

لە جیهان دا جیاوازی گەورە لە ئاستی گوزەرانی خەڵك دا هەیە. تەنانەت هەژارترین هاوڵاتی ویلایەتە یەکگرتوەکان خاوەن داهات و خزمەتگوزاری تەندروستی و پەروەردە و دەرفەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەوتۆن کە زۆر زیاترن لەوانەی لەبەردەم زۆربەی ئەو خەڵکەدان لە وولاتانی باشووری بیابانی ئەفریقی و باشووری ئاسیا و ناوەڕاستی ئەمەریکا دا دەژین. جیاوازی نێوان باشوور و باکووری کۆریا و هەردوو نۆگالس و ویلایەتە یەکگرتوەکان و مەکسیك ئەوەمان بیردەخەنەوە کە ئەم جیاوازییانە تا ڕادەیەك دیاردەی نوێن. پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر، مەکسیك، شوێنی دەوڵەتی ئازتێك، بێگومان لە قەوارەکانی باکوور دەوڵەمەندتر بوە و تا سەدەی نۆزدەیەم ویلایەتە یەکگرتوەکان پێش مەکسیك نەکەوتەوە. بوشایی نێوان هەردوو نۆگالس تەنانەت زۆر نوێترە. باشوور و باکووری کۆریا هەردووکیان لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەوە بەر لە دابەشکردنیان، لە سەر هێڵی ٣٨، لە دوای دوەم جەنگی جیهانی، لە یەکتر جیانەدەکرانەوە. بە هەمانشێوە، زۆربەی جیاوازییە ئابوورییەکانی ئەمڕۆ کە لە دەوری خۆمان دەیانبینین لە ماوەی دوو سەد ساڵی ڕابووردودا سەریانهەڵداوە.

ئایا هەموو ئەمانە هەر دەبوایە بەو شێوەیە بوونایە؟ ئایا لە ڕووی مێژوویی یان جوگرافیا و کەلتووری و ئێتنییەوە پێشتر دیاریکرابوو کە لە ماوەی دوو سەد ساڵی ڕابوردوودا ئەورووپای ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتوەکان و یابان هێندە دەوڵەمەندتر بن لە وولاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا و ئەمەریکای لاتین و چین؟ ئایا شتێکی حەتمی بوو کە شۆڕشی پیشەسازی لە سەدەی هەژدەیەم دا لە بەریتانیا دا سەرهەڵبدا و دواتریش بڵاوبێتەوە بۆ ئەورووپای ڕۆژئاوا و

دەسکردەکانی ئەوروپا لە باکووری ئەمەریکا و ئوسترالیا؟ ئایا جیهانێکی پێچەوانەی ئەوەی ئەمڕۆ کە تیایدا شۆڕشی شکۆدار و شۆڕشی پیشەسازی لە پیرۆ دا ڕوویدەن و دواتریش ئەورووپای ڕۆژئاوا بکاتە کۆلۆنی و سپییپێستەکان بکاتە کۆیلە، ئەگەری هاتنەئارای هەیە یان تەنیا جۆرێکە لە خەیاڵی زانستی مێژوویی؟

بۆ وەڵامدانەوە، یان ڕاست تر تەنانەت بۆ ووردبوونەوە لە لۆجیکی ئەم پرسیارانە، پێویستمان بە تیۆرییەکە دەربارەی ئەوەی بۆچی هەندێك نەتەوە خۆشگوزەرانن، لە کاتێك دا ئەوانی تر شکستخواردوون و هەژارن. پێویستە ئەم تیۆرییە ئەو فاکتەرانەی کە خۆشگوزەرانی دروستدەکەن و هێواشیدەکەنەوە، لەگەڵ بنچینە مێژووییەکانیان دا دیاریبکا. ئەم کتێبە ئەو جۆرە تیۆرییە دەخاتەڕوو. هەموو دیاردەیەکی ئالۆزی کۆمەڵایەتی، وەك بنەماکانی ڕێچکە جیاوازە ئابووری و سیاسییەکانی سەدان قەوارە لە جیهان دا، ڕەنگەچەندین هۆکاری هەبێ و زۆربەی زانایانی کۆمەڵایەتی والێدەکەن کە خۆیان بە دووربگرن لە دانانی تیۆری سادە و (Noncausual) و بەکارهاتوو بەشێوەیەکی فراوان، لە جیاتی ئەمە، ئەوان بەدوای شرۆڤەی جیاوازدا دەگەڕێن بۆ ئاکامە هاوشێوەکان کە لە سەردەم وناوچە جیاوازەکان دا سەرهەڵدەدەن. ئێمە تیۆرییەکی سادەمان خستۆتەڕوو، ئەم تیۆرییەمان بەکارهێناوە بۆ شرۆڤەکردنی زۆربەی کۆنتۆرەکانی پەرەسەندنە ئابووری و سیاسییەکان لە جیهان دا هەر لە سەردەمی شۆڕشی کشتوکاڵییەوە. هەڵبژاردنی ئەم تیۆرییە لە لایەن ئێمەوە لەو باوەڕە ساکارەوە نەهاتوە کە تیۆری لەم جۆرە شرۆڤەی هەموو شتەکان دەکا، بەڵکو لەو باوەڕەوە سەرچاوەی گرتوە کە پێویستە تیۆری وامان لێبکا جەخت لە سەر دیاردە لێکچووەکان بکەین، هەندێجار لەسەر حسابی دەرهێنیان لەناو چەندین ووردەکاری سەرنجڕکێش دا. کەواتە تیۆری سەرکەوتوو کوێرانە ووردەکارییەکان بەرهەمناهێنێتەوە، بەڵکو شرۆڤەیەکی بە سوود و لە ڕووی تەجربییەوە بناخە پتەو بۆ کۆمەڵە پرۆسەیەکی جیاواز ئەنجامدەدا، لە کاتێك دا ئەو هێزە سەرەکییانەش ڕووندەکاتەوە کە کاریگەرییان هەیە.

تیۆرییەکەمان هەوڵیداوە لە ڕێگەی کارکردن لە سەر دوو ئاست ئەمە ئەنجامبدا. یەکەمیان بریتییە لە جیاکردنەوەی دەزگایانی ئابووری و سیاسی

چەوسێنەر لەودەزگایانەی کراوەن. دووەمیان بریتییە لەوەی بۆچی دەزگایانی کراوە لە هەندێك ناوچەی جیهان دا سەریانهەڵدا و لەوانی تردا سەریانهەڵنەدا. لە کاتێك دا ئاستی یەکەمی تیۆرییەکەمان دەربارەی لێکدانەوەیەکی دەزگاییە بۆ مێژوو، ئاستی دووەم دەربارەی ئەوەیە کە چۆن مێژوو ڕێچکەی دەزگایی نەتەوەکانی دارشتوە.

ئەوەی بۆ تیۆرییەکەی ئێمە بنەڕەتییە، بریتییە لە پەیوەندی نێوان دەزگایانی ئابووری و سیاسی کراوە لەگەڵ خۆشگوزەرانیدا. دەزگایانی ئابووری کراوە کە مافی موڵکداری دەچەسپێنن و مەیدانی گەمەی تەخت دروستدەکەن و هانی وەبەرهێنان دەدەن لە تەکنەلۆجییا و بەهرەی نوێدا، زیاتر هاوکاری گەشەکردنی ئابووری دەکەن لە چاو دەزگایانی ئابووری چەوسێنەردا کە بەشێوەیەك پێکهێنراون تا سامان لە ژمارەیەکی زۆر لە لایەن ژمارەیەکی کەمەوە دەرکێشن و ناتوانن مافی موڵکداری بپارێزن، یان هاندان دروستبکەن بۆ چالاکییە ئابوورییەکان. دەزگایانی ئابووری کراوە پشتگیری دەزگایانی سیاسی کراوەوە دەکەن و ئەوانیش لە لایەن دەزگایانی سیاسی کراوەوە پشتگیریدەکرێن. دەزگایانی سیاسی کراوە ئەو دەزگایانەن کە دەسەڵاتی سیاسی بە فراوانی و بە شێوازێکی پلورەلیستی دابەشدەکەن و لە توانایاندایە ئەندازەیەك لە مەرکەزیەتی سیاسی دەستەبەربکەن بۆ چەسپاندنی یاسا و ئاسایش کە بناخەی مافی موڵکداری جێگیر و ئابووری بازاڕی کراوەن. بە هەمانشێوە، دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر بەشێوەیەکی توند بەستراونەتەوە بە دەزگایانی سیاسی چەوسێنەر کە دەسەڵات لە چنگی ژمارەیەکی کەم دا چڕدەکەنەوە و ئەو ژمارە کەمەش دواتر هاندانیان بۆدروستدەبێ تا دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر پەرەپێبدەن و بیانهێڵنەوە بۆ قازانجی خۆیان و ئەو سامانەی دەستیاندەکەوێ بەکاربهێنن بۆ بەهێزکردنی دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتی سیاسی دا.

ئەم ئارەزوانە ئەوە ناگەیەنن کە دەزگایانی ئابووری و سیاسی چەوسێنەر لەگەڵ گەشەکردنی ئابووری دا یەکناگرنەوە. بە پێچەوانەوە، هەموو نوخبەیەك حەزدەکا تا دەکرێ هانی گەشەسەندنی ئابووری بدا بۆ ئەوەی سامانێکی زۆرتر دەربکێشێ. دەزگایانی چەوسێنەر، کە بەلایەنیکەمەوە ئاستی کەمی مەرکەزیەتی سیاسییان بەدەستهێناوە، زۆرجار دەتوانن بڕیك گەشەکردن

ئەنجامبدەن. ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە ناتوانرێ گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا بەردەوامی پێبدرێ، ئەویش لەبەر دوو هۆکار. یەکەمیان ئەوەیە کە گەشەسەندنی بەردەوامی ئابووری پێویستی بە نوێکاری هەیە و ناشکرێ نوێکاری لە تێکدانی بنیاتنەر لە مەیدانی ئابووری دا جیابکرێتەوە کە کۆن بە نوێ دەگۆڕێ و پەیوەندییە سیاسییە چەسپیوەکان لەقدەکا. لەبەر ئەوەی ئەو نوخبانەی زاڵن بەسەر دەزگا چەوسێنەرەکان دا لە تێکدانی بنیاتنەر دەترسن، بەرەنگاری ئەو تێکدانە دەبنەوە و هەر گەشەسەندنێك کە لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا چەکەرەدەکا لە سەرەنجام دا تەمەن کورت دەبێ. دوەمیان ئەوەیە کە لەبەر ئەوەی ئەوانەی بەسەر دەزگا چەوسێنەرەکان دا زاڵن دەتوانن قازانجێکی زۆر بکەن لە سەر حسابی باقی کۆمەڵگا، ئەوە دەگەیەنێ کە دەسەڵاتی سیاسی لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا یەکجار خوازراوە و چەندین گروپ و تاکەکان والێدەکا لە پێناوی بەدەستهێنانی دا شەڕبکەن. لە ئەنجامی ئەمەدا، هێزی دەسەڵاتدار لە کۆمەڵگادا دروستدەبن کە کۆمەڵگایانی بن دەسەڵاتی دەزگایانی چەوسێنەر بەرەو ناسەقامگیری دەبەن.

هاوکاری لە نێوان دەزگایانی ئابووری و سیاسی چەوسێنەردا بازنەی ناهەمواری دروستدەکا کە لەو ڕێگەیەوە دەزگایانی چەوسێنەر، کاتێك دامەزران، دەمێننەوە. بە هەمانشێوە بازنەی بەختەوەری پەیوەندی بە دەزگایانی ئابووری و سیاسی کراوەوە هەیە. بەڵام نە بازنەی ناهەمواری و نە بازنەی بەختەوەری ئەبەدی نین. لە ڕاستیدا، هەندێك نەتەوەی ئەمڕۆ لە سایەی دەزگایانی کراوەدا دەژین، هەرچەندە دەزگایانی چەوسێنەر لە مێژوودا دەزگایانی باو بوون، بەڵام ئەو کۆمەڵگایانە توانیویانە قاڵبەکە بشکێنن و بەرەو دەزگایانی کراوە بگوێزنەوە. شرۆڤەکانی ئێمە بۆ ئەم گواستنەوانە مێژوویین، بەڵام گواستنەوەکان لە ڕووی مێژووییەوە پێشتر دیارینەکراون. گۆڕانکاری دەزگایی سەرەکی کە مەرجە بۆ گۆڕانکاری ئابووری سەرەکی، لە ئەنجامی کارلەیەککردن لە نێوان دەزگا هەنووکەییەکان و وەرچەرخانی مێژوویی دا دروستدەبێ. وەرچەرخانە مێژووییەکان ڕووداوی سەرەکین کە باڵانسی ئابووری و سیاسی هەنووکەیی تێکدەدەن لە کۆمەڵگایەك یان چەندین کۆمەڵگا دا. نموونەی ئەو وەرچەرخانە مێژووییانە بریتین لە مردنی ڕەش، کە نیوەی

دانیشتوانی زۆربەی ناوچەکانی ئەورووپای لەناوبرد لە سەدەی چواردەیەم دا و کرانەوەی ڕێگاکانی بازرگانی ئەتڵەسی کە دەرفەتی زۆری قازانجکردنی بۆ چەندین کەس لە ئەورووپای ڕۆژئاوا دا ڕەخساند و شۆڕشی پیشەسازی، کە توانای گۆڕانکاری خێراو لە هەمانکات دا تێکدەری لە پێکهاتە ئابوورییەکان دا لەسەرتاسەری جیهان دا ئەنجامدا.

جیاوازییە دەزگاییە هەنووکەییەکان لە نێوان کۆمەڵگان دا ئەنجامی گۆڕانکارییە دەزگاییەکانی ڕابوردون. بۆچی ڕێڕەوی گۆڕانکاری دەزگایی لە نێوان کۆمەڵگاکان دا لە یەکتری جیاوازن؟ وەڵامی ئەم پرسیارە لەناو لێکترازانی دەزگایی دا دەستدەکەوێ. بەهەمان ئەو شێوەیەی کە جینی دوو کۆمەڵە زیندەوەری هاوشێوەی لە یەکتر دابڕا و بە هێواشی لە یەکتر دەترازێن بەهۆی بازدانی ڕێکەوت (Random Mutation)ەوە لەو پرۆسەیە دا کە پێیدەوترێ لێکترازانی پەرەسەندن یان جینی زیندەوەران، دوو کۆمەڵگای هاوشێوەش لە ڕووی دەزگاییەوە لە یەکتر دەترازێن، هەڵبەتە دیسانەوە بە هێواشی. ململانێ لەسەر داهات و دەسەڵات و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەسەر دەزگاکان، لە هەموو کۆمەڵگاکان دا بەردەوامە. ململانێکە زۆرجار ئەنجامێکی پەیوەست (contingent)ی هەیە، تەنانەت ئەگەر مەیدانی گەمەی ئەو ململانێیەی تیادا ئەنجامدەدرێ تەختیش نەبێ. ئەنجامی ئەم ململانێیە دەبێتە هۆی لێکترازانی دەزگایی. بەڵام مەرج نییە ئەم لێکترازانە پرۆسەیەکی لەسەر یەك کەڵەکەبوو بێ. مەرج نییە ئەو جیاوازییە بچووکانەی لە کاتێکی دیاریکراو دا پەیدادەبن بە تێپەڕبوونی کات گەورەتر ببن. بە پێچەوانەوە، هەروەك گفتوگۆکەمان دەربارەی بەریتانیای ڕۆما لە چاپتەری شەشەم دا دەریدەخات، جیاوازی بچووك سەرهەڵدەدەن و دواتر نامێنن و دواتریش جارێکیتر دەردەکەونەوە. بەهەرحاڵ، کاتێك وەرچەرخانێکی مێژوویی سەرهەڵدەدا، ئەم جیاوازییە بچووکانەی کە لە ئەنجامی لێکترازانی دەزگاییەوە پەیدابوون، ڕەنگە ئەو جیاوازییە بچووکانە بن کە پێویستن بۆ ئەوەی دوو کۆمەڵگای هاوشێوە بەشێوەیەکی بنەڕەتی لە یەکتر دووربکەونەوە.

لە چاپتەری حەوتەم و هەشتەم دا بینیمان کە سەرەڕای چەندین لێکچوون لە نێوان ئینگلتەرە و فەرەنسا و ئیسپانیا دا، وەرچەرخانی مێژوویی بازرگانی ئەتڵەسی زۆرترین کاریگەری گۆڕانکاریی لەسەر ئینگلتەرە هەبوو، لەبەر بوونی

ئەم جۆرە جیاوازییە بچووکانە ـ لەبەر پەرەسەندنەکانی سەدەکانی پازدەیەم و شازدەیەم، پاشای ئینگلتەرە نەیتوانی کۆنترۆڵی هەموو بازرگانی دەرەوە بکا، بەو شێوەیەی ئەم بازرگانییە بەزۆری لە ژێر مۆنۆپۆڵی پاشایەتیدا بوو لە فەڕەنسا و ئیسپانیا دا. لە ئاکام دا، لە فەڕەنسا و ئیسپانیا، ئەوە پاشایەتی و ئەو گروپانەی هاوپەیمانیان بوون سوودمەندی سەرەکی ئەو دەسکەوتە گەورانە بوون کە لە بازرگانی ئەتڵەسی و فراوانبوونی کۆلۆنیالیەوە دەستکەوتن، لە کاتێك دا لە ئینگلتەرە ئەو گروپانەی بە توندی دژی پاشایەتی بوون سوودیان لەو دەرفەتە ئابوورییانە وەرگرت کە بەهۆی ئەم وەرچەرخانە مێژووییەوە هاتنەئاراوە. هەرچەندە لێکترازانی دەزگایی دەبێتە هۆی دروستبوونی جیاوازی بچووك، بەڵام کارلێکردنی ئەم جیاوازییە بچووکانە لەگەڵ وەرچەرخانی مێژوویی دا دەبێتە هۆی لێکدوورکەوتنەی دەزگایی و ئەم لێکدوورکەوتنەوەیەش دەبێتە هۆی دروستکردنی جیاوازی دەزگایی گەورەتر کاتێك وەرچەرخانی مێژوویی داهاتوو کاری تێدەکا.

مێژوو کلیلە، چونکە ئەوە پرۆسە مێژووییەکانن کە، لە ڕێگەی لێکترازانی دەزگاییەوە، ئەو جیاوازییانە دروستدەکەن و هەر ئەو جیاوازییانەشن کە ڕەنگە لە کاتی وەرچەرخانە مێژووییەکان دا ڕۆڵی سەرەکی ببینن. وەرچەرخانە مێژووییەکان بۆخۆیان خاڵی وەرچەرخانی مێژووین. بازنەی ناهەمواری و بازنەی بەختەوەری ئەوە دەگەیەنن کە پێویستە دیراسەی مێژوو بکەین بۆ تیگەیشتن لە سروشتی جیاوازییە دەزگاییەکان کە لە ڕووی مێژووییەوە پێکهاتوون. تیۆرییەکەمان حەتمیەتی مێژوویی ناگەیەنێ ـ یان هەر جۆرێکی تری حەتمیەت. هەر لەبەر ئەم هۆیەیە کە وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەتای ئەم چاپتەرەمان پێ دەسپێکرد بریتییە لە نەخێر: پێویستیەکی مێژوویی نەبوو کە پیرۆ ببێتە وڵاتێکی هێندە هەژار تر لە ئەورووپای ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکان.

بەر لە هەموو شتێك، بە پێچەوانەی گریمانەکانی جوگرافیا و کەلتوورەوە، پیرۆ، تووشی هەژاری نەبوو لەبەر جوگرافیا یان کەلتوورەکەی. بە پێی تیۆرییەکەی ئێمە، ئەمڕۆ، پیرۆ لەبەر هۆکاری دەزگایی بەو ئەندازەیە لە ئەورووپای ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکان هەژارترە. بۆ ئەوەی لە هۆکارەکانی ئەمە تێبگەین، پێویستە پرۆسەی مێژوویی پەرەسەندنی دەزگایی لە پیرۆ دا

تێبگەین. هەروەك لـە چاپتەری دوەم دا بینیمـان، پێنج سـەد سـاڵ لەمەوبـەر ئیمپراتۆریەتی ئینکا، کە پیرۆی ئەمڕۆی ئەگرتـەوە، دەوڵەمەند تـر و لـە ڕووی تەکنەلۆجییەوە پێشکەوتوو تر و خاوەن مەرکەزیـەتی سیاسـی زیـاتر بـوو لـەو قـەوارە بـچووکترانەی لـە بـاکووری ئەمـەریکادا هـەبوون. خـاڵی وەرچـەرخان بریتیبـوو لـەو شـێوەیەی ئـەم ناوچـەیە بـەکۆلۆنی کـرا و چـۆن ئـەم شـێوازی کۆلۆنیکردنە جیاواز بوو لەوەی باکووری ئەمـەریکا. ئەمـە لـە ڕێگـەی پرۆسـەی مێژوویی پێشتر دیاریکراوەوە دروستنەبوو، بەڵکو وەك ئـەنجامێکی پەیوەسـتی چەندین پەرەسـەندنی دەزگـایی گـرنگ لـە کـاتی وەرچـەرخانە مێژووییـەکان دا دروسـتبوو. بەلایەنیکەمـەوە، سـێ فاکتـەر دەیتـوانی ئـەم ڕێـچکەیە بگـۆڕن و پاتێرنی درێژخایەنی زۆر جیاواز دروستبکەن.

یەکەم: جیاوازی دەزگایی لە نـاو هـەردوو ئەمـەریکا دا لـە مـاوەی سـەدەی پازدەیەم دا شێوازی بەکۆلۆنیکردنی ئەم ناوچانەی دارشت. باکووری ئەمـەریکا ڕێچکەیەکی دەزگایی جیاوازی لە پیرۆ، گرتە بەر چونکە باکووری ئەمەریکا بـەر لـە بـەکۆلۆنیکردن دانیـشتوانی کـەمی تێـدا نیـشتەجێبوو، ئـەو نیـشتەکارە ئەوروپیانـەی تێـدا نیـشتەجێبوو کـە دواتـر سـەرکەوتوانە دژی ئـەو نوخبەیـە وەستان کە کۆمپانیای ڤێرجینیا و پاشـایەتی ئینگلتـەرە هـەوڵی چەسپاندنیان دابوون. بە پێچەوانەوە، داگیرکارانی ئیسپانی لـە پـیرۆ دا دەوڵـەتێکی خـاوەن مەرکەزیەت و چەوسێنەریان دۆزییەوە کە توانیـان دەستیبەسـەردابگرن لەگـەڵ دانیشتوانێکی زۆر کە توانیان لە چـاندنگە و کانـەکان دا کاریـان پێبکـەن. هـیچ شـتێکیش دەربـارەی چـۆنیەتی بـاری زەوی هـەردوو ئەمـەریکا لـە ڕووی جوگرافییـەوە پێـشتر دیارینـەکرابوو کاتێـك کـە ئەوروپییـەکان گەیـشتنە ئـەو شـوێنانە. بـە هـەمان ئـەو شـێوەیەی کـە سـەرهەڵدانی دەوڵـەتێکی خـاوەن مەرکەزیەت بەسەرۆکایەتی شیام پاشا لە ناو بوشۆنگ دا ئەنجامی نوێکارییەکی گـەورەی دەزگـایی بـوو، یـان لەوانەیـە ئـەنجامی شۆڕشـێکی سیاسـی بـووبێ، هەروەك لە چاپتەری پێنجەم دا بینیمان، شارستانی ئینکـاش لـە پـیرۆ و زۆری دانیـشتوانی ئـەم ناوچـەیە، لـە ئـەنجامی نوێکارییـەکی گـەورەی دەزگـایی هاتەئاراوە. دەکرا ئەمانە لە باکووری ئەمەریکا دا ڕوویانبدایە، لـە جێگـای وەك دۆڵی میسیسپی یان تەنانەت لە باکووری ڕۆژهەلاتی ویلایەتە یـەکگرتوەکان دا. ئەگـەر ئەمـە ڕوویبدایـە، ڕەنگـە ئەوروپییـەکان خـاکی چـۆڵیان لـە ئەنـدیز و

دەوڵەتانی خاوەن مەرکەزیەتیان لە باکووری ئەمەریکا دا بدۆزیایەتەوە و ڕۆڵی ویلایەتە یەکگرتوەکان و پیرۆ پێچەوانە دەبۆوە. ئەوروپییەکان لە ناوچەکانی دەوری پیرۆ نیشتەجێدەبوون و ململانێ لە نێوان زۆربەی نیشتەکاران و نوخبەدا دەبوە هۆی دامەزراندنی دەزگایانی کراوە لە پیرۆ دا لە جیاتی باکووری ئەمەریکا. ڕێچکەکانی پەرەپێدانی دواتر ڕەنگە جیاواز بوونایە.

دوەم: لەوانەیە ئیمپراتۆریەتی ئینکا بەرەنگاری کۆلۆنیالی ئەوروپییەکان ببێتەوە، هەروەك یابان کردی کاتێك کەشتییەکانی کۆمۆدۆر پێری گەیشتنە کەنداوی ئیدۆ. هەرچەندە چەوساندنەوەی زیاتر لە لایەن ئیمپراتۆریەتی ئینکا، بە پێچەوانەی تۆکوگاوا لە یابان، بێگومان ئەگەری ئەنجامدانی شۆڕشێکی سیاسی هاوشێوەی ئەوەی گێڕانەوەی مەیجی زەحمەت تر ئەکرد، بەڵام پێویستییەکی مێژوویی نەبوو کە ئینکا بەتەواوی بچێتە بندەستی ئەوروپییەکانەوە. ئەگەر ئەوان بیانتوانیایە بەرگریبکەن و تەنانەت لە ڕووی دەزگاییەوە نوێکاری ئەنجامبدەن بەرامبەر ئەو هەڕەشانە، ئەوا هەموو ڕێچکەی مێژووی جیهانی نوێ و لەگەڵ ئەویش دا ڕەنگە سەراپای مێژووی جیهان جیاواز بوایە.

سێیەم و لە هەموویان ڕادیکاڵ تر: تەنانەت لە ڕووی مێژوویی و جوگرافی و کەلتوورییەوە پێشتر دیارینەکرابوو کە هەر دەبوایە ئەوروپییەکان جیهانیان بەکۆلۆنی بکردایە. دەکرا چینییەکان یان تەنانەت ئینکاکان بن. بێگومان ئەنجامی لەم چەشنە مەحاڵە، کاتێك لە گۆشەنیگای سەدەی پازدەیەمەوە سەیری جیهان دەکەین، لەو سەردەمەدا ئەوروپای ڕۆژئاوا لە هەردوو ئەمەریکا دا جێگەی خۆیان کردبۆوە و چین ڕووی بەرەو ناوەوە وەرگێرابوو. بەڵام ئەوروپای ڕۆژئاوای سەدەی پازدەیەم بۆخۆی ئەنجامی پرۆسەیەکی پەیوەستی لێکترازانی دەزگایی بوو کە بە وەرچەرخانە مێژووییەکان کوترابوو و هیچ شتێك دەربارەی ئەوروپا حەتمی نەبوو. دەسەڵاتدارەکانی ئەوروپای ڕۆژئاوا نەیاندەتوانی بەرەو پێش تەکانبدەن و دنیا داگیربکەن بەبێ چەندین وەرچەرخانی گرنگی مێژوویی. لەوانە ئەو ڕێڕەوە تایبەتە بوو کە فیودالیزم گرتیە بەر و لەو ڕێڕەوەدا کۆیلەیەتی نەهێشت و دەسەڵاتی پاشاکانی لاوازکرد و ئەو ڕاستییەی کە چەندین سەدەی دوای کۆتاییهاتنی هەزارەی یەکەم لە ئەوروپادا، پەرەسەندنی شارانی سەربەخۆ و لە ڕووی بازرگانییەوە تواناداری

بەخۆوە بینی و ئەو ڕاستییەی کە پاشاکانی ئەورووپا هێندە نەکەوتنە بەردەم هەڕەشەی بازرگانی دەرەوە و لە ئەنجامیشدا هەوڵیاننەدا تەگەرە بخەنە بەردەم ئەم بازرگانییە، بەو شێوەیەی ئیمپراتۆرەکانی چین لەسەردەمی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی مینگ دا کردیان و پەیدابوونی مردنی ڕەش، کە بناخەکانی سیستەمی فیوداڵی لەرزاند. ئەگەر ئەم ڕووداوانە بەشێوەیەکی جیاواز دەرکەوتنایە، ئەمڕۆ لە جیهانێکی زۆر جیاواز دا دەژیاین، جیهانێك کە تیایدا ڕەنگە پیرۆ لە ئەورووپای ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکان دەوڵەمەند تر بوایە.

بێگومان، توانای پێشبینیکردنی تیۆرییەك کە تیایدا جیاوازییە بچووکەکان و پەیوەستی ڕۆڵی سەرەکی ببینن، سنووردار دەبێ. کەم کەس لە سەدەی پازدەیەم و تەنانەت سەدەی شازدەیەم دا، ئەوە هەر باسی سەدەکانی دوای ڕمانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما مەکە، پێشبینی دەکرد کە پێشکەوتنی گەورە بەرەو دەزگایانی کراوە لە بەریتانیادا ڕوودەدا. ئەوە پرۆسەی لێکترازانی دەزگایی و سروشتی ئەو وەرچەرخانە مێژووییە بوو کە بەهۆی بازرگانی ئەتڵەسییەوە هاتەئاراوە، بوە هۆی ئەم پێشکەوتنە لەبەریتانیا دا ڕوویدا. کەسیش لەو بڕوایەدا نەبوو کە لە ناوەڕاستی شۆڕشی کەلتووری دا لە ساڵانی ١٩٧٠ کان دا چین لە ماوەیەکی کەمدا دەکەوێتە سەر ڕێڕەوەی گۆڕنکاری ڕادیکاڵی لە دەزگا ئابوورییەکانی دا و دواتریش دەکەوێتە سەر ڕێچکەی گەشەسەندنی خێرا. بە هەمانشێوە، مەحاڵە بە دڵنیاییەوە پێشبینی ئەوە بکرێ کە چۆنیەتی باری زەوی چۆن دەبێ لە ماوەی پێنج سەد ساڵی داهاتوودا. لەگەڵ ئەمەش دا، ئەمانە کەموکوڕی تیۆرییەکەی ئێمە نین. ئەو بەسەرهاتە مێژووییانەی تا ئێستا باسمانکردوون، ئەوە دەردەخەن کە هەر ڕێگایەکی پشتبەستوو بە حەتمیەتی مێژوویی — پشتبەستوو بە جوگرافیا و کەلتوور و تەنانەت فاکتەرە مێژووییەکانی تر- نادروستن. جیاوازییە بچووکەکان و پەیوەستی تەنیا بەشێك نین لە تیۆرییەکەمان، بەڵکو بەشێکن لە شێوازی مێژوو.

ئەگەر چی پێشبینی تەواو دەربارەی ئەوەی کام کۆمەڵگایانە لە داهاتوودا گوزەرانیان لەوانی تر باشتردەبێ، زەحمەتە، ئێمە لەم کتێبەدا بینیمان کە تیۆرییەکەمان بە شێوەیەکی باش شرۆڤەی جیاوازییە گشتییەکان لە خۆشگوزەرانی و هەژاری نەتەوان دا دەکا. لە بەشەکانی تری ئەم چاپتەرەدا دەبینین کە ئەم تیۆرییە هەندێك ڕێنمایی دەخاتەڕوو دەربارەی ئەوەی چ

جۆرێك لە کۆمەڵگاکان ئەگەری ئەنجامدانی گەشەکردنی ئابوورییان هەیە لە ماوەی چەندین دەیەی داهاتوودا.

یەکەم: بارنەکانی ناهەمواری و بەختەوەری برێکی زۆر بەردەوامی و خاوبوونەوە دروستدەکەن. نابێ هیچ گومانێك هەبێ کە لە ماوەی پەنجا تەنانەت سەد ساڵی داهاتوودا، ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئەورووپای ڕۆژئاوا، بە پشتبەستن بە دەزگا ئابووری و سیاسییە کراوەکانیان، دەوڵەمەند تر دەبن و زۆریش ڕێگەی تێدەچی کە زۆر دەوڵەمەندتر بن لە وڵاتانی باشووری بیابانی ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوەڕاستی ئەمەریکا یان باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا. لە چوارچێوەی ئەم پاتێرنە گشتییەدا، گۆڕانکاری دەزگایی گەورە لە سەدەی داهاتوو دا دێتەئاراوە و هەندێك لە وڵاتان قاڵبەکە دەشکێنن و لە وڵاتانی هەژارەوە دەبنە وڵاتانی دەوڵەمەند.

ئەو نەتەوانەی هیچ مەرکەزیەتێکی سیاسییان بەدەستنەهێناوە، وەك سۆماڵ و ئەفغانستان، یان ئەوانەی تووشی دارمانی دەوڵەت بوون، هەروەك هایتی لە ماوەی چەندین دەیەی ڕابوردوودا تووشی بوە، زۆر بەر لەوەی زەویلەرزە گەورەکەی ساڵی ٢٠١٠ ببێتە هۆی وێرانکردنی ژێرخانی وڵاتەکە، پێناچێ نە گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا ئەنجامبدەن و نە گۆڕانکاری گەورە بەرەو دەزگایانی کراوە ئەنجامبدەن. لە جیاتی ئەمە، ئەو نەتەوانەی لە ماوەی چەندین دەیەی داهاتودا ئەگەری گەشەکردنیان هەیە ـ هەڵبەت لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا ـ ئەو نەتەوانەن کە ئەندازەیەك لە مەرکەزیەتی سیاسییان بەدەستهێناوە. نموونەی ئەو دەوڵەتانە لە باشووری بیابانی ئەفریقادا، بریتین لە بروندی و ئەسیوپیاو ڕواندا، ئەمانە ئەو نەتەوانەن کە مێژوویەکی درێژی دەوڵەتی خاوەن مەرکەزیەتیان هەیە و تەنزانیا، کە توانیویەتی ئەم جۆرە مەرکەزیەتە ئەنجامبدا، یان بەلایەنیکەمەوە توانیویەتی هەندێك لە مەرجە پێشەکییەکان بۆ مەرکەزیەتی سیاسی دابینبکا. لە ئەمەریکای لاتین دا، بەڕازیل و چیلی و مەکسیك، کە نەك هەر مەرکەزیەتی سیاسییان بەدەستهێناوە، بەڵکو تەکانی گرنگیان داوە بەرەو دیموکراسی ساوا. تیۆرییەکەی ئێمە ئەوە پیشنیازدەکا کە ئەنجامدانی گەشەکردنی ئابووری بەردەوام لە کۆلۆمبیا دا زۆر زەحمەتە.

تیۆرییەکەی ئێمە ئەوەش پێشنیاز دەکا کە گەشەکردن لە سایەی

دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا، وەك چین، گەشەکردنێکی بەردەوام ناهێنێنەئاراوە و ئەگەری زۆر هەیە کە تینوگوڕی خۆی لەدەستبدا. بەدەر لەم حاڵەتانە، نارِوونی زۆر هەیە، بۆ نموونە، کوبا، لەوانەیە بەرەو دەزگایانی کراوە گواستنەوە ئەنجامبدا و ئاڵوگۆڕێکی گەورەی ئابووری ئەنجامبدا، یان لە بندەستی دەزگایانی ئابووری و سیاسی چەوسێنەردا بەردەوامبیّ. هەمان شت بۆ باکووری کۆریا و بێرما (میانمار) لە ئاسیا دا ڕاستە. کەواتە، لەکاتێك دا تیۆرییەکەمان ئامرازەکان دەرەخسێنیّ بۆ بیرکردنەوە دەربارەی ئەوەی چۆن دەزگاکان دەگۆڕێن و ئاکامەکانی ئەم گۆڕانانەچۆن دەبن، بەڵام سروشتی ئەم گۆڕانانە- ڕۆڵی جیاوازییە بچووکەکان و پەیوەستی - پێشبینی وردتر زەحمەت دەکەن.

تەنانەت پێویستە بە وریاییەکی زیاترەوە ڕاسپاردە بۆ پۆلسییەکان لەم شیکردنەوە گشتییەی بنچینەکانی خۆشگوزەرانی و هەژاری گەڵاڵەبکریّ. بەهەمان ئەو شێوەیەی کاریگەری وەرچەرخانە مێژووییەکان بەندن بە دەزگا هەنووکەییەکانەوە، چۆنیەتی کاردانەوەی کۆمەڵگایەکیش بۆ جێبەجێکردنی هەمان پۆلیسی بەندە بەو دەزگایانەوە کە لەئارادان. بێگومان هەموو تیۆرییەکەمان دەربارەی ئەوەیە چۆن نەتەوان دەتوانن هەنگاو بەرەو خۆشگوزەرانی بنێن - بە گۆڕینی دەزگاکانیان لە دەزگایانی چەوسێنەرەوە بۆ دەزگایانی کراوە. لە هەمانکات دا، ئەم تیۆرییە هەر لەسەرەتاوە ڕوونی دەکاتەوە کە ڕەچەتەی ئاسان بۆ بەدەستهێنانی ئەم گواستنەوەیە نییە. یەکەم، بازنەی ناهەمواری ئەوە دەگەیەنیّ کە گۆڕینی دەزگاکان زۆر زەحمەت ترە لەوەی دەردەکەویّ. بەتایبەتی، دەزگایانی چەوسێنەر دەتوانن خۆیان لە ژێر پەردەی جیاوازدا دروستبکەنەوە، هەورەك لە حاڵەتی یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکی دا لە چاپتەری دوازدەدا بینیمان. ئەو ڕاستیەی کە ڕژێمە چەوسێنەرەکەی موبارەك لە ڕێگەی نارەزاییەکی جەماوەرییەوە لە شوباتی ساڵی ٢٠١١ لەسەر تەخت لابرا، گەرەنتی ئەوە ناکا کە میسر ڕێچکەی بەرەو دەزگایانی کراوە دەگرێتەبەر. لە جیاتی ئەمە، ڕەنگە دەزگایانی چەوسێنەر خۆیان دروستبکەنەوە، سەرەڕای بوونی بزووتنەوەی هیوابەخش و زیندووی دیموکراسی. دوەم، لەبەر ئەوەی ڕێچکەی پەیوەستی مێژوو ئەوە دەگەیەنیّ کە زەحمەتە بزانریّ کارلێکردنێکی دیاریکراو لە نێوان وەرچەرخانە مێژووییەکان و

جیاوازییە دەزگاییە هەنووکەییەکان دا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دەزگایانی زیاتر کراوە یان چەوسێنەر، کارێکی پاڵەوانانە دەبێ کە فۆرمیولەی پۆلیسی گشتی بکەیت بۆ هاندانی گۆڕانکاری بەرە و دەزگایانی کراوە. لەگەڵ ئەمەش دا، تیۆرییەکەی ئێمە هێشتا بەسوودە بۆشیکردنەوەی پۆلیسی، چونکە وامان لێدەکا ئامۆژگاری خراپ دەسنیشانبکەین کە پشتی بە گریمانەی ناڕاست یان تێگەیشتنی ناتەواو بەستوە دەربارەی ئەوەی دەزگاکان چۆن دەگۆڕێن. لە مەدا، هەروەك لە زۆربەی شتەکان دا، دوورکەوتنەوە لە هەڵە گەورەکان، هێندەی هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی چارەسەری ئاسان، گرنگە و بگرە واقیعی تریشە. ڕەنگە ئەمە بە ڕوونی دیار بێ کاتێك ئێمە ڕاسپاردەی پۆلیسی لەبەرچاو دەگرین بۆ هاندانی "گەشەکردنی ئەسۆریتاری" کە پشت بە ئەزموونی سەرکەوتووی گەشەکردنی چین دەبەستێ لە ماوەی چەندین دەیەی ڕابوردودا. ئێمە دواتر باسیدەکەین کە بۆچی ئەو ڕاسپاردانە بۆ پۆلیسی نادروستن و بۆچی گەشەکردنی چین، بەو شێوەیەی تا ئێستا ئەنجامدراوە، شێوازێکی تری گەشەکردنە لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا و پێناچێ ببێتە پەرەسەندنی ئابووری بەردەوام.

## دڵڕفێنی گەشەکردنی ئەسۆریتاری

دای گیۆفانگ هەر زوو دەرکیکرد کە بوژانەوەی ناوچە شارییەکان بەڕێوەیە لە چین دا. ڕێگاوبانی نوێ و سەنتەری بزنس و شوێنی نیشتەجێبوون و باڵاخانەی بەرز لە هەموو شوێنێکی چین دا لە ساڵانی ١٩٩٠ەکان دا لە بڵاوبوونەوە دا بوون. دای، لای وابوو ئەم گەشەکردنە لە دەیەی دواتردا خێرا تر دەبێ. ئەو لەو بڕوایەدا بوو کە کۆمپانیاکەی، کۆمپانیای جینگسۆ تایین بۆ ئاسن و پۆڵا، وەك بەرهەمهێنەرێکی نرخ نزم دەتوانێ بازاڕێکی گەورە بۆخۆی دابین بکا بەتایبەتی بە بەراوورد لەگەڵ ئەو کارگە پۆڵایانەی هی دەوڵەت بوون و ناکارا بوون. دای، پلانی دروستکردنی کارگەیەکی زەبەلاحی پۆڵای دارشت و بە هاوکاری سەرکردە حیزبییە لۆکاڵەکان لە چانگزوو، لە ساڵی ٢٠٠٣ دا دەستیکرد بە دامەزراندنی کارگەکەی. لە ئازاری ساڵی ٢٠٠٤ دا بە فەرمانی

حیزبی کۆمیۆنیست لە بەیژینگ پرۆژەکە ڕاگیرا و دای لەبەر کۆمەڵە هۆکارێك کـە هــەرگیز ئاشــکرا نــەکران خرایــە بەندیخانــەوە. ڕەنگــە دەســەڵاتداران لایــانوابووبێ کــە هەنــدێك بەڵگــەی تاوانبــارکردنی دای لــە حــساباتەکانی دا دەدۆزنــەوە. لــەو بارودۆخــەدا، دای پێــنج ســاڵی دواتــری لــە بەندیخانــە و دەستبەســەری مــاڵ دا بەســەربرد و لــە ســاڵی ۲۰۰۹ دا بــە تۆمــەتێکی بــچووك تاوانبــار کــرا. تــاوانی ڕاســتەقینەی دای بریتیبــوو لــەوەی کــە دەســتی بــە دامەزرانـدنی پرۆژەیـەکی گـەورە کردبـوو کـە ڕکابـەریی لەگـەڵ کۆمپانیاکـانی دەوڵەت دا دەکرد و ئەمەشی بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندی بەرپرسانی سەرەوەی حیزبی کۆمیۆنیست کردبوو. ئەمەش بێگومان وانەیەك بوو کـە خـەڵکی تـر لـەم کێشەیەوە فێربوون.

نابێ هەڵوێستی حیزبی کۆمیۆنیـست بەرامبـەر کەسانی کـارزانی وەك دای، جێگـەی سەرسـوڕمان بـێ. چـین یـەن، یـەکێك لـە هاوکـارە نزیکـەکانی دێـنگ سـیاوپینگ و ئەنـدازیاری سـەرەکی پێـشووتری ڕیفۆرمـەکانی بـازاڕ، بۆچـوونی زۆربەی کادیرەکانی حیزبی بە نموونەی "باڵندەیەك لە قەفەس دا" بۆ ئـابووری کـورتکردەوە: ئـابووری چـین بریتیبـوو لـە باڵندەیـەك و کـۆنترۆڵی حیـزبیش بریتیبوو لە قەفەسەکە. پێویـست بـوو قەفەسـەکە گـەورە بکـرێ تـا باڵندەکـە تەندروست تر و داینەمیك تر بێ، بەڵام نەدەکرا دەرگـای قەفەسـەکە بکرێتـەوە یان قەفەسەکە لابرێ، نەوەك باڵندەکە بفڕیایە. جیانگ زیمین، ماوەیەکی کـەم دوای ئەوەی بوە سکرتێری حیزب لە ساڵی ۱۹۸۹ دا، کە بەهێزترین پێگـە بـوو لە چین دا، تەنانەت زیاتر لەوەش ڕۆیشت و گومانی حیزبـی بەرامبـەر کارزانـان (entrepreneurs) بـە کـورتی خـستەڕوو. ئـەوانی وەسـفکرد بـە (بازرگانـانی دەسگێڕ کە فێڵدەکەن و بەرتیلدەدەن و خۆیـان لـە دانـی بـاج دەدزنـەوە). بـە درێژایی ساڵانی ۱۹۹۰ کان، تەنانەت لە کاتێك دا وەبەرهێنانی بیانی دەڕژایە ناو چین و پشتگیری پیشەسازییە دەوڵەتییەکان دەکرا تا کارەکانیـان فراوانبکـەن، بە گومانەوە پێشوازی لە کارزانیی دەکرا و چەندین کارزان تەنانـەت بەنـدکران. بۆچوونی جیانگ زیمین هەرچەندە لە کزبوونی ڕێژەیی دایە، بـەڵام تـا ئێـستاش لە چین دا زۆر بڵاوە. بە قسەی ئابووریناسێکی چینی، *(کۆمپانیا گـەورەکانی دەوڵــەت دەتــوانن بەشــداری لــە پــرۆژە گــەورەکان دا بکــەن، بــەڵام کاتێــك کۆمپانیاکانی کەرتی تایبەت ئەمە دەکەن، بەتایبەتی کاتێك ڕکابەریی کۆمپانیا*

*دەوڵەتییەکان دەکەن، کێشە لە هەموو سووچێکەوە سەرهەڵدەدا)*

لە کاتێك دا دەیان کۆمپانیای کەرتی تایبەت ئێستا بە سوودی زۆرەوە لە چین دا کاردەکەن، چەندین توخمی ئابووری تا ئێستاش لە ژێر فەرمان و پارێزگاری حیزب دایە. رۆژنامەنووس، ریچارد مەکریگۆر دەڵێ کە لە سەر مێزی سەرۆکی هەریەك لە کۆمپانیا گەورەکانی دەوڵەت لە چین دا، تەلەفۆنێکی سوور هەیە. کاتێك زەنگ لێدەدا، ئەوە حیزبە تەلەفۆن دەکا بە فەرمانەوە دەربارەی ئەوەی پێویستە کۆمپانیاکە چی بکا و لە کوێ وەبەرهێنان بکا و تارگێتەکانی چی دەبن. ئەم کۆمپانیا گەورانە تا ئێستاش لە ژێر فەرمانی حیزب دان، ئەمەش راستییەکە کاتێك بۆمان دەردەکەوێ کە حیزب بریاری ئاڵوگۆرکردن لە بەرێوەبەرە راپەرێنەرەکان دا دەدا و دەریاندەکا و پلەیەیان بەرزدەکاتەوە لەگەڵ پاساوێکی کەم دا.

ئەم چیرۆکانە بێگومان نکۆڵیناکەن لەوەی کە چین تەکانی گەورەی بەرەو دەزگایانی ئابووری کراوە داوە. تەکانی وا کە بنەمای ئەو رێژەی گەشەکردنە سەرسورهێنەرەی چینە لە ماوەی سی ساڵی رابوردوودا ئەنجامیداوە. زۆربەی کارزانەکان هەندێك پاراستنیان هەیە، هەر هیچ نەبێ لەبەر ئەوەی ئەوان سوود وەردەگرن لە پشتگیری کادیرە لۆکاڵەکان و نوخبەکانی حیزبی کۆمیۆنیست لە بەیژینگ. زۆربەی پرۆژە بازرگانییە دەوڵەتییەکان بە دوای قازانجدا دەگەرێن و لە بازارە جیهانییەکان دا رکابەریی دەکەن. ئەمەش گۆرانکارییەکی ریشەییە لە چینی ماو دا. هەروەك لە چاپتەری پێشوودا بینیمان، چین لە سەرەتادا توانی گەشەبکا چونکە ریفۆمی بنەرەتی بە سەرکردایەتی دێنگ سیاوپینگ ئەنجامدرا بۆ دوورکەوتنەوە لە دەزگا ئابوورییە هەرە چەوسێنەرەکان بەرەو دەزگایانی ئابووری کراوە. گەشەکردن لە چین دا بەردەوامبوە لە کاتێك دا دەزگایانی ئابووری کەوتونەتە سەر رێچکەی بەرەو کراوەیی زیاتر. هەڵبەتە، بە هەنگاوی هێواش. چین هەروەها سوودێکی زۆر لە هێزی کاری هەرزان و گەیشتنە بازار و سەرمایە و تەکنەلۆجی بیانی وەردەگرێ.

تەنانەت ئەگەر ئەمرۆ دەزگایانی ئابووری چین لە سێ دەیەی رابوردوو کراوەتر بن، ئەوا هەر ئەزموونی چین نموونەیەکی گەشەکردنە لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا. سەرەرای جەختکردنەوەی ئەم دواییانە لە چین لەسەر نوێکاری و تەکنەلۆجی، گەشەکردنی چین پشت بە بەکارهێنانی ئەو

تەکنەلۆجییانە دەبەستێ کە لە ئارادان شانبەشانی وەبەرهێنانی خێرا، نەك تێکدانی بنیاتنەر. ڕوویەکی گرنگی ئەمە ئەوەیە کە مافی موڵکداری لە چین دا بە تەواوی جێگیر نییە. هەر جارە ناجارێك هەندێك کارزانی وەك دای ڕووتدەکرێتەوە. جووڵەی کرێکاران بە توندی ڕێکخراوە و سادەترین مافی موڵکداری، مافی فرۆشتنی هێزی کاری یەکێك بەو شێوەیەی بۆخۆی دەیەوێ، تا ئێستاش یەکجار سنوورداره. ڕادەی ئەوەی کە دەزگایانی ئابووری تا ئێستاش دوورن لەوەی بەشێوەیەکی ڕاستەقینە کراوەبن لە ڕێگەی ئەو ڕاستییەوە ڕووندەبێتەوە کە تەنیا ژمارەیەکی کەم بزنسمان و بزنسومان سەرکێشی ئەوە دەکەن بەشداری هەر چالاکییەك بکەن بەبێ ڕەزامەندی کادیرە حیزبییە لۆکاڵەکان و لەوەش گرنگتر بەبێ ڕەزامەندی بەیژینگ. پەیوەندی نێوان بزنس و حیزب بۆ هەردوو لایان یەکجار چەورە. ئەو بزنسانەی لە لایەن حیزبەوە هاوکاریدەکرێن گرێبەستیان بە مەرجی لەبار پێدەدرێ و دەتوانن خەڵکی ئاسایی دەربکەن بۆ زەوتکردنی زەوییەکانیان و یاسا و ڕێساکان بشکێنن بەبێ لێپێچینەوە. ئەوانەی دەبنە کۆسپ لەبەردەم ئەم پلانە دا کەناردەخرێن و تەنانەت بەنددەکرێن یان دەکوژرێن.

قورسایی هەمیشە ئامادەبووی حیزبی کۆمیۆنیست و دەزگایانی چەوسێنەر لە چین دا، چەندین لێکچوونمان بیردەخەنەوە لە نێوان گەشەکردنی یەکێتی سۆڤیەتی ساڵانی ١٩٥٠ کان و ١٩٦٠ کان و گەشەکردنی ئەمڕۆی چین دا، هەرچەندە جیاوازی بەرچاویش هەیە. یەکێتی سۆڤیەت گەشەکردنی لە سایەی دەزگایانی ئابووری چەوسێنەر و دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا ئەنجامدا چونکە بە زۆر دەرامەتی بۆ کەرتی پیشەسازی تەرخانکرد لە ژێر هەیکەلێکی فەرماندەیی ناوەندی دا، بەتایبەتی بۆ پیشەسازی چەك دروستکردن و پیشەسازی قورس. توانرا ئەم جۆرە گەشەکردنە ئەنجامبدرێ تا ڕادەیەك لەبەر ئەوەی دەبوایە بگەشتایەتەوە بە وڵاتانی تری پێشکەوتوو. گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا ئاسانترە کاتێك تێکدانی بنیاتنەر پێویست نییە. بە دڵنیاییەوە دەزگایانی ئابووری چین کراوەترن لەوانەی لە یەکێتی سۆڤیەت دا هەبوون، بەڵام دەزگایانی سیاسی چین هێشتا چەوسێنەرن. حیزبی کۆمیۆنیست لە چین دا یەکجار دەسەڵاتدارە و کۆنترۆڵی هەموو بیرۆکراسییەتی دەوڵەت و هێزی چەکدار ومیدیا و بەشێکی گەورەی ئابووری دەکا. گەلی چین

ئازادی سیاسی کەم و بەشدارییەکی کەمیان لە پرۆسەی سیاسی دا هەیە.

بۆ ماوەیەکی زۆر کەسانێکی زۆر بڕوایان وابوو کە گەشەکردن لە چین دا دیموکراسی و پلورەلیزمی زیاتر لەگەڵ خۆی دا دەهێنێ. هەستێکی ڕاستەقینە لە ساڵی ١٩٨٩ دا هەبوو کە خۆپیشاندانەکانی مەیدانی تیانامێن دەبنە هۆی کرانەوەی زیاتر و تەنانەت ڕمانی ڕژێمی کۆمیۆنیستی، بەڵام تانک بەردرایە گیانی خۆپیشاندەران و لە بری خۆپیشاندانێکی ئاشتیانە، کتێبە مێژووییەکان ئێستا پێیدەڵێن کوشتارەکەی مەیدانی تیانامێن. لە زۆر ڕووەوە دەزگا سیاسییەکانی چین لە دوای تیانامێن بوونە دەزگایانی چەوسێنەر تر: ڕیفۆرمخوازانی وەك جاو زیانگ، وەك سکرتێری گشتی حیزبی کۆمیۆنیست کە پشتگیری خۆیان بۆ خوێندکارانی مەیدانی تیانامێن دەربڕی، لە حیزب دوورخرانەوە و حیزب بە سەرگەرمیەکی زۆرەوە کەوتە بەر تەسکردنەوەی ئازادییە مەدەنییەکان و ئازادی ڕۆژنامەگەری. جاو زیانگ بۆ ماوەی زیاتر لە پازدە ساڵ لە ماڵەوە بەندکرا و ناوی لە تۆمارە گشتییەکان دا بەرەبەرە سڕایەوە بۆ ئەوەی تەنانەت نەبێتە ڕەمزی ئەوانەی پشتگیری گۆڕانکاری سیاسییان دەکرد. ئەمڕۆ، کۆنترۆڵی حیزب بەسەر میدیاوە، لەوانە ئینتەرنێت، بێوێنەیە. بەشی زۆری ئەمە لە ڕێگەی چاودێری خودییەوە ئەنجامدەدرێ: کەناڵەکانی میدیا دەزانن نابێ باسی جاو زیانگ یان لیو ژیاوبۆ بکرێ، کە ئەویش ڕەخنەگرێك بوو لە حکومەت و داوای دیموکراسی زیاتری دەکرد و تا ئێستاش لە بەندیخانەدا دەناڵێنێ تەنانەت دوای ئەوەی خەڵاتی ئاشتی نۆبڵیشی پێدرا. چاودێری خودی لە لایەن جیهازێکی ئۆرۆێلیەوە پاڵپشتیدەکرێ کە دەتوانێ چاودێری گفتوگۆکان و پەیوەندییەکان بکا و وێب سایت و ڕۆژنامەکان دابخا و تەنانەت نەهێلێ هەندێك هەواڵ لەسەر ئینتەرنێت پیشانبدرێن. هەموو ئەمانە لە کاردا بوون کاتێك هەواڵ دەربارەی تۆمەتی گەندەڵی دژی کوڕی سکرتێری گشتی حیزب، هو جینتاو کە لە ساڵی ٢٠٠٢ ەوە سکرتێرە، لە ساڵی ٢٠٠٩ دا بڵاوبۆوە. جیهازی حیزب یەکسەر کەوتە کار و نەك تەنیا توانی نەیەڵێ میدیای چین بابەتەکە ڕومالبکەن، بەڵکو توانیشی ووتارەکان دەربارەی بابەتەکە لەسەر وێب سایتەکانی نیو یۆرك تایمز و فاینانشیەڵ تایمز بلۆکبکەن.

لەبەر بوونی کۆنترۆڵی حیزب بەسەر دەزگایانی ئابوورییەوە، ئەندازەی

تێکدانی بنیاتنەر بەری پێگیراوە و بەم شێوەیەش دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی ڕیفۆرمی ڕیشەیی لە دەزگایانی سیاسی دا دەکرێ. هەروەك لە یەکێتی سۆڤیەت دا، ئەزموونی چین بۆ گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا بە زۆری لەبەر ئەوە بوە کە چینیش وەك یەکیتی سۆڤیەت دەبوایە بە وولاتانی تر بگەشتایەتەوە. داهاتی تاك لە چین دا تا ئێستاش تەنیا بەشێکی بچووکی ئەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئەورووپای ڕۆژئاوایە. بێگومان گەشەکردنەکەی چین تا ڕادەیەکی زۆر فرەجۆر ترە لەوەی یەکێتی سۆڤیەت و بە تەنیا پشتی بە دروستکردنی چەك یان پیشەسازی قورس نەبەستوە و کارزانەکانی چین بلیمەتی زیاتر پیشاندەدەن. بەهەمانشێوەی ئەوەی سۆڤیەت، ئەم گەشەکردنە تینوتاوی خۆی لەدەستدەدا ئەگەر دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەکان ڕێگا بۆ دەزگایانی سیاسی کراوە چۆڵنەکەن. تا ئەو کاتەی دەزگایانی سیاسی بە چەوسێنەری دەمێننەوە، گەشەکردن سنووردار دەبێ، هەروەك لە دۆخە هاوشێوەکان دا گەشەکردن سنووردار بوە.

ئەزموونی چین چەندین پرسیاری جێگەی سەرنج قوتدەکاتەوە دەربارەی ئایندەی گەشەکردنی چین و لەوەش گرنگتر، توانای مانەوە و پەرەسەندنی گەشەکردنی ئەسۆریتاری. ئەم جۆرە گەشەکردنە بۆتە ئەڵتەرنەتیڤێکی بەناوبانگی " سازانی واشنتۆن" کە پێداگری لەسەر گرنگی بازاڕەکان و سەربەستکردنی بازرگانی و چەند شێوازێکی دیاریکراوی ڕیفۆرمی دەزگایی دەکا بۆ سەرپێکەوتنی گەشەکردنی ئابووری لە چەندین ناوچەی کەمپەرەسێنی جیهان دا. لە کاتێك دا بەشێك لە پەسەندیی گەشەکردنی ئەسۆریتاری بریتییە لەکاردانەوە بەرامبەر "سازانی واشنتۆن"، ڕەنگە جوانی زیاتری ـ بێگومان بۆ ئەو فەرمانڕەوایانەی کۆنترۆڵی دەزگایانی چەوسێنەریان کردوە ـ ئەوە بێ کە توانای زیاتریان دەداتێ بۆ مانەوە و تەنانەت پتەوکردنی دەسبەسەرداگرتنیان بەسەر دەسەڵات دا تا بەرگی ڕەوایی بکەنە بەر چەوسانەوەکەیان.

هەروەك تیۆرییەکەمان دەریدەخات، بەتایبەتی لە ناو ئەو کۆمەڵگایانەدا کە ئەندازەیەك لە مەرکەزیەتی دەوڵەتیان بەدەستهێناوە، دەکرێ ئەم جۆرە گەشەکردنە لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا ئەنجامبدرێ و تەنانەت ڕەنگە بۆ چەندین نەتەوە بەهێزترین سیناریۆ بێ ئەنجامبدرێ، هەر لە کامبۆدیا و ڤێتنام تا بروندی و ئەسیوپیا و ڕواندا. بەڵام تیۆرییەکەمان ئەوەش دەگەیەنێ کە بە

هەمانشێوەی هەموو نموونەکانی گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسێنەردا، ناتوانرێ بەردەوامی بەم گەشەکردنە بدرێ.

لە دۆخی چین دا، پرۆسەی گەشەکردن لە ڕێگەی هەوڵدان بۆ گەیشتنەوە بە وولاتانی تر و هاوردەکردنی تەکنەلۆجی و هەناردەکردنی بەرهەمی هەرزانی کارگەکان پێدەچێ بۆ ماوەیەك بەردەوامبێ. لەگەڵ ئەمەش دا، پێشدەچێ ئەم گەشەکردنە بوەستێ، بەتایبەتی کاتێك چین دەگاتە ستاندەردەکانی ئاستی گوزەرانی وولاتێکی داهات مامناوەندی. سیناریۆیەك کە زۆرترین ئەگەری ڕوودانی هەیە ئەوەیە کە حیزبی کۆمیۆنیستی چین و نوخبەی ئابووری چین کە دەسەڵاتیان ڕوو لە زیادبوونە، بتوانن کۆنترۆڵی توندی خۆیان بەسەر دەسەڵات دا بۆ ماوەی چەندین دەیەی داهاتوو بهێڵنەوە. لەم حاڵەتە دا تیۆرییەکەی ئێمە و مێژوو ئەوە پێشنیازدەکەن کە گەشەکردن و تێکدانی بنیاتنەر و نوێکاری ڕاستەقینە نایەنەدی و ڕێژەی گەشەکردنی سەرنجڕاکێشی چین بە هێواشی دەبێتە هەڵم. بەڵام ئەم ئەنجامە زۆر دوورە لەوەی چارەنووس بیسەپێنێ و دەتوانرێ دوور بخرێتەوە ئەگەر چین گواستنەوە بۆ دەزگایانی سیاسی کراوە ئەنجامبدا بەر لەوەی گەشەکردنەکەی لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا بگاتە بنبەست. هەروەك دواتر دەبینین، هۆکاری ئەوتۆ لە ئارادا نین وامان لێبکا کە چاوەڕێی ئەوە بکەین گواستنەوە لە چین دا بەرەو دەزگایانی سیاسی کراوەتر ڕوودەدا یان ئەو گواستنەوەیە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و بێ ئازار ڕوودەدا.

تەنانەت چەند دەنگێکی ناو حیزبی کۆمیۆنیستی چین دان بە مەترسییەکانی ڕێگای بەردەمیان دا دەنێن و لەملاولا ئەو ئایدیایە دەخەنەڕوو کە ڕیفۆرمی سیاسی ـ کە گواستنەوەیە بەرەو دەزگایانی سیاسی کراوەتر بە پێی ناولێنانەکەی ئێمە ـ پێویستە. سەرۆك وەزیرانی دەسەڵاتداری چین وێن جیابۆ لەم دواییانەدا هۆشداریدا کە تەگەرە دەکەوێتە بەردەم گەشەکردنی ئابووری ئەگەر ڕیفۆرمی سیاسی ئەنجامنەدرێ. لەو بڕوایەداین شیکردنەوەکانی وێن بیرتیژانەیە ئەگەرچی هەندێك کەس گومانیان بەرامبەر نیازپاکی قسەکانی هەیە. بەڵام چەندین کەس لە ڕۆژئاوادا کۆك نین لەگەڵ قسەکانی وێن دا. بەلای ئەوانەوە چین ڕێگایەکی ئەڵتەرنەتیڤی گرتۆتەبەر بۆ گەشەکردنی ئابووری، ڕێگایەکی گەشەکردن لە سایەی ئەسۆریتاریانیزم نەك لە سایەی دەزگایانی سیاسی و ئابووری کراوەدا. بەڵام ئەوان هەڵەن. ئێمە پێشتر ڕیشە گرنگەکانی

سەرکەوتنی چینمان بینی: گۆڕانکاری ڕادیکاڵی لە دەزگایانی ئابووری دا بە دوورکەوتنەوە لە دەزگا ئابوورییە کۆمیۆنیستیە چەقبەستوەکان و بەرەو ئەو دەزگایانەی کە هاندانیان ڕەخساند بۆ زیادکردنی بەرهەمداریی و بۆ ئەنجامدانی بازرگانی. ئەگەر لەم نیگایەوە سەیربکەین ئەوا هیچ جیاوازییەکی بنەڕەتی لە ئەزموونی چین دا نابینین بە بەراورد لەگەڵ ئەو وولاتانەی توانیویانە لە دەزگایانی چەوسێنەر دووربکەونەوە و هەنگاوبنێن بەرەو دەزگایانی کراوە، تەنانەت کاتێك ئەمە لە سایەی دەزگایانی سیاسی چەوسینەردا ئەنجامدەدرێن هەوەك لە حاڵەتی چین دا ئەنجامدەدرێن. چین گەشەکردنی ئابووری ئەنجامداوە نەك لە ڕێگەی دەزگا سیاسییە چەوسێنەرەکانییەوە بەڵکو سەرەڕای بوونی ئەو دەزگایانە: ئەزموونی گەشەکردنی سەرکەوتووی چین لە ماوەی سێ دەیەی ڕابوردوودا بەهۆی دوورکەوتنەوەی ڕادیکاڵی چینەوە بوە لە دەزگا ئابوورییە چەوسێنەرەکانی و بەرەو دەزگایانی ئابووری بە ڕادەیەکی زۆر کراوەتر و بوونی دەزگایانی سیاسی یەکجار ئەسۆریتاری و چەوسێنەری سیاسی ئەم کارەی زەحمەت تر کردوە نەك ئاسانکردنی.

جۆرێکی تری جیاوازی پەسەندکردنی گەشەکردنی ئەسۆریتاری داندەنێ بە سروشتی نەخوازراوی ئەم گەشەکردنەدا، بەڵام پێیوایە کە ئەسۆریتاریانیزم تەنیا قۆناخێکە و تێدەپەڕێ. ئەم ئایدیایە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە تیۆرییە کلاسیکیەکانی سۆسیۆلۆجی سیاسی، کە ئەویش تیۆری مۆدێرنایەزەیشنە، کە لە لایەن سیمۆر مارتن لیپسێ داڕێژراوە. تیۆری مۆدێرنایەزەیشن لایوایە کە هەموو کۆمەڵگاکان، کاتێگ گەشەدەکەن، بەرەو کۆمەڵگایانی مۆدێرنتر و پەرەسەندووتر و شارستانیتر دەڕۆن و بەتایبەتی بەرەو دیموکراسی دەڕۆن. چەندین پەیڕەوانی تیۆری مۆدێرنایەزەیشن لایانوایە کە بە هەمانشێوەی دیموکراسی دەزگایانی کراوە وەك بەرهەمێکی ناڕاستەوخۆی پرۆسەی گەشەکردن سەرهەڵدەدەن. لەوەش زیاتر، هەرچەندە دیموکراسی لەگەڵ دەزگایانی سیاسی کراوە دا هەمان شت نین، بەڵام ئەنجامدانی هەڵبژاردنە یەك لەدوای یەکەکان و ڕکابەرییە سیاسییە کراوەکان ئەگەری پەرەسەندنی دەزگایانی سیاسی کراوە دروستدەکەن. شێوەی جیاواز تری تیۆری مۆدێرنایزەیشن لایانوایە کە هێزی کاری خوێندەوار بە شێوەیەکی سروشتی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دیموکراسی و دەزگایانی باشتر. لە شێوەیەکی تا

ڕادەیەك پۆستمۆدێرنی تیۆری مۆدێرنایەزەیشن دا، ستوون نووسی نیو یۆرك تایمز، تۆماس فرایدمان، تا ئەو ڕادەیەش ڕۆیشت کە لای وابوو کاتێك وولاتێك بوە خاوەنی ژمارەی پێویستی ڕێستۆرانتی مەکدۆنالدز، ئەوا دیموکراسی دەزگاکان ناچارن بە دوایدا بێن. هەموو ئەمانە وێنەیەکی گەشبین دەنەخشێنن. لە ماوەی شەست ساڵی ڕابووردودا، زۆربەی وولاتان، تەنانەت چەندین لەوانەی خاوەن دەزگایانی چەوسێنەرن هەندێك گەشەکردنیان بەخۆوە بینیوە و زۆربەیان زیادبوونی بەرچاویان لە خوێندەواری هێزی کاردا بەدەستهێناوە. کەواتە لە کاتێك دا داهات و خوێندەوارییان لە زیادبووندایە، بە شێوەیەك لە شێوەکان دەبێ هەموو شتە باشەکانی تری وەك دیموکراسی و مافی مرۆڤ و ئازادییە مەدەنییەکان و مافەکانی موڵکداری جێگیر، بێنەدی.

تیۆری مۆدێرنایزەیشن لە ناوەوە و دەرەوەی بازنەی ئەکادیمی پەیڕەوانی زۆری هەیە. هەڵوێستەکانی ئەم دواییانەی ویلایەتە یەکگرتوەکان بەرامبەر چین، بۆ نموونە، لە ڕێگەی ئەم تیۆرییەوە داڕێژراون. جۆرج ئێچ دەبلیو بوش سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی بەرامبەر دیموکراسی چین بەم جۆرە کورتکردەوە (بە ئازادی لەگەڵ چین بازرگانی بکە و کات لە بەرژەوەندی ئێمەیە). بیرۆکەکە ئەوە بوو کە کاتێك چین بە شێوەیەکی ئازاد لەگەڵ ڕۆژئاوا بازرگانی دەکا، گەشەدەکا و ئەو گەشەکردنە دیموکراسی و دەزگایانی باشتر دەهێننەئاراوە، هەروەك تیۆری مۆدێرنایزەیشن پێشبینیکرد. لەگەڵ ئەمەش دا، زیادبوونی خێرای بازرگانی لە نێوان ویلایەتە یەکگرتوەکان و چین دا هەر لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە شتێکی ئەوتۆی بۆ دیموکراسی چین نەکرد و تێکەڵبوونی زیاتر کە ڕەنگە لە ماوەی دەیەی داهاتوو دا ئەنجامبدرێ، بەهەمانشێوە گۆڕانکاری کەم ئەنجامدەدا. هەڵوێستی کەسانێکی زۆر دەربارەی ئایندەی کۆمەڵگا و دیموکراسی لە عێراق دا دوای داگیرکردنی ئەو وولاتە بە سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتوەکان، بەهەمانشێوە گەشبینانە بوو بە هۆی تیۆری مۆدێرنایزەیشنەوە. سەرەڕای بەڕێوەبردنی ئابووری وێرانکارانە لەسەردەمی سەدام حسین دا، عێراق لە ساڵی ۲۰۰۲ دا هێندەی زۆربەی نەتەوەکانی باشووری بیابانی ئەفریقی هەژار نەبوو، بە بەراورد لەگەڵ ئەو وولاتانە دا، عێراق دانیشتوانێکی خوێندەوار تری هەبوو، بۆیە وا بیردەکرایەوە کە زەمینەیەکی لەبار بێ بۆ پەرەسەندنی دیموکراسی و ئازادییە مەدەنییەکان

و تەنانەت بۆ ئەوەش کە ئێمە پێیدەڵێین پلورەلیزم. ئەم هیوایانە لەبنهاتن کاتێك ئاژاوە و جەنگی ناوخۆ یەخەی کۆمەڵگای عێراقییان گرت.

تیۆری مۆدێرنایزەیشن نادروستە و هەروەها هاوکار نییە بۆ بیرکردنەوە دەربارەی چۆنیەتی بەرەنگاربوونەوەی کێشە گەورەکانی دەزگایانی چەوسێنەر لە ناو نەتەوانی شکستخواردوو دا. بەڵگەیەکی بەهێز کە پاڵپشتی تیۆری مۆدێرنایزەیشنە ئەوەیە کە نەتەوانی دەوڵەمەند ئەو نەتەوانەن خاوەنی ڕژێمی دیموکراسین و ڕێز لە مافە مەدەنی و مرۆییەکان دەگرن و خاوەن بازاڕی کارا و بەگشتیش دەزگایانی ئابووری کراوەن. لەگەڵ ئەمەش دا، لێکدانەوەی ئەم پەیوەندییە بەوەی پاڵپشتی تیۆری مۆدێرنایەیزەیشنە، کاریگەری سەرەکی دەزگایانی ئابووری و سیاسی کراوە لەسەر گەشەکردنی ئابووری پشتگوێدەخا. هەروەك لە سەراپای ئەم کتێبەدا باسمانکردوە، ئەوە کۆمەڵگایانی خاوەن دەزگایانی کراوەن کە لە ماوەی سێ سەدساڵی ڕابوردوودا گەشەیانکردوە و ئەمڕۆش بە شێوەیەکی ڕێژەیی دەوڵەمەندبوون. ئەوەی کە ئەمە شرۆڤەی ئەوە دەکا کە ئەمڕۆ لە دەوری خۆمان دەیبینین، ڕووندەبێتەوە ئەگەر بە شێوەیەکی کەمێك جیاواز سەیری ڕاستیەکان بکەین: لە کاتێك دا ئەو نەتەوانەی لەماوەی چەندین سەدەی ڕابوردوودا دەزگایانی ئابووری و سیاسی کراوەیان دامەزراندوە گەشەکردنی ئابووری بەردەوامیان بەدەستهێناوە، ڕژێمە ئەسۆریتارییەکان کە لە ماوەی شەست یان سەد ساڵی ڕابووردودا گەشەی خێرایان کردوە، بە پێچەوانەی ئەوەی تیۆری مۆدێرنایزەیشنی لیپسێ بانگەشەی بۆ دەکا، نەبوونە ڕژێمانی دیموکراسی تر. لە ڕاستیدا ئەمە جێگەی سەرسوڕمان نییە. دەکرێ گەشەکردن لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا ئەنجامبدرێ چونکە ئەم گەشەکردنە بە شێوەیەکی پێویست یان ئۆتۆماتیکی لەناوچوونی ئەم دەزگایانە ناگەیەنێ. لە ڕاستیدا زۆرجار ئەم گەشەکردنە ئەنجامدەدرێ چونکە ئەوانەی کۆنترۆڵی دەزگا چەوسێنەرەکانیان کردوە وەك هەڕەشە سەیری گەشەکردنی ئابووری ناکەن بەڵکو وەك پشتگیری ڕژێمەکانیان سەیری دەکەن، هەورەك حیزبی کۆمیۆنیستی چین لە ساڵانی ١٩٨٠ کانەوە کردویەتی. دیسانەوە جێگەی سەرسوڕمان نییە کە ئەو گەشەکردنەی بەهۆی زیادبوونی بەهای دەرامەتە سروشتیەکانی نەتەوەیەکەوە دێتەئاراوە، وەك گابۆن و ڕوسیا و سعودیە و ڤەنزەوێلا، ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لەم ڕژێمە ئەسۆریتارییانە دا بەرەو

دەزگایانی کراوە نەهێننەدی.

تۆمارە مێژووییەکان تەنانەت کەمتر بە بەزەیین بەرامبەر تیوری مۆدیرنایزەیشن. چەندین نەتەوەی دەوڵەمەند خۆیان داوەتە دەست دیکتاتۆریەتە داپڵۆسێنەرەکان و دەزگا چەوسێنەرەکان و پشتگیرییان کردوون. یابان و ئەڵمانیا لە ناو نەتەوە هەرە دەوڵەمەندەکان و خاوەن پیشەسازی دا بوون لە جیهان دا لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دا و بە بەراوورد لەگەڵ نەتەوەکانی تردا هاوڵاتییانیان خاوەن پەروەردەی باش بوون. ئەمانە ڕێگر نەبوون لەبەردەم سەرهەڵدانی حیزبی سۆشیالیستی نەتەوەیی لە ئەڵمانیا دا یان ڕژێمی سەربازیی لە یابان دا کە لە ڕێگەی جەنگەوە خوازیاری فراوانکردنی ناوچەکانی خۆیان بوون ـ کە بوونە هۆی ئەوەی دەزگایانی ئابووری و سیاسی سووڕانێکی تیژ بەرەو دەزگایانی چەوسێنەر ئەنجامبدەن. ئەرجەنتینیش لە سەدەی نۆزدەیەم دا یەکێك بوو لە دەوڵەمەندترین وڵاتانی جیهان و هێندەی بەریتانیا و بگرە لەویش دەوڵەمەند تر بوو چونکە سوودمەندی ترۆقی جیهانی دەرامەتەکان بوو، خاوەن خوێندەوارترین دانیشتوان بوو لە ئەمەریکای لاتین دا، بەڵام دیموکراسی و پلورەلیزم سەرکەوتووتر نەبوون و بگرە کەمتریش سەرکەوتوو بوون لە ئەرجەنتین دا لەچاو زۆربەی وڵاتانی تری ئەمەریکای لاتین دا. کۆدێتا بەدوای کۆدێتا دا هات و هەروەك لە چاپتەری یازدەیەم دا باسمانکرد، تەنانەت ئەو سەرۆکانەی بە شێوەیەکی دیموکراسیش هەڵبژێران وەك دیکتاتۆری چاوچنۆك ڕەفتاریان کرد. تەنانەت لەم دواییانەش دا پێشکەوتنی کەم بەرەو دەزگایانی کراوە هاتۆتەئاراوە و هەوەرك لە چاپتەری سیازدەیەم دا بینیمان، حکومەتەکانی سەدەی بیست و یەکەمی ئەرجەنتین دەتوانن سامانی هاوڵاتییانیان بەبێ لێپێچینەوە داگیربکەن.

هەموو ئەمانە چەندین ئایدیای گرنگ ڕووندەکەنەوە. یەکەم، گەشەسەندن لە سایەی دەزگایانی سیاسی ئەسۆریتاری و چەوسێنەردا لە چین، هەرچەندە پێدەچی بۆ ماوەیەکی تریش بەردەوامبێ، نابێتە گەشەسەندنی بەردەوام کە لە لایەن دەزگایانی ئابووری کراوەی ڕاستەقینە و تێکدانی بنیاتنەر پشتگیری بکرێ. دوەم، بە پێچەوانەی بانگەشەکانی تیۆری مۆدێرنایزەیشن، نابێ پشت بەوە ببەستین کە گەشەکردنی ئەسۆریتاری دەبێتەهۆی سەرهەڵدانی دیموکراسی و دەزگایانی سیاسی کراوە. چین و ڕوسیا و چەندین ڕژێمی تری

ئەسۆریتاری کـە ئێـستا هەنـدێك گەشـەکردن ئەنجامـدەدەن پێدەچـن بگەنـە سنوورەکانی گەشەکردنی چەوسێنەرانە پـێش ئـەوەی دەزگـا سیاسـییەکانیان بەرەو ئاڕاسـتەیەکی زیـاتر کـراوە بگـۆڕن ـ لەڕاستیـشدا بـەر لـەوەی خواسـتی ڕاسـتەقینە لـەناو نوخبـەدا دروسـتبیّ بـۆ ئەنجامـدانی ئـەم گۆڕانکارییـە یـان دروسـتبوونی ئۆپۆزیسۆنێکی بـەهێز تـا ناچـاریان بکـا ئـەم گۆڕانکارییـە ئەنجامبدەن. سێیەم، گەشەسەندنی ئەسۆریتاری نە خوازراوە و نە لـە مـەودای دوور دا توانای بەردەوامیی هەیە، بۆیە نابیّ پـشتگیری کۆمـەڵگای نێودەوڵـەتی بەدەسـتبهێنیّ وەك مۆدێلێـك بـۆ نەتـەوەکانی ئەمـەریکای لاتـین و ئاسـیا و باشووری بیابانی ئەفریقا، تەنانەت ئەگەر ئەوە ڕێچکەیەکە کە چـەندین نەتـەوە هەڵیدەبـژێرن لەبـەر ئـەوەی ئـەو ڕێـچکەیە هەنـدێجار هاوتەبایـە لەگـەڵ بەرژەوەندییـەکانی نوخبـە ئـابووری و سیاسـییەکانی کـۆنترۆڵی ئـەو نەتەوانـە دەکەن.

## ناتوانی ئەندازیاریی خۆشگوزەرانی بکەی

بـە پێـچەوانەی ئـەو تیۆرییـەی لـەم کتێبـەدا خـستوومانەتەڕوو، گریمانـەی نەشارەزایی پێشنیازی ئامادەی پێیە دەربارەی ئەوەی چـۆن کێـشەی هـەژاری "چارەسـەردەکریّ": ئەگـەر نەشـارەزایی ئێمـەی گەیاندبێتـە ئێـرە، ئـەوا فـەرمانڕەوایان و دانـەرانی پۆلیـسی شـارەزا و زیـرەك دەتـوانن لـەم کێشەیە ڕزگارمان بکەن و پێویـستە بتـوانین ئەنـدازیاریی بـۆ خۆشـگوزەرانی بکـەین لـە سەرتاسەری جیهان دا لە ڕێگەی پێشکەشکردنی ڕاوێـژی دروسـت و فێرکردنـی سیاسییەکان بەوەی ئابووری باش چییە. لـە چـاپـەری دوەم دا، کاتێـك باسـی ئەم گریمانەیەمان کرد پیشانماندا کـە چـۆن ئـەزموونی کـوفی بوسـیای سـەرۆك وەزیرانی غانا لە سەرەتای ساڵانی ۱۹۷۰ کان دا ئـەو ڕاستییەی دەرخـست کـە کۆسـپی سـەرەکی بـەردەم خـستنەگەڕی پۆلیـسی وا کـە شکـستهێنانی بـازاڕ کەمدەکاتەوە و هـانی گەشـەکردنی ئـابووری دەدا بـریتی نییـە لـە نەشـارەزایی سیاسـییەکان، بـەڵکو بریتییـە لـەو هانـدان و ڕێگرییانـەی ئـەو سیاسـییانە ڕووبەڕوویاندەبنـەوە لـە لایـەن دەزگـا ئـابووری و سیاسـییەکانی کۆمەڵگاکانیانـەوە. سـەرەڕای ئەمـەش گریمانـەی نەشـارەزایی هێـشتا لـە نـاو

بازنەکانی دانەرانی پۆلیسی ڕۆژئاوا دا باڵادەستە، کە بەدەر لە هەموو شتێکی تر جەخت لەسەر ئەندازیاریی خۆشگوزەرانی دەکا.

ئەم هەوڵە ئەندازیارییانە دوو شێوە لەخۆدەگرن. یەکەمیان، کە زۆجار لە لایەن ڕێکخراوانی نێودەوڵەتی وەك سندوقی دراوی نێودەوڵەتی (IMF)ەوە پاڵپشتدەکرین، لایانوایە پەرەپێدانی خراپ بەهۆی پۆلیسی و دەزگایانی ئابووری خراپەوە دروستدەبێ و لیستێکی چاکسازی پێشنیازدەکەن کە ئەم ڕێکخراوە نێودەوڵەتییانە هەوڵدەدەن وولاتە هەژارەکان ناچاربکەن تا ئەو چاکسازییانە جێبەجێبکەن. (سازانی واشنتۆن یەکێك لەو لیستانە پێکدەهێنی). ئەم چاکسازییانە جەخت لەسەر شتی شیاو دەکەن وەك سەقامگیری ماکرۆئابووری و دانانی ئامانجی ماکرۆئابووری سەرنجڕاکێشی وەك کەمکردنەوەی قەبارەی کەرتی حکومی و ڕێژەی نەرمی گۆڕینەوەی دراو و سەربەستی حسابی سەرمایە (Capital Account Liberalization). لە لایەکی ترەوە چاکسازییەکان جەخت لەسەر هەندێك ئامانجی مایکرۆئابووری وەك بەتایبەتکردن و پێشخستنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان و ڕەنگە پیشنیازیش بۆ چۆنیەتی باشترکردنی کارەکانی خودی دەوڵەت، لە ڕێگەی هەنگاونان بۆ نەهێشتنی گەندەڵی، بخەنەڕوو. هەرچەندە ڕەنگە بەشێك لەم چاکسازییانە شیاو بن، بەڵام هەڵوێستی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان لە واشنتۆن و لەندەن و پاریس و شوێنەکانی تر تا ئێستاش لە تێڕوانینێکی ناڕاست دا نقوم بوە کە ناتوانێ ڕۆڵی دەزگایانی سیاسی و ئەو کۆسپانەی ئەم دەزگایانە دەیانخەنە بەردەم دانانی پۆلیسی، لەبەرچاو بگرێ. هەوڵەکان لە لایەن ڕێکخراوانی نێودەوڵەتییەوە بۆ ئەندازیاریی گەشەسەندنی ئابووری بە گوشار خستنە سەر وولاتانی هەژار بۆ پەیڕەوکردنی پۆلیسی و دەزگایانی باشتر، سەرکەوتوو نییە چونکە ئەم هەوڵانە لەو چوارچێوەیەدا نادرێن کە شرۆڤەی ئەوە دەکا بۆچی هەر لە بنەڕەت دا پۆلیسی و دەزگایانی خراپ لەو وولاتانەدا هەن، بەڵکو تەنیا شرۆڤەیەك کە دەیخەنە ڕوو ئەوەیە کە سەرکردەکانی ئەو وولاتە هەژارانە نەشارەزان. ئاکامی ئەمەش ئەوەیە کە ئەو پۆلیسییانەی بۆ ئەم وولاتانە پێشنیازدەکرێن جێبەجێناکرێن یان تەنیا بە ناو جێبەجێدەکرێن.

بۆ نموونە، چەندین ئابووری لە جیهان دا بە ڕواڵەت ئەم جۆرە ڕیفۆرمانە جێبەجێدەکەن، بەتایبەتی لە ئەمەریکای لاتین دا کە لە ساڵانی ١٩٨٠ کان و ٩٠

ەکان دا چەقیان بەستبوو. لە ڕاستیدا ئەم جۆرە ڕیفۆرمانە لە کەشێك دا بەسەر ئەو وولاَتانەدا سەپێنران کە تیایدا سیاسەتی ئەم وولاَتانە وەك خۆیان بەردەوامبوون. لە ئەنجامدا، ئەگەرچی ئەم ڕیفۆرمانە پەیڕەوکران، بەلاَم ئامانجی ڕیفۆرمەکان لەناوبران یان سیاسییەکان ڕێگای تریان گرتەبەر بۆ کەمکردنەوەی کاریگەریی ڕیفۆرمەکان. هەموو ئەمانە ڕووندەبێتەوە لە ڕێگەی "جێبەجێکردنی" یەکێك لە ڕاسپاردە سەرەکییەکانی ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بەمەبەستی سەقامگیریی ماکرۆئابووری کە ئەویش سەربەخۆیی بانکی ناوەندییە. ئەم ڕاسپاردەیە یان تەنیا لە تیۆری دا جێبەجێکرا نەك لە پراکتیس دا، یان لە ڕێگەی بەکارهێنانی پۆلیسی ترەوە لاوازکرا. لە پرینسیپ دا ڕاسپاردەیەکی شیاو بوو. چەندین سیاسی لە جیهان دا پارەی زیاتریان خەرجدەکرد لەوەی لە ڕێگەی داهاتی باجەوە دەستیان دەکەوت و دواتر بانکە ناوەندییەکانیان ناچاردەکرد تا جیاوازییەکە بە چاپکردنی پارە پڕبکەنەوە. ئەو هەلاَوسانەی لە ئەنجامی ئەمەدا دروستدەبوو ناسەقامگیری و نادڵنیایی دروستدەکرد. تیۆرییەکە ئەوە بوو کە بانکی ناوەندی سەربەخۆی وەك بوندزبانك لە ئەڵمانیا، بەرەنگاری گوشاری سیاسی دەبێتەوە و سەرقاپێك لەسەر هەلاَوسان دادەنێ. مۆگابی، سەرۆکی زیمبابۆی بڕیاریدا ئامۆژگاری نێودەوڵەتی جێبەجێبکا: ئەو لە ساڵی ١٩٩٥ دا سەربەخۆیی بانکی ناوەندی ڕاگەیاند. بەر لەمە، ڕێژەی هەلاَوسان لە زیمبابۆی دا لە دەوری ٪٢٠ دا دەخولایەوە. لە ساڵی ٢٠٠٢ دا هەلاَوسان گەیشتە ٪١٤٠ و لە ساڵی ٢٠٠٣ دا گەیشتە نزیکەی ٪٦٠٠ و لە ساڵی ٢٠٠٧ دا ٪٦٦,٠٠٠ و لە ساڵی ٢٠٠٨ دا گەیشتە ٪٢٣٠,٠٠٠,٠٠٠! بێگومان لە وولاَتێك دا کە سەرۆك لوتکە بباتەوە نابێ کەس تووشی سەرسوڕمان ببێ کە دەرکردنی یاسایەك بۆ سەربەخۆکردنی بانکی ناوەندی هیچ ناگەیەنێ. سەرۆکی بانکی ناوەندی زیمبابۆی ڕەنگە زانیبێتی کە چۆن هاوتاکەی لە سیارا لیۆن دا لە بانی سەرەوەی تەلاری بانکی ناوەندی کەوتبوە خوارەوە کاتێك بە گوێی سیاکا ستیڤنسی نەکردبوو. سەربەخۆ یان نا، جێبەجێکردنی داخوازییەکانی سەرۆك بژاردەیەکی دروستبوو بۆ پارێزگاری لە تەندروستی خۆی ئەگەر چی ئەو بژاردەیە بۆ تەندروستی ئابووری وولاَت دروستنەبوو. هەموو وولاَتەکان وەك زیمبابۆی نین. لە ئەرجەنتین و کۆلۆمبیا دا بانکە ناوەندییەکانیان لە ساڵانی ١٩٩٠ ەکان دا

سەربەخۆکران و کاری خۆیان لە کەمکردنەوەی هەڵاوسان دا ئەنجامدا. بەڵام لەبەر ئەوەی لە هیچ یەکێك لەم دوو وڵاتەدا سیاسەت گۆڕانکاری بەسەردا نەهات، نوخبە سیاسییەکان توانیان ڕێگای تر بەکاربهێنن بۆ کڕینی دەنگ و هێشتنەوەی بەرژەوەندییەکانیان و پاداشتکردنی خۆیان و لایەنگرەکانیان. لەبەر ئەوەی نەیانتوانی ئەمە لە ڕێگەی چاپکردنی پارەوە ئەنجامبدەن، دەبوایە ڕێگایەکی تریان بگرتایەتەبەر. لە هەردوو وڵاتەکەدا سەربەخۆکردنی بانکی ناوەندی هاوکات بوو لەگەڵ فراوانبوونێکی گەورەی خەرجییەکانی حکومەت دا کە بە زۆری لە ڕێگەی قەرزەوە پارەی ئەو خەرجییانە دابینکرا.

شێوەی دووەم بۆ ئەندازیاریی خۆشگوزەرانی لەم ڕۆژگارە دا زیاتر لە برەودایە. ئەم شێوەیە دانددەنێ بەوەدا کە چارەسەری ئاسان نییە بۆ گواستنەوەی نەتەوەیەك لە هەژارییەوە بۆ خۆشگوزەرانی لە مەودایەکی کورت و تەنانەت لەماوەی چەند دەیەیەکیش دا. لە بری ئەمە، ئەم تێڕوانینە لایوایە چەندین "شکستی مایکرۆمارکێت" هەن کە دەکرێن لە ڕێگەی ئامۆژگاری باشەوە چارەسەربکرێن و ئەگەر دانەرانی پۆلیسی سوود لەو ئامۆژگارییانە وەربگرن ئەوا دەبنە مایەی خۆشگوزەرانی ـ کە دیسانەوە دەکرێ لە ڕێگەی هاوکاری و دیدی ئابووریناسان و کەسانی ترەوە بەدەستبهێنرێن. شکستهێنانە بچووکەکانی بازاڕ لە وڵاتانی هەژاردا لە هەموو شوێنێك دا هەن. بۆ نموونە، ئەم تێڕوانینە لایوایە ـ ئەم شکستانە لە سیستەمی پەروەردە و دابینکردنی چاودێری تەندروستی و شێوازی ڕێکخستنی بازاڕەکانی ئەو وڵاتانەدا هەن. بێگومان ئەمە ڕاستە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە کە ئەم شکستە بچووکانەی بازاڕ ڕەنگە تەنیا مشتی ناو خەروارێك بن، نیشانەی کێشەی ڕیشە قووڵتری کۆمەڵگایەکن کە لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا بەڕێوەدەچێ. هەروەك چۆن ڕێکەوت نییە وڵاتانی هەژار پۆلیسی ماکرۆئابووری خراپیان هەیە، ڕێکەوتیش نییە کە سیستەمی پەروەردەیان بە باشی کارناکا. ئەم شکستانەی بازاڕ ڕەنگە بە تەنیا بەهۆی نەشارەزاییەوە نەبن. داڕێژەرانی پۆلیسی و بیرۆکراتان کە دەبێ بە پێی ئامۆژگارییە نیاز پاکەکان کاربکەن، ڕەنگە بۆخۆیان بەشێك بن لە کێشەکە و هەوڵەکان بۆ چارەسەرکردنی ناکارامەییەکان ڕەنگە ئاکامی پێچەوانەیان لێبکەوێتەوە چونکە ئەوانەی بەرپرسیارن هەر لە بنەڕەتەوە سەریان لە هۆکارە دەزگاییەکانی هەژاری دەرناچێ.

ئەم کێشانە لە ڕێگەی ئەو هاوکارییەوە ڕووندەکرێتەوە کە ڕێکخراوی ناحکومی (NGO) سیڤا ماندیر ئەندازیاریی بۆ کرد بۆ پێشخستنی خزمەتگوزاری تەندروستی لە راجاستهان لە هیندستان. چیرۆکی دابینکردنی خزمەتگوزاری تەندروستی لە هیندستان دا یەکێکە لەو چیرۆکانەی ڕیشەی ناکارامەیی و شکستهێنانی قووڵە. خزمەتگوزاری تەندروستی دابینکراو لە لایەن حکومەتەوە، هەرهیچ نەبێ لە تیۆری دا، بە فراوانی لەبەردەستەو هەرزانیشە و ئەوانەی کاریتێدادەکەن بە گشتی شارەزان. بەڵام تەنانەت هەژارترین هاوڵاتی هیندی بنکە تەندروستییەکانی حکومەت بەکارناهێنێ و لە بری ئەمە پەنا دەباتە بەر دابینکارانی خزمەتگوزاری تەندروستی کەرتی تایبەت کە زۆر گرانتر و بێچاودێری و تەنانەت هەندێجاریش ناکارامەن. ئەمە لەبەر هەندێك هۆکاری نامەنتیقی نییە: خەڵك ناتوانن هیچ خزمەتگوزارییەك لە بنکە حکومییەکان وەربگرن کە تووشی دەردی خۆدزینەوە بوون. ئەگەر هیندییەك چوە بنکەیەکی تەندروستی حکومی، نەك تەنیا هیچ نێرسێك لەوی دا نابینێ، بەڵکو ڕەنگە هەر نەتوانێ بچێتە ناو بینای بنکەکەوە چونکە بنکە خزمەتگوزارییە تەندروستییەکان زۆربەی کاتەکان داخراون.

لە ساڵی ٢٠٠٦ دا سیڤا ماندیر لەگەڵ گروپێکی ئابووریناسان دا سیستەمێکی هاندانیان دیزاینکرد بۆ ئەوەی هانی نێرسەکان بدەن تا لەسەر کارەکانیان ئامادەبن لە ناوچەی یوداپور لە راجاستهان. بیرۆکەکە سادەبوو: سیڤا ماندیر کاتژمێری بەکارهێنا کە ڕۆژ و کاتی ئامادەبوونی نێرسەکانی لە بنکەکەدا تۆماردەکرد. دەبوایە نێرسەکان ڕۆژانە سێجار کارتی ئامادەبوونیان ئیمزابکردایە بۆ دڵنیابوون لەوەی نێرسەکان لە کاتی خۆی دا دەگەیشتن و لەسەر کارەکانیان دامانەوە و لەکاتی خۆی دا کارەکانیان بەجێدەهێشت. ئەگەر سیستەمێکی لەم چەشتە کاری بکردایە و پێشکەشکردنی جۆر و بڕی خزمەتگوزارییە تەندروستییەکانی زیادبکردایە، ئەوا ئەمە ڕوونکردنەوەیەکی بەهێز بوو بۆ ئەو تیۆرییەی لایوایە چارەسەری ئاسان هەیە بۆ کێشە سەرەکییەکانی پەرەپێدان.

لەم دۆخەدا، هاوکارییەکە هەندێك شتی زۆر جیاوازی ئاشکراکرد. ماوەیەکی کەم دوای ئەوەی پرۆگرامەکە خرایە بواری جێبەجێکردنەوە، زیادبوونێکی بەرچاو لە ئامادەبوونی نێرسەکان دا ڕوویدا، بەڵام ئەمە بۆ ماوەیەکی کورت

بوو. له ماوەی کەمێك زیاتر له ساڵێك، بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی ناوچەکە بە ئەنقەست سیستەمی هاندانەکەیان پشتگوێخست کە سیڤا ماندیر خستبویەگەڕ. ئامادەنەبوون گەڕایەوە بۆ دۆخی پێشووتری و زیادبوونێکی بەرچاو ڕوویدا لە "ڕۆژانی بەخشراو" دا کە مانای ئەوەبوو نێرسەکان لە راستیدا لە بنکەکەدا نەبوون ـ بەڵام ئەمە بە شێوەیەکی فەرمی لە لایەن بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی ناوچەکەوە پەسەند کرابوو. لە هەمانکات زیادبوونێکی زۆر ڕوویدا لە " گرفتەکانی ئامێر" دا کاتێك کاتژمێرەکان دەشکێنران، بەڵام سیڤا ماندیر نەیتوانی ئەم کاتژمێرە شکاوانە بگۆڕێ چونکە بەرپرسانی تەندروستی ناوچەکە ئامادەی هاوکاری نەبوون.

ناچارکردنی نێرسەکان بۆ ئیمزاکردن سێجار لە ڕۆژێك دا پێناچێ بیرۆکەیەکی هێندە نوێ بێ. لە راستیدا ئەم پراکتیسە لە هەموو بوارەکانی پیشەسازی دا بەکاردەهێنرێ، تەنانەت لە ناو پیشەسازی هیندستانیش دا و دەبێ بەڕێوەبەرانی تەندروستی بیریان لەوە کردبێتەوە کە ئەمە چارەسەرێکە بۆ کێشەکانیان. کەواتە پێناچێ نەزانینی ئەم سیستەمی هاندانە سادەیە هەر لە سەرەتاوە هۆکاری بەکارنەهێنانی بووبێ. ئەوەی لە کاتی جێبەجێکردنی پرۆگرامەکە دا ڕوویدا دووپاتی ئەمەی کردەوە. بەڕێوەبەرانی تەندروستی بە ئەنقەست پرۆگرامەکەیان تێکدا چونکە ئەوان لەو پیلانەدا هاوکار بوون لەگەڵ نێرسەکان و بەشدار بوون لە کێشەکانی ئامادەنەبوون دا. ئەوان سیستەمێکیان نەدەویست نێرسەکان ناچاربکا لەسەر کارەکانیان ئامادە بن یان موچەکانیان کەمبکەنەوە ئەگەر ئامادەنەبوون.

ئەوەی ئەم چیرۆکە ڕوونیدەکاتەوە شێوازێکی زۆر بچووکی ئاستەنگی بەردەم جێبەجێکردنی گۆڕانکارییە گرنگەکانە کاتێك دەزگاکان لە بنەڕەت دا هۆکاری کێشەکانن. لەم بارەدا ئەوە سیاسییە گەندەڵەکان یان بزنسە دەسەڵاتدارەکان نەبوون کە تەگەرەیان لەبەردەم ڕیفۆرمی دەزگایی دا دروستکرد، بەڵکو بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆیی تەندروستی و نێرسەکان بوون کە توانیان سیستەمە هاندانەکەی سیڤا ماندیر و ئابووریناسانی بواری پەرەپێدان تێکبدەن. ئەمە ئەوە پیشاندەدا کە چەندین شکستی مایکرۆمارکێت کە لە ڕووکەش دا پێدەچن چارەسەرکردنیان ئاسان بن، لە ڕاستیدا هێندە ئاسان نین: ئەو پێکهاتە دەزگاییەی شکستەکانی بازاڕ دروستدەکا، هەر بۆ خۆشی

ڕێگـره لەبـەردەم جێبـەجێکردنی ئـەو هەوڵانـەی دەدرێـن بـۆ باشـترکردنی ماندانەکان لە ئاستی مایکرۆ دا. هەوڵدان بۆ ئەندازیاریی خۆشگوزەرانی بەبێ بەرەنگاربوونەوەی هۆکاری ڕیشەیی کێشەکە - دەزگایانی چەوسێنەر و ئەو سیاسەتانەی ئەم دەزگایانە دەهێڵنەوە - پێناچێ هیچ بەرهەمێکی هەبێ.

## شکستهێنانی هاوکاری نێودەوڵەتی

دوای هێرشـەکانی ئەلقاعیـدە لـە ١١ ی ئـەیلولی سـاڵی ٢٠٠١ دا، هێزەکـانی ویلایەتە یەکگرتوەکان ڕژێمە چەوسێنەرەکەی تالیبانیان لـە ئەفغانستان دا لـە ناوبرد کـە دالّـدەی ئەنـدامانی ئەلقاعیـدەی دابـوو، ئامـادەش نـەبوو ئەوانـە ڕادەستی ویلایەتە یەکگرتوەکان بکا. ڕێکەوتنامـەی بۆن، لـە کـانونی یەکـەمی سـاڵی ٢٠٠١ دا لـە نێـوان سـەرکردەکانی پێـشووی موجاهـدین کـە هاوکـاری هێزەکـانی ویلایەتـە یـەکگرتوەکانیان کـرد و ئەنـدامانی ناسـراوی ڕەوەنـدی ئەفغانـستان لـە دەرەوە، لەوانـە حامیـد کـارزای، پلانێکـی پێکـەوەنا بـۆ دامەزراندنی ڕژێمێکی دیموکراسی. هـەنگاوی یەکـەم بریتیبـوو لـە دامەزرانـدنی ئەنجوومەنێکی گـەورەی سەرتاسـەری وڵات، لۆیـا جێرگـا، کـە حامیـد کـارزای هەڵبژارد بۆ سەرۆکایەتی حکومەتی کـاتی. شـتەکان ڕوویـان لـە باشـی بـوو بـۆ ئەفغانستان. زۆرینـەی دانیـشتوانی ئەفغانـستان بـە پـەرۆش بـوون بـۆ ئـەوەی تالیبـان لـە بیربکـەن. کۆمـەڵگای نێودەوڵـەتی لایـانوابوو ئـەوەی ئەفغانـستان پێویـستی پێـی بـوو بریتیبـوو لـە لێـشاوێکی گـەورەی هاوکـاری نێودەوڵـەتی. نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان و چەندین ڕێکخراوی ناحکومی ناسراو گەیشتنە کابوڵی پایتەخت.

ئەوەی دوای ئەوە ڕوویدا نەدەبوایە جێگەی سەرسوڕمان بوایـە، بەتایبـەتی ئەگـەر شکـستهێنانی هاوکـاری نێودەوڵـەتی بـۆ وڵاتـانی هـەژار و دەوڵـەتانی شکستخواردوو لە مـاوەی پێـنج دەیـەی ڕابـوردوودا لەبەرچـاوبگیرایە. جێگـەی سەرسـوڕمان بـێ یـان نـا، نەریتـە ئاسـاییەکە دووبارەکرایـەوە. ژمارەیـەك لـە کارمەنـــدانی ڕێکخراوانـــی پێـــشکەشکاری هاوکـــاری نێودەوڵـــەتی و دەسـتوپێوەندەکانیان بـە فرۆکـەی تایبـەتی خۆیـان گەیـشتنە شـارەکە.

ڕێکخراوانی ناحکومی لە هەموو جۆرێك بە لێشاو هاتن تا ئەجێنداکانی خۆیان جێبەجێبکەن و گفتوگۆ لە پایەی بەرزدا دەستپێکرد لە نێوان حکومەتەکان و شاندەکانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دا. ملیاردان دۆلار ڕژایە ئەفغانستانەوە، بەڵام کەمێك لەو پارەیە بەکارهات بۆ دروستکردنی ژێرخان و قوتابخانە یان خزمەتگوزارییە گشتییەکانی تر کە پێویست بوون بۆ پەرەپێدانی دەزگایانی کراوە یان تەنانەت بۆ گێڕانەوەی ئاسایش و یاسا. لە کاتێك دا بەشی زۆری ژێرخان داتەپیبوو، یەکەم گوژمەی پارەکە بەکارهێنرا بۆ پێکهێنانی هێڵێکی ئاسمانی بۆ گواستنەوەی کاربەدەستانی نەتەوە یەکگرتوەکان و نێودەوڵەتییەکانی تر. ئەوەی دواتر پێویستیان پێیبوو بریتیبوو لە شۆفێر و وەرگێڕ. بۆیە کەوتنە بەکرێگرتنی ئەو بیرۆکراتە ژمارە کەمانەی ئینگلیزییان دەزانی و مامۆستایانی تری قوتابخانەکانی ئەفغانستان بۆ ئەوەی هاتوچۆیان پێبکەن و ڕێنماییان بکەن و موچەی چەندین قاتی ئەو موچەیەی ئەفغانییەکان وەریاندەگرت درایە. کاتێك ئەو ژمارە کەمەی بیرۆکراتانی خاوەن بەهرە ڕاکێشرانە ناو ئەو ئیشانەی خزمەتی ڕێکخراوانی هاوکاری نێودەوڵەتییان دەکرد، لێشاوی هاوکارییەکە لەبری ئەوەی ژێرخان دروستبکاتەوە لە ئەفغانستان دا کەوتە بنکۆڵکردنی ئەو دەوڵەتە ئەفغانییەی بەتەمابوون دروستیبکەنەوە و بەهێزیبکەن.

گوندنشینەکانی ناوچەیەکی دوورەدەست لە دۆڵی ناوەڕاستی ئەفغانستان دا لە ڕادیۆوە گوێیان لە ئاگادارییەك بوو دەربارەی پرۆگرامێکی چەند ملیۆن دۆلاری بۆ دروستکردنەوەی خانوو لە ناوچەکەیان دا. دوای ماوەیەکی زۆر، چەند نیرگەیەکی دار بە لۆرییەکانی کارتیلی ئیسماعیل خان کە لۆردێکی ناسراوی شەڕی پێشووتر و ئەندامی حکومەتی ئەفغانستان بوو، گوێزرانەوە. بەڵام ئەم نیرگانە زۆر گەورەتر بوون لەوەی لەو ناوچەیەدا بتوانرێ بۆ هیچ شتێك بەکاربهێنرێن و گوندنشینەکان بۆ تەنیا شتێکی شیاو بەکاریانهێنان: داری ئاگرکردنەوە. ئەی ئەو هەموو ملیۆن دۆلارانە چییان بەسەرهات کە بەڵێندرابوو بۆ گوندنشینەکان خەرجبکرێن؟ لەو پارەیەی بەڵێن درا بوو بدرێتە گوندنشینان، ٪۲۰ ی وەك خەرجییەکانی ئۆفیسی سەرەکی نەتەوە یەکگرتوەکان لە جنێڤ هەڵگیرا و باقیەکەشی درایە ڕێکخراوێکی ناحکومی وەك بەڵێندەری دوەم کە ٪۲۰ی هەڵگرت وەك خەرجییەکانی ئۆفیسی سەرەکی لە

بەلچیکا و بەم شێوەیە سێ چینی تریش هەریەکەیان نزیکەی ٪۲۰ی بۆخۆی هەڵگرت لەو پارەیەی مابۆوە. ئەو پارە کەمەی گەیشتە ئەفغانستان درا بە دار لە ڕۆژئاوای ئێران و بەشی زۆریشی درایە کارتیلەکەی ئیسماعیل خان بۆ گواستنەوەی دارەکان بە نرخێکی هەڵاوساو. تا ڕادەیەك موعجیزە بوو کە ئەو نیرگە دارە قەبارە گەورانە گەیشتنە ئەفغانستان.

ئەوەی لە دۆڵی ناوەڕاستی ئەفغانستان دا ڕوویدا، ڕووداوێکی دابڕاو نەبوو. چەندین لێکۆڵینەوە دەریانخستوە کە تەنیا ٪۱۰ یان بەلایەنی زۆرەوە ٪۲۰ ی هاوکارییەکان دەگەنە شوێنی مەبەست. دەیان لێکۆلینەوە لەسەر ساختەکاری بەردەوامە دەربارەی ئەو تۆمەتانەی خراونەتە پاڵ کاربەدستانی نەتەوە یەککگرتوەکان و کاربەدەستانی نێوخۆیی وولاتان بەوەی پارەی هاوکاری نێودەولەتیان بردوە. بەشی زۆری بەفیڕۆچوون لە پارەی هاوکاری نێودەولەتی تەنیا لە ساختەکاری دا نییە، بەڵکو ناکارامەیی و لەوەش خراپتر: ڕێکخراوانی هاوکاری نێودەولەتی وەك هەمیشە بەردەوامن لە سەر کارەکانیان.

ئەزموونی ئەفغانستان لە میانەی هاوکاری نێودەولەتی دا لە ڕاستیدا ڕەنگە سەرکەوتنێکی مەرجدار بێ بە بەراوورد لەگەڵ وولاتانی تردا. بە درێژایی پێنج دەیەی ڕابوردوو، سەدان ملیارد دۆلار دراوەتە حکومەتان لە سەرتاسەری دنیادا وەك هاوکاری "پەرەپێدان". بەشی زۆری ئەم هاوکارییە لە خەرجییەکانی کارمەندان و گەندەڵی دا بە فیڕۆدراوە هەورەك لە ئەفغانستان دا کراوە. لەوەش خراپتر بەشێك لەو پارەیە چوە بۆ دیکتاتۆرانی وێنەی مۆبۆتۆ کە پشتی بە هاوکاری نێودەولەتی بەست لە لایەن پارێزە ڕۆژئاواییەکانییەوە بۆ کڕینی پشتگیری دۆستەکانی بۆ مانەوەی ڕژێمەکەی و دەولەمەنکردنی خۆی. وێنەکە لە زۆربەی وولاتانی باشووری بیابانی ئەفریقی دا هاوشێوە بوو. هاوکارییە مرۆییەکان کە وەك یارمەتیدانی کاتی لە ساتەوەختی قەیرانەکان دا پیشکەش کران، بۆ نموونە، نوێترینیان ئەو هاوکارییانە بوون درانە هایتی و پاکستان، بە دڵنیاییەوە سوودیان زیاتر بوو، هەرچەندە جێبەجێکردنیان بەهۆی کێشەی هاوشێوەوە لکەدار بوون.

سەرەڕای ئەم تۆمارە خراپەی هاوکاری "پەرەپێدان"، هاوکاری نێودەولەتی یەکێکە لە پۆلیسیە هەرە نێودارەکان کە حکومەتانی ڕۆژئاوا و ڕێکخراوانی نێودەولەتی وەك نەتەوە یەککگرتوەکان و (NGO)کان بە جۆرە

جیاوازەکانیانەوە، وەك ڕێگایەك بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەژاری لە جیهان دا ڕایدەسپێرن. بێگومان بارنەی شکستهێنانی هاوکاری نێودەوڵەتی جار لە دوای جار خۆی دووبارەدەکاتەوە. بیرۆکەی ئەوەی کە پێویستە وولاتانی ڕۆژئاوا بڕێکی زۆر "هاوکاری پەرەپێدان" پێشکەشبکەن بۆ چارەسەرکردنی هەژاری لە وولاتانی باشووری بیابانی ئەفریقی و کاریبی و ناوەڕاستی ئەمەریکا و باشووری ئاسیا، پشت بە تێگەیشتنێکی هەڵە دەبەستێ دەربارەی ئەوەی چی هەژاری دروستدەکا. وولاتانی وەك ئەفغانستان هەژارن لەبەر دەزگا چەوسێنەرەکانیان ـ کە دەبنە هۆی نەبوونی مافی موڵکداری و یاسا و ئاسایش یان نەبوونی سیستەمێکی کاریگەری دادوەری و باڵادەستیی خنکێنەرانەی نوخبەکان لەسەر ئاستی وولات و زۆرجاریش لەسەر ئاستی ناوچەکان بەسەر ژیانی سیاسی و ئابووری دا. هەمان کێشە دەزگاییەکان ئەوە دەگەیەنن کە هاوکاری نێودەوڵەتی کاریگەر نابێ، چونکە بەفیڕۆ دەدرێ و پێناچێ بگاتە ئەو شوێنەی پێویستە بۆی بڕوات. لە خراپترین سیناریۆدا، ئەو هاوکارییە دەبێتە پاڵپشتی ئەو ڕژێمانەی کە بۆخۆیان ڕیشەی کێشەکانی ئەو کۆمەڵگایانەن. ئەگەر گەشەسەندنی بەردەوامی ئابووری پشت بە دەزگایانی کراوە ببەستێ، ئەوا پێشکەشکردنی هاوکاری بەو ڕژێمانەی کۆنترۆڵی دەزگایانی چەوسێنەر دەکەن ناکرێ چارەسەرەکە بێ. ئەمە نکۆڵیکردن نییە لەوەی کە لە ناو هاوکارییە مرۆییەکان دا کاری باش لە ئەنجامی جێبەجێکردنی هەندێك پرۆگرامی دیاریکراوی هاوکاری دا ئەنجامدەدرێ کە قوتابخانە لەو شوێنانەدا دروستدەکا کە پێشتر قوتابخانەیان نەبوە و موچەی مامۆستایان دەدا کە بەبێ ئەو هاوکارییە بێمووچە دەبن. لە کاتێك دا بەشی زۆری ئەو هاوکارییەی ڕژایە ناو کابوڵەوە شتێکی ئەوتۆی نەکرد بۆ باشترکردنی ژیانی هاوڵاتییانی ئاسایی ئەفغانستان، بەڵام سەرکەوتنی بەرچاویش تۆمارکراوە لە دروستکردنی قوتابخانە دا بەتایبەتی بۆ کچان، کە بە تەواوی دوورخرابوونەوە لە خوێندن لە سەردەمی تالیبان و تەنانەت پێشتریش دا.

چارەسەرێك ـ کە لەم دواییانەدا زیاتر نێوبانگی پەیداکرد و لەسەر بنەمای ئەو دانپێدانانە هاتەئاراوە کە دەزگاکان پەیوەندییان بە خۆشگوزەرانی و تەنانەت گەیاندنی هاوکارییەکانەوە هەیە ـ ئەوەیە کە هاوکارییەکان "مەرجدار" بکرێن. بە گوێرەی ئەم بۆچوونە، پێویستە بەردەوامبوونی هاوکاری

ببەسترێتەوە بە جێبەجێکردنی هەندێك مەرجەوە لە لایەن حکومەتانی وەرگری هاوکارییەکانــەوە ــ بـۆ نموونــە، ئــازادکردنی بــازاڕ یــان هــەنگاونان بــەرەو دیموکراسی. ئیدارەی جۆرج دەبلیو بوش گـەورەترین هـەنگاوی نـا بـەرەو ئـەم جـۆرە لـە هاوکـاری مەرجـدار بـە هێنانـەئارای حـسابەکانی ڕووبەڕووبوونـەوەی هەزارە (Millennium Challenge Accounts)، کە پێدانی هاوکاری ئایندەی بەسـتەوە بـە هێنانـەدی پێـشکەوتنی پێـوراو لـە چـەندین بـواری پەرەپێـدانی ئابووری و سیاسی دا. بەڵام پێدەچێ کاریگەری هاوکاری مەرجدار باشـتر نـەبێ لە کاریگەری جۆرە بێمەرجەکە. ئەو وڵاتانەی لە جێبەجێکردنی ئەو مەرجانەدا شکـستدەهێنن هــەمان بــڕی ئــەو هاوکارییــە وەردەگــرن کــە ئــەو وڵاتانــەی مەرجەکان جێبەجێدەکەن وەریدەگرن. بۆ ئەمەش پاساوێکی سادە هەیـە: ئـەو وڵاتانـە پێویـستییەکی زیاتریـان بـە هاوکـاری هەیـە، جـۆری مرۆیـی بـێ یـان پەرەپێـدان. بــە شـێوەیەکی زۆر چـاوەڕێکراو هاوکــاری مەرجـدار پێدەچـی کاریگەری کەمی هەبێ بۆ سەر دەزگاکانی نەتەوەیەك. بەهەرحاڵ، زۆر جێگـەی سەرسوڕمان دەبـوو کـە کەسـێکی وەك سـیاکا سـتیڤنس لـە سـیارا لیـۆن یـان مۆبۆتــۆ لـــە کۆنگــۆ لەپڕێکــدا دەســتبکەن بـــە هەڵوەشـــاندنەوەی دەزگـــا چەوسێنەرەکانیان بۆ کەمێك هاوکاری نێودەوڵەتی زیاتر. تەنانەت لـە وڵاتـانی باشووری بیابانی ئەفریقی دا کە هاوکاری نێودەوڵەتی بەشێکی گرنگی بودجەی چـەندین لـە حکومەتـەکان پێکـدەهێنێ، تەنانــەت دوای خـستنەگەڕی حـسابی ڕووبەڕووبوونەوەی هەزارە کە ڕادەی مەرجداری هاوکارییـەکانی زیـادکرد، بـڕی ئەو هاوکارییە زیادەی کە دیکتاتۆرێك دەتوانێ وەریبگرێ لە ڕێگەی لاوازکردنـی دەســەڵاتەکەی خۆیــەوە کەمــە و ئــەوە نــاهێنێ موجازەفــە بــە بــەردەوامی بالادەستی خۆی بەسەر وڵات دا بکا یان موجازەفە بە ژیانی خۆی بکا.

هەموو ئەمانە مانای ئەوە نییە کە هاوکاری نێودەوڵەتی، جگە لـە هاوکـاری مرۆیی، پێویستە ڕاگیرێ. کۆتاییهێنان بە هاوکاری نێودەوڵەتی پراکتیکی نییـە و ڕەنگە ببێتە هۆی مەینەتی مرۆیی زیاتر. پراکتیکی نییـە چـونکە هاوڵاتییـانی چـەندین نەتـەوەی ڕۆژئـاوا هەسـت بـە گونـاح و نائـارامی دەکـەن دەربـارەی کارەسـاتە ئـابووری و مرۆییــەکان لـە جیهـان دا و هاوکـاری نێودەوڵـەتی ئـەو بڕوایەیان لا دروستدەکا کە هەوڵێك دەدرێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو کێشانە. تەنانەت ئەگەر ئەم هەوڵەش زۆر کاریگەر نـەبێ، خواسـتی ئـەو هاوڵاتییانـە بـۆ

ئەنجامــدانی ئــەم هەوڵــە بەردەوامــدەبێ، بۆیــە هاوکــاری نێودەوڵــەتیش بەردەوامدەبێ. ئاڵۆزی لە ڕادەبەدەری ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و ڕێکخراوە ناحکومییەکان بێپسانەوە داوادەکەن و توانای خۆیان دەخەنەگەڕ بۆ دڵنیابوون لە بەردەوامی ئەو واقیعەی کە ئێستا هەیە. جگە لەمانەش، بڕینی هاوکاری لـەو نەتەوانەی زۆرترین پێویستییان بەو هاوکارییـە هەیـە، دڵڕەقییـە. بـەڵێ بەشـی زۆری ئەو هاوکارییانـە بـەفیڕۆدەدرێن، بـەڵام ئەگـەر لـە هـەر دۆلارێك کـە وەك هاوکـاری دەدرێ، دە سـێنت بگاتـە هـەژارترین خـەڵك لـە جیهـان دا، ئـەوا ئـەو خەڵکـە دە سـێنتیان زیـاتر دەبـێ لـەوەی لەوەبـەر هـەیانبوە بـۆ نەهێـشتنی نالەبارترین هەژاری و ڕەنگە لە هیچ باشتر بێ.

لێـرەدا دوو وانـەی گـرنگ هەیـە. یەکـەم، ئـەمڕۆ هاوکـاری نێودەوڵـەتی ئامرازێکی زۆر کاریگەر نییە بـۆ مامەڵـەکردن لەگـەڵ شکستهێنانی نەتـەوان لـە جیهـان دا. زۆر لـەوە دوورە. وڵاتـان پێویـستیان بـە دەزگایـانی ئـابووری و سیاسـی کـراوە هەیـە بـۆ دەرچـوون لـە بازنـەی هـەژاری. بـە گـشتی هاوکـاری نێودەوڵەتی لەم بارەیەوە کاریگەری کەمی هەیە و بە دڵنیاییەوە بەو شـێوەیەی ئەمڕۆ ئەو هاوکارییە ڕێکدەخرێ ناتوانێ ئەو کاریگەریەشی هەبێ. تێگەیشتن لە ڕیشەی نایەکسانی و هەژاری لە جیهان دا گرنگە بۆ ئـەوەی هیواکانمـان لەسـەر بناخـەی بەڵێنـە ناڕاستەکان هەڵنەچنین. لەبـەر ئـەوەی ئـەو ڕیشانە لـە نـاو دەزگاکانـدان، هاوکـاری نێودەوڵـەتی، لـە چوارچـێوەی ئـەو دەزگایانـەی لـەناو وڵاتانی وەرگردا هەن، شتێکی ئەوتۆ ناکا بۆ تاودانی گەشەسەندنی بـەردەوام. دوەم لەبــەر ئــەوەی پەرەپێــدانی دەزگایــانی ئــابووری و سیاســی کــراوە چارەسەرەکەیە، بەکارهێنانی لێشاوی ئێستای هاوکاری نێودەوڵەتی، هەر هیچ نەبێ بەشێك لەو هاوکارییە، بـۆ خستنەگەڕی ئـەو جـۆرە پەرەپێدانـە سـوودی دەبـێ. هــەروەك بینیمــان، لێـرەدا دانــانی مــەرج بەرامبــەر پێـشکەشکردنی هاوکارییەکان وەڵام نییە چونکە ئەو مەرجدارییـە داوا لـە فـەرمانڕەواکان دەکا تەنازول بکـەن. لـە جیـاتی ئەمـە، ڕەنگـە دارشـتنەوەی هاوکـاری نێودەوڵـەتی بەشــێوەیەك کــە دابینکــردن و بــەڕێوەبردنی هاوکارییەکــە ئــەو گــروپ و سەرکردانەی خراونەتە دەرەوەی دەسەڵات بهێنێتە ناو پرۆسـەی بڕیاردانـەوە و بەشێکی فراوانی دانیشتوان هێزدار بکا، ڕێگەیەکی باشتر بێ.

# هێزدارکردن

ڕۆژی ١٢ مایسی ساڵی ١٩٧٨ پێدەچوو ڕۆژێکی ئاسایی بێ لە کارگەی سکانیای دروستکردنی ئۆتۆمبێل لە شاری ساو بێرناردۆ لە ویلایەتی ساو پاولۆی بەرازیل دا، بەڵام کرێکارەکان بێئارام بوون. مانگرتنەکان هەر لە ساڵی ١٩٦٤ ەوە لە بەرازیل دا قەدەغەکرابوون، کاتێک سوپا حکومەتە دیموکراسییەکەی سەرۆك جۆئۆ گولارتی لەو ساڵەدا ڕووخاند. دەنگۆی ئەوە بڵاوبۆوە کە حکومەت دەسکاری ژمارەکانی هەڵاوسانی نیشتمانی کردوە بۆ ئەوەی بەرزبوونەوەی گرانیی کەمتر پیشانبدرێ. کاتێك شیفتی کاتژمێر ٧:٠٠ ی بەیانی دەستیپێکرد، کرێکارەکان ئامرازەکانیان دانا. لە کاتژمێر ٨:٠٠ بەیانی دا گیلسۆن مێنیزس، کە ڕێکخەرێکی سەندیکا و لە کارگەکەدا کاریدەکرد تەلەفۆنی بۆ سەندیکا کرد. سەرۆکی سەندیکای کرێکارانی میتاڵ لە ساو بێرناردۆ چالاکوانێکی تەمەن سی و سێ ساڵە بوو بەناوی لویز ئیناسیۆ لولا دا سیلڤا (لولا). لە نیوەڕۆدا لولا گەیشتە کارگەکە. کاتێك کۆمپانیاکە داوایانلێکرد کارمەندەکان ڕازیبکا بگەڕێنەوە سەر کار، ئەو ڕەتیکردەوە.

مانگرتنی کارگەی سکانیا یەکەم مانگرتن بوو لە شەپۆلێك مانگرتن کە سەرتاسەری بەرازیلی گرتەوە. بە ڕووکەش مانگرتنەکان دەربارەی مووچە بوون، بەڵام هەروەك لولا دواتر ئاماژەیپێدا:

*(لەو بڕوایەدام ناتوانین فاکتەرە ئابووری و سیاسییەکان لەیەکتر جیابکەینەوە ... خەباتەکە لەسەر مووچە بوو، بەڵام لە خەباتکردن دا بۆ مووچە، چینی کرێکاران سەرکەوتنی سیاسی بەدەستهێنا).*

ژیانەوەی بزووتنەوەی کرێکارانی بەرازیل تەنیا بەشێك بوو لە کاردانەوەیەکی کۆمەڵایەتی فراوانتر بەرامبەر دەیە و نیوێك لە فەرمانڕەوایی سەربازی. چەپخوازی ڕووناکبیر فێرناندۆ هێنریك کاردۆسۆ، کە وەك لولا بووە سەرۆکی بەرازیل لە دوای گەڕانەوەی دیموکراسی، لە ساڵی ١٩٧٣ دا پێیوابوو کە دیموکراسی لە بەرازیل دا دادەدمەزرێ لە ڕێگەی پێکەوەکارکردنی هەموو ئەو گروپە کۆمەڵایەتییانەی دژی فەرمانڕەوایی سەربازی وەستاونەتەوە. ئەو ووتی ئەوەی پێویست بوو بریتیبوو لە *(چالاك کردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی ... ڕێکخراوە پیشەییەکان و سەندیکایانی کرێکاران و کلێسەکان و ڕێکخراوانی خوێندکاران و گروپەکانی لێکۆڵینەوە و بازنەکانی گفتوگۆکردن و بزووتنەوە*

*کۆمەڵایەتییەکان)*. بە واتایەکی تر، هاوپەیمانییەکی فراوان بە ئامانجی دامەزراندنەوەی دیموکراسی و گۆڕینی کۆمەڵگای بەرازیلی.

کارگەی سکانیا ڕێخۆشکاری پێکهێنانی ئەم هاوپەیمانییە بوو. لە کۆتاییساڵی ١٩٧٨ دا، لولا بیرۆکەی دامەزراندنی حیزبێکی سیاسی نوێی خستەئاراوە، کە حیزبی کرێکاران بوو. ئەمەش دەبوایە حیزبێك بێ تەنیا بۆ سەندیکا کرێکارییەکان نەبێ. لولا پێداگریکرد کە دەبێ حیزبێك بێ بۆ هەموو ئەوانەی کاری کرێ دەکەن و بەگشتی بۆ هەموو هەژاران بێ. لێرەدا هەوڵەکانی سەرکردەکانی سەندیکاکان بۆ دامەزراندنی پلاتفۆرمێکی سیاسی لەگەڵ هەموو ئەو گۆروپە کۆمەڵایەتییانەی دەستیان بە دەرکەوتن کرد خەست بۆوە. لە ١٨ ئابی ١٩٧٩ دا کۆبوونەوەیەك لە ساو پاولۆ ئەنجامدرا بۆ گفتوگۆکردن لەسەر پێکهێنانی حیزبی کرێکاران کە گروپە ئۆپۆزیۆسۆنەکانی پێشتر و سەرکردەکانی سەندیکا و خوێندکاران و ڕووناکبیران و خەڵکێك کە نوێنەرایەتی سەد بزووتنەوەی جیاوازی کۆمەڵایەتی کە لە ساڵانی ١٩٧٠ کانەوە دەستیان بە ڕێکخستن کردبوو لە سەرتاسەری بەرازیل دا، لەخۆ بگرێ. حیزبی کرێکاران کە لە ڕێستۆرانتی ساو جودەس تادیۆ لە ساو بێرناردۆ لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٩ دا دامەزرا، بوە ئەو حیزبەی نوێنەرایەتی هەموو ئەم گروپە جیاوازانەی دەکرد.

هەر زوو حیزبەکە کەوتە سوود وەرگرتن لەو کرانەوە سیاسییەی کە سوپا بە ناچاری دابینیکردبوو. لە هەڵبژاردنە ناوخۆییەکانی ساڵی ١٩٨٢ دا، حیزبەکە بۆ یەکەمجار کاندیدی خۆی خستە هەڵبژاردنەکانەوە و دوو پێشبڕکێی بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك شارەوانی بردەوە. لە ساڵانی ١٩٨٠ کان دا، لە کاتێك دا دیموکراسی بەرەبەرە لە بەرازیل دا دەکەوتەوە سەرپێ، تا دەهات حیزبی کرێکاران ژمارەیەکی زیاتری حکومەتە ناوخۆییەکانی بەدەستدەهێنا. بە هاتنی ساڵی ١٩٨٨، ئەو حیزبە کۆنترۆڵی حکومەتەکانی سیوشەش شارەوانی کرد، لەوانە شارە گەورەکانی وەك ساو پاولۆ و پۆرتۆ ئەلێگری. لە ساڵی ١٩٨٩ دا لە یەکەم هەڵبژاردنی ئازادانەی سەرۆکایەتی دا هەر لە کاتی کۆدێتا سەربازییەکەوە، لولا، وەك کاندیتی حیزب لە خولی یەکەم دا ١٦٪ دەنگەکانی بەدەستهێنا. لە خولی دوەم دا بەرامبەر فێرناردۆ کۆلۆر، ٤٤٪ دەنگەکانی بەدەستهێنا.

لە میانەی دەسەلات گرتنەدەست لە چەندین حکومەتی ناوخۆیی دا، کە لە ساڵانی ١٩٩٠ کان دا تاوی زیاتری سەند، حیزبی کرێکاران کەوتە دروستکردنی

پەیوەندی ڕەمزی لەگەڵ چەندین بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی ناوخۆیی دا. لە پۆرتۆ ئەلێگری یەکەم ئیدارەی حیزبی کرێکاران لە دوای ساڵی ١٩٨٨ "بەشداریکردن لە دانانی بودجەدا"ی هێنایەئاراوە کە بریتیبوو لە میکانیزمێك بۆ بەشداریپێکردنی هاوڵاتییانی ئاسایی لە داڕشتنی بودجەی شارەکەدا. ئەمەش سیستەمێکی دروستکرد کە بوە مۆدێلێکی جیهانی بۆ لێپێچینەوە و بەرپرسیارێتی حکومەتە لۆکەڵەکان، ئەمەش شانبەشانی پێشخستنی بەرچاو ئەنجامدرا لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان و چۆنیەتی ژیان لە شارەکەدا. هەیکەلی حوکمڕانی سەرکەوتووی حیزب لە سەر ئاستی لۆکەڵ دا بوە هۆی سازدانێکی سیاسی گەورەتر و سەرکەوتن لە سەر ئاستی نیشتمانی دا. هەرچەندە لولا لە هەڵبژاردنە سەرۆکایەتیەکانی ساڵانی ١٩٩٤ و ١٩٩٨ دا لە لایەن فێرناندۆ هێنریك کاردۆسۆ شکستپێهێنرا، ئەو لە ساڵی ٢٠٠٢ دا بە سەرۆکی بەرازیل هەڵبژێررا. حیزبی کرێکاران لەو کاتەوە لە دەسەڵاتدان.

پێکهێنانی هاوپەیمانییەکی فراوان لە بەرازیل دا لە ئەنجامی یەکگرتنی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان و کرێکارانی ڕێکخراو کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ئابووری بەرازیل هەبوو. لە ساڵی ١٩٩٠ ەوە گەشەکردنی ئابووری بە خێرایی بەرەوپێش چوە و ڕێژەی دانیشتوانی هەژار لە ٪٤٥ وە دابەزی بۆ ٪٣٠ لە ساڵی ٢٠٠٦ دا. نایەکسانی کە لەسەردەمی حوکمی سەربازی دا بە خێرایی بەرزبۆوە، بەڵام بە تیژی دابەزی بەتایبەتی دوای ئەوەی حیزبی کرێکاران دەسەڵاتی گرتەدەست و فراوانبوونی بەرچاو لە پەروەردە دا هاتەئاراوە و تێکڕای ساڵەکانی خوێندن بۆ دانیشتوان لە شەش ساڵەوە لە ساڵی ١٩٩٥ دا بەرزبۆوە بۆ هەشت ساڵ لە ساڵی ٢٠٠٦ دا. بەڕازیل ئێستا بەشێکە لە نەتەوانی BRIC (بەرازیل و ڕوسیا و هیندستان و چین)، یەکەم وڵاتی ئەمەریکای لاتینە کەلە ناو بازنە دیپلۆماسییەکانی نێودەوڵەتی دا خاوەن کێش بێ.

پێشکەوتنی بەڕازیل لە ساڵانی ١٩٧٠ کانەوە، لە لایەن ئابووریناسانی دەزگا نێودەوڵەتیەکانەوە ئەندازیاریی بۆ نەکرا تا بە دانەرانی پۆلیسی بەرازیل بڵێن کە چۆن دیزاینی پۆلیسی باشتر بکەن تا لە شکستەکانی بازاڕ دووربکەونەوە. ئەم پێشکەوتنە لە ڕێگەی هێنانی هاوکاری نێودەوڵەتییەوە ئەنجامنەدرا. ئاکامێکی سروشتی مۆدێرنایەزەیشن نەبوو. بەڵکو ئاکامی یەکگرتنی گروپە جیاوازەکان بوو کە بەشێوەیەکی ئازایانە دەزگایانی کراوەیان دامەزراند. لە

ئاکام دا ئەم هەنگاوە بوە هۆی دامەزراندنی دەزگایانی ئابووری کراوەتر. بەڵام چۆن کۆمەڵگا دەزگایانی سیاسی کراوە دادەمەزرێنێ؟

مێژوو، هەروەك بینیمان، پڕە لە نموونەی بزووتنەوانی ڕیفۆرمخواز کە لەبەردەم یاسای ئاسنینی ئۆلیگارکی دا چەمینەوە و کۆمەڵە دەزگایەکی چەوسێنەریان بە کۆمەلە دەزگایاکی تری چەوسێنەر جێگرتەوە. بینیمان کە ئینگلتەرە لە ساڵی ١٦٨٨ دا و فەرەنسا لە ساڵی ١٧٨٩ دا و یابان لە سەردەمی گێرانەوەی مەیجی دا لە ساڵی ١٨٦٨ دا بە شۆڕشی سیاسی دەستیانکرد بە پرۆسەی پێکهێنانی دەزگایانی سیاسی کراوە. بەڵام ئەم شۆڕشە سیاسییانە بەگشتی تێکدان و ماڵوێرانی زۆر لەگەڵ خۆیان دا دەهێنن و سەرکەوتنیشیان مسۆگەر نییە. شۆڕشی بۆلشەڤیك ئامانجەکانی خۆی وا خستەڕوو کە بریتین لە لابردنی سیستەمی چەوسێنەری ئابووری ڕووسیای قەیسەری و جێگرتنەوەی بە سیستەمێکی دادپەروەر و کارامەتر کە ئازادی و خۆشگوزەرانی بۆ ملیۆنان ڕووسی بهێنێ. بەداخەوە، ئاکامەکەی پێچەوانەبوو، دەزگایانی زۆر داپلۆسێنەر تر و چەوسێنەر تر جێگەی دەزگایانی ئەو حکومەتەیان گرتەوە کە بۆڵشەفیکەکان لە ناویانبرد. ئەزموونی چین و کوبا و ڤێتنام هاوشێوە بوون. چەندین ڕیفۆرمی ناکۆمیۆنیستی کە لە سەرەوە بۆ خوارەوە ئەنجامدران، ئاکامی باشتریان بەدەستنەهێنا. ناسر بەڵێنی دا کۆمەڵگایەکی ئیگالیتاری نوێ لە میسردا دابمەزرێنێ، بەڵام ئەمە بەرەو ڕژێمە گەندەڵەکەی حوسنی موبارەك ملینا، هەورەك لە چاپتەری سیازدەیەم دا بینیمان. ڕۆبەرت مۆگابی لە لایەن چەندین کەسەوە وەك خەباتگێڕێك لە پێناوی ئازادی دا سەیردەکرا کە ڕژێمە ڕەگەزپەرست و یەکجار چەوسێنەرەکەی ئیان سمیسی لە ڕۆدیسیا لەناوبرد، بەڵام دەزگاکانی زیمبابۆی بوونە کۆمەڵە دەزگایەك کەمتر چەوسێنەر نەبوون لەوانەی سەردەمی ئیان سمیس و پێشکەوتنی ئابووری تەنانەت لە سەردەمی پێش سەربەخۆیی خراپتر بوە.

ئەوەی هاوبەشە لە نێوان ئەو شۆڕشە سیاسییانەی سەرکەوتوانە ڕێگایان بۆ دەزگایانی کراوەتر و گۆڕانکاری دەزگایی بەرەبەرە خۆشکرد لە باکووری ئەمەریکا و لە ئینگلتەرەدا لە سەدەی نۆزدەیەم و لە بۆتسوانا لە دوای سەربەخۆیی ـ کە بووشنە هۆی بەهێزکردنی بەرچاوی دەزگایانی سیاسی کراوە ـ ئەوەیە کە ئەو شۆڕشانە توانیان کۆمەڵانی فراوانی کۆمەڵگا هێزداربکەن. پلورەلیزم کە بەردی بناخەی دەزگایانی سیاسی کراوەیە، ئەوە دەخوازێ کە

دەسەڵاتی سیاسی بە شێوەیەکی فراوان لە ناو کۆمەڵگادا دابەشبکرێ. کاتێك بە دەزگایانی چەوسێنەر دەستپێدەکرێ، کە دەسەڵاتیان لە چنگی نوخبەیەکی بچووك دا چڕکردۆتەوە، ئەوا دابەشکردنی فراوانی دەسەڵات پێویستی بە هێزدارکردن هەیە. ئەمە، هەروەك لە چاپتەری حەوتەم دا جەختمان لەسەرکرد، ئەوەیە کە شۆڕشی شکۆدار لە دەسەڵات سەندنەوە لە نوخبەیەك لە لایەن نوخبەیەکی تر جیادەکاتەوە. لە حاڵەتی شۆڕشی شکۆدار دا، ڕەگی پلورەلیزم لە سەندنەوەی دەسەڵات لە جەیمسی دوەم دا خۆی داکوتا لە ڕێگەی شۆڕشێکی سیاسییەوە کە سەرکردایەتیکرا لە لایەن هاوپەیمانییەکی فراوانی پێکهاتوو لە بازرگانان و پیشەکاران و زەویدارە گەورەکان و تەنانەت چەندین ئەندامی ئەریستۆکراسی ئینگلیزی کە لایەنگری پاشا نەبوون. هەروەك بینیمان، شۆڕشی شکۆدار ڕێگەی بۆ خۆشکرا لە ڕێگەی سازدان و هێزدارکردنی هاوپەیمانییەکی فراوان و لەوەش گرنگتر، ئەمە بە دەوری خۆی بوە هۆی هێزدارکردنی زیاتری تەنانەت بەشێکی فراوانتری کۆمەڵگا ـ ئەگەرچی فراوانی ئەم بەشە زۆر بچووکتر بوو لە فراوانی هەموو کۆمەڵگا و ئینگلتەرە بۆ ماوەی دوو سەد ساڵی دواتر دوور لە دیموکراسی ڕاستەقینە مایەوە. ئەو فاکتەرانەی بوونە هۆی سەرهەڵدانی دەزگایانی کراوە لە کۆلۆنییەکانی باکووری ئەمەریکا دا هاوشێوە بوون، هەروەك لە چاپتەری یەکەم دا بینیمان. جارێکیتر ئەو ڕێچکەیەی لە ڤێرجینیا و کارۆلینا و مێریلاند و ماساشوتز دەستپێکرد و گەیشتە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی و قایمکردنی دەزگایانی کراوە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دا، ڕێچکەی هێزدارکردنی بەشێکی فراوانی کۆمەڵگا بوو.

شۆڕشی فەرەنسی نموونەیەکی هێزدارکردنی بەشێکی فراوانی کۆمەڵگایە کە دژی ڕژێمە کۆنەکە ڕاستبۆوە لە فەرەنسا دا و توانی ڕێگا خۆشبکا بۆ سیستەمێکی سیاسی زیاتر پلورەلیستی. بەڵام شۆڕشی فەرەنسا، بەتایبەتی ماوەی پڕ لە زەبروزەنگی سەردەمی ڕۆبسپێری کە ڕژێمێکی چەوسێنەر و ڕەشەکوژ بوو، دیسانەوە ئەوە پیشاندەدا کە چۆن هێزدارکردنیش بێخەوش نییە. لە کۆتایی دا ڕۆبسپێری و کادیرە جاکۆبیەکانی وەلانران و میراتە هەرە گرنگەکانی شۆڕشی فەرەنسی، بریتی نییە لە سەرپەڕاندن، بەڵکو ئەو ڕیفۆرمە هەمەلایەنەیە کە شۆڕش جێبەجێیکردن لە فەرەنسا دا و بەشەکانی تری ئەورووپا دا.

چەندین هاوتەریبی لە نێوان ئەم پرۆسە مێژووییانەی هێزدارکردن و ئەوەی

له ساڵانی ۱۹۷۰ کان دا له بەرازیل دا ڕوویدا هەیە. هەرچەندە ڕەگێکی حیزبی کرێکاران بریتییە لە بزووتنەوەی سەندیکاکانی کرێکاران، بەڵام هەر لە ساڵانی سەرەتاوە، سەرکردەکانی وەك لـولا شانبەشانی چەندین ڕووناکبیر و سیاسییەکانی ئۆپۆزیۆسۆن کە پشتگیری حیزبەکەیان کرد، هەولیان دا حیزبەکە بکەنە هاوپەیمانییەکی فراوان. کاتێکیش حیزب لە حکومەتە لۆکاڵەکان دا دەسەڵاتی گرتەدەست، ئەم هەولانە لەگەڵ بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە لۆکاڵەکان دا لەسەرتاسەری وولات دا یەکیانگرت و بوە هۆی هاندان بۆ بەشداریکردنی مەدەنییانە و بەرپاکردنی جۆرە شۆرشێك لە بەڕێوەبردن دا له هەموو وولات دا. لە بەرازیل دا، بە پێچەوانەی ئینگلتەرە لە سەدەی حەڤدەیەم دا یان فەرەنسا لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم دا، شۆڕشی ڕادیکاڵ ڕووینەدا تا کلپە بداتە پرۆسەی ئاڵوگۆڕی دەزگایانی سیاسی. پرۆسەی هێزدارکردن کە لە کارگەکانی ساو بێرناردۆ دەستیپێکرد کاریگەر بوو تا ڕادەیەك لەبەرئەوەی ئەو پرۆسەیە گۆڕرا بۆ گۆڕانکاری سیاسی بنەڕەتی لە ئاستی نیشتمانی دا ـ بۆ نموونە، گواستنەوە لە حوکمی سەربازییەوە بەرەو دیموکراسی. لەوەش گرنگتر، هێزدارکردن لە ئاستی بنکەی جەماوەری دا لە بەرازیل دا بوەهۆی ئەوەی کە گواستنەوە بۆ دیموکراسی هاوکات بێ لەگەڵ هەنگاونان بەرەو دەزگایانی سیاسی کراوە و هەر ئەمەش فاکتەری سەرەکی بوو لە سەرهەڵدانی حکومەتێك دا کە پابەندبوو بە دەستەبەرکردنی خزمەتگوزارییە گشتییەکان و فراوانکردنی پەروەردە و هێنانەئارای مەیدانێکی تەختی گەمەی ڕاستەقینە. هەروەك بینیمان، دیموکراسی گەرەنتی ئەوە ناکا کە پلورەلیزم دێتەئاراوە. جیاوازی لە نێوان پەرەسەندنی دەزگایانی پلورەلیستی لە بەرازیل دا لەگەڵ ئەزموونی ڤەنزەوێلا دا لەم بارەیەوە جێگەی سەرنجە. ڤەنزەوێلاش لە دوای ساڵی ۱۹۵۸ ەوە بەرەو دیموکراسی ڕۆیشت، بەڵام ئەمە بەبێ هێزدارکردن لە ئاستی بنکە جەماوەرییەکەدا ڕوویدا و دەسەڵاتی سیاسی بەشێوەیەکی پلورەلیستی دابەشنەکرد. لە بری ئەمە، سیاسییانی گەندەڵ و دروستکردنی تۆڕەکانی پشتیوانی و ململانێ لە ڤەنزەوێلا دا بەردەوامبوون و تا ڕادەیەکیش لە ئەنجامی ئەمەدا کاتێك دەنگدەران چوونە بەردەم سندوقەکانی هەڵبژاردن، ئامادەبوون تەنانەت پشتگیری زۆردارێکی وەك هیوگۆ شافێز بکەن. زۆر ڕێگەی تێدەچێ ئەمە لەبەرئەوە بووبێ کە ئەو دەنگدەرانە لایان وابوە تەنیا ئەو دەتوانێ بەرەنگاری نوخبە دامەزراوەکەی

ڤەنزەوێلا ببێتەوە. لە ئاکامی ئەمەدا، هێشتا ڤەنزەوێلا لە سایەی دەزگایانی چەوسێنەردا دەناڵێنێ، لە کاتێك دا بەرازیل قاڵبەکەی شکاند.

ئایا دەتوانرێ چی بکرێ تا پرۆسەی هێزدارکردن بخرێتەگەڕ یان تەنیا رێگەی بۆ خۆشبکرێ و لەوێشەوە پەرەپێدانی دەزگایانی سیاسی کراوە؟ بێگومان وەڵامی ڕاستگۆیانە ئەوەیە کە ڕەچەتەیەك لە ئارادا نییە بۆ دامەزراندنی ئەم جۆرە دەزگایانە. بێگومان چەند فاکتەرێکی دیار هەن کە وا لە پرۆسەی هێزدارکردن دەکەن هەنگاوی یەکەمی بنێ. لەمانە، بوونی ئەندازەیەك لە ئاسایشی ناوەندی تا ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییانەی تەحەدای رژێمەکان دەکەن بەرەو ئاژاوە ملنەنێن و بوونی هەندێك دەزگایانی سیاسی پێشتر کە برێکی کەم پلورەلیزم دەهێننەئاراوە، وەك ئەو دەزگا سیاسییە تەقلیدیانەی لە بۆتسوانا دا هەبوون، تا بتوانرێ هاوپەیمانی فراوان پێکبهێنرێ و توانای مانەوەی هەبێ و بوونی دەزگایانی کۆمەڵگای مەدەنی کە بتوانن هەماهەنگی لە نێوان داخوازییەکانی دانیشتوان دا دروستبکەن بۆ ئەوەی نەتوانرێ بزووتنەوە ئۆپۆزیۆسۆنەکان بە ئاسانی لە لایەن نوخبەی دەسەڵاتدارەوە تێبشکێنرێن یان بکرێنە ئامرازی دەستی گروپێکی تر تا دەستبگرن بە سەر ئەو دەزگا چەوسێنەرانەدا کە لە ئارادان. بەڵام چەندین لەم فاکتەرانە لە رووی مێژووییەوە دیاریکراون و بەهێواشی دەگۆڕێن. نموونەی بەرازیل ئەوە روونکردۆتەوە کە چۆن دەتوانرێ دەزگایانی کۆمەڵگای مەدەنی و رێکخراوانی حیزبی لە خوارەوە بۆ سەرەوە دروستبکرێن، بەڵام ئەم پرۆسەیە هێواشە و تا چ رادەیەك لە بارودۆخە جیاوازەکان دا دەتوانێ سەرکەوتووبێ تێگەیشتنی روون لەم بارەیەوە نییە.

ئەکتەرێکی تر، یان کۆمەڵە ئەکتەرێکی تر کە دەتوانن رۆڵی ئاڵوگۆڕکارانە لە پرۆسەی هێزدارکردن دا ببینن بریتییە لە میدیا. زەحمەتە هێزدارکردنی کۆمەڵگا بە شێوەیەکی فراوان رێکبخرێ و بەردەوامی پێبدرێ بەبێ بوونی زانیاری بڵاو دەربارەی ئەوەی کە ئایا پێشێلکاری ئابووری و سیاسی لە لایەن ئەوانەی لە دەسەڵاتدان ئەنجامدەدرێ. ئێمە لە چاپتەری یازدەیەم دا رۆڵی میدیامان بینی لە ئاگادارکردنی جەماوەر و دروستکردنی هەماهەنگی لە نێوان داخوازییەکانیان دا دژی ئەو هێزانەی ویستیان دەزگا کراوەکان لاواز بکەن لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دا. میدیا دەشتوانێ رۆڵی سەرەکی ببینێ لە ئاڕاستەکردنی هێزدارکردنی بەشێکی فراوانی کۆمەڵگا بەرەو ریفۆرمی سیاسی

خۆگرتر، هەروەك لە چاپتەری یازدەیەم دا باسمانکرد بەتایبەتی لە چوارچێوەی دیموکراتیزەکردن لە بەریتانیادا.

بڵاوکراوە و کتێب کە زانیارییان دەدایە خەڵك و هاوکاری نێوان خەڵکیان دروستدەکرد، ڕۆڵی گرنگیان بینی لە کاتی شۆڕشی شکۆداری ئینگلتەرە و شۆڕشی فەڕەنسا و کاروانی بەرەو دیموکراسی لە بەریتانیای سەدەی نۆزدەیەم دا. بە هەمانشێوە، میدیا، بەتایبەتی فۆرمی نوێی میدیا کە پشتی بە پێشکەوتنەکانی بواری زانیاری تەکنەلۆجییای گەیاندن بەستوە، وەك وێب سایتەکان و گفتوگۆی نهێنی و فەیسبووك و تویتەر ڕۆڵی ناوەندی گێڕا لە بەرهەڵستکردنی ئێرانییەکان دژی هەڵبژاردنە ساختەکەی ئەحمەدی نەژاد لە ساڵی ٢٠٠٩ دا و سەرکوتکارییەکانی دواتردا. پێدەچێ میدیا ڕۆڵی ناوەندی هاوشێوە بگێڕێ لە نارەزاییەکانی بەهاری عەرەبی دا کە ئێستا لە کاتی ئامادەکردنی ئەم نووسینەدا بەردەوامن.

ڕژێمە ئەسۆریتارییەکان زۆر جار ئاگاداری گرنگیی میدیای ئازادن و ئەوەی پێیان بکرێ دەیکەن بۆ بەرەنگاربوونەوەی. ڕوونکردنەوەیەکی ئێکستریم بۆ ئەمە لە حوکمی ئەلبێرتۆ فیوجیمۆری لە پیرۆ دەردەکەوێ. هەرچەندە فیوجیمۆری لە سەرەتادا بە شێوەیەکی دیموکراسی هەڵبژێرا، بەڵام هەر زوو ڕژێمێکی دیکتاتۆری لە پیرۆ دا دامەزراند و کاتێك لەسەر حوکم بوو لە ساڵی ١٩٩٢ دا کۆدێتایەکی ئەنجامدا. دوای ئەوە، هەرچەندە هەڵبژاردنەکان بەردەوامبوون، فیوجیمۆری ڕژێمێکی گەندەڵی دامەزراند و لە ڕێگەی چەوساندنەوە و بەرتیلدانەوە حوکمیکرد. لەم کارەدا بە قورسی پشتی بە پیاوەکەی دەستەڕاستی، ڤالادیمیرۆ مۆنتیسینۆس بەست کە سەرۆکایەتی دەزگای هەواڵگری نیشتمانی خاوەن دەسەڵاتی پیرۆی دەکرد. مۆنتیسینۆس پیاوێکی ڕێکخەر بوو بۆیە تۆماری باشی هەڵگرتبوو دەربارەی بڕی ئەو پارانەی حکومەت دابویە تاکە جیاوازەکان بۆ کڕینی پشتگیرییان و تەنانەت بە ڤیدیۆ چەندین کاری بەرتیلدانەکانی گرتبوو. لۆجیکێك بۆ ئەمە هەبوو. بەدەر لە تەنیا تۆمارکردنەکان، ئەم بەڵگانە جەختکردن بوو لەسەر ئەوەی تێوەگلاوەکان لە ناو تۆماردان و وەك فیوجیمۆری و مۆنتیسینۆس تاوانبار سەیردەکرێن. دوای ڕمانی ڕژێمەکە، ئەم تۆمارانە کەوتنە دەست ڕۆژنامەنووسان و کاربەدەستان. ئەو بڕە پارانەی درابوون گرنگی میدیا بۆ دیکتاتۆریەت ڕووندەکەنەوە. دادوەرێکی دادگای باڵا بایی ٥,٠٠٠ تا ١٠,٠٠٠ دۆلار بوو لە مانگێك دا و

سیاسییەکانی ناو هەمان حیزب یان حیزبەکانی تر برە پارەی هاوشێوەیان پێدەدرا. بەڵام کاتێك دەهاتە سەر ڕۆژنامە و کەناڵەکانی تەلەفزیۆن، برە پارەکان دەگەیشتنە ملیۆنان دۆلار. جارێك ٩ ملیۆن دۆلار و جارێکیتر ١٠ ملیۆن دۆلاریان داوە بۆ کۆنترۆڵکردنی کەناڵەکانی تەلەفزیۆن. ئەوان زیاتر لە ملیۆنێك دۆلاریان داوە بە ڕۆژنامەیەکی سەرەکی و بۆ ڕۆژنامەکانی تریش بری ٣,٠٠٠ دۆلار تا ٨,٠٠٠ دۆلاریان داوە بۆ نووسینی هەر مانشێتێك. فیوجیمۆری و مۆنتیسینۆس لەو بڕوایەدا بوون کە کۆنترۆڵکردنی میدیا زۆر گرنگتر بوو لە کۆنترۆڵکردنی سیاسییەکان و دادوەرەکان. یەکێك لە دەسکەلاکانی مۆنتیسینۆس، جەنەراڵ بێلۆ، لە یەکێك لە ڤیدیۆکان دا ئەمەی بەم شێوەیە کورتکردەوە (ئەگەر ئێمە کۆنترۆڵی تەلەفزیۆن نەکەین ئەوا هیچ شتێکمان بۆ ناکرێ"

دەزگا چەوسێنەرەکانی ئەم سەردەمەی چینیش بە خەستی پشت بە کۆنترۆڵکردنی میدیا دەبەستن لە لایەن حکومەتەوە، کە، هەروەك بینیمان بە شێوەیەکی ترسناك ئاڵۆز بوە. هەورەك شیکارێکی چینی کورتی کردەوە (بۆ ئەوەی سەرکردایەتی حیزب پابەند بێ بە ریفۆرمی سیاسی، پێویستە سێ پرینسیپ پەیڕەوبکرێن: حیزب کۆنترۆڵی هێزە چەکدارەکان بکا و حیزب کۆنترۆڵی کادیرەکان بکا و حیزب کۆنترۆڵی هەواڵەکان بکا)

بێگومان میدیای ئازاد و تەکنەلۆجییای نوێی گەیاندن تەنیا دەتوانن لە پەراوێزدا یارمەتی بدەن بە دابینکردنی زانیاری و دروستکردنی هەماهەنگی لە نێوان داخوازییەکان و کارەکانی ئەوانەی هەوڵی هێنانەئارای دەزگایانی کراوەتر دەدەن. یارمەتی میدیا تەنیا کاتێك وەردەگەرێ بۆ گۆڕانکاری واتادار کە کەرتێکی فراوانی کۆمەڵگا خۆسازدەکەن و خۆڕێکدەخەن بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری سیاسی و ئەوە بۆ مەبەستی دروستکردنی تاقم یان بۆ کۆنترۆڵکردنی دەزگا چەوسێنەرەکان ناکەن، بەڵکو ئەوە بۆ گۆڕینی ئەو دەزگا چەوسێنەرانە بۆ دەزگایانی کراوەتر دەکەن. ئایا ئەم پرۆسەیە دەستپێدەکا و دەرگا بۆ هێزدارکردنی زیاتر و لە کۆتاییشدا بۆ ریفۆرمی سیاسی خۆگر دەکاتەوە، پابەندە، هەروەك لە چەندین بارودۆخی جیاوازدا بینیمان، بە مێژووی دەزگایانی ئابووری و سیاسی و پابەندە بە چەندین جیاوازی بچووك کە گرنگن و پابەندە بە ڕێچکەی پەیوەستیی مێژوو.



**دارۆن ئاسمۆگلو**، پرۆفیسۆری ئابوورییە لە زانکۆی MIT. لە ساڵی ٢٠٠٥ دا، مەدالیای جۆن بەیتس کلارکی وەرگرتوە کە دەدرێتە ئەو ئابووریناسانەی لە خوار تەمەنی چل ساڵییەوەن و گرنگترین بەشداریدەکەن لە بیرو زانیاری ئابووری دا.



**جەیمس ئەی ڕۆبینسۆن**، زانای سیاسی و ئابووریناس و پرۆفیسۆری بواری حکومەتە لە دەیڤید فلۆرەنس لە زانکۆی هارڤارد. شارەزایەکی ناسراوی جیهانییە لەسەر ئەمەریکای لاتین و ئەفریقا. ئەو لە بۆتسوانا و مۆریشیەس و سیارالیۆن و باشووری ئەفریقا کاریکردوە.

ئەم کتێبە ، بەرهەمی پازدە ساڵ توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیە لە لایەن نووسەران دارۆن ئاسمۆگلۆ و جەیمس ڕۆبینسۆن و چەندین کەسی ترەوە چۆتە ناو قووڵایی مێژووی مرۆڤایەتیەوە، هەر لە شۆرشی کشتوکاڵی ناوچەی مێسۆپۆتامیا تا مێژووی نوێی چەندین وولاتانی دەوڵەمەند و هەژاری ئەم سەردەمە. ئەوان، هەوڵیان داوە وەڵامێکی نوێی ئەوپرسیارە کۆنە بدەنەوە کە دەڵێ: بۆچی هەندێک وولات هەژار و هەندێکی تریان دەوڵەمەندن؟. لێرەوە گەرانێکی وورد دەسپێدەکەن بۆ بەدەسختنی وەڵامی چەندین پرسیاری گرنگی تر: ئایا کەلتووری نەتەوان یان هەلکەوتەی جوگرافی ولاتان یان ئاستی شارەزایی فەرمانرەواو نوخبەکان ڕۆڵی گرنگ لە هەژاری و دەوڵەمەندی یان لەسەرکەوتن و شکستهێنانی نەتەوان دەبینن؟ ئەگەر وەلامەکە نەخێرە، ئەی هۆکاری ئەم جیاوازییە گەورەیە لە داهات و گوزەرانی نەتەوان دا چییە؟. ئایا سیاسەت بناخەی خۆشگوزەرانی دائەنێ یان ئابووری و چۆن؟. هەردوو نووسەر، دوای ووردبوونەوە لەچەندین نموونەی مێژوویی و لێکۆڵینەوە لە ئەزموونی چەندین وولات لە کیشوەرە جیاجیاکان دا دەگەنە ئەو دەرئەنجامەی کە کەلتوور وجوگرافیا و نەشارەزایی ڕۆڵی گەورەیان نیە، بەڵکو ئەوە دەزگایانی وولاتن ڕۆڵی سەرەکی لە پەرەپێدان و پێشکەوتنی ئابووری و سیاسی وولات دا دەبینن.

وەرگێر

چاپخانەی رۆژهەلات / هەولێر

نرخ ( 12000 ) دینار